# هۆی جیاوازیی شەرعزانان
# لە ئەحکامی شەرعیدا

نووسینی

**دکتۆر مصطفى زەڵمی**

وەرگێڕانی

**عومەر عەلی غەفوور**

# کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەلْمی لە شەریعەت و یاسادا

پرۆژەی وەرگێڕانی
کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەلْمی لە
شەریعەت و یاسادا

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد



## أسباب اختلاف الفقهاء في الأحكام الشرعية

## هۆی جیاوازیی شەرعزانان لە ئەحکامی شەرعیدا

نووسینی : دکتۆر مصطفی زەلْمی
وەرگێڕانی : عومەر عەلی غەفوور
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
٢٥٠,٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤٤) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ ﴿١١٩﴾ ﴾

هود: ١١٨ – ١١٩

## ناوەرۆك

# پێشەکی

سوپاس بۆ ئەو خوایەی بە بەندەکانی فەرمووە: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسلام دِيناً﴾[1]، هەروەها بنەماکانی شەریعەتەکەی کردۆتە ئامرازێك بۆ لق و پۆپەکانی و چی ویستوە لە هەڵێنجانی حوکمەکانی لە چاوگەکەی بەئیلهام ختسویەتیە دڵی هەر کەس خۆی ویستوێتی.

درود و سلاو بۆ ئەو کەسەی شەرعدانەری یەکەم سەرپشکی کردوە بۆ روونکردنەوەی ئایەتەکانی بەوەی دەفەرموێ: ﴿... وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[2]، ئەویش بۆ رێنوێنیکردنی ئەم ئوممەتە بۆ بەڵگە ئەقڵی و نەقڵیەکان. هەروەها لەسەر ئال و یاوەرانی کە ئەستێرەی هیدایەت و مۆمی زانست بوون، پێشەوا موجتەهیدەکانیش لە دیاریکردنی حوکمی ئەحکام و عیللەی دەقەکان و دەستگرتن بە گوتراو و ماناکانیانەوە، کردنیانە چاوساغ و سەرمەشق.

پاش ئەوە..

یەکێك لە ئایەتەکانی خوا ئەوەیە مرۆڤ بە زمان و رەنگی جیاواز خولقاندوە: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ﴾[3]، جیاوازی هەر لەم سنووردەدا نەوەستاوە، بەڵکو تێپەریوە بۆ بەهرە

---

[1] المائدة: ٣

[2] النحل: ٤٤

[3] الروم: ٢٢

خواکرده‌کـان و ئاماده‌یـیـه فیتریـه‌کان و توانـا زه‌ینیـه‌کان، بـه‌وه‌یش ئاسـه‌واره‌کان ده‌گرێته‌وه له بۆچوونه ئه‌قڵیه‌کان و ره‌فتاره گوفتاری و کرداریه‌کان.

به‌وه‌یش جیاوازی بوو به به‌شێك له سروشتی مرۆڤ، که له دروستبوونیه‌وه ده‌ست پێـده‌کات و لـه قۆناغـه‌کانی ژیانیـدا یاوه‌ریـه‌تی، تواناکانیـدا تێده‌پـه‌ڕێ و بـه ئاسه‌واره‌کانی کۆتایی دێ: ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ إِلاَّ مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ﴾[1]، خوای گه‌وره نه‌یویستوه خه‌ڵك هـه‌موو بکاتـه یـه‌ك ئوممه‌ت، له‌به‌رئه‌وه‌ی جیاوازی له‌گه‌ڵ سروشتی ده‌گونجێ و له‌گه‌ڵ ئه‌م جیاوازیه‌ی له زانـین و حـه‌ز و بـه‌هره‌ی زاتـی و لابه‌لایـیـه‌کانی و هـه‌روه‌ها کارتێکـه‌ره خێزانـی و ژینگه‌ییه‌کاندا رێك ده‌که‌وێ.

که‌واتـه ئـیتر هـیچ سـه‌یر نیـه کـه جیـاوازی لـه بۆچـوون و حوکمـه‌کان ببێتـه دیارده‌یه‌کی سروشتی له هه‌موو شه‌ریعه‌تێکی ئاسمانی و هه‌موو یاسـایه‌کی مرۆڤکـرد (وضـعي)دا، جیـاوازیی شـه‌رعزانی موسـڵمانیش لـه ئـه‌حکامی شـه‌رعیدا به‌شـێکی دانه‌براوه له‌م دیارده‌یه. ئه‌مه جگه له‌وه‌ی ئامانج له جیـاوازی گه‌یشـتنه بـه باشـترین رێکخستنی ژیـان، به‌شـێوه‌یه‌ك ره‌زامه‌نـدیی خـالق و به‌ختـه‌وه‌ریی مـه‌خلوق لـه‌ڕووی ره‌حمه‌ت و نیعمه‌ت و فراوانیه‌وه، به‌دیبێ[2].

جیاوازی هه‌ندێکی ناپه‌سه‌نده وه‌ك جیاوازیی بیدعه‌کار و ئاره‌زووبازان، ﴿إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعاً لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ...الآية﴾[3]. ﴿وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ

---

[1] هود: ١١٨-١١٩

[2] ته‌به‌رانی گێڕاویه‌تیه‌وه که پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمویه‌تی: ((اختلاف أمتي رحمة))، واته جیاوازیی ئوممه‌ته‌که‌م ره‌حمه‌ته. له ریوایه‌تێکدا: ((اختلاف أصحابي رحمة)). عه‌للامه ئه‌له‌مناوی (عبدالقادر الطبري ت١٠٧٨هـ) له شه‌رحی ئه‌م حه‌دیسه‌دا ده‌ڵێ: "جیاوازییان فراوانکارییه بۆ خـه‌ڵك کـه وا ده‌کا مه‌زهه‌به‌کان وه‌ك چـه‌ند شه‌ریعه‌تێك بن که پێغه‌مبه‌ر به‌هه‌موویانه‌وه ره‌وانه کراوه تا شته‌کانیان لێ ته‌نگ نه‌بێتـه‌وه، هـه‌روه‌ها بـۆ فراوانکردنی شه‌ریعه‌ته لێبورده و ئاسانه‌که شتێکیان نه‌خراوه‌ته سه‌ر شان له‌توانایان به‌ده‌ر بێ. جیاوازیی مه‌زهه‌به‌کان نیعمه‌تێکی گه‌وره‌ی و چاکه‌یه‌کی مه‌زنه تایبه‌ت کراوه به‌م ئوممه‌ته".

[3] الأنعام: ١٥٩

وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ ...الآية﴾[1].

هەندێکیشــی پەســەندە وەك جیــاوازیی شــەرعزانی هــاوەڵان (الصــحابە) و شوێنکەوتوان (التـابعين) و پێشـەوا موجتەهیـدەکان (خـوا لـە هـەموویان رازی بـێ)، لەبەرئەوەی لەسەر هەڵێنجانی ئەحکام لـە دەقـەکانی قورئـان و سـوننە دامـەزراوە و پشت بەو هۆیانە دەبەستێ کە شەرع پەسەندی کردوون.

بەڵام لێکۆڵینەوە لە هۆی جیاوازیەکان، سەرباری گرنگی و زینـدوێتییان، شـتێکی کەمی لەبارەوە نووسـراوە، بـەپێی زانیـاریی مـن یەکـەمین کـەس لـەوە کۆڵیوەتـەوە بەتلیموسییە[2] (رەحمەتی خوای لێبێ)، کە هـۆی جیاوازیـەکان لـە هەشـت هـۆدا پوخـت دەکاتەوە کە بریتین لە: هاوبەشی (الاشتراك)، حەقیقەت و مەجاز، تاکبوون و لێکدان (الافراد و التركيب)، تایبەت و گشتی، گێڕانەوە و گواستنەوە، ئیجتیهـادکردن لـەوەی دەقی تیایە، ناسخ و مەنسوخ، رێپێدان و فراوانکاری (الاباحە و التوسع).

لەڕاستیدا –وەك لەم لێکۆڵینەوەیەدا روونی دەکەمەوە– ئەو هۆیانە بۆ سـێ شت دەگەڕێنەوە، ئەوانیش پەیوەندییان بە رێسا ئوسوڵی و زمانییەکانەوە هەیە، هەروەها ئەوەی پەیوەندی هەیە بە سوننە و ئیجتیهاد بـە را لـەوەی دەقـی تێدا نیـە. پاشـان خستنەڕووەکەی بەتلیمۆس فیقهیانە نیە، بەڵکو ئـەدەبی و زمانەوانییـە و بەدەگمـەن نەبێ خۆی لە قەرەی بابەتە فیقهیەکان نەداوە[3].

ئیبن روشد[4] (رەحمەتی خوای لـێبێ) لە (بداية المجتهد ونهايـة المقتصـد)[5]دا قسـەی لـەم بابەتـە کـردوە و پێـی وابـووە هۆکـانی نـاکۆکی (خـیلاف) بـۆ شـەش شـت

---

[1] آل عمران: ١٠٥

[2] ئەو (أبو محمد عبدالله بن محمد بن السيد)ـە (٤٤٤– ٥٢١ ک) کتێبێکی دانا ناوینا (الإنصاف في التنبيه على الأسباب التي أوجبت الإختلاف بين المسلمين في آرائهم)

[3] بڕوانە (الانصاف) سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٧٧ و پاشتر.

[4] محمد الأندلسي القرطبي الشهير بابن رشد الحفيد (ت –٥٩٥ هـ).

[5] ١/٥–٦ .

دەگەڕێنەوە، یەکێکیان ڕاڕابوونی لەفزە لەنێوان ئەوەی ئاخۆ گشتییە و مەبەست پێی گشتی یان تایبەتە، یان تایبەتە و مەبەست پێی گشتی یان تایبەتە. دووەم هاوبەشیی لەفز و ماناکانە، سێیەم جیاوازیی ئیعرابە، چوارەم ڕاڕابوونی لەفزە لەنێوان لەنێوان حەقیقەت و جۆرێك لە جۆرەکانی مەجازدا، یان لەنێوان ئەو دوانە و خوازە (استعارە)دا، پێنجەم ڕەها و بەندکردنە (الاطلاق والتقييد)، شەشەمیش تێکگیرانی بەڵگەکانە.

دەبینی ئەم هۆیانە –جگە لە تێکگیرانی ئاسەوارەکان کە دەچێتە خانەی جیاوازی لە سوننەدا– هەرهەموویان بۆ یەك هۆ دەگەڕێنەوە، ئەویش جیاوازییە لە ڕێسا ئوسوڵی و زمانەوانیەکاندا، پاشان ئەم دابەشکردنە جگە لەوەی سەرتاپاگیر نیە، لەسەر بناغەیەکی ئەقڵی یان سەرپێوانە (استقرائي) بنیات نەنراوە.

ئیبن تەیمیەیش[1] لە کتێبی (رفع الملام عن الأئمة الأعلام)[2]دا هەوڵی دا هۆکان لە سیاندا کورت بکاتەوە: یەکەم موجتەهیدەکە باوەڕی نەبووە بەوەی حەدیسەکە لە پێغەمبەرەوەیە. دووەم باوەڕی نەبووە مەبەستی لەو قسەیە ئەو مەسەلەیە بووبێ. سێیەم پێی وابووە ئەو حوکمە نەسخ کراوەتەوە. پاشان دە وردە هۆیتری لەمانە کردۆتەوە کە هەرهەموویان پەیوەندییان بە حەدیسەوە هەیە. واتە بۆ یەك هۆ دەگەڕێتەوە ئەویش جیاوازییە سەبارەت بە سوننە.

شاتبیش[3] لە کتێبی (الموافقات)[4]دا هەمان قسەکەی بەتڵیمۆسی دووبارە کردۆتەوە و هیچیتری زیادەی نەکردوە جگە لە جیاکردنەوە لەنێوان ناکۆکیی ڕاستەقینە (حەقیقی) و ناکۆکیی ڕواڵەتی (زاهیری).

---

[1] تقي الدين أبو العباس أحمد عبدالحليم بن عبدالسلام بن تيمية (٦٦١– ٧٢٨ هـ).

[2] ص ٤– ١٥

[3] ابراهيم اللخمي الغرناطي المالكي (ت– ٧٩٠ هـ).

[4] ٢١١/٤ و پاشتر.

پاشتر شا وەلیولّای دەهلەوی[1] لە کتێبی (الإنصاف في بیان سبب الاختلاف)دا لە بابەتەکە کۆڵیوەتەوە، بەڵام لەوەی ئیبن تەیمیە زیاتری نەگوت، جگە لە ئیجتیهاد بە را بەهۆی دابەشبوونی قوتابخانە فیقهیەکان بۆ ئەهلی را و ئەهلی حەدیس.

دواجار، مامۆستا شێخ عەلی ئەلخەفیف[2] لەبارەی هۆکانی جیاوازی نووسیوە و لەو بوارەدا کاری چاکی کردوە کە شیاوی دەستخۆشییە. بەبۆچوونی ئەو ناکۆکی (خیلاف) یان بۆ جیاوازی (ئیختیلاف) لە تێگەیشتن لە دەقەکان دەگەڕێتەوە بەهۆی هاوبەشی و حەقیقەت و مەجازەوە.. یان لە تێگەیشتن لە شێوازەکانی دەق وەك مانای پێچەوانە (مەفهوم موخالەفە).. یان جیاوازی لەسەر ئەوەی دەقی تێدا نیە. بەڵام هەوڵی نەدا شیکردنەوەیەکی زانستیانە بۆ ناکۆکی لەو ڕێسا ئوسولّیانەدا بکا، هەروەك هەوڵی نەدا هۆکانی ناکۆکی جەموجۆر بکات و لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا قەتیسیان بکا.

بەر لە وازهێنان لەم پێشەکییە پێم خۆشە ئەوە روون بکەمەوە کە زۆر شت پاڵیان پێوە نام بۆ هەڵبژاردنی ئەم بابەتە، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١– کارکردن لەسەر پەرەپێدانی توێژینەوە ئوسولّی و فیقهیەکان و سوودبینین لە ئەنجامەکانی بەیەکگەیشتنی فیکری لە فراوانترین چوارچێوەدا لەڕێی بەستنەوەی فیقه بە بنەما (واتە ئوسول)ەکەیەوە لەلایەك و بەراوردکردن لەنێوان رای ئوسولّناس و شەرعزانەکان لە مەزەبە جیاوازەکاندا لەلای دووەمەوە، لەبەرئەوەی ڕێگەی کلاسیکی بۆ توێژینەوە لە فیقه یان بنەماکانی فیقه (ئوسولّی فیقه) بەزۆری ڕێگەیەکی تاکەکەسییە و لەسەر دابڕینی فیقه لە بنەماکانی و بنەماکان لە لق و پۆپەکانی دامەزراوە و پشتبەستووە بە شانازیکردنی هەر مەزەبێك بە (ئوسولّ و فروع)ەکەی خۆی و پشتکردنە

---

[1] ١١٨٠ك مردوە.

[2] لە هەندێ موحازەرەدا کە بە بەشی توێژینەوە ئاینیەکانی وتوتەوە لە قاهیرە ١٩٥٦– ١٩٥٧.

(ئوسوڵ و فروع)ی مەزەبەکانیتر، کە ئەوە چەقبەستنێکیتری خستە سەر چەقبەستنی فیقهی ئیسلامی لە سەدەی چوارەمی کۆچیەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان.

٢- بەرتەسککردنەوەی بازنەی ناکۆکی نێوان مەزەبە ئیسلامیەکان و دانانی سنوورێك بۆ دەمارگیریی مەزەبی یان تایفی، کە زادەی کارتێکران بە زۆر هۆکارە گرنگترینیان بێئاگایی زانایانی هەندێ مەزەبە لە بنچینە و کۆڵەکەکانی ئەوانیتر.

٣- هەوڵدان بۆ گەیشتن بە واقیعی فیقهی ئیسلامی لە ئاسانترین و کورتترین ڕێگەیەوە، ئەوەیش بەبێ بەراوردکردن لەنێوان بنەماکانی هەڵێنجان (اصول الاستنباط)ی شەرعزانی موسڵمان و گەیشتن بە خاکی ناکۆکی و هۆکانی، ڕوون نابێتەوە، ئەوکاتە پاش خستنەڕووی ڕاکان و تاوتوێکردن و هەڵسەنگاندنیان، زاڵ (راجح) لە بنزاڵ (مرجوح) ڕوون دەبێتەوە و ڕاست لە لاواز جیا دەبێتەوە.

٤- لابردنی ئەو گومانانەی تووشی هەندێ دەروونی لاواز دەبێ کە دەڵێن: ئەگەر قورئان یەکە و پێغەمبەر یەکە، ئیتر ئەم جیاوازییە بۆ؟ ئەی بۆچی شەرعزان لە لقەکان (واتە فروع)دا ڕێك نەکەوتوون؟ هۆی ئەم جیاوازیانە چییە؟ ئەمانە و چەندین گومان و پرسیاریتر کە بناغەیان نەزانینی هۆی جیاوازیەکانە.

٥- نرخاندنی ئەو کۆششە جێسوپاسانەیە ئەو کەڵە زانایانە پێشکەشی ئوممەتی ئیسلامییان کردوە و سوودبینین لەو سامانە فیقهییە مەزنە کە بەرهەمی کارکردنی سەدان ساڵەی هەزاران بیرمەندە لە شەرعزانی موسڵمان، کە شەویان داوەتە دەم ڕۆژ لەپێناو ڕوناککردنەوەی ڕێگە لەبەردەم نەوەکانی داهاتوویان.

# دەسپێك

باس لە هەندێ شتی بەرایی دەکا کە لەڕووی شیکاری و مێژووییەوە پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەیە.

## ئەحکامی شەرعی لە قورئانی پیرۆزدا:

زانایانی ئوسوڵی فیقه پێیان وایە ئەحکامی شەرعی لە قورئاندا سێ بەشن، کە بریتین لە: حوکمەکانی باوەڕ و ئەخلاق و کردار. ئەم ئاراستەیەش پێچەوانەوەی راستی و واقیعە، لەبەرئەوەی حوکمەکانی قورئان پێنج بەشن و بریتین لە: ئەحکامی باوەڕ (ئیعتیقادی یاخود عەقائیدی)، ئەحکامی ئەخلاقی، ئەحکامی گەردوونی، ئەحکامی پەندئامێز (العبرية) و ئەحکامی کرداری.

### یەکەم: ئەحکامی باوەڕ (عەقائیدی):

ئەوەیە پەیوەندی بە عەقیدەی مرۆڤەوە هەیە لە ناسینی زات و سیفات و کرداری خوا و لەو لقانەی لێی دەبنەوە لە باوەڕ بە شتە نادیارەکان، ئەم حوکمانە بنچینەی سەرەکیی باقیی چوار حوکمەکەیترە. مەبەست لەوە بەدەستهێنانی عەقیدەی جێگیری ئاینییە کە کۆڵەکەی ژیانی دروستی خێزانی مرۆڤایەتییە و بڕبڕەی پشتی پەیکەری کۆمەڵگە و شادەماری زیندووی جەستەی تاکە. ئەو زانستەیش روونکردنەوەی ئەو حوکمانەی گرتۆتە ئەستۆ بریتییە لە زانستی کەلام (یان زانستی عەقائید).

**دووەم: ئەحکامی ئەخلاقی (یان ئاکاری):**

ئەخلاق لەوەدا لەگەڵ عەقیدەی ئاینی یەك دەگرێتەوە کە هەردووکیان لایەنێك لە لایەنەکانی کەسایەتیی مرۆڤ و وزەیەك لە وزە ئاینی و سلوکیەکانی دەنوێنن، لەبەرئەوە پێشتر و هێشتایش پەیوەندیی نێوانیان پتەوە، ئەم پەیوەندییە لەسەر بناغەگەلی دەروونی وەستاوە، کە هەندێکیان ویژدانی و هەندێکیان ئەقڵین، بەڵام عەقیدەی ئاینی کاریگەری و دەسەڵاتی گەورەی بەسەر تاك و گرووپەکاندا پێگەی یەکەمی داگیر کردوە، بگرە لەڕاستیدا عەقیدە شوێنکەوتوو (متبوع) و ئەخلاق شوێنکەوتە (تابع) و وابەستەی ماهیەتی عەقیدەیە وابەستەییەکی زەینی و دەرەکی، هەربۆیە بەدەگمەن ئەخلاقی تەواو لای کەسێك دەبینین کە عەقیدەی نەبێ، یان کەسێك ببینین عەقیدەی راستی هەیە و ئەخلاقی نەبێ. کەواتە ئەخلاق وابەستەی عەقیدەیە وەك وابەستەیی جووت بۆ چوار، قورئانی پیرۆز بایەخی بە ئەخلاق داوە، بەشێوەیەك لاپەڕەیەکی نابینیت لایەنێك لە لایەنەکانی ئەخلاقی تێدا نەبێ، چ راشکاوانە بێ یان ئاماژە.

**سێیەم: ئەحکامی گەردوونی:**

قورئانی پیرۆز زۆر ئایەتی گەردوونی خاوەن مانای زانستی تێدایە و گەیشتۆتە ئاستی ئیعجاز، کە موفەسیرانی کۆن دەرکیان پێ نەکردوە، بگرە هەندێکیان پەرەسەندنی زانستیی نوێ ئاشکرای کردون و مانا و مەبەستیانی روون کردۆتەوە، هەندێکیشی هێشتا نەدۆزراوەتەوە و چاوەڕوانی دۆزینەوە زانستییە نوێکانن لە ئایندەدا، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ...﴾[1].

---

[1] فصلت: ٥٣

حیکمەتی حوکمە گەردوونیەکان بەهێزکردنی باوەڕە بە زاتی خوا و بە قورئانی پیرۆز و چەسپاندنی بیروباوەڕە بەوەی کە قورئان دەستکردی مرۆڤ نیە بەڵکو نیگا (وەحی)یەکی دابەزیوە، ئەمە جگە لەوەی مرۆڤ ئاراستە دەکا بەرەو تێفکرین لەم گەردوونە کە ژێربار خراوە بۆ سوود لێبینینی لەڕووی مادی و مەعنەویەوە، بەڵام خەڵکێکی کەم دەرك بە نهێنییە گەردوونیەکانی ئەم ئایەتانە و فەلسەفەکەیان دەکەن، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ﴾[1].

پاشان ئیعجازی ئایەتە قورئانییە گەردوونیەکان پوچەڵکردنەوەی ئەو درۆ و دەلەسانەن کە ناوبەناو لە لێکۆڵینەوە خوێنراو و بینراو و نەبینراوەکاندا لەژێر ناونیشانی زانستەکانی ئایندە و شتی لەو جۆرەدا بڵاو دەبنەوە، کە پەیوەندی بە تەمەنی گەردوون بەگشتی و تەمەنی زەوی بەتایبەتی و تەمەنی مرۆڤ بەشێوەیەکی تایبەتترەوە هەیە. ئەو بڵاوکراوە چەواشەکارانە کۆمەڵێ ژمارەی خەیاڵییان تێدایە بۆ ئەو تەمەنانە، ئەو دۆزینەوە خەیاڵییە چەواشەکار و هەڵبەستراوانە، هەوڵدانن بۆ لاوازکردنی باوەڕی باوەڕداران بە بوونی خوا لەسەر بناغەی گێڕانەوەی گەردوون و ئەوەی تێیدا بۆ سروشت لەلایەك، هەروەها لاوازکردنی باوەڕ بە بەرپرسیارێتیی رۆژی دوایی لەلایەکیترەوە.

هەڵبەستنی ئەو شتانە پیلانە، وەرگێڕانیان پیلانە و بڵاوکردنەوەیان پیلانە لە پشت پەردەوە. لەو درۆ و دەلەسە خەیاڵییە چەواشەکارانەیش ئەوەیە گۆڤاری (علوم المستقبل) کە وەزارەتی راگەیاندن لە بەغدا[2] دەریدەکا لە ژمارە (٣) لاپەڕە (٤) لەژێر ناونیشانی (بەر لە تەقینەوە مەزنەکە)دا بڵاوی کردۆتەوە کە بەر لە تەقینەوە مەزنەکە ١٥ ملیار ساڵی روناکییە، پاشان ١٥ ملیار ساڵ لە رابردووی دووردا

---

[1] العنکبوت: ٤٣

[2] لە سەرەتا هەشتاکانی سەدەی رابردوو.

تێپەڕیوە، فەلەکناسانی ئەم سەردەمە بە دەزگا پێشکەوتوەکانیان توانیویانە رۆبچنە نێو ئەو ساڵانە، بەڵام شتەکە هێشتا تەمومژاوییە. ئەمە قسـەی زانـای گەردووونناسـی رووسی (ئەندریا لیندا)یە، کە وێنەیەکی خـەیاڵی گـەردوونی بـۆ کێشـاوین نـاوی نـاوە تەقینەوە مەزنەکە، کە شتی وجودی نیە لە خەیاڵی خراپ و خراپکەری ئـەودا نـەبێ. ئەوەی ئەو نـاوی نـاوە تەقینـەوە مەزنەکـە قورئـان راشـکاوانە باسـی کـردوە، بـەڵام تەقێنەرەوەکە خوایە نەك سروشت، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً[1] فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾[2]

## حیکمەتی ئەحکامی ئایەتە گەردوونیەکان:

حیکمـەت بـەهێزکردنی بـاوەڕ بـە خـوا و ئـەوەی لێـی دەبێتـەوە و وەبـەرهێنانی فەزایە. لەو ئایەتانە ئەوەیە پتر لە سیازدە سەدە بـەر لـە دۆزینـەوەی کارەبا باسـی بارگە کارەباییەکان دەکا، خوا ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي[3] سَحَاباً ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَاماً فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِن بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَن مَّن يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ﴾[4].

موعجیزەی ئەم ئایەتە کەونییـە لـەوەدا دەڵـێ ﴿ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ﴾، موفەسـیرانی سەرەتا ئـەم جـۆرە وشـانەیان بـە مـەجازی رەوانبێـژی لێکدەدایـەوە، لەکاتێکدا لە راستییە گەردوونیەکانە کە پەیوەندییان بـە ئیعجـازی قورئانـەوە هەیـە، لەبەرئـەوەی بـەڕوونی ئاماژەیـە بـۆ وزەی کارەبـایی لـەنێو هـەوردا چـەند سـەدەیەك بـەر لـە

---

[1] واتە یەك شت کە بەشەکانی بەیەکەوە پەیوەستن، (الرفت) دژی (فتق)ـە ، ئەویش لێك جیاکردنەوەی دوو شتی پێکەوە لکاوە.

[2] الأنبياء: ٣٠

[3] واتە بەنەرمی دەیداتە بەر.

[4] النور: ٤٣

دۆزینەوەی. ئەو وزەیە بنچینەی ئەو دیاردە کەشییانەیە، چـونکە (تـەئلیف) لـەنێوان ئەو پارچە هەورانە ئاماژەیەکی روونە بگرە وەسـفێکی وردە بـۆ لێـی، نزیککردنـەوەی پارچە جیاوازەکانی هەور لە وزەی کارەبایـدا، تـا یـەکتر کـێش بکـەن و پێکـەوە لـە ئاسماندا ساز و ئامادە ببن وەك سـاز و ئامـادەبوونی سـوپاکان بـەو شـێوەیەی خـوا دەیەوێ لەنێو هەورەکاندا دروستی بکا لە بروسـکە و هـەورە تریشـقە، لـە بـاران یـان بەفر، جا ئەگەر هەور بەسەر یەکدا هات و چوو هەوری کەڵەکەبوو پەیـدا دەبـێ، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً وَيُنْشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ﴾[1].

ئەم ئایەتە دوو ئامـاژەی تێدایـە، یـەکێکیان هـەوری کەڵەکـەبوو کـە بـەفری تێـدا دروست دەبێ بە چیا چواندوە، دووەمیش ئاماژەیە بۆ مەزنیی ئەو هێزە کارەباییـەی لە پێکهاتنیدا هاوبەشە.

هەر لەو ئایەتە گەردوونیانە ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنْتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ﴾[2].

تا دوێنێی نزیك زانایانی تەفسیری (اللقاح)یـان بـە پیتێنـی نێـوان تـۆوی نێرینـە و هێلکۆکەی مێینە لە رووەك و درەخت لێکدەدایەوە، لەکاتێکدا ئـەم تەفسـیرە لەگـەڵ ئەنجامەکەدا ناگونجێ کە دابەزانـدنی ئـاوە لـە ئاسمـان. لەڕاسـتیدا ئـەوەی دەنـگ و بروسکە بەرهەم دێنێ موتوریـەی نێـوان بارگـە کارەباییـە موجـەب و سـالبەکانی نـاو هەورە.

لە ئایەتە گەردوونیەکانیتر ئەوەیـە خـوا ئەفـەرموێ: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ﴾[3].

مەبەست لە (سلطان) لێرەدا زانستە، ئەگەر موسڵمانان بەگوێرەی ئەوەی ئەم ئایەتـە

---

[1] الرعد: ١٢

[2] الحجر: ٢٢

[3] الرحمن: ٣٣

گەردوونییە داوای دەکا کاریان بکردایە، ئەو کەشتیەی لەسەر مەریخ نیشتەوە ئیسلامی دەبوو نەك ئەمەریکی.

**چوارەم: ئەحکامی پەندئامێز:**

کۆمەڵە حوکمێکن لەو ئایەتانە وەردەگیرێن کە باس لەو ئوممەتانەی رابردوو پێش ئیسلام دەکەن و ئەو پاداشتەی بەدەستیان هێناوە جا ئەگەر خێریان کردبێ بە خێر و شەڕیشیان کردبێ بەشەڕ. حیکمەتی ئەم ئایەتانە و حوکمەکانیان ئەوەیە نەوە یەك لەدوای یەکەکانی پاش دەرکەوتنی ئیسلام لە پەندەکانی ئەوەی ئوممەتانی پێشوو کردویانە و ئەو پاداشتەی بەدەستیان هێناوە ئاشنا دەکا، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ﴾[1].

**پێنجەم: ئەحکامی شەرعیی کرداری[2]:**

بۆ هەشت جۆر دابەش دەبێ:

**١- پەرستن (عیبادەت)ەکان:**

ئەو حوکمانەن پەیوەندی تاك بە پەروەردگاری رێك دەخەن لە نوێژ و رۆژوو و هیتر، کە پاڵفتەکردنی دەروون و چاککردنی تاك و بەختەوەریی کۆمەڵگەیان تێدایە[3].

**٢- ئەحکامی خێزان:**

ئەو حوکمانەن ماف و ئەرکە شەخسیەکانی مرۆڤ رێك دەخەن لە هاتنەدنیایەوە تا مردنی، لە شیردان و دایەنی و حیجر (پەروەردەکردن) و

---

[1] یوسف: ١١١

[2] بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە ئەم دانراوەمان: (اصول الفقه في نسيجه الجديد) ل٣٧٧ و پاشتر.

[3] قورئان بەشێوەیەکی گشتی لە نزیکەی (١٤٠) ئایەتدا لێی دواوە، لەوانە: ﴿أَقِمِ الصَّلاَةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ... الآية﴾ (الإسراء: ٧٨). ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ... الآية﴾ (البقرة: ١٨٣). ﴿وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً... الآية﴾ (آل عمران: ٩٧).

ویلایەت و هاوسەرگیری و تەڵاق و نەفەقە و وەسێت و هەر شتێك پەیوەندی بە کاروباری میرات و ئەو جۆرە شتانەوە هەیە[1].

**٣- ئەحکامی مامەڵە داراییەکان:**

ئەو حوکمانەن ئەو پەیوەندیانەی نێوان تاکەکان رێك دەخەن کە لە مامەڵەکانی نێوانیان دەکەونەوە لە رەفتارەکانی وەك فرۆشتن و بەکرێدان و رەهن و پابەندبوون بە گرێبەندەکان و دانەوەی سپاردە[2].

**٤- ئەحکامی دارایی دەوڵەت:**

ئەو حوکمانەن داهات و خەرجەکانی دەوڵەت رێك دەخەن، هەروەها پەیوەندییە داراییەکانی نێوان دەوڵەمەند و هەژاران، نێوان دەوڵەت و تاکەکان رێك دەخەن و خەرج و دەرامەتی گەنجینەی دەوڵەت لە باج و زەکات و کانزاکان... روون دەکەنەوە[3]

---

[1] قورئان لە نزیکەی (٧٠) ئایەتدا لێی دواوە، لەوانە: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا... الآية﴾ (الروم: ٢١). ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ... الآية﴾ (الطلاق: ١). ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ... الآية﴾ (النساء: ١١). ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا... الآية﴾ (البقرة: ٢٣٣).

[2] قورئان بەشێوەیەکی گشتی لە نزیکەی (١٤٠) ئایەتدا لێی دواوە، لەوانە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ... الآية﴾ (النساء: ٢٩). ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافاً مُّضَاعَفَةً... الآية﴾ (آل عمران: ١٣٠ ). ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ... الآية﴾ (البقرة: ٢٨٢).

[3] قورئان لە دە ئایەتدا لێی دواوە، لەوانە: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ قُلِ الأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ... الآية﴾ (الأنفال: ١). ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ... الآية﴾ (الأنفال: ٤١). ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة: ٦٠ ).

### ٥- ئەحکامی دەستووری:

ئەو حوکمانەن پەیوەندیەکانی نێوان دەسەڵات و تاك ڕێك دەخەن و ماف و ئەرکی هەریەکەیان دیاری دەکەن[١].

### ٦- ئەحکامی نێودەوڵەتی:

ئەو حوکمانەن پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکانی نێوان دەوڵەتانی ئیسلامی و دەوڵەتانیتر لە هەردوو حاڵەتی ئاشتی و جەنگدا ڕێك دەخەن، وەك بانگکردن بۆ باوەڕهێنان بە ئاینی ئیسلام، مامەڵەکردن لەگەڵ دیل، بەستنی پەیماننامە، سوڵح و ئاگربەست و پەسەندکردنی ماف و ئەرکەکانی ئەهلی زیممە..[٢]

### ٧- ئەحکامی داکۆکیکارییە یاساییەکان (المرافعات):

ئەو حوکمانەن ڕێوشوێنە قەزاییەکان ڕێك دەخەن لە بەرزکردنەوەی سکاڵاوە بۆ دەرچوونی حوکم، بەشێوەیەك دادپەروەریی تەواو بێتە دی و هەرکەس مافی خۆی وەربگرێ، وەك سکاڵا و شایەتیدان و سوێندخواردن و بڕیاردان و پێویستیی جوڵانەوە بەگوێرەی دادپەروەری[٣].

---

[١] قورئانی پیرۆز ئەم پەیوەندیانەی بە هەندێ بنەمای گشتی لە نزیکەی دە ئایەتدا روون کردۆتەوە، وەك بنەمای راوێژ ﴿...وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ ...الآيَة﴾ (الشورى: ٣٨ )، هاوکاری لە بەرپرسیارێتیدا ﴿...وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ... الآية﴾ (المائدة: ٢ )، گوێڕایەڵی وەلی ئەمر ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ... الآيَة﴾ (النساء: ٥٩)، هەروەها دادپەروەری ﴿...وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ... الآيَة﴾ (النساء: ٥٨ ).

[٢] قورئانی پیرۆز بە هەندێ بنەمای گشتی و روونکردنەوەی گشتی (ئیجمالی) لە نزیکەی (٢٥) ئایەتدا باسی کردوە، لەوانە: ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ... الآيَة﴾ (الأنفال: ٦١). ﴿...وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ (التوبة: ٣٦). ﴿فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء... الآيَة﴾ (محمد: ٤ ). ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ﴾ (البقرة: ١٩٠). ﴿...فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة: ١٩٤).

[٣] قورئان بە روونکردنەوەیەکی ئیجمالی لە نزیکەی (١٣) ئایەتدا لێی دواوە و وردەکاری و پێناسەکانی حوکمەکانی بۆ سوننەتی پێغەمبەر و ئیجتیهادی موجتەهیدان بەجێهێشتووە، لەوانە، خوا ئەفەرموێ: ←

### ٨- تاوان و سزاکان:

ئەو حزکمانەن تاوان و سزاکان دیاری دەکەن و ئامانجیان پاراستنی بیروباوەڕ و گیان و ماڵ و ئەقڵ و ناموسە. تاوانەکان (الجنایات) ئەو کردەوانەن مرۆڤ دەیانکات و زیانێکی ماددی یان ئەدەبی بە کەسیتر یان بەخۆی دەگەیەنن وەك کوشتن و قەزف (بوهتانکردن بە زینا) و دزی و زینا و مەی خواردنەوە و چەتەیی (قطع الطریق)..

مەبەست لە سزاکان (العقوبات)یش: قیساس و حەدد و تەمێکردن (تەعزیر)ەکانە[1].

ئەمە بەشەکانی شەریعەتی ئیسلامین کە -وەك دەبینی- سەرجەم ئەو بوارانە لەخۆ دەگرێ کە یاسا مرۆڤکردەکان کاریان تێدا دەکەن، لەگەڵ هەندێ زیادە و جیاوازیی جەوهەری لەوانە:

أ- شەرعی ئیسلامی پەیوەندیی مرۆڤ بە بەدیهێنەریەوە رێك دەخا، یاسا وا ناکا.

ب- شەرعی ئیسلامی پەیوەندیی مرۆڤ بە خۆیەوە رێك دەخا، یاسا وا ناکا.

ج- رێساکانی شەرعی ئیسلامی ئەخلاقین بەپێچەوانەی یاسا، کە لەسەر یارمەتینەدانی کەسانیتر و پڕکردنەوەی پێویستیی هەژار، لێپرسینەوە لەگەڵ مرۆڤ دەکەن.

د- شەرعی ئیسلامی ئەرێنییە و فەرمان بە چاکە دەکا لەرێی بەڵێندان بە پاداشت، هەروەها نەرێنییە و نەهی لە خراپە دەکا لەرێی هەڕەشەی سزادان، لەکاتێکدا یاسا تەنها نەرێنییە.

---

﴿...واسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ...الآية﴾ (البقرة: ٢٨٢ ). ﴿...وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (المائدة: ٤٥).

[1] قورئانی پیرۆز بە روونکردنەوەیەکی ئیجمالی لە نزیکەی (٣٠) ئایەتدا لێی دواوە، لەوانە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى...﴾ (البقرة: ١٧٨). ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا﴾ (المائدة: ٣٨)

بەم شێوەیە لە قورئانی پیرۆز و سوننە و ئەوەی پێشینانی ساڵح لـە هـاوەڵان و شوێنکەوتوان و پێشەوا موجتەهیـدەکان بۆیـان بـەجێ هێشـتووین سـامانێك فیقهیـی مەزن بەدی دەکەین، کە بێنیازمان دەکا لە پەنابردن بۆ هێنانی یاسا وەزعیەکان، بەو مەرجەی کار بۆ پەرەدان بەو فیقهە لەبـەر تیشـکی بنچینە و ئوسـوڵە گشـتیەکانیدا، بکەین.

## بەڵگەکانی ئەحکامی شەرعی:

بەڵگەکانی ئەحکامی شەرعی ئەمانەن:

أ- بەڵگەی بەدیهێنی حوکمەکان، کە قورئانی پیرۆزە.

ب- بەڵگەی روونکەرەوەی حوکمەکان، کە سوننەتی پێغەمبەرە.

ج- ئەو بەڵگانەی حوکمەکان ئاشکرا دەکەن و لای زانایانی ئوسـوڵی فیقـه پێیـان دەوترێ سەرچاوە پاشکۆ (تەبەعی)یەکان، کە بـریتین لـە ئیجمـاع و قیـاس و باقیی ئەوانەیتر کە پێیان دەوترێ سەرچاوەی پاشکۆ.

لەڕاستیدا ئەوەی پێی دەوترێ سەرچـاوەی پاشـکۆ (واتـە تەبـەعی) لـە ئوسـوڵی فیقهدا سەرچاوە نیە، بەڵکو بەڵگەیەکە حوکمی شەرعی ئاشکرا دەکا.

## بەراورد لەنێوان فیقه و شەریعەتدا:

١- پەیوەندیی نێوانیان پەیوەندیی گشتی و تایبـەتی رەهایـە بـەگوێرەی ئـەوەی بەسەریدا راست دەگەڕێ (واتە: الماصدق) بەلای بەڕاستدانەران (المصوّبة)وە، چـونکە هــەموو فیقهێـك شــەریعەتە نــەك بەپێچــەوانەوە، هــەروەها بــەلای بەهەڵەدانەران (المُخطِّئة)ەوە[1] گشتی و تایبەتە لە روویەکەوە، ئـەویش لەبـەر

---

[1] المصوّبة: ئەوانەن دەڵێن هەموو موجتەهیدێك راستی پێکاوە بەڵام لە وەسفکردنی ئەوەدا رایـان جیـاوازە، هەندێکیان دەڵێن حوکمی خوا لە هەر مەسەلەیەکی ئیجتیهادیدا گومانگر (ظني)یە و شوێنکەوتەی گومـانی موجتەهیدەکەیـە، ئـەو گومـانی هــەر حـوکمێکی هەڵبـژارد ئـەوە حـوکمی خوایـە بـۆ ئـەو و بـۆ ←

کۆبوونەوەیان لەو حوکمە فیقهیانەی موجتەهید تێیاندا حوکمی خوای پێکاوە، هەروەها جیابوونەوەی فیقھ لەو حوکمانەی پەیوەندییان بە لایەنی ئیعتیقادی و ئەخلاقی و سەرگوزەشتەی ئوممەتە رابردووەکانەوە هەیە.
بەگوێرەی مانایش جیاوازن چونکە لە مانای هەریەکەیاندا شتێك وەرگیراوە کە لە مانای ئەویتردا وەرنەگیراوە.

٢- شەریعەت تەواو (واتە کامڵ)ە بەپێچەوانەی فیقهـ، ئەوەی لێکی جیانەکردونەتەوە گوتوێتی گوایە بەهۆی پەرەسەندنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیەوە شەریعەت وەك یاسا گشتگیر نیە، چونکە موجتەهید کار بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە دەکا کە تێیدایە. ئەم گومانە بێبنەمایە و تێکەڵکردنە لەنێوان شەریعەت کە رێسا و بنەمای گشتین و باس لە بنچینەکانی سەرجەم کاروبارەکانی ژیان دەکەن، لەگەڵ فیقھ کە رای شەرعزانە.

لەلایەکیترەوە قیاسکردنی شەریعەت لەسەر یاسای مرۆڤکرد (وەزعی) قیاسێکی فاسیدە، لەبەرئەوەی یاسا وەزعیەکان چەندە لە وردی و گشتگیری و داڕشتنی تەکنیکیدا بگەنە پلەی کەماڵ، ئەوا بەحەتمی کون و کەلەبەریان هەر تێدا دەبێ، کە زادەی ناتەواویی زانینەکانی یاسادانەری وەزعییە.

---

لاسایەکەرەوەکانی. هەندێکیشیان دەڵێن: مەسەلەکە شتێکی تێدایە، ئەگەر خوا حوکمی تێدا دا دەبێتە ئەو شتە، بەڵام خوا حوکمێکی دیاریکراوی نەداوە، بەڵکو حوکمەکەی وابەستە کردوە بە گومانی موجتەهیدەوە، جا ئەوەی رێی لەوە نەکەوێ ئیجتیهادێکی پێکاوە -لەبەرئەوەی هەوڵی خۆی داوە- نەك حوکمێك.
هەرچی (والمُخطِّئة)یە: ئەوانەن دەڵێن ئەوەی لە ئیجتیهاددا دەیپێکێ یەك کەسە، خوایش بەر لە ئیجتیهادەکە حوکمی لەو مەسەلەیەدا هەیە، ئەوەی پێکای ئەوە پێکاویەتی ئەوەی نەیپێکا ئەوە هەڵەی کردوە. بڕوانە:
المنار لأبي البركات (ت-٧١٠هـ) وشرحه لأبن ملك ص٦٢٥- ٦٢٨.

٣- شەریعەت گشتییە بەپێچەوانەی فیقه ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾[1]، ئەم گشتیبوونە لە واقیعی شەریعەت و ئامانج و دەقەکانیەوە کە سەرجەم مرۆڤایەتی دەدوێنن بەرچاوە: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ﴾[2].

٤- سیفەتی پابەندکردن (ئیلزام): شەریعەتی ئیسلامی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی مولزیمە، هەر مرۆڤێك مەرجەکانی تەکلیفی تێدا هاتەدی لەسەریەتی پابەند بێ بە هەموو ئەوەی شەریعەت هێناویێتی لە عەقیدە و عیبادەت و ئاکار و رەفتار، بەپێچەوانەی فیقهی بەرهەمی رای موجتەهیدان، کە رای هیچ موجتەهیدێك بۆ موجتەهیدێکیتر مولزیم نیە، بگرە بۆ لاساییەکەرەوەکەشی مولزیم نیە هەرکات ئەو کەسە موجتەهیدێکیتری بینیەوە شوێنی بکەوێ، لە رێساکانی ئوسولێش ئەوەیە (خەڵکی ئاسایی مەزەبی نیە) واتە مولزەم نیە بەوەی هەمیشە شوێن مەزەبێکی دیاریکراو بکەوێ.

٥- فیقه کە هەڵێنجانی موجتەهیدە و لەوانەیە بە رێگەچارەیەك چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگەی لە سەردەم یان شوێنێکدا پێ بکرێ، دەکرێ بۆ کێشەکانی سەردەم یان شوێنێکیتر نەگونجێ، بەپێچەوانەی شەریعەت کە هەموو سەردەم و شوێنێك دەگرێتەوە.

## پەیدابوونی فیقه:

ئەحکامی فیقهی لەگەڵ لەدایکبوونی شەریعەتدا پەیدا بوون، کە لە سەرەتای ئیسلامدا لەو حوکمانە هەڵدەهێنجران کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتبوون، ئەمە لەپاڵ ئەحکامە عەقائیدی و ئەخلاقیەکاندا. لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەندێ حوکم دەرچوون وەك داوەریکردنی لەنێو کێشەداران و فتوادانی لە رووداوێکدا، هەروەها لە

---

[1] الأنبياء: ١٠٧
[2] سبأ: ٢٨

فتوا و داوەریکردنی هاوەڵاندا، کە لە قورئان و سوننە و کۆدەنگی (ئیجماع) و را هەڵێنجراون.

لە سەردەمی شوێنکەوتوان (تابیعین) و شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان (تابیعیی تابیعین) و پێشەوایانی موجتەهیددا سنووری دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بوو و چەندین گەل و هۆز هاتنە ناو ئیسلام، بەوە موسڵمانان رووبەرووی هەندێ کێشە و رووداوی ئەوتۆ بوونەوە موجتەهیدانی هان دا قۆڵی لێ هەڵبماڵن بۆ ئیجتیهاد و هەڵێنجان، بەوە گۆڕەپانی دانانی ئەحکامی فیقهی فراوان بوو تا زۆر لە رووداوە گریمانەییەکانیشی گرتەوە، لەپاڵ ئەمەدا و پاش وەرگرتنی مۆرکە زانستییەکەی دەست کرا بە تۆمارکردنی ئەحکامی فیقهی و بەڵگە و عیللە و بنەمەکانی لەگەڵدا باس کران، بەو شێوەیە پیاوەکانی ناونران شەرعزان و زانینیشی ناونرا فیقه.

## پەرەسەندنی فیقه:

باری پەرەسەندنی فیقهی ئیسلامیش وەك بوونەرەوە زیندووەکانە، لەدایك بوو، گەشەی کرد و پێگەیشت، ئەنجا پاش داخستنی دەرگای ئیجتیهاد تووشی چەقبەستن و وەستان هات.

ئەم پەرەسەندنە شتێکی سروشتی و زەرورەتێکی حاشاهەڵنەگر بوو، شتێکە لە سروشتی فیقه خۆی و هەروەها لە سروشتی ژیانیشەوە سەرچاوەی گرتوە.

پاش مردنی پێغەمبەر هاوەڵانی دەسەڵاتی هەڵێنجان (استنباگ)یان گرتە ئەستۆ، سەردەمەکەیان بە سەردەمی تەفسیری تەشریعی و سەرەتایەك بۆ کردنەوەی دەرگاکانی هەڵێنجان دادەنرێ، زانایانی هاوەڵان (صحابە) فەزا و ئیفتایان گرتە ئەستۆ و بەهۆی هاوەڵیی دوور و درێژیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و لەبەرکردنی قورئان و سوننە و زانینی هۆکانی دابەزینەوە تەواو جێمتمانە بوون، ئەمە جگە لەوەی

بەشـێکیان راوێـژکاری پێغەمبـەر بـوون، لـە بـەناوبانگترینیان لـە مەدینـە خەلیفـە راشیدەکان و زەیدی کوڕی سابیتە[1].

## رێگەی هاوەڵان لە هەڵێنجان (الاستنباط)دا:

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ئەگەر لە قورئان یان سوننە دەقێکیان ببینیایـە ئامـاژە بیّ بۆ حوکمی رووداوەکـە لەسـەر ئـەو دەقـە دەوەسـتان و کۆششـی یاسـادانەرانەی خۆیـان لـە تێگەیشـتن لـە مەبەسـت لـە دەقەکـەدا کـورت دەکـردەوە، تـا بگەنـە جێبەجێکردنێکی راست و دروستی. خـۆ ئەگـەر دەقێکیـان دەسـت نەکەوتایـە رایان بـەکار دەهێنـا، لـە ئیجتیهادەکەشـیاندا پشـتیان بـە سـەلیقەی یاسـادانانی خۆیـان دەبەست کە لە هاوەڵێکردنی پێغەمبەر(ﷺ) و ئاگەداربوون لە نهێنیەکانی یاسـادانان و بنەماکانی بەدەسـتیان هێنـابوو، هەنـدێ جـار قیاسـیان دەکـرد و هەنـدێ جـاریش بەگوێرەی بەرژەوەندی حوکمیان دەدا.

## مۆرکی گشتیی فیقهی هاوەڵان:

١- سەرچاوەی فیقهەکەیان: قورئان و سوننە و ئیجماع (کۆدەنگی) و را بوو.

٢- فیقهێکی واقیعی بوو، لەسەر نەهجی سەردەمی پێغەمبـەر(ﷺ) دەچـوون لـە هەوڵنەدان بۆ زانینی حوکمی رووداوێك کە هێشتا رووی نەداوە.

٣- داوەریکردن (قەزاوەت) و فتواکانیان پشتیان بەو هۆ (عیللانـە) دەبەسـت کـە لە دەقەکانی قورئان و سوننە وەردەگیرێن.

٤- ئیجتیهادکردنیـان لـەوەی دەقـی تێـدا نـەبوو، بـوارێکی فـراوان بـوو و وەڵامدەرەوەی پێویستی و بەرژەوەندیەکانی خەڵك بوو.

---

[1] ساڵی ٤٥ك مردوە.

## هۆ گشتی (ئیجمالی)یەکانی جیاوازیی هاوەڵان:

أ- سەبارەت بە سوننە:

١- جیاوازیی حاڵی بگێڕەوە (راوی)یەکان لەڕووی دەستپاکی و متمانە و زەبتکردنەوە.

٢- گەیشتنی حەدیسەکە بە هەندێك و نەگەیشتنی بە هەندێکیتر.

ب- سەبارەت بە رێسا ئوسوڵی و زمانەوانیەکان: جیاوازییان لە تێگەیشتنی دەقەکاندا.

ج- سەبارەت بە ئیجتیهادکردن بە را لەوەی دەقی تێدا نیە.

١- جیاوازییان لە رادا: لە بەکارهێنانی رادا لە یەك ئاستدا نەبوون، هەندێکیان پێیان وایە هیچ کێشەیەك لە پەنابردن بۆ رادا نیە، هەندێکیشیان خۆیانی لێ دەبوێرن مەگەر لە زەرورەتدا.

٢- جیاوازیی ژینگەکانیان و پێویستی و دابونەریتی ئەو وڵاتانەی تێیاندا بوون.

## هۆی کەمیی جیاوازییان:

١- بوونیان لە یەك وڵاتدا لە سەرەتاکانی سەردەمی راشیدین، ئەوەیش کۆبوونەوە و کۆدەنگییانی لەسەر بۆچوونێك لە زۆر بابەتدا ئاسان کردبوو.

٢- بەکارهێنانی سیستمی راوێژ، خەلیفە ئەگەر بابەتێکی بهاتەیە بەردەست راوێژی بە گەورە هاوەڵان دەکرد.

٣- کەمیی کێشە و رووداوەکان لە سەردەمی ئەواندا بەبەراورد بە سەردەمەکانی پاشتر.

٤- کەمیی گێڕانەوەی حەدیس، کە بوو بە گرنگترین هۆی ناکۆکی پاش ئەوان.

٥- پەلەپەلنـــەکردن لـــە دەربڕینـــی رادا، حوکمـــدانیان لەســـەر پشـــوودرێژی و دیراسەکردنی بابەتەکە دامەزرابوو.

٦- سیاســەت پاشــکۆی فیقــە بــوو نــەك بەپێچــەوانەوە وەك لــە ســەردەمەکانی پاشتردا رووی دا، لەبەرئەوەی ئەوکات ئوممەت شوورایی و دەستووری بوو[1].

## فیقه لەسەردەمی شوێنکەوتوان (تابیعین)دا:

یاسادانان (تەشریع) لە سەردەمی شـوێنکەوتواندا بەشـێوەیەکی بەرچـاو پـەرەی سەند، ئەوەیش بۆ چەند هۆیەك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- سەرهەڵدانی دابەشبوونی سیاسی لەنێو موسڵماناندا، کە بناغەکەی کێشە بوو لەسەر ئەوەی کێ بۆ جێنشینی (خیلافەت) شایستەترە پاش ئەوەی ئـەمیری بڕواداران عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوای لێبێ) بـە تـەحکیم لەگـەڵ معاویـە رازی بوو، کە بەهۆیەوە موسڵمانان بۆ سێ تاقم دابەش بوون:

أ- شـیعە کـە لـە خۆشەویسـتیی عـەلی و نەوەکانیـدا رۆچـوون و خیلافـەتیان لەواندا حەسر کرد.

ب- خەواریج کە لـە هـەموو ئـەو لۆخانـە یـاخی بـوون کـە بوونـە مایـەی ئـەو کێشەیە و هەردوو لایەنی ناکۆکیان کافر کرد.

ج- کـۆڕ (جمهـور)ی میـانڕەوان لـە ئـەهلی سـوننە و جەماعـەت، کـە لەسـەر دەستگرتن بەوەی لە سەردەمی هاوەڵاندا هەبوو بەردەوام بوون.

٢- زانایانی موسڵمان لە وڵات و مەملەکەتە ئیسلامیەکاندا پەرت بوون و راوێژ لـەو سەردەمەدا بایەخی خۆی نەبوو.

٣- شـەرعزان لـە ڕێـرەوی فیقهییانـدا دوو ڕێچـکەیان گرتەبـەر: هەنـدێکیان لـە سـنووری دەقەکانـدا وەسـتان و نـاوی (ئـەهلی حـەدیس) بەسـەریاندا سـەپا،

---

[1] بڕوانە: الفكر السامي ٢/٣٩.

هەندێکیشیان لەبەر تیشکی دەقەکاندا پەنایان بۆ قیاسکردن لەسەر بەشێك لە حوکمەکان برد، ئەمانەیش ناونران (ئەهلی را).

٤- بڵاویی گێڕانەوەی حەدیس پاش ئەوەی پێشتر خۆیان لە گێڕانەوەی دەپاراست، لەترسی ئەوەی نەوەك درۆ بەدەم پێغەمبەری خواوە بکەن.

٥- پەیدابوونی کەسانێکی دزەکردوو کە بەهۆی رەواجی حەدیس لەناو خەڵکدا دەستیان دیاە هەڵبەستنی حەدیس.

٦- دەرکەوتنی شەرعزان لە غەیری عەرەب و بەشداریکردنیان لە بزاڤە زانستی و فیقهیەکەدا بەو بەهرە و توانایەی هەیانبوو.

هەموو ئەم هۆیانە بوونە مایەی ناکۆکیی گەرم لەبارەی لق و پۆپە فیقهیەکان و مایەی مشتومڕ و کێشە لەنێوان شەرعزاندا چ بە تاك تاك و چ بە کۆمەڵ. پشت بەخوا لە دەروازەی سێیەمدا بەدرێژی لەسەر ئەم باسە دەوەستین.

### قوتابخانە فیقهیەکان لەسەردەمی شوێنکەوتواندا:

قوتابخانە فیقهیەکان لە سەردەمی شوێنکەوتواندا زۆر بوون، بەناوبانگترینیان قوتابخانەی مەدینە بوو کە گرنگترین پێگەی حەدیس بوو، هەروەها قوتابخانەی کوفە کە گوزارشتی لە راکانی خاوەنڕاکان دەکرد.

#### أ- قوتابخانەی مەدینە:

وێڕای گواستنەوەی پایتەختی خیلافەت لەو شارە لە رۆژانی عەلی کوڕی ئەبوتالیبدا، مەدینە هەر پارێزگاری لە رابەرایەتییە ئاینیەکەی کرد، ئەویش لەبەر مانەوەی ژمارەیەکی زۆری هاوەڵان تێیدا، لەوانە زەیدی کوڕی پابت، دایکی برواداران عائیشە، عەبدوڵای کوڕی عەباس، عەبدوڵای کوڕی عومەر. لەو شوێنکەوتوانەیش کە لەوانەیان وەرگرتوە تاقمێکن پێیان دەوترێ (حەوت شەرعزانەکە) کە بەپێی بەناوبانگترین گێڕانەوەکان ئەمانەن: سەعیدی کوڕی مسەیب، عوروەی کوڕی زوبێر،

قاسمی کوڕی محەمەد، ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمان، عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵا، سلێمانی کوڕی یەسار و خاریجەی کوڕی زەید.

ب- قوتابخانەی کوفە:

پێگەی ئەم قوتابخانەیە لەڕووی زانستیەوە لەوەی مەدینە کەمتر نەبوو، ئەوە بوو هەندێ لە گەورە هاوەڵان باریان کردە ئەوێ، لەوانە ئیبن مەسعود و ئەبوموسای ئەشعەری و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەمماری کوڕی یاسر و حوزەیفەی کوڕی یەمانی عەبسی و ئەنەسی کوڕی مالیك و هیتر. ئەمە جگە لەوەی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب کردی بە بارەگای خیلافەتەکەی. لەم قوتابخانەیەدا ژمارەیەك لە شەرعزانی شوێنکەوتوان دەرکەوتن، لەوانە عەلقەمەی کوڕی قەیس ئەلنەخعی و شورەیح ئەلقازی و عامر کوڕی شەرحەبیل ئەلشەعبی و مەسروق کوڕی ئەلئەجدەع و ئیبراهیم ئەلنەخعی و سەعدیی کوڕی جوبێر.

## بنەماکانی هەڵێنجان لای شوێنکەوتوان:

شوێنکەوتوانیش هاوشێوەی هاوەڵان لەئاست دەقدا دەوەستان ئەگەر هەبوایە، ئەگەریش نەبوایە پەنایان بۆ را دەبرد، بەڵام لە سەردەمەکەیاندا بەهۆی جیاوازی لەسەر ئیجماع و بەڵگەبوون (حوجیەت)ی لەلایەك و بەهۆی دابەشبوونی تایفی (یان سیاسی) کە لە کۆتاکانی سەردەمی هاوەڵان و سەرەتاکانی سەردەمی تابیعیندا سەری هەڵدا لەلایەکیتر، گۆڕانێکی بەرچاو ڕووی دا، شیعە نکوڵییان لە حوجیەتی قیاس و ئیجماعی جگە لە ئیمامەکانیان کرد، خەواریج –جگە لە ئیبازی– نکوڵییان لە ئیجماع کرد لەبەرئەوەی ئیقرارکردنی مانای داننان دەبوو بە غەیری خۆیاندا کە ئەوان هەموویان تەفسیق یان تەکفیر کردبوون، هەروەها کارکردن بە قیاسیان رەت کردەوە، لەبەرئەوەی پێیان وابوو قیاس رایە و ئاینیش بە را وەرناگیرێ. ئەمە بەدرێژی لە دەروازەی سێیەمدا دێ.

## مۆرکی گشتیی فیقهی شوێنکەوتوان:

فیقهی شوێنکەوتوان بەچەند تایبەتمەندیەك جیا دەکرێتەوە، گرنگترینیان:

١- فرەیی ئاراستە فیقهیەکان بەهۆی دابەشبوونی سیاسیەوە[1]، فیقهی ئیسلامی زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەو دابەشبوونەی پاش جیابوونەوەی شیعە و خەواریج لە کۆڕ (جمهور)ی موسڵمانان لەنێو موسڵماناندا رووی دا و ئیتر هەریەك لەو سێ تایفەیە بوو بە خاوەن رێچکەیەکی تایبەت، ئەوەیش جیاوازبوونی لە زۆر لە مەسەلە فیقهیەکاندا لێکەوتەوە.

٢- دامەزراندنی رێبازی زانستیانە بۆ فیقه: ئەو سیاسەتەی بەنی ئومەیە بۆ پاڵپشتیکردنی هەژموون و دەسەڵاتی خۆیان و شوێنپێ هەڵگرتنی پاشا بیزەنتی و فارسەکان گرتیانە بەر، کاریگەریی گەورەی هەبوو لەوەی زانایانی ئاین لێیان بتۆرێن و لە ژیانی سیاسی گۆشەگیر بن، ئەوە وای کرد خۆیان بە زانستە ئاینیەکانەوە سەرقاڵ بکەن و هەریەکەیان لە لایەنێکی دیاریکراوی زانستە ئاینیەکانی وەك تەفسیر و گێڕانەوەی حەدیس پسپۆڕی پەیدا بکەن، وای کرد هەندێکیان خەمی گەورەیان روونکردنەوەی ئەحکام بێ وەك زانایانی مەدینە، کە چاکەی دانانی بناغەکانی رێبازی زانستیانەی فیقهی ئیسلامی، کە شەرعزان پاشتر لەسەری چوون بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە، کە لەوەدا زانایانی کوفە هەمان رێچکەیان گرتەبەر، ئەگەرچی لە ئاراستەیەکی جیاوازیان گرتەبەر لە پەنابردن بۆ را و بەکارهێنانی قیاس بەفراوانی.

٣- فراوانیی بازنەی پەرەسەندنی فیقه و زیادبوونی چالاکی و جمجوڵی لەبەر چەند هۆکارێك، گرنگترینیان:

أ- ئەو پەرتبوونەی باس کرا.

---

[1] بڕوانە (الفكر السامي)ی حجوي ٢/٨٤ و پاشتر.

ب- بڵاوبوونەوەی گێڕانەوەی حەدیس.

ج- دەرکەوتنی قوتابخانە فیقهیەکان و رووکردنی جمهوری میانڕەو لە هەردوو رێچکە فیقهییە باسکراوەکە: لایەنی را و لایەنی دەستگرتن بە رواڵەتی دەقەکانەوە[1].

د- سەرقاڵبوونی موسڵمانانی ناعەرەب بە فیقە و ئەو زانستانەی پەیوەندییان پێوە هەیە.

هـ- نووسینەوەی سوننە کە کاریگەریی گەورەی هەبوو هەم لە پاراستنی سوننە و هەم لە ئاسانکردنی هەڵێنجاندا.

## هۆی جیاوازیی شوێنکەوتوان:

أ- سەبارەت بە رێچکەی فیقهی:

١- هەندێ شەرعزان دەستیان بەدەقەکانەوە دەگرت و بەکەمی نەبێ بەلای رادا نەدەچوون، هەندێکیشیان رایان زۆر بەکار دەهێنا.

٢- جیاوازبوون لە هەندێ سەرچاوەی پاشکۆ (تەبەعی)دا وەك ئیجماع و قیاس لەئەنجامی دابەشبوونی تائیفی.

ب- سەبارەت بە سوننە:

بڵاوبوونەوەی گێڕانەوەی حەدیس و پەیدابوونی حەدیس هەڵبەستان، وای کرد لە ترسی درۆکردن بەدەم پێغەمبەرەوە، لەژێر کۆمەڵێ مەرجی دیاریکراودا نەبێ سڵ لە کارکردن بە حەدیس بکرێتەوە.

ج- سەبارەت بە رێسا ئوسوڵی و زمانەوانیەکان:

بەیەکسانی تەماشاکردن لە ئیسلامدا دەرگای پێگەیشتنی لەبەردەم موسڵمانانی ناعەرەب واڵا کرد، لەئەنجامدا کۆمەڵێ زانای هەڵکەوتوویان لە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ٩٤/٢ و پاشتر.

زمان و رێزمان و باقیی زانستە ئەقڵیەکان، ئەمە جگە لە فیقه و تەفسیر، تێدا دەرکەوت، ئەمەیش بووە مایەی زیادبوونی چالاکیی فیکری و قووڵبوونەوە لە دەق و بابەتەکان و مشتومڕ لەبارەی مانا زمانەوانیەکان. هەموو ئەوانە هۆیەك بوون لە هۆکانی جیاوازبوون لە تەفسیری دەقەکان و لێرەیشەوە لەو حوکمانەی لێیان هەڵدەگوزرێن.

## فیقه لە سەردەمی زێڕینیدا:

ماوەی نێوان سەدەی دووەم تا ناوەڕاستی سەدەی چوارەم بە گەشاوەترین سەردەمەکانی فیقهی ئیسلامی دادەنرێ، کە تێیدا گەیشتە لوتکەی وردی و فراوانی و بوو بە خاوەنی کۆمەڵێ رێبازی رۆشن و رێگەی وێنەکێشراوی دیاریکراو.

ئەم سەردەمە بەم رواڵەتانەی جیا دەکرێتەوە:

١- راچەنین و گەشەی نایابی فیقه کە گەیشتە پلەی پێگەیشتن و کەماڵ و هیچ شتێکی پەیوەست بە مرۆڤی نەهێشتەوە، چ لەسەر ئاستی تاکەکەس بێ یان کۆمەڵ، حوکمەکەی روون نەکاتەوە.

٢- دەرکەوتنی شەرعزانی هەڵکەوتوو کە جمهور دانی بە سەرگەورەیی و پێشڕەوییاندا ناوە، مەزەبی فیقهی دەستەجەمی پەیدا بوون کە خاوەنەکانیان رێسا و رێکخەرەکانیان داڕشت، پاشان قوتابیەکانیان درێژەیان دا بە وابەستەکردنی لقەکان پێیانەوە. لەو سەردەمەدا جگە لە چوار مەزەبەکەی ئەهلی سوننە و هەردوو مەزەبی شیعیی ئیمامی و زەیدی، هەروەها مەزەبی خەواریج و زاهیری، چەندین مەزەبیتر دروست بوون، وەك مەزەبی حەسەنی بەسری لە بەسرە، مەزەبی ئەوزاعی لە شام، مەزەبی (الليث) و سوفیانی سەوری لە کوفە، مەزەبی سوفیان کوڕی عویەینە و مەزەبی ئیبن جەریری تەبەری و مەزەبی أبي ثور لە بەغدا و چەندین مەزەبیتر، هەندێ کەس ژمارەی مەزەبەکانیان گەیاندۆتە پێنجسەد مەزەب، بەڵام ئەو مەزەبانە ژیانیان

بۆ نەنووسراوە، لەبەرئەوە هەرهەموو پوکاونەتەوە جگە لە مەزەبە زانراوەکان کە شوێنکەوتوانیان نووسیویانەتەوە و ماونەتەوە.

لاساییکردنەوە سیمای ئەم سەردەمە نەبووە، بەڵکو هەر قوتابیەك بنەماکانی پیشە فیقهییەکەی لە مامۆستاکانی وەردەگرت، جا کاتێ توانای ئیجتیهادی کامڵ دەبوو، لە مامۆستاکەی جیا دەبوویەوە و ئەڵقەی وانەوتنەوەی خۆی دادەمەزراند و تێیاندا ئەو حوکمە فیقهییانەی دەوتەوە کە ئەو خۆی لە دەقەکان دەریهێنابوون.

٣- گەشەی تۆمارکردنی فیقه لەم سەردەمەدا بۆ مەزەبە جیاوازەکان، هەندێ لە ئیمامەکان خۆیان تۆماریان کردوە وەك ئیمام مالیك کە مەزەبەکەی لە (الموطأ)دا تۆمار کردوە، ئیمامی شافیعی مەزەبە کۆنەکەی لە کتێبی (الحجة)دا بە قوتابییە عێراقیەکانی و مەزەبە تازەکەی لە کتێبی (الأم)دا بە قوتابییە میسریەکانی نووسیوەتەوە.

٤- فراوانبوونی بازنەی فیقهی گریمانەیی لەم سەردەمەدا پاش ئەوەی ئەبوحەنیفە (رەحمەتی خوای لێ بێ) رابەرایەتیی قوتابخانەی رای وەرگرت. ئەوە بە عەیبە لەسەر خۆی و هاوەڵانی گیراوە کە لێکۆڵینەوەکانیان شتی گریمانەیی تێدایە. لەڕاستیدا ئامانجی ئەو گەورە زانایانە لەو گریمانەکردنانە دروستکردنی سەلیقەی فیقهییە لە دەروون وئەقڵی قوتابیەکانیاندا، ئەو گریمانانە وەك راهێنانەکانی قوتابخانەیە لە سەردەمی نوێدا و مەبەست راهێنان بووە لەسەر بەکارهێنانی رێسا گشتیەکان بۆ ملکەچکردنی جوزئیاتەکان بۆیان.

٥- دەرکەوتنی زاراوە فیقهیەکان وەك زاراوەی فەرز (فرض) بۆ ئەوەی بەبەڵگەی گومانبڕ (قەتعی)[1] واجببوونی سەلماوە. (واجب) بۆ ئەوەی بە بەڵگەی

[1] واتە لای ئەبوحەنیفە، ئەگینا فەرز و واجب لای باقیی مەزەبەکان هاومانان.

گومانگر (ظني) سەلماوە، هەروەها سوننە و مەندوب، موستەحەب و مەکروە کەراهەتی حەرامکردن و کەراهەتی بەپاك دانان (تنزيه) و روکن و عیللە و هۆ و مەرج و رێگر (مانع)، دروست (صحيح) و قەڵب (فاسد) و بەتاڵ.. و باقیی زاراوەکانیتر کە بەر لەو سەردەمە بەو وردی و دیاریکراوییە بەکار نەهێنراون[1].

٦- فراوانبوونی بازنەی ناکۆکی لەنێوان شەرعزان لە مەسەلەکانی فروعدا، کە هەندێ جار هەشت را یان زیاتر لەسەر یەك مەسەلە لە مشتومڕدا بوون، هۆی ئەوەیش بۆ زۆریی موجتەهیدان و زیادبوونی مەسەلە گریمانەکراوەکان و تێکڕژانی ڕێسا ئوسولییەکان دەگەڕێتەوە.

بەڵام ئەم ناکۆکییە سەرباری زۆریەکەی هۆیەك نەبوو بۆ وروژاندنی رق و کینە لەناو شەرعزان و مایەی بەچاوی سووك سەیرکردنی لایەك بۆ لایەکیتر، بەڵکو هەر موجتەهیدێك تەواو پەرۆش بوو بۆ ڕێزگرتن لە رای نەیارەکەی، ئەوپەڕەکەی ئەوە بوو هەرکەس پێی وابوو بۆچوونەکەی ئەو دروستە و ئەگەری هەڵەی لێ دەکرێ، بەڵام بۆچوونی ئەوانیتر هەڵەیە و ئەگەری راستبوونی لێ دەکرێ.

## هۆکارەکانی راچەنینی فیقهی لەم سەردەمەدا:

فەزڵی چالاکییە زانستیەکە بەگشتی و چالاکیی فیقهی بەتایبەت لەو سەردەمەدا بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان:

١- بایەخدانی خەلیفە عەباسیەکان -بەپێچەوانەی ئومەویەکان- بە فیقه و شەرعزان، لە رواڵەتەکانی ئەم بایەخدانەیش تا رادەیەکی زۆر ملکەچکردنی کاروبارە ئیداریەکان بوو بۆ فیقهی ئیسلامی.

---

[1] ئەلحەجەوی دەڵێ: بەگشتی پێنج حوکمەکە، ئەوەی لە کتێبە فیقهیەکاندا بە لەفزەکانی حەرام و واجب و موباح و مەندوب و مەکروە لە هەر مەسەلەیەکدا هاتووە، لە کیتاب (قورئان) و سوننەدا باس نەکراون، بەڵکو لە کیتاب و سوننەدا زیاتر ئەو دەستەواژانە بەکار هاتوون کە ئاماژەن بۆ تووڕەیی یان رازیبوون چ بە گوترلو و چ بە مانا، یان کردن و ئیقرارکردنیان هاتوون. الفكر السامي١/٤٣.

٢- دەرکەوتنی گەورە موجتەهیدان و ئازادییان لە ئیجتیهادکردندا.

٣- زۆریی رووداوەکان پاش فراوانبوونی هەرێمی دەوڵەتی ئیسلامی کە سنوورەکانی فراوان بوون، کە گەل و هۆزی جیاواز لە دابونەریت و شارستانێتییان تێدا بوو.

٤- موسڵمانبوونی ژمارەیەکی زۆر غەیرە عەرەب لە وڵاتانی خاوەن شارستانێتیی کۆن وەك فارس و رۆم.. ئەوانە لە فەلسەفە و ئاینەکان و مەنتیق شارەزا بوون و بەوهۆیەوە پاش ئەوەی زانستەکانی قورئان و سوننە و فیقه و زمانیان دیراسە کرد و تێیدا پێش کەوتن، زرنگی و توانای هەڵێنجانی ئەحکامیان پەیدا کرد.

٥- کاریگەریی کەلتووری ئەو ئوممەتە جیاوازانەی هاتنە ناو ئیسلام لەسەر شەرعزانی موسڵمان، ئەو کارتێکرانە کاریگەریی گەورەی لەسەر پێگەیشتنی فیکری و فراوانبوونی توانا ئەقڵیەکانیان هەبوو.

٦- زیادبوونی چالاکیی بزوتنەوەی تۆمارکردن و وەرگێڕانی زانستە جیاوازەکان لە زمانە جۆراوجۆرەکاندا و پەیدابوونی رێکخستن و پۆلبەندیکردن و بەڵگەسازییە مەنتیقیەکان.

٧- زیادبوونی دەمەتەقێ و کۆڕی مشتومڕی فیکری و ئاڵوگۆڕی بیروڕا، هەموو ئەوانە بوونە مایەی فراوانبوونی بازنەی بزاوتی ئیجتیهاد و پەیدابوونی بیروڕای فیقهیی بەنرخ.

## لاساییکردنەوە:

لە کۆتاکانی ئەو سەردەمەدا لاساییکردنەوە سەری هەڵدا، کە بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان:

١- پروپاگەندەی مەزهەبی: قوتابیانی ئیمامەکان بۆچوونی پێشەواکانیان تۆمار و شی دەکردەوە و داکۆکییان دەکرد لێیان، هەربۆیە رێچکەی هەر مەزهەبێك لە

ناوچـەیەك لـە ناوچـەكان بـڵاو بوویـەوە و توێـژە گشـتی و تایبەتـەكان دەمارگیرییان بۆ پەیدا كردن، تا كار گەیشتە ئەوەی پیرۆزیی دەقەكان بە رای شەرعزان بدرێ.

٢- یارمەتیدانی دەسەڵاتداران لە بڵاوبوونەوەی مەزەبەكاندا، چونكە كاتێ حاكمی وڵاتێك پەیڕەوی لە مەزەبێك دەكات و پشتیوانی دەكا، رەعیەتەكەیش لەوەدا شوێنی دەكەون.

٣- سـپاردنی قـەزا بـە كەسـانی لێنەوەشـاوە، ئەوانـەیش شـوێن مـەزەبێك لـە مەزەبەكان دەكەوتن و بەگوێرەی ئەو داوەرییان لەناو خەڵكدا دەكرد.

٤- تۆماركردنی مەزەبەكان و سەرقاڵبوونی زاناكان بە بۆچوونەكانی ئەو مەزەبانە و پشتكردنە ئیجتیهاد.

٥- زانایـان بـەهۆی تێكرژانـی فـەتوا و دەمەتـەقێ و بەرهەڵسـتیەوە مشـتومڕیان دەكـرد و بـەوە خۆیـان لـێ قوتـار دەكـرد كـە رایـەكی راشـكاوی ئیمامیـان دەگواستەوە.

## وەستانی فیقه لە پێشڕەوی:

پاش ئەو هەستانە نایابە فیقه تووشی شكست و چەقبەستنێك بوو، ئەوەیش هۆی خۆی هەبوو كە گرنگترینیان بەم شێوەیە پوخت دەكەینەوە:

١- لاوازیـی سیاسـیی دەوڵـەتی عوسمـانی بـووە هـۆی لاوازبـوونی گیـانی سەربەخۆبوونی زانایان لە یاساداناندا.

٢- پابەندبوونی هەر زانایەك بە مەزەبی پێشەواكەی و لانەدان لێی، بەشێوەیەك زانایان بوونە بار بەسەر فیقهی پێشەواكانیانەوە و بەورد و درشتیەوە شوێنی كـەوتن، بەشـێوەیەك دەقـەكانی ئیمامـەكان بەلایانـەوە وەك دەقـەكانی شەرعدانەر (الشارع)ی لێهات.

٣- قەتیسبوونی کۆششەکان لە کورتکردنەوە و شەرحکردنی کتێبەکان و سەرنج لەسەر نووسینیان بە پەراوێز، یان رەخنەلێگرتن.

٤- دەمارگیریی مەزەبی و نەبوونی بوێریی هەڵێنجانی ئەحکام لە چاوگە رەسەنەکانیان، لەم بوارەدا کەرخی -کە لە گەورە زانایانی حەنەفییە- دەڵێ: "هەر ئایەت یان حەدیسێك پێچەوانەی ئەوە بێ هاوەڵانمانی لەسەرە، یان تەئویلکراوە یان نەسخکراو"[1]، ئەمە لەکاتێکدا ئەبوحەنیفە لەبارەی سەلەفەوە دەڵێ: "ئەوان پیاون و ئێمەیش پیاو و بۆم هەیە وەك ئەوان ئیجتیهاد بکەم".

## پێشەوایانی مەزبەکان و رێڕەوی فیقهییان

رەنگە شتێکی باش بێ لەکاتێکدا باس لە جیاوازیی رای زانایان دەکەین، ژیاننامەی گەورە پێشەوایان و رێڕەوی زانستی و ئاراستەی فیقهییان بخەینە روو، هەروەها هەندێ لەو قوتابیانەیان باس بکەین کە مەزەبەکەیان تۆمار کردوون و شوێنپێیان هەڵگرتوون.

١- ئەبوحەنیفە (٨٠-١٥٠ ك):

ناوی (نوعمان کوڕی کوڕی زوگی کوڕی ماه)ـە، بەپێی ئەوەی بەناوبانگە بەئەسڵ فارسە و باپیری خەڵکی کابولە و بە شوێنکەوتووی شوێنکەوتوان (تابیعی تابیعین) دادەنرێ[2].

لە کوفە لەدایك بووە و پیشەی نانفرۆشتن بوو، پاشان رووی کردۆتە زانست و باقیی ژیانی وەك زانا و شەرعزانێکی مەزن و دامەزرێنەری مەزەبی حەنەفی

---

[1] تأسيس النظر للدبوسي ص١١٦.

[2] ٥٢ساڵ لە سەردەمی ئومەویەکان ١٨ ساڵ لە سەردەمی عەباسیەکاندا ژیا. بڕوانە: الفكر السامي ١١٩/٢، تاريخ بغداد ٣٣١/١٣ وفيات الأعيان لأبن خلكان ١٤٥/٢.

بەسەربرد. لە بەغدا کۆچی دوایی کرد و لە ناوچەیەکی ئەسپەردە کرا کە ئەعزەمیەی ئێستایە.

ئەبوحەنیفە خاوەن کەسایەتیەکی بەهێز و درەوشاوە بوو، کۆمەڵێ هۆکاری زاتی و دەرەکی کاریان لە پێکهاتنی کەسایەتیدا کردوە، گرنگترین ئەو هۆکارانە:

أ- سیفەتە زاتییەکانی کە لەسەریان دروست بووبوو.

ب- ئەو شێخانەی بینیونی و لێی وەرگرتوون و ئەو رێگەیەیان بۆ کێشا کە لە رێڕەوە فیقهیەکەدا گرتیەبەر.

ج- ژینگە فیکریەکەی کە بەهرەکانی لە چوارچێوەیدا گەشەیان کرد.

لە سیفەتەکانی: کەسێکی دەروون هێمن و هەست بەهێز بوو، قسە راگوزەرەکان نەیاندەورووژاند و نیشانە دوابڕاوەکانی دنیا لە هەق لایاننەدەدا، لە شیکردنەوەی مەسەلەکاندا بیری قووڵ و ورد بوو، تەنیا بە کۆڵینەوە لە رواڵەتی دەقەکان وازی نەدەهێنا، بەڵکو بەدوای ئامانجەکانیاندا دەگەڕا، ئەم سیفەتانە و هیتر پلەیان بەرز و دڵیان رۆشن و چاوی دڵیان روناک کردەوە.

گرنگترین ئەو هۆکارانەی کاریان لە بیرکردنەوەی فیقهیی ئەبوحەنیفە کردوە:

أ- کارتێکرانی ئەبوحەنیفە بەو ژینگەیەی تێیدا ژیاوە. کاریگەریی ژینگەیش تەنها ئەو کەسە ناگرێتەوە کە تەنها بە سیاسەت و ئەدەب و فەلسەفەوە سەرقاڵە، بەڵکو رۆڵێکی کاریگەری لەسەر ژیانی فیقهیشی هەیە، کە لە پەیوەندیدا دەبێ لەگەڵی و بایەخ بە پێشکەشکردنی چارەسەر بۆ کێشە و رووداوەکانی لەرێی یاسادانانەوە دەدا.

ئەبوحەنیفە لە هەردوو سەردەمی ئومەوی و عەباسیدا ژیاوە، دەوڵەتی ئیسلامی حوکمی رۆژهەڵاتی دەکرد لە کەنارەکانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی لە رۆژئاواوە، بۆ چین لە رۆژهەڵات و هیند لە باشورەوە. ئەم رووبەرە پان و پۆڕە ئاوێتەیەک لە گەلانی بنەچە و دابونەریت جیاوازی لەخۆ دەگرت، بەدڵنیاییەوە هەموو ئەوە کار لە ئاراستەی فیقهی ئەبوحەنیفە دەکا.

ب- ئەبوحەنیفە کۆڕەکانی موتەکەلیمەکانی لە کوفـە بینیـوە، زۆربـەی مشـتومڕی ئەو کۆڕانەیش لـەبارەی قـەزا و قـەدەر و ئیمانـەوە بـوون و کارەکـانی هـاوەڵان دەخرانە روو، بەکردەوە بەشداری لە هەندێ لـەو مشـتومڕانەدا کـردوە، هەنـدێ جار رەخنەی دەگرت و هەندێ جار پشتگیری دەکرد، بەوە توانای دەمەتەقێ و دیالۆگ و راهاتن لەسەر گرتنەبەری شێوازی ئەقڵی بەدەست هێنا، هـەموو ئەمـە کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەی فیقهی هەبوو.

ج- ئەبوحەنیفە فیقهی لە مامۆستاکەی، حەماد کوڕی ئـەبی سـولەیمان[1] وەرگـرت کە نزیکەی ١٨ ساڵ لە قوتابخانەی کوفـە لـە خزمەتیـدا بـوو. ئـەو قوتابخانەیـە پیـاوانی خـۆی و سـیمای تایبـەتی خـۆی هـەبوو، لـە هـاوەڵان ئـیبن مەسـعود مامۆستای یەکەمی عێراقی تێدا بوو کە زانستی خەلیفەی دووەم عومەری کـوڕی خـەتابی هـەڵگرتبوو لـە وردیـی سـەرنج و ئـازادیی رادا، یـەکێك لـە باشـترین قوتابیەکانی عەلقەمە بوو کـە زانسـتەکەی لێـوە لەبـەر کـرد. مەسـروق کۆمـەڵێ فتوای هەبوو کە پاش مردنی لەنێو شەرعزاندا بڵاو بوونـەوە، شـورەیح ٦٢ سـاڵ قازی بوو. تێکەڵ بە ژیانی کرداری بـوو و پاڵپشـتیی مـەزەبی ئـەهلی رای کـرد. شەعبی-ش لەپاڵ ئەوانەدا بە حەدیس و ئەسەر ئەو قوتابخانەیـەی دەوڵەمەنـد دەکـرد، بـەوە قوتابخانەکـە بـە حـەدیس و را تێـر کـرا، پاشـان حـەماد کـوڕی سـولەیمان هـات و سـەرجەم ئـەو رۆشـنبیریانەی کـۆکردەوە و لـە سـنگی ئەبوحەنیفەدا بەتاڵی کردنەوە، ئەویش لە مەزەبێکدا داڕیشت کـە بـە مـۆرکێکی سەربەخۆ و ئاراستەیەکی جیاواز لە جیهانی ئیسلامیدا دەرکەوت.

---

[1] ساڵی ١٢٠ك مردوە.

**بنەماكانی هەڵێنجانی:**

ئەو سەرچاوانەی فیقهی لێ هەڵدەهێنجان ئەمانە بوون:

أ- قورئانی پیرۆز: ئەبوحەنیفە لە كەسە بەرایییەكانە كە دیلالەتە جۆراوجۆرەكانی قورئانیـان روون كردۆتـەوە، لـە دیـارترین ئـەو شـتانەی تێیـدا لەگـەڵ جمهـور جیاواز بووە، گومانبڕیی دیلالەتی گشتی (عام) و كارنەكردنی بـووە بـە مانـای پێچەوانە (مەفهومی موخالەفە)یە.

ب- سـوننە: پـاش قورئـان لـە سـوننە لاینـەداوە بـۆ سەرچـاوەیەكیدی. بـەڵام رێبازێكی تایبەتی هەیە لە كاركردن بە حەدیسی تاكینە (الآحاد) وەك لە جێـی خۆیدا باس دەكرێ.

ج- كۆدەنگی (الاجماع): ئەبوحەنیفە بـەرەهایی كـار بـە كۆدەنگی دەكـا ئەگـەر گواستنەوەی سـاغ بوبێتـەوە و كۆدەنگیی راشـكاو بـە بەڵگەیـەكی گومـانبڕ (قطعـي) دادەنــێ، كـۆدەنگیی بێـدەنگبوونیش (السـكوتي) بـە بەڵگەیـەكی گومانگر (ظني).

د- قسەی هاوەڵ (ی پێغەمبەر): كـار بـە قسـەی هـاوەڵ (صـەحابی) دەكـا لـەو بابەتانــەی بــواری رایــان تێــدا نیــە وەك عیبادەتــەكان و حــەددەكان و مەزەنـدەكراوەكان، كـە بەدیـدی ئـەو وەك ئـەو سـوننەتە وایـە دراوەتـە پـاڵ پێغەمبەر، لەبەرئەوەی پێش قیاسی دەخا[1].

هـ- قیاس: لە هەموو ئەوانەی پێش خۆی زیاتر كـاری بـە قیـاس كـردوە، ئـەویش لەبەر ئەو وردبینی و بـیرە خێرایـەی هـەیبووە لـە زانینـی ئـەو لێكچوون یـان جیاوازیەی لەنێوان شتەكاندا هەیە.[2]

---

[1] بڕوانە: الفكر السامي ٢/١٣٢ و پاشتر.

[2] سەرچاوەی پێشوو ٢/١٣٥ .

و– بەباشزانین (استحسان): ئەگەرچی بەدڵنیاییەوە تەنها ئەو نەبووە کاری بەمە کردبیّ، بەڵام لە هەموو ئیمامەکان زیاتر کاری پێکردوە.[1]

ز– عورف: رەچاوی عورفی دروستی کردوە لە دامەزراندنی ئەحکام لەسەری و لەکاتی تێکگیران (تعارض) پێشی قیاسی خستوە و زۆر لە فەرعە فیقهیەکانی لەسەر بینا کردوە.

ح– بەرژەوەندی و (ئیستیصحاب).

مۆرکی فیقهەکەی:

فیقهی ئەبوحەنیفە مۆرکێکی سەربەخۆی هەیە و هەندیّ تایبەتمەندی هەیە، لەوانە:

أ– ئاسانکردن لە عیبادات و مامەڵەکاندا، کە ئەویش لەو کۆڵەکانەیە یاسادانانی ئیسلامی لەسەر دامەزراوە ﴿... يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ...﴾[2]، ﴿... مَا يُرِيدُ اللّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ...﴾[3] . باقیی شەرعزانانیتریش رەچاوی ئەمەیان کردوە بەڵام نەگەیشتونەتە ئاستی ئەو.[4]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ٢/١٣٧ .

[2] البقرة: ١٨٥

[3] المائدة: ٦

[4] لەو مەسەلانەی ئاسانکاری تێدا رەچاو کردوە:

أ– ئەگەر پیسیەك بەر لەش یان جل کەوت دروستە بە هەر رێگرێکی زاهیر لابریّ.

ب– روخسەتی سەفەر بۆ گوێڕایەڵ و سەرپێچ جائیزە.

ج– ئەگەر هەزار دینار قەرزی لەسەر بوو، هاوکات ئەویش هەزاردینار قەرزی لەسەر خەڵك بوو، هەزار دیناریشی لەدەستدا بوو، زەکاتی لەسەر نیە. بڕوانە: الاختلاف مع ابن أبي ليلى، لأبي يوسف، ١٣٢/٧.

د– لە زەکاتدا بەلایەوە دروستە نرخەکەی بدریّ، ولتە بۆ نموونە لەباتیی مەڕێك بدریّ بۆی هەیە پارەکەی بدا.

هـ– رێگەی داوە بە فرۆشتنی خانوبەرە بەر لە وەرگرتنی.

و– رەفتاری کەسی خۆهەڵقورتێن (فزولّی) پیّ دروستە. بڕوانە: البدائع ١٤٨/٥ و پاشتر.

ب– لەبەرچاوگرتنی لایەنی هەژار و لاواز وەك قورئانی پیرۆز فەرمانی پێدەكا، ئەوەیش لە بۆچوون و فتوا و داوەریكردنەكانیدا دیارە.[1]

ج– راستكردنەوەی هەڵسوكەوتی مرۆڤ بەپێی توانا.[2]

د– رێزگرتنی ئازادیی و مرۆڤایەتیی مرۆڤ.[3]

هـ– رەچاوكردنی سەروەریی دەوڵەت كە لە ئیمامدا خۆی دەنوێنێ.[4]

و– فیقهەكەی مۆركی گریمانەكردنی پێوە دیارە، مەزەبەكەی مەسەلەی گریمانەكراو لەخۆ دەگرێ، بەوەیش سامانێكی فیقهی بەرهەم هێنا كە ئەوانەی

---

[1] لەوانە: گوتوێتی زەكات لە خشڵی زێڕ و زیودا واجبە، كە ئەوە رای زۆر لە هاوەڵانیشە. هەروەها دەڵێ: دزیكردن چەند جار دووبارە بێتەوە سزای بڕینەوە تەنیا دوو جار لەسەر دز جێبەجێ دەكرێ.

[2] لەو مەسەلانەی بەم شێوەیە قسەی تێدا كردوە:

١– دروستیی بازرگانیكردنی سەرپەرشت (وەصی) بە ماڵی ئەو هەتیوەی لەژێر چاودێریدایە لەبەرئەوەی وەصی لە جێی وەسێتكاردایە لە دەسەڵاتدا.

ب– ئەگەر كاڵایەكی كڕی پاشان هەڵشكا (مایەپوچ بوو) و نەیتوانی پارەكەی بدات فرۆشتنەكە هەڵناوەشێتەوە، بەڵكو فرۆشیارەكە دەبێتە سەرمەشقی قەرزدەرەكانیتر.

[3] لەگەڵ ئەوەیشدا:

أ– پێی وایە ئافرەتی باڵق و ژیر خاوەن ئیرادە و ئازادییە لە شووكردن بەو كەسەی بەباشی دەزانێ شووی پێ بكا.

ب– گوتوێتی هاوسەرگیری (زەواج) بە حزووری پیاوێك و دوو ئافرەت دروستە.

ج– پێی وایە حیجر دروست نیە لە شێتی یان چكۆلەییدا نەبێ و لەبەر بێئەقڵی (سفه) نابێ، لەبەرئەوەی رەچاوكردنی كەرامەتی مرۆڤ لە رەچاوكردنی ماڵەكە گرنگترە.

د– پێی وایە سوار لە غەنیمەتدا دوو پشكی هەیە، پشكێك بۆ خۆی و پشكێك بۆ ئەسپەكەی، لەكاتێكدا شافیعی و مالیك و هیتر پێیان وایە ئەسپەكە دوو پشكی هەیە.

[4] لەوانە: هەركەس زەویەك زیندوو بكاتەوە نابێتە خاوەنی بەمۆڵەتی ئیمام نەبێ. هەروەها ئەگەر خاوەن زەویی خەراج نەیتوانی بەكاری بێنێ ئیمام بۆی هەیە:

أ– بیدا بە كەسێكیتر تا بیچێنێ و خەراجەكە لە پشكی خاوەنەكەی دەبا.

ب– یان بەكرێی بدات و خەرجەكە لە كرێكەی ببا.

ج– یان بۆ بەرژەوەندیی دەوڵەت بیچێنێ.

د– ئەگەر ئەمانە هیچیان نەكران بیفرۆشێ و خەراج لە نرخەكەی ببا.

پاش خۆی سوودیان لێ بینی.[1]

بەناوبانگترین هاوەڵانی:

لە بەناوبانگترین هاوەڵانی کە بەشدارییان لە پەرەپێدانی فیقهەکەی و بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکەیدا کردوە: ئەبو یوسف[2] و محەمەد بن ئەلحەسەن ئەلشەیبانی[3] و زەفر کوڕی الهذیل[4] و ئەلحەسەن کوڕی زیاد[5].

٢- ئیمامی مالیک (٩٣- ١٧٩ ک):

مالیک کوڕی ئەنەس کوڕی مالیک کوڕی عامر ئەلئەصبەحی[6] ئەلمەدەنی، ئەبوعامری باپیرە گەورەی صەحابیەکی گەورەیە.

زانستی لای پێشەوایانی قوتابخانەی حەدیس خواستوە، لە شێخەکانی عەبدوڕەحمان بن هورمز و عەبدوڕەحمانی ناسراو بە (ربیعة الرأي)[7]، لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا لە مەدینە دەستی بە وانەوتنەوە و فتوادان کردوە پاش ئەوەی شێخەکانی شایەتیی شارەزایی لە حەدیس و فیقهیان بۆ داوە، لە مەدینە مایەوە و بۆ ماوەی نزیکەی حەفتا ساڵ فتوای بۆ خەڵك دەدا و فێری دەکردن، لە مزگەوتی پێغەمبەری

---

[1] ئەبوحەنیفە بە یەکەمین کەس دادەنرێ خۆی تەرخان کرد بۆ گریمانەکردنی مەسەلەکان و پێشبینیکردنی ڕوودانیان و گریمانەکردنی حوکمەکانیان یان بە قیاس لەسەر ئەوەی ڕووی داوە، یان بە جێکردنەوەی لەنێو (عموم)دا بۆ نموونە، بەوە فیقە زیاتر گەشەی کرد و ڕۆڵی لە پێشتر گەورەتر بوو. الفکر السامي ١٢٧/٢

[2] أبو یوسف (١١٣– ١٨٢ أو ١٨٣ هـ): یەعقوب کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبو لەیلای ئەنساری بە ڕەچەڵەك و لە کوفە گەورە بووە.

[3] محمد الشیباني (١٢٢– ١٩٨ هـ) لە واسیت لەدایك بوو و لە کوفە گەورە بوو.

[4] زفر بن الهذیل بن قیس (١١٠– ١٥٨ هـ). باوکی عەرەب و دایکی فارسە.

[5] الحسن بن زیاد اللؤلؤي (١٣٣– ٢٠٤ هـ) لای ئەبوحەنیفە خوێندی، پاش ئەویش لای ئەبو یوسف و محەمەد.

[6] لە (الاصبح)ەوە هاتووە کە هۆزێکی یەمەنە.

[7] ساڵی ١٣٦ك مردوە.

خوا (ﷺ) دادەنیشت و لەکاتی خوێندنەوەی حەدیسدا ئامـاژەی بـۆ گـۆڕی پـیرۆزی دەکرد.

## پێگەی زانستی:

شێخ و هاوشانەکانی و پاش ئـەوانیش کـۆدەنگن لـە شـایەتیدان بـۆ پێشـەوایی و جێمتمانەیی و راستیی گێڕانەوەی و وەستانی لەگەڵ سـوننە و ژمـاردنی بەیـەکێك لـە گەورەترین پێشـەوایانی حـەدیس. حـەماد بـن سـەلەمە دەڵـێ: "ئەگـەر پـێم بـوترێ پێشەوا (ئیمام)ێك بۆ ئوممەتی محەمەد هەڵبژێرە زانسـتی لـێ وەربگـرن، مـالیکم بـە شایستە بۆ ئەوە دەبینی"[1].

## کاریگەریی ژینگەی مەدینە لەسەر فیقهـ:

خەڵکی شاری مەدینە لە هەموو کەس زیاتر لە یاسادانانی پراکتیکی ئاگەدار بوون، کە پێغەمبەر(ﷺ) و زانایانی هاوەڵان دەیانکرد، بۆیە شتێکی سروشتییە مالیك کە لە مەدینـە ژیـاوە، لـە ئاسـەوارەکانی هـاوەڵان و شـوێنکەوتوان سـوودمەند بـێ و لـە شوێنکەوتوانەوە فتواکانی هـاوەڵان وەربگـرێ، یـاوەریی ئـەهلی را بکـات و سـۆراخی هەواڵەکانی عومەر و ئیبن مەسعود و هیتر لە شەرعزانی هاوەڵان بکـات و بـە کێشـە و حوکمـەکانیان ئاشـنا بـێ، تـا ببێتـە شـوێنکەوتە نـەك (موبتـەدیع)، کـاری خـەڵکی مەدینەی بە بەڵگـەی شـەرعی (واتـە حوججـە) دەبینـی و لـە فتواکانیـدا پشـتی پـێ دەبەست، لەبەرئەوە قوتابخانەی مالیك لە قوتابخانەکانی ئەهلی حەدیس دادەنرێ.[2]

---

[1] الفكر السامي ٢/١٥٦ .

[2] وفيات الأعيان لإبن خلكان ١/٥٥٥ و پاشتر.

بنەماكانی هەلێنجانی:

أ- قورئانی پیرۆز.

ب- سوننە: دووەم كۆڵەكەی بوو، یەكینە هەواڵ (خبر الواحد)یان بەلاوە بەڵگە بوو كە نابێ بەكەم سەیر بكرێ بەو مەرجەی پێچەوانەی كاری خەڵكی مەدینە نەبێ، بەپێچەوانەی ئەبوحەنیفە، لە حەدیسیشدا ئەوە لای زۆر گرنگ بوو كە خەڵكی حیجاز گێڕابێتیانەوە.

ج- كۆدەنگی: جگە لە كۆدەنگی بە مانا باوەكەی لای جمهور، باوەڕی بە حوجیەتی كۆدەنگیی خەڵكی مەدینە هەبوو.[1]

د- قیاس: قیاسی لەسەر ئەو حوكمانە دەكرد كە لە قورئان و سوننەدا هەن، (الموطأ) زۆر لەوەی تێدایە.

هـ- ئیستیحسان: شاتبی لە (اصبغ)ەوە دەگوێزێتەوە: گوێم لە ئیبن ئەلقاسم بوو لە مالیكی دەگێڕایەوە و دەیگوت: "نۆ لەسەر دەی زانست ئیستیحسانە"، بەلاّم لەگەڵ ئەوەیشدا بەئەندازەی حەنەفیەت بەفراوانی بەكاری نەهێنا.[2]

و- ئیستیصحاب: قەرافی دەڵێ ئیستیصحاب بەلای مالیكی و ئیمام ئەلموزنی و ئەبوبەكری سەیرەفیەوە حوججەیە.[3]

ز- بەرژەوەندی: كاركردن بەمە لە بنەماكانی مالیكە، مەزەبی مالیك لە كاركردن بە بەرژەوەندی ناسراوە.[4]

---

[1] قەرافی دەڵێ: بەڵگەكان (الادلة) بریتین لە قورئان و سوننە و ئیجماع و ئیجماعی خەڵكی مەدینە و قیاس و قسەی صەحابی... هتد) بڕوانە: شرح تنقیح الفصول لا٤٥٥.

[2] بڕوانە: الموافقات ١١٨/٤ . مالیك لە هەندێ مەسەلەدا ئیستیحسانی كردوە كە كەس پێش ئەو نەیكردوە، لەوانە: جێگیربوونی شەفیعبوون (واتە هەقداری) لە فرۆشتنی بەروبوم و لە خاشاكی زەویی حەبس و زەویی عاریەدا. حوكمدان بە شایەتێك و سوێندخواردن لە قیساس و برینداریەكان و خوێنبایی برگەكانی پەنجە گەورە بە پێنج وشتر مەزەندە دەكرێ.

[3] شرح تنقیح الفصول ص٤٤٧ .

[4] هەمان سەرچاوە. لا٤٤٤ .

ح- بیانوویەست (سد الذرائع): پێشەوا مالیك لە هەر كەس زیاتر بەفراوانی بەكاری هێنا و زۆر ئەحكامی لەسەر بنیاتنا.[1]

ط- عورف: پێشەوا مالیك پەنای بۆ عورف دەبرد، بەڵام بەشێوەیەكی بەرفراوان حوكمی لەسەر بینا نەكردوە.

ی- قسەی هاوەڵ (صەحابی): فیقهی مالیك پشتی بە فتوا و قەزاوەتەكانی هاوەڵان دەبەست و لە مەدینە فیقهی حەوت شەرعزانەكەی وەرگرت، بەلای ئەوەوە سوننە ئەوەیە هاوەڵانی لەسەرن، لەبەرئەوە فتوای هاوەڵان شوێنێكی دیاری لەنێو بنەماكانی هەڵێنجانیدا هەبوو.[2]

مۆركی فیقهەكەی:

فیقهی مالیك بە هەندێ تایبەتمەندی جیا دەكرێتەوە، گرنگترینیان:

أ- شێلگیری (مرونەت)ی بنەماكانی: ئەو لە دەقەكانی قورئان و سوننەی بەهیچ شێوەیەك بە گشتی (العام) و رەها (المطلق)یان وەرنەگرتوە، بەڵكو دەرگای واڵا كردوە بۆ تایبەتكردنی گشتی و بەستنەوەی رەهایان. لەپاڵ ئەوەیشدا ئوسوڵەكانی بەیەكەوە دەبەستەوە تا فیقهێكی پێگەیشتوویان لێ بەرهەم بێنێ كە لەگەڵ حوكمی ئەقڵ تەبا و لای خەڵك پەسەند بێ.

ب- بەرژەوەندی لەبەرچاو دەگرت لە هەر رێگەیەكەوە بهاتایە چ بەقیاس یان بە ئیستیحسان یان بەرژەوەندی، یان (سەدی زەرایع) و... هتد، بەوە زۆر دەرگای بۆ نەهێشتنی بارگرانی و زەحمەتی و بەدیهێنانی بەرژەوەندی و پڕكردنەوەی پێویستی كردەوە، وای كرد ئەقڵەكان حەزە سەرەكیەكانی خەڵك بەدیبێنن و بەگوێرەی پەسەندكراوی ئەوان بچن.

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] الفكر السامي/١٦٦ و پاشتر.

مالیك (رەحمەتی خوای لێبێ) پێی وابوو مەبەستی بنچینەیی شەرعدانەر(الشارع) بەدیهێنانی بەرژەوەندیەكانە، لەبەرئەوە وای كرد فیقهەكەی بەدەوری ئەو خولگەیەدا بسوڕێتەوە جارێ بە داخستنی بیانووەكان و جارێ بە كردنەوەی، تا بە ئاسانترین رێگەی بەردەست ئەو بەرژەوەندییانە بەدیبێنێ.

ج- لە ناسینی ئامانجی شەریعەتدا پشتی بە داوەری و فتواكانی هاوەڵان دەبەست، پاشان وەك كەسێكی بەئەزموون لە تێگەیشتنی شەریعەتدا بە دەق و مەرام و ئامانجە نزیك و دوورەكانیەوە، قوڵی لێ هەڵدەماڵی بۆ دۆزینەوە و پەی بردن بە حوكم و ئامانجەكان، بەوەیش فیقهی مالیك گەشەیەكی گەورەی كرد.

د- فیقهی مالیك بەوە جیا دەكرێتەوە كە رەگەزەكانی گەشە و ئاسۆ فراوانی تێدا بەدیهاتووە، لە توانای ئەقڵیی شەرعزان و ئاسۆ فراوانییان و مرونەتی بنەماكانیان و هەروەها هەمەجۆریی رێگەكانی چارەسەركردنی مەسەلە و كێشە كۆمەڵایەتیەكان كە ناوبەناو یەخەی خەڵك دەگرن.

بەناوبانگترین هاوەڵانی:

ئیمام مالیك (رەحمەتی خوای لێبێ) لە زۆریی هاوەڵ و قوتابیدا بەبەخت بوو، فێرخوازان لە وڵاتانی جیاجیای ئیسلامیەوە روویان تێدەكرد تا حەدیس و فیقهی لێ وەربگرن، بەوەیش مەزهەبەكەی بڵاو بوویەوە. رەنگە چاكەی ئەو بڵاوبوونەوەیە بۆ دوو تاقم لە قوتابیانی بگەڕێتەوە: تاقمی میسریەكان و تاقمی وڵاتی ئەفریقیای باكور و ئەندەلوس. لە تاقمی یەكەم عەبدوڕەحمان كوڕی ئەلقاسم[1]، عەبدوڵا كوڕی وەهەب[2]، ئەشهوب كوڕی عەبدولعەزیز[3]، عەبدوڕەحمان كوڕی ئەلحەكەم[1] و

---

[1] (١٢٨- ١٩١ ك) لە شام لەدایك بووە و لای مالیك فێری فیقە بووە و ماوەی بیست ساڵ یاوەری بووە، خاوەنی (المدونە)یە.

[2] (١٢٥- ١٩٧ ك أو ١٩٩ك) . ماوەیەكی زۆر یاوەری مالیك بووە و لەگەڵی بووە تا مردنی مالیك و (الموطأ)دا دەقی لێوە گێڕاوەتەوە.

[3] (١٤٠- ٣٠٤ ك) هاوەڵی مالیكە و فیقهی لەو و لە (اللیث)ەوە وەرگرتوە.

ئەصبەغ کوڕی ئەلفەرەجی ئەلئومەوی[2].. لە تاقمی دووەم: ئەسەد کوڕی ئەلفورات[3]، سەحنون ئەلتەنوخی[4] و عەبدولمەلیك کوڕی حەبیب[5]

٣- ئیمامی شافیعی (١٥٠-٢٠٤ ك):

ئەبو عەبدولا محەمەد کوڕی ئیدریش کوڕی ئەلعەباس کوڕی عوسمان کوڕی شافیع ئەلشافیعییە، لە نەوەی بەنی موتەلیبی کوڕی عەبدولمەنافە، کە چوارەمین باپیرەی پێغەمبەری خوا و تۆیەمینی ئیمامی شافیعییە، دایکی یەمانییە لە ئەزد.

پێگەیشتنی:

لە غەززە لەدایك بووە کە زێدی باوباپیرانی نیە، بەڵکو باوکی چووەتە ئەوێ و لەوێ مردوە، پاش دوو ساڵ لە لەدایکبوونی دایکی هەڵیگرتوە و بردویەتیەوە بۆ زێدی باوباپیرانی لە مەککە، لە منداڵیەوە قورئانی لەبەر کردوە و چووەتە دەرەوە بۆ (هذیل) لە دەشت و لە زمان و ئەدەبدا پێگەیشتوە. پاشان گەڕاوەتەوە مەککە و فیقه و حەدیسی لای موسلیم کوڕی خالید ئەلزنجی و سوفیان کوڕی عویینە خوێندوە، لە تەمەنی بیست ساڵیدا چووە بۆ مەدینە و فیقهی لە مالیك وەرگرتوە و لەگەڵی بووە تا مالیك مردوە.

پاشان چووە بۆ یەمەن و لەوێ وەزیفەیەکی وەرگرتوە، تۆمەتی شیعەگەری دراوەتە پاڵ و هارون ئەلرەشید بانگی کرد، بەوە هەلی بینینی محەمەد کوڕی

---

[1] (١٥٠- ٢١٠ أو ٢١٣ ك) کتێبی (الموطأ)ی بە بیستن لە مالیکەوە ریوایەت کردوە.

[2] (ت - ٢٢٥ هـ) هەندێ پێیان وایە لە هەموو کەس زاناتر بووە بە مەزەبی مالیك و مەسەلەکانی.

[3] بەئەسڵ نەیسابورییە، ماڵی لە تونس بووە، لای هاوەڵانی ئەبوحەنیفە فیقه فێر بووە لە عێراق، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ قەیرەوان و لەوێ لە ساڵی ٢١٣ك مردوە.

[4] (١٦٠- ٢٤٠ ك) لە قەیرەوان فیقهی وەرگرت پاشان کۆچی کرد بۆ میسر و ئیبن ئەلقاسمی بینی و لێیەوە فێر بوو و لە مەسەلەکانی (الاسدیە)دا هاوڕای نەبوو.

[5] (لە ٢٣٨ ك مردوە) مەزەبی مالیك لە ئەندەلوس بڵاو بوویەوە.

حەسەن ئەلشەیبانی بۆ رەخساوە و لەوەوە فیقهی عێراقی وەرگرتـوە و خسـتویەتیە سەر فیقهی حیجاز.[1]

پێگەی زانستی:

لـە شـافیعیدا (رەحمـەتی خـوای لـێبێ) چـەندین رەنـگ لـە رۆشـنبیری و زانسـت کۆبوونەتەوە کە لە هیچکام لە هاوسەردەمەکانیدا کۆنەبوونەتەوە، ئەویش لەبـەر دوو هـۆ: ئەقڵیەتـە کامڵەکـەی کـە یارمـەتی دا سـوود لـە هـەموو شـتێکی دەوروبـەری وەربگرێ، دوەمیشیان زۆریی گەشت و سەفەرەکانی و پەیوەنـدیکردنی بـە زانایـان و وەرگرتنی ئەو زانستانەی لەلایان بـووە. ئـەو گەشـتانە هـەروەها یارمـەتیان داوە بـۆ ئاگەداربوون لە ژیانی کۆمەڵگەکان و ئەو دابونـەریت و عورفانـەی هـەیانبووە، هـەموو ئەوەیش رۆشنبیریەکی بەرفراوانی لە زمان و ئەدەب و حەدیس و فیقهـ لەسەر هەردوو رێگەی ئەهلی حەدیس و ئەهلی را پێ بەخشی.

کارە فیقهیەکەی:

سەرەتا خۆی بە قوتابیـەکی ئیمـامی مالیـك و یـەکێك لـە پیـاوانی قوتابخانەکـەی دادەنـا، تـا بـۆ جـاری دووەم هاتــە عێـراق و قوتابخانەیـەکی فیقهیـی سـەربەخۆی دامەزراند، لە دیارترین کارە فیقهیەکانی:

أ- رای پێشینانی خۆی دیراسە کرد و بە وردیەکی بێئەندازە لە مەسلەکی هەردوو قوتابخانـەی ئـەهلی حـەدیس و ئـەهلی رای کۆڵیـەوە، لـە هـەموو ئـەوەیش رێبازێکی فیقهی بەرهـەم هێنـا کـە تایبەتمەندیـەکانی هـەردوو قوتابخانەکـەی تێدایە، بـەوە پێگەیـەکی مامناوەنـدی لـەنێوان ئـەهلی حـەدیس و ئـەهلی رادا پێکهێنا.

---

[1] الفكر السامي ١٧٢/٢ و پاشتر. تأريخ التشريع الإسلامي للخضري ص٢١٣. والسايس ص١٠٣

ب- ڕێڕەوێکی فیقهیی سیما دیاری ڕەنگڕێژ کرد کە لەسەر کۆمەڵێ بنەما وڕێسای تایبەت دادەمەزرێ، کە ئەوە بەڕوونی لە کتێبی (الرسالە)کەیدا دیارە. بەر لە شافیعی ئەو بنەما و ڕێسا هەمەکیانە دیاری نەکرابوون کە شەرعزان لە هەڵێنجانیدا پشتیان پێ دەبەستێ.[1]

بنەماکانی هەڵێنجانی:

أ- قورئانی پیرۆز: وەك باقیی شەرعزانەکان قورئان لە پێشی پێشەوەی سەرچاوەکان و چاوگی یەکەمی هەڵگۆزینی فیقھ دادەنێ و ڕواڵەت (زاهیر)ی دەقەکانی دەکاتە بەڵگە، تا ئەوکاتەی بەڵگە پەیدا دەبێ کە مەبەست تێیاندا ڕواڵەت نەبووە.

ب- سوننە: شافیعی داکۆکیەکی بەهێزی لە کارکردن بە یەکینە هەواڵ (خبر الواحد) دەکرد مادام ڕاویەکەی جێمتمانە و ورد بێ و مادام حەدیسەکە بگاتەوە بە پێغەمبەری خوا. هەروەها ڕەخنەی لە حەنەفیەت گرتوە لەوەی قیاسی پێش یەکینەهەواڵ خستوە. بۆ وەرگرتنیشی مەرجەکانی حەنەفی و مالیکی نەکردۆتە مەرج و پێی وایە سوننە ئەگەر ڕاست بوو شوێنکەوتنی واجبە وەك چۆن شوێنکەوتنی قورئان واجبە، بەڵام هەندێ مەرجی بۆ کارکردن بە حەدیسی (مورسەل) داناوە، وەك ئەوەی مورسەلەکە هی سەعیدی کوڕی مسەیب بێ.[2]

ج- کۆدەنگی: لە نەزەری ئەودا ئاگەدارنەبوونە لە ناکۆکی (خلاف)، لەو ڕووەوە کە زانینی کۆکبوون مومکین نیە، بۆچوونی شێخەکەی (واتە مالیك)ی لە دانانی کۆدەنگی خەڵکی مەدینە بە حوججە ڕەت کردۆتەوە و دەڵێ، یەکەمین کۆدەنگی، کۆدەنگیی هاوەڵانە.[3]

---

[1] مناقب الشافعي للفخر الرازي ص١٠٠ .

[2] بڕوانە: الأم ٢٤٦/٧. الرسالة للشافعي ص٤٦٥ .

[3] الرسالة ص٤٧٢، ص ٤٧٤ .

د- قسەی هاوەڵ: شافیعی لە قسە (قەول)ی کۆنیدا کاری بە قسەکانی هاوەڵان دەکرد، بەڵام لە قسە نوێکەیدا وەك لێی زانراوە و زۆر لە هاوەڵانی دەڵێن، رای وابووە نەکرێنە بەڵگە، لەبەرئەوەی هەندێ قسەی لێ گواستونەتەوە کەچی سەرپێچیشی کردوون. بەڵام لە قسەکانی لە (الأم)دا ئەوە تێدەگەین قسەی صەحابی بەلایەوە حوججەیە بەو مەرجەی نەیزانیبێ هاوەڵێتر هەیە رای پێچەوانەی ئەوە بێ.[1]

هـ- قیاس: شافیعی بە یەکەم کەس دادەنرێ کە قسەی لەسەر قیاس کردوە و رێساکانی رێك خستوون و بناغەکانی روون کردونەتەوە. بەڵام هەڵوێستێکی مامناوەندی بەرانبەر وەرگرت لەنێوان توندگیریی مالیك و فراوانگیریی ئەبوحەنیفەدا. مەرجیشی بۆ وەرگرتنی بەحوججە ئەوەیە عیللەکەی رێك (مونزەبیت) بێ و مەسەلەکە حەدیسێکی تێدا نەبێ با هەواڵی تاکینە (ئاحاد)یش بێ.[2]

و- ئیستیصحاب: ئەوەی لە فروعی مەزهەبی شافیعی ورد بێتەوە دەبینێ کاری بە ئیستیصحاب کردوە و بە یەکێك لە سەرچاوەکانی ئەحکامی فیقهی داناوە.

ز- عورف: فیقهی شافیعی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی عورفە باوەکانی میسر و لەوە پاشگەز بوویەوە کە لەسەر عورف و دابونەریتی عێراقیەکان بنیاتی نابوون، ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە شافیعی عورف بەیەکێك لە سەرچاوەکانی ئەحکام دادەنێ.

و- ئیستیحسان: ئەوەی لە شافیعیەوە زانراوە ئەوەیە کاری بە ئیستیحسان نەکردوە، بەڵکو رەتی کردۆتەوە و بەرپەرچی ئەوانەی داوەتەوە پەسەندیان کردوە، تا ئەو رادەیەی وتویەتی: (من استحسن فقد شرّع) واتە ئەوەی ئیستیحسان

---

[1] بروانە دوو سەرچاوەی پێشوو.

[2] بروانە دوو سەرچاوەی پێشوو.

بکا شـەرعی دانـاوە. بـەڵام شـافیعی هەنـدێ لـە مەسـەلە فیقهیـەکانی لەسـەر ئیستیحسان بینا کردوە، لەوانە ئەوەیە گوتویەتی: "أستحسن أن يؤجل الشفيع ثلاثاً" (وام پێ باشە شەفیع سێ جار بۆی دوابخرێ). لەبارەی دزیش گوتویـەتی "ئەگەر لەباتیی دەستی راست دەستی چەپی دەرهێنـا و بـڕدرا، قیـاس ئەوەیـە دەستی راستی ببڕدرێ، ئیستیحسان ئەوەیە نەبڕدرێ".[1]

کەواتە ئەو ئیستیحسانەی شافیعی هێرشی کردۆتەسەر و دژی وەستاوە، ئەوەیـە خەڵك بەبێ بەڵگە بەباشی دەزانن و حەزیان لێیە، دیـارە هـیچ موجتەهیـدێکیش بـەم شێوەیە وەریناگرێ.

مۆرکی فیقهەکەی:

فیقهی شافیعی بە چەند شتێك جیا دەکرێتەوە، لەوانە:

أ- رێڕەوە فیقهیەکـەی مامناوەنـد بـوو لـەنێوان هـەردوو رێـڕەوی ئـەهلی حـەدیس و ئەهلی رادا، لەبەرئەوەی ئاراستەی ئیمام ئەبوحەنیفە و ئیمام مالیکی ئاوێتە کـرد، بەشێوەیەك هاوڕای ئەبوحەنیفە بوو لە بنەماکانیدا بـەڵام لـە سـنوورێکدا وەسـتا، هەروەك هاوڕا بـوو لەگـەڵ مالیـك لـە بایەخـدانی زۆری بـە حـەدیس، بەشـێوەیەك شافیعیەت لە عێراق و خوراسان بە ئەهلی حەدیس ناسران، خەڵکی بەغدا ناویـان نابوو سەرخەری سوننە.[2]

ب- کاتێ شافیعی جیاوازیی نێوان رێچکەی حیجازی و عێراقیەکانی بینـی، کـاری بـۆ ئەوە کرد هەڵوێستی خۆی بـەوردی دیـاری بکـا، رێچـکەیەکی تایبـەت بـۆ خـۆی پەیڕەو کرد و پلانێکی روونـی لـە بەبەڵگـەکردنی حـەدیس و هەنـدێ سەرچـاوەی پاشکۆ گرتەبەر، جا کەوتە بـەرگریکردن لـەو پلانـە و هێرشـکردنە سـەر ئەوانـەی سەرپێچی دەکەن، عێراقی بوونایە یان حیجازی.

---

[1] بڕوانە الرسالة، للشافعي ل٥٠٣ و پاشتر. الأحكام، للآمدي ٣/٢٠٠. ارشاد الفحول ص٢٢٤.

[2] راجع الخضري ص ٦ .

ج- شافیعی لە تێگەیشتنی دەقەکانی قورئان و سوننەدا ڕێچکەیەکی ڕواڵەتگەرا (زاهیری) گرتەبەر و لێی لانەدەدا، لەبەرئەوەی پێی وابوو دەستگرتن بە جگە لە (زاهیر) دەستگرتنە بە گومان و وەهمەوە، بەوەیش بواری هەڵە زۆر و بواری ڕاست کەم دەبێ، کەواتە پێویستە ئەحکام بدرێتە پاڵ شتە بەردەوامەکان (المگردە) نەك نابەردەوامەکان.

د- ئوسوڵی شافیعی ئاراستەیەکی هەم تیۆری و هەم کرداری دەگرنە بەر، گرنگی بە شتە گریمانەییەکان نادا، بەڵکو لە ئەحکامی شتە واقیعییە هەبووەکان دەکۆڵێتەوە، لەبەرئەوە بەکەمی نەبێ فیقهی گریمانەیی لەلای شافیعی نابینین.[1]

هـ- جیاوازیی زۆر لەنێوان بۆچوونە کۆن و نوێکانیدا. لەوانەیە لە یەك مەسەلەدا سێ قسەی هەبێ، ئەم جیاوازییە زیندوێتییەکی بە مەزەبەکەی بەخشیوە و موجتەهیدانی پاش خۆی خستۆتە بەردەم ڕای جۆراوجۆر، کە دەتوانن ئەوەیان هەڵبژێرن کە پێیان وایە لەگەڵ بارودۆخدا گونجاوترە.

بۆچوونە کۆن و نوێکانی:

شافیعی لە زۆر مەسەلەدا دوو ڕای هەیە، ڕایەك لە عێراق گوتویێتی کە ڕای کۆنە، ڕایەکیش لە میسر گوتویێتی کە قسە تازەکەیەتی. شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) کاتێ ساڵی ١٩٥ك گەڕایەوە بۆ عێراق، زۆر لە زانایانی عێراق پەیوەندییان پێوە کرد و لێیانەوە وەرگرت و وازیان لە ڕێچکەی ئەهلی ڕا هێنا کە لەسەری بوون، لێرەدا کتێبە کۆنەکەی (الحجة)ی دانا کە مەزەبە کۆنەکەی تێدایە و هەندێ لە گەورە هاوەڵە عێراقیەکانی لێیەوە دەگێڕنەوە، کە بریتین لە: ئەحمەد کوڕی حەنبەل، حەسەن

---

[1] بڕوانە: الشافعي لأبي زهرة ٢٦٩ لا و پاشتر.

کوڕی عەلی ئەلکەرابیسی[1] و زەعفەرانی[2].

کاتێکیش کۆچی کرد بۆ میسر و لەوێ جێگیر بوو و بە زانستی زاناکانی ئەوێ و دابونەریتی باوی ئەوێ ئاشنا بوو، ئەقڵیەتی فیقهی گەشەی کرد و بەهرەکانی دەرکەوتن و ئاسۆی فراوان بوو، هەربۆیە کتێبە نوێکانی بە قوتابییە میسریەکانی نووسیەوە کە لە کتێبی (الأم)دا کۆبوونەتەوە و دواین هەڵوێستەکانی مەزهەبەکەی کە لەسەری جێگیر بووە تێدا تۆمار کرد.

بەناوبانگترین هاوەڵانی:

(يحيى البويطي)[3]، (أبو ابراهيم بن إسماعيل المزني)[4] و (الربيع بن سليمان المرادي)[5] بە بەناوبانگترین هاوەڵە میسریەکانی دادەنرێن. هەروەها (ابراهيم بن خالد البغدادي)، (الحسن بن محمد الزعفراني) (أحمد بن عمر سريج)[6] بە بەناوبانگترین هاوەڵە عێراقیەکانی دادەنرێن.

---

[1] بەغدادی لە بەناوبانگترین هاوەڵانی ئیمامی شافیعییە و لە هەموویان زیاتر مەزهەبەکەی لەبەرە (لە ٢٤٥ ك یان ٢٤٨ ك مردوە)... کرابیس کۆی (کرباس)ە، بەمانای جلی ئەستوور، وشەیەکی فارسییە، ابن خلكان ١٨١/١.

[2] بە وردترین گێڕەوەکانی مەزهەبی قەدیمی شافیعی دادەنرێ. دراوەتە پاڵ (زەعفەرانیە) کە گوندێکە لە نزیکی بەغدا. (لە ٢٦٠ ك مردوە).

[3] شافیعی لە فتوادا پشتی پێ دەبەست و کردی بە جێنشینی خۆی بەسەر هاوەڵانیەوە پاش مردنی، ساڵی ٢٣١ك بەبەندکراوی لە بەغدا لە فیتنەی خەلقی قورئاندا مردوە.

[4] (١٧٥– ٢٦٤ك) ئەو کتێبانەی دانا کە خولگەی مەزهەبی شافیعین.

[5] ٢٧٠ ك مردوە.

[6] . بە لێکۆڵینەوە و وردبینی بەناوبانگە و چەندین دانراوی هەیە کە دەڵێن گەیشتوتە ٤٠٠ دانراوە. (لە ٣٠٦ك مردوە).

**٤- ئیمام ئەحمەد کوڕی حەنبەل (١٦٤-٢٤١ ک):**

عەبدوڵا ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی حەنبەل کوڕی هیلال کوڕی ئەسەد کوڕی ئیدریس کوڕی عەبدوڵا کوڕی حەیان کوڕی عەبدوڵا کوڕی ئەنەس ئەلشەیبانی ئەلمروزی ئەلبەغدادییە.

پێگەیشتنی:

بە بنەچە مەرووییە و لە بەغدا گەورە بووە، لای زانایانی بەغدا و کوفە و بەسرە و مەدینە و شام زانستی خوێندوە، لە ١٦ساڵیدا لای ئەبویوسف خوێندوێتی و کاتێ هاتۆتە بەغدا لەسەر دەستی شافیعی فیقهی وەرگرتوە، لە گەورەترین قوتابییە بەغداییەکانی بووە و یاوەری بوو تا شافیعی چووە بۆ میسر، شافیعی لەبارەیەوە دەڵێ: "بەغدام بەجێهێشت و کەسێکیتری بەتەقواتر و فیقهزانترم لە ئیبن حەنبەل تێدا بەجێ نەهێشت".

پاشان بوو بە موجتەهیدێکی سەربەخۆ، ئەمە جگە لەوەی حەدیسی زۆر دەگوت تا بوو بە پێشەوای حەدیس لە سەردەمی خۆیدا، بوخاری و موسلیم لێی دەگێڕنەوە، کتێبی (المسند)ی داناوە و حەدیسی وای تێدا کۆکردتەوە کە بۆ کەسیتر هەڵنەکەوتوە.[1]

سیفەتەکانی:

پێشەوا ئەحمەد (رەحمەتی خوای لێ بێ) توانایەکی گەورەی لەبەرکردنی هەبوو و هاوسەردەمەکانی شایەتیی توانای لەبەرکردن و زەبتیان بۆ داوە، حەدیسەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و فتواکانی هاوەڵان و شوێنکەوتوانی لەبەر کرد و لەبەر رۆشناییاندا ئەحکامی دەردەهێنا. بە بەهێزی و ئارامی و دانبەخۆداگرتن و باقیی سیفەتەکانیتر کە سەرچاوەیان بەهێزیی ئیرادە و راستگۆیی لێبڕان و هیمەتبەرزییە،

[1] . بڕوانە: الأستاذ السایس ص١٠٧، الخضري ص٢٢١، محمد أنیس عبادة ٣٥/٢.

دەناسرایەوە. لە ئەقڵدا هۆشیار و لە ئیماندا دامەزراو بوو، لەبەرئەوە خۆی لە دەمەدەمە دوور خستەوە، لە فیقهەکەیدا قووڵ و زۆر پەرۆش بوو بۆ ئەوەی لە بازنەی سوننەتی پێغەمبەری خوا و فتوا و قەزاوەتەکانی هاوەڵان دەرنەچێ.

بنەماکانی هەڵێنجانی:

ئیبنولەقیم[1] پێی وایە ئوسوڵی هەڵێنجانی ئیمام ئەحمەد بۆ پێنج حوکمەکە بریتی بووە لە:

أ- قورئان و سوننە.

ب- ئەوەی هاوەڵان فتوایان دابێ و رایەکی جیاوازی هاوەڵانی لەبارەیەوە نەزانیبێ.

ج- ئەگەر هاوەڵان لە بۆچووندا جیاواز بوونایە ئەوەیانی هەڵدەبژارد کە لە قورئان و سوننە نزیکتر بوو، ئەگینا باشی جیاوازیی راکانی دەکرد و پێداگری لەسەر قسەیەك نەدەکرد.

د- کارکردن بە مورسەل و حەدیسی لاواز ئەگەر لەو دەروازەیەدا شتێك نەبوو لێی دوور بخاتەوە و لە قیاسی پێ لەپێشتر بوو.

هـ- قیاس، ئەگەر نە دەقێك و نە قسەیەکی هاوەڵان و نە ئەسەرێکی مورسەل یان لاوازی نەدیایە، پەنای بۆ قیاس دەبرد و بۆ زەرورەت بەکاری دەهێنا.

دەبینی ئەوەی ئیبنولەقیم بە پێنجی دانا لەڕاستیدا چوارن، ئەوانیش قورئان و سوننە و قسەی هاوەڵ و قیاس. پاشان ئوسوڵی ئیمام ئەحمەد نە لە چوار و نە لە پێنجدا کورت نەبوونەتەوە وەك لە کتێبەکانی ئوسوڵ فیقهی حەنبەلیەکاندا روون کراوەتەوە.[2]

---

[1] . بڕوانە:اعلام الموقعين لأبن القيم ٣٢/١ و پاشتر.

. بڕوانە: الامام احمد، مامۆستا أبي زهرة ص٣٠٥ و پاشتر.

[2] بڕوانە: شرح الكوكب المنير المسمى بمختصر التحرير للفتوحي في اصول فقه الحنابلة- الطبعة الأولى- ص٣٨٢- ٣٨٩.

المسودة في اصول فقه الحنابلة تتابع على تصنيفه ثلاثة من أئمة آل تيمية، مطبعة المدني ص٤٥٠- ٤٥٥.

کەواتە بنەماکانی هەڵێنجان (اصول الاستنباط) لای ئیمام بریتین لە: قورئان و سوننە و کۆدەنگی و قسەی هاوەڵ و قیاس و ئیستیصحاب و (مەساڵیحی مورسەلە) و بیانوو بەست (سەدی زەرایع).

هۆی زۆریی گێڕانەوە لە ئیمام ئەحمەدەوە:

زۆر جار چەند را یان گێڕانەوەیەك لە یەك مەسەلەدا دەدرێتە پاڵ ئیمام ئەحمەد، ئەوەیش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان:

أ- ئەو (بەڕەحمەت بێ) لەخواترس بوو و رقی لە بیدعە بوو لە ئایندا، رەنگە فتوایەکی دابێ، پاشان حەدیس یان ئەسەرێك دیبێ کە حوکمەکەی جیاوازە لەوەی ئەو فتوای داوە، بۆیە لە راکەی پاشگەز دەبوویەوە، لەوانەیە ئەو کەسەی بۆچوونەکەی لێوە گواستۆتەوە بەو پاشگەزبوونەوەی نەزانیبێ و هەردوو قسەکەی لێوە گواستۆتەوە.

ب- ئەگەر هاوەڵان جیاواز بوونایە ئیمام ئەحمەد لە قسەکانیان دەرنەدەچوو، ئەگەر لە مەسەلەیەکدا دوو را یان زیاتری هاوەڵان بهاتایە، خۆی لە زاڵکردن (تەرجیح) دەپاراست، بەوە دوو گوتەی دەدرێتە پاڵ، لەکاتێکدا ئەو بێدەنگی هەڵبژاردوە و هیچ گوتەیەك لە گوتەکانی تەرجیح نەکردوە.

ج- جیاوازیی هاوەڵان لە هەڵێنجانی لە قسە و کردار و وەڵام و گێڕانەوەکانی، کە لەوانەیە هەرکەس جیاواز لە یەکێکیتر لێکی بداتەوە، بەوەیش دوو را یان زیاتری دەدرێتە پاڵ، لەکاتێکدا ئەو یەك رای لە مەسەلەکەدا هەیە.

د- لەوانەیە لە رووداوێکدا بەپێی ئەسەر فتوایەکی دابێ، پاشان لە رووداوێکیتردا بەنزیك لەوەی یەکەم فتوای دابێ، کە هەندێ دۆخ و هەلومەرجی لەگەڵدایە

---

الفکر السامي ٣/ ١٩ و پاشتر.

ابن حنبل، الأستاذ أبي زهرة ص ٢٠٨ و پاشتر.

دەخوازێ جیاواز لەوەی یەکەم فتوا بدات، بەوە دوو رای لێ دەگێڕدرێتەوە کە بەبێ سەرنجدان لەو هەلومەرجانە، دژیەکی لەنێوانیاندا دیارە.

مۆرکی گشتی:

مۆرکە فیقهیەکەی ئەم تایبەتمەندیانەی هەیە:

أ- فتواکانی پشتیان بە حەدیس و هەواڵ (الاخبار) و ئاسەواری سەلەفی ساڵح دەبەست، بەپشتبەستن بە گوتە و داوەریەکانی پێغەمبەر و فتوای هاوەڵان لەو جێیانەی رایەکی جیاوازیتری هاوەڵانی تێدا نەبێ، فتوای دەدا، ئەوەی هەڵدەبژارد کە تێیدا جیاواز بوون، سوودی لە گوتەی تابیعی یان شەرعزانێك لەو شەرعزانەی بە زانستی ئەسەر بەناوبانگن، وەك مالیك و ئەوزاعی و هیتر، وەردەگرت.

ب- لە گریمانەکان دوور دەکەوتەوە و فتوای تەنها لەو شتانەدا نەبێ کە روو دەدەن فتوای نەدەدا، لەبەرئەوەی بەبۆچوونی ئەو فتوا و را لە زەرورەتدا نەبێ پەنایان بۆ نابرێ.

ج- پشتبەستنی بە ئەسەر بە پلەی یەکەم وای نەکردوە فیقهەکەی قەتیس و دوور بێ لە ژیانی کرداری، بەشێوەیەك مەزەبەکەی بە بەرینترین مەزەبەکان دادەنرێ لە بەخشینی ئازادیی گرێبەندکردن و لەو مەرجانەی هەردوو گرێبەندوان پێیانەوە پابەندن، لە مەزەبەکەیدا دوو شتی ئیقرار کردوە، کە بریتین لە:

١- ئەسڵ لە عیبادەتەکاندا بەتاڵییە تا بەڵگەیەك پەیدا دەبێ کە فەرمان بەکردنیان کراوە.

٢- ئەسڵ لە گرێبەند و مامەڵەکاندا دروستییە، تا بەڵگەیەك پەیدا نەبێ لەسەر بەتاڵی و حەرامکردنیان.

ئەم دوو ئەسڵەیشی بەوە شی کردۆتەوە کە: خوا بەو شێوەیە نەبێ لەسەر زمانی پێغەمبەرانی دایناوە عیبادەت ناکرێ، لەبەرئەوەی پەرستن مافێکی خوایە لەسەر

ئەو بەندەیەی پێی رازی بووە، هەرچی گرێبەند و مامەڵەکانن مـافی بەنـدەکانن و دروستن، تا شتێکی وا دێ حەرامیان بکا.

بناغەی مینهاجی پێشەوا ئەحمەد (رەحمەتی خوای لێبێ) رێزگرتنـی هـەر مەرجێکـە هــەردوو گرێبەنــدوان داینــێن و پێــوە پابەندبوونیــەتی، تــا بەڵگەیــەك لەلایــەن شەرعدانەرەوە دێ لەسەر حەرامکردنی ئەو مەرجە.

د- ئەگــەر دەق یــان ئەســەری شــوێنکەوتووی دەســت نەکەوتایــە فتــوای بــەپێی بەرژەوەنـدی دەدا، بـۆ ئامرازەکـان حـوکمی ئامانجـەکانیان و بـۆ پێشـەکیەکان حوکمی ئەنجامەکانیانی دادەنا و لەمەدا فراوانگیری کرد، بەشێوەیەك فیقهی پێش خۆی فراوانگیری تێدا نەکردوە.

ئەم جۆرە لە بیرکردنەوەی فیقهیانە وای کرد فیقهـی حەنبـەلی بـەپیت و زینـدوو و بەرفراوان بێ، تەنها لەسەر رواڵەت و مادیاتی شتەکان نەدەوەستا، بەڵکو لە روانگـەی پاڵنەرەکانیەوە حوکمی لەسەر دەدان بەپێچـەوانەی فیقهـی شـافیعی (رەحمـەتی خـوای لێبێ) -لەم بوارەدا- کە بەشێوەیەکی رواڵەتی بۆ گرێبەنـد و رەفتارەکـان دەڕوانـێ و تــەنها بــەو دەربڕینانــەی ئامــاژەن بــۆی، لێکیــان دەداتــەوە و تەماشــای پاڵنــەر و ئامانجەکانیان ناکا.[1]

بەناوبانگترین شوێنکەوتەکانی:

ئیمام ئەحمەد لـە ژیانیـدا ژمارەیـەك شـەرعزان شـوێنی کـەوتوون کـە ژمارینیـان زەحمەتە، بەناوبانگترینیان بـریتین لـە (أحمـد بـن محمـد بـن الحجـاج المـروزي)[2] و (إبراهيم بن إسحاق الحربي).[3]

---

[1] بڕوانە: الإمام أحمد، الأستاذ أبي زهرة ل٢٠٣ و پاشتر.

[2] خولناس و ساڵح و پێشەوا بوو لە فیقه و حەدیسدا و زۆر دڵنزلوی هەیە (لە ٢٧٥ ك مردوە).

[3] ابراهيم بن اسحاق بن ابراهيم، خاوەنی: غريب الحديث ودلائل النبوة (لە ٢٨٥ ك مردوە).

دوو کەسایەتیی گەورە هەن کە فیقهی حەنبەلی بەچاکەی ئەوان پەرەی سەند و دیاری کرا، ئەوانیش (ئیبن تەیمیە) و (ئیبنول قەیم)ن. لەبەر بایەخی رۆڵی ئەم دوو شەرعزانە مەزنە لە فیقهی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی و فیقهی حەنبەلی بەتایبەت، ژیانیان بەکورتی دەخەینە روو.

### ئیمام ئیبن تەیمیە (٦٦١ - ٧٢٨ ك)

ئەحمەد تەقیودین ئەبولعەباس کوڕی شێخ شەهابەدین ئەبولمەحاسین عەبدولحەلیم کوڕی شێخ مەجدودین ئەبول بەرەکات عەبدوسەلام کوڕی ئەبو محەمەدە، ئەم بنەماڵەیە بە بنەماڵەی ئیبن تەیمیە ناسراوە.[1]

شەرعزانێکی بیر قووڵ و ئاسۆ فراوان و زانایە، بەوردی شارەزای مەنتیق و پێوەرەکانی هەر چوار مەزەبەکە بووە و لە خستنەرووی مەسەلەکاندا هەوڵی داوە بەوردی و مەحکەمی بەراورد لەنێوان ئەو تیۆر و بنچینانەدا بکا کە هەر رایەکیان لەسەر دامەزراوە.

دەکرێ ئەو رێبازەی ئیبن تەیمیە لە لێکۆڵینەوە و هەڵێنجاندا گرتبوویە بەر بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

أ- متمانەی رەهای بە ئەقڵ نیە، بەڵام پشتگوێیشی ناخا، بەڵکو لە بازنە و چوارچێوەی شەرعدا حەسری کردوە و نەیویستوە سنووری خۆی تێبپەڕێنێ.

ب- بەناو شوێن پیاوان نەکەوتوە، قسەی هیچ کەس بەلایەوە کێشی نیە بەئەندازەی ئەوە نەبێ کە قورئان یان سوننە یان ئاسەواری (سەلەف) پشتگیری دەکەن، لە حوکمەکانیدا تەنها شوێن بەڵگە دەکەوێ.

ج- وای دەبینی ئەسڵی شەریعەت قورئانی پیرۆزە، قورئانیش پێغەمبەر (ﷺ) تەفسیری کردوە، ئەو کەسانەیش ئەو تەفسیر و روونکردنەوە و پەیامەیان

---

[1] الأعلام للزركلي ١٢٩/٤ .

وەرگرتوە هاوەڵانن، ئەوان بوون شـەرعی خوایـان وەرگـرت، لەبەرئـەوە ئـیبن تەیمیە پاش پێغەمبەر شوێنی کەسیتر نەکەوت جگە لە هاوەڵان.

د- لە بیرکردنەوەیدا دەمارگیر نەبوو، فیکرێکی دیاریکراو بەسەریدا زاڵ نەبوو کـە دەمارگیری هەبێ بۆی و لەسەری وشك هەڵبێ، بەڵکو بیرکردنەوەی ئازاد بـوو، جگە لە قورئان و سوننە و ئەسەری سەلەفی ساڵح خۆی لە هەر شتێك دامـاڵی کە بیبەستێتەوە. لە پێگەیشتنیدا رێچکە حەنبـەلی بـوو، بـەڵام پـاش ئـەوەی مەزەبە فیقهیەکانی دیراسە کرد و سەرچاوەکانیانی تەی کرد، لێکۆڵینەوەکانی گەیاندیانە ئەوەی لە هەندێ رادا لە هەر چوار مەزەبەکە جیاواز بێ.[1]

### ئیمام ئیبنول قەییم (٦٩١ - ٧٥١ ك)

محەمەد کوڕی ئەبوبەکر کوڕی ئەیوب کوڕی سەعد کوڕی حریز ئەلزەرعی[2] ئـەبو عبدالله شەمسەدینە، باوکی سەرپەرشتی جەوزیە بوو.[3]

ئەم پێشەوایە: دڵساف، زانا و شارەزا لە سوننە و ئەسەر، زانایان شـایەتیی فـەزڵ و لەپێشبوونیان بۆ داوە، بەشێوەیەك قازی بورهانەدین ئـەلزەرعی گوتویـەتی، لـەژێر بنمیچی ئاسماندا لەو زاناتر نیە.

لای ئیبن تەیمیەی مامۆستای خوێندویـەتی و زۆر شـتی لـێ وەرگرتـوە، زۆر پێـی سەرسام بووە بەشـێوەیەك بـە گـەورەترین پشـتیوان و شـوێنپێ هـەڵگرانی دراوەتـە قەڵەم. لەگەڵ ئەوەیشدا لە لێکۆڵینەوە و داناندا رێبازی سـەربەخۆی خـۆی هـەبووە ، کە دەکرێ بەم شێوەیە کورتی بکەینەوە:

أ- زۆر بەکارهێنانی بەڵگەی نەقلی و ئەقڵی.

---

[1] ابن تیمیة، مامۆستا أبي زهرة ل ٢١٨ و پاشتر.

[2] زەرع گوندێکە لە حوران لە سوریا.

[3] قوتابخانەیەکە (محي الدین بن الحافظ أبي الفرج بن الجوزي) لە دیمەشق دروستی کردوە.

ب- خستنەڕووی ڕای شەرعزان لە مەسەلەکەدا، پاشان هەڵبژاردن لەنێوانیاندا یان ڕای مامناوەند.

ج- هێنانی بەڵگەکان بەو شێوەیەی دەیبینێ پاشان هێنانی بەڵگەکانی نەیاران و پوچاندنەوەیان.

د- وازنەهێنان تەنها بە هێنانەوەی بەڵگە لە ئایەت، بەڵکو فەرموودەی پێغەمبەریشی لەگەڵ دێنێ. پێی وایە سوننە هەندێ حوکمی زیاد لە قورئان دێنێ وەك میراتبردنی داپیرە.

هـ- خستنەڕووی دەقەکان و پاشان هەڵێنجان لێیان، هەندێ جار بەبێ باسکردنی ڕای شەرعزان.

و- دەمارگیرنەبوونی بۆ مەزەبێکی دیاریکراو، خولگەی ئامانجەکانی بانگەواز بۆ ئیجتیهاد و وەلاخستنی لاساییەکردنەوە بووە.[1]

٥- ئیمام جەعفەری سادق (٨٠-١٤٨ ك):

ئەبو عەبدوڵا جەعفەر ئەلصادق کوڕی محەمەد ئەلباقر کوڕی عەلی زەین ئەلعابدین کوڕی ئەلحوسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (ڕەزای خوای لێبێ). بە گەورەترین ئیمامانی شیعەی دوازدە ئیمامی لە سەردەمی تابیعی تابیعین دادەنرێ، لە ساداتی ئەهلی بەیت بوو و لەبەر ڕاستگۆیی نازناوی ڕاستگۆ (الصادق)ی لێنرابوو.

لە باوك و دایکێکی ڕێزدار لەدایك بووە، ئەوانیش محەمەد ئەلباقر و وەفرەی کچی ئەلقاسم کچی محەمەد کچی ئەبوبەکری سدیقن، لە ماڵی شکۆ و زانستدا گەورە بوو و لە بەدواداچوونی زانست بەردەوام بوو تا زانستی سوننە و فیقهی بەدەست هێنا، بایەخی بە زانینی ڕای شەرعزان بە جیاوازی ڕێبازەکانیانەوە دەدا تا ڕێبازی ڕاستیان لەنێودا هەڵبژێرێ. هاوسەردەمی ژمارەیەکی زۆر لە تابیعین بووە. لە ئیمامە

---

[1] بڕوانە: ابن قيم الجوزية دكتور عبدالعظيم عبدالسلام ل٤٨٢ و پاشتر.

مەعسومەکانە لای شیعەی ئیمامی کە گەورەترین فیرقەی شیعەن و مەنهەجێکی تایبەت و ڕێڕەوێکی دیاریکراو و فیقهێکی جیاوازیان لە هەندێ ڕووەوە هەیە.

بنەماکانی هەڵێنجان لای مەزهەبی ئیمامی:

پشت بە سەرچاوە ئەسڵیەکان دەبەستن کە بریتین لە قورئان، هەروەها سوننە کە —لە دیدی ئەواندا— بریتییە لە فەرمان و قەدەغە و کردەوە و تەقریرەکانی مەعسوم، کە ئەوەی لە پێغەمبەر و ئیمامە مەعسومەکانەوە لەبارەی یاسادانانەوە دەرچووە دەگرێتەوە. هەروەها پشت بە سەرچاوە پاشکۆ واتە تەبەعیەکانیش دەبەستن کە بریتین لە:

أ- کۆدەنگی (ئیجماع): گوتویانە ئەگەر سەرجەم شەرعزان لەسەر فتوایەك کۆك بوون پێویستە وەربگیرێ، ئەویش یان لەبەرئەوەی ئوممەت لەسەر هەڵە کۆنابێتەوە —کە ئەوە رای جمهورە—، یان لەبەرئەوەی قسەی مەعسوم ئاشکرا دەکا، کە ئەوە رای ئیمامییە.

ب- ئەقڵ: ئەمەیش سەرچاوەیەکە پێویستە دەستی بۆ ببرێ و کاری پێ بکرێ بەو شێوەیەی بنەما کرداریەکان دەیخوازن، ئەویش لە بارێکدا نە دەق هەبێ و نە ئیجماع.

ترۆکی گشتیی فیقهەکەیان:

مەزەبی ئیمامی لەسەر ڕێڕەوێ:ی فیهقیی یەکگرتوو ڕێك نەکەوتوە، بەڵکو لە سەردەمێکی کۆنەوە ناکۆکی کەوتۆتە نێوانیان و بۆ ئیخباری و ئوسوڵیەکان دابەش بوون و هەریەکەیان مەنهەجێکی تایبەتی هەیە.

لە بنەماکانی ئیخباریەکان: داکۆکی لە عیسمەتی ئیمامەکان (واتە: پارێزراوییان لە گوناە و تاوانە-وەرگێڕ)، هەروەها بەوەی عەلی کە وەصیی پێغەمبەری خوایە دیار و نادیاری شەریعەتی فێر کراوە، ئەویش فێری ئەو ئیمامانەی کردوە کە پاش ئەو هاتوون.

بەم پێیە بەلای ئەوانەوە قسەی ئیمامەکان وەك دەقەکانی شەرعدانەر وان، حوکمەکان بە ئیجتیهاد بە را بەدەست نایەن بەڵکو لەڕێی ئیمامی مەعسومەوە بەدەست دێن. پشت تەنها بە فەرموودەناسانی خۆیان و کتێبەکانی کلێنی و صەدوق و توسی دەبەستن، کە بەلایانەوە وەك کتێبە (صحيح)ەکانن بەلای ئەهلی سوننەوە، ئەو کتێبانەیش بریتین لە:

– کتێبی (الكافي)ی (محمد بن يعقوب بن إسحاق الكليني)، شێخی شیعەی ئیمامی، (١٦٠٩٩) حەدیسی تێدایە هەرهەموویان لە ڕێگەی ئالی بەیتەوە.

– کتێبی (من لا يحضره الفقيه)ی (أبي جعفر محمد بن علي بن الحسين بن موسى بن بابويه).

– هەردوو کتێبی (التهذيب والاستبصار)ی (محمد بن الحسن الطوسي).

ئیخباریەکان پێیان وایە دەستگرتن بەو حەدیسانەی لەناو ئەو کتێبانەدان بەسە، لەبەرئەوەی گومانبڕ (قەتعی)ن، یان لانیکەم لە جێمتمانەییدا گەیشتوونەتە ئاستێك دڵنیایی دروست دەکەن و هەرهەموویان حوججەن.

هەرچی ئوسولیەکانن: ڕێبازیان وایە نابێ پشت بەو هەواڵانەی ناو ئەو چوار کتێبە ببەسترێ تا حەدیسەکانی یەك بەیەك لەڕووی دیلالەت و سەنەدەوە نەپشکنرێن، لەبەرئەوەی زۆربەیان لەڕووی سەنەدەوە ناگومانبڕن و لە ئاستدا جیاوازن، سەحیح و حەسەن و مەوسوق و لاواز و مورسەلیان تێدایە، هەر شتێکیش وابێ گومانگر (ظني)ـە.

لەم خستنەڕووەوە بەو ئەنجامە دەگەین کە ڕێبازی ئیخباریەکان لە دوو شتی جەوهەریدا لە هی ئوسولیەکان جیاوازە:

یەکێکیان ئەوەیە ئیخباریەکان هەرچی لەو چوار کتێبەدایە بەبێ تەتەڵەدان وەردەگرن، بەڵام ئوسولیەکان بەپێویستی دەزانن ئەوەی دەکرێ وەربگیرێ لەوەی ناکرێ وەربگیرێ جیا بکرێتەوە، لەبەرئەوەی هی لاواز ڕەتکراوەیە و پێویستە لە

حەڵاڵ و حەرامکردندا دەست شل نەکرێ، هەروەها لەبەرئەوەی ئەسڵ بێتاوانی و ڕێپێدانە تا بەڵگەی تەکلیف پەیدا دەبێ، بە داوای کردن یان نەکردن.

دووەمیان ئەوەیە ئیخبارییەکان لاسایی ئیمامەکان دەکەنەوە و ئیجتیهاد ناکەن و ئەگەر دەقێکیان لە هەواڵ (ئەخبار) نەبینیەوە رادەوەستن، چونکە ئەوەی تێدایە تەواوە و زیادەی پێویست نیە، لەبەرئەوەی حوکمی هەموو پێویستیەکی مرۆڤایەتی تێدایە، بەپێچەوانەی ئوسوڵیەکان کە بەپێویستی دەبینن ئیجتیهاد بکرێ، لەبەر ئەوەی ئەو هەواڵانە بەس نین.

بەڵام هەردوولا کۆکن لەسەر ئەوەی هەرچی لە ئیمامەکانەوە هاتبێ بەتایبەت لە جەعفەری سادق و باوکیەوە، حوججەیە و ڕاڤەکاری قورئانە، بەشێوەیەك گشتی (عموم)ی قورئان تایبەت (واتە تخصیص) و رەها (مطلق)ی سنووردار یاخود بەند (تقیید) دەکا، ئەویش بەگوێرەی ویسایەی ئیمامەت.[1]

لەگەڵ ئەوەیشدا فیقهی ئیمامی لە سەدەی سێیەمی کۆچیەوە دەستی بە پەرەسەندن کردوە، بەهۆی بەردەوامی ئیجتیهادەوە فیقهێکی شێلگیر و بزۆزە.

**٦- ئیمام زەید (٨٠-١٢٢ ك):**

زەیدی کوڕی عەلی زەینولعابدین کوڕی حوسێن کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبە و دامەزرێنەری مەزەبی زەیدییە.

لە ماڵی پێغەمبەرایەتیدا و لە دایك و باوکێکی ڕێزدار و لە خێزانێکدا کە بەیەداخی شەریعەت و تەقوا و چاکەی هەڵگرتوە، لەدایك بووە. زانیاریەکانی لە باوکی و محەمەد باقری برای و عەبدوڵا بن حسێن و زۆر لە تابیعیەکانەوە وەرگرتوە، پاش گەورەبوونی

---

[1] بڕوانە: مقدمة شرح ديوان الشريف المرتضي للصفار ص٧٢– ٧٣.
مبادئ الوصول إلى علم الأصول للحلي ص١٩٠.
الإمام الصادق لأبي زهرة ص٢٦٠ و پاشتر.

بەدوای زانستدا گەڕاوە و چاوی بە (واصل بن عطاء) کەوتوە و مـەزەبی موعتەزیلـەی لەگەڵ تاوتوێ کردوە. لە سەردەمی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکدا لە کوفـە بەیعـەتی پێ دراوە کە ئەمیری کوفە یوسفی سەقەفی بوو، لەگەڵ زەید و هاوەڵانی شەڕی کـرد تا زەید شەهید بوو و شەو ئەسپەردەی خاك کرا.

فیقهی زەیدی هەر فیقهی ئیمام زەید نیە بەتەنها، بەڵکو تێکەڵەیەکە لە فیهی ئـەو و فیقهی قوتابیەکانی کە پاش ئەو هاتن لە گەورە پیاوانی ئالی بەیت لەوانەی سەر بەم مەزەبەن وەك (الرسی) و (الهادي) و (الناصر).

ئیمام زەید ڕێچکەیەکی سەربەخۆی لـە فیقـە و هەڵێنجانـدا نـەبوو، ئـەو ڕێبـازەی لەسەری دەڕۆیشت زۆر دوور نەبوو لە ڕێبـازی ئـەو ئیمامانـەی هاوسـەردەمیان بـووە وەك ئەبوحەنیفە و ئیبن ئەبی لەیلا و هیتر لـە پێشـەوایانی فیقـە و حـەدیس، کـە لـە مەدینە یان لە عێراق ژیاون.

### بنەماکانی هەڵێنجان لای زەیدییە:

١- دەستگرتن بە کتێبی خواوە.

٢- سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ).

٣- کۆدەنگی: لای ئەوان ئیجماع حەوت پلەی هەیە: بەرزترینیان ئەوەیە پێشـینان و پاشـینان (سـەلەف و خەلـەف) لەسـەری کـۆك بـن و نـەزانراوە نـاکۆکی تێـدا بوویێ، لای خواریشی ئەوەیە خەڵکی سەردەم لەسەری کـۆك بـن، یـەك دوانێـك نەبێ.

٤- قیاس: کە بەلایانەوە ئیستیحسان و (مەساڵیحی مورسەلە) دەگرێتەوە.

٥- ئەقڵ: زەیدی بەباشدانان و بەدزێودانانی ئەقڵی لەبەرچاو دەگرن، ئەوەی ئـەقڵ بە باشی دابنێ خوازراو دەبێ، ئەوەیش بە دزێوی دابنێ نەهیلێکراو دەبێ، ئەمە ئەگـەر شـتێك نـەبوو بکرێتـە بەڵگـە لەسـەر شـتێکیتر. بـەم پێیـە ئوسـوڵی

هەڵێنجانیان بەئیجمال پێنج و بەتەفسیل حەوتن.[1]

مۆرکی گشتیی فیقهی زەیدی:

فیقهی زەیدی بەم تایبەتمەندیانە جیادەکرێتەوە:

أ- زەیدی کوڕی عەلی فیقهەکەی لەسەر حەدیس و لەسەر را دامەزراند، لە حەدیسیشدا تەنها پشتی بە ریوایەتەکانی ئالی بەیت نەدەبەست، بەڵکو ریوایەتی هاوەڵانیشی قبوڵ دەکرد.

ب- شەرعزانی ئەم مەزەبە جیاواز لەوانیتر، لە مەزەبەکانیتریش هەرچی لەگەڵ لۆژیکی مەزەبەکەیان یان لەگەڵ کۆی ئەو بنەمایانەی شەرعزانی موسڵمانان پەسەندیان کردوون کۆك بێ وەریانگرتوە، ئەمەیش رۆڵێکی گەورەی هەبووە لە فراوانبوونی ئەو مەزەبەدا.

ج- شەرعزانی زەیدی دەستیان گرت بە بنەمای کردنەوەی دەرگای ئیجتیهاد و هەنگاونان شانبەشانی رووداوەکان و پێشکەشکردنی چارەسەر بۆیان بەو شێوەیەی لەگەڵ رۆحی شەریعەتدا بگونجێ.

د- کاتێ پێشەوایانی ئالی بەیت بۆ هەڵاتن لە چەوساندنەوەی عەباسی یان فاتیمی بەرهەڵدا بوون، بنەماکانی مەزەبی زەیدییان لەگەڵ خۆیان برد و ئیجتیهادیان تێدا کرد و دابونەریتی ناوخۆیی ئەو شوێنانەیان لەبەرچاو گرت کە تێیاندا نیشتەجێ دەبوون، بەوە فیقهێکی فراوانیان لەلا دروست بوو.

بەناوبانگترین شەرعزانی زەیدی پاش ئیمام زەید ئەمانەن: ئیمام (هاشم بن ابراهیم الرسي)[2] و نەوەکەی واتە ئیمام (الهادي بن يحيى بن الحسين بن القاسم)[1]، حسن بن علی[2] ئیمام (أحمد بن يحيى المرتضى).[3]

---

[1] بڕوانە: الفكر السامي ٣/٦٧ و پاشتر.

الإمام زيد لأبي زهرة ص٣٢٦، ٤١١، ٤١٥، ٤٥٧ .

[2] دامەزرێنەری قوتابخانەی قاسمی لە فیقهی زەیدیدا (لە ٢٤٢ ك مردوە).

٧- داودی زاهیری (٢٠٢-٢٧٠ ك)،

ئەبو سلێمان داود کوڕی عەلی کوڕی خەڵەف کە بە شوێنی گەورەبوون بەغدادی و بەڕەچەڵك ئەسفەهانییە و دامەزرێنەری مەزەبی زاهیرییە.

کەسێکی زاهید و زۆر بەتەقوا بوو، لای قوتابیانی شافیعی خوێندوێتی و لەسەر دەستیان پێگەیشتوە، زۆر سەرسامبووە بە شافیعی و دەمارگیر بووە بۆی. پاشتر لەگەڵ ڕێزنانی لەو پێشەوا گەورەیە وازی لە مەزەبەکەی هێناوە و مەزەبی زاهیری دامەزراندوە، سەرگەورەیی زانست بەو گەیشتووە و بووەتە پێشەوا بۆ زاهیریەکان و بە یەکێك لە سەرانی قوتابخانەی حەدیس دادەنرێ کە لەوانە بوو زۆر بەتوندی دەستی بە حەدیسەوە دەگرت و پەرگیری دەکرد لە دەستگرتن بە زاهیرەوە، وازی لە قیاس هێنا و کاری بە هۆدۆزی (تەعلیل) نەکردوە، هەر شتێ دوور و نزیك پەیوەندی بە ڕاوە هەبێ نەیکردوە، لەبەرئەوە بە ڕەوتی پێچەوانەی مەزەبی حەنەفی دادەنرێ، ئەو وەك چۆن ڕای ڕەت کردەوە، لاسایەکردنەوەیشی ڕەت کردەوە و پێی وابوو عومومیاتی دەقەکانی قورئان و سوننە وەڵامی هەموو پرسیارێکیان تێدایە.

بناغەی مەزەبەکەی کارکردنە بە زاهیری کیتاب (قورئان) و سوننە، هەروەها کارکردن بەوەی هاوەڵان ئیجماعیان لەسەری هەبووە، نەك ئیجماعی جگە لەوان.[٤]

لە درەوشاوەترین ئەو کەسایەتییە فیقهیانەی پاڵپشتی ئەم مەزەبەیان کردوە و تەلارەکەیان بەرز کردۆتەوە، ئیبن حەزمی زاهیرییە کە بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی

---

[١] لە شەڕی لەگەڵ قەرامیتەکان (٢٩٨ ك) شەهید بوو.

[٢] دامەزرێنەری قوتابخانەی ناسری لە فیقهی زەیدیدا (لە ٣٠٤ ك مردوە).

[٣] خاوەنی کتێبی: البحر الزخار الجامع لمذاهب الأمصار (لە ٨٤٠ ك مردوە).

[٤] بڕوانە: الأعلام للزركلي ٨/٣

الفكر السامي ٢٣/٢ و پاشتر.

مقدمة ابن خلدون ص٣٧٢ .

تأريخ بغداد للخطيب البغدادي ٣٧٠/٨ و پاشتر.

مەزەبی زاهیری دادەنرێ، لەبەرئەوە هەندێ بەجیا قسەی لەبارەوە دەکەین.

### ئیبن حەزمی زاهیری (٣٨٤-٤٥٦ ك):

ناوی عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی حەزمە و نازناوی ئەبومحەمەدە، لە قورتوبە لە ئەندەلوس لەدایك بووە، لە سەردەمی ئەلموستەزهیر عەبدوڕەحمان بن هاشمدا (٤١٤ ك) وەزارەتی وەرگرتوە، لە بنەماڵەیەکی پایەدار بووە لە حوکمی ئەندەلولس. هەر لە منداڵیەوە رووی لە زانست کردوە، سەرەتا رووی کردۆتە فیقهی مالیك کاتێ مەزەبی باو بووە لە ئەندەلوس، پاشان مەزەبی شافیعی خوێندوە و دواجاریش رێچکەی پێشەوا داودی زاهیری وەرگرتوە لە بانگەشە بۆ دەستگرتن بە دەق و بەبەتاڵدانانی قیاس، پاشان لە بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندندا سەربەخۆیی وەرگرت.

چەند فاکتەرێك رۆڵیان لە پێکهاتنی کەسایەتیی ئیبن حەزمدا هەبووە، گرنگترینیان: بەهرە شەخسیەکانی، لەپێشیانەوە مێشکە بەهێزەکەی لە لەبەرکردن و ئیستیعابی جۆرەکانی زانست و ئەسەری هاوەڵان و تابیعین، ئەمە لەپاڵ کاریگەریی ئەو ژینگەیەی تێیدا ژیاوە و ئەو مامۆستایانەی ئاراستەیان کردوە.[1]

### مۆرکی گشتی فیقهی زاهیری:

فیقهی زاهیری بەم تایبەتمەندیانە جیادەکرێتەوە:

١- فیقهی دەقە بەگشتی و فیقهی حەدیس بەتایبەتی.

٢- پشتبەستنی ئەم فیقهە تەنیا بە هەندێ بنەما بۆ ئەحکام و کارنەکردنی بە قیاس و کۆدەنگیی دەرەوەی هاوەڵان و باقیی سەرچاوە تەبەعیەکان، بووەتە مایەی زەحمەت و تەنگەبەری لە زۆر مامەڵەدا کە خەڵك پێویستیانە.[2]

---

[1] بروانە: ترجمة ابن حزم في الإحكام في أصول الأحكام لأبن حزم الظاهري ١١٧١/٧ .
ابن حزم لأبي زهرة ص٦٦ و پاشتر.

[2] بروانە: الفكر السامي للحجوي ٤٦/١ .

٣– ئەم فیقهە بەپێچەوانەی فیقهی حەنبەلیەکان هەر گرێبەند و مەرجێك بە بەتاڵ دادەنێ کە بە دەق یان ئیجماع جێگیر نەکرابێ، ئەویش بەپشتبەستن بە هەندێ بەڵگە لەوانەئەوەی پێغەمبەر فەرمویەتی: مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ.[1] (واتە: ئەوەی کارێك بکا فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ رەتکراوەیە).

**٨- ئیمام جابری ئیبازی (٢١-٩٣ ك):**

ئیمام جابر کوڕی زەیدی ئەزدییە ئیبازی دامەزرێنەری مەزەبی ئیبازییە کە لە کۆنترین مەزەبەکانە. بەئەسڵ عومانی و یەکێکە لە گەورە تابیعیەکان، لە بەسرە ژیاوە و بە یاوەریکردنی هەندێ لە گەورە هاوەڵان ناسراوە لەوانە عەبدوڵای کوڕی عەباس، ئەنەسی کوڕی بن مالیك خزمەتکاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) و عەبدوڵای کوڕی عومەر.

ئیبازیەت گرووپێکن لە میانڕەوانی خەواریج و لە هەموویان لە جمهور نزیکترن کە بۆچون و بیرکردنەوەی میانڕەوانەیە. لە ناوی عبدالله بن أباض التميمي–ەوە ناونراوە ئیبازی، وەك نرخاندنێك بە رۆڵی لە پەرەپێدانیدا، کە ئەو تۆماری کرد و بناغەکانی دانا، لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا ژیاوە، تا ئەمڕۆیش هەندێ ئیبازی لە عومان و جەزائیر و زەنجبار هەن.

سەرچاوەکانی هەڵێنجان لای ئیبازی هەمان سەرچاوە موعتەبەرەکانن لای زۆر لە مەزەبە ئیسلامیەکان، لە قورئان و سوننە و ئیستیدلال کە ئیستیصحابیش دەگرێتەوە، مەسالیحی مورسەلە و ئیستیحسان، ئیجماع نەبێ.[2]

---

[1] حەدیسەکە بوخاری ١٧/٢ ریوایەتی کردوە، دار قوتنی هێناویتی ٢٢٧/٤، هەروەها موسلیم ریوایەتی کردوە و ئەحمەدیش لە مەسنەدەکەیدا لە عائیشەوە هێناویتی.

[2] بڕوانە: طلعت الشمس للسالمي الأباضي ١٩/١– ٢٠.

الموسوعة العربية الميسرة ص١ .

لەنێو زانایانی ئەم مەزەبە هەریەك لە (محمد بن يوسف بن أطفيش)[1] (صالح بن علي بن ناصر)[2] و (عبدالله بن حميد بن سلوم السالمي)[3] بەناوبانگن.

**ئەنجامگیری:**

لەم خستنەڕووە بەو ئەنجامە دەگەین کە شەرعزان لە بنەماکانی هەڵێنجان و لە وەرگرتنی سەرچاوە تەبەعیەکان و هەروەها لە ڕێڕەوی فیقهیدا، جیاوازییان تێکەوتوە.

ئەگەر ئەوەیشی بخەینە سەر کە جیاوازیی زانایان لە ئوسوڵناس و شەرعزان لە ڕێسا ئوسوڵی و زمانەوانیەکاندا، وەك لە کتێبەکانی ئوسوڵی مەزەبە جیاوازەکاندا روون کراوەتەوە، بۆمان دەردەکەوێ هۆ سەرەکیەکانی جیاوازی دەبن بە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم: ئەوەی پەیوەندی بە سەرچاوە ئەسڵیەکانەوە هەیە (کیتاب و سوننە).

بەشی دووەم: ئەوەی پەیوەندی بە سەرچاوە تەبەعیەکانەوە هەیە (ئیجماع و قیاس و قسەی هاوەڵ و ئیستیصحاب و مەساڵیحی مورسەلە و ئیستیحسان و سەدی زەرایع و عورف و هیتر).

بەشی یەکەم دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: کیتاب و سوننە تێیدا بەشدارن ئەویش جیاوازییە لە ڕێسا ئوسوڵی و زمانەوانیەکاندا.

---

[1] خاوەنی: شرح النيل وشفاء العليل، لە فیقهی ئیبازیدا.

[2] (لە ١٣١٤ ك مردوە).

[3] ناسراو بە عبده الضرير (لە ١٣٣٢ ك مردوە).

جۆری دووەم: تایبەتە بە سوننە، ئەویش جیاوازییە لە زانینی حەدیس، یان متمانە پێ بوونی، یاخود کارپێکردنی لەژێر هەندێ مەرجی دیاریکراودا، یان تێکگیران (تعارض)ی نێوان حەدیسەکان و نەهێشتنی ئەو تێکگیرانە.

شێوەی زەبتکردن: ناکۆکی یان پەیوەندی بە دەقەکانەوە هەیە یان بە غەیری دەقەکانەوە.

یەکەمیان: یان کیتاب و سوننە تێیدا بەشدارن –کە جیاوازییە لە ڕێسا ئوسوڵی و زمانەوانیەکاندا– یان نا، کە ئەوە ناکۆکییە سەبارەت بە سوننە.[1]

دووەم: ناکۆکییە لەبارەی ئیجتیهادکردن بە را لەوەی دەقی تێدا نیە، لەڕێی کارکردن بە سەرچاوەیەك لە سەرچاوە پاشکۆ (تبعی)یەکان.

سەرجەم وردە هۆکانی جیاوازیی شەرعزان دەچنە ژێر خانەی ئەم شتە هەمەکییانە.

لەم ڕوانگەوە بابەتەکە لەرووی فۆرمەوە بەسەر چوار دەروازە (باب)دا دابەش دەکەین:

دەروازەی یەکەم تەرخان دەکەین بۆ جیاوازیی شەرعزان لە ئەحکامدا بەپێی جیاوازییان لە ڕێسا ئوسوڵی و زمانەوانیەکاندا.

لە دەروازەی دووەمدا باسی جیاوازی لە ئەحکامدا دەکەین بەهۆی جیاوازی لە سوننەدا.

لە دەروازەی سێیەمدا جیاوازیی هاوەڵان و شوێنکەوتوان لە ئەحکامدا بەهۆی جیاوازییان لە ئیجتیهادکردن بە را، ڕوون دەکەینەوە.

لە دەروازەی چوارەمدا لە جیاوازیی پێشەوایانی مەزەبەکان بەهۆی جیاوازییان لە کارکردن بەسەرچاوە پاشکۆکان دەکۆڵینەوە.

---

[1] ئەگەر بوترێ لەتی دووەم قورئان دەگرێتەوە نەك سوننەیش، دەڵێین شەرعزان سەبارەت بە کارکردن بە قورئانی پیرۆز ناکۆکییان نیە تەنها لە ڕێسا ئوسوڵی و زمانەوانیەکاندا نەبێ.

# دەروازەی یەکەم

## جیاوازیی ئەحکام بەگوێرەی جیاوازی لە ڕێسا ئوسوڵی و زمانەوانیەکاندا

دەروازی یەکەم باس لەو جیاوازیەي شەرعزانان دەکا کە زادەی جیاوازییانە لە ڕێسا ئوسوڵی و زمانەوانیەکاندا لەڕووی دانانی وشە (لەفز) بۆ ماناکانیان و چۆنێتیي ئاماژەکردنیان بۆ حوکمەکان، ڕوونی و شاراوەیي ئاماژە، هەروەها لەڕووی بەکارهێنانی لەفزەکان لە ماناکاندا، ئەویش لە پێنج بەشدا .

# بەشی یەکەم:
# لەفز بە لەبەرچاوگرتنی دۆخەکەی تایبەت، یان گشتی، یان هاوبەشە

لەبەرئەوەی لەفز ئەگەر بۆ یەك مانا دانرا، ئەوا یان بەتەنها دەبێ یان بە هاوبەشی لەنێو تاکەکاندا، یەکەمیان تایبەت و دووەمیان گشتییە. ئەگەر بۆ زیاتر لە مانایەك دانرا، یان بە یەك دۆخ دەبێ یان هەر مانایەك بەتەنها دۆخێکی سەربەخۆی دەبێ. بە ئیعتیباری یەکەم مەعنەوی و بە ئیعتیباری دووەم هاوبەشێکی لەفزییە.[1]

لەسەر ئەم بنچینەیە بەشەکە لەڕووی فۆرمەوە بۆ سێ باس دابەش دەبێ:

---

[1] بڕوانە: مشكاة الأنوار في اصول المنار للعلاّمة زين الدين بن ابراهيم الشهير بابن نجيم. ط/١٣٥٥هـ ١٤/١

## باسی یەکەم:
## تایبەت

لێکۆڵینەوە لە تایبەت لەڕووی حەقیقەتی، دیلالەتی و، جۆرەکانی لە فەرمان و نەهی و رەها (موتڵەق) و بەن (موقەیەد)ەوە، چوار خواست لەخۆ دەگرێ:

### خواستی یەکەم:
### تایبەت، دیلالەتی، کاریگەریی لەسەر جیاوازیی شەرعزانان

### تایبەت[1]:

لەڕووی زمانەوانیەوە بەواتای تاکبوون و پچڕینی هاوبەشی دێ، لەوەوە وتراوە: (خصه بالشيء)، واتە شتێکی بەتەنها بە ئەودا نەك کەسیتر.

لەڕووی زاراوەوە: وەك ئوسولناسان پێناسەیان کردوە، هەموو لەفزێکە[2] بۆ یەك تاکە مانا دانرابێ[3] و هاوبەشی تێدا نەبێ[4]، چ بە کەس یەك بێ[1]، یان بە جۆر یەك بێ[2]، یان بە رەگەز یەك بێ[3]، یان ژمارەیەك بێ کە برەکەی دیاریکراو بێ[4].

---

[1] لەو رووەوە تایبەتە، واتە بەبێ لەبەرچاوگرتنی بەریەست و رێگرەکان وەك قەرینەی لادەر لە ویستی حەقیقەتی دەقەکە.

[2] جا چ (إسم) بێ یان (فعل) یان (حرف).

[3] دانان (الوضع) بریتییە لە تایبەتکردنی لەفزەکە بەرانبەر ماناکە چ لەڕووی زمان، یان عورف، یان شەرع یان یاساوە.

[4] أصول البزدوي مع كشف الأسرار ١/٣٠.

دیلالەتی،

پاش گەڕان و سەرپێو (ئیستیقرا)یێکی تەواو، رای جمهوری زانایان لە ئوسولّی و شەرعزان لەسەر ئەوە جێگیر بووە کە دیلالەتی تایبەت (الخاص) بۆ مەدلولەکەی گومانبڕ (قەتعی)یە، جا یەقین دروست دەبێ لەو حوکمەی مەبەستە و بەبەلگە نەبێ لەو مانایەوە بۆ مانایەکیتر ناگوێزرێتەوە.

بەزدەوی[5] دەلّێ: "لەفزی تایبەت بە قەتعی و یەقینی و بەبێ گومان باس لە تایبەتکراو بەو حوکمەی بۆی ویستراوە دەکا، تایبەت لە ئەسلّی دانانیدا لەمە بەدەر نیە، با لە ئەسلّی دانانەکەی دا ئەگەری گۆڕینیشی هەبێ، بەلاّم ئەگەری دەستکاریکردنی بە رێگەی روونکردنەوەی نیە، لەبەرئەوەی رۆشنە کە بۆچی دانراوە"[6].

سەرخەسی[7] دەلّێ: "حوکمی تایبەت بریتییە لە زانینی مەبەست لە لەفزەکە و پێویستیی کارپێکردنی لەوەی لە زمان دا[8] بۆی دانراوە، هیچ تایبەتێك لەوە بەدەر نیە، ئەگەرچی رێی تێدەچێ لە باری پەیدابوونی بەلّگەدا لەفز لە بابەتەکەی بگۆڕێ و ببێتە مانای مەجازی بۆی، بەلاّم ئەگەری ئەوە نیە بەمەبەستی روونکردنەوە دەستکاری بکرێ، لەبەرئەوەی خۆی لە خۆیدا روونە و بەبێ هیچ گومانێك ئەو کارە دەکا کە بۆی دانراوە"[9].

---

[1] کاسماء الأعلام.

[2] وەك لەفزی (القتل) کە بۆ دەرکردنی گیان دانراوە و جۆرێکە لە جۆرەکانی تاوان.

[3] وەك لەفزی (الجريمة) کە رەگەزێکە جۆرەکانی تاوان دەچنە ژێر خانەی.

[4] وەك لەفزی (مائة) لە ئایەتی: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ﴾(النور:٢).

[5] فخر الإسلام على بن محمد البزدوي (ت– ٤٨٣هـ).

[6] الأصول للبزدوي مع شرحه كشف الأسرار لعبدالعزيز (ت– ٧٣٠ هـ).

[7] أبوبكر محمد بن أحمد بن أبي سهل السرخسي (ت– ٤٩٠هـ).

[8] هەروەها لەڕووی عورف و شەرع و یاساوە.

[9] أصول السرخسي ١٢٨/١.

پوختەی قسە ئەوەیە: سوودی لەفزی تایبەت، بەبێ بەربەست و رێگرەکان، وەك ئەو قەرینەیەی وا دەکا مەبەست لە لەفزەکە مانا راستەقینەکەی نەبێ، بە باسکردنی مەدلولەکەیەتی بەشێوەیەك ویستنی شتێکیتر جگە لەو مانایە نەهێڵێ. هەروەها روونکردنەوە و راڤەکردن هەڵناگرێ لەبەرئەوەی خۆی لە خۆیدا روونە. کەواتە شیمانە (ئیحتیمال) سیفەتی لەفزە، ئەویش دەستدانیەتی بۆ ئەوەی جگە لەو مەبەستە بگەیەنێ کە بۆی دانراوە، واتە دیلالەتی تایبەت بۆ تایبەتکراو بە ئیعتیباری ئەسڵی دانانەکەیە نەك بە ئیعتیباری حەقیقەت و مەجاز، لەبەرئەوەی هەردووکیان لە بابی بەکارهێنانن، تایبەتکردنیش لە بابی دانانە (الوضع)، دانانیش لە پێش بەکارهێنانەوەیە.

حوکمی تایبەت:

وتمان رای جمهور لەسەر ئەوە گیرساوەتەوە کە تایبەت (الخاص) بەشێوەیەکی گومانبڕ مەدلولەکەی دەگەیەنێ، بەڵام ناکۆکیەك لەم ئەسڵەدا هەیە، لەم روانەوە:

أ- جیاڕایی لە ساغبوونەوەی گومانبڕی (القطعیة)دا: هەندێ لە ئوسوڵناس و شەرعزان -وەك شێخانی سەرمەقەند و هاوەڵانی شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ)- وتویانە: "حوکمی گومانبڕ بە تایبەت جێگیر نابێ، لەبەر بوونی شیمانەی مەجاز، لەگەڵ شیمانەیشدا چاوەڕوانی گومانبڕی ناکرێ".[1]

ب- جیاڕایی لە دانانی ئەسڵی لەفزەکە لە تایبەت یان گشتی، یان لە هاوبەش... یان هیتر.

[1] وەڵامی ئەوە دەدەمەوە بەوەی ئەو شیمانەیەی لە بەڵگەوە پەیدا نەبووە (وەك قەرینەیەکی رێگرە لە ویستنی ئەوەی بۆی دانراوە)، وەك نەبوو (مەعدوم) وایە و رێگە لە گومانبڕی ناگرێ.
بڕوانە: تسهيل الوصول إلى علم الأصول للشيخ محمد عبدالرحمن المحلاوي، مطبعة الحلبي ١٣٤١هـ ل٢٧٢.

ج– جیاوازیی لەوەی ئاخۆ ئەو حوکمەی بۆ مەدلولی دەقی تایبەت زیاد دەکرێ بە نەسخ دادەنرێ، کە بە بەڵگەی گومانگر (دلیل ظني) ، وەك حەدیسی تاکینە (ئاحاد) یان بە رای موجتەهید، نابێ.

شایانی باسە ئوسولناس و شەرعزان ناکۆکییان نیە لەوەی زیادکردن بۆ دەق ئەگەر حوکمێکی سەربەخۆ بوو نەك تەواوکەری ئەو حوکمەی دەقە تایبەتەکە دیلالەتی بۆ دەکا، بە نەسخ بۆ حوکمی بۆ زیادکراوەکە دانانرێ، لەبەرئەوە زیادە حوکمێکە لە شەرعدا بەبێ گۆڕینی یەکەم.[1]

هەروەها ناکۆکی نیە لەوەی زیادە بۆ ئەحکام و مافەکانی خوا لە عیبادەت، یان سزا یان کەفارەت بە نەسخ دادەنرێ، لەبەرئەوەی بە بەش بەش ئەنجام نادرێت، بۆ نموونە یەك رکات لە نوێژی بەیانی پێی ناوترێ نوێژ، هەروەها نەوەد و نۆ جەڵدیش لە تاوانی زینادا پێی ناوترێ حەد.

بەپێچەوانەشەوە مافەکانی مەردم، دەکرێ بەش بەش بکرێت، دەکرێ خستنەپاڵی زیادە پەسەندکردنی بۆزیادکراوەکە بێ.[2]

بەڵام لە جگە لەوانەدا جیاوازن، کە چەند رایەکیان هەیە گرنگترینیان سیانن:

**یەکەم: زیادە بەرەهایی نەسخە:**

ئەمە رای حەنەفی و هاوڕاکانیانە. سەرخەسی دەڵێ: "زیادکردن بۆ دەق: بەلای ئێمەوە رونکردنەوەی وێنە و نەسخی مانایە، جا چ زیادەکە لە هۆدا بێ یان لە حوکمدا. لەسەر قسەی شافیعی ئەوە وەك تایبەتکردنی گشتییە (تخصیص العام) و مانای نەسخی تێدا نیە، هەتا پێی وایە ئەوە بە هەواڵی ئاحاد و پێوانەش دەکرێ".[3]

---

[1] بڕوانە: کشف الأسرار لعبدالعزیز البخاري، سەرچاوەی پێشوو ٣/٩١١.

[2] أصول السرخسي ٢/٨٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

بەڵگەیشـیان ئەوەیـە نەسـخ ڕاگەیانـدنی کۆتاهـاتنی حوکمێـك و سـەرەتای حوکمێکیترە. دەقی ڕەهایش پێویستە بەڕەهاییەکەی کاری پێبکرێ، ئەگەر بوو بە بەنـد (مقیـد) دەگـۆڕێ بـۆ شـتێکیتر، لەبەرئـەوەی (ئیـتلاق و تەقییـد) دوو دژن و کۆنابنەوە، جا ئەگـەر ئەمـە یەکـەمیان نـەبێ ئـەوا پێویسـتە بـوترێ یەکـەم کۆتـایی هاتووە و دووەم دەستی پێکردوە.[1]

**دووەم: زیادە بەهیچ شێوەیەك نەسخ نیە:**

ئەمە بۆچوونی مەزەبەکانی مالیکی و جەعفەری و شافیعی و حەنبـەلی، هـەروەها هەنـدێ موعتـەزیلەیشـە وەك جـەبائی و ئـەبو هاشـم، لەبەرئـەوەی نەسـخ لەڕاسـتیدا گـۆڕین و نەهێشـتنی حـوکمی گوتـارە، زیـادەیش ئیقرارکردنـی حـوکمێکی ڕەوا و زیـادکردنی شـتێکیترە بـۆی، ئەمـەیش زۆر لـە زیـادکردنی فـەرمانکردن بـە ڕۆژوو بـۆ فەرمانکردن بۆ نوێژ دەچێ.

**سێیەم: وردکردنەوە (التفصيل)، بەم شێوەیەی خوارەوە:**

أ- هەنـدێ گوتویانـە: ئەگـەر زیادەکـە شـتێکیتری دەگەیانـد جیـاواز لـە مانـای پێچـەوانە (مـەفهوم موخالەفـە)ی دەقـە تایبەتەکـە، دەبێتـە نەسـخ، وەك واجیبوونی زەکات لە مـەڕی ئالیکـداروداً، کـە بەپێچـەوانەی دیلالـەتی ئەوەیـە پێغەمبـەر (ﷺ) ئەفـەرموێ: ((في الغـنم السـائمة زكـاة)).[2] (واتـە مـاڵاتی ئالیکنەدراو زەکاتی دەکـەوێ)، ئـەوەی لـەڕێی مانـای پێچـەوانەی ئـەو دەقـە زەکاتی ماڵاتی ئالیکدراوی ڕەت کردەوە، ئەگەریش زیادەکـە ئـەو جیاوازیـەی نەدەگەیاند، بە نەسخ دانانرێ.

---

[1] اصول البزدوي مع كشف الاسرار ٣/٩١٢

[2] لە لەفزەکەی بوخاریدا هاتووە: (صدقة الغنم في سائمتها) سبل السلام ٢/١٢٢

ب- کۆمەڵێ گوتویانە ئەگەر زیادەکە حوکمی بۆزیادکراوی لە ئایندەدا گۆڕی، وەك زیادکردنی دوورخستنەوە (نفی) بۆ حەد، دەبێتە نەسخ، ئەگینا نابێ، ئەوەیش ڕێبازی کەرخی و ئەبوعەبدوڵای بەصرییە لە موعتەزیلە.

ج- هەندێکیتر گوتویانە: ئەگەر زیادەکە گۆڕانێکی شەرعی زۆری لە بۆزیادکراودا دروست کرد، بەشێوەیەك وای لێهات، ئەگەر پاش زیادەکە بەگوێرەی ئەوە بکرێ کە پێش زیادەکە دەکرا، ئەوا بوونی وەك نەبوونی وایە، و پێویستە بەردەوام بێ لەسەری، ئەوا دەبێتە نەسخ، ئەگینا نابێتە نەسخ. ئەمەیش رای ڕێبازی ئەشعەری و ئیبن نەصری مالیکی و ئەلباجییە، کە لەوەدا شوێن ئیبن ئەلباقلانی کەوتون.

هەندێ لە زانایان شتیتریان گوتوە، ئەوەی زانیاریی زیاتری دەوێ با بگەڕێتەوە بۆ کتێبەکانی ئوسوڵ.

**زاڵکردن (الترجیح):**

ئەوەی من زاڵی دەکەم ئەوەیە زیادە نەسخ نیە و وەك نەسخیش نیە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

أ- ئەگەر زیادە نەسخ بوایە دروست نەبوو بە بۆزیادکراوەوە پەیوەست بکرێ، لەبەرئەوەی ناسیخ بە مەنسوخ بەراورد ناکرێ، حەنەفیەت ئەو پەیوەستکردن (اقتران)ەیان بە جائیز داناوە.

ب- زیادە نە لەڕووی زمان و نە شەرع و نە عورف و نە ئەقڵەوە نەهێشتنی بۆزیادکراو واجب ناکا، لەکاتێکدا نەسخ نەهێشتنی ئەوەیە.

ج- لە نەسخدا پێویست بە بوونی مەرجی دژیەکی و تێکگیران لەنێوان ناسیخ و مەنسوخ و نەکرانی کۆبوونەوەیان دەکا، لەکاتێکدا ئاشکرایە زیادە لەگەڵ بۆزیادکراو دژیەکی نیە و دەکرێ کۆببنەوە.

ج- ناسیخ و مەنسوخ دەبێ لە یەك بابەتدا بێ، کە مەنسوخ مانەوەی و ناسیخ نەهێشتنی دەخوازن، یان بەپێچەوانەوە، ئەمەیش لە زیادکردن بۆ دەقدا

بەدیهاتنی مومکین نیە.[1]

### کاریگەریی جیاوازی لەم ئەسڵەدا لەسەر جیاوازی لە حوکمە شەرعیەکاندا:

شتێکی سروشتییە کاریگەریی جیاوازی لەم ئەسڵە لـە ئوسـوڵی فیقهـی ئیسـلامی بەسەر هەندێ حوکمی ئیجتیهادیدا رەنگ بداتەوە، لە خوارەوە هەنـدێکیان دەخەینـە روو:

**١- شەرعزان لە حوکمی ئۆقرەیی (الطمأنینة) لە رکـوع و کڕنووشـبردنی نوێـژدا رایان جیاوازە، بەم شێوەیە:**

أ- ئەبوحەنیفە و محەمەد (رەحمەتی خوایان لێ بێ) گوتویانە ئەندازەی پێویست لە رکوع لەکاتی نوێژدا چەمانەوە و خواربوونەوەیە، لە کڕنـوش (سجدە)یشـدا ئەسڵی دانانە. بەڵام ئۆقرەیی تێیانـدا فـەرز نیـە[2]، بەڵگەیشـیان ئەوەیـە خـوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ﴾.[3]

پشتبەستن بەم ئایەتەیش وەك بەڵگە لەو رووەوەیە هەریەك لـە (رکـوع و سـجود) لەو لەفزە تایبەتانەن کە بەشێوەیەکی قەتعی ئاماژەن بۆ مانـا تایبەتـەکانیان، رکـوع بریتییە لە چەمانەوە لە دۆخـی راوەسـتانەوە و بـە کـەمترین خواربوونـەوە بەدیـدێ، لەبەرئەوە زیادکردنی سیفەتی ئۆقرەیی وەك فەرز کارکردن نیە بەوەی ئەم تایبەتـەی بۆ دانراوە، بەڵکو ئەوە زیادەیەکە بەحەدیسی تاکینـە (ئاحـاد) بـۆ مانـای ئـەو دەقـە تایبەتە زیاد دەکرێ. ئـەو زیادەیـەیش نەسـخکردنەوەی حوکمێکـە کـە بـە دەقێکـی گومانبڕ (نص قطعي) و بەڵگەیەکی گومانگر (دلیل ظني) جێگیر بووە، ئەوەیش بەبێ

---

[1] بڕوانە: أعلام الموقعين، ابن القيم ٢٨٦/٢ و پاشتر.

[2] ئەبویوسف و زەفر پێچەوانەی ئەو بوون و پێیان وایە ئۆقرەگرتن لە رکوع و سجوددا فەرزە. بڕوانـە: بـدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، للعلامة أبي بكر بن مسعود الكاساني (ت-٥٨٧هـ) مطبعـة العاصـمة/ القـاهرة/ ٣١٣/١ و پاشتر.

[3] الحج: ٧٧

دابەزاندنی پلەی قورئان بۆ پلەی حەدیسی تاکینە یان بەرزکردنەوەی ئاستی حەدیسی تاکینە بۆ ئاستی قورئان، ناکرێ. هەموو ئەوەیش بەتاڵە.

کەواتە زیادە فەرز نیە بەڵکو سوننەتە، لەڕووی کۆکردنەوەی هەردوو بەڵگەکە (قورئان و سوننە). [1]

رای ئیمام مالیك[2] و ئیمامی ئەوزاعی[3] لەگەڵ بۆچوونەکەی ئیمام ئەبوحەنیفە و ئیمام محەمەدی شەیبانیدا کۆکن.

ب- شافیعی[4] و حەنبەلی[5] و جەعفەری[6] و زاهیری[7] و زەیدیەکان[1] دەڵێن: ئۆقرەیی فەرزێکە لە فەرزەکانی نوێژ و مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ دروستیی

---

[1] بڕوانە: أصول البزدوي مع كشف الأسرار ٨١/١. أصول السرخسي ١٢٨/١. فتح الغفار بشرح المنار المعروف بمشكاة الأنوار في اصول المنار للعلامة زين الدين بن ابراهيم المعروف بإبن نجيم.. سەرچاوەی پێشوو ١٩/١.

[2] بڕوانە: الشرح الصغير مع حاشية الصاوي ١٠٧/١ تێیدا هاتووە: "فەرزی شەشەم رکوعبردنە پاش بەپێوەبوون کە هەردوو ناولەپی لە هەردوو ئەژنەکەی نزیك دەکاتەوە، رکوعی واجب چەمانەوەیە بەشێوەیەك ئەگەر هەردوو لەپی دانا بکەونە سەری هەردوو رانی، بەڵام تەختبوونی پشت سوننەتێکی زیادەیە بۆ واجبەکە وەك گرتنی ئەژنۆکان بە دەست".

[3] بڕوانە: منهب الإمام الأوزاعي، تحقيق الدكتور عبدالله الجبوري مطبعة الإرشاد ١٣٩٧هـ، ١٨٥/١ تێیدا هاتووە: مەزەبی ئیمامی ئەوزاعی ئەوەیە: ئەو ئەندازەیەی نوێژ بەبێ ئەوە ناتولو دەبێ ئەوەیە نوێژکەر رۆکعەت بیا بەشێوەیەك بە رکوعی رێك بوەستێ.. ئەلعەینی ئەوەی لێ گواستۆتەوە، هەروەها ئەبوحەنیفە و مالیکیش وایان وتوە.. لەبەرئەوەی رکوع لەڕووی زمانەوانیەوە بەمانای چەیمانەوە دێ، لەبەرئەوە واجبەکە بەلای خواری جێبەجێ دەبێ".

[4] الأنوار (٩٢/١) تێیدا هاتووە: "روکنی پێنجەم رکوعە و مەرجە ئۆقرەی تێدا بگرێ بەشێوەیەکی چەمانەوەی لە قیتبوونی جیاواز بێ ئەگەر بە ساتێکیش بێ".

[5] المغني لأبن قدامة المقدسي (٤٤٩/١) تێیدا هاتووە: پێویستە رکوعبەر هەردوو دەستی لەسەر هەردوو ئەژنۆکانی دابنێ".

[6] كتاب الخلاف للطوسي (١١٣/١) تێیدا هاتووە: " ئۆقرەگرتن روکنێکە لە روکنەکانی نوێژ".

[7] لمحلى (٢٥٥/٣) تێیدا هاتووە: "رکوع لە نوێژدا فەرزە، هەروەها ئۆقرەگرتن لە رکوعدا تا هەموو ئەندامەکانی رێك دەبن و دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دادەنێ، فەرزە".

هەریەك لە ركوع و سوژدەبردن. بەڵگەیشیان ئەوەیە یەحیا بن خەلاد لە باوكی لە ریفاعە بن رابیعی مامیەوە دەگێڕێتەوە كە گوتویەتی:

((كنت جالسا[2] عند رسول الله(ﷺ)، إذ جاء رجل فدخل المسجد فصلى، فلما قضى صلاته جاء فسلم[3] فقال له رسول الله (ﷺ): وعليك. ارجع فصل[4]، فإنك لم تُصلِّ. فرجع، فلما قضى صلاته جاء فسلم[5]، فقال رسول الله(ﷺ): وعليك[6]، ارجع فصله، فإنك لم تُصلِّ. فذكر ذلك مرتين أو ثلاثاً، فقال الرجل: أ أدري ما عتب عليّ![7] فقال النبي(ﷺ) انه: لا تتم صلاة أحدكم حتى يسبغ الوضوء كما أمره الله، ويغسل[8] وجهه ويديه الى المرفقين، ويمسح برأسه ورجليه إلى الكعبين، ثم يكبّر الله ويحمده ويمجّده ويقرأ من القرآن ما أذن الله فيه وتيسر،[9] ثم يكبّر فيرفع فيضع[10] كفيه على ركبتيه حتى تطمئن مفاصله وتسترخي[11]، ثم يقول: سمع الله لمن حمده، ويستوي قائما حتى يأخذ كل عضو[12] مأخذه ويقيم صلبه، ثم يكبّر فيسجد ويمكّن

---

[1] البحر الزخار (٢٥٣/١) تێیدا هاتووە: "الركن الخامس الركوع لقوله تعالى: ﴿أركعوا﴾ ويطمئن حتماً، وهو لبث ما بعد لنتهائه حتى يطمئن".

ومن الجدير بالذكر أن ما ورد في هذه المراجع من القول بوجوب الطمأنينة في الركوع ورد فيها أيضاً القول بوجوب الطمأنينة في السجود.

[2] لە: المستدرك والبيهقي–دا هاتووە: (أنه كان جالساً) (دانیشتبوو).

[3] لە: (المستدرك والبيهقي)دا زیادەی: (على رسول الله وعلى القوم) هەیە.

[4] لە هەردووكیاندا (فصل) بەبیٚ ها–یە.

[5] لە: البيهقي–دا زیادەی (على رسول الله وعلى القوم) هەیە.

[6] وشەی (وعليك) لەوەی بەیهەقیدا نیە.

[7] لە هەردووكیاندا (ما أدري ما عتب عليّ من صلاتي).

[8] لە هەردووكیاندا (يغسل) بەبیٚ واو.

[9] لە هەردووكیاندا بە لابردنی (وتيسر).

[10] لە هەردووكیاندا (ويضع).

[11] لە: المستدرك–دا (ويستوي)، لە: البيهقي–دا (فيستوي).

[12] لە روایەتێكدا (كل عظم).

جبهته[1] من الأرض حتى تطمئن مفاصله وتسترخي، [2] ثم يكبّر فيرفع راسه ويستوي قاعدا على مقعدته ويقيم صلبه. فوصف الصلاة هكذا حتى فرغ، ثم قال: لا تتم صلاة أحدكم حتى يفعل ذلك.[3]

(واته: لای پێغەمبەری خوا دانیشتبووم، پیاوێك هاتە مزگەوت و نوێژی کرد، کە نوێژەکەی تەواو کرد و هات و سەلامی کرد، پێغەمبەری خوا پێی وت: وعلیك، بگەڕێوە و نوێژ بکە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد. گەڕایەوە، کە نوێژەکەی تەواو کرد و هات و سەلامی کرد، پێغەمبەری خوا پێی وت: وعلیك، بگەڕێوە و نوێژ بکە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد. ئەوەی دوو یان سێ جار وتەوە، پیاوەکەیش وتی: نازانم لەبەرچی سەرکۆنە دەکرێم، پێغەمبەر وتی: نوێژی کەسێکتان تەواو نابێ تا بەو شێوەی خوا فەرمانی کردوە دەستنوێژ نەگرێ، روومەت و دەستەکانی تا ئانیشکەکانی بشوات، هەروەها دەست بە سەری و پێکانی تا قولەپێکانیدا بێنێ، پاشان تەکبیر و حەمد و سەنای خوا بکات و چەندە خوا مۆڵەتی بدات و ئاسان بێ بۆی قورئان بخوێنێ، پاشان تەکبیر بکات و بەرز بکاتەوە و هەردوو لەپی لەسەر ئەژنۆکانی دابنێ تا جومگەکانی ئۆقرە دەگرن و خاودەبنەوە، پاشان بڵێ: سمع الله لمن حمده– و راست بێتەوە تا هەموو ئەندامەکانی جێی خۆیان دەگرنەوە و رێك دەوەستێ، پاشان تەکبیر بکات و سوجدە ببا و ناوچاوانی لەسەر زەوی تەخت بکا تا جومگەکانی ئۆقرە دەگرن و خاودەبنەوە، پاشان تەکبیر بکات و سەری بەرز بکاتەوە و لەسەر قنگ دابنیشێ و رێك بێتەوە. بەم شێوەیە باسی نوێژی کرد تا تەواو بوو. پاشان گوتی: نوێژی کەستان تەواو نابێ تا وا نەکا).

---

[1] لە روایەتێکدا (وجهە).

[2] لە هەردووکیاندا (ویستوی).

[3] رواه الحاكم في المستدرك (١/ ٢٤١– ٢٤٢) ورواه ابن الجارود في المنتقى ص١٠٢– ١٠٣ عن محمد بن يحيى عن حجاج عن المنهال.

**زاڵکردن:**

بەبڕوای من ڕاست ئەوەیە جمهور بۆی چووە و پێویستە کاری پـێ بکرێ، لەبـەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

یەکەم: هەردوو مانـای (رکوع و سجود) شـەرعدانەر لـە مانـا زمانەوانیەکەیانـەوە گواستونیەتیەوە بۆ مانای شەرعی وەك باقیی ئەو زاراوە شـەرعیانەیتر کـە لـە مانا زمانەوانییـە ڕەهاکانیانـەوە بـۆ مانـا شـەرعییەکانیان گوێزراونەتـەوە، کـە بەبەنـدی زیـادە بەسـتراونەتەوە، گوێزراونەتـەوە، وەك وشـەکانی (الصـلاة، الصیام، الزکاة، الحج، الربا...).

ڕکوعبردن (الرکـوع): لـە مانـا زمانەوانیەکـەی وەرگـیراوە، کـە بریتییـە لـە تـەنها چەمانەوە، بۆ مانایەکی شەرعیی نوێ، ئەویش دانانی هـەردوو لـەپی دەسـتە لەسـەر ئەژنۆکان (گەیشتن پێیان) بەشێوەیەك جومگەکان ئۆقرە بگرن و خاوببنەوە.

کڕنووشبردن (السجود): لە دانانی ناوچاو بەرەهایی وەرگیراوە، بـۆ چەسـپکردنی ناوچاو لەسەر زەوی تا جومگەکان ئۆقرە دەگرن و خاو دەبنەوە.

بەوە ئەو دوو وشەیە لەبەر بـەکارهێنانیان بەهـەردوو مانـای ئەسـڵیی زمانـەوانی و مانـا شـەرعییە نوێکـەدا بوونەتـە لـەفزی گشـتی (موجمـەل). یـەکێك لـە ئەرکـەکانی سوننەیش ڕوونکردنـەوەی موجمەلـە وەك خـوا ئەفـەرموێ: ﴿...وَأَنزَلْنَـا إِلَيْـكَ الـذِّكْرَ لِتُبَـيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَـيْهِمْ ...﴾[1]. بەڵگـە لەسـەر ئەمـە ئەوەیـە هەرکـەس ناوچـاوی بخاتە سەر زەوی بەبێ ڕووکردنە قیبلە، یان بەبێ دەستنوێژ لەڕووی زمانەوانیەوە بـە کڕنووشبردوو دادەنرێ، لەکاتێکدا ئەم کڕنووشبردنە لە شەرعدا ئیعتیباری نیە.

کەواتــە مەبەســت (رکــوع و سجود)ــە بــەمانا شــەرعیەکانیان نــەك مانــا زمانەوانیــەکانیان، حەدیســەکە هــاتووە بــۆ ڕوونکردنــەوەی ئــەوە و نەهێشــتنی

---

[1] النحل: ٤٤

ئیجمالەکە، بە بڕوای سەرجەم ئوسولناس و شەرعزانیش روونکردنەوەی دەقی موجمەلیش بە حەدیسی تاکینە دروستە.

دووەم: ئەگەر گریمان دەق (رکوع و سجود) رەهایە و مەبەست مانا زمانەوانیەکەیەتی، ئەوا ئەو حەدیسەی جمهور دەستیان پێوە گرتوە بەناوبانگە، ئوممەتی ئیسلامی پەسەندی کردوە و پێشەوایانی حەدیس بە زۆر ریوایەت گێڕاویانەتەوە، هەروەها دیلالەتی گومانبڕە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار فەرمانی بە ئەعرابیەکە کرد نوێژەکەی بکاتەوە، بە رای سەرجەم شەرعزانیش زیادەخستنە سەر ئەحکامی قورئانی پیرۆز بە سوننەتی بەناوبانگ دروستە، لەبەرئەوەی ئەو زیادەیەیش هەر لە ئەرکەکانی سوننەیە، هەروەها خوای گەورە لەبارەی پێغەمبەرەوە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾.[1]

## ٢- لەبارەی مەرجی پاکێتی (الطهارة) بۆ دروستی تەوافی ماڵی خوا جیاوازن، بەم شێوەیە:

أ- حەنەفی دەڵێن: پاکێتی لە بێدەستنوێژی و لەشپیسی (الجنابە) و بێنوێژی (حەین) و زەیسانی (نیفاس) مەرج نیە بۆ دروستیی تەواف و لای ئێمە فەرز نیە، بەڵکو واجبە (لای ئەوان واجب جیایە لە فەرز)[2] و دروستە بەبێ ئەوەیش تەواف بکرێ، لەبەرئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾[3]. ئەم دەقە فەرمانە بە تەواف بەڕەها لە مەرجی پاکێتی[4]، وشەی تەواف

[1] النجم: ٤

[2] بەلای ئەوانەوە (واجب) ئەوەیە بەبەڵگەیەك دڵنرابێ و نەکردنی کارەکە بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵام (فەرز) ئەوەیە بە بەڵگەیەکی گومانبڕ جێگیر بووە و نەکردنی بەتاڵکەرەوەیە.

[3] الحج: ٢٩

[4] بڕوانە: البدائع للكاساني، سەرچاوەی پێشوو ٣/ ١١٠٣.

←

(الطواف) ناوێکی تایبەتە بۆ مانایەکی تایبەت دانراوە کە بەشێوەیەکی گومانبڕ ئاماژەی بۆ دەکا ئەویش سوڕانەوەیە بەدەوری کەعبەدا، زیادکردنی شتێکیتر بۆ ئەم مانایە زیادەیەکە نەسخکردنەوەی واجب دەکا، نەسخکردنەوەی قورئانیش بەحەدیسی تاکینە (ئاحاد) نابێ، کە بریتییە لە حەدیسی: ((إن الطواف صلاة إلا أن الله تعالى أباح فيه الكلام)).

بەڵکو ئەم حەدیسە بە چواندن وەردەگیرێ بەو مانایەی: تەواف لە پاداشت و فەرزبووندا وەك نوێژە و پاکێتی پێ واجب دەبێ نەك فەرز. لەو ڕوانگەیەشەوە، ئەگەر بەبێ پاکێتی تەوافی کرد تەوافەکەی بەتاڵ نابێ بەڵام ناتەواوە و مادام لە مەککەیە پێویستە دووبارەی بکاتەوە، لەبەرئەوەی دووبارەکردنەوە قەرەبووکردنەوەیە بە رەگەزی خۆی، ئەگەر گەڕایەوە بۆ لای کەسوکارەکەی خوێنی لەسەرە، ئەگەر دەستنوێژی نەبوو مەڕێکی لەسەرە، ئەگەر لەشی پیس بوو وشترێکی دابەستە (بُدنة) لەسەرە، لەبەرئەوەی بێدەستنوێژی (حدث) ناتەواویەکی کەم واجب دەکات و مەڕێك بۆ قەرەبووکردنەوەی بەسە. هەرچی لەشپیسییە ناتەواویەکی زەق واجب دەکات و وشترێکی دابەستە واجب دەبێ.

هەندێ لە شەرعزان هاوڕای حەنەفیەت بوون لەوەی دەڵێن پاکێتی مەرج نیە بۆ دروستیی تەواف لە بەیت (بيت العتيق)، لەوانە زاهیریەکان، بەڵام بۆ حەیزدار لەگەڵ رای جمهورن[1].

---

أصول البزدوي مع كشف الأسرار ١/٨٢.

أصول السرخسي ١/١٢٨.

مشكاة الأنوار، سەرچاوەی پێشوو ١/٢٠

[1] المحلی (١٨/٧). تێیدا هاتووە: "تەوافکردنی بەیت بەبێ تەھارەت جائیزە و بۆ زەیسانیش. تەنها لەسەر حەیزدار حەرام کراوە، لەبەرئەوەی پێغەمبەرﷺ ڕێگری لە دلێکی ئیمانداران کرد، کە لەکاتی تەوافی بەیتدا کەوتە عادە، ئەگەر تەھارەت لە مەرجەکانی تەواف بوایە پێغەمبەرﷺ ڕوونی دەکردەوە وەك چۆن باسی حەیزداری روون کردۆتەوە (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى)، ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾(مریم: ٦٤).

ب- جمهوری شەرعزانی موسلمانان دەلێن: پاکێتی مەرجە بۆ دروستیی تەواف و بەبێ ئەوە بەتاڵە، ئەویش بەپێی ئەو حەدیسەی دەڵێ (إن الطواف صلاة إلا أن الله تعالى أباح فيه الكلام).[1]، زیادکردنی ئەم مەرجە بە نەسخی حوکمی دەقێکی تایبەت لە قورئانی پیرۆز دانانرێ، بەڵکو روونکردنەوەی پێداویستیەکانی ئەو حوکمەیە. لە ئایەتی ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾[2] یشدا پێغەمبەر سەرپشك کراوە و ئەرکی ئەو روونکردنەوەیەی خراوەتە سەر شان. ئەویش لەخۆوە قسە ناکا.

لەوانەی پاکێتی واتە تەهارەتیان بە مەرج بۆ دروستیی تەواف داناوە: مەزەبەکانی مالیکی و شافیعی[3] و حەنبەلی[4] و جەعفەری[5] و زەیدی[6].

من رام بەلای رای حەنەفیەتدایە لەبەر ساغنەبوونەوەی بەڵگەیەکی گومانبڕ کە بەڵگە بێ بۆ رای جمهور.

---

[1] عمدة القارئ ٢٦٣/٩ .

[2] سورة النحل/ ٤٤

[3] الشرح الصغير مع الصاوي (٢٥٦/١). تێیدا هاتووە: "مەرجی دروستیی تەواف فەرز بێ یان سوننەت بوونی دوو تەهارەتە: تەهارەتی دەستنوێژشکان (حدث) و تەهارەتی پیسی، هەروەها داپۆشینی عەورەتە وەك نوێژ بۆ نێر و مێ".

[4] الأنوار (٢٩١/١). تێیدا هاتووە: "پاك بێ لە پۆشاکێکی پاکدا، لەبەرئەوەی تەهارەت لە دەستنوێژشکان و پیسی و داپۆشین مەرجن بۆ دروستی تەواف لە رای بەناوبانگدا (لە ئەحمەدەوە)".

[5] الخلاف للطوسي (٤٤٧/١). تێیدا هاتووە: "ئەوەی بەبێ دەستنوێژ تەواف بکا و گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی، دەگەڕێتەوە و بەپێی توانا تەوافەکە دووبارە بکاتەوە، ئەگەر نەیتوانی کەسێك دەکاتە وەکیل لەباتی ئەوەی تەواف بکا".

[6] البحر الزخار (٣٤٦/٢). تێیدا هاتووە: "فەرزەکانی تەواف نۆن: نیەت، پاکێتی لە (حدث)، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ئەفەرموێ: ((الطواف بالبيت صلاة)).

**٣- لەبارەی حوکمی نیەت و بەدوای یەکداهاتن (الموالاة) و تەرتیب لە دەستنوێژدا جیاوازن: ئایا ئەوانە لە فەرز و مەرجەکانی دروستیی دەستنوێژن یان نا؟ بەم شێوەیە:**

أ- حەنەفیەت دەڵێ: "ئەوانە مەرج نین بۆ دروستیی دەستنوێژ لەبەر ئەو ئایەتەی ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ ...﴾.[1]

رووی بەڵگەبوون: هەریەك لە لەفزەکانی شۆردن (الغسل) و دەست پێداهێنان (المسح) لەم دەقەدا بۆ مانایەکی دیاریکراو و تایبەت دانراون کە بەشێوەیەکی گومانبڕ دیلالەتی لێ دەکا، فەرزبوونی شۆردن بۆ شۆراوەکان و مەسح بۆ مەسحکراوەکان بەم دەقە تایبەتە جێگیر کراوە، زیادکردنی حوکمیتر بۆ مەدلولەکەی وەك فەرزیی نیەت و بەدوای یەکداهاتن و تەرتیب و بیسمیلاکردن... بە زیادەیەك بۆ سەر حوکمێکی جێگیری رەها دادەنرێ، زیادەیش نەسخکردنەوەی ئەم حوکمەیە.

باسکردن لەوەی دەستنوێژێك بەبێ نیەت یان تەرتیب یان بەدوای یەکداهاتن بەتاڵە، لێرەیشەوە ئیقرارکردنی ئەوەی کە ئەوەی لە قورئاندا هاتوە ناتەواوە و حەدیسی ئاحاد (تاکینە) تەواوی کردوە، هەموو ئەوانە وا لازم دەکەن ئەو حەدیسەی ئەم زیادانەی هێناوە بە نەسخ دابنرێ، هەروەك وا لازم دەکا پلەی دەقی قورئانی لە ئاستی خۆی دابەزێنرێ، یان پلەی یەکینەهەواڵ لە ئاستی خۆی بەرزتر بکرێتەوە، لازم و هەروەها مەلزوم بەتاڵن.

بەڵام نیەت و بەدوای یەکداهاتن و تەرتیب و بیسمیلاکردنیان لە سوننەتەکانی دەستنوێژ داناوە.[2]

---

[1] المائدة: ٦

[2] البدائع، سەرچاوەی پێشوو (١/٢٠–٥١) تێیدا هاتووە: "نیەت و هەروەها تەرتیب لە مەرجەکان نیە.. هەروەها بەلای زۆربەی شێخەکانەوە بەدوای یەکداهاتن مەرج نیە". خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ←

ب- جمهوری شەرعزانی موسڵمان لە مالیکی[1] و شافیعی[2] و حەنبەلی[3] و جەعفەری[4] و زەیدی[5] و زاهیری[6] رایەکی جیاواز لە حەنەفییان هەیە، هەموویان دەڵێن: نیەت فەرزێکە لە فەرزەکانی دەستنوێژ و بەبێ ئەوە دروست نیە. زۆربەیان گوتویانە: بەدوای یەکداهاتن و تەرتیبیش لە فەرزەکانی دەستنوێژن، هەندێکیشیان بیسمیلاکردنیان بە فەرز داناوە.

---

إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ ... الآيَةَ﴾ (المائدة: ٦). فەرمانکردن بە شۆردن و مەسح رەهایە و بەندکردنی رەها بەبێ بەڵگە دروست نیە (بەڵگەی قەتعی).

لەم بابەتەدا سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە: أصول البزدوي مع الكشف (٨٣/١)، کە تێیدا هاتووە: لەوانە خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ ... الآيَةَ﴾ دەستنوێژ و مەسح کە دوو لەفزی تایبەتن بۆ مانایەکی زانراو لە ئەسڵی دلناندا، مەرجی نیەت لەوەدا نابێتە کارکردن بەوە و روونکردنەوەی لە بارێکدا لەوەی بۆ دانراوە روونە، بەڵکو پێویستە لەسەر ئەو وەسفەی باسمان کرد پێی بگەیەنرێ (واتە گەیاندنی فەرع بە ئەسڵ بەوەی واجب بێ یان سوننە بەگوێرەی خواستی بەڵگەکە نەک بەفەرز. وەك باسمان کرد مەرجی بەدوای یەکداهاتن و تەرتیب و بیسمیلایشی بەتاڵ کردۆتەوە".

[1] بداية المجتهد (٦/٢)... الشرح الصغير مع حاشية الصاوي (٤١/١) تێیدا هاتووە: "نیەت و بەدوای یەکداهاتن و دەست تێدان (الدلك) لە فەرزەکانی دەستنوێژن، بەپێچەوانەی تەرتیب کە لە سوننەتەکانیەتی".

[2] الأنوار (٣١/١، ٣٣) تێیدا هاتووە: "فەرزەکانی دەستنوێژ شەشن: نیەت کە لە ئیسلامدا مەرجە، کردەوە ئەگینا نیەتێکیتری لێ دەکەوێتەوە، هەروەها بەدڵ بێ، بەردەوام بێ و بەرلورد بێ..فەرزی شەشەمیش تەرتیبە، ئەگەر بەئەنقەست یان بەفشە بەجێی هێشت بەتاڵ دەبێتەوە جگە لەوەی بەتەرتیب کردویەتی". وادیارە بەدوایەکداهاتن و بیسمیلاکردن لای شافیعیەت لە سونەتەکانی دەستنوێژن.

[3] (١٣٦/١) تێیدا هاتووە: "لە فەرزەکانی تەهارەت نیەتە.. لەبەرئەوەی لە پێغەمبەر دەگێرنەوە فەرمویەتی: ((إنما الأعمال بالنيات)). . هەروەها تەرتیب لە دەستنوێژدا بەو شێوەیەی لە ئایەتەکەدایە، لای ئەحمەد واجبە".

[4] كتاب الخلاف للطوسي (١٦/١): تێیدا هاتووە: "لای ئیمە لە دەستنوێژدا بەدوای یەکداهاتن و تەرتیب واجبن هەروەها هەموو ئەندامەکان. هەروەها پێویستە راست پێش چەپ بخرێ".

[5] البحر الزخار (١/ ٥٥- ٥٨) تێیدا هاتووە: "فەرزەکانی دەستنوێژ سیانن: یەکەم نیەت، دووەم: بیسمیلاکردن، سێیەم: تەرتیب".

[6] المحلى (٧٣/٧) تێیدا هاتووە: "دەستنوێژ بەبێ نیەتی تەهارەت بۆ نوێژ جا فەرز بێ یان سوننەت تەواو نابێ، لەبەرئەوەی خوا تەنها لەبەر نوێژ فەرمانی بە دەستنوێژ کردوە".

بەڵگەیشیان لەوەدا گوتە و کردارەکانی پێغەمبەری ڕێزدارە (ﷺ)، لەوانە ئەوەیە فەرمویەتی: ((إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امرئ ما نوى)) (واتە: کارەکان بەپێی نیەتن و هەرکەس نیەتی حسێبە)، ئەوان دان بەو ئەسڵەدا نانێن کە دەڵێ زیادە لەسەر دەقی تایبەت نەسخکردنەوەیەتی. لەڕاستیدا نیەت لە دەستنوێژدا فەرزە لەبەرئەوەی لە مەرجەکانی دروستیی نوێژە، نوێژیش ڕێکخستنێکی ڕۆحی و ئامادەسازیی دڵە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی لەنێوان خوا و بەندەدا. جا ئەگەر دەستنوێژی گرت و لەم ڕاستییە غافڵ بوو، کارەکەی لە بنەڕەتەوە بەبەتاڵ دادەنرێ.

**٤– جیاوازی لە زامنکردنی ماڵە دزراوەکە لەلایەن دزەوە: ئایا سزای دەستبڕین ئەو زامنکردنەی لەکۆڵ دەکاتەوە و کابرای دز بەرپرسیار دەبێ لە گێڕانەوەی هاوچەشنەکەی یان نرخەکەی لەکاتی فەوتان یان بەکارهاتندا؟ بۆ زانیاری، هیچ ناکۆکی نیە لەوەی پێویستە ماڵە دزراوەکە بۆ خاوەنەکەی بگێڕدرێتەوە ئەگەر پاش دەستبڕینەکە مابوو[1]:**

أ– حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن رایان وابووە کە دز ئەگەر سزای دەستبڕینی لەسەر جێبەجێ کرا نابێتە زامنی فەوتانی ماڵە دزراوەکە، ئەویش بەپێی ئایەتی: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّه...﴾[2].

ڕووی بەڵگەبوون: لەفزی (الجزاء) ناوێکی تایبەتە ئاماژەیە بۆ مانایەکی دیاریکراوی تایبەت و دیلالەتەکەی گومانبڕە، ئەویش سزادانی ئەوەیە دزەکە لە ئەنجامدانی تاوان و فەوتاندنی ماڵە دزراوەکەدا کردویەتی. هەر خستنەسەرێك بۆ ئەوە لەگەڵ ئەو

---

[1] ابن قدامة، لە: المغني (٨/٢٧١)دا دەڵێ: "ئەهلی عیلم جیاوازییان نیە لە پێویستیی گێڕانەوەی ماڵە دزراوەکە بۆ خاوەنەکەی ئەگەر مابوو".

[2] المائدة: ٣٨

قەتعەدا بەریەك دەكەوێت و دەبێتە نەسخكەرەوە بۆی.

پوختەی قسە: دزی دوو حوكمی هەیە: یەكێكیان پەیوەندی بە نەفسەوە هەیە (نەفسی دزەكە)، ئەویتریان پەیوەندی بە ماڵەوە هەیە (ماڵە دزراوەكە):

ئەوەی پەیوەندی بە نەفسەوە هەیە برینە لەبەرئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿...وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا...﴾، ئەمەیش حوكمێكە هەموولا لەسەری كۆكن.

هەرچی ئەوەیە پەیوەندی بە ماڵەوە هەیە لەڕووی زەمانكردنەوە، شەرعزان تێیدا جیاوازن. حەنەفیەت دەڵێن: زامنكردن و دەستبڕین لە دزیەكدا كۆنابنەوە، واتە فەوتانی دزراو یان بەكارهاتنی لەلایەن كابرای دزەوە پاش یان پێش برینەكە زەمانی لەسەر نیە و دەستیان بە بنەماكەیانەوە گرتوە كە دەڵێ: "إن الزيادة على النص الخاص نسخ". (واتە: زیادە بۆ سەر دەقی تایبەت نەسخكردنەوەیە)، ئەمە جگە لە كردنی سوننە و ماقولّ بەبەڵگە.

یەكەم: دەق: دەستیان بە دەقی تایبەتەوە گرتوە لە ئایەتی ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ...﴾ ، ڕووی بەبەڵگەبوونی لە دوو لاوەیە:

یەكێكیان: خوا برینەوەی بە سزا (جزاء) ناو بردوە، جەزایش لەسەر كیفایە دادەمەزرێ، لەبەرئەوەی ناوێكی تایبەتە بۆ مانایەكی زانراو دانراوە كە بەشێوەیەكی گومانبڕی روون و ئاشكرا دیلالەتی لێ دەكا كە هیچ ئیجمالی تێدا نیە تا پێویست بە سوننە بكا. جا ئەگەر زامنكردنی ماڵە دزراوەكەیشی بۆ زیاد كرا ئەوە دەبێتە نیشانە بۆ ئەوەی گومانبڕەكە بەس نەبووە، واتە جەزا نەبووە، خوای گەورەیش بێگەردە لەوەی هەواڵ بەناتەواوی بگەیەنێ.

دووەمیان: خوا دەستبڕینی بە هەموو سزاكە داناوە لەبەرئەوەی وەك ناوێكی تایبەت باسی كردوە كە بەشێوەیەكی گومانبڕ دیلالەت بۆ مەدلولەكەی دەكا و هیچیتری باس نەكردوە. جا ئەگەر زەمانكردنیشی لەسەر واجب بكەین، ئەوا دەستبڕینەكە دەبێتە هەندێ لە سزاكە و هەندێكیتریشی بریتی دەبێ لە

زەمانکردنەکە (واتە بژاردنی–وەرگێڕ)، ئەوەیش زیادەیەك دەبێ لەسەر تایبەتەکە و نەسخکردنەوەی دەقی قورئانە.

دووەم: سوننە: وتویانە سوننەتێکی پێغەمبەر (ﷺ) هەیە جەخت لەوە دەکا کە دەقێکی تایبەت لە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداوە، لەوەی دەستبڕین سزایەکی تەواوە بۆ ئەسڵی کارە تاوانکاریەکە و فەوتانی دزراوەکە، ئەویش ئەوەی عەبدوڕەحمان کوڕی عەوف لە پێغەمبەر(ﷺ)ی گێڕاوەتەوە کە فەرمویەتی: ((إذا قطع السارق فلا غرم عليه)). (واتە: دز ئەگەر دەستی بڕدرا، پێبژاردنی لەسەر نیە).

سێیەم: ماقول (المعقول): وتویانە ئەقڵی ساغ پشتگیریی ئەوە دەکا ئێمە داکۆکیمان لێکردوە کە دەستبڕین سزایەکی تەواوە بۆ هەریەك لە دزیەکە و فەوتاندنی دزراوەکە، لەبەرئەوەی زامنکراوەکان لەکاتی ئەنجامدان یان هەڵبژاردنی زامنکردندا لەکاتی وەرگرتنەوە (واتە بەئەسەری رەجعی) دەبنە موڵك، کەواتە پاش غەرامەکردن دزەکە بەخاوەنی ماڵەکە دادەنرێ لە مێژووی جێبەجێکردنی سزای دزیەکەوە، کە ئەوە دەبێتە سزادانی دزەکە و دەستبڕینی لەسەر موڵکی خۆی، ئەوەیش بە رای هەموولا دروست نیە.[1]

لە روانگەی ئەم لێکۆڵینەوە وردانەوە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی دەڵێ دەستبڕین و غەرامەکردن (واتە پێبژاردن) کۆنابنەوە، جا ئەگەر بەر لە دەستبڕین غەرامە کرا بڕینەکە نامێنێ، ئەگەریش بەر لە غەرامەکردن دەستی بڕایەوە غەرامەکردنەکە نامێنێ.

هەندێ زانا بەشێوەیەکی رەها لەگەڵ ئەم رایەی حەنەفیەتدان لەوانە (الثوري).[2]

[1] بڕوانە: البدائع، سەرچاوەی پێشوو ٤٢٦٩/٩ . أصول البزدوي مع كشف الأسرار ٩١/١. أصول السرخسي ١٢٩/١ .

[2] البدائع، سەرچاوەی پێشوو ٤٢٦٩/٩ أصول البزدوي مع كشف الاسرار ٩١/١. أصول السرخسي ١٣٠/١

ئیمام مالیك جیاوازی لەنێوان دزی نەدار و دارادا كردوە و دەڵێ: دزی نەدار زەمانی لەسەر نیە. هەریەك لە (عطاء) و ئیبن سیرەین و شەعبی و مەكحولیش ئەم رایەیان وەرگرتوە.[1]

ب- جمهوری شەرعزانی موسڵمان لە شافیعی[2] و حەنبەلی[3] و جەعفەری[4] و زاهیری[5] و هیتر پێیان وایە پێویستە بڕین و زەمانكردن كۆبكرێنەوە، لەبەرئەوەی زەمانكردن مافی بەندە و بڕین مافی خوایە، جا ئەگەر هۆیان هەبوو، پێویستە حوكمیان پێ بدرێ.

پوختەی قسە: دز كاتێ دزی دەكا لە یەك كاتدا دەستدرێژی دەكاتە سەر دوو ماف، مافی خوا (مافی گشتی)، كە بریتییە لە ئاسایش و ئارامیی و دڵنیایی كۆمەڵگە لە ماڵ و ژیانیان + مافی بەندە (مافی تایبەت) كە ئەو مافە كەسیەیە لێی دزراوە. دەستدرێژیكردنە سەر مافی خوا لە قورئانی پیرۆزدا دەستبڕینی ئاشكرایە. دەستدرێژیكردنە سەر ماڵی خەڵكیش زەمانەكەی بەپێی رێسا گشتی و جێگیرەكان لە شەریعەتی ئیسلامیدا بڕیار دراوە، لەوانە ئەوەیە پێغەمبەر فەرمویەتی: ((لا ضرر ولا ضرار)).. زۆر كێشەیتری هاوشێوە هەن كە دەستدرێژییان تێدایە: دەستدرێژیكردنە سەر مافی خوا + دەستدرێژیكردنە سەر مافی بەندە، لەبەرئەوە دوو سزای تێدا واجبە هاوشێوەی كوشتنی بەهەڵە كە هەم كەفارەتی تێدایە وەك مافی

---

[1] المغني لأبن قدامة ٣٧١/٨ .

[2] المهذب (٢٨٤/٢). تێیدا هاتووە: "ئەگەر دزراوەكە لای كابرای دز فەوتا دەبێ باتیەكەی بدات و دەستی دەبڕدرێ و هیچیان رێ لەویتریان ناگرێ، لەبەرئەوەی زەمانكردن لەبەر مافی ئادەمیزاد واجب دەبێ، بڕینەكەیش مافی خوایە، هەربۆیە وەك خوێنبایی و كەفارەت هیچیان رێ لەویتریان ناگرێ".

[3] المغني لأبن قدامة (٢٧٠/٨). تێیدا هاتووە: "پاش دەستبڕین ئەگەر دزراوەكە مابوو بۆ خاوەنەكەی دەگێڕدرێتەوە، ئەگەریش فەوتابوو دەبێ نرخەكەی ببژێرێ، جا چ دارا بێ یان نەدار".

[4] الخلاف للطوسي (٤٧٣/٢). تێیدا هاتووە: "ئەگەر ماڵێكی دزی لەسەر ئەوە دەستی دەبڕین، ئەگەر ماڵەكە مابوو بەبێ ناكۆكی دەیگێڕێتەوە، ئەگەریش فەوتابوو نرخەكەی پێدەبژێرێ".

[5] المحلى ٣٣٩/١١

خـوا، هـەم خوێنبـایی (قەرەبوو)یشـی تێـدا واجبـە وەك مـافی بەنـدە (وەرەسـەی قوربانیەکە).

**زاڵکردن:**

ئەو رایەی من زاڵ (تەرجیح)ی ئەکەم ئەوەیە ئیمام مالیك و شوێنپێهەڵگرانی بـۆی چوون، لە جیـاوازیکردن لـەنێوان دزی دارا و دزی نـەداردا، بـەوەی یەکـەمیان بـڕین و بژاردنی تێدا کۆبکرێتەوە، نەك دووەم.

ئەم وردکردنەوەیە ئەگەرچی دەقێکی زاهیر لە قورئان یان سوننە پشتئەسـتووری نەکردوە، بەڵام لە دەستگرتن بە رۆحی لێبوردەی شەریعەتی ئیسلامیەوە نزیکترە.

هەرچی کەسی بەتوانایە، لەبەرئەوەی سـزاکە و زەمانکردنەکـە روو لەیـەك شـوێن ناکەن، بەڵکو سزای بڕین بۆ نەفس و زەمانەکـە بـۆ ماڵـە دزراوەکـە دەبـێ. هـەروەها هۆی هەردووکیشیان یەك نـەبووە، هـۆی بڕینەکـە بەزانـدنی حورمـەتی مـافی خوایـە (مافی گشی) لە تێکدانی ئاسایش و ئـارامیی ژیـانی کۆمەڵگـە، لەسـەر ئـەوەیش سـزا دەدرێ بـەگوێرەی ئایـەتی ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا ...﴾[1]. هـۆی زەمانکردنەکە زیادەڕۆییکردنە بۆ سەر مافێکی تایبەتی بەندە (دزی لێکراوەکە) بـەبێ پاساو، هەربۆیە بەگوێرەی رێسـا گشـتیەکانی شـەریعەتی ئیسـلامی حـوکمی بژاردن (زەمانکردن)ی لەسەر دەدرێ، لەوانە ئەوەی پێغەمبەری مەزن ئەفەرموێ: ((لا ضـرر ولا ضرار)).

کەواتە شتێکی سروشتییە قازی دوو حوکمی سەربەخۆ یان یەك حوکم لەسـەر دز بدات بەهەریەك لە دەستبڕین و پێبژاردن. یاساکانی سەرجەم دەوڵەتانی جیهـان لـەم سـەردەمەدا لەسـەر ئەمـە گیرسـاونەتەوە، هەرکـەس تاوانێـك بکـا زیـانێکی مـادی لێبکەوێتەوە تاوانبارەکە حوکمی قەرەبووکردنـەوەی لەسـەر دەدرێ، ئەمـە جگـە لـە حوکمدانی بە سزای دیاریکراو بۆ تاوانەکە بەگوێرەی داوای زیانمەندەکە.

---

[1] المائدة: ٣٨

بەڵام لە حاڵەتی هەژاریی دزەکەدا لێبوردەیی ئیسلام و عەدالەتی ئاسمان وا دەخوازن لە قەرەبووەکە ببەخشرێ و تەنها بە بڕینەکە وازی لێ بهێنرێ.

بەڵام بۆ کامڵکردنی بۆچوونەکەی، ئەوە بۆ رای ئیمام مالیك (رەحمەتی خوای لێبێ) زیاد دەکەم کە دادپەروەریی تەواو لەم حاڵەتەدا دەخوازێ زیانلێکەوتوو لە گەنجینەی دەوڵەت قەرەبوو بکرێتەوە. ئەمە ئەگەر هەژاری پاڵنەر نەبووبێ بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە، ئەگینا بەپێی فەرمانی خوای دادپەروەر و چاکەکار کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ...﴾[1] چاکە (ئیحسان) وا دەخوازێ لە دەستبڕینیش ببەخشرێ.

**٥- لەبارەی حوکمی نەفیکردنی زیناکاردا رایان جیاوازە: ئایا ئەوە بەشێکە لە حەد و وەلی ئەمر (سەرۆکی دەوڵەت یان ئەوەی سەرپشکی دەکا) دەسەڵاتی مەزەندەکردنی هەیە و ئەگەر بە بەرژەوەندی بینی جێبەجێی دەکات و بەپێچەوانەوە نایکا:**

أ- حەنەفیەت و ئەوانەی هاورایانن دەڵێن: حەدی تەواو سەد شەلاقە بۆ عازەب و نەفیکردن (واتە دوورخستنەوە لە زێدی خۆی) بەشێك نیە لەو حەدە، بەڵکو سزایەکی تەمێکارانەی سەربەخۆیە، ئیمام دەسەڵاتی هەیە وەی جێبەجێی بکا یان چاوپۆشی لێبکا، ئەویش لەبەر تیشکی هەلومەرجی کێشەکە و بەرژەوەندیی گشتیدا. بەڵگەیشیان ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾[2].

---

[1] النحل: ٩٠

[2] النور: ٢

رووی بەڵگەخوازی (وجه الاستدلال): لەفزی سەد (مائة) ژمارەیەکی تایبەتە بەشێوەیەکی گومانبڕ ئاماژەیە بۆ مانایەکی زانراو کە زیاد و کەمکردن هەڵناگرێ، بەوەیش هەر خستنەسەرێك بۆ ئەم سزا دیاریکراوە (سەد شەلاق یاخود جەڵد) نەسخکردنەوەی حوکمێکی جێگیرە کە بەقەتعی بەدەقی قورئان جێگیر کراوە، هەربۆیە زیادکردنی دوورخستنەوە کە بە حەدیسی تاکینە جێگیر بووە ئەگەر بەبەشێك لەم حەدە دابنرێ دەبێتە نەسخکردنەوە، نەسخکردنەوەی قورئانیش بە حەدیسی تاکینە، یان دابەزاندنی پلەی قورئانە بۆ پلەی حەدیسی تاکینە، یاخود بەرزکردنەوەی پلەی حەدیسی تاکینەیە بۆ ئاستی قورئان، ئەو دووانەیش هەردووك بەتاڵن.[1]

لێرەوە ئەو دوورخستنەوەیەی لە حەدیسدا هاتووە سزایەکی تەمێکارانە (تەعزیری)یە و بۆ دەسەڵاتی ئیمام (سەرۆکی دەوڵەت)، بەجێ هێڵراوە.

ئەوەیش لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕدرێتەوە، پاڵپشتە بۆ رای حەنەفیەت، کە دەگێڕنەوە کاتێ وەك سزایەکی تەعزیری رەبیعەی کوڕی ئومەیە کوڕی خەڵەفی بەهۆی مەیخواردنەوەوە بۆ خەیبەر دوور خستەوە و ئەویش چووە پاڵ هیرەقل و بوو بە مەسیحی[2]، گوتویێتی: (لا أغرّب مسلماً بعد هذا أبداً) (واتە: پاش ئەمە ئیتر هیچ موسڵمانێك دوور ناخەمەوە). هەروەها ئەوەی لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ریوایەت کراوە کە گوتویەتی: (حسبهما من الفتنة أن ينفيا)، (واتە: ئەوەندەیان بەسە فیتنە بێ بۆیان کە دوور دەخرێنەوە).[3]

ب- زۆربەی شەرعزانی موسڵمان گوتویانە: دوورخستنەوە بەشێکە لە سزاکە و پێویستە لەپاڵ سزای جەڵدلێداندا لەسەر هەردوو زیناکاری نێر و مێ جێبەجێ

---

[1] شرح فتح القدير ٢٤٢/٥. أحكام الأحكام شرح عمدة الأحكام لأبن دقيق العيد ٣٤٢/٤.

[2] المغني لأبن قدامة ١٦٨/٨.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

بکرێ، لەوانە شافیعی[1] و حەنبەلی[2] و زاهیریەکان[3]، بەڵگەیشیان ئەو حەدیسەیە ئەفەرموێ: ((خذوا عني خذوا عني قد جعل الله لهن سبيلا البكر بالبكر جلد مائة ونفي سنة)).

ج– ئیمام مالیك (رەحمەتی خوای لێبێ) [4] و ئەو شەرعزانەی مەزهەبەکەی کە شوێنی کەوتوون، هەروەها جەعفەریەکان و ئەوزاعی دەڵێن دوورخستنەوە بۆ زیناکاری پیاوە نەك ژنەکە، لەو رووەوە مەترسی هەیە لە دوورخستنەوە تووشی فیتنە ببێ.

---

[1] الأنوار (٤٩٩/٢). تێیدا هاتووە: "ئەگەر زیناکار هاوسەردار بێ حەدەکەی رەجمە، ئەگەریش هاوسەردار نەبوو حەدەکەی جەڵد و دوورخستنەوەیە".

[2] المغني (١٦٩/٨)، تێیدا هاتووە: "ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەرمان هەیە کە دەڵێ: (البكر بالبكر جلد مائة وتغريب عام)، بۆیە پیاوانساڵێك دوور دەخرێنەوە، ئافرەتیش ئەگەر مەحرەمی لەگەڵ بێ بۆ ماوەیەك بەئەندازەی ماوەی کورتکردنەوەی نوێژ دوور دەخرێتەوە. بەڵام ئەگەر مەحرەمی لەگەڵی دەرنەچوو، لە ئەحمەدەوە ریوایەت کراوە کە وەك پیاوە بەئەندازەی ماوەی کورتکردنەوە دوور دەخرێتەوە". هەروەها تێیدا هاتووە (١٦٧/٨): مالیك و ئەوزاعی دەڵێن پیاو دوور دەخرێتەوە نەك ئافرەت".

[3] المحلى (٢٣٢/١١، ٢٣٣). تێیدا هاتووە: "پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: ((البكر بالبكر جلد مائة وتغريب عام))...

لە شتە سەیرەکانی دنیا ئەوەیە ئەو چل جەڵدەی عومەری کوڕی خەتاب وەك تەعزیر بۆ حەدی مەی خواردنەوەی زیاد کرد بکەنە حەدێکی واجب و فەرزکراو، پاشان بێن حەدێك خوا لەسەر زمانی پێغەمبەرکەی فەرزی کردوە بیکەنەتەعزیرێك".

[4] الشرح الصغير مع الصاوي (٣٩٣/٢) تێیدا هاتووە: "تەنها نێرینەی پاش سەد جەڵد ساڵێك دوور خێتەوە وەك زیادکردنێك لە سزاکەیدا لەپێناو ئەوەی لە کەسوکار و منداڵ و گوزەرانی دابڕێ.. ئەگەر غەریب بوو جەڵد دەکرێ و بەند دەکرێ، بەڵام مێینە نا با خۆی و مێردەکەیشی رازی بن، ئەویش لەبەر ئەوەی بەهۆی ئەو دوورخستنەوەوە مەترسی زینای لێدەکرێ".

جۆرەكانی تایبەت:

تایبەت دەبێ بە چوار جۆرەوە:

١- فەرمانكردن (الامر): سیغەی فەرمانكردن بەیەكێك لە سیغەكانی تایبەت دادەنرێ و بەلای جمهورەوە بۆ داواكردنی كردنەكە وەك حەتم و ئیلزام دانراوە، بەوەیش مانای واجببوون دەگەیەنێ، هەروەك دەكرێ بە قەرینە جگە لەوەیش بگەیەنێ.

٢- قەدەغەكردن (النهی): سیغەی نەهیكردن لە سیغەكانی تایبەت دادەنرێ و -بەلای جمهورەوە- بۆ دلواكردنی نەكردنی كردەوەیەك وەك حەتم و ئیلزام دانراوە، لەبەرئەوە حەرام و قەدەغەكردن دەگەیەنێ، مەگەر قەرینە (بەلگە)یەك پەیدا ببێ كە جیاواز لەوە بگەیەنێ.

٣- لەفزی رەها (موتلەق) پێویستە بە رەهاییەكەی وەربگیرێ و قەید نەكرێ، مەگەر بەلگەیەك لەسەر جیاواز لەوە پەیدا ببێ.

٤- لەفزی بەند (موقەیەد) پێویستە رەچاوی قەیدەكەی بكرێ لەكاتی كاركردن بەدەق و نابێ پشتگوێ بخرێ مەگەر بەلگەیەك لەسەر هەڵوەشاندنەوەی پەیدا ببێ.

ئەم چوار جۆرە لەو خواستانەی خوارەوەدا باس دەكەین:

## خواستی دووەم:
## جیاوازی لەبارەی خواستی فەرمان و کاریگەری لەسەر جیاوازی لە حوکمدا

جیاوازبوون لە دیاریکردنی خواست (مقتضـی)ی ئـەمر و نـەهی کاریگەریـەکی گەورەی هەیە لەسەر جیاوازی لەو حوکمە فیقهیانـەی لـە بەڵگـە تەفسیلیەکانیان لـە دەقـەکانی قورئـانی پـیرۆز و سـوننە هـەڵێنجراون، کـە تێڕوانینـی موجتەهیـدان لـە پێشەوایانی موسڵمانان بۆ سروشتی ئەو کارەی لە سیغەی فەرمانکردنەکە مەبەستە، هەمەجۆرە: ئایا کردنی ئەوەی لەلایەن خواوە فەرمان بە کردنـی کـراوە وەك حـەتم و ئیلزامە بەشێوەیەك بکەرەکەی پاداشـتی بکـرێ و نەکـەری سـزا بـدرێ، یـان لـەڕووی لەپێشبوون (ئەولەویەت)ـەوەیە کە بکەرەکەی پاداشت دەکرێ بەڵام نەکەرەکەی سزا نادرێ، یان تەنها بۆ ئاراستە و ڕێنوێنییە، یان بۆ شتیتر؟

جیاوازبوون سەبارەت بە جۆری ئـەو کـارەی نـەکردنی لـە سـیغەی نەهیکردنەکە مەبەستە: کـە ئـاخۆ شـەرعدانەر (الشـارع) وەك حـەتم و ئیلـزام مەبەسـتی نـەکردنی کارەکەیە، بەشێوەیەك بکەرەکەی سزا دەدرێ و نەکەرەکەی پاداشـت دەکـرێ، یـان لەڕووی لەپێشبوونەوەیە بەشێوەیەك نەکەرەکـەی پاداشـت دەکـرێ و بکەرەکەیشـی سزا نادرێ، یان تەنها بۆ ئاراستە و ڕێنوێنییە، یان بۆ شتیتر؟

هـەروەها نـاکۆکی لەوەشـدا دروسـت بـووە کـە ئـاخۆ داواکـە بـۆ یـەك جـارە و بەرپرسیارێتیی بەرئەرك (مکلف) بـە یـەك جـار جێبـەجێکردن تـەواو دەبـێ، یـان بـۆ دووبارەکردنەوەیە و بەرئەرك بەبەردەوامی لەگەڵ ژمارەی جارەکانی داواکردندا دەبێ پابەند بێ؟

هەروەها رای جیاوازیان هـەبووە لـەوەی ئـاخۆ داواکردنەکـە فەورییـە و پێویسـتە بەرئەرك هەر کە بە داواکەی زانی و کاتی هات داواکراو جێبەجێ بکا جا کردنی کارێك

بێ یان نەکردنی، یـان مـافی دواخسـتنی هەیـە و بـوارێکی فراوانـی لەبەردەمدایـە بـۆ جێبەجێکردن هەرکات ویستی و بارودۆخی رێگەی پێ دا؟

پاشان دەرچوونی مرۆڤی بەرئەرك لە بەرپرسـیارێتی بـەبێ بـەوردی دیـاریکردنی دیلالەتی ئەمر و نەهیەکان ناکرێ، تا بەرچاوی رۆشن بێ لە ئەنجامدانی فـەرمانپێکراو و دوورکەوتنەوە لە نەهیلێکراو. بۆزیادە روونکردنـەوە ئـەم ناکۆکییانـە سـەبارەت بـە فەرمانکردن بۆ سێ لق دابەش دەکەین:

## لقی یەکەم:
## جیاوازی لەبارەی سروشتی ئەو داوایەی لە فەرمان مەبەستە

فــەرمانکردن (الامــر) پێناســەی زۆری بــۆ کــراوە، نزیکترینیــان لــە واقیعــەوە پێناسەکەی بەیزاوییــە بــەوەی: (ئــەو گوتەیەیــە داوای کردەوەیــەك دەکـا)[1]، رەنگــە شتێکی شاراوە نەبێ کــە بڵێین: هــەر ئایــەتێك لــە ئایەتــەکانی قورئــانی پــیرۆز، یــان سوننەتێك لە سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کەم رێك دەکەوێ سیغەیەکیان تێدا نــەبێ ئامارە بێ بۆ داوایەك لە مرۆڤ بۆ کردنی کارێك کە بەرژەوەندیەکی تایبەت یان گشتی یان هەردووکیانی تێدایە، یان بۆ نەکردنی کارێك کە زیانێکی تایبەت یـان گشـتی یـان هەردووکیانی تێدایە.

بەڵام شێوازی فەرمان و قەدەغەکردنەکان بەیەك تەرز نــەهاتوون، بــەڵکو قورئــانی پــیرۆز، هــەروەها فــەرمودەیش، شــێوازی رەوانبێژیانــەی جۆراوجــۆری نایابیــان بەکارهێناوە و هونەرکارییان لە دارشتنی دەقەکاندا کردوە، لەوانە:

١- شێوازی فەرمانکردنی باو لــە زمـانی عەرەبیدا وەك لــەوەی خـوا ئەفــەرموێ:
﴿...وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً﴾[2]، ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾[3]، ﴿اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ﴾[4]، ﴿...كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ...﴾[5].

---

[1] البيضاوي مع الأسنوي ٢/٣
[2] الإسراء: ٣٤
[3] المائدة: ٢
[4] آل عمران: ٢٠٠
[5] النساء: ١٣٥

٢- شێوازی فەرمانی ڕانەبردووی بەستراو بە لام-ی ئەمرەوە، وەك لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿...فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ...﴾[1]، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ...﴾[2]، ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ...﴾[3]، ﴿وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ...﴾[4].

٣- ڕستەی خەبەری، وەك لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ...﴾[5].

٤- زۆر دەستەواژەیتر وەك (كَتَبَ) (بەمانای لەسەرتان فەرز كراوە)، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى ...﴾[6]، هەروەها وشەی و(فَرَضَ) لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿...قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِي أَزْوَاجِهِمْ ...﴾[7]، وشەی (علی) لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿...وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً...﴾[8]. ئەمانە و چەندین دەستەواژە و شێوازیتر، هەروەها وەك لەوەی پێغەمبەر فەرمویەتی(ﷺ): ((ولا تُنكح البكر حتى تستأذن)).[9]

[1] البقرة: ١٨٥
[2] البقرة: ٢٨٢
[3] الطلاق: ٧
[4] النساء: ١٠٢
[5] البقرة: ٢٣٣
[6] البقرة: ١٧٨
[7] الأحزاب: ٥٠
[8] آل عمران: ٩٧
[9] متفق عليه. سبل السلام ١١٨/٣.

## ماناکانی بەکارهێنانی فەرمان

فەرمانکردن بۆ چەندین مانا بەکار دێ، گرنگترینیان:

١- فەرزکردن (الایجاب): وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿أَقِمِ الصَّلاَةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ ...﴾[١].

٢- هاندان (الندب)، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً...﴾[٢]. ﴿...وَأَحْسِنُوَاْ...﴾[٣].

٣- ڕێپێدان (الاباحة): وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُواْ...﴾[٤].

٤- ڕێنماییکردن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ...﴾، ﴿...وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ...﴾.[٥]

٥- هەڕەشەکردن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[٦].

٦- منەت بەسەرداکردن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللّهُ...﴾[٧].

٧- ڕێزلێنان: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...ادْخُلُواْ الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[٨].

---

[١] الإسراء: ٧٨

[٢] النور: ٣٣ بەپێی ڕاسترین را ئەوە بۆ هاندانە، بەلای دلودی زاهیری و کۆمەڵێکەوە بۆ واجببوونە.

[٣] البقرة: ١٩٥

[٤] المائدة: ٢

[٥] البقرة: ٢٨٢-

ئەمە بەلای ئەوەی پێی وایە بۆ ڕێنوێنیکردن (ارشاد)ە، هەندێ لەوانە مەزەبی زاهیری پێیان وایە بۆ واجببوونە، ڕێنوێنی بۆ بەرژەوەندیی دنیایە بەلام نەدب پەیوەندی بە بەرژەوەندیی ئاخیرەتەوە هەیە، هەروەها ئیرشاد پاداشتی تێدا نیە. شرح الكوكب المنير ٣٢٢/٣. جیاوازی لەنێوان ئیرشاد و نەدب ئەوەیە لە ئیرشاددا بەرژەوەندی دنیاییە بەلام لە نەدبدا بۆ ئەودنیایە.

[٦] فصلت: ٤٠

[٧] المائدة: ٨٨

[٨] النحل: ٣٢

٨- دروستكردن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾[١].

٩- دەستەپاچەكردن (التعجين): ﴿...فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِه...﴾[٢].

١٠- پاڕانەوە: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ﴾[٣].

١١- پەندوەرگرتن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...انظُرُواْ إِلِى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ...﴾[٤].

١٢- ئاگەداركردنەوە یاخود ترساندن (الانذار): وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلاً...﴾[٥].

١٣- یەكسانكردن (التسوية): وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا...﴾[٦].

١٤- بێنرخكردن (التحقير): وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...أَلْقُواْ مَا أَنتُم مُّلْقُونَ﴾[٧].

١٥- سووكایەتی پێكردن (الاهانة): وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ﴾[٨].

١٦- سەرسوڕمان: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿انظُرْ كَيْفَ ضَرَبُواْ لَكَ الأَمْثَالَ﴾[٩].

---

[١] النحل: ٤٠

[٢] البقرة: ٢٣- پەیوەندی لەنێوان ئەوە و واجببووندا دژیەكییە، لەبەرئەوەی تەعجیز لە نەكردەكانە (الممتنعات)، بەڵام واجبكردن لە مومكینەكانە.

[٣] إبراهيم: ٤١

[٤] الأنعام: ٩٩

[٥] الزمر: ٨

[٦] الطور: ١٦

[٧] يونس: ٨٠ -لە چیرۆكی موسادا قسە لەگەڵ سیحربازەكان دەكا كە ئیشەكەی ئەوان لەبەرانبەر موعجیزەدا بێنرخە.

[٨] الدخان: ٤٩ - هەندێ پێی دەڵێن (التهكم)، پێوەرەكەی ئەوەیە لەفزێك بەكار بێ رواڵەتەكەی خێر و كەرامەتە، بەڵام مەبەست دژەكەیەتی.

[٩] الإسراء: ٤٨

١٧- بەدرۆخستنەوە: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...قُلْ فَأْتُواْ بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾[1]. ﴿...قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾[2].

١٨- راوێژپێكردن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿... فَانظُرْ مَاذَا تَرَى...﴾[3].

١٩- سەرپشككردن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ...﴾[4].

٢٠- خەفەت پێدان: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ إِنَّ اللّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾[5].

٢١- گاڵتەپێكردن (التسخير): وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...كُونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ﴾[6].

٢٢- لاقرتێ پێكردن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا...﴾[7].

٢٣- هەواڵپێدان: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلاً وَلْيَبْكُواْ كَثِيراً...﴾[8].

٢٤- تەمێكردن: وەك پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ(ﷺ): ((كل مما يليك))[9].

٢٥- داوالێكردن: وەك ئەوەی كەسێك بە یەكێكی هاوئاستی خۆی بڵێ: وا بكە.

زانایان سەبارەت بە كەمی و زۆریی ژمارەی ئەم مانایانە جیاوازن، هۆكەیشی تێهەڵكێشبوونی ماناكان و جیاوازیی لێ تێگەیشتنیانە، پاشان قەرینە (جێبەند یاخود سیاق) رۆڵێكی گەورەی لە دیاریكردنی جۆری بەكارهێنانەكەدا هەیە.[1]

---

[1] آل عمران: ٩٣

[2] البقرة: ١١١

[3] الصافات: ١٠٢

[4] طه: ٧٢

[5] آل عمران: ١١٩

[6] البقرة: ٦٥ مەبەست لە (التسخير) لێرەدا گاڵتەپێكردن (سوخريه)یە نەك بە مانای دروستكردن وەك هەندێ گوتویانە.

[7] الزخرف: ٨٣

[8] التوبة: ٨٢

[9] رواه الشيخان وغيرهما. وهو قوله (ﷺ) لعمر بن أبي سلمة في حال صغره: ((يا غلام.. سم الله وكل مما يليك)). متفق عليه.

بازنەی جیاوازیی نێوان زانایان لە ئوسولناس و شەرعزان سەبارەت بە دیلالەتی راستەقینەی فەرمان فراوان بووە، چونکە بەکارهێنانی بەچەندین شێواز –وەك پێشتر بینیمان– مانای وانیە فەرمانەکە لە هەرهەموویاندا راستەقینەیە. جا ئەگەر فەرمانێك لە دەقێکی کیتاب (قورئان) یان سوننەدا هات، ئاخۆ ئەوە بەڵگەی واجببوونیەتی و نەکردنی بێ گوێیی و شایستەی سزادانە؟ یان بۆ هاندان (نەدب)ـە؟ یان بۆ رێپێدانە (الاباحە)؟ یان مانایەکیتر لەو مانایانەی رابردوو؟

هەموولا کۆکن لەوەدا کە (سیغەی ئەمر) لە سەرجەم ئەو مانایانەی راستەقینە (واتە حەقیقی) نیە، لەبەرئەوەی گاڵتەپێکردن و دەستەپاچەکردن و بێنرخکردن و سافکردن و هیتر تەنیا بە هاتنی سیغەی ئەمر وەرناگیرێن، بەڵکو بە قەرینەکان ئەو مانایانەیان لێ دەخوێنرێتەوە.[2]

هەروەها کۆکن لەسەر ئەوەی سیغەی فەرمانکردنەکە ئەو مانایە دەگەیەنێ کە ئەو قەرینەی لەگەڵی هاتووە دیاری دەکا، لە بارێکدا لەسەر ئەو قەرینەیە کۆك بن.

بەڵام لە پێنج شتدا زانایان ناکۆکن کە بریتین لە:

جیاوازی لە پێنج شتدایە کە بریتین لە: واجبکردن (الوجوب)، پێخۆش (الندب)، رێپێدان (الإباحة)، پاکدانان (التنزیه)، حەرامکردن (التحریم).

هەروەها وتراوە لە رێنوێنی و هەڕەشەیشدا.

زانایان لەوەدا رای جیاوازیان هەیە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١– حەقیقەتە بۆ واجبکردن و بە قەرینە نەبێ نابرێ بە لایەکیتردا، ئەمە رای جمهورە.

---

[1] بڕوانە: مسلم الثبوت ١/٣٠٠– مطبعة الحسينية المصرية فرج الله زكي الكردي. لرشاد الفحول للشوكاني ل٩٣ ل٩٣ و پاشتر.

الإحكام في أصول الأحكام للآمدي ٢/١٣.. المستصفى للغزالي ص٢٩٣. مطبعة شركة الطباعة الفنية المتحدة.. البيضاوي مع الأسنوي ٢/١٢ و پاشتر.. شرح الكوكب المنير ص٣٢٠ و پاشتر.

[2] بڕوانە: المحصول للرازي، تحقيق د.طه جابر، الطبعة الأولى، الجزء الأول، القسم الأول، ص٦٢.

ئەبوبەکر ئەلەجەصاص کە حەنەفییە دەڵێ: ئەوە ڕێبازی هاوەڵانمانە.[1]

ئەلقەرافی لە مەزەبی مالیکی دەڵێ: ئەوە لای مالیك و هاوەڵانی بۆ واجبکردن دانراوە.[2]

ئەبو ئیسحاقی شیرازی لە شافیعی دەڵێ: بە گوتەی زۆربەی هاوەڵانمان ئەگەر شێوەی فەرمانکردنەکە بەڕووتی بوو واجبکردن دەخوازێ.[3]

ئەلمەرداویی حەنبەلی لە کتێبەکەی (التحریر)دا دەڵێ: فەرمانکردن بەڕووتی بەبێ قەرینە حەقیقەتە بۆ واجبکردا.[4]

ئیبن حەزمی زاهیری[5] دەڵێ: ئەوەی لە فەرمان تێدەگەین ئەوەیە فەرماندەر ویستوێتی ئەوە ببێ کە فەرمانی پێکراوە و فەرمانپێکراوی بەو فەرمانە پابەند کردوە.

٢– حەقیقەتە بۆ پێخۆشبوون : ئەوە رای ئەبوهاشم و موعتەزیلە بەگشتی و کۆمەڵێ لە شەرعزانە.[6]

٣– هەروەها گوتراوە حەقیقەتە بۆ ڕێپێدان، لەبەرئەوەی ئەوە (موحەقەق)ـە و ئەسڵ داوانەکردنە، ئەوەیش قسەی هەندێ لە مالیکییە.[7]

٤– گوتراوە هاوبەشیەکی لەفزییە لەنێوان واجبکردن و پێخۆش و ڕێپێداندا.

٥– گوتراوە هاوبەشێکی مەعنەوییە، واتە حەقیقەتە لە ئەندازەی هاوبەش

---

[1] بڕوانە: أصول الفقه للجصاص. ف٩٦–ب مخطوطة دار الكتب المصرية. أصول السرخسي ١/١٨.

[2] بڕوانە: شرح تنقيح الفصول في اختصار المحصول في الاصول للإمام الكبير شهاب الدين أبي العباس أحمد بن ادريس القرافي المالكي (ت–٦٨٤هـ) ط/١، ص١٢٧.

[3] بڕوانە: اللمع في أصول الفقه للإمام أبي اسحاق ابراهيم بن علي بن يوسف الشيرازي الفيروز آبادي الشافعي (ت–٤٧٦هـ) ط٣، ١٣٧٧هـ، ١٩٥٧م، ص٧.

[4] بڕوانە: مختصر التحرير لإبراهيم الفتوحي، الطبعة الأولى ١٣٧٢هـ، ١٩٥٣م، مطبعة السنة المحمدية.

[5] الإحكام في اصول الأحكام ٣/٢٥٩

[6] البيضاوي مع البدخشي والأسنوي ٢/١٨

[7] الأسنوي ٢/١٨

(داواكـە) لـەنێوان واجبكـردن و پێخۆشـدا.[1] ئـەوەيش قسـەی ماتريدييـە لـە حەنەفی.

٦- گوتراوە هاوبەشێكی مەعنەوييە، واتـە حەقيقەتـە بـۆ مۆڵەتپێـدان (ئەنـدازەی هاوبەش) لەنێوان واجبكردن و پێخۆش و ڕێپێداندا.

٧- گـوتراوە هاوبەشـيەكی لەفزييـە لـەنێوان ئـەو سـيانە باسـكراوە و ئيرشـاد و هەڕەشەلێكردندا.

٨- گوتراوە هاوبەشە لەنێوان پێنج حوكمەكەدا.

٩- هەندێ لە زانايان، لەوانە ئەبوبەكری ئەبهەری لە مەزەبی مـاليكی پێيـان وايـە فەرمانەكانی خوا واجبكردن و فەرمانەكانی پێغەمبەری خـوا پێخـۆش (نـەدب) دەخوازن.[2]

١٠- هەنـدێ زانـا لەگـەڵ ڕاوەسـتان بـوون لـە ديـاريكردنی مانـای ڕاسـتەقينەی فەرماندا، لەبەرئەوەی لە (ئيتلاق)دا زۆر مانا هەڵدەگرێ، لەبەرئـەم شـيمانەيە خاوەنانی ئەم ڕايە دەوەستن تا ڕوونكردنەوە دێ، ئەمانەيش دوو پۆلن:

أ- ئيبن سەريج كە شافيعييە، لە ئەشعەری و لە هەندێ شيعەوە دەگێڕێتەوە: وەستان لـە ديـاريكردنی مانـای مەبەسـت لـە فەرمانەكـە لـە بـەكارهێنان، لەبەرئەوەی بـەلای ئەوانـەوە بـە هاوبەشـی بـۆ وجـوب و نـەدب و ئيباحـە دانـراوە، جـا ئەگـەر فـەرمانێك هـات ئـەو سـێ مانايـە هەڵـدەگرێ و بـۆ ديـاريكردنی مەبەسـت ڕوونكردنـەوە پێويسـتە، بۆيـە دەوەسـتن تـا ئـەو ڕوونكردنەوەيە دێ.[3]

---

[1] ابن السبكي، لە: الإبهاج (٢/١٥)دا دەڵێ ئەوە ڕای ئەبو مەنسوری ماتريدييە.

[2] المحصول للرازي، سەرچاوەی پێشوو.

[3] بڕوانە: مختصر المنتهى بشرح العضد وحاشية السعد ٢/٧٠. ارشاد الفحول ص٩٤.

ب- هەرچی غەزالی و قازی باقلانی و ئەشعەرییە لە ریوایەتێکدا و کۆمەڵێ لە لێکۆڵەران، وەستان لای ئەوان لە دیاریکردنی ئەوەدایە فەرمانەکەی بەراستەقینە بۆ دانراوە. غەزالی لە (المستصفی)دا بەڕاشکاوی ئەم ڕێبازەی راگەیاندوە و هەڵیبژاردوە.[1]

**بەڵگەکانی جمهور:**

جمهور لە چەند روویەکەوە بەڵگەی لەسەر ئەوە هێناوەتەوە کە فەرمانی بێ قەرینە بۆ واجبکردنە لەوانە:

١- خوا سەرکۆنەی ئیبلیسی کردوە لەسەر گوێنەدانی بە فەرمان، جا ئەگەر فەرمانی رووت بۆ واجبکردن نەبوایە خوا ئیبلیسی لەسەر تەرککردنی سەرکۆنە نەدەکرد، بەڵگەیش لەسەر ئەمە ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ ألاّ تَسْجُدَ إذْ أمَرْتُكَ...﴾[2]، لەبەرئەوەی (ما) لە (ما منعك) ئیستیفهامی ئینکارییە.

٢- ئەوەی پشت دەکاتە فەرمان سەرپێچی دەکا. هەموو سەرپێچیکارێکی فەرمانیش لەسەر لێواری سزایە. کەواتە ئەوەی پشت دەکاتە فەرمان لەسەر لێواری سزایە لەبەر ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿...فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أمْرِهِ أن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ ألِيمٌ﴾[3].

٣- ئەوەی واز لە فەرمانپێکراو بێنێ فەرمانشکێنە، لەبەرئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿قَالَ يَا هَارُونُ، مَا مَنَعَكَ إذْ رَأيْتَهُمْ ضَلُّوا ألاّ تَتَّبِعَنِ، أفَعَصَيْتَ أمْرِي؟﴾[4].
هەموو فەرمانشکێنێکیش لە ئاگردایە لەبەرئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿...وَمَن

---

[1] المستصفى للغزالي ص٢٩٦ .
[2] الأعراف: ١٢
[3] النور: ٦٣
[4] طه: ٩٣-٩٢

يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾[1]. واتە ئەوەی فەرمانپێکراو واز لێدێنیٚ لە ئاگردایە. کەواتە فەرمان حەقیقەتە لە واجبکردندا.

ناکۆکی لەسەر ئەم ئەسڵە، جیاوازی لە مەسەلە فەرعیەکان لیٚ کەوتۆتەوە، لەوانە:

أ- لەبارەی حوکمی دەنگ بەرزکردنەوە لە تەلبیەکردنی حەجدا[2] جیاواز بوون: جمهور پێی وایە پێخۆش واتە موستەحەبە، زاهیری گوتویانە واجبە، هۆی ناکۆکیەکەیش جیاوازیانە لە خواستی ئەو فەرمانەی لە فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ)دا هاتوە کە دەڵیٚ: ((أتاني جبريل فأمرني أن آمر أصحابي أن يرفعوا أصواتهم بالتلبية والإهلال)).[3]. جمهور بەپێی ئیجتیهادی خۆیان فەرمانەکەیان بەمانای پێخۆشبوون (ئیستیحباب) وەرگرتوە، هەرچی زاهیرییە بەمانای واجببوون وەریانگرتوە لەبەرئەوەی حەقیقەتە تێیدا.[4]

ب- لەبارەی حوکمی موتعەی تەڵاق سیٚ رای جیاوازیان هەیە، سەرچاوەی خیلافەکەیان جیاوازییە لە خواستی فەرمانی (وَمَتِّعُوهُنَّ)ـە لەوەی خوا ئەفەرمویٚ: ﴿لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء مَا لَمْ تَمَسُّوهُنُّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعاً بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾[5].

* کۆمەڵیٚ لە ئەهلی زاهیر فەرمانەکەیان بە واجببوون و گشتیبوون وەرگرتوە و گوتویانە: موتعە بەرەهایی لە هەموو تەڵاقدراوێکدا واجبە[6]، ئەوەیش لە هاوەڵان رای

---

[1] الجن: ٢٣

[2] وتنی (لبيك اللهم لبيك)-وەرگێر.

[3] رواه الخمسة وصححه الترمذي وابن حبان. سبل السلام ٢٥٢/٢.

[4] بڕوانە: بداية المجتهد ونهاية المقتصد، لأبن رشد ٢٧٢/١.

[5] البقرة: ٢٣٦

[6] بداية المجتهد ونهاية المقتصد ٨٠/٢- ٨١ .

ئیبن عومەر و لە شوێنکەوتوان رای سەعید بن مسەیب و موجاهیدە.

* مالیك و (لیث) و ئیبن ئەبی لەیلا دەڵێن: موتعە موستەحەبە و واجب نیە، لەبەرئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿حَقّاً عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾، قەرینەیەکە فەرمانی لە حەقیقەتی خۆی لاداوە، چونکە ئەوەی لەڕووی ئیحسان و چاکەوە بێ واجب نیە، هەروەها لەبەرئەوەی ئەگەر واجب بوایە تایبەت نەدەکرا تەنیا بە چاکەکاران.[1]

* هەندێکیتریان وردیان کردۆتەوە، حەنەفی و حەنبەلی و شیعەی ئیمامی و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن موتعە لەسەر هەر مێردێك پێویستە بۆ هەر ژنێك کە مارەیی بۆ دانەنراوە ئەگەر بەر لە چوونەلا واتە بەزاوابوون (دخول) تەلاق درا، ئەویش بەکارکردن بەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ...الآيَة﴾.[2]

وتویانە: لەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً﴾[3]، هەروەها ئەوەی ئەفەرموێ: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ...الآيَة﴾[4]، ئەوە وەردەگیرێ کە ژن لەگەڵ دیاریکردنی بڕی مارەیی یان تەڵاقدران پاش چوونەلا موتعەی ناکەوێ. بەوە حەنەفی و حەنبەلی و ئەوانەی هاوڕایانن فەرمانەکەیان بە مانای واجببوون وەرگرتوە نەك گشتیبوون. شافیعیش لە را کۆنەکەیدا هەمان بۆچوونی هەیە.

لە را تازەکەیشیدا دەڵێ: بەپێی ئایەتی ﴿...فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً﴾[5] موتعە بەرەهایی پاش چوونەلا واجب دەبێ، چونکە ئەوە سەبارەت بەو

---

[1] احكام القرآن لأبن العربي ٢١٦/١ فما بعدها. المغني لأبن قدامة ٧١٣/٦.

[2] لنظر الهداية مع البداية بشرح فتح القدير ٣٢٥/٣– ٢٣٦.

المغني لأبن قدامة ٧١٥/٦. الخلاف للطوسي ٢٥/٢.

[3] الأحزاب: ٤٩

[4] البقرة: ٢٣٧

[5] الأحزاب: ٢٨

ئافرەتانەیە کە مێردەکانیان لەگەڵیان جووت بوون، ئەو مارەییەی دەستی دەکەوێ لەبەرانبەر جووتبوونەکەیە، هەربۆیە موتعە لەبەرانبەر سووککردنە (الإبتذال).

ئەمە ئەگەر بە تەلاق جیابوونەوە رووی دا، بەلام ئەگەر بە مردن بوو یان بەهۆی ژنەکەوە بوو موتعە واجب نابێ، لەبەرئەوەی موتعە لەبەر ئەو سووککردنەی بەعەقدەکە تووشی دەبێ و کەمبوونەوەی حەزی خەڵك بۆ خواستنی پاش تەلاقدران، واجب بووە.

بەلام ئەگەر بەهۆی پیاوەکەوە بوو وەك لە ئاین هەڵگەڕانەوە و لیعانکردن، یان بەهۆیەکی بێگانەی وەك شیردانەوە بوو، ئەوا حوکمەکەی حوکمی تەلاقە.[1]

ج- لەبارەی حوکمی تۆمارکردنی گرێبەندی قەرز و شایەتیدان لەسەری جیاواز بوون، هەروەها لەبارەی حوکمی نووسین بۆ نووسەرەکە و لەبارەی حوکمی شایەتیدان لەسەر گرێبەندی فرۆشتن:

سەرچاوەی ناکۆکیەکە جیاوازییە لە خواستی ئەو فەرمانەی لەم فەرمایشتەی خوادا هاتوون: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللّهُ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئاً فَإن كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهاً أَوْ ضَعِيفاً أَوْ لاَ يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى وَلاَ يَأْبَ الشُّهَدَاء إِذَا مَا دُعُواْ وَلاَ تَسْأَمُوْاْ أَن تَكْتُبُوْهُ صَغِيراً أَو كَبِيراً إِلَى أَجَلِهِ ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ اللّهِ وَأَقْومُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلاَّ تَرْتَابُواْ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلاَّ تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوْاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ وَإِن تَفْعَلُواْ فَإِنَّهُ فُسُوقٌ بِكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللّهُ وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ

---

[1] بڕوانە: المهذب للشيرازي ٢/٦٣.

عَلِيمٌ﴾[1].

* سەبارەت بە تۆمارکردنی قەرزەکە و بوونی شایەت تێیدا ئیبن حەزمی زاهیری و ئەوانەی هاوڕاین دەڵێن، گرێبەندەکە ڕاست و دروست نابێ تا لە قەواڵەیەکی نووسراودا جێگیر نەکرێ و بە ئامادەبوونی شایەت نەبێ، لەبەرئەوەی ئەو فەرمانانەی لەو بارەوە لە دەقە قورئانیەکەدا هاتوون بەزاهیر ئاماژەن بۆ واجیبوون، تەرازان لە زاهیریش بەبێ بەڵگە نابێ، هیچ بەڵگەیش نیە.

بەڵام جمهور پێیان وایە خواست (موقتەزا)کەی نەدبە نەك واجیبوون، لەبەرئەوەی موسڵمانان لە سەرجەم وڵاتانی ئیسلامیدا مامەڵە داراییەکانیان بە نرخی دواخراو ئەنجام دەدا بەبێ نووسین یان بوونی شایەت، ئەوەیش کۆدەنگییە لەسەر واجبنەبوون، هەروەها لەبەرئەوەی توندگیری و زەحمەتکردنی تێدایە، پاشان قەرز و کڕین و فرۆشتن لە سەردەمی هاوەڵان و شوێنکەوتواندا هەبووە بەڵام نەزانراوە نووسین و شایەتگرتنیان کردبێ.

* لەبارەی حوکمی نووسین لەلایەن نووسەرەکەوە[2]، شەعبی و ئەوانەی هاوڕاین دەڵێن: ئەوە فەرزی کیفایەیە لەسەر نووسەر، وەك جیهاد و نوێژی مردوو.

هەندێ شەرعزانی کوفە گوتویانە: لەکاتی دەستبەتاڵیدا فەرزە لەسەری.

موجاهید و (عطاء) گوتویانە مەندوبە (واتە پێخۆشە).

(الضحاك) و ئەوانەی هاوڕاین دەڵێن حوکمەکە نەسخ کراوەتەوە.

ئیبنول عەرەبی[3] دەڵێ ڕاستیەکەی ئەوەی فەرمانی ڕێنوێنیکردن (ئیرشاد)ـە، بۆیە (نووسەرەکە) تا مافی خۆی وەرنەگرێ، ناینووسێ.

* لەبارەی بوونی شایەت لەسەر گرێبەندی فرۆشتن، داودی زاهیری و ئیبن حەزم

---

[1] البقرة: ٢٨٢

[2] بڕوانە: أحكام القرآن لأبن العربي ٢٤٨/١.

[3] محمد بن عبدالله بن محمد بن عبدالله بن أحمد، ناسراو بە (إبن العربي)ـە، کە مالیکییە (لە ٥٤٣ ك مردووە).

و ئەبوجەعفەری تەبەری پێیان وابووە پێویستە هەردوو گرێبەندوان دوو پیاو یان پیاوێك و دوو ئافرەت بکەنە شایەت لەسەر فرۆشتنەکەیان، چونکە ئەوە خواستی ئەو فەرمانەیە لە ﴿وَأَشْهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾دا هاتووە، جا بابەتی عەقدەکە کەم بێ یان نا، ئەمە رای ئەبوموسای ئەشعەرییە لە هاوەڵان و زەحاك و عەتا و سەعید بن مسەیب و ئیبراهیمی نەخعی لە شوێنکەوتوان، تەنانەت ئیبراهیم دەڵێ: ئەگەر کڕیم و ئەگەر فرۆشتم شایەت دەگرم با بەستەیەك پاقلەیش بێ.[1]

جمهور رایان وایە خواستی فەرمانەکە لێرەدا نەدب یان ئیرشادە بە بەبەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر فرۆشتن و رەهنی کردوە بەبێ بوونی شایەت، کردەوەی هاوەڵان و شوێنکەوتوانیش بەڵگەیە، هەروەها کارەکە بەو شێوەیە زەحمەت و قورس دەبێ، کە شەریعەتی ئیسلامی رەتی دەکاتەوە.

تاقمێك گوتویانە: ئەوە بۆ واجیبوون بووە بەڵام بە ئایەتی ﴿...فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضاً فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ...﴾[2] نەسخ کراوەتەوە. بەڵام تەبەری بەرپەرچی ئەوانەی داوەتەوە و گوتوێتی ئەمە حوکمی ئەو کەسەیە نووسەرێك نەدۆزێتەوە، خوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِباً فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ...الآية﴾[3]، ئەگەر بکرێ ئەوە نەسخکەرەوەی یەکەم بێ ئەوا دەکرا ئایەتی تەیەموم نەسخکەرەوەی ئایەتی دەستنوێژ بێ.[4]

ئیبنول عەرەبی بە کردەوەی پێغەمبەر(ﷺ) قسەکەی جمهوری تەرجیح کردوە و دەڵێ: لەبارەی ئەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿...وَأَشْهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ...﴾[5] بوون بە دوو رای جیاوازەوە، یەکێکیان پێی وایە فەرزە، ئەوە رای زەحاکە، دووەمیان دەڵێ

---

[1] بروانه: المحلى لأبن حزم ٣٤٤/٨.

[2] البقرة: ٢٨٣

[3] البقرة: ٢٨٣

[4] بروانه: تفسير الطبري ٨٤/٦، تفسير القرطبي ٤٠٤/٣. المحلى ٣٤٤/٨.

[5] البقرة: ٢٨٢

نەدبە، ئەوەیش قسەی ئەلکافەیە هەر ئەوەیش راستە، پێغەمبەر شتی فرۆشتوە و شایەتی بۆ نەگرتوە، قەڵغانەکەی کڕیوە و کردویەتی بە بارمتە (رەهن) لای جولەکەیەك و شایەتی نەگرت، ئەگەر شایەتگرتن واجب بوایە لەگەڵ رەهن واجب دەبوو لەبەر مەترسی دروستبوونی کێشە.[1]

**زاڵکردن:**

وای دەبینم رای زاڵ لە بابەتی موتعەدا قسەکەی شافیعییە (رەحمەتی خوای لێبێ)، لەبەرئەوەی شیکردنەوەکەی بەهێزتر و حوکمەکەی عادیلانەترە، هەروەها نەیاری قسەکەی مالیك و ئەوانەیە هاوڕاین بەوەی تەڵاقە لە نیکاحێکدا کە باتی دەخوازێ، هەروەها بەوەی ئایەتی ﴿حَقّاً عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ جەخت لە واجببوون دەکا لەبەرئەوەی (حق) دەقە لە واجببووندا، هەروەها لەبەرئەوەی ئەنجامدانی واجب بە ئیحسان حسێبە و تێکگیران لەنێوان ئەو دووانەدا نیە. رای ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین رەت دەکاتەوە بەوەی لەو رووەوە مارەیی بۆ واجب نەکراوە موتعە جێی گرتۆتەوە.

لە مەسەلەی تۆمارکردنی قەرز و شایەتیدان لەسەری، هەروەها شایەتیدان لەسەر گرێبەندەکە، لای من رای زاڵ قسەی زاهیری و هاوڕاکانیانە، بۆیە پێویستە قەرزەکان تۆمار بکرێن و شایەت تێیاندا ئامادە بێ، هەروەها جێگیرکردنی ئەو گرێبەندانەی لەسەر خانوبەرە و گوێزراوە بەنرخەکان دەکرێ. لەبەر کۆمەڵە هۆیەك، لەوانە:

١- ئەو فەرمانانەی لەو بارەوە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون بەڕواڵەت ئەوە دەگەیەنن، بەبێ بوونی بەڵگەیش ماناکە لە زاهیرەوە لانادرێ بۆ مانایتر، کارکردنی هەندێ خەڵك بەپێچەوانەی ئەوە بەبەڵگە دانانرێ، ئیدیعای ئیجماعیش قەدەغەیە.

---

[1] احكام القرآن لأبن العربي ٢٥٩/١

٢- تۆمارکردن لە پێغەمبەرەوە ریوایەت کراوە، دەقی نووسینەکەی دەڵێ: ((بسم الله الرحمن الرحيم، هَذَا مَا اشْتَرَى الْعَدَّاءُ بْنُ خَالد بْنِ هَوْذَةَ منْ مُحَمَّدٍ رَسُـولِ الله (ﷺ)، اشْـتَرَى منْـهُ عَبْـدًا أَوْ أَمَـةً، لاَ دَاءَ، وَلاَ غَائلَـةَ، وَلاَ خِبْثَـةَ، بَـيعَ الْمُسْـلِمِ لِلْمُسْلِمِ)).[1]

٣- ژیانی بازرگانی پەرەی سەندوە و مامەڵە دارابیە ئاڵۆزەکانی ئەم سەردەمە بە مامەڵە سادەکانی پێشتری نێوان خەڵك بەراورد ناکرێ، ئەمە جگە لەوەی دڵ و دەروونـەکان گـۆڕاون، پاڵنـەری ئـاینی لاواز بـووە، ئەمانـەت کـەمی کـردوە و متمانە نەماوە.

٤- بە دەستگرتن بە رای زاهیری و هاوڕاکانیانەوە دەرگا لە فەوتانی مـافی خـەڵك دادەخرێ، لەبەرانبەردا کارکردن بە رای جمهور واڵاکردنـی دەرگـای نـاکۆکی و دژبەرییە، هەرچـی کـاری نووسـەرە (نووسـەری گرێبەنـدی قـەرز) راجـیح رای ئیبنول عەرەبییە، کە پێی وایە بۆی هەیە نەینووسێ تا مافی خۆی وەرنەگرێ، چـونکە خـوا ئەفـەرموێ: ﴿وَلاَ يُضَـآرَّ كَاتِـبٌ﴾ (واتـە: زیـان بـە نووسـەر نەگەیەنرێ).

---

[1] ابن ماجه ٧٥٦.

## لقی دووەم:
## جیاوازی لەبارەی خواستی فەرمان
## بۆ جارێک یان دووبارە

ناكۆكی لەنێوان زانایان لە ئوسوڵناس و شەرعزاندا نیە لەوەدا كە یەك جار زەرورەییە، لەو رووەوە چییەتی (ماهیەت) لە دەرەوە وجودی نیە، لە چوارچێوەی تاكەكانیدا نەبێ، نەك لەو رووەوە كە ئاماژەپێدراو (مدلول)ە.

هەروەها ناكۆكی لەوەدا نیە كە ئەو فەرمانەی بەندكراوە بەوەی جارێك یان دووبارە ئەنجام بدرێ، بەو شێوەیە وەردەگیرێ كە پێی بەند كراوە.[1] بەڵكو ناكۆكی لە دیلالەتی فەرمانەكەیە بۆ زیاد لەو ئەندازەیەی چییەتی پێ بەدیدێ، ئەگەر بەند نەكرابوو بەوەی ئاماژە بێ بۆ دووبارە یان یەك جار. لەوەدا چەند رایەكی جیاواز هەیە، گرنگترینیان چوارن و بریتین لە:

١- جمهور رای وایە فەرمان ئاماژەیە بۆ داوای بەدەستهێنانی ماهیەت بەبێ دیاریكردنی ئەوەی ئاخۆ بۆ یەك جارە یان بۆ دووبارەكردنەوە. ئیمام ئەلحەرەمەین و رازی[2] و بەیزاوی[3] و ئیبنول حاجب[4] و ئامەدی[5] و حیللی[6] ئەمەیان هەڵبژاردوە و بۆ راكەیان پشتیان بە چەند بەڵگەیەك بەستوە، لەوانە:

---

[1] بڕوانە: القواعد والفوائد الأصولية لابن اللحام ص١٧١.

[2] المحصول، سەرچاوەی پێشوو ص١٦٢.

[3] الأسنوي مع البدخشي ٢/٣٧ .

[4] مختصر المنتهى مع العضد والسعد ٢/٨٠ .

[5] الإحكام في أصول الأحكام للآمدي ٢/٢٢.

[6] مبادئ الوصول إلى علم الأصول. ص٩٤ .

أ- ئەگەر ماناى يەكێكيانى بگەياندايە بەندكردنى بەو مانايە دووبارەكردنەوە و بە جگە لەوە هەڵوەشاندنەوە (نقض)ى دەخواست. لازمەكە بەتاڵە لەبەرئەوەى بەندكردنەكە نابێتە مايەى هيچكام لە دوو شتەكە، هەروەها مەلزوميش لەبەرئەوەى لازمى يەكسان يان تايبەتتر بەتاڵيى مەلزومەكەى دەخوازێ. [1]

ب- لە شەرعدا هەندێ جار بۆ دووبارەكردنەوە هاتووە وەك فەرمانكردن لە ئايەتى نوێژدا، هەندێ جاريش بۆ يەك جارە، وەك فەرمانكردن لە ئايەتى حەجدا، ئەندازەى هاوبەشى نێوانيان ئەوە دەگەيەنێ فەرمانەكە حەقيقەتە، كە ئەويش داواى ئەنجامدانى فەرمانپێكراوەكەيە نەوەك هاوبەشى لەفزى و مەجاز رووبدات كە لە كردنى بە بابەت بۆ هەردووكيان يان تەنها بۆ يەكێكيان دەكەوێتەوە لەو رووەوە (هەردووكيان) پێچەوانەى ئەسڵن، ئەوكاتە هيچكاميان نە بارێكى دياريكراو دەگەيەنێ و نە رەتى دەكاتەوە. [2]

٢- فەرمان دووبارەكردنەوە دەگەيەنێ لە هەموو تەمەندا بەپێى توانا، ئەگەر ئاماژەيەكى واى تێدا نەبوو شتێكيترى جياواز لەمە بگەەينێ. ئيبنول حاجب دەڵێ[3]: ئەمە هەڵبژاردنى مامۆستا ئەبوئيسحاقە. ئيبن ئەللەحام دەڵێ[4]: ئەوە مەزەبى ئيمام ئەحمەد و هاوەڵانيەتى. هەروەها راى ئەبوئيسحاقى ئەلئەسفەراينييە بەڵام بەگوێرەى تاقەت و ئيمكان، ئەبوحاتەم ئەلقەزوينى و عەبدولقادرى بەغداديش وايان گوتوە. ئەوانەى ئەم بۆچوونەيان هەيە پشتيان بە چەند بەڵگەيەك بەستووە لەوانە:

---

[1] البدخشي مع الأسنوي ٢/٤٣- ٤٤.

[2] المحصول للرازي، سەرچاوەى پێشوو.

[3] مختصر المنتهى مع العضد والسعد ٢/٨٢ .

[4] القواعد والفوائد الأصولية ص١٧١ .

أ- كۆدەنگیی بێدەنگبوون (الاجماع السكوتي): كاتێ ئەهلی ریددە (هەڵگەڕاوەكان) زەكاتیان نەدا ئەبوبەكر لە واجیبوونی دووبارەبوونەوەیدا پشتی بە ئایەتی ﴿...وَآتُواْ الزَّكَاةَ...﴾ بەست و كەس لە هاوەڵان لەوەدا بەرهەڵستیان نەكرد، ئەمەیش كۆدەنگییەكە لە بێدەنگبووندا لەسەر دووبارەكردنەوە.[1]

ب- ئەگەر فەرمانەكە بۆ دووبارەكردنەوە نەبوایە نەسخكردنەوەی بەسەردا نەدەهات لەبەرئەوەی ئیتر پاش جارێك كردنی فەرمانپێكراوەكە نەدەما[2]، چونكە بەسەرداهاتنی (نەسخ) پاش ئەنجامدانی (فەرمانەكە) مەحاڵە، لەو رووەوە كاتێ پێشی بداء بێ (دەركەوتنی بەرژەوەندی پاش دیارنەبوونی یان بەپێچەوانەوە) تەكلیف نابێ، ئەمەیش بۆ خوا مەحاڵە، بەڵام هاتنی نەسخ جائیزە، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بۆ دووبارەكردنەوەیە.

٣- فەرمان یەك جار دەگەیەنێ و نە دووبارەكردنەوە واجب دەكات و نە هەڵیشی دەگرێ، مەگەر بە مەرجێكەوە ببەسترێتەوە، وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿...وَإِن كُنتُمْ جُنُباً فَاطَّهَّرُواْ...﴾. ئیمام ئەلحەرەمەین دەڵێ: ئەم قسەیە لە هەندێ مشایخەكانی حەنەفی گوێزراوەتەوە، هەروەها قسەی هەندێ لە شافیعیەكانە[3]. خاوەنانی ئەم رایە پشتیان بە چەند بەڵگەیەك بەستووە لەوانە:

أ- جێبەجێكردنی فەرمان بە كەمتر لە جارێك بەدینایەت، ئەوەیش دەبێتە ئاماژە بۆی.

ب- ئەگەر كەسێك وتی خالید خێری كرد یان خێر دەكا، قسەكە بەردەوامیدان بە خێركردنی تێدا نیە، بەڵكو یەك جار هەست بە كردەوەكە دەكرێ، دەبا

---

1 صفوة البيان شرح منهاج البيضاوي ٢/١٤.

2 سەرچاوەی پێشوو.

3 البرهان مخطوطة المكتبة المركزية- بغداد.

سیغەی فەرمانەکە وابێ.

پاش ئەمەی باس کرا، پێم خۆشە ئەم سەرنجانەی خوارەوە بخەمەروو:

١- سەرچاوەی ناکۆکیی هەمووان ئەوەیە شەرعدانەر فەرمانی هەم بۆ یەك جار وەك لە حەج، هەم بۆ دووبارە (تیکرار)یش بەکارهێناوە وەك لە نوێژ و زەکات و رۆژوو و جیهاددا.

٢- سەرجەم بەڵگەکان کە خاوەنانی هەر چوار رایەکە خستنیانە روو قابیل بە رەخنە و قسە لەسەرکردنن، وەك لە کتێبەکانی ئوسولدا روون کراوەتەوە.

٣- لە قورئانی پیرۆز یان سوننەدا بەکەمی فەرمانێکی رەها بەبێ قەرینەیەك ئاماژە بێ بۆ دووبارە دەبینین، وەك لە نوێژ و رۆژوو، یان بۆ یەك جار وەك بۆ نموونە لە حەجدا، لەبەرئەوەی هەریەك لە دووبارە و یەك جار لە سروشتی کردارەکە و جێبەندەکەیەوە دەزانرێ، لەبەرئەوە مەسەلە فیقهییە جێناکۆك (خیلاف)یەکان کە لە جیاوازبوون لەم رێسا ئوسولییە دەکەونەوە، زۆر کەمن ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ ئەو مەسەلە خیلافیانەی لە جیاوازی لە رێسا ئوسولیەکانیتر دەکەونەوە.

٤- رای هەڵبژێردراو لە دیدی مندا ئەوەیە فەرمانی رەها و دابڕاو لە قەرینە بۆ داوای رەهایە، چونکە بەگوێرەی دیلالەتە زمانەوانیەکانی لەفزە عەرەبیەکان کە قورئانی پیرۆزی پێ دابەزیوە و سوننەتی پێغەمبەری پێ هاتووە، مەبەست لەو لەفزانە دیاری دەکرێ کە ئاخۆ بۆ یەك جارە یان بۆ دووبارە.

## له مه‌سه‌له خیلافیه‌کان که له جیاوازیوون له‌م ئه‌سڵه که‌وتونه‌ته‌وه ئه‌مانه‌ن:

١– شه‌رعزان سه‌باره‌ت به‌وه‌ی ئاخۆ دروسته چه‌ند فه‌رزێکی نوێژ به یه‌ك ته‌یه‌موم بکرێن رایان جیاوازه:

حه‌نه‌فی[1] و حه‌نبه‌لی[2] و شیعه‌ی ئیمامی[3] و زاهیری[4] له‌سه‌ر ئه‌وه‌ن ته‌یه‌مومکار ده‌توانێ به ته‌یه‌مومه‌که‌ی چه‌ندی بوێ نوێژی فه‌رز و سوننه‌ت بکا.

مالیکی[5] و شافیعی[6] و ئه‌وانه‌ی هاوڕایانن ده‌ڵێن، بۆی نیه له یه‌ك فه‌رز زیاتری پێ بکات و پێویسته بۆ هه‌ر فه‌رزێك ته‌یه‌موم بکاته‌وه، به‌ڵام ده‌توانێ چه‌ندی ده‌وێ سوننه‌تی پێ بکا، به‌ڵام مالیکی رایان وابووه ئه‌گه‌ر به‌ر له فه‌رزه‌کان سوننه‌ت کرا، فه‌رزه‌که دروست نابێ.

هۆی خیلافه‌که‌یش پێده‌چێ جیاوازی بێ له‌وه‌ی ئاخۆ فه‌رمانکردن به ته‌یه‌موم بۆ یه‌ك جاره یان دووباره؟ ئه‌وه‌ی ده‌ڵێ بۆ دووباره‌یه پێی وایه به‌دووباره‌بوونه‌وه‌ی نوێژ ته‌یه‌مومیش دووباره ده‌کرێته‌وه، ئه‌وه‌یش ده‌ڵێ بۆ یه‌ك جاره پێی وایه ده‌توانێ چه‌ندی بوێ فه‌رز و سوننه‌تی پێ بکا.

زنجانی –له زانایانی شافیعی– ده‌ڵێ: "شافیعی رای وابووه فه‌رمان به‌ره‌ها دووباره‌کردنه‌وه ده‌خوازێ، هه‌روه‌ها کۆمه‌ڵێ له زانایانیش هه‌مان رایان هه‌یه. حه‌نه‌فیه‌ت پێی وایه دووباره‌کردنه‌وه ناخوازێ، ئه‌م ئه‌سڵه هه‌ندێ مه‌سه‌له‌یتری لێ ده‌که‌ونه‌وه، له‌وانه ئه‌وه‌یه به‌لای شافیعیه‌وه دوو فه‌رز له یه‌ك ته‌یه‌ممومدا

---

[1] بڕوانه: الفتح القدير ١٣٧/١ .

[2] نيل المآرب ٢٧/١ .

[3] الخلاف للطوسي ٣٧/١ .

[4] الإحكام في اصول الأحكام لأبن حزم ٣٦٧/٣ و پاشتر.

[5] حاشية الدسوقي على الشرح الكبير للعلامة الدردير ١٤٧/١.

[6] المهذب للشيرازي ٣٦/١ .

کۆناکرێنەوە". [1]

ئەمە قسەی زنجانییە، بەڵام نە لە ریسالەکەی ئیمامی شافیعی و نە لە کتێبەکانی ئوسولّ لای شافیعی دەقێك نیە بەڵگە بێ لەسەر ئەوەی لای شافیعی فەرمان دووبارەکردنەوە دەخوازێ، بەڵکو ئەوەی لە کتێبەکانی شافیعیدایە چەند قسەیەکە، لەپێشترینیان ئەوەیە نە مانای دووبارەکردنەوە و نە مانای یەك جار ناگەیەنێ. [2] خۆ ئەگەر لە مەسەلەیەکدا حوکم بە دووبارەکردنەوە درا ئەوە لەبەر قەرینەیەکە کە ئەو دووبارەکردنەوە دەگەیەنێ، رەنگە ئەوەی لە شافیعی گوێزراوەتەوە لەوەی فەرمان مانای دووبارەکردنەوە دەگەیەنێ، لەوەوە هاتبێ.

تەلمەسانی —لە شەرعزانی مالیکییە— دەڵێ: ئیبن خویز مەنداد، مەسەلەی تەیەمومی لەسەر ئەم ئەسڵە دامەزراندوە، کە ئایا دەبێ لە هەموو نوێژێکدا تەیەموم بکرێ یان یەك تەیەموم بەسەر بەو مەرجەی دەستنوێژ نەشکێ؟ ئەوەی دەڵێ بۆ هەموو نوێژێك واجبە پێی وایە ئەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿...فَتَيَمَّمُواْ صَعِيداً طَيِّباً...﴾ فەرمانێکە ئامازەیە بۆ دووبارەکردنەوە. هەروەها دەڵێ بەڵگەی سوننە وای کردوە دەستنوێژێك بۆ زۆر نوێژ بەکەڵك بێ. [3]

ئیبن حەزم پێی وایە تەیەموم وەك دەستنوێژە و تا دەستنوێژ نەشکێ گرتنەوەی واجب نابێ، ئەوەیش لە هەمان دەق تێدەگەین، دەڵێ: عەلی گوتی ئەوەی دەڵێ بۆ هەموو نوێژێك تەیەمومکردن واجبە، خۆی بە دووبارەکردنەوەوە بەستوە. ئەبومحەمەد دەڵێ: ئەمە هەڵەیە، لەبەرئەوەی دەقی ئایەتەکە تەیەموم واجب ناکا لەسەر ئەو کەسە نەبێ کە دەستنوێژی شکاوە... پاشان دەڵێ: هەرچی

---

[1] تخريج الفروع على الأصول للزنجاني ص٢٢ .

[2] بڕوانە: الأسنوي مع البدخشي ٤١/٢. حاشية البناني على جمع الجوامع ٣٧٩/١ .

[3] بڕوانە: مفتاح الوصول إلى علم الأصول، ص٣٦... سوننەت ئەوەیە پێغەمبەرﷺ رۆژی فەتح بەیەك دەستنوێژ هەر پێنج فەرزەکەی کرد.

دووبارەکردنەوەی تەیەمومە دەقی ئایەتەکە پوچەڵی دەکاتەوە.[1]

٢- شەرعزان لەبارەی مافی ئەو ئافرەتەی سەرپشك کراوە بۆ تەڵاق هەروەها لەبارەی مافی ئەوەی کراوەتە بریکار رایان جیاوازە:

تەڵاق تەڵاقێك یان دووان یان سیانە.. ئەوەی گوتویەتی فەرمان دووبارەکردنەوە ناخوازێ پێی وایە چ ئەوەی سەرپشك کراوە بۆ تەڵاق و چ بریکارەکە تەنها یەك تەڵاقیان هەیە.

ئەلشاشی لە ئوسولەکەیدا دەڵێ: "فەرمانکردن دووبارەکردنەوە ناخوازێ، لەبەرئەوە وتمان ئەگەر وتی ژنەکەم تەڵاق بدە، بریکارەکەیش تەڵاقی دا، پاشان بریکاردار (الموكل)ەوە -بۆ جاری دووەم- مارەی کردەوە بریکارەکە بۆی نیە بۆ دووەم جار بە فەرمانی یەکەم تەڵاقی بداتەوە. هەروەها ئەگەر پێی وت ژنێکم لێ مارە بکە، ئەمە نابێتە ژن لێ مارەکردن جار دوای جار".[2]

ئەلئەسنەوی دەڵێ: لە لقەکانی مەسەلەکە: ئەگەر بە بریکارەکەی وت: ئەم کۆیلەیە بفرۆشە و فرۆشتی، پاشتر لەبەر عەیبداری بۆی گێردرایەوە، یان پێی بڵێ: بە مەرجی بوونی بژارە (الخيار) بیفرۆشە و کڕیار هەڵیوەشاندەوە، بۆی نیە بۆ جاری دووەم بیفرۆشێتەوە.[3]

---

[1] الأحكام في اصول الأحكام، سەرچاوەی پێشوو.

[2] أصول الشاشي ص٣٥ و پاشتر.

[3] التمهيد في تخريج الفروع للإمام جمال الدين أبي محمد عبدالرحيم بن الحسن الأسنوي (ت-٧٧٢)، تحقيق الدكتور محمد حسن هيتو، ص٢٨٣.

## لقی سێیەم:
## جیاوازیوون لەبارەی خواستی فەرمان
## بۆ دەستبەجێ یان لەسەرخۆ

خواستی فەرمان بۆ جێبەجێکردنی دەستبەجێ (فەوری) مانای وایە: پێویستە بەرئەرك (موكەلەف) لەگەڵ بیستنی فەرمانەكە و نەبوونی رێگردا (بەفەوری) جێبەجێی بكا. ئەگەر بەبێ عوزر دواكەوت بەرپرسیار دەبێ. هەروەها خواستی لەسەرخۆ (اتراخی)یش ئەوەیە كەسی بەرئەرك واجب نیە لەسەری فەوری فەرمانەكە جێبەجێ بكا، بەڵكو بۆی هەیە بۆ كاتێكیتر دوای بخا ئەگەر پێی وابوو ئەوكاتە توانای بەسەریدا دەشكێ.

ئەوانەی دەڵێن فەرمان دووبارە دەخوازێ ناكۆكییان نیە لەوەدا كە بەزەرورەت دەشخوازێ جێبەجێكردن دەستبەجێ بێ، دووبارە (التكرار) وا پێویست دەكا بەدرێژایی كات فەرمانەكە جار دوای جار جێبەجێ بكرێتەوە، بۆیە پێویست بە دەستپێشخەری دەكا، بەڵگەیشیان هەمان ئەو بەڵگانەیە لەسەر دووبارە هێنایانەوە، بەڵام ئەم ئەسڵەیش جێكۆك (محل اتفاق) نیە، بەڵكو رای زانایان تێیدا بەسەر چوار بۆچوونی جیاوازدا دابەش بووە:

١- فەرمانی رەها تەنها داوای كردن دەگەیەنێ و نە فەوری و نە لەسەرخۆ ناگەیەنێ، ئەمە رای هەڵبژێردراوە لای هەریەك لە مەزهەبەكانی حەنەفی[1] و شافیعی[2] و شیعەی ئیمامی[3]، پشتیشیان بە چەند بەڵگەیەك بەستوە لەوانە:

---

[1] مشكاة الأنوار في أصول المنار ٣٧/١. هەروەها ئەوەی رازی (المحصول)دا وتویەتی، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٨٩ كە لای حەنەفیەت فەوری دەگەیەنێ بەو رەهاییە راست نیە.

[2] الأسنوي مع البدخشي، ٥٥/٢.

[3] مبادئ الوصول إلى علم الأصول للحلي، ص٩٦.

أ- ئەگەر فەرمانی رەها ئاماژەی جێبەجێکردنی دەستبەجێ یان لەسەرخۆی بگەیاندایە، ئەوا بەندکردنی بە یەکێك لەو دووانە دژیەکی یان دووبارە دەبوو، بەڵام وانیە، کردنی هیچ شێوەکیان بەتایبەت ناگەیەنێ، بەڵکو ئەوە بۆ ئەندازەی هاوبەشە.

ب- بەکارهێنانی لە دەستبەجێدا هاتووە وەك فەرمانکردن بە باوەڕهێنان لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿...فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِه...﴾[1]. ، هەروەها لە لەسەرخۆ-یشدا وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ ...﴾[2]، ئەسڵیش لە بەکارهێناندا راستەقینەیە، بۆیە پێویستە هاوبەشێکی مەعنەوی بێ کە بۆ ئەندازەی هاوبەش دانراوە بۆ خۆلادان لە هاوبەشی لەفزی و مەجاز.

٢- فەرمان جێبەجێکردنی دەستبەجێ (فەوری) دەگەیەنێ، واتە کردنی کردەوە فەرمانپێکراوەکە لە یەکەمین کاتدا کە بکرێ ئەنجام بدرێ، بەشێوەیەك ئەگەر بەرئەرك لەوە دواکەوت گوناهبار دەبێ. واباوە ئەمە بۆچوونی مالیك و حەنبەلیەکان و کەرخی لەناو مەزەبی حەنەفی و هەروەها مەزەبی زاهیرییە.

قەرافی دەڵێ: "بەلای مالیك هەروەها لای مەزەبی حەنەفی بۆ فەورییە، بەپێچەوانەی هاوەڵانی مەغریبیمان و مەزەبی شافیعی"[3]. (صاحب المسودة)ی حەنبەلی دەڵێ "ئەگەر لە فەرمانەکەدا باسی دووبارەکردنەوەی نەهاتبوو، چ بە بەڵگەیەك یاخود هاتنی بەرەهایی لای ئەوانەی وا دەڵێن، ئەوا بەلای هاوەڵانمانەوە بۆ فەورییە".[4] ئامەدی دەڵێ: "حەنەفی و حەنبەلیەکان و هەر هەموو ئەوانەی پێیان وایە فەرمان بۆ دووبارەیە پەلەکردنیان بە واجب داناوە".[5] بەیزاوی دەڵێ:

---

[1] آل عمران: ١٧٩

[2] البقرة: ١٩٦

[3] شرح تنقيح الفصول للقرافي، ص١٢٨ و پاشتر. التلمساني ص٣٥.

[4] المسودة في أصول الفقه الحنبلي ص٢٤، مختصر التحرير ص٣٢٩،

[5] الأحكام في اصول الأحكام للآمدي ٢/٣٠.

"بەپێچەوانەی حەنەفیەت، فەرمانی رەها فەوری ناگەیەنێ"[1]، زاهیریش رایان وایە بۆ فەورییە.[2]

لەڕاستیدا باسکردن لەوەی حەنەفیەت جێبەجێکردنی فەرمان بەفەوری دادەنێ، بەو رەهاییە هەڵەیە، لەبەرئەوەی لە مەزهەبی حەنەفیدا تەنها کەرخی لەگەڵ ئەوەیە فەورییە. سەرخەسی دەڵێ: "ئەبولحەسەنی کەرخی دەڵێ فەرمانی رەها جێبەجێکردنی فەوری واجب دەکا".[3]

خاوەنانی ئەم رایە پشتیان بە چەند بەڵگەیەك بەستووە لەوانە:

أ- خوا ئەفەرموێ: ﴿وَسَارِعُواْ إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ...الآيـة﴾[4]. بەڵگەبوونی ئەم ئایەتە لەوەدایە پێشبڕکێکردن (المسارعة) دەستپێشخەرییە لە کردنی کارەکە بەپەلە لە یەکەمین کاتی مومکیندا، ناشکرێ لێخۆشبوون (المغفرة) -کە لە ئایەتەکەدا هاتووە- بە مانا راستەقینەکەی وەربگیرێ، لەبەرئەوەی کردەی خوایە و مەحاڵە بەندە بەپەلە بۆی بچێ، بۆیە مەبەست پێی هۆکانیەتی بەمەجاز، وەك لێنانی ناوی بەرهۆ لە هۆ، قەرینەکەیش مەحاڵبوونە. ئاشکرایە فەرمانەکە بۆ واجببوونە، بەوەیش دەستپێچەری بۆ کردنی فەرمانپێکراوەکان واجب دەبێ، مانای فەوریش دەبێ هەر ئەمە بێ.

ب- ئەگەر فەرمانەکە بۆ فەوری نەبوایە دواخستن جائیز دەبوو، بەڵام جائیز نیە، بۆیە بۆ فەوری دەبێ.

٣- لەسەرخۆ (التراخي) دەگەیەنێ. تێبینی دەکرێ خواستی ئەم گوتەیە بەڕواڵەت ئەوەیە جێبەجێکردن دەستبەجێ نیە و کەسیش وای نەوتوە، رەنگە مەبەست ئەوە بێ وەك شیان (جوان) دەشێ ئەوە بگەیەنێ، وەك ئەسنەوی بەوە بەندی

---

[1] البيضاوي مع الأسنوي والبدخشي ٢/٤٤.
[2] الأحكام في أصول الأحكام لأبن حزم ٣/٢٩٥.
[3] أصول السرخسي ١/٢٦ .
[4] آل عمران: ١٣٣

کردوە.[1]

لە (المسودة)دا هاتووە: ئیبن ئەلباقلانی پێی وابووە بۆ لەسەرخۆییە، هەروەها ئیبن عوقەیل لە ئەحمەدی گێڕاوەتەوە، لە شافیعیەکانیش ئەوانەی ئەو رایەیان هەڵبژاردوە بریتین لە: ئەبوعەلی لە ئەبوهورەیرەوە و ئەبو عەلی ئەلتەبەری و ئەبوبەکر ئەلدەقاق"[2]. لەباتی ئەلدەقاق وتراوە ئەبوبەکر ئەلقەفال.

بەڵگەی ئەوانەم لەسەر ئەم رایە دەست نەکەوت، بەلام بینیم گەورە زانایان رەخنەیان لەو بۆچوونە گرتوە، مامۆستا ئیسحاق ئەلئەسفەرایینی دەڵێ هەڵەیە بوترێ لەسەرخۆ دەگەیەنێ[3]. ئیمام ئەلحەرەمەین لە (البرهان)دا دەڵێ: "لەفزێکی دروستکراوە، چونکە خواست (موقتەزا)ی مانای لەسەرخۆ ئەوەیە ئەگەر جێبەجێکردنی فەوری فەرز بکرایە، بەهەند وەرنەدەگیرا، ئەمەیش بڕوای کەس نیە".[4]

٤- هاوبەشە لەنێوان دەستبەجێ و لەسەرخۆدا و بەتایبەت یەکێکیان ناگەیەنێ تا قەرینەیەك پەیدا نەبێ، ئەمە رای واقیفییە.[5] بەڵگەیشیان ئەوەیە فەرمانەکە لە (دەستبەجێ) و (لەسەرخۆ)دا بەکاردێ، هەرچیش بەم شێوەیە بێ هاوبەشێکی لەفزییە.[6]

٥- یەکلانەکردنەوە یاخود وەستان (التوقف)، ئەمە رای جوەینییە، کە لەوەدا وەستاوە لەڕووی زمانەوانییەوە هەم دەستبەجێ و هەم لەسەرخۆ دەگەیەنێ، دەڵێ: فەرمانپێکراو هەم بە دەستبەجێ و هەم بە لەسەرخۆ پابەند دەبێ

---

[1] الأسنوي مع البدخشي ٤٧/٢.

[2] المسودة ص٢٦

[3] القواعد لابن اللحام ص١٧٩.

[4] مخطوطة المكتبة المركزية- بغداد.

[5] بڕوانە: الأسنوي، سەرچاوەی پێشوو ٤٧/٢.

[6] بڕوانە: اصول الفقه للأستاذ محمد أبي النور ١٦٣/٢ و پاشتر.

لەبەرئەوەی هیچکامیان بەسەر ئەویتردا زاڵ نیە، کە گوناهەکەی لە لەسەرخۆدا دەوەستێ نەك لە دەستبەجێدا، لەبەرئەوەی ڕێی تێناچێ (لەسەرخۆ) واجب بێ.[1]

بەڵگەی جوەینی لەسەر ئەو (وەستان)ـەی بۆی چووە ئەوەیە داواکە گومانی تێدا نیە، بەڵام گومان لە جەوازی دواخستندایە، بۆیە جێبەجێکردنی فەوری (دەستبەجێ) واجب بووە تابەیەقینەوە لە بەرپرسیارێتی دەربچێ.

ئەم بەڵگەیە لەگەڵ ماناوە (وەستان)دا ناگونجێ.

سەرچاوەی ئەم ناکۆکیانەیش لەم ئەسڵەدا هاتنی فەرمانە جارێ بەبەکارهێنانی بۆ دەستبەجێ وەك فەرمانکردن بە باوەڕهێنان، هەندێ جاریش بە لەسەرخۆ وەك فەرمانکردن بە حەج.

بەلای منەوە رای زاڵ ئەوەیە فەرمان بۆ جێبەجێکردنی دەستبەجێی فەرمانپێکراوەکەیە لە نزیکترین کاتی مومکیندا، چونکە لەڕووی زمانەوانی و عورفیەوە ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە.

**لەو پیادەکردنە فیقهییە خیلافیانەی لەم ناکۆکییە کەوتونەتەوە ئەمانەن:**

**أ- شەرعزان رایان جیاوازە لەوەی ئاخۆ ئەگەر حەج مەرجەکانی هاتنەدی، دەبێ دەستبەجێ ئەنجام بدرێ یان دەکرێ دوابخرێ؟**

مالیکیەت لە قەولی زاڵ (راجیح)ی نێو دوو قەولیدا[2]، هەروەها حەنبەلیەکان[3] و لە حەنەفیش ئەبویوسف رایان وایە حەج فەرزێکی دەستبەجێیە بۆ هەر کەسێك مەرجەکانی فەرزی تێدا هەبن و بەبێ عوزر دواخستنی دروست نیە. خاوەنی (الهدایة)دەڵێ: لە ئەبوحەنیفەیشەوە ریوایەتێك هەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە.[4]

---

[1] البرهان مخطوطة المكتبة المركزية. لرشاد الفحول للشوكاني ص١٠٠.
[2] بلغه السالك، ٢٤٣/١. مفتاح الوصول في علم الأصول للتلمساني، ص٣٥.
[3] نيل المآرب في الفقه الحنبلي ١٠٣/١.
[4] الهداية مع العناية بشرح فتح القدير ٤١٢/٢.

شافیعیەت، هەروەها مالیکیەت لە قەولی بنزال (مرجوح)یدا، هەروەها محەمەد بن ئیحسانی شەیبانی لە حەنەفیەت، ئەبوحەنیفەیش لە ریوایەتێك لێیەوە و ئەوانەی شوێنیان کەوتون رایان وایە: واجبە بە لەسەرخۆیی، بەلام واباشترە پێشی بخات.

هۆی ناکۆکیەکە: ئەوەی پێی وایە فەرمانەکە لە ئایەتی ﴿وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ ...﴾[1] بۆ دەستبەجێیە، دەڵێ حەج فەرزە بەفەوری لەسەر هەر کەسێك مەرجەکانی تێدا بێ. ئەوەیش گوتویێتی بۆ لەسەرخۆیە، دەڵێ: کردەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە حەج بۆ فەوری نیە، لەبەرئەوەی لە ساڵی دووەمدا فەرز کراوە و پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی دەیەمدا بەهاوەڵانیەوە حەجی کردوە، ئەگەر فەوریبوون خواستی فەرمانەکە بوایە ئەو دواکەوتنە بەبێ عوزر رووی نەدەدا.[2]

تێبینی دەکرێ ئەم شیکردنەوەیە بابەتەکە لە شوێنی کێشەکە دەباتە دەرەوە، چونکە ناکۆکیەکە خۆی لەبارەی فەرمانێکە هیچ قەرینەیەکی لەگەڵ نەبێ دیاری بکا ئاخۆ بۆ فەورییە یان بۆ لەسەرخۆ.

ئەم ناکۆکییە رای جیاوازی لەبارەی قەزاکردنەوەی حەج لە میراتی مردووەکە لێ کەوتۆتەوە، بەشێوەیەك حەنبلەیەکان پێیان وایە قەزاکردنەوە واجبە و لە تەواوی ماڵەکەی ئەندازەی ئەوەی بەشی حەجکرنەکە بکا دەردەکرێ، شافیعیەتیش هەمان رای هەیە بەلام بەو مەرجەی پاش واجببوون و بوونی توانای حەجکردن مردبێ[3]. ئەوە رای شیعەی ئیمامیشە. ئەلتوسی دەڵێ: "ئەوەی حەجی لەسەر واجب بوو و حەجی نەکرد و مرد، پێویستە لە ماڵەکەی حەجی بۆ بکرێ هەروەك قەرز، ئەگەر ماڵی لەپاش بەجێما لەسەری ناکەوێ، بەلام ئەگەر بەجێی نەهێشت کەسوکارەکەی

---

[1] البقرة: ١٩٦

[2] بروانە: حاشیة الرملي علی المنهاج ٣/٢٢٩.

[3] بروانە: سبل السلام ٢/١٨١.. المهذب للشیرازي ١/١٩٩.

سەرپشكن لەوەی قەزای بۆ بكەنەوە یان نا".[1]

حەنەفی و مالیكی رایان وایە قەزاكردنەوە واجبە ئەگەر وەسێتی كرد و لە بەشی وەسێتەكەی دەردەكرێ نەك هەموو ماڵەكەی، بەڵام ئەگەر وەسێتی نەكرد واجب نیە لەبەرئەوەی پەرستنێكی جەستەییە و نوێنەرایەتی قبوڵ ناكا.

سەبارەت بە پێش مردن، ناكۆكی گوناهی لێ دەكەوێتەوە، خاوەنی (العنایە) دەڵێ بەروبومی ناكۆكی دەرناكەوێ بەتایبەت لە گوناهدا نەبێ.

**ب- شەرعزان لە پێویستی دانەوەی دەستبەجێی قەرز ئەگەر وادەیەكی بۆ دیاری نەكرا و خاوەن قەرزیش داوای نەكردەوە، رای جیاوازیان هەیە:**

كۆمەڵێكیان رایان وایە پێویستە دەستبەجێ بدرێتەوە، كۆمەڵێكیش رایان وا نیە، سەرچاوەی ناكۆكیەكەیش جیاوازییە لە خواستی فەرمانەكە لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿...أَوْفُوا بِالْعُقُودِ...﴾[2]، لەبەرئەوەی قەرزكاری جۆرە گرێبەندێكە، ئەوەی گوتوێتی فەرمان بۆ فەورییە پێی وایە پێویستە قەرز دەستبەجێ بدرێتەوە، ئەوەیش گوتوێتی بۆ لەسەرخۆیە دەڵێ دروستە دوابخرێ.

بەرهەمی ناكۆكیەكەیش ئەوەیە ئەگەر فەرمان بۆ فەوری بێ، قەرزار بەدواخستنی گوناهبار ئەبێ.

ئیبن ئەللەحام لە حەنبەلیەكان دەڵێ: "لەو مەسەلانەی لە رێسای فەرمانی رەها (الامر المطلق) دەبنەوە كە ئاخۆ فەوری دەخوازێ یان نا، دانەوەی قەرزی مەردمە لەكاتی داواكردنەوەیدا، كە واجبە دەستبەجێ بدرێتەوە و هاوەڵان پێداگرییان لەمە كردوە، ئاخۆ بەبێ داواكردنەوەیش پێویستە بەفەوری بدرێتەوە یان نا؟ مەسەلەكە دوو رووی هەیە، یەكێكیان ئەوەیە ئەبو ئەلمەعالی و سامری و هیتر -كە ئەوە مەزهەبەكەیە- گوتویانە واجب نیە... دووەمیان ئەوەیە قازی لە (الجامع) و شێخ ئەبو

[1] بروانە: الخلاف للطوسي ٢/٤١٥.
[2] المائدة: ١

محەمەد لە (المغني)دا گوتویانە لە پێدراوی ژنان (قَسْم الزوجات)دا کە واجبە دەستبەجێ بدرێتەوە".[1]

پێدەچێ قسەی ئیبن ئەللەحام -کە ئەوە مەزەبەکەیە- لەگەڵ بنەماکانی حەنبەلیەکاندا لێك بدا کە پێی وایە فەرمان بەبێ قەرینە بۆ فەورییە.

**ج- شەرعزان سەبارەت بە واجببوونی دەستپێشخەری بۆ زەکاتدان و زەمانکردنی ئەگەرماڵەکە پاش واجببوون و پێش دەرکردنی فەوتا:**

مەزەبی شافیعی[2] و حەنبەلی[3] و پێشەوا مالیك لە ئەسڵی مەزەبەکە[4] و هەندێ لە حەنەفیەکان[5] رایان وابووە ئەو کەسەی زەکاتی لەسەر واجب بووە و دەتوانێ دەریبکا بۆی نیە دوای بخا، چونکە ئەوە مافێکە و پێویستە بۆ کەسە شایستەکانی خەرج بکرێ، بۆیە داواکردنەکە بۆ دەستبەجێ پێدانیانە، جا ئەگەر دوای خست لەبارێکدا دەیتوانی بیدات، زامنی دەکا (واتە دەبێ بیدات)، چونکە ئەوە دواین شتە لەسەری واجب بووە لەگەڵ بوونی توانای ئەنجامداندا، بۆیە وەك سپاردە زامنی دەکا.

هەندێ لە حەنەفیەکان و ئەوانەی هاورایانن پێیان وایە بە لەسەرخۆ واجبە، مەگەر لە فەوتانی بترسێ، ئەوکاتە پێویستە دەستبەجێ بیدات[6]. سەرخەسی دەڵێ: "لە زەکات و سەرفیترە و دەیەکدا مەزەب ئاشکرایە کە بە دواخستنی ئەنجامدانی بەکەمتەرخەم حسێب نابێ و بۆی هەیە بینێرێ بۆ خزمە هەژارەکانی لە شوێنێکیتر".[7] تەلمەسانی دەڵێ: "هەروەها رایان جیاوازە لەوەی ئاخۆ ئەگەر پاش

---

[1] بروانە: قواعد ابن اللحام ص١٨٢.

[2] المهذب للشيرازي ٤٠/١.

[3] المغني لأبن قدامة ٦٨٤/٢. نيل المآرب ٨٥/١. قواعد ابن اللحام ص١٨٠-٢٢٠.

[4] الشرح الصغير مع بلغة المسالك ٢٢٠/١.

[5] أصول السرخسي ٤٦/١.

[6] فتح القدير ١٥٥/٢ و پاشتر.

[7] أصول السرخسي سەرچاوەی پێشوو.

سوڕانەوەی ساڵ و بوونی توانای زەکاتدان نیسابەکە فەوتا، ئاخۆ زەکات زامن دەکا یان لەسەری دەکەوێ؟ بەلای شافیعیەوە زامنی دەکا لەبەرئەوەی فەرمانکردن بە زەکاتدان بەلای ئەوەوە بۆ دەستبەجێیە بۆیە ئەو بە دواخستنی بێفەرمانی کردوە. حەنەفیش پێی وایە زامنی ناکا لەبەرئەوەی فەرمانکردن بە زەکاتدان بەلای ئەوەوە بۆ دەستبەجێ نیە، بۆیە بە داوخستن بێفەرمانی نەکردوە". [1]

تێبنی دەکرێ ئەو حەنەفیانەی گوتویانە پێویستە (زەکات) دەستبەجێ بدرێ جیاوازییان تێ کەوتوە، هەندێکیان دەڵێن فەرمانەکە بۆ دەستبەجێیە لەوانە کەرخی، هەندێکیشیان دەڵێن فەرمانەکە قەرینەی فەوری لەگەڵدایە وەك ئیبن ئەلهەمام، کە لەسەر ئەو قسەیەی خاوەنی (الهدایة) دەڵێ: "پاشان گوترا دەستبەجێ واجبە، لەبەرئەوەی ئەوە خواستی فەرمانە بەرەها"، کەرخی دەڵێ: ئیددیعاکە پەسەندە، بەڵام ئەو بەڵگەیەی لەسەری باس کراوە پەسەند نیە، چونکە ئەوەی لە ئوسوڵدا هەڵبژێدراوە ئەوەیە: فەرمان بەرەها نە فەوری دەخوازێ و نە لەسەرخۆ، بەڵکو تەنها بۆ کردنی ئەوەیە فەرمانی پێکراوە، بۆیە بەرئەرك بۆی هەیە لە ئەنجامداندا کار بە فەوری یان بە لەسەرخۆ بکا. رووی هەڵبژێدراویش ئەوەیە فەرمانکردن بە دانی بە هەژار لەگەڵ قەرینەی دەستبەجێ، ئەوەیە بۆ پڕکردنەوەی پێویستیەتی کە شتێکی پەلەیە، بۆیە هەرکات بەفەوری واجب نەبوو ئامانج لە واجبکردن بەتەواوی بەدینایەت. [2]

**زاڵکردن:**

رای زاڵ لە روانگەی منەوە ئەوەیە واجببوون فەورییە و ئەگەر ماڵەکە پاش واجببوون و پەیداکردنی توانای زەکاتدان و پێش لە ئەنجامدانی فەوتا، زەمانی دەکەوێتە سەر، ئەویش لەبەر بێفەرمانیکردنی بە دواخستنی زەکاتدانەکە، ئەگەر بەر

---

[1] مفتاح الوصول إلى علم الأصول، ص٣٥.

[2] بڕوانە: فتح القدير مع الهداية والعناية ٢/١٥٥.

له دانیشی مرد زەکاتەکە بە خودی تەواوی ماڵەکەیەوە دەبەستریتەوە، لەبەرئـەوەی زەکات بۆ پڕکردنەوەی پێویستی هەژاران فەرز کراوە و پێویستە پەلە لە دانیدا بکرێ، هەروەها لەبەرئەوەی لە عیبادەتە پەیوەندی بە کاتـەوە هەیـە و هـەر عیبـادەتێکی کاتبەندیش پێویستە لە یەکەم پێنانە ناو کاتەکەیدا ئەنجام بدرێ ئەگینا ئـیتر دانـانی کات هیچ سوودێکی نابێ. هەروەها لەبەرئەوەی لە کیتاب و سوننەدا هەڕەشەی تونـد هاتووە بۆ ئەوانەی لەو نیعمەتانەی خوا پێی بەخشیون چروکی دەکەن.

**لە کۆتایی ئەم بابەتەدا پێم خۆشە ئاماژە بەوە بدەم فەرمانی کاتبەند بە کاتێکی فراوان زانایان سێ رای جیاوازیان لەبارەیەوە هەیە:**

أ- هەندێ لـە زانایـانی شـافیعی رایـان وابـووە فـەرمان پەیوەنـدی بـە سـەرەتای کاتەکەوە هەیە، ئەگەر لێی دواکەوت و کەوتـە ئـاخری، قەزایەکـە جێـی فـەرز دەگرێتەوە.

ب- هەندێ لە زانایانی حەنەفی گوتویانە: فەرمان پەیوەندی بە ئاخری وەختـەوە هەیە، ئەگەر بۆ سەرەتاکەی پێش خرا جێگەی فەرز دەگرێتەوە.

ج- مالیکیـەت[1] و هەنـدێ لـە لێکۆڵـەران وەك شـافیعی[2] پێیـان وایـە فـەرمان بەتاییـەت نەبەسـتراوە بەبەشـێکی دیـاریکراو لـە کاتـەوە، چـونکە ئەگـەر پەیوەندی بە سەرەتاکەیەوە هەبێ، ئەوا ئەو کەسـەی دوای دەخـا بێفـەرمانی کردوە، هەروەها قەزاکەرەوە دەبێ نەك ئەنجامدەر، ئەوکاتە پێویسـتە نیـەتی قەزاکردنـەوە بـێنێ ئـەوەیش پێچـەوانەی ئیجماعـە. هـەروەها ئەگـەریش پەیوەندی بە ئاخری کاتەکەوە هەبێ ئەوا پێشخەرەکەی خۆبەخش دەبێ نەك جێبەجێکەری فەرمانەکـە، هـەروەها پێویسـتە نیـەتی خۆبەخشکردن بـێنێ،

---

[1] شرح تنقیح الفصول للقرافي ص١٥٠. تخريج الفروع للزنجاني ص٣١ و پاشتر.

[2] بڕوانە: شرح التوضيح على التنقيح مع التلويح. ٢/٢٤٠.

جێگەی واجبیشی نەدەگرتەوە وەك ئەوەی پـێش لـە کـاتی خـۆی کردبێتـی، ئەمەش دیسان پێچەوانەی ئیجماعـە، کەواتـە سـاغ بوویـەوە فـەرمانی فـراوان پەیوەندی بە بەشێکی دیاریکراو لە کاتەوە نیە.

لەبەر تیشکی ئەوەی پێشوو، واجب بەپێی دوو رای یەکەم بەرتەسککار و بـەپێی رای سێیەم بەرفراوانکار دەبێ. لەم ناکۆکیەیش جیاوازی لە هەندێ مەسەلەی لاوەکی دەکەونەوە، لەوانە:

أ- منداڵ ئەگەر لە سەرەتای کاتەکـەدا نوێـژی کـرد، پاشـان بـەر لـە تـەواوبوونی کاتەکە باڵق بوو، بەپێی رای یەکەم و سێیەم، نەك دووەم، لێی وەردەگیرێ.

ب- رێبوار ئەگەر لە سەرەتای کاتەکەدا سەفەری کرد، یان ئافرەت پـاش چـوونە ناو کاتەکە کەوتە عادە و ئەندازەی کردەوەکە لـە کـات تێپـەڕی، ئـەوا بـەپێی رای یەکەم و سێیەم بۆ رێبوار تەواوکردن و بۆ حەیزداریش قەزاکردنەوە واجـب دەبـێ، بـەپێی رای دووەمـیش واجـب نـابێ، لەبەرئـەوەی واجببوونەکـە لـە سەرەتای کاتەکەدا بەدینەهاتووە.[1]

---

[1] بڕوانە: مفتاح الوصول إلى علم الأصول للتلمساني ص٣٧ و پاشتر.

## خواستی سێیەم:
## جیاوازی لە خواستی نەهیکردن و
## کاریگەری لەسەر جیاوازیی حوکمی شەرعی

### چییەتیی نەهیکردن:

قەدەغەکردن (النهی) لە زماندا مانای رێگرتنە. دەوترێ: نهاه عن كذا، واتە رێگری کرد لەوە. لێرەوەیە عەقڵ ناونراوە (نهية)، لەبەرئەوەی رێگری لە خاوەنەکەی دەکا لە کەوتنە ناو شتی نەشیاو. لەوانە، خوا ئەفەرموێ: ﴿...إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّأُوْلِي النُّهَى﴾[1].

لە زاراوەدا: ئەو گوتە دارێژراوەیە کە ئاماژەیە بۆ نەکردنی کارێك لە لایەنێکی بالآخوازیەوە.[2]

### شێوازەکانی نەهیکردن:

قورئانی پیرۆز بە شێوەی جۆراوجۆر و دەربڕینی جیاواز کە هێمان بۆ شێوازی رەوانبێژیانەی نایاب، نەهی لە مرۆڤ دەکا لەو رەفتارانەی خراپە و زیانیان تێدایە، لەو شێوانە:

١- فەرمانی رانەبردوو کە (لا)ی ناهیەی خراوەتە پێش، وەك سیغەی (لاتقربوا) لە ئایەتەکانی ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً﴾[3]، ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ ...﴾[4]. هەردوو سیغەی (لا تـأكلوا،

---

[1] طه: ٥٤.

[2] الشوكاني: لرشاد الفحول ص١٠٩ .

[3] الإسراء: ٣٢.

[4] الأنعام: ١٥٢، الإسراء: ٣٤.

لا تقتلوا) له ئايەتەكانی: ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَينَكُم بِالْبَاطِلِ...﴾[1]، ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالحَقِّ...﴾[2].

٢- فەرمانی ئاماژەدەر بە وازهێنانی لەفزی: (ذروا، اجتنبوا) لە ئايەتەكانی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ...﴾[3]، ﴿...فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ﴾[4].

٣- داتاشراوەكانی مادەی حەرامكردن (التحريم)، وەك هەردوو لەفزی (حرم، حُرِّمت) لە ئايەتەكانی ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ...﴾[5]، ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ...الآية﴾[6].

٤- داتاشراوەكانی مادەی نەهيكردن وەك هەردوو سيغەی (نهى، ينهى) لە ئايەتەكانی ﴿...وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا...﴾[7]، ﴿...وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ...﴾[8].

٥- بە ناحەڵاڵ دانان: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً...﴾[9].

٦- بەستنەوەی كردەوەكە بە هەڕەشەی سزادان لەسەری، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ، الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ، الَّذِينَ هُمْ يُرَاؤُونَ، وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ﴾.[10]

---

[1] البقرة: ١٨٨
[2] الإسراء: ٣٣
[3] الجمعة: ٩
[4] الحج: ٣٠
[5] الأعراف: ٣٣
[6] النساء: ٢٣
[7] الحشر: ٧
[8] النحل: ٩٠
[9] البقرة: ٢٢٩
[10] الماعون: ٤، ٥، ٦، ٧ .

٧- ئیستیفهامی ئینکاری، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾[1].

## ڕووەکانی بەکارهێنانی نەهیکردن:

سیغەی ناسراوی نەهیکردن (فیعلی موزاریع کە بە لا-ی ناهیە دەست پێدەکا) بۆ زۆر مەبەست بەکار دێ:

١- حەرامکردن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ ...﴾[2].

٢- کەراهەت: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ...﴾[3].

٣- ڕێنوێنیکردن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ...﴾[4].

٤- ڕوونکردنەوەی سەرەنجام: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ...﴾[5].

٥- بێنرخکردن (التحقیر): وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنيَا...﴾[6].

٦- بێئومێدکردن: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَعْتَذِرُوا الْيَوْمَ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[7].

٧- ئارامی پێدان: وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا...﴾[8].

---

[1] یونس: ٩٩
[2] البقرة: ٢٢١
[3] المائدة: ٨٧
[4] المائدة: ١٠١
[5] إبراهيم: ٤٢
[6] طه: ١٣١
[7] التحريم: ٧
[8] التوبة: ٤٠

٨- پاڕانەوە: وەك خوا ئەفەرمویٚ: ﴿رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا...﴾[١].

٩- ئاگەدارکردنەوە: وەك خوا ئەفەرمویٚ: ﴿...فَلاَ تَمُوتُنَّ إَلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾[٢].

١٠- دڵنیاکردنەوە: وەك خوا ئەفەرمویٚ: ﴿...وَلَا تَخَفْ إِنَّكَ مِنَ الْآمِنِينَ﴾[٣].

١١- یەکسانکردن (التسوية): وەك خوا ئەفەرمویٚ: ﴿اصْلَوْهَا فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا سَوَاء عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[٤].

١٢- وەفاداری و هاوکاری: وەك خوا ئەفەرمویٚ: ﴿...وَلاَ تَنسَوُاْ الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[٥].

## مانای ڕاستەقینەی نەهیکردن:

نەهیکردن لە سەرجەم ئەو مانایانەی باس کران بە ڕاستەقینە (حەقیقەت) دانانریٚ، بەڵکو لە هەندێکدا ڕاستەقینە و لە هەندێکیتردا مەجازە. کەس لەمەدا ناکۆك نیە، ناکۆکیەکە لە دیاریکردنی مانا ڕاستەقینەکەدایە، کە ئاخۆ یەك مانایە یان زیاتر؟ لە باری دووەمدا ئایا هاوبەشێکی لەفزی یان مەعنەوییە؟

١- جمهور لە ئوسوڵناس و شەرعزان دەڵێن: نەهیکردن لە حەرامکردندا ڕاستەقینە و لە جگە لەوەدا مەجازە، هەندیٚ بەڵگەیشیان هێناوە، لەوانە ئەوەیە خوا ئەفەرمویٚ: ﴿...وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا ...﴾. ، خوای گەورە فەرمان دەکا بە وازهێنان لەوەی نەهی لێکراوە، فەرمانەکەیش بۆ واجیبوونە، بەوە وازهێنان لە نەهیلێکراو واجب دەبیٚ و حەرامکردن جگە لەوە ناگرێتەوە.[٦]

---

[١] آل عمران: ٨

[٢] البقرة: ١٣٢

[٣] القصص: ٣١

[٤] الطور: ١٦

[٥] البقرة: ٢٣٧

[٦] لنظر المحصول للرازي، تحقيق الدكتور طه جابر، ح١ ق٢ ص٤٦٩.

ارشاد الفحول للشوكاني ص١١٠. شرح الكوكب المنير ص٣٣٩.

←

٢- وتراوه له كەراهەت (پێناخۆش)دا راستەقینەیە، لەبەرئەوەی نەهیكردن ئاماژەیە بۆ مەرجوحیەتی نەهی لێكراو، ئەوەیش حەرامكردن ناخوازێ.

ئەمە بەوە رەت دەكرێتەوە كە لەكاتی نەبوونی قەرینەدا ئەوەی لەپێشەوە بە زەیندا دێ حەرامكردنە.

٣- وتراوە هاوبەشە لەنێوان حەرامكردن و كەراهیەتدا و بەبێ بەڵگە هیچ یەك لەوانە دیاری ناكرێ، ئەگینا ساغكردنەوەی بەسەر یەكێك لەو دوانە زاڵكردنە بەبێ (بەڵگەی) زاڵكەر.

ئەمە بەوە رەت دەكرێتەوە كە ئەقڵ لە سیغەی بێ قەرینە حەتمیبوون تێدەگا، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حەرامكردندا راستەقینەیە، هەروەها بەوە كە پێشینان (سەلەف) سیغەی نەهیكردنی رووتیان بە بەڵگە لەسەر حەرامكردنی نەهیلێكراو وەردەگرت، هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی (نەهیكردن) لە حەرامكردندا راستەقینە و لە كەراهەتدا مەجازە.

٤- هەندێ -وەك حەنەفیەكان- گوتویانە نەهیكردن بۆ حەرامكردن دەبێ ئەگەر بەڵگەكە گومانبڕ بوو، بۆ كەراهەتیش دەبێ ئەگەر بەڵگەكە گومانگر بوو.

ئەمەیش بەوە رەت دەكرێتەوە كە خیلافەكە لە داواكردنی وازلێهێناندایە، ئەمەیش داوایەكە دەشێ لە بەڵگەیەكی گومانبڕ (قەتعی)ەوە وەربگیرێ و ببێتە گومانبڕ، لەوانەیشە لە بەڵگەیەكی گومانگر (زەننی)ەوە وەربگیرێ و ببێتە گومانگر.[1]

## نەهیكردن وازلێهێنانی دەستبەجێ و بەردەوام دەخوازێ:

نەهیكردن ئاماژەیە بۆ داوای دەستبەجێ و بەبەردەوامی دەستهەڵگرتن لە كردەوە نەهیلێكراوەكە، لەبەرئەوەی نەكردنی بەردەوامی كردەوە نەهیلێكراوەكە

---

المسودة لآل تيمية ص٨١.

تحقيق المراد في أن النهي يقتضي الفساد، للحافظ صلاح الدين العلائي ص٦٣.

[1] ارشاد الفحول، سەرچاوەی پێشوو ل١١٠.

پاش دەست لێهەڵگرتنە فەوریەکە بۆ بەدیهاتنی پابەندبوون زەرورییە، بەوەیش نەهیکردن لە فەرمانکردن جیاواز دەبێ، لەبەرئەوەی دووەم لەخۆیدا دەستبەجێ و دووبارە ناگەیەنێ. نهێنیی ئەو جیاوازیەیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە خوای گەورە فەرمان بە شتێك بە مرۆڤ ناکا تا بەرژەوەندیەکی گشتی یان تایبەتی تێدا نەبێ، ئەوەیش لەوانەیە بە یەك جار کردنی فەرمانپێکراوەکە بێتەدی.

بەڵام نەهیکردن لە شتەکە لەبەر ئەو زیان (یان خراپە) گشتی یان تایبەتەیە تێیدایە، دووربوون لەوەیش بەبێ دەست لێهەڵگرتنی فەوری و بەردەوامبوون لەسەری ناکرێ، لەبەرئەوەی ئەو کەسەی داوای نەکردنەکەی لێکراوە، ئەگەر تەنانەت یەك جاریش کارە قەدەغەکەی کرد، بە پابەند و گوێڕایەڵی داواکەی خوای گەورە دانانرێ، لەبەرئەوە نەکردنی دەستبەجێ و بەردەوام لە پێویستییە زەروریەکانی پابەندبوونە.

سەیر لەوەدایە هەندێ لە گەورە زانایان لە ئوسوڵناسان وەك ئیمام فەخرەدینی رازی[1]، پێیان وابووە دووبارەکردنەوە ناگەیەنێ.

## خواستی نەهیکردن بۆ خراپە (فەساد):

ئوسوڵناس و شەرعزانی سەرجەم مەزەبە ئیسلامیەکان لەم رێسا ئوسوڵییە مەترسیدارەدا جیاوازن لەڕووی ئەنجام و ئاسەوارەکانەوە. دەکرێ ناکۆکیەکان لەو رووەوە بۆ سێ ئاراستەی سەرەکی بگەڕێنرێنەوە (نەخواستنی بۆ فەساد بەڕەهایی، خواستنی بۆ فەساد بەڕەهایی، وردکردنەوە).

لەبەر گرنگیی بابەتەکە، دیراسەکردنی ئاراستەکان لەڕووی شکڵیەوە بەسەر سێ لقدا دابەش دەکەین، پاشان خستنەڕووەکە بە لقێکی چوارەم کۆتایی پێ دێنین بۆ روونکردنەوەی هەندێ لەو حوکمانەی لە جیاوازبوون لەم رێسا ئوسوڵییە بوونەتەوە.

---

[1] المحصول، سەرچاوەی پێشوو ح١ ق٢ ل٤٧٠.

## لقی یەکەم:
## نەهیکردن بەهیچ شێوەیەک خراپە ناخوازێ

لە هەندێ شەرعزان و زانای ئوسولناس دەگێڕنەوە گوتویانە نەهیکردن بەهیچ شێوەیەك خراپە ناخوازێ، جا چ قەدەغەکراوەکە لە عیبادەتەکان بێ یان لە مامەڵەکان، هەروەها چ نەهیکردنەکە لەبەر خودی نەهیلێکراوەکە بوویێ یان لەبەر بەشێکی، یان لەبەر جگە لەو لە وەسفە لازم یان هاوسێکەی. لەبەر بوونی شپرزی لەم گێڕانەوەیە و لەبەر ئەو نارێکیەی لە بەڵگە پشت پێبەستراوەکاندایە، بەگرنگم بینی ئاماژە بە هەندێ سەرچاوە و کەس بکەم کە بەوە ناسراون لە لایەنگرانی ئەو بۆچوونەن کە پێی وایە نەهیکردن بەهیچ شێوەیەك خراپە ناخوازێ.

رازی دەڵێ[1]: "ئەوانەی گوتویانە نەهیکردن لە هەڵسوکەوت بەڵگە نیە لەسەر خراپە، سەبارەت بەوەی ئاخۆ بەڵگەیە لەسەر دروستی رایان جیاوازە، لە ئەبوحەنیفە و محەمەد بن ئەلحەسەن (هاوەڵی ئەبوحەنیفە)ەوە گوێزراوەتەوە کە بەڵگەیە لەسەر دروستی".[2]

ئامەدی دەڵێ[3]: "هەندێ گوتویانە ناخوازێ، ئەوەیش هەڵبژاردنی لێکۆڵەرانە لە هاوەڵانمان[4]، وەك ئەلقەفال[5] و ئیمامی حەرەمەین[6] و غەزالی[7] و زۆر لە

---

[1] الإمام الأصولي النظار المفسر فخرالدين محمد بن عمر بن الحسين الرازي (٥٤٤-٦٠٦هـ) (١١٤٩-١٢٠٩م).

[2] المحصول في علم أصول الفقه، دراسة وتحقيق الدكتور طه جابر فياض العلواني، القسم التحقيقي، الجزء الأول، القسم الثاني، الطبعة الأولى ١٣٩٩هـ، ص٥٠٠.

[3] سيف الدين الآمدي الكردي علي بن محمد بن سالم من آمد (ديار بكر) (٥٥١-٦٣١هـ).

[4] الشافعية.

[5] أبوبكر محمد بن علي بن اسماعيل الشاشي القفال الشافعي (٢٩١-٣٦٥هـ).

[6] عبدالملك بن عبدالله بن يوسف بن محمد الجويني النيسابوري، زاناترینی پاشینەکانە لە هاوەڵانی شافیعی (٤١٩-٤٧٨ك).

[7] أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي (ت- ٥٠٥هـ).

حەنەفیەکان، کۆمەڵێ لە موعتەزیلەیش وایان گوتوە وەك ئەبوعەبدوڵا ئەلبەسری[1] و ئەبولحوسێن ئەلکەرخی[2] و قازی عەبدولجەبار[3] و ئەبولحوسێن ئەلبەصری[4] و زۆر لە مامۆستاکانیان.[5]

قەرافی دەڵێ[6]: "لای ئێمە نەهیکردن خراپە دەخوازێ، بەپێچەوانەی زۆربەی شافیعیەکان و قازی ئەبوبەکر لە ئێمە، ئەبوحەنیفە و محەمەد بن ئەلحەسەن دەڵێن بەهیچ شێوەیەك بەڵگە نیە لەسەر خراپە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر دروستی (الصحه)، لەبەر مەحاڵیی نەهیکردن لە مەحاڵ".[7]

شیرازی دەڵێ[8]: "لە شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ) شتی وا دەگێڕنەوە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەهیکردن بەڵگە نیە لەسەر خراپە، ئەوەیش قسەی کۆمەڵێ لە هاوەڵانی ئەبوحەنیفە و زۆربەی موتەکەلیمینە".[9]

ئیعتیمادی دەڵێ: "لەبارەی دیلالەتی نەهیکردن لە خراپەی نەهیکراو، بوون بە سێ بۆچوونی جیاوازەوە، دووەمیان ئەوەیە بەهیچ شێوەیەك ئاماژە نیە بۆ خراپە".[10]

شەوکانی دەڵێ[11]: "کۆمەڵێ لە شافیعی و حەنەفی و موعتەزیلە رایان وابووە خراپە ناگەیەنێ، نە لە رووی زمان و نە لە ڕووی شەرعەوە، نە لە مامەڵە و نە لە

---

[1] الحسين بن علي (ت– ٣٦٧هـ).

[2] عبيدالله بن الحسين الكرخي (٢٦٠–٣٤٠هـ) رابەرایەتی حەنەفیەت لە عێراق بەو گەیشت.

[3] أحمد بن عبدالجبار الهمداني الأسد آبادي. كان شيخ المعتزلة ولقبَ بقاضي القضاة (ت–٤١٥هـ).

[4] محمد بن علي الطيب، أحد أئمة المعتزلة (ت– ٤٣٦هـ).

[5] الإحكام في أصول الأحكام للآمدي، طبعة ١٩٦٨م، مكتبة محمد علي صبيح وأولاده، ج٢ ص٤٨.

[6] شهاب الدين أبو العباس أحمد بن ادريس القرافي (ت–٦٨٤هـ).

[7] بڕوانە: شرح تنقيح الفصول في اختصار المحصول، تحقيق طه عبدالرؤوف، منشورات دار الفكر، ص١٧٣.

[8] ابراهيم علي بن يوسف الفيروز آبادي الشيرازي الشافعي (٣٩٣– ٤٧٦هـ).

[9] اللمع في اصول الفقه الشافعي، الطبعة الثالثة، ١٩٥٧م، مطبعة البابي الحلبي، مصر ص١٤.

[10] معالم الدين في اصول الفقه الجعفري للإعتمادي، ص١١٦.

[11] محمد بن علي بن محمد الشوكاني (ت– ١٢٥٥هـ).

عیبادەتەکاندا".[1]

عـەلائی دەڵـێ[2]: "قـازی ئەبوبـەکر[3] و قـازی ئەبوجەعفـەر ئەلسـینانی[4] و ئەبوعەبـدولاّ ئەلئـەزدی[5] و ئەبوبـەکر ئەلقـەفال لـە شـافیعیەت گوتویانـە خراپیـی نەهیکراو ناگەیەنێ".[6]

## بەڵگەکان و گەنگەشەکردنیان:

ئەوانەی گوتویانە نەهیکردن بەهیچ شێوەیەك (واتـە بـەرەهایی) فەسـاد ناگەیـەنێ پشتیان بە چەند بەڵگەیەك بەستووە لەوانە:

١- وتویانە: ئەگەر نەهیکردن لەڕووی زمـان و شـەرعەوە بەڵگـە بـێ لەسـەر خراپـە (الفسـاد)، ئـەوا لـەڕووی زمـان و شـەرعەوە دژی بەدروسـت دانـان دەبـوو، لازم بەتاڵە، پێکـەوە بەندبوونەکـەیش ئاشـکرایە. بەڵگـەی بـەتاڵیی لازمەکـە ئەوەیـە ئەگەر شەرعدانەر بیگوتایە: نەهیم کردیت لە سوو (ربا) بە نـەهیی حـەرامکردن، ئەگەر کارەکەی کرد ئـەوا فرۆشـتنە نەهیلێکراوەکـە دەبـووە واجبکـەری موڵـك، هـەروەها بـەبێ دژیـەکی نـە لـەڕووی زمـان و نـە لـەڕووی شـەرعەوە دروسـت دەبوو[7]. هەروەها ئەگەر خاوەنی شەرع بیگوتایە: نەهیم کردیـت لـە نوێـژکردن لەماڵی زەوتکراودا و لە دەستنوێژ شتن بە ئاوی زەوتکراو و نوێژکرن لە پۆشاکی زەوتکراو و حەجکردن بە ماڵی زەوتکراو... و ئەگەر ئەو عیبادەتانـەت ئەنجامـدا و کردنت بەهۆیەك بۆ پاکبوونەوەی ئەستۆت لە نوێژ و حەجە واجبەکە، نـاکۆکی

---

[1] ارشاد الفحول إلى تحقيق الحق من علم الأصول للشوكاني، ص١١١.

[2] الحافظ صلاح الدين خليف بن كيكلدي العلائي (٦٤٩-٧٦١هـ)

[3] أبوبكر الباقلاني محمد بن الطيب بن محمد بن جعفر (٣٣٧- ٤٠٣هـ).

[4] محمد بن أحمد بن محمد السمناني (٣٦١- ٤٤٤هـ). قاض حنفي وهو من (سمنان العراق).

[5] الحسين بن محمد بن الحسين بن علي بن يعقوب المروزي (٤٧٠-٥٥٩هـ).

[6] تحقيق المراد في أن النهي يقتضي الفساد. تقديم وتحقيق وتعليق ابراهيم محمد السلقيني، ص٧٩.

[7] بڕوانە: القرافي: شرح تنقيح الفصول، سەرچاوەی پێشوو لا١٧٤.

لـەنێوان نەهیکردنەکـە و دروسـتیی عیبادەتەکـەدا رووی نـەدەدا، لەبەرئـەوەی بەرژەوەندیی عیبادەتەکان لەو حاڵەتانەدا بـەدیهاتووە، بـەڵام خراپەیـەکیان لـە بەرانبەردایـە، پێـوەری ئەسـتۆپاکیش پەیـدابوونی بەرژەوەندییـە نـەك بـوونی خراپە لە بەرانبەردا.[1]

ئەم جۆرە بەڵگەسازییە، نائوسوڵییە لەبەرئـەوەی رێسـا مەنتیقیەکـە دەخـوازێ بەڵگەکە یەکسان بن بە ئیدیعاکراو یـان لـەو گشـتیتر بـێ، لەکاتێکدا لێرەدا لـە بانگەشەی ئەوەی (نـەهیکردن بـەهیچ شـێوەیەك خراپـە نـاخوازێ) تایبـەتترە، لەبەرئەوەی تێکنەگیرانی نێوان نەهیکردن و دروستیی گرێبەند یان عیبادەتەکـە بناغەکەی ئەوەیە نەهیکردنەکە پەیوەندی نە بە روکن و نـە بـە مـەرج و نـە بـە زاتـــەوە نـــەبووە، بـــەڵکو پـــێ پەیوەســـتەکەی شـــتێکە لـــە دەرەوەی نەهیلێکراوەکـــەوە، بەڵگـــەیش لەســـەر ئـــەوە روودانـــی تێکگیرانـــە لـــەنێوان بەحەڵاڵدانانی خواردنی ماڵی کەسانیتر بـەناڕەوا، لەگـەڵ ئـەوەی خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿وَلاَ تَـأْكُلُواْ أَمْـوَالَكُم بَيْـنَكُم بِالْبَاطِـلِ ...﴾[2]، هـەروەها لـەنێوان ئیباحەکردنی زینـا لەگـەڵ ئـەوەی خـوا ئەفـەرموێ ﴿وَلاَ تَـأْكُلُواْ أَمْـوَالَكُم بَيْـنَكُم بِالْبَاطِـلِ ...﴾[3]، لەبەرئـــەوەی نـــەهیکردن لـــەم دوو وێنەیـــەدا بـــۆ خـــودە نەهیلێکراوەکەیە، نەك لەبەر شتێك لە دەرەوەی.

٢- ئەگەر ئاماژە بێ لەسەر خراپە ئەوا یان بە لەفز یان بەمانا ئاماژەی بـۆ دەکـرد، واتە دیلالەتکردنی بۆی بە یەکێك لـە سـێ دیلالەتەکـە: پڕاوپڕبـوون، تێـدابوون، پابەندی (المطابقة، والتضمن، والإلتزام) دەبوو، هیچ لەمانـەیش نـین. سـەبارەت بە نەبوونی دوانی یەکەم ئاشکرایە، لەبەرئەوەی لەفزەکە جگە لـە قەدەغـەکردن

---

[1] بڕوانە: الشوکاني: لرشاد الفحول، سەرچاوەی پێشوو لا١١١.
[2] البقرة: ١٨٨
[3] البقرة: ١٨٨

هیچیتر ناگەیەنیّ لەکاتێکدا فەساد لە عیبادەتدا وەرنەگیرانە، لە عەقدیشدا لێنەکەوتنەوەی ئەو ئاسەوارانەن کە لەڕووی شەرعەوە داواکراون.

هەرچی دیلالەتنەکردنیەتی لەڕووی ماناوە (وەك پابەندبوون) لەبەرئەوەیە یەکێك لە مەرجەکانی دیلالەتی مەعنەوی (پابەندییانە) بوونی لزومی ئەقڵییە وەك لەنێوان کوێری و چاودا، یان عورفی وەك لەنێوان حاتەم و بەخشندەییدا، هەردووکیشیان نین.[1]

ئەم بەڵگەیە بەوە گەنگەشە دەکریّ کە بە بۆچوونی تێکڕای جمهور لە شەرعزان و ئوسولیەکان حەقیقەتی شەرعیی نەهیکردن، بۆ حەرامکردنە، ئەوەیش روونە هەر حەرامکراوێك لەبەر خودی خۆی بیّ یان بەشێکی یان وەسفێکی وابەستەی، خراپەیەکی تێدایە کە پێویستە رابگیریّ، لەم رووەوە حەرامیی نەهیلێکراو یان یەکسانە بە خراپە یان بەپێی شەرع ئەوە دەخوازیّ، لزومی نێوانیشیان شەرعییە بۆیە پێویست بە لزومی ئەقڵی یان عورفی ناکا مادام بابەتەکە تەنها تایبەتە بە شەرع.

٣- نەهیکردن دروستی دەخوازیّ، لەبەرئەوەی نەهیکردن ئاماژەیە بۆ وێناکردن لەو رووەوە مەبەست پێی نەکردنە، ئەوەیش خۆی لەخۆیدا نەکردە (ممتنع) و مەحالّ بیّ نەکردن هەڵناگریّ، هەربۆیە نەهی لێناکریّ،

وەك نەهیکردن لە کەسێك توانای رۆیشتنی نەبیّ لە چوون (الزَّمِن) یان نابینایەك لە سەیرکردن، لەم روانگەوە ئەگەر دروستی (الصحة) نەبوایە نەهی نەدەکرا.[2]

---

[1] بروانە: الرازي: المحصول، سەرچاوەی پێشوو ل٤٨٩ و پاشتر.
الإعتمادي: شرح معالم الدين في الأصول، سەرچاوەی پێشوو ل١١٦.

[2] ابن قدامة (الإمام موفق الدين عبدالله بن أحمد بن قدامة المقدسي ٥٤١-٦٢٠هـ): روضة الناظر وجنة المناظر في أصول الفقه على مذهب الإمام أحمد، ١١٣.
القرافي: شرح تنقيح الفصول في اختصار المحصول، سەرچاوەی پێشوو ل١٧٣

ئەمەیش بەوە گەنگەشە دەکرێ کە دروستی سێ بەشی هەیە:

أ- دروستیەکی ئەقڵی: بریتییە لەوەی شتێك لە دیدی ئەقڵدا بوون و نەبوون قبوڵ بکا، وەك ئیمکانی بوونی ژیان لەسەر هەسارەیەکیتر جگە لە زەوی.

ب- دروستیەکی ئاسایی : ئەوەیە شتەکە بەعادەت مومکین بێ، وەك سەفەرکردن بەئاسمان و بە وشکانی و بەدەریا لە کاتی ئێستاماندا.

ج- دروستیەکی شەرعی: بریتییە لە مۆڵەتی شەرعی لە جائیزبوونی کردنی کارەکە، کە ئەحکامی شەرعی دەگرێتەوە جگە لە حەرامکردن کە مۆڵەتی تێدا نیە، باقیی چوارەکەیتر (واجب و مەندوب و موباح و مەکروه) مۆڵەتیان تێدایە.

ناکۆکی لەبارەی دروستییە شەرعیەکەوەیە، ئەوەیش تەنها ئەوە دەخوازێ پێشوەخت دروستییە ئاساییەکە هەبێ[1]، ئەویش وەك پەیڕەوکردنی ئەوەی خوا دەفەرموێ: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا...﴾[2].. کوشتنی نەهیلێکراو و زینا و دزی و خواردنی ماڵی کەسانیتر بەناڕەوا و فرۆشتنی مادە هۆشبەرەکان و نوێژکردن بەبێ دەستنوێژ، هەرهەموویان دروستیی ئاساییان هەیە، لەبەرئەوەی دەکرێ ببن لەگەڵ ئەوەی هەڵگری سیفەتی دروستیی شەرعی نین.

٤- ئەگەر نەهیکردن خراپەی بخواستایە دەبوو لە هەر جێیەك نەهیکردن هەبوو خراپەیش هەبێ، لازم بەتاڵە و مەلزومیش هەروەك ئەو، بەبەڵگەی ئەوەی نوێژکردن لە کاتە مەکروهەکاندا فاسید نیە با نەهیشی لێ کراوە. ئەم بەڵگەیەیش بەوە گەنگەشە دەکرێ کە دروستیی نوێژ لەم حاڵەتەدا لەبەر ئەوەیە نەهیکردنەکە پەیوەندی بە شتێکەوە هەیە لە دەرەوەی ئەو، ئەویش مانەوەیە لە زەویی کەسیتر و زیان پێگەیاندنی.

---

[1] القرافي: شرح تنقيح الفصول، ص١٧٦ .

[2] البقرة: ٢٨٦

٥- ئەگەر بەڵگە بێ لەسەر خراپە ئەوا ئەو بەڵگەیە دەیخواست، بەڵگە (دەلیـل)یش یان ئەقڵییە یان نەقڵی، نەقڵیش یان ئیجماعە یان دەق، دەقیش یـان موتـەواتیر (جەمینە) یە یان ئاحاد (تاکینە)، هیچ لەوانەیش نەسەلماوە، هیچ دیلالەتێکیش لە لایەنی ئەقڵەوە نیە.[1]

هەروەها بەوە رەت دەکرێتەوە کە نەهیکردن خراپە دەگەیەنێ، بە دەق و ئیجماع و ئەقڵ:

أ- دەق وەك ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((من أحدث في ديننا ما لـيس منـه فهو رد))[2]، دیارە رەتکراوە (مردود)یش خراپەکەیە.

ب- ئیجماع: شەرعزانی موسڵمان بـەجیاوازیی سـەردەمەکانیانەوە کۆدەنگ بـوون لەسەر کردنی ئەو نەهیەی ناو ئایەتی ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ ...﴾[3] بەبەڵگە لەسەر خراپیی مارەکردنی ژنانی موشریك.[4]

ج- ماقولێ: لە حاڵەتی گەڕانەوەی نەهیکردنەکە بۆ روکن یـان مـەرجی نـەهیلێکراو، ئەوا شتەکە روونە، لەبەرئەوەی رێی تێناچێ (کل) بەبێ (جزء) و مەرجدار بـەبێ بوونی مەرجەکە، بەدیبێن. هەروەها لە حاڵەتی گەڕانەوەی بۆ وەسفی دەرەکی، ئەوا رەفتارەکە لەگـەڵ ئـەو وەسـفە مەبەسـت بـووە، هەربۆیـە نـەبوونی مانـای بەدینەهاتنی رەفتارە داواکراوەکە دەگەیەنێ.[5]

---

[1] العلائي: تحقيق المراد، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٩- ١٥٠.

[2] فتح الباري، كتاب الصلح، ٢٣٠/٦.

[3] البقرة: ٢٢١

[4] الشوكاني/ ارشاد الفحول، سەرچاوەی پێشوو ل١١١.
الفتوحي: شرح الكوكب المنير ط١، ١٩٥٣م، ص٣٣٩.

[5] القرافي: الفروق، سەرچاوەی پێشوو ٨٤/٢ .

## گوتەکان و گەنگەشەکردنیان:

١- ئەوەی دەڵێن ئەبوحەنیفە (رەحمەتی خوای لێبێ) گوتوێتی نەهیکردن بەهیچ شێوەیەك فەساد ناگەیەنێ بەڵکو دروستی دەگەیەنێ، لەگەڵ واقیع یەکناگرێتەوە، لەبەرئەمانەی خوارەوە:

أ- لە مەزەبی ئەبوحەنیفەدا رێسا ئەوەیە نەهیکردن لە شتێك لەبەر خودی خۆی، بەتاڵیی شتەکە و لەبەر وەسفە وابەستەکەیشی فەسادی ئەو شتە دەخوازێ.

لەسەر ئەم بناغەیە حەنەفیەت سێیەمێکی لەنێوان راست و بەتاڵدا داهێناوە ئەویش فاسیدە و گوتویانە: بەتاڵ (الباطل) بەئەسڵ و وەسفی نامەشروعە، بەڵام فاسید بەئەسڵەکەی مەشروع و بە وەسفی نامەشروعە.

ب- لە مەزەبی ئەبوحەنیفەدا دروستی (الصحة) دوو مانای هەیە:

یەکەم: کردەوەکە لە عیبادەتەکاندا قەزا لە کۆڵ دەکاتەوە، گرێبەندیش هۆیە بۆ لێکەوتنەوەی ئاسەوارە داواکراوەکانی لە مامەڵەکاندا.

دووەم: ئەوەی بەرانبەری فاسید و بەتاڵە، جا ئەگەر وترا ئەمە دروست (صحیح)ە مانای وایە بەئەسڵ و بەوەسفی مەشروعە، بەپێچەوانەی بەتاڵ، کە بەئەسڵ مەشروع نیە، هەروەها بەپێچەوانەی فاسید کە بەئەسڵی مەشروعە نەك بە وەسفی. لێرەیشەوە ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی دەڵێن: "ئەوەی لەبەر خودی خۆی نەهیلێکراوە بەهەردوو ماناکە دروست نیە، ئەوەیش لەبەر وەسفە وابەستەکەی نەهیلێکراوە، بە مانای یەکەم دروستە نەك دووەم"[1]، وەك لە لقی سێیەمدا بەدرێژی باس دەکرێ.

٢- ئەوەی دەوترێ غەزالی پێی وایە نەهیکردن بەهیچ شێوەیەك خراپە ناخوازێ، لەگەڵ سەقامگیرنەبوونی غەزالی (رەحمەتی خوای لێبێ) لەسەر یەك ئاراستە بریەك

---

[1] بروانە سەرچاوە ئوسوڵیەکانی حەنەفی بەتایبەت: أصول البزدوي مع كشف الأسرار ١/٢٥٧-٢٥٨.

دەکەوێ، کە لە المستصفی–دا دەڵێ[1]: "(رای) هەڵبـژێردراو ئەوەیە خراپە ناخوازێ". لە (المنخـول)دا[2] دەڵـێ: "نـەهیکردن لەسـەر خراپیـی نـەهیلێکراو دامەزراوە، بەو مانایەی وادەکا بوونی وەك نەبوونی بێ". لە (شفاء الغلیل)[3]یشـدا نەهیلێکراو لەبەر خودی خۆی و نەهیلێکراو لەبەر وەسفی لێك جیا دەکاتـەوە و یەکەمیان بە خراپ (فاسید) دادەنێ بەبێ دووەم. هـەروەها لـە (الـوجین)[4]دا ئـەو عەقدانەی لەبەر خودی خۆیان یان وەسفە وابەستەکەیان نەهییان لێکراوە بەبەتاڵ و لەوانە بەدەری بە دروست، داناوە. بەوەیش دەتوانین بڵێین غـەزالی لەگـەڵ هـەر ئاراستەیەکدا رایەکی هەیە.

٣- دانـانی ئەبولحەسـەن ئەلبەصـری لـە ریـزی ئەوانـەی وتویانـە نـەهیکردن بـەهیچ شێوەیەك خراپـە نـاخوازێ، لەگـەڵ ئـەو را باوەیـدا دژ دەوەسـتێ کـە لـە دەیـان سەرچاوەدا باس کراوە، ئەویش ئەوەیە نەهیکردن لە عیبادەتەکاندا مانای خراپـە دەخوازێ نەك لە مامەڵەکاندا.

٤- گوتنی ئەوەی ئیمامی حەرەمەین لە لایەنگرانی ئەو رایەیە کـە نـەهیکردن بـەهیچ شێوەیەك خراپە ناخوازێ، لەگـەڵ ئـەوە دژیـەك دەوەسـتێ کـە ئـەو لەگـەڵ ئـەو ئاراستە فراوانەیە کە دەڵێ نەهیکردن بەڕەها خراپە ناخوازێ.[5]

---

[1] بڕوانە: المستصفی تحقیق محمد مصطفی أبو العلاء ص٣١٧.

[2] المنخول، تحقیق محمد مصطفی أبو العلاء، ص٣١٧.

[3] شفاء الغلیل، تحقیق محمد حسن هیتو ص١٢٦.

[4] شفاء الغلیل، تحقیق الدکتور حمد الکبیسي ص٥٠-٥١.

[5] بڕوانە: شرح العبادي علی شرح جلال الدین المحلی علی الورقات في الأصول لإمام الحـرمین الجـویني علـی هامش ارشاد الفحول ص٩٧،

تێیدا هاتووە: "ئەگەر ئـەو دەرەی نەهیکردنەکە لەپێناویدایە لـە عیبـادەت و مامەڵەکان نـالازم بـێ، وەك دەستنوێژگرتن بە ئاوی زەوتکراو بۆ نموونە، هـەروەها وەك فرۆشـتن لـەکاتی بـانگی جوعـە، بەڵگـە نیـە لەسەر فەسادی، بەپێچەوانەی ئەوەی لە قسەی موسەنیف (ئیمامی حەرەمـەین) حـاڵی دەبـن کـە گوایـە ئاماژە بێ بۆ ئەوەی هەرکات باس کرا نەهییە لەسەر فەساد".

## لقی دووەم:
## نەهیکردن بەهەموو شێوەیەک خراپە دەخوازێ

بەپێچەوانەی ئاراستەی یەکەم، هەندێ لە زانایان لە ئوسوڵناس و شەرعزان بۆ ئەوە چوون کە نەهیکردن بەڕەهایی ئاماژەیە بۆ ئەو خراپەیەی نەهی لێکراوە، جا چ لە عیبادەتەکاندا بێ یان لە مامەڵەکاندا، هەروەها چ نەهیکردنەکە لەبەر نەهیلێکراوەکە خۆی بێ، یان لەبەر بەشێکی، یان لەبەر وەسفە وابەستەکەی، یان لەبەر وەسفە ناوابەستەکەی (تەنیشت) تا بەڵگەیەك لەسەر پێچەوانەی ئەوە پەیدا نەبێ. ئەم ئاراستەیە حەنبەلی و زاهیری و جمهوری زەیدی رابەرایەتیان کردوە بەڵام بە بەڵگەسازیی جیاواز لەیەکتر و هەروەها هەندێ هەڵاوێران لەم رێسایە لەبەر بەڵگەیەکی دەرەکی، وەك لەم وردکردنەوەیەدا:

### حەنبەلیەکان[1]:

ئیمام ئەحمەد و زۆربەی هاوەڵانی دەڵێن: "نەهیکردنی رەها (دابڕاو لە قەرینە) خراپیی نەهیلێکراو دەخوازێ جا چ نەهیکردنەکە لەبەر خودی خۆی بێ وەك کوفر و

---

[1] بڕوانە: شرح الكوكب المنير المسمى بمختصر للفقيه الأصولي الحنبلي محمد بن شهاب الدين احمد بن عبدالعزيز علي بن ابراهيم الفتوحي الشهير بإبن النجار، لختصر فيه كتاب تحرير المنقول من علم الأصول لعلاء الدين المرداوي. مطبعة السنة المحمدية ١٩٥٣م، ص٣٣٩–٣٤٢.
المسودة في أصول الفقه لآل تيمية وهو الشيخ مجد الدين وولە الشيخ عبدالحليم وحفيده شيخ الإسلام تقي الدين. مطبعة المدني ص٨٢–٨٣.
روضة الناظر وجنة المناظر في أصول الفقه الحنبلي، لامام موفق الدين عبدالله بن أحمد بن قدامة المقدسي (٥٤١–٦٢٠هـ)، المطبعة السلفية، ص١١٣–١١٥.
المدخل إلى منهب الإمام أحمد بن حنبل للشيخ عبدالقادر بن أحمد المعروف بابن بدران الدمشقي، ادارة الطباعة المنيرية، ص١٠٥–١٠٦.
الفروق للقرافي، ٢/٨٤–٨٥.

ستەم و ئەو شتانە کە لەبەر خۆیان درێون، یان لەبەر وەسفە وابەستەکەی وەك گرێبەندی سوودار (ریبەوی) و ڕۆژووی ڕۆژی جەژن، یان لەبەر مانایەك لە غەیری خۆیدا وەك فرۆشتن پاش بانگی جومعە، هەروەها وەك دەستنوێژگرتن بە ئاوی زەوتکراو".

بۆ ئەمەیش چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە لەمانە.

١- دەق: وەك ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ)).[1]

٢- کۆدەنگیی بێدەنگبوون (الاجماع السكوتي): هێشتا زانایانی موسڵمان نەهیکردن دەکەنە بەڵگە لەسەر خراپیی ئەو گرێبەندانەی نەهییان لێکراوە.

٣- ئیمام ئەحمەد (رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: "نەهیکردن خراپەکان دەگرێتەوە و هەرکات نەهییەك هات ئەو گرێبەندە و کۆی ئەو هەڵسوکەوتە بەتاڵ دەکەینەوە، لەبەرئەوەی ئەو گرێبەندە بەو وەسفە ئەو ماهیەتەی خواستوە، بەبێ ئەوە هەردوو گرێبەندوان خۆیان لە قەرەی نەداوە، بۆیە لەسەر ئەسڵەکەی بەبێ عەقد لەسەرکراوی دەمێنێتەوە و لە دەستێکەوە کە بەبێ عەقد وەریگرتوە دەگەڕێنرێتەوە. بەهەمان شێوە دەستنوێژگرتن لە ئاوی زەوتکراو لەڕووی شەرعەوە وەك نەبوو وایە، نەبووی شەرعیش وەك نەبووی هەستی وایە، ئەوەی بە هەستەوە بەبێ دەستنوێژ نوێژ بکا نوێژەکەی بەتاڵە، بەهەمان شێوە نوێژی دەستنوێژگرتوو بەئاوی زەوتکراویش بەتاڵە، هەروەها نوێژکردن بە جلی زەوتکراو و دزراو و سەربڕین بە چەقۆی زەوتکراو یان دزراو، هەرهەموویان لەڕووی شەرعەوە مەعدومە، هەربۆیە لەڕووی هەستیشەوە مەعدوم دەبن.

---

[1] مسند أحمد: ٢٥٥١١

بەڵام حەنبەلیەکان لە عمومی ڕێسای (نەهیکردن بەرەهایی خراپە دەخوازێ)، نەهیکردن لەبەر مافی مرۆڤێکیان هەڵاویر کرد و گوتویانە: "ئەگەر نەهیکردن لە شتەکە لەبەر غەیری خۆی بوو و ئەو غەیرەیش بریتی بوو لە پاراستنی مافی مرۆڤێك، ئەوا خراپە ناخوازێ، لەبەرئەوەی شەرع مافی بڕارەی بەخشیوەتە ئەو مرۆڤە بۆ هەڵوەشاندنەوەی عەقدەکە بەمەبەستی نەهێشتنی مافخورانەکەی و راگرتنی ئەو زیانەی پێ گەیشتوە. [1]

## زاهیری[2]:

بەلای زاهیریەوە خواستنی نەهیکردن بۆ خراپە بەرەهایی وەك خواستنی فەرمانە بۆ واجببوون بەرەهایی شتێکی حاشاهەڵنەگرە مادام ئەوان لە هەموو مەسەلەیەکی شەرعیدا دەست بە زاهیری دەقەکانەوە دەگرن. بەلای ئەوانەوە نەهیکردن خراپە دەخوازێ چ لە عیبادەتەکان و چ لە مامەڵەکاندا، هەروەها چ نەهیکرنەکە لەبەر نەهیلێکراوەکە، یان بەشێکی، یان وەسفە وابەستەکەی یاخود وەسفە هاوسێکەی/تەنیشت (المجاور) بێ.

---

[1] لە: شرح الكوكب المنير (ص ٣٤٢)دا هاتووە: "نەهیکردنی رەها لە شتێك لەبەر خۆی یان وەسفی یان مانایەك لە غەیری خۆیدا، وەك نەهیکردن عەقدی فرۆشتن پاش بانگی جومعە و دەستنوێژگرتن بە ئاوی زەوتکرلو، بەلای ئیمام ئەحمەد و زۆریەی هاوەڵانیەوە، لەڕووی شەرعەوە فەسادی نەهیلێکراو دەخوازێ، بەو مەرجەی نەهیکرننەکە لەبەر مانایەك نەبێ لە غەیری نەهیلێکراودا، لەبەر مافی ئادەمیزادێك وەك چوونە پێش کاروان (تلقي الركبان)، نەجش (ئەویش زیادکردنی نرخە لەلایەن کەسێکەوە کە نیازی کڕینی نیە لەسەر کڕیاران)، زەمکردن بەسەر هاوسەرگیریی کەسیتردا و ساختەکردنی فرۆشتن وەك قصریە و ئەو جۆرە شتانە..کە عەقدەکەی لای ئێمە و لای زۆرینە دروستە. ابن مفتح لە ئوسوڵەکەیدا دەڵێ: وەك هاوەڵانمان وتویانە نەهیکردن خراپە دەخوازێ، مەبەستیان ئەوەیە بەو مەرجەی نەهیکرننەکە لەبەر مافی ئادەمیزادێك نەبێ کە دەرفەتی فریاکەوتنی ماوە،.. وەك چوونە پێش کاروان و نەجش کە بەلای ئێمە و زۆرینەوە دروستن لەبەرئەوەی شەرع بڕارەی جێگیر کردوە".

[2] الإحكام في اصول الأحكام للحافظ أبي محمد علي بن حزم الأندلسي الظاهري وكنيته أبو محمد (٣٨٤-٤٥٦هـ) نشر زكريا علي يوسف ٣٠٧/٢ و پاشتر.

بەڵگەیان لەسەر ئەوە: ئەوەیە ئەنجامدانی هەر کارێکی شەرعی تەواو نیە تا بەو شێوەیە نەبێ کە خوا فەرمانی پێکردوە و پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی پێداوە و ئەفەرموێ: ((كُلّ أمرٍ لَيسَ عَلَيْهِ أمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ)). هەر شتێکیش ڕەتکراوە بێ بەتاڵ دەبێ.[1]

## زەیدی[2]:

جمهوری زانایانی زەیدی لە ئوسوڵناسان و شەرعزان دەڵێن: نەهیکردنی ڕەها (دابڕاو لە قەرینە) خراپیی نەهیلێکراو دەخوازێ بەڕەها تا بەڵگەیەك نەبێ لەسەر پێچەوانەی ئەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ((كُلّ أمرٍ لَيسَ عَلَيْهِ أمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ)).[3]

---

[1] في الأحكام، سەرچاوەی پێشوو ٣٠٧/٣دا هاتووە: "ئەو کەسەی بەجلێکی پیس یان زەوتکراوە نوێژ بکا و بزانێ ئەوە بۆی دروست نیە، یان لە جێیەکدا نوێژ بکا نەهیکراوە تێیدا بمێنێتەوە وەك شوێنی پیس یان زەوتکراو یان لە تەویلەی وشتر (عطن الإبل) یان لە گۆڕدا، یان ئەو کەسەی بەچەقۆی زەوتکراو سەربڕێ، یان ئاژەڵی کەسیتر بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی سەربڕێ، یان بەئاوی زەوتکراو، یان بەدەفری زیو یان زەوتکراو یان ئاڵتون دەستنوێژی گرت، هەموو ئەوانە فەرزیان پێ جێبەجێ نابێ، جا ئەوەی بەو شێوەیە نوێژ بکا نوێژی نەکردوە و بەو شێوە دەستنوێژ بگرێ دەستنوێژی نەگرتوە، ئەوەی بەو شێوەیە سەربڕێ سەری نەبڕیوە و وەك مردار وایە و خواردنی ئەو گۆشتە دروست نیە نە بۆ خاوەنەکەی و نە بۆ خەڵکیتر و سەربڕەکە پێویستە بیبژێرێ، لەبەرئەوەی ئەو شتانەی بەپێچەوانەی ئەوەی فەرمانی پێکراوە کردوە. پێغەمبەر فەرمویەتی: ((مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ)).
ئیبن حەزم دەڵێ: خوا نەهی لێکردوە لە بەرکارهێنانی ئەو چەقۆیانە و لە سەربڕینی حەیوانی کەسیتر بەبێ مۆڵەت لە مانەوە لە شوێنی زەوتکراو، بەگشتی هیچ کارێك جێبەجێ نابێ بەو شێوەیە نەبێ خوا فەرمانی کردوە و ڕێگەی پێداوە، نەك بەو شێوەیەی نەهی لێکردوە".

[2] بڕوانە: ارشاد الفحول الى تحقيق الحق من علم الأصول، تأليف محمد بن علي بن محمد الشوكاني الزيدي (ت-١٢٥٥هـ) مطبعة مصطفى البابي الحلبي، ص١١٠-١١١.

[3] في ارشاد الفحول سەرچاوەی پێشوو (١١١/) بەدەستکاریەوە، هاتووە: لەڕاستیدا هەر نەهیکردنێك بەبێ جیاوازی لەنێوان عیبادەتەکاندا لەڕووی شەرعیەوە خراپیی نەهیلێکراو دەخوازێ کە هاومانای بەتاڵییە. لەوە دەرناچێ ئەوە نەبێ بەڵگە هەبێ کە ئەوە ناخوازێ، ئەوکاتە ئەو بەڵگەیە دەبێتە قەرینەیەك کە لە مانا ڕاستەقینەکەیەوە دەیگوازێ بۆ مانایەکی مەجازی. لەو بەڵگانەی لەسەر ئەمە هەن ئەوەیە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((كُلّ أمرٍ لَيسَ عَلَيْهِ أمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ))، نەهیلێکراویش فەرمانی ئێمەی لەسەر نیە ←

**هەڵسەنگاندنی ئەم ناراستە فراوانە:**

١- هەڵاویرانی ئەو عەقدانەی نەهیکردن تێیاندا بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی عەقدکاری مافخوراوە لە رێسای (نەهیکردن بەرەهایی خراپە دەخوازێ) فیقهێکی باشە، لەبەرئەوەی شەرعدانەر کاتێ بژاری بۆ لایەنی زیانمەند ئیقرار کردوە، ئەوە مانای ئەوەیە بە دروستی داناوە، لەو رووەوە بژارە لە عەقددا جێگیر نابێ تا عەقدەکە دروست نەبێ. پاشان بژارە بەهەمان ئەرك هەڵدەستێ ئەگەر عەقدکاری مافخوراو کردی. ئەمە جگە لەوەی دەشێ چاو لە هەڵوەشاندنەوەی عەقدەکە بپۆشێ و لەبەر هۆیتر لەسەری بەردەوام دەبن، ئەوەیش سەقامگیریی مامەڵەکانی تێدایە.

٢- ئەوەی دەوترێ نەهیکردن لە شتێك لەبەر هۆیەکی دەرەکیی نالازم خراپە دەخوازێ جێی سەرنجە، لەو رووەوە هیچ وابەستەییەك لەنێوان ئەم دەرەکییە و خراپیی نەهیلێکراوەکەدا نیە مەگەر کاتێ بوونی یەکێکیان لەسەر ئەویتر بوەستێ، ئەوەیش زانراوە تێکگیران لەنێوان کۆبوونەوەی فەرمانکردن و نەهیکردندا نیە ئەگەر پێپەیوەستی هەریەکەیان لەویتر جیاواز بێ جیاوازیەك نەبەسترابێ بە پەیوەندیەکەوە، کە لەرووی بەدیهاتنەوە یەکێکیان لەسەر ئەویتریان بوەستێنێ. واتە شرعدانەر کاتێ فەرمانی کردوە بە دەستنوێژ لەکاتی نوێژکردندا وەك خوا ئەفەرموێ ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ...﴾ نەیکردۆتە مەرج شۆردنەکە بە ئاوی موباح بێ، بەڵکو

---

لەبەرئەوە رەتکراوەیە. زانایان کودەنگن لەسەر ئەوە نەهیلێکراو لە شەرع نیە و بەتاڵە و دروست نیە، ئەمەیە مانای ئەوەی نەهیکردن خراپە (فەساد) دەخوازێ. نەهیکردن لە شتێکیش لەبەر خۆی، یان لەبەر بەشێکی لە هەموو بار و کاتێکدا خراپەی دەخوازێ. نەهیلێکردنی لەبەر وەسفە وابەستەکەی فەسادی دەخوازێ مادام ئەو وەسفە، هەروەها نەهیلێکردنی لەبەر وەسفێکی جیا یان شتێك لە دەرەوەی نەهیلێکردنی دەخوازێ کاتێ ئەو وەسفەی وەرگرت و کەوتە ناو ئەو شتەی دەرەوە، لەبەرئەوەی نەهیکردن لە تێکەوتنی بەبەندکردنی بەو دوانەوە فەسادی دەخوازێ مادام قەید بێ بۆی".

زەوتکردنی بەڕەها حەرام کردوە و تەهارەتی بەڕەها واجب کردوە. هەروەها لە کردنی نوێژدا کاتێ خوا ئەفەرموێ : ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلَاةَ﴾ نەیگردۆتە مەرج لە پارچە زەویەکی موباحدا بکرێ، بەڵکو نوێژی بەڕەها واجب کردوە و زەوتکردنی بەڕەها حەرام کردوە، حەرامکردنی شتێکیش نەبوونی ناکاتە مەرج.

هەمان شتیش لەبارەی فرۆشتن لەکاتی بانگی جومعەدا راستە، چونکە هیچ وابەستەییەك لەنێوان فرۆشتن و فەوتاندنی نوێژدا نیە، لەبەرئەوەی دەکرێ لە رێگەی چوون بۆ جومعەدا بکرێ، هەروەك دەشکرێ نوێژەکە بەبێ فرۆشتن و چوون بۆ جومعەیش بفەوتێنرێ.

## لقی سێیەم:
## ئاراستەی میانڕەو

ئاراستەی سێیەمی زانایانی موسڵمان لە ئوسوڵناس و شەرعزان سەبارەت بەوەی ئاخۆ نەهیکردن خراپیی نەهیلێکراو دەگەیەنێ یان نا، رایەکی ناوەڕاستە لەنێوان ئەوەی دەڵێ بەڕەها خراپە ناگەیەنێ و ئەوەی دەڵێ بەڕەها خراپە دەگەیەنێ. هەریەك لە مەزەبەکانی حەنەفی و مالیکی و شافیعی و جەعفەری پەیڕەوییان لەم ئاراستەیە کردوە بەجیاوازی لە وردەکاریدا، وەك لە خوارەوە دەردەکەوێ:

### حەنەفی[1]:

دەڵێن: ئەوەی نەهیکردن دەخوازێ درزێویی نەهیلێکراوە لەڕووی شەرعەوە، نەهیلێکراویش لەڕوی درزێوییەوە دوو بەشە، درزێو (قبیح) لەبەر خۆی و درزێو لەبەر غەیری خۆی، درزێو لەبەر غەیری خۆیشی دوو جۆرە، درزێو لەبەر وەسفێکی واستە و

---

[1] شرح التوضيح على التنقيح لصدر الشريعة عبدالله بن مسعود، مع التلويح للإمام سعد الدين التفتازاني، وحاشية الفنري على التلويح، وحاشية ملا خسرو وعبدالحكيم عليه أيضاً. الطبعة الأولى ١٣٢٢هـ، ٢٢٢/٢ و پاشتر. أصول البزدوي مع كشف الأسرار، ٢٥٦/١ و پاشتر.
فتح الغفار شرح المنار المعروف بمشكاة الأنوار في اصول المنار، للإمام زين الدين بن ابراهيم الشهير بابن نجيم الحنفي، مطبعة البابي ١٩٣٦م، ٧٧/١ و پاشتر.
شرح المنار وحواشيه من علم الأصول للعلامة عزالدين عبداللطيف ابن عبدالعزيز بن ملك، على متن المنار في اصول الفقه للشيخ الإمام أبي البركات عبدالله بن أحمد المعروف بحافظ الدين النسفي (ت-٧١٠هـ) مع حاشية عزمي زاده ولبن الحلبي، طبعة ١٣١٥هـ/ ص٢٥٨ و پاشتر.
أصول السرخسي للإمام الفقيه الأصولي النظار أبي بكر محمد بن أحمد أبي سهل السرخسي (ت-٤٩٠هـ) دار المعرفة للطباعة ٨٠/١ و پاشتر.
تيسير التحرير شرح العلامة محمد أمين المعروف بأمير بادشاه الحنفي الخراساني على كتاب التحرير في اصول الفقه الجامع بين اصطلاحي الحنفية والشافعية، لابن همام، مطبعة البابي، ٣٧٦/١ و پاشتر.

دزێو لەبەر وەسفێکی هاوسێ.

لە روانگەی ئەم وردەکاریەوە، دەکرێ دابەشبوونەکان بکەین بە سێ جۆر:

جۆری یەکەم: نەهیلێکراو لەبەر خودی خۆی و دزێو لەڕووی دانان (الوضع)[1] یان شەرعەوەوە[2]: ئەوەیە ماهیەتەکەی هەڵگری خراپە بێ، چونکە شتە خراپەکان نەهییان لێدەکرێ و بەرژەوەندیەکانیش فەرمانیان پێدەکرێ. نموونە لەم جۆرە فرۆشتنی هێلکە (ملاقیح)[3] و سپێرم (مضامین)[4] لە ماماڵەکان و نوێژ بەبێ دەستنوێژە لە عیبادەتەکاندا، هەروەها زینا و کوشتن و ستەم و درۆیە لە کارە ناڕەواکانیتردا.

دزێوی شەرعیی بۆ ئەو فرۆشتنەی باس کرا ئەوەیە بابەتەکەی (المحل) مەشروع نیە لەبەر ماڵینەبوون لە فرۆشراوەکەدا لەکاتێکدا فرۆشتن گۆڕینەوەی ماڵە بە ماڵ. لە روونکردنەوەی ئەوەدا گوتویانە: عەقد چوار روکنی هەیە: دوو باتی (عوض)ـەکە و هەردوو عەقدکارەکە. هەرکات روکنەکان هانەدی و لە نەهیکردن دوور بوون ماهیەتەکە لەڕووی شەرعیەوە موعتەبەرە. هەرکاتیش یەکێك لە روکنەکانی ناتەواو بوو، بەزەرورەت ماهیەتەکەیشی نامێنێ، لەبەرئەوەی ماهیەتی ئاڵۆز وەك لەبەر نەبوونی سەرجەم بەشەکانی وجودی نابێ، بەهەمان شێوە لەبەر نامەشروعبوونی یەکێکیشیان وجودی نابێ. فرۆشتنی مەڕگەلێك لەلایەن رەشیدێکەوە بە رەشیدێکیتر بە چەردەیەکی دیاریکراو لە پارە دروستە لەبەر دروستیی سەرجەم روکنەکانی، بەپێچەوانەی فرۆشتنی مەڕ بە بەراز، عەقدەکە بەتاڵە لەبەرئەوەی یەکێك لە دوو باتییەکە کە بەرازە نامەشروعە.

---

[1] واتە دانەری زمان، کە بۆ کردەوەیەکی دزێوی وەك ستەم و درۆی داناوە.

[2] وەك فرۆشتنی بەراز.

[3] کۆی (ملقوحە)یە ئەویش ئەو کۆرپەلانەیە لە رەحمی دایکاندان.

[4] کۆی (مضمون)ـە، کە ئەو سپێرمانەن لە پشتی باوکدان.

هـەروەها نوێـژ بـەبێ دەسـتنوێژ نـەهیلێکراوە لەبەرئـەوەی شـەرع پـاکبوون لـە دەستنوێژشـکان و لەشپیسـی بـە مـەرج دانـاوە بـۆ کەسـێك تـا شـیاو (ئـەهل) بـێ نوێـژکردن، هەربۆیـە بـە نـەبوونی سـیفەتی تـەهارەت ئەهلیەتەکـە نـامێنێ، نـەمانی ئەهلیەتیش لەسەروو نەبوونی بابەتەوەیە (المحلیة).

حوکمی ئەم جۆرە لە نەهیکردن بریتییە لە بەتاڵی نەهیلێکراو ئەگەر کەسێك پێـی هەسـتا، بـەمانای ئـەوەی عیبادەتەکـەی بـۆ نانووسـرێ، هـەروەها بریتییـە لـە لێنەکەوتنەوەی ئاسەوارە پێویستەکان لە عەقدەکاندا، چونکە لـە بنەڕەتـدا مەشـروع نیـە، لـەو رووەوە مەشـروع لـە بەرژەوەنـدی خـاڵی نیـە، بـەبێ بـوونی ئەهلیـەت و محەلیەتیش ئەو بەرژەوەندییە وجودی نیە.

جۆری دووەم: نەهیکردنـە لـە شـتێك لەبـەر وەسـفە وابەسـتەکەی، بـەوەی کـارە نەهیلێکراوەکـە ئەرکـە شـەرعیەکانی تێـدا هاتبنـە جـێ، هـەروەها نـەهیکردن لەبـەر مانایەکی وەك وەسفێك پەیوەندی پێیەوە هەیە، واتە لەبەر وەسـفێکی وابەسـتە وەك فرۆشتن بەسوو، کە لەبەر بـوونی روکنـەکانی بەئەسـڵی مەشـروعە، بـەڵام بەوەسـفی نامەشروعە، کە فائیز (زیادە)یەکە باتی نیە و بەهۆیەوە یەکسانی نامێنێ کە مـەرجی رێپێدانــە بــۆ گرێبەنــدکردن لــە بابەتــە ســوودارەکاندا، مــەرجی هەرشــتێکیش شـوێنکەوتەیەتی، بۆیـە دەبێتـە وەسـف. هـەروەها وەك رۆژووی رۆژی جـەژن لـە عیبادەتەکاندا، کە لەخۆیدا باشە بەڵام لەبەر مانایەك کە پەیوەندی بەکاتەوە هەیە کە شوێنی ئەنجامدانەکەیە، دزێوە. ئەوە وەسفێکی وابەستە (لازمە) و لێی جیا نابێتەوە.

**حوکمی ئەم جۆرە:**

ئەوەیە بەئەسڵی مەشروع و بە وەسفی فاسیدە، بۆیە بەخۆی بـاش و بـە غـەیری خۆی دزێو دەبێ، بکەری ئەنجامدەری حەرامە لەبەر غەیری خۆی نـەك لەبـەر خـۆی، چونکە عەقدەکە بەئەسڵی مەشروعە، لەبەرئـەوە مخاوەنـدارێتی واجـب دەکا ئەگـەر

وەرگرتنی[1] تێکەوت، بەو ئیعتیبارەی فرۆشتنێکە روکنەکانی هاتونەتەدی. بەڵام بە وەسفی فاسیدە بۆیە پێویستە هەڵبوەشێنرێتەوە بەو ئیعتیبارەی لەبەر غەیری خۆی حەرامە. رۆژوو بە ئەسڵی خۆی مەشروعە، جا ئەگەر نەزری کرد رۆژی جەژن بەرۆژوو بێ دروستە بەڵام بە وەسفەکەی (رۆژی میواندارێکردنە لەلایەن خواوە) فاسیدە، بۆیە پێویستە رۆژوەکەی بشکێنێ و دواتر قەزای بکاتەوە.[2]

ئەبوحەنیفە (رەحمەتی خوای لێبێ) حوکمی ئەم جۆرە (کە بەئەسڵی مەشروع و بە وەسفی فاسیدە) بەوە شی کردۆتەوە کە: ئەسڵی ماهیەتەکە لە خراپە بەدوورە و نەهیکردنیش لە شتێکە لە دەرەوەی ماهیەتەکە، ئەگەر بڵێین بەرەهایی خراپە ئەوا ماهیەتی خراپ و هی ساغ یەکسان دەکەین.

ئەگەر بشڵێین بەرەها دروستە، ئەوا ماهیەتی ساغ لە خۆی و لەسیفەتەکانی لەگەڵ ماهیەتی خراپ لە سیفەتەکانیدا تێکەڵ دەکەین، ئەوەیش دروست نیە، چونکە یەکسانکردن لەنێوان شوێنەکانی خراپە و ساغ لە خراپە پێچەوانەی رێساکانە، ئەوکاتە پێویست دەکا ئەسڵ بەئەسڵ و وەسف بە وەسف بەرانبەر بکرێ. دەڵێین: ئەسڵی ماهیەت لە نەهیکردنەوە دوورە، ئەسڵیش لە هەڵسوکەوتی موسڵمانان و عەقدەکانیاندا دروستییە تا نەهیەك دێت و ئەسڵەکە بۆ ئەسڵی ماهیەتەکە، کە دروستییە، جێگیر دەبێ. ئەو وەسفەیش کە زیادە (بۆ نموونە وەك لە عەقدی

---

[1] وەرگرتنی کردۆتە مەرج لەبەرئەوەی هۆکەی نامەشروعە.

[2] أصول الشاشي للقفال الشاشي، ص٤٩.

تيسير التحرير، سەرچاوەی پێشوو ٣٧٨/١.

أصول السرخسي، سەرچاوەی پێشوو ، ٨١/١.

الرهاوي على سەرچاوەی پێشوو، لا٢٧٤.

لە: الهداية-دا هاتووە: "ئەگەر رۆژی جەژن بەرۆژوو بێ ئەوا گرتویەتی، ئەمە زاهیری ریوایەتەکەیە. لە ئیبن موبارەکەوە لە ئەبوحەنیفەوە ریوایەت کراوە دروست نیە، کە ئەوە قسەی زەفر و شافیعییە".

سـوودااردا) کـه هـهلگری خراپـهیـه، وهسـفی سـهرههڵداوی بـۆ جـێگیر دهکـرێ کـه نههێکردنه و بهوهیش وهسفهکه خراپ دهبێ نهك ئهسڵهکه، ئهوهیش داواکراوه.[1]

بهم شیکارییه ئوسولیيه زانستییه لۆژیکییـهی ئـهم شـهرعزانه مهزنـه، فیقهەکـهی حاڵهتێکی سێیهمی لهنێوان دروست و بهتاڵ (الصحيح والباطل) تێدا دهبـێ، دروسـت ئهوهیـه بهئهسـڵ و بـه وهسـفی مهشـروعه، بـهتاڵ ئهوهیـه بهئهسـڵ و بهوهسـفی نامهشروعه، خراپ (فاسيد)یش ئهوهیه بهئهسڵی مهشروع و به وهسفی نامهشروعه.

جۆری سێیهم: نههێکردنه بۆ وهسفی هاوسێ (نالازم): ئهوهیه کارهکه بهماهیهتی مهشروع بێ، بهڵام لهبهر وهسفێك کـه دهکـرێ لێـی بکرێتـهوه، نـههی لێکـراوه، وهك فرۆشتن لهکاتی بانگی جومعهدا که نههی لێکراوه بهوهی خـوا ئهفـهرموێ: ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَـيْعَ...﴾[2].

نههێکردنهکه نه له خودی فرۆشتنهکه و نه بـۆ وهسـفێکی وابهسـتهی نیـه، لهبـهر ناتهواونهبوونی هیچ روکن یان مهرجێك له عهقدێکدا کـه پـاش بـانگی نوێـژی جومعـه دهکرێ.

کهواته نههیهکه بۆ وهسفێکی هاوسێیهتی ئهویش ئهوهیـه خـهریکبوونی عهقـدکار بـه عهقدهکـهوه لهوانهیـه سهریکێشـێ بـۆ وازهێنـان لـه ههوڵـدان بـۆ یـادی خـوا کـه وهسفێکی نالازمه، بهڵکو قابیل بهوهیه لێی ببێتهوه بهوهی فرۆشتنهکه لهکاتی چوون بۆ نوێژدا بکرێ، ههروهك نهچوونهکه لهوانهیه لهبهر شتێکیتر بـێ جگـه لـه فرۆشـتن، بهوهی کهسهکه لـه ماڵهکهیـدا بمێنێتـهوه بـهبێ فرۆشـتن و بـهبێ چـوون بـۆ نوێـژی جومعه. ههمان شت سهبارهت به نوێژکردن له زهویی زهوتکراویشـدا راسـته، چـونکه مانهوه له زهویی کهسانیتردا بهبێ مۆڵهتی خاوهنهکهی، وهك چۆن بهنوێژکرد دهبـێ، به جگه لهویش دهبێ، کهواته ئهوه وهسفێکی نالازمه.

---

[1] بڕوانه: أصول السرخسي ١/٨٨، الفروق للقرافي ٢/٨٣-٨٤.
[2] الجمعة: ٩

## لقی چوارەم:
## چەند نموونەیەک لە مەسەلە فیقهییە جێناکۆکەکان
## کە لە جیاوازی لەبارەی ڕێسای "نەهێکردن خراپە دەخوازێ" کەوتونەتەوە

لەئـەنجامی جیـاوازیی زانایـانی موسـڵمان لـە ئوسـوڵناس و شـەرعزان لەمـەڕ ئـەو ڕێسای ئوسوڵیەی دەڵێ (نەهیکردن خراپە دەخوازێ)، لە هەندێ حوکمی شەرعیدا لە مەسـەلەکانی هاوسـەرگیری (زواج) و تـەڵاق و مامەڵـە داراییـەکان و عیبادەتەکانـدا ڕاجیاییان تێکەوتووە.

لـە هاوسـەرگیریدا: لـەبارەی ژن بـەژن (زەواجـی شـیغار)، خـوازبێنی بەسـەر خوازبێنیی یەکتردا، هاوسەرگیریی حەرام و هاوسـەرگیریی حەڵاڵکـەر (المحلـل)دا ڕای جیاوازیان هەبووە.

لە تەڵاقدا: لەوەدا جیاواز بوون ئەگەر لە حاڵەتی بێنوێـژی (حـەیز) یـان زەیسـانی (نیفاس)، یان لە پاکبوونەوەیەکدا پیاوەکە سەرجێی لەگەڵی کردبێ تێیـدا، هـەروەها لە خولعدا لەکاتی بوونی تەنگپێهەڵچنین (العضل)لدا.

لە مامەڵـە داراییەکانـدا: لـەبارەی نـەجش، چـوونە پـێش کـاروان (تلقـي ركبـان)، فرۆشتن بەسەر فرۆشتنی کەسیتردا، فرۆشتنی عەینە (بيع العينة)[1]، فرۆشتن بەمەرج، فرۆشتن پاش بانگکردن بۆ نوێژی هەینی، جیاواز بوون.

لـە عیبادەتەکانـدا: لـەبارەی ڕۆژی جـەژن، نوێـژکردن لـە زەویـی زەوتکـراودا، نوێژکردن لە کاتە پێناخۆش (مەکروه)ـەکان و هـەروەها لـە شـوێنە پێناخۆشـەکاندا، جیاواز بوون.

لە خوارەوە درێژەی ئەم قەڵەمانە دەخەینە ڕوو:

---

[1] لە پێناسەی (بيع العينة)دا وتراوە: ئەوەیە کاڵایەك بە نرخی دواخراو بفرۆشێ، پاشان بەکاش بە کەمتر لەو نرخە بیکڕێتەوە. وەرگێڕ.

## یەکەم - جیاوازی لە ئەحکامی هاوسەرگیریدا:

### ١- ژن بەژن (زەواجی شیغار):

شیغار لە زاراوەی شەرعیدا: هاوسەرگیرییەکە لە دامەزراندنیدا دەوترێ: (کچەکەم یان خوشکەکەمت لێ مارە دەکەم بەو مەرجەی کچەکەت یا خوشکەکەتم لێ مارە بکەیت).

سەرچاوەکەی ئەوەیە لە مالیك بن نافیع، ئەویش لە ئیبن عومەرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەهی لە شیغار کردوە، شیغاریش ئەوەیە پیاو کچەکەی[1] بداتە کەسێك بەرانبەر بەوەی ئەویش کچەکەی بداتێ و مارەییان لەنێواندا نیە[2].

وادیارە ئەم راڤەکردنە بۆ شیغار لە قسەی پێغەمبەر نیە، بەڵکو ئەوەی زانراوە نەهیکردنێتی لە شیغار و گوتویەتی (لَا شِغَارَ فِي الإسلام)، لەبەرئەوە لە لەبەرچاوگرتنی قەیدی (لیس بینهما صداق) (واتە: مارەییان لەنێواندا نیە)دا ناکۆکی دروست بووە.

شەرعزانی موسڵمان کۆکن لەسەر ئەوەی زەواجی شیغار نەهی لێکراوە و حەرامە، بۆیە کردنی دروست نیە، بەڵام لەبارەی ئەوە ناکۆکن کە ئاخۆ ئەگەر روویدا ئایا هاوسەرگیریەکە دروستە. هۆی ناکۆکیشیان جیاوازییە لەوەی ئاخۆ نەهی بەرەهایی فەساد دەخوازێ یان نایخوازێ مەگەر لەبەر خودی خۆی، یان لەبەر وەسفێکی وابەستەی نەبێ، یان وردەکاری تێدایە، بەم شێوەیە:

أ- ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی دەڵێن: ئەگەر پیاوێك کچەکەی دا بە پیاوێك بەو مەرجەی ئەو پیاوەیش کچەکەی یان خوشکەکەی بداتێ، تا یەکێك لە دوو

---

[1] لەفزی کچ (البنت) مانای پێچەوانەی نیە، هەروەها خوشکیش لەوانەی پیاوە عەقدکارەکە مافی ویلایەتی بەسەریانەوە هەیە.

[2] بڕوانە: الموطأ لإمام مالك مع المنتقى ٣٠٩/٣، فتح الباري ٣٣٣/١٢، عمدة القاري شرح صحيح البخاري ١٠٨/٢٠، ونيل الأوطار ١٦٠/٦، عين المعبود على سنن أبي داود.

عەقدەکە ببێتە باتیی ئەویتر، ئەوا هەردوو عەقدەکە جائیزن، هەریەك لە دوو بوکەکەیش مارەیی هاوشانی خۆی هەیە. ئەوەیش بینا لەسەر ئەسڵەکەیان کە نەهیکردنەکە لەبەر خودی عەقدەکە نیە بەڵکو لەبەر وەسفەکەیەتی، واتە بەئەسڵەکەی دروست (صحیح)ە و فەسادی مارەییەکە فەسادی عەقدەکە ناسەپێنێ. لەم روانگەوە شیغار بەلایانەوە دروستە جا مارەییەکەی تێدا باس کرابێ یان نا. ئەم ئاراستەیە قسەی زەهری و مەکحول و (ثوري) و (لیث) و ئیسحاق و (أبي ثور)ـە، هەروەها ریوایەتێك لە ئەحمەدەوە وەك شەوکانی دەڵێ.[1]

ب- زاهیری و حەنبەلیەکان دەڵێن: زەواجی شیغار بەڕەهایی فاسیدە، جا چ مارەیی تێدا باس کرابێ یان نا، ئەویش بینا لەسەر ئەو ئەسڵەیان کە دەڵێ نەهیکردن بەڕەهایی فەساد دەخوازێ، چ لەبەر خودی خۆی بێ یان لەبەر وەسفە وابەستەکەی یان لەبەر دەرەکیەکی نالازم.

ئیبن حەزم دەڵێ[2]: مارەکردنی شیغار حەلاڵ نیە کە بریتییە لەوەی ئەمە کچەکەی خۆی بداتە ئەوە و ئەویش کچەکەی خۆی بداتە ئەم، جا چ باسی مارەیی هەریەکەیان یان یەکێکیان کرابێ یان باسی مارەیی هیچیان نەکرابێ. لە هەموو بارەکاندا بەهەموو شێوەیەك هەڵدەوەشێنرێتەوە، نە میرات و نە مارەیی و نە عیددە و نە هیچ حوکمێکی زەواجی تێدا نیە، جا ئەگەر چوونەلا (دخول) رووی دا لەبارێکدا بە فەسادەکە دەزانرا حەد واجب دەبێت و نەسەب جێگیر نابێ، لە باری نەزانیشدا منداڵەکەی دەدرێتە پاڵ و حەدی لەسەر نیە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی لە شیغار و لە هەر مەرجێك کردوە کە لە کتێبی

---

[1] نيل الأوطار للشوكاني ٦/١٦٠.
[2] المحلّى لابن حزم الظاهري ٩/٥١٣- ٥١٥.

خوادا نەبێ. شیغاریش باسی مارەیی تێدا بکرێ یان نەکرێ مەرجێکیان تێدا کردۆتە مەرج کە لە کتێبی خوادا نیە، لە هەموو بارەکاندا بەتاڵە.

ئیبن قودامە دەڵێ[1]: لە ئەحمەدەوە ریوایەتەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە مارەکردنی ژن بەژن فاسیدە، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەلایەك نەهی لە ژن بەژن کردوە، لەلایەکیترەوە بەستویەتیەوە بە مەرجێکی فاسیدەوە، ئەگەر ئەم دوو پێشەکییە جێگیر بوون، هیچ جیاوازی نیە لەنێوان ئەوەی بڵێ: مارەیی هەریەکێکیان داوێن (بُضْعُ)ی ئەویتریانە، یان ئەوە نەڵێ.

ج- مەزەبی مالیکی: چەند قسەیەکیان لەم مەسەلەیەدا هەیە[2]، بەلاّم را بەناوبانگەکەی مەزەبی مالیك ئەوەیە شیغار فاسیدە جا چ مارەیی باس بکرێ یان نا. لەوەیشدا لەگەڵ زاهیری و حەنبەلی بەیەك دەگەن، بەلاّم لەوەدا لەگەڵیان جیاوازن کە هەڵوەشاندنەوە بە تەلاّق دەبێ ئەویش بینا لەسەر ئەسڵەکەیان کە دەڵێ هەموو هاوسەرگیریەکی فاسیدی جێناکۆك (مختلف فیە) پێویستە بە تەلاّق کۆتایی بێ بەپێچەوانەی فاسیدی جێکۆك (متفق علیە) و لەوەدا ژن و ژنخوازی و نەسەب و میراتی پێ جێگیر دەبێ -ئەگەر بەر لە هەڵوەشاندنەوەی یەکێکیان مرد- بەو ئیعتیبارەی لەم حوکمانەدا حوکمی فاسیدی جێناکۆك

[1] المغني لابن قدامة ٦٤١/٦.

[2] لە: المنتقى شرح الموطأ (٣٠٩/٣)دا هاتووە: ئەگەر وتمان هەڵدەوەشێنرێتەوە ئەگەر رووی دا، لە (المدونە)دا لە ئیبن قاسمەوە هاتووە کە پێش و پاش جووتبوون هەڵدەوەشێنرێتەوە با ژنەکە منداڵیشی بێ.. ئەمە ئەگەر لە هەردوولاوە باسی مارەیی نەکرا، بەلاّم ئەگەر باسی مارەیی کرا، وەك ئەوەی بڵێ: کچەکەمت بە سەد دینار لێ مارە دەکەم بەو مەرجەی کچەکەتم بە سەد دینار لێ مارە بکەیت، بەناوبانگ لە مەزەبدا ئەوەیە نابێ. لە (المدونە) دا لە گێڕانەوەی عەبدوڕەحمان ئەبوحازم هاتووە ئەوە ئاساییە و هیچی تێدا نیە. شێخ ئەبوعومەر دەڵێ: قسەی مالیك لەبارەی شیغار جیاواز بووە، لەبەر جیاوازیی خەڵك لە مانای شیغاردا.

حوکمی هاوسەرگیریی دروستە.[1]

هەروەها گوتویانە هەر عەقدێکی فاسیدی جێناکۆك دروست دەبێ ئەگەر قازیەك لەو مەزەبەی بەراستی دادەنێ حوکمی بۆ بدات. لە دیدی ئەواندا هاوسەرگیریی شیغار بە راست دادەنرێ ئەگەر قازیەکی حەنەفی حوکمی پێ بدات.

د- مەزەبی شافیعی: شافیعی و هاوەڵانی گوتویانە هاوسەرگیریی شیغار فاسیدە و هەڵدەوەشێنرێتەوە ئەگەر مارەیی تێدا دیاری نەکرا، بەڵام ئەگەر مارەیی بۆ هەردووکیان یان یەکێکیان دیاری کرا، هەردوو نیکاحەکە جێگیر دەبن و ئەو مارەییەی باس کراوە بەتاڵ دەبێتەوە و هەریەکەیان مارەیی هاوشانی خۆی دەکەوێ ئەگەر پیاوەکە مرد یان لەگەڵی جووت بوو، نیوەی مارەیی هاوشانیش ئەگەر بەر لە چوونەلا تەڵاقی دا.[2]

ئەمەیش لەو روانگەوە کە ئەو نەهیکردنەی فەساد دەخوازێ حەسر کراوە لەسەر حاڵەتی کردنی داوێنی هەریەکەیان بە مارەیی ئەویتریان.

هـ- جەعفەری[3] و زەیدی[4] دەڵێن هاوسەرگیریی شیغار بەتاڵە ئەویش ئەوەیە پیاو بڵێ (کچەکەت یان خوشکەکەتم لێ مارە بکە منیش کچەکەم یان خوشکەکەمت

---

[1] لە: الشرح الصغير مع الصاوي (٣٦٦/١)دا هاتووە: "هەڵوەشاندنەوە (الفسخ) پێش و پاش چوونەلا تەلاقێکە، ئەگەر عەقدەکەی دووبارە کردەوە بە دوو تەلاق لەگەڵی دەبێ ئەگەر ئەهلی عیلم سەبارەت بە دروستی و فەسادی رایان جیاواز بوو با لە دەرەوەی مەزەبیش بێ و با لە مەزەبێکیشدا بێ کە پوکابێتەوە و با کۆدەنگیش هەبێ لەسەر نادروستیی کردنی هەر لە سەرەتاوە وەك شیغار، چونکە کەس نەیوتوە جائیزە، بەڵکو پاش رووداني باس لە دروستیی کراوە، بەهەمیشەیی بە تەلاق هەڵدەوەشێتەوە، ئەویش لەبەر بوونی جیاوازی تێیدا".

[2] لە: المهذب (٤٦/٢)دا هاتووە: ئەگەر وتی کچەکەم لێ مارە کردیت بە سەد بەو مەرجەی کچەکەتم لێ مارە بکەیت بە سەد، هەردوو نیکاحەکە دروستن و مارەیی هاوشان واجب دەبێ، لەبەرئەوەی فساد لە مارەییەکەدایە، ئەویش ئەوەیە کچەکەی بەمەرجی سەد بەشوو بدات.

[3] المختصر النافع ص ٢٠٦.

[4] الدراري المضيئة للشوكاني ٥٧/٢.

لێ مارە دەکەم). وردەکاریی ئەمەم لەو دوو مەزەبەدا نەدیوە کە ئاخۆ لەئەنجامدا لەگەڵ شافیعی رێك دەکەون، یان لەگەڵ زاهیری و حەنبەلیەکان؟

زاڵکردن:

ئەو رایەی من بە پەسەندی دەزانم ئەو رایەی مەزەبی شافیعییە لە وردکردنەوە و جیاکردنەوە لەنێوان هەردوو حاڵەتی باسکردن و باسنەکردنی مارەییدا، لەبەرئەوەی هۆی نەهیکردنەکە رەچاوکردنی پێگەی ئافرەت و حسابنەکردنیەتی وەك کاڵایەك کە کاڵاگۆڕی (مقايضة) پێوە دەکرێ، چونکە لە حاڵەتی بوونی مارەییدا هەریەکێکیان بە مارەیی ئەویتریان دانانرێ و ئەو مارەییەی باس کراوە بە فاسید دادەنرێ لەبەرئەوەی مەرجێکی فاسیدی لەگەڵە.

٢- هاوسەرگیریی خوازبێنی بەسەر خوازبێنیی یەکتردا:

شەرعزانی شەریعەت کۆکن لەسەر حەرامکردنی خوازبێنی بەسەر خوازبێنیی یەکتردا پاش وەڵامدانەوە و جێگیربوون و خوازبێنیی یەکەم، چونکە ئەو کارە زیان و ئازار بە خوازبێنیکاری یەکەم و خێزانەکەی دەگەیەنێ، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەهی لێکردوە و ئەفەرموێ: ((الْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ فَلَا يَحِلُّ لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يَبْتَاعَ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ وَلَا يَخْطُبَ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَذَرَ))[1].

بەڵام رایان جیاوازە لەوەی ئاخۆ ئەم نەهیکردنە بەڵگەیە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی خوازبێنیکاری دووەم لەو روانگەوە نەهیکردن بەرەها فەساد دەخوازێ؟ یان کارەکە حەرامە و لەبەر نەهیکردنەکە گوناهبار دەبێ بەڵام هاوسەرگیریەکە دروستە لەبەرئەوەی نەهیکردنەکە لەبەر خودی خۆی نیە بەڵکو لەبەر وەسفێکی وابەستەیەتی؟

---

[1] وفي رواية ابي هريرة: ((لَا يَخْطُبْ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَنْكِحَ أَوْ يَتْرُكَ)). وفي رواية ابن عمر ((وَلَا يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَتْرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ أَوْ يَأْذَنَ لَهُ الْخَاطِبُ)).. نيل الأوطار ١٢١/٦.

أ- جمهوری شەرعزان لەگەڵ ئەوەن هاوسەرگیریەکە دروستە و هەڵناوەشێتەوە، لەبەرئــەوەی نەهیەکــە لــە شــتێکی دەرەکــی (خــارج)ی نالازمــە، ئــەویش ئەزیەتدانی دڵی خوازبێنیکاری یەکەمە، بـەلام خوازبێنیکـاری دووەم یـاخی و گوناهبارە و شایستەی تەمێکردن و تەعزیرە.

ب- داودی زاهـیری و ئەوانـەی هـاوڕاین پێیـان وایـە دروسـت نیـە و پێویسـتە هەڵبوەشێنرتەوە، لەبەرئـەوەی نـەهیکردن بـەرەهایی فەسـاد دەگەیـەنێ، چ لەبـەر خـودی خـۆی بـێ یـان لەبـەر وەسـفێکی لازم (وابەسـتە) یـان لەبـەر دەرەکیەك.[1]

ج- ئیمامی مالیك و هاوەڵانی سێ رایان هەیە:

رایەکیان لەگەڵ زاهیری هاوڕایە لەو روانگـەوە کـە نـەهیکردن لـە مەسـەلەکانی هاوسەرگیریدا بەرەهایی فەساد دەخوازێ، با نەهیکردنەکە لەبەر دەرەکیـەکی نالازمیش بێ.

رایەك لەگـەڵ جمهـور هاوڕایـە و بـەهیچ شـێوەیەك هەڵناوەشـێنێتەوە، بـەڵکو بکەرەکەی تەمێ دەکا[2]، لەبەرئـەوەی نـەهیکردن فەسـاد نـاخوازێ تـا لەبـەر خودی خۆی یان وەسفێکی وابەستە یان لەبەر مافێکی خوا نەبێ.

سێیەم لەگەڵ وردکردنەوە (التفصیل)دایە، بەشـێوەیەك پـێش چـوونەلای ژن (دخـول) هاوســەرگیرییەکە هەڵدەوەشــێنێتەوە، بــەلام پــاش چــوونەلا هەڵیناوەشێنێتەوە. مەزەبی مالیکی بۆ بە فاسید دانان و هەڵوەشـاندنەوەی، ئەوەی کردۆتە مەرج رەزامەندی هەبێ، هەروەها خوازبێنیکاری یەکەم فاسـیق

[1] بدایـة المجتهد ٣/٢. سبل السلام ٣/٣٠. داود لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی مارەکردنەکەدایە و چاکیشی کردوە، ئەوەیش ریوایەتێکە لە مالیکەوە.

[2] الحطاب ٣/٤١٢ تێیدا هاتووە: ئیبن ئەلقاسم دەڵێ: هەڵناوەشێنرێتەوە بەلام بکەرەکەی تەمێ دەکرێ.

نەبێ[1] و حاکمێك حوکم بە دروستی نەدا، بەلای زۆربەشیانەوە مەرجە لەگەڵی جووت نەبووبێ، ئەگینا هەڵناوەشێنرێتەوە.[2]

زاڵکردن:

بە دیدی من رای زاڵ ئەوەیە رای جمهوری لەسەر گیرساوەتەوە لە دروستیی هاوسەرگیریی خوازبێنیکردن بەسەر خوازبێنیی یەکتردا مادام روکن و مەرجە شەرعیەکانی تێدا هاتبنەجێ، چونکە هیچ پەیوەندیەکی ئیلزامی لەنێوان خوازبێنی و گرێبەندی هاوسەرگیریدا نیە و دەکرێ هەریەکەیان بەبێ ئەویتریان بەدیبێ. پاشان خوازبێنی تەنها گفتێکە و پشت تێکردنی بەبێ پاساو بە کارێکی پێچەوانەی ئەخلاق دادەنرێ نەك سەرچاوەیەك بۆ پابەندبوون بە تەواوکردنی هاوسەرگیری.

٣- هاوسەرگیریی ئیحرامبەستوو:

زانایان لەبارەی راست و دروستیی نیکاحی ئیحرامبەستوو جیاوازن و سەرچاوەی جیاوازیەکەیش جیاوازییانە لە خواستی ئەو نەهیەی لەو فەرموودەیەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە کە دەڵێ: ((لَـا يَـنْكِحُ الْمُحْـرِمُ وَلَـا يُـنْكَحُ))[3]. (واتە ئیحرامبەستوو نە مارە دەکات و نە مارە دەکرێ).

---

[1] الحطاب ٣/٤١٠، تێیدا هاتووە: خوازبێنیی ئافرەتی دڵ لەلای خوازبێنیکاری پێشوو (کە پێی دەوترێ: الراكنه)ی بۆ غەیری فاسق حەرام کردوە، رکونی کردوە بە مەرج لەبەرئەوەی پێغەمبەر رێگەی بە خوازبێنیی فاتیمە کچی قەیسی دا بۆ ئوسامە کە پێشتر معاویەی کوری ئەبوسوفیان و و ئەبوجەهم خوازبێنییان کردبوو.

[2] لە: الشرح الصغير والصاوي (٣٥١/١)دا هاتووە: خوازبێنیی راکینەی بۆ غەیری فاسیق حەرام کردوە و عەقدی دووەم کەس هەڵدەوەشێنرێتەوە بەر لە چوونەلا بەتەلاقێکی یەکجاری (بائن) وەك واجب، لەبەرئەوەی نەهیکردنەکە لەبەر مافی ئادەمیزادێکە، ئەمەیش یەکێك لە سێ قسەکەیە و پوختەکەیان ئەوەیە: هەڵوەشاندنەوە بەرەهایی جا لەگەڵ ژنەکە جووت بووبێ یان نا، هەڵنەوەشاندنەوە بەرەهایی، هەڵوەشاندنەوە ئەگەر جووتبوون رووی نەدابوو و زۆرینە لەگەڵ ئەوەن. ئەمە ئەگەر حاکمێك بریاری دروستیی نیکاحی دووەمی نەدابوو ئەگینا هەڵناوەشێنرێتەوە وەك حەنەفی، کە پێی وایە نەهیکردن لە حەدیسەکەدا بۆ کەراهەتە، هەروەها لەبەر وەسفێکی نالازمە کە فەساد ناخوازێ".

[3] عمدة القاري شرح صحيح البخاري ١٠/١٩٥.

أ- جمهوری شەرعزانی موسڵمان لەگەڵ ئەوەن نادروستە، لەوانە زانایانی مالیکی[1] و شافیعی[2] و جەعفەری، شەرعزانی جەعفەری دەڵێن لێك جیا دەکرێنەوە و بۆ هەتاهەتایە ژنەکەی لێ حەرام دەکرێ.[3]

ب- زانایانی حەنەفی[4] و ئەوانەی هاوڕایانن[5] دەڵێنك هاوسەرگیریی ئیحرامبەستووی نێر و مێ دروستە، لەبەرئەوەی نەهیکردنەکە رووی لە نیکاحەکە نەکردوە بەمانای گرێبەندی هاوسەرگیری، بەڵکو مەبەست پێی جووتبوونە، لەبەرئەوەی لەفزی نیکاح لە زمانی عەرەبیدا بەمانای گرێبەندی هاوسەرگیری و هەروەها بەمانای سێکسکردنیش دێ، ئەوەی لێرەدا نەهی لێکراوە دووەمە نەك یەکەم، بەبەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە حاڵەتی ئیحرامدا بووە کە مەیمونەی خواستوە.

---

[1] لە: الشرح الكبير مع الدسوقي (٥٤/٣)دا هاتووە: "وفسد منهى عنه، ولته بەتاڵ بوویەوە و دانەمەزرا، چ عیبادەت بێ وەك رۆژووی رۆژی جەژن یان عەقدی نیکاحی نەخۆش یان ئیحرامبەستوو".

[2] لە: المنهاج ومغني المحتاج (١٥٦/٣)دا هاتووە: ئیحرامبەستنی یەکێك لە دوو عەقدکارەکە لە وەلی یا حاکمێکیش بێ یان مێردێك یان وەکیلی یەکێکیان یان ژنەکە بە نوسکێك با فاسیدیش بێ، رێ لە دروستی دەگرێ لەبەر حەدیسی ((المحرم لا ينكح ولا يُنكح))، ئیحرام ویلایەت بۆ دوورترین ناگوێزێتەوە، لەبەرئەوەی ویلایەت زەوت ناکا لەبەر مانەوەی هۆش و بیرکرینەوە".

[3] لە: الخلاف-ی توسی (١٧٠/٢)دا هاتووە: لەبارەی هاوسەرگیری بەنەزانی لە حاڵەتی ئیحرامی ئافرەتەکەدا رایان جیاوازە، ئەگەر چووە لای جیا دەکرێ‌ەوە و هەرگیز بۆی حەڵاڵ نابێتەوە. ئەگەر بەزانینیش کردی و نەچووە لای، دیسان جیادەکرێنەوە و هەرگیز حەڵاڵ نابێتەوە بۆی".

[4] لە: الهداية وبداية المبتدي مع فتح القدير (٢٣٢/٣- ٢٣٣) دا هاتووە: "ئیحرامبەستووی نێر و مێ بۆیان هەیە لە حاڵەتی ئیحرامدا هاوسەرگیری بکەن. شافیعی دەڵێ: بۆی نیە لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ((لا ينكح المحرم ولا يُنكح)). ئێمە هەمانە کە پێغەمبەر لە ئیحرامدا مەیمونەی مارە کردوە. ئەوەی ئەو ریوایەتی کردوە بە جووتبوون وەرگێراوە".

[5] ئاراستەی حەنەفیەت لەم مەسەلەیەدا بریتییە لە گوتەی: ابراهيم النخعي و الثوري وعطاء بن أبي رباح والحكم بن عتيبة وحماد بن ابن سليمان وعكرمة ومسروق.
بڕوانە: عمدة القاري شرح صحيح البخاري. ١٩٥/١٠.

زاڵکردن:

رای زاڵ قسەی جمهورە، لەبەرئەوەی ئیحرامبەستوو لە خواپەرستیەکی سافدایە، کە ئەوە لەگەڵ خۆخەریککردن بە بابەتە دەروونی و سێکسیەکانەوە ناگونجێ لەکاتێکدا ئەو لەو عیبادەتەدایە، هەروەها ئەوەی ئیبن عەباس ریوایەتی کردوە کە پێغەمبەری خوا لە ئیحرامدا بووە کاتێ مەیمونەی مارە کردوە، لەگەڵ ئەوە لێك دەدا کە لە مەیمونەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دوای لابردنی ئیحرام مارەی کردوە.

٤- هاوسەرگیریی حەلاڵکەر (زواج المحلل):

پاش تەڵاقی سێیەم پەیوەندیی ژن و مێردایەتی دەپچڕێ بەشێوەیەك ناکرێ بەعەقدێکی نوێ دەستی پێبکرێتەوە تا ژنەکە بەشێوەیەکی سروشتی مێردێکیتر نەکاتەوە و جووتبوونی شەرعی تێدا بکرێ، پاشان جیا ببنەوە و عیددەی تەواو ببێ، چونکە خوا ئەفەرموێ: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا﴾ واتە بۆ جاری سێیەم ﴿فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾[1]..

بەڵام حیلەیەك هەیە هەندێ کەس دایانهێناوە و ریشەکەی بۆ سەردەمی نەفامی دەگەڕێتەوە، ئەویش ئەنجامدانی گرێبەندێکی هاوسەرگیریی کاتییە لەنێوان تەڵاقدراوەکە و پیاوێکیتر بەو مەرجەی پاش چوونەلا تەڵاقی بدات تا حەڵاڵی بکا بۆ مێردی یەکەمی، ئەوەیش پێی دەوترێ هاوسەرگیریی حەڵاڵکەر[2]. ئەوەیش هاوسەرگیرییەکی نەهیلێکراوە لە چەند روویەکەوە: هاوسەرگیریەکی کاتییە و هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ زەواجی موتعەی نەهیلێکراو[3]، هاوسەرگیریەکە بەستراوە بە مەرجی تەڵاقدانەوە پاش چوونەلا (دخول) ئەوەیش فاسیدە، لەبەرئەوەی لەگەڵ

---

[1] البقرة: ٢٣٠

[2] لە کوردەواریدا پێی دەوترێ: مارە بەجاش–وەرگێڕ.

[3] انظر عمدة القاري شرح صحیح البخاري ١١١/٢٠ و پاشتر.

مانای هاوسەرگیریدا لێك دەدا[1]،هاوسەرگیریەکە لەسەر زمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەفرەتی لێکراوە و ئەفەرموێ: ((لَعَنَ اللّٰه الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ))[2] (واتە خوا نەفرەتی لە حەلاڵکەر و بۆ حەلاڵکراو کردوە) ناوی ناوە: ساورێنی خوازراو (التیس المستعار).[3]

بینا لەسەر ئەوە، شەرعزانی موسڵمان لەبارەی دروستی یاخود فەسادی ئەم هاوسەرگیریەوە ناکۆکن، سەرچاوەی ناکۆکیەکەیشیان جیاوازیانە لە مانای نەهیکردنەکەدا.

أ- ئەبوحەنیفە و محەمەدی هاوەڵی دەڵێن: عەقدەکە دروستە جا چ مەرجی تەلاقدانەکە لە عەقدی هاوسەرگیریەکەدا باس کرابێ یان پێش ئەوە، یان شاراوە بێ و بەهیچ شێوەیەك باس نەکرابێ، ئەویش بینا لەسەر ئەسڵەکەیان: (إن الشرط الباطل غير مبطل) واتە: مەرجی بەتاڵ، بەتاڵکەرەوە نیە.

سەبارەت بە حەلاڵکردنی بۆ مێردی یەکەمی، لە ئەبوحەنیفەوە دوو ریوایەت دەگێڕنەوە، لە یەکێکیاندا پێی وایە ئەوە سەرباری دروستیی هاوسەرگیریی حەلاڵکەرەکە، بە هاوسەرگیریەکی ئاسایی نەبێ ناکرێ[4]. ئەم گێڕانەوەیە لەگەڵ قسەی محەمەدی هاوەڵیدا کۆکە کە ئەویش پێی وایە بەم رێگەیە بۆ یەکەمیان حەلاڵ نابێ نەك لەبەر بەتاڵیی هاوسەرگیریی حەلاڵکەرەکە بەڵکو لەبەرئەوەی هاوسەرگیریی گرێبەندی تەمەنە، بۆیە بەوە بۆ مێردی یەکەمی حەلاڵ دەبێتەوە کە مێردی دووەمی

---

[1] عمدة القاري، سەرچاوەی پێشوو ١٤٢/٢٠ و پاشتر.

[2] نيل الأوطار، شرح منتقى الأخبار، من أحاديث سيد الأخيار، للشوكاني ١٥٧/٦. وفيه: "عن ابن مسعود قال: ((لعن رسول الله(ﷺ) المحلل والمحلل له)) رواه أحمد والنسائي والترمذي وصححه، والخمسة، وصححه ابن قطان وابن دقيق العيد على شرط البخاري.

[3] عن عقبة بن عامر قال: قال رسول الله(ﷺ): ((ألا أخبركم بالتيس المستعار؟)) قالوا: بلى يا رسول الله، قال: ((هو المحلل والمحلل له)). بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو.

[4] الميزان الكبرى للشعراني سيدي عبدالوهاب ٩٩/٢. رحمة الأمة في اختلاف الأئمة. ص ٢٠٩.

بمرێ، لەبەرئەوەی تەڵاق بەرێگەیەکی ئاساییە نەك بەرێگەی رێکەوتن (التواطئ)، چونکە مێردی یەکەم بە دانانی مەرجی حەڵاڵکردن، پەلە لە حەڵاڵکردندا دەکا، هەربۆیە بە بێبەشکردنی لە بەدیهێنانی مرازەکەی پاداشت دەدرێتەوە رێك وەك بێبەشکردنی بکوژی میراتگر لە میرات، کە بە کوشتنی میراتدەرەکەی پەلە لە بەدەستهێنانی میراتەکە دەکا.[1]

ب- ئیمام مالیك و شەرعزانەکانی[2]، هەروەها ئیمام ئەحمەد و هاوەڵانی[3] و زەیدی[4] ئاراستەیەکی پێچەوانەی رای حەنەفیەتیان هەیە و بەرەهایی بە فاسیدیان داناوە.

ج- شافیعی و هاوەڵانی[5]، ئەبو یوسف لە مەزهەبی حەنەفی[6]، هەروەها جەعفەری[7] و زاهیری[8] بەم شێوەیەی خوارەوە چوونەتە ناو وردەکاری:

باسکردنی مەرجەکە لەکاتی عەقدکردنەکەدا فاسید دەبێ، لەبەرئەوەی مەرجێکی خراپ و نەهیلێکراو و خراپکەرە. بەڵام ئەگەر مەرج باس نەکرا ئەوا عەقدەکە دروستە و ئامانجی حەڵاڵکردن دێنێتە دی با مەرجەکەیش شاراوە و مەبەست بێ لای هەردوو عەقدکار. سەرچاوەی ناکۆکیەکەیشیان جیاوازییە لەو نەهییەی لەو فەرمودەیەی

---

[1] شرح فتح القدير وهامشه ٣/١٧٧.

[2] شرح موطأ الإمام مالك للقاضي ابن وليد سليمان الباجي ٣/٢٩٨.
بداية المجتهد لأبن رشد ٢/٤٨.
شرح الخرشي ٣/٢١٦.
الشرح الصغير مع حاشية الصاوي ١/٣٧٥.

[3] منتهى الإرادات للإمام تقي الدين أحمد الشهير بابن النجار. ٢/١٨٠.

[4] التاج المذهب للصنعاني ٢/٢٨، ٢٩.

[5] الأم للشافعي ٥/٨٠. وعند الشافعية لا يضر إلا بالشرط الذي يكون في صلب العقد، فلو اتفقوا عليه قبل العقد لا يضر.

[6] فتح القدير، سەرچاوەی پێشوو.

[7] شرائع الإسلام ٢/٣٣.

[8] المحلى لأبن حزم الظاهري ١٠/١٨٠. معجم فقه ابن حزم ٢/٧٢٥.

پێغەمبەر(ﷺ) وەردەگیرێ کە دەڵێ: ((لَعَنَ اللّه الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ))، ئەوەی وا لە لەعنەتەکە گەیشتوە کە مەبەست گوناهباربوونە گوتوێتی هاوسەرگیریەکە دروستە، ئەوەیش گوتویەتی لەعنەتکردن مانای نەهیکردنە و نەهیکردنیش ، انای فەسادی نەهیلێکراو دەگەیەنێ، گوتوێتی فاسیدە.[1]

لەلایەکیترەوە، جیاوازییان لەوەدایە کە ئایا ئەم هاوسەرگیرییە کاتییە یان بەستراوە بەمەرجێکەوە کە لەگەڵ خواستەکەی دژ دەوەستێ چ مەرجەکە باس کرابێ یان شارابێتەوە لە روانگەی زاڵکردنی ئیرادەی پەنهان بەسەر ئیرادەی دیاردا یان نا، بەو شێوەیە دادەنرێ مەگەر مەرجەکە بەڕاشکاوی باس کرابێ لەڕووی کارکردن بە زاڵکردنی ئیرادەی دیار بەسەر ئیرادەی پەنهاندا؟.

**زاڵکردن:**

ئەو را زاڵەی کە پێویستە کاری پێ بکرێ ئەو رایەیە کە پێی وایە هاوسەرگیریی حەلاڵکردن فاسیدە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- حەلاڵکردن نەریتێکی سەردەمی نەفامییە و ئیسلام لەسەر زمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرکۆنەی کردوە کاتێ ئەفەرموێ: ((لَعَنَ اللّه الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ))، هەروەها ئەفەرموێ: ((ألا أخبركم بالتيس المستعار؟)) قالوا: بلى يا رسول الله، قال: ((هو المحلل والمحلل له)).

٢- حەلاڵکردن پێچەوانەی زاهیری قورئانی پیرۆزە لە زۆر رووەوە لەوانە بڕیاردان بۆ هاوسەرگیری بەر لە تەواوبوونی عیددە بە رێکەوتن، خوا ئەفەرموێ: ﴿... وَلاَ تَعْزِمُواْ عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىَ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ...﴾[2].

٣- گرێبەندێکی کاتییە هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ زەواجی موتعەدا کە جمهوری شەرعزانی موسڵمان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی بەتاڵە.

---

[1] بداية الجهد لأبن رشد ٤٨/٢.

[2] البقرة: ٢٣٥

٤- گرێبەندێکە بەستراوە بە مەرجی تەڵاقدانەوە پاش چوونەلا، ئەوەیش مەرجێکی خراپ و خراپکەرە، لەبەرئەوەی لەگەڵ خواستت (موقتەزا)ی گرێبەندەکەدا ناکۆکە.

٥- بەکارهێنانی هاوسەرگیرییە لە غەیری ئامانجە رەواکەی خۆی و حەقیقەتە شەرعیەکەیدا، ئەوەیش گەمەکردنە بە ئایەتەکانی خوا، خوایش دەفەرموێ: ﴿... وَلاَ تَتَّخِذُوَاْ آيَاتِ اللّهِ هُزُواً ...﴾[1].

٦- ئەوەی لە ئیبن عەباسەوە ریوایەت کراوە کە لەبارەی حەڵاڵکەرەوە پرسیار لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کراوە، ئەویش گوتویەتی: ((لا، إلاّ نكاح رغبة، لا نكاح دلسة ولا استهزاء بكتاب الله، ثم تذوق العسيلة)).[2]

## دووەم- جیاوازی لە ئەحکامی تەڵاق

**١- لەبارەی تەڵاقکەوتن ئەگەر هاتوو ژنەکەی لەکاتی بێنوێژی، یان زەیسانی یان لە پاکبوونەوەیەکدا کە تێیدا لەگەڵیدا سەرجێیی کردبێ، ژنەکەی تەڵاق دا، رایان جیاوازە:**

سەرچاوەی ناکۆکیشیان جیاوازیانە لە خواستی ئەو نەهیەی لەو فەرمانەی خوا وەردەگیرێ بە تەڵاقدان لەکاتی عیددەدا کە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ...﴾[3]. لەبەرئەوەی یەکێك لە رێسا ئوسوڵییە باوە گشتیەکان ئەوەیە: (إن الأمر بالشيء نهي عن ضده) (واتە: فەرمانکردن بەشتێك

---

[1] البقرة: ٢٣١

[2] بڕوانە: اغاثة اللهفان لأبن قيم ٢٨٥/١.
زاد المعاد لأبن القيم ٥/٤-٦
فتاوى ابن تيمية ٦/٣٣.
بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە ئەم کتێبەمان: (مدى سلطان الإرادة في الطلاق في شريعة السماء وقانون الأرض خلال أربعة آلاف سنة) ٢٠٥/١ وما بعدها.

[3] الطلاق: ١

نەهیکردنە لە دژەکەی)، (لام)یش لە وشەی (لعدتهن)دا بەمانای (لـە) دێ[1] واتـە لـە هەر کاتێکدا بۆ عیدەکەیان گونجاوە. کاتی دیاریکراویش بۆ تەڵاقدان ئەوەیە ژنەکە لە پاکبوونەوەیەکدا بێ تێیدا پیاوەکەی سەرجێیی لەگەڵ نەکردبێ، بەدەر لـەوە نـەهی لێکراوە، ئەویش لەبەر وەسفە نالازمەکەی کە زیانگەیاندنە بە ژنەکە لە درێژکردنەوەی عیددەکەی و بەو منداڵەی کە لەوانەیە لەو جووتبوونـەیان لـەو پاکبوونەوەیـەی تێیـدا تەڵاقی داوە دروست ببێ، هـەروەها لـە ئەگـەری هەرەسهێنانی ژیـانی هاوسـەری لـە حاڵەتی ساردی و دوورکەوتنەوە لە جووتبوون لەگەڵ ژنەکـە بـەبێ پاسـاو. ئـەوەیش روونە زیان پێگەیاندن لە سەرجەم ئەم وێنانەدا وەسفێکی وابەستە نیە بـە تەڵاقـەوە، چـونکە هەریەکـەیان بـەبێ ئـەویتر بەدیـدێ. بینـا لەسـەر ئـەوە، ئـەوەی گوتـوێتی نەهیکردن بەرەهایی خراپە دەگەیەنێ چ لەبەر خودی خۆی بێ یـان لەبـەر بەشـێکی، یان وەسفە وابەستەکەی، یان وەسفە ناوابەستەکەی، پێی وایە تـەڵاق دەکـەوێ وەك مـەزەبی زاهـیری[2] و هەنـدێ لـە شـەرعزانی زەیـدی[3]. هـەروەها شـەرعزانی جەعفەریش[4] ئەم ئاراستەیەیان پەسەند کردوە، لەو رووەوە نەهیکردن ئاگەداریـەکی

---

[1] تفسیر القرطبي ١٥٢/١٨.

[2] ئیبن حەزمی زاهیرە لـە (المحلی ١٦١/١٠) دەڵـێ: سـەیر لـە بـوێریی ئـەوەی بانگەشـەی ئیجمـاع دەکا بەپێچەوانەی ئەمە لەکاتێکدا وشەیەك لە یەکێك لە هاوەڵانی نادۆزێتەوە هاورای بێ لەوەی کە دەڵێ تەڵاق لە حەیز و لـە پاکبوونەوەیـەکی جیمـاع تێدا کرلودا دەکـەوێ، جگـە لـە ریوایەتەکـەی ئـیبن عومـەر کـە ریواەیتێکی لەو باشتر لە ئیبن عومەرەوە بەرهەڵستی دەکا.. بەڵام زاهیری دەڵێن ئەوەی خوا لە کۆتـایی ئایەتەکەدا دەیڵێ ﴿... لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کاتەکە بۆ تەڵاقە لە خوار سێ و بۆ ژنێکی سەرجێی لەگەڵ کرلوە، جا ئەگـەر سێیەسـێ تـەڵاقی دا یـان تـەڵاقی سێیەمی دا تەڵاقەکە دەکەوێ.

[3] لە: البحر الزخار (١٥٣/٣)دا هاتووە: (ئەوە تەڵاقێکی حەرامە، بکەرەکەی گوناهبارە با بشکەوێ. صادق و ناصر و باقر و ئیبن علیة هشام بن الحکم دەڵێن: ناکەوێ...".

[4] شەرعزانی جەعفەری دەڵێن: "لە ژنی تەڵاقدرلوی سەرجێی لەگەڵ کرلودا پاکبوونەوە لە خوێنی بێنوێژی و زەیسانی مەرجە ئەگەر رێگر بوو کاتێ مێردەکەی ئامادە بووە لەگەڵی و لە پاکبوونەوەیەکدا تـەڵاقی بـدا ←

تێدایە بۆ بوونی خراپە لە نەهیلێکراودا.

بەڵام جمهوری شەرعزانی حەنبەلی سەرپێچی لەم ڕێسایە لایان داوە ئەگەرچی لە لایەنگرانین، ئەویش بینا لەسەر ئەو ئەسڵەیان کە دەڵێ نەهیکردن بۆ وەسفێکی ناوابەستە ئەگەر لەبەر مافی ئادەمیزادێك بوو مانای فەسادی نەهیلێکراو ناگەیەنێ، نەهیکردن لەو تەڵاقەیش لەبەر پاراستنی مافی مرۆڤە نەك مافی خوا، لەبەرئەوە رایان وایە تەڵاقدانی ژن لە کاتی بێنوێژی و زەیسانی و پاکبوونەوەیەکدا کە پیاوەکەی سەرجێی لەگەڵی نەکردبێ، دەکەوێ، بەڵام مێردەکە گوناهبارە، لەگەڵ ئەوەیشدا هەندێکیان، لەوانە ئیبنول قەیم و ئیبن عوقەیل لەگەڵ پابەندبوونن بە رەهایی ڕێسای (النهي يقتضي الفساد) و گوتویانە تەڵاق ناکەوێ[1]. هەروەها مەزەبی حەنەفی[2] و مالیکی[3] و شافیعی[4] و جمهوری زەیدی[5] دەڵێن تەڵاق دەکەوێ، ئەویش بینا

---

کە تێیدا لەگەڵی نەخەوتبێ". بڕوانە: ایضاح الفوائد ٣٠٣/٣. الروضة البهية ١٤٩/٢. شرائع الإسلام ٥٤/٢. مستدرك الوسائل ٦/٣.

[1] بڕوانە: زاد المعاد، سەرچاوەی پێشوو.

[2] لە: الفتح القدير ٤٨٠/٣ دا هاتووە: "ئەگەر پیاو ژنەکەی لە باری بێنوێژیدا تەڵاق دا تەڵاقەکە دەکەوێ لەبەرئەوەی نەهیلێکردنەکە لەبەر مانایەکە لە غەیری ئەودا و واباشە بگەڕێنرێتەوە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بە عومەری گوت: (فەرمان بە کوڕەکەت بکە با (ژنەکەی) بگێڕێتەوە، کە لە حاڵەتی حەیزدا تەڵاقی دابوو".

لە: الهداية مع فتح القدير ٤٨١/٣ دا هاتووە: "وا باشبوون قسەی هەندێ لە شێخوکانمانە، راستتر ئەوەیە واجبە لە رووی کارکردن بە حەقیقەتی بابەتەکە".

[3] لە: شرح الخرشي ٢٩/٤ دا هاتووە: "ئەگەر بەویستی خۆی لە حاڵەتی بێنوێژ و زەیسانیدا تەڵاقی دا حاکم فەرمانی پێدەکا بیگێڕێتەوە، ئەگەر رازی نەبوو هەڕەشەی حەپسکردنی لێدەکا، ئەگەر هەر نەیکرد هەڕەشەی لێدانی لێدەکا، ئەگەر نەیکرد لێی دەدرێ. ئەگەر هەر سوور بوو ناچار بە ریجعەی دەکا و بەزۆر بۆی دەگێڕێتەوە، بەوەی بڵێ: ژنەکەتم بۆ گێڕایەوە و بە گێڕانەوەی حاکم و میراتگرتن (التوارث)، جووتبوون جائیز دەبێ با بەبێ نیەتیش بێ لەلایەن مێردەوە، لەبەرئەوەی نیەتی حاکم لەجێی نیەتی ئەوە".

[4] بڕوانە: المهذب ٧٩/٢. نهاية المحتاج ٥/٦.

[5] التاج المذهب ١٢٧/٢.

لەسەر ڕێسای (النهي عن الشيء لوصفه غير اللازم لا يقتضي فساده) (واتە: نەهیکردن لە شتێك لەبەر وەسفە ناوابەستەکەی، فەسادی ئەو شتە ناخوازێ)، بەڵام مالیکیەکان دەڵێن: زۆر لە مێرد دەکرێ بیگێڕێتەوە، ئەگەر بەوە رازی نەبوو، با نەشیەوێ قازی لە جێی ئەو دەیگێڕێتەوە.

**زاڵکردن:**

وای دەبینم قسەی زاڵ کە پێویستە دەستی پێوە بگیرێت و سیفەتی ئیلزامی لە یاساکانی باری کەسایەتی لە دەوڵەتانی عەرەبی و ئیسلامی پێ بدرێ ئەوەیە مالیکی بۆی چووە، کە تەڵاقی حەیزدار دەکەوێ، بەڵام مێردەکە ناچار دەکرێ ژنەکەی بگێڕێتەوە، ئەگەر بەوە رازی نەبوو قازی دەیگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی دەستگرتن بە مەزەبی مالیکەوە کۆکردنەوە لەنێوان بەڵگەکان و نەهێشتنی تێکگیرانی نێوانیانی تێدایە.[1]

**٢- لەبارەی دروستیی خولعێك تەنگ پێهەڵچنین (عضل)ی لەگەڵ بێ رایان جیاوازە:**

شەرعزانی موسڵمان کۆکن لەسەرئەوەی ئەو پیاوەی ژنەکەی لە بەشێك لە مافەکانی بێبەش بکا، یان بەخراپی لەگەڵی بجوڵێتەوە تا ناچاری بکا تەڵاق وەربگرێ، لەبەرانبەر دەستهەڵگرتنی لە مارەیی پاشینە و نەفەقەی عیددە بۆ نموونە یان بەرانبەر هەر باتیەکیتر، بە گوناهبار دادەنرێ و شایستەی سزادانە لەبەردەم خوادا، لەبەرئەوەی بەو کارەی سەرپێچیی فەرمانی خوای گەورەی کردوە کە ئەفەرموێ: ﴿...وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ...﴾[2]. یان ئەفەرموێ ﴿...وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلاَّ

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم بابەتە بڕوانە کتێبی: (مدى سلطان الإرادة في الطلاق في شريعة السماء وقانون الأرض خلال أربعة آلاف سنة)ی دانەر، ج١، ل١١١٧ و پاشتر.

[2] البقرة: ٢٢٩

أن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾[1]. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَاراً فَلاَ تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْئاً أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُّبِيناً﴾[2].

بەڵام سەبارەت بە کەوتنی تەڵاقەکە ئەگەر هاتوو لە سایەی بارودۆخێکی لەم جۆرەدا رووی دا لەسەر باتیەك کە ژنەکە بەرانبەر مێردەکە پێیەوە پابەند بێ وەك دەستهەڵگرتن لە مافەکانی، یان پێدانی قەرەبوویەك لەبەرانبەر تەڵاقدانەکە، رای جیاوازیان هەیە.

سەرچاوەی ناکۆکیەکە جیاوازییە لە خواستی ئەو نەهیکردنەی لەو دەقە قورئانیانەدا هاتووە، کە ئاخۆ فەسادی باتی (عوض) و تەڵاقەکە پێکەوە دەگەیەنێ، یان تەنها فەسادی باتیەکە دەگەیەنێ، یان نەخێر فەسادی هیچکامیان ناگەیەنێ لەبەرئەوەی نە لەبەر زاتی شتەکە و نە لەبەر وەسفێکی وابەستەی نیە، بەڵکو لەبەر هۆیەکی دەرەکیی نالازمە، ئەویش زیانگەیاندن و ئازاردانی ژنەکەیە؟

أ- حەنەفی دەڵێن: رەفتارەکە مەکروهە و تەڵاقەکە دەکەوێ و لەرووی دیانەتەوە بۆی نیە هیچ لە ژنەکە وەربگرێ، ئەگەر شتی وای کرد لە قەزادا جائیزە[3]، ئەویش لەو رووەوە نەهیەکە لەبەر زاتەکە یان وەسفێکی وابەستە (لازم)ی نیە.

ب- مەزهەبی مالیکی[4] و شافیعی[5] دەڵێن: تەڵاقەکە دەکەوێ و مێردەکە شایستەی باتییەکە نابێ، بەڵام نەهیکردنەکە باتییەکە فاسید دەکا نەك تەڵاق.

---

[1] النساء: ١٩

[2] النساء: ٢٠

[3] احكام القرآن للجصاص ٢/٩١.. فتح القدير ٣/١٩٩ و پاشتر.

[4] شرح الخرشي ٤/١٢. بداية المجتهد ٢/٥٦.

[5] المهذب ٢/٧١. تێیدا هاتووە: "کارەکە حوکمی جائیزنەبوونی هەیە، بەڵام تەڵاقەکە دەکەوێ و باتییەکەیش هەڵدەوەشێتەوە".

ج- حەنبەلی[1] و جەعفەری[2] و زەیدی[3] و زاهیریەکان[4] دەڵێن: خولع بەتاڵ دەکاتەوە و تەڵاق ناکەوێ، لەبەرئەوە ژنەکەیش بەهیچ پابەند نابێ، جا ئەگەر ماڵێکی دا بە مێردەکە پێویستە لەسەری بۆی بگێڕێتەوە، ئەگەریش ژنەکە دەستی لە مافێك هەڵگرت ئەوا دەستهەڵگرتنەکە بەتاڵە و مافەکە باقییە، چونکە ئەو نەهیەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە فەسادی نەهیلێکراو لە تەڵاق و باتی پێکەوە دەخوازێ.

## زاڵکردن:

ئاشکرایە کە روکنی بنچینەیی لەم رەفتارەدا (واتە خولع) رەزامەندیی دووسەرە و بەیەکگەیشتنی ئیرادەی ژن و مێرد و کۆتاهێنانە بە پەیوەندیی هاوسەری بە رەزامەندیی هەردوولا لەبەرانبەر پابەندبوونی ژنەکە بە بەدەلێك بۆ مێردەکە. جا ئەگەر ئەم رێکەوتنە خەوش (عەیب)ێك لە خەوشەکانی ئیرادەی تێکەوت وەك تەنگ

---

[1] في المغني (٥٤/٧) تێیدا هاتووە: "ئەگەر ژنەکەی تەنگاو کرد و بەلێدان و تەنگ پێهەڵچنین یان پێنەدانی مافەکانی لە نەفەقە و پشکی خۆی و ئەو جۆرە شتانە تا ژنەکە ناچار بێ خۆی لێ بکڕێتەوە و ئەویش وای کرد، ئەوا خولعەکە بەتاڵ و باتییەکەیش رەتکراوەیە.. ئەمە لە هەریەك لە ابن عباس وعطاء و موجاهید و شەعبی و قاسم بن محەمەد و عەمرو بن شوعەیب و حەمید بن عبدالرحمن و الزهري، ریوایەت کراوە. هەروەها هەریەك لە مالیك و الثوري و قەتادە و شافیعي و ئیسحاقیش هەمان رایان بووە. ئەبوحەنیفە دەڵێ: عەقد (خولع)ەکە دروستە و باتییەکە لازمە و پیاوەکە گوناهبار و یاخییە، خوا ئەفەرموێ: ﴿...وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ...﴾ .. ﴿...لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهاً وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ...﴾.

[2] المختصر النافع ص٢٧.

[3] التاج المذهب ١٧٧/٢. البحر الزخار ١٣٩/٣.

[4] لە: المحلی (٢٣٥/١٠) دا هاتووە: "خولع بریتییە لە خۆکڕینەوە (الافتداء) ئەگەر ژن رقی لە مێردەکەی بوو و ترسا بەو هۆیەوە مافی مێردەکەی نەدات، یان ترسا ئەو رقی لێ هەڵبگرێ و مافەکانی نەداتێ، بۆی هەیە خۆی بکڕێتەوە لێی و تەڵاقی لێ وەربگرێ ئەگەر رازی بوو، خۆکڕینەوە بەیەکێك لەو دوو شێوەیەی باس کرا یان هەردووکیان پێکەوە حەڵاڵ نیە، ئەگەر بەجگە لەوە روویدا بەتاڵە و پیاوەکە چی لە ژنەکەی وەرگرتوە بۆی دەگێڕێتەوە و وەك پێشتر بە ژنی دەمێنێتەوە و تەڵاقەکەی بەتاڵ دەبێتەوە".

پێهەڵچنین و فشار و لەخشتەبردن لەگەڵ مافخوران (التغریر مع الغبن)، ئەوا وەك باقیی ئاڵوێرەکانیتر بەتاڵە.

ئەگەر پابەندبوونی ژنەکە بەدانی بەدەل لەبەرانبەر گێڕانەوەی ئازادیی خۆی بێ، هەروەها هۆی ئەوە یاخیبوون (نشوز) یان ستەمی مێردەکە نەبێ، بەڵکو نەگونجانیان بێ لەبەر هۆکاری غەریزی یان هیتر، وەك جیاوازیی تەمەن یان پێگەی کۆمەڵایەتی یان رۆشنبیری.. یان هەر شتێکیتر کە پیاوەکە گوناهی نیە تێیدا، هیچ بوارێك نیە بۆ بەبەتاڵدانانی خولع و لێنەکەوتنەوەی ئاسەوارەکانی.

بەڵام ئەگەر سەرچاوەی رازیبوونی ژنەکە بە دانی بەدەل لەبەرانبەر تەڵاقدانی ستەمی مێردەکە و پێنەدانی مافەکانی و فشارلێکردنی بێ بۆ رازیبوون بە خولع (واتە: داواکردنی تەڵاق)، ئەوا نابێ بەتاڵبوونی بەهیچ شێوەیەك جێی گومان و دوودڵی و مشتومڕ بێ، تەڵاقەکە ناکەوێ و باتییەکە رەت دەکرێتەوە و هاوسەرگیریەکە باقی دەبێ، کە ئەمە رای حەنبەلی و زاهیریەکان و کۆمەڵێ لە جەعفەری و جمهوری زەیدییە.

پاشان بەکەوتوو دانانی تەڵاق و بەتاڵیی پابەندبوونی ژنەکە بەدانی بەدەل، جگە لە تێکگیرانی لەگەڵ رواڵەتی دەقەکان لەگەڵ خواست (موقتەزا)ی خولع و سروشتەکەی کە لەسەر بناغەی ئاڵوگۆڕ دامەزراوە، بەریەك دەکەوێ.

## سێیەم- جیاوازی لە ئەحکامی مامەڵە داراییەکاندا

ئیسلام لەسەر زاری پێغەمبەرە رێزدارەکەی(ﷺ) نەهی لە هەندێ سەودا و مامەڵەی دارایی کردوە، ئەویش لەبەر ئەو زیان و ئازارەی بە کۆمەڵگە یان بەتاکی دەگەیەنن، لەبەرئەوەی ئیسلام هەر شتێکی قەدەغە کردبێ بەدڵنیاییەوە لەبەرئەوەیە زیانێکی گشتی یان تایبەتی تێدایە، وەك چۆن فەرمانی بەهەر شتێکیش کردبێ بەرژەوەندیەکی گشتی یان تایبەتی تێدایە.

لەو مامەڵانە هەندێ جۆری فرۆشتنن کە لەبەر خودی خۆیان یان وەسفێکی وابەستەیان نەهییان لێ کراوە، کە شەرعزان کۆکن لەسەر نادروستییان، لەپاڵ ئەمانەدا هەندێ فرۆشتنیتر هەن نەهییان لێکراوە لەبەر هۆیەکی دەرەکی کە وابەستەیان نیە، ئەمەیان بابەتی توێژینەوەکەی ئێمەیە لەڕووی جیاوازیی رای شەرعزان لە دروستی یان فەسادیانەوە کە جیاوازیەکە زادەی ناکۆکییانە لەو ڕێسا ئوسولّیەی دەڵێ: نەهیکردن خراپە دەخوازێ(النهي يقتضي الفساد).

لەبەر زۆریی جۆرەکانی ئەم بەشە تەنها چەند نموونەیەك باس دەکەین:

١- نەجش (النجش)[١]:

ئیبن عومەر دەگێڕێتەوە کە ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ النَّجْشِ))[٢].. لە ئەبوهورەریرەیشەوە هاتووە: ((أن النبي(ﷺ) نهى أن يبيع حاضر لباد وأن يتناجشوا))[٣].

(النجش) لە زاراوەی شەرعیدا: ئەوەیە کەسێك نرخی کاڵایەکی عەرزکراو بۆ فرۆشتن زیاد بکا، نەك بۆ ئەوەی بیکڕێ بەڵکو بۆ ئەوەی کەسانیتری پێ بخەڵەتێنێ، جا ئەگەر کەسێك بەوە فریوی خوارد و کڕی، ئایا کڕینەکەی دروستە؟

شەرعزان کۆکن لەسەر ئەوەی نەجش حەرامە و نەجشچیش بەو کارەی کردویەتی بێفەرمانی کردوە، بەڵام لەبارەی حوکمی فرۆشتنەکە رایان جیاوازە، بەم شێوەیە:

أ- حەنەفیەت[١] و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن: فرۆشتنەکە دروستە با مەکروهیش بێ و کڕیار بژارە (ی پەشیمانبوونەوە-وەرگێڕ)ی نیە، لەبەرئەوەی نەهیکردنەکە لەبەر هۆیەکی دەرەکیی نالازمە و فاسیدبوونی ناگەیەنێ.

---

[١] النجش: بفتح النون وسكون الجيم في اللغة تنفير الصيد واستثارته ليصاد.

[٢] الحديث متفق عليه. بلوغ المرام من جمع أدلة الأحكام وشرحه سبل السلام ٢٣/٣.

[٣] متفق عليه، نيل الأوطار ١٨٧/٥.

ب- داودی زاهیری و و پێشەوا مالیك لە ریوایەتێكدا[٢]، حەنبەلیـەكانیش لـە رای بەناوبانگیانـدا دەڵـێن: گرێبەندەكـە بەتاڵـە لەبەرئـەوەی نەهیكردنەكـە مانـای فەسـادی نـەهلێكراو دەگەیـەنێ بـا لەبـەر وەسـفێكی نـالازمیش بـێ. بـەڵام حەنبەلیـەكان بـۆ بـەتاڵبوونی ئـەوەیان بەمـەرج دانـاوە كـە نەجشـەكە بـە تێوەگلانی فرۆشیارەكە یان دەستكیسەی خۆی بێ.[٣]

ج- بـەلای مەزەبـەكانی شـافیعی[٤] و جەعفـەری[١] و زەیـدی[٢] و بـەناوبانگی مالیكی[٣] و هەروەها ئیبن حەزمی زاهیریەوە[٤]: فرۆشتنەكە دروست دەبێ و كڕیاریش مافی بژارەی دەبێ.

---

[١] لە: فتح القدير مع الهداية وبداية المبتدي (٦/٤٧٦-٤٧٩) دا هاتووە: "پێغەمبـەری خـوا نـەهی لـە نـەجش كردوە، ئەویش زیادكردنی نرخە بەبێ ئەوەی مەبەستی بێ بیكڕێ هەروەها لە زەمكردن بەسەر یـەكتر لـە كڕین و فرۆشتندا دەڵێ: با هیچ كەسێك لە مامەڵەدا زەم بەسەر براكەیدا نەكا، خوازبێنی بەسەر خوازبێنیی براكەیدا نەكا، چونكە ئەوە ئازاردانە، هـەروەها (نـەهی كردوە) لـە چـوونە پـێش كـاروان و لـە فرۆشـتنی شارنشین بۆ دەشتنشین و هەروەها لە فرۆشتن لەكاتی بانگی جومعەدا. هەرهەموو ئەوانە مەكروهن بـەڵام بەرای گشت زانایانمان فرۆشتنەكە فاسید ناكەن".

[٢] لە: رحمة الأمة في اختلاف الأئمة (ص١٤٣) دا هـاتووە: "ئەگـەر كەسـێك فریـوی خـوار پێـی و كـڕی ئـەوا كڕینەكەی بەلای ئەم سیانەوە (ئەبو حەنیفە و شافیعی و ئیمام ئەحمەد) دروستە، مالیك دەڵێ كڕینەكـە بەتاڵە".

وفي بداية المجتهد (٢/١٣٩) دا هاتووە: "رایان جیاوازە، ئەگەر روویدا ئەهلی زاهیر دەڵێن فاسیدە".

پێویستە قسەكەی ئیبن روشد بەپێی قسەكەی داودی زاهیری و ئـەو شـەرعزانەی مەزەبەكـە كـە هـاوڕاین وەربگیرێ، ئەگینا ئیبن حەزم رای وانیە بەم شێوەیە.

[٣] لە: نيل الأوطار (٥/١٨٧) دا هاتووە: "زانایان كۆدەنگ لەسـەر ئـەوەی نەجشچـی بەكارەكـەی بێفـەرمانی كردوە، بەڵام لەبارەی فرۆشتنەكە ئەگەر رووی دا رایان جیاوازە. ابن المنـذر لـە زاری كۆمـەڵێ لـە ئـەهلی حەدیسەوە دەگێڕێتەوە كە فرۆشتنەكە ئەگەر بـەو شـێوەیە رووی دا فاسیدە، ئـەوەیش قسـەی ئـەهلی زاهـیر و ریوایەتێكـە لـە مالیكـەوە. هـەروەها لای حەنبەلیـەكان رای بەناوبانگـە ئەگـەر بـە تێـوەگلان و دەسكیسەی فرۆشیارەكە بوو. رای بەناوبانگ لای مالیكیەت جێگیربوونی بژارەیە (واتە سەرپشكبوون)".

لە: الميزان الكبرى (٢/٦١) دا هاتووە: "ئەوەی بـە نـەجش فریـو بخـوات و بیكـڕێ، كڕینەكـەی دروسـتە ئەگەریش فریودەرەكە گوناهبارە، لەگەڵ قسەی مالیك كە دەڵێ كڕینەكە بەتاڵە".

[٤] شرح المنهج مع الجمل ٢/٩١. الوجيز ١/١٣٨-١٣٩.

لەبەرئەوەی بەرهەمی نەهیکردنەکە کاتێ فەسادی نەهیلێکراو نەگەیەنێ، بریتییە لە جێگیرکردنی بژارە بۆ کەسی زیانمەند. ئەم رای سێیەکە جۆرە هاوسەنگیەکی تێدایە، بۆیە شیاوی هەڵبژاردنە، لەبەرئەوەی دەکرێ زیانەکە بە بوونی بژارە لە هەڵوەشاندنەوەی عەقدەکەدا چارەسەر بکرێ.

٢- فرۆشتنی شارنشین بۆ گوندنشین (بيع حاضر لباد):

ئیبن عەباس دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا فەرموی: لَا تَلَقَّوْا الرُّكْبَانَ وَلَا يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ. فَقِيلَ لِابْنِ عَبَّاسٍ: مَا قَوْلُهُ لَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ؟ قَالَ: لَا يَكُونُ لَهُ سِمْسَارًا))[5]

(واتە: مەچنە پێش کاروان و با شارنشین بۆ دەشتنشین نەفرۆشێ، بە ئیبن عەباسیان وت: مەبەست چییە لەوەی با شارنشین بۆ دەشتنشین نەفرۆشێ، وتی: نەبێتە دەلاڵی".

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، دەڵێ: نُهِينَا أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ وَإِنْ كَانَ أَخَاهُ لأبِيهِ وأُمِّه)).[6]

لە ئەبوداو و نەسائیەوە: ((نَهَى أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ وَإِنْ كَانَ أَبَاهُ أَوْ أَخَاهُ)).[7]

فرۆشتنی شارنشین بۆ گوندنشین (دەشتنشین): ئەوەیە کەسێکی غەریب (خەڵکی شوێنە کڕیارەکە نەبێ) کاڵایەك بباتە شوێنێك کە پێویستیانە تا بە نرخی ڕۆژ بیفرۆشێ، جا کەسێکی خەڵکی شوێنەکە (خەڵکی شوێنی کڕینەکە) پێی بڵێ لای

---

[1] الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية ١٩١/١.

[2] في التاج المذهب (٣٨٧/٢) دا هاتووە: "بۆ بکەرەکەی حەرامە و کڕیاریش سەرپشکە".

[3] الشرح الكبير مع الدسوقي ٥٤/٣.

[4] لە: المحلى ٤٤٨/٨ دا هاتووە: "ئەگەر رووی دا کڕیار سەرپشکە، یاخی نەجشچییەکەیە".

[5] رواه الجماعة الا الترمذي. نيل الاوطار ١٨٥/٥.

[6] متفق عليه، سەرچاوەی پێشوو.

[7] سەرچاوەی پێشوو.

من بەجێی بێڵە تا وردە وردە بە گرانتر بیفرۆشم.

شەرعزانانی موسڵمان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەو کارە حەرامە، ئەویش لەبەر ئەو حەدیسانەی باس کران و گێڕانەوەی هەردوو سەحیحەکە ((وَلَا يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ دَعُوا النَّاسَ يَرْزُقُ اللَّهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ)).

بەڵام سەبارەت بەوەی ئایا ئەگەر رووی دا دروستە یان نا، رایان جیاوازە، بەم شێوەیە:

أ- ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی دەڵێن: کێشە نیە شارنشینێك بۆ گوندنشینێك بفرۆشێ و نرخەکەی پێ بڵێ، ئەگەر پێی نەڵێ مەکروهە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا فرۆشتنەکە دروستە، لەبەرئەوەی نەهیکردنەکە رووی نە لە خودی کارەکە و نە لە وەسفێکی وابەستەی نەکردوە، بەڵکو رووی لە دەرەکیەکی ناوابەستە کردوە، بۆیە فەساد ناگەیەنێ.[1]

ب- حەنبەلی[2] و زاهیریەکان[3] و هەندێ لە هاوەڵانی مالیك و ئەوانەی هاوڕایانن[4] دەڵێن: نەهیکردن فەسادی نەهیلێکراو دەگەیەنێ، بەوەیش فرۆشتنەکە بەتاڵ دەبێ، رای حەنبەلی و مالیکی لەسەر ئەم بناغەیە دامەزراوە کە نەهیکردنەکە لەبەر مافی خوایە (مافی موسڵمانان) بۆیە فەساد دەگەیەنێ یا لەبەر هۆیەکی

---

[1] فتح القدير، سەرچاوەی پێشوو ٦/٤٧٦ و پاشتر.

[2] المغني لابن قدامة ٤/٢٤١.

[3] لە: المحلى ٨/٤٥٣دا هاتووە: ئەگەر وای کرد کڕین و فرۆشتنەکە بەهەمیشەیی هەڵدەوەشێتەوە و حوکمیشی حوکمی زەوتکردنە.

[4] لە: فتح الباري شرح صحيح البخاري ١٢/٢٥٩ دا هاتووە: "رایان جیاوازە، کە ئاخۆ نەهیکردن فەساد دەخوازێ یان نا؟ مالیك و ئەحمەد رایان وایە دروست نیە شارنشین بۆ دەشتنشین بفرۆشێ. شافیعی و جمهور لەگەڵ ئەوەن دروستە ئەگەرچی کڕینیشی حەرام کراوە. مالیك پێی وایە بژاردەی هەیە و ئەوە عەیبەێکە لە عەیبەکان وەك لە المصراة -دا. ئیبن حەبیب دەڵێ: بژارە نیە ئەگەر فرۆشیار تێوەنەگلابێ. ئوهلی زاهیر دەڵێن فرۆشتنەکە بەتاڵ و رەتکراوەیە بۆ فرۆشریارەکەی ئەگەر ئەوەی لەسەر ساغ بوویەوە.

دەرەکیی ناوابەستەیش بێ.

بۆچوونی زاهیریەکان لەو ئەسڵانەوە سەرچاوەی گرتوە کە دەڵێ نەهیکردن بەرەهایی فەساد دەخوازێ.

ج- شافیعی[1] و جەعفەریەکان[2] دەڵێن: نەهیکردن فەساد ناخوازێ، لەبەرئەوە فرۆشتنەکە دروستە لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ((دَعُوا النَّاسَ يَرْزُقْ اللَّهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ)).

**زاڵکردن:**

بەڕای بەندە حوکمدان بە دروستیی یان فەساد لەسەر رادەی زیانگەیشتن بە بەرژەوەندیی گشتی لەو کردەوەیە دەوەستێ، ئەگەر بووە هۆی زیانگەیاندن بە کۆمەڵگە ئەوکاتە نەهیکردنەکە لەبەر مافی خوا ئەبێ (مافی گشتی) و پێویستە کار بە قسەکەی مالیکی و حەنبەلیەکان بکرێ کە نەهیکردنەکە لەبەر دەرەکیەکی ناوابەستەیە و فەسادی نەهیلێکراو دەگەیەنێ، ئەگەر لەبەر مافی خوا بێ. بەڵام ئەگەر کردەوەکە کاری لە بەرژەوەندیی بەکاریەران نەکرد، ئەوا ژیرانەترینیان راکەی ئەبوحەنیفەیە.

**٣- چوونەرێی کاروان (تلقي الركبان):**

ئیبن مەسعود دەڵێ ((نهى رسول الله (ﷺ) عن تلقي الركبان))[3]. لە ئیبن سیرینەوە، پێغەمبەری خوا فەرموی: ((لا تلقوا الجلب)).[4]

کاروان (الركبان) ئەو کەسانەن رزق و رۆزی لە ناوچەکانی خۆیانەوە بەمەبەستی

---

[1] لە: المغني المحتاج ٢/٣٦ دا هاتووە: "هەندێ نەهیلێکراو بەتاڵ نابێتەوە لەبەر گەڕانەوە بۆ مانایەك کە فرۆشتنی شارنشین بۆ گوندنشین نزیکیەتی".

[2] لە: الروضة البهية ٢٩١/١ دا هاتووە: "وازهێنان لە بەوەکیلبوونی شارنشین بۆ گوندنشین".

[3] متفق عليه، نيل الاوطار ١٨٨/٥.

[4] فتح الباري شرح صحيح البخاري ١٢/ ٢٧٦.

فرۆشتنی دەبەن بۆ ناوچەیەکیتر جا چ بەسوار بن یان بەپێ، بەکۆمەڵ بن یان بەتاك، چوونەپێش (التلقی)یش دەرچوونە لە بازاڕی کڕین و فرۆشتنەوە بۆ پێشوازیی ئەوانە و کڕینی لێیان بەر لەوەی بگەنە بازاڕ و نرخی بازاڕ بزانن.

پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لەم جۆرە کارە کردوە، لەبەرئەوەی زیان لەلایەك بە بەرژەوەندی بەکاریەران و لەلایەکیتریش بەوانەی رزقەکان دێنن، دەگەیەنێ.

شەرعزانی موسڵمان کۆدەنگن لەسەر نامەشروعیی چوونەڕێی کاروان، بەڵام لەبارەی حوکمی کڕین و فرۆشتنەکە پاش ڕوودانی، جیاوازن بەم شێوەیە:

أ- حەنەفیەکان دەڵێن: کارەکە مەکروهە و و فرۆشتنەکە دروستە و مافخوراو (المغبون) بژارەی (ی پەشیمانبوونەوە) نیە، ئەویش لە ڕوانگەی ئەو ئەسڵەیانەوە کە دەڵێ نەهیکردن لەبەر دەرەکیەکی ناوابەستە فەساد ناگەیەنێ.[1]

ب- هەندێ لە مالیکی و حەنبەلیەکان دەڵێن گرێبەندەکە فاسیدە، ئەویش بینا لەسەر ئەوەی نەهیکردنەکە لەبەر مافی خوایە و زیان بە بەرژەوەندیی گشتی دەگەیەنێ، بۆیە فەسادی نەهیلێکراو ناخوازێ با لەبەر دەرەکیەکی ناوابەستەیش بێ.[2]

ج- جمهور دەڵێن فرۆشتنەکە دروستە بەڵام زیانلێکەوتوو لە مافی هەڵوەشاندنەوەدا سەرپشکە، لەبەرئەوەی نەهیکردنەکە لەبەر وەسفێکی ناوابەستەیە و فەساد ناخوازێ، لەوانە مەزەبەکانی شافیعی[3] و جەعفەری[4] و

---

[1] الهدایة وبدایة مع فتح القدیر، سەرچاوەی پێشوو، ٤٧٨/٦.

[2] لە: نیل الأوطار (١٨٨/٥) دا هاتووە: "نەهیکردنەکە ئایا فەساد دەخوازێ یان نا وتویانە فەساد دەخوازێ، هەروەها وتراوە نەخێر و ئەوە زاهیرە، لەبەرئەوەی نەهیکردنەکە لێرەدا لەبەر شتێکی دەرەکییە. هەندێ لە مالیکی و حەنبەلی وتویانە فەسادی هاومانای بەتاڵییە".

[3] مغني المحتاج ٣٦/٢.

[4] الروضة البهية ٢٩٢/١

زاهیری[1] و هەندێ لە حەنبەلیەکان[2] و هەندێ لە مالیکیەکان[3] و مەزهەبی زەیدی[4].

تێبینی دەکرێ زاهیریەکان لەم مەسەلەیەدا لە ڕێساکەیان لایان داوە، لەبەرئەوەی ئەسڵی گشتی لەلایان ئەوەیە نەهیکردن بەرەهایی فەساد دەخوازێ.

من وای بەباش دەزانم بەرژەوەندیی گشتی بکرێتە پێوەر بۆ بڕیاردان لەسەر فەسادیی ئەم رەفتارە وەك لە فرۆشتنی شارنشین بۆ گوندنشیندا روونمان کردەوە.

٤- فرۆشتن پاش بانگی نوێژی جومعە:

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ﴾[5]، وشەی (ذروا) لە لەفزدا فەرمانکردن و لە مانادا نەهیکردنە و بەیەکێك لە سیغەکانی نەهیکردن دادەنرێ، لەبەرئەوەی داوای نەکردنی کردەوەکەیە.

لێرەوە شەرعزانی موسڵمان لە هەموو سەردەمێکدا کۆدەنگ بوون لەسەر قەدەغەکردنی فرۆشتن پاش بانگی نوێژی هەینی تا ئەنجام دەدرێ. بەڵام لەوەدا جیاوازن کە ئاخۆ ئەگەر رووی دا هەڵدەوەشێنرێتەوە یان نا و بەسەر کێدا هەڵدەوەشێنرێتەوە؟ هەروەها ئایا سەرجەم گرێبەندەکانیتریش لەم مانایەدا دەچنە پاڵ فرۆشتن یان ناچنەپاڵی؟

---

[1] المحلى ٤٤٩/٨.

[2] لە: المغني (٣٤١/٤) دا هاتووە: "لە ریوایەتێکی ئەحمەدا چوونە پێش کاروان فاسیدە، بەڵام راستتر ئەوەیە مەکروهە و عەقدەکە دروستە لەبەرئەوەی نەهیکردنەکە بۆ مانای فرۆشتنەکە نیە".

[3] الشرح الصغير مع حاشية الصاوي ٣٥/٢.

[4] التاج المذهب ٣٨٥/٢.

[5] الجمعة: ٩. الهداية وبداية المبتدي مع فتح القدير ٤٧٦/٦ و پاشتر.

وا لە خوارەوە وەڵامی ئەو پرسیارانە دەبینرێ:

أ- شەرعزانی حەنەفی، هەروەها شافیعی و هاوەڵانی[1] دەڵێن: فرۆشتن مەکروهە بەڵام دروستە و هەڵناوەشێنرێتەوە، لەبەرئەوەی نەهیکردنەکە نە لە خودی فرۆشتنەکە و نە لە وەسفێکی وابەستەی نەبووە، بەڵکو لەبەر دەرەکییەکە، کە سەرقاڵبوونێکە ببێتە مایەی نەچوون بۆ نوێژ، کە ئەوە بۆ غەیری فرۆشتنیش روودەدات. هەروەك دەکرێ لەکاتی چوون بۆ جومعەدا هەم فرۆشتن و هەم چوونە نوێژیش کۆبکرێنەوە.

لە ئەبوحەنیفە (رەحمەتی خوای لێبێ)ەوە گوێزراوەتەوە کە گوتویێتی: ئەم نەهیکردنە مانای فەسادی نەهیلێکراو دەخوازێ و فرۆشتن هەڵدەوەشێنێتەوە ئەگەر کرا.[2]

ب- مەزەبی مالیکی وردکردنەوەیان لەمەدا هەیە کە بەگشتی بەم شێوەیە:

هەندێکیان دەڵێن: بەرەهایی هەڵدەوەشێتەوە وەك لە (المدونة)دا هاتووە، لەبەرئەوەی نەهیکردن لەبەر مافی خوا فەسادی نەهیلێکراو دەخوازێ.[3]

هەندێکیان دەڵێن: ئەو کەسەی خووی بەو جۆرە فرۆشتنەوە گرتبێ (واتە فرۆشتن لەکاتی نوێژی هەینی-وەرگێر) هەڵدەوەشێنرێتەوە، بەڵام ئەگەر بەدەگمەنی رووی دا هەڵناوەشێنرێتەوە.[4]

---

[1] شرح العبادي على المحلي على الورقات هامش لرشاد الفحول ص٩٧.
بداية المجتهد /١٤٠. تفسير القرطبي ١٠٨/١٨. أحكام القرآن لأبن العربي ١٧٩٤/٤.

[2] ابن العربي دەڵێ (سەرچاوەی پێشوو): "شافیعی دەڵێ بەهیچ شێوەیەك هەڵناوەشێنرێتەوە. ئەبوحەنیفەیەش لە وردەکارییەکی نزیك لەوەی مالیکیەتدا لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەیە".

[3] أحكام القرآن لبن العربي ١٩٧٤/٤.. الجامع لأحكام القرآن للقرطبي ١٠٨/١٨. تێیدا هاتووە: "وتم راستیەکەی ئەوەیە فاسیدە و هەڵدەوەشێنرێتەوە لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ))، واتە رەتکراوەیە.

[4] لەوانەی ئەم رایەیان پەسەند کردوە ئیبن ماجشونە. بڕوانە: ابن العربي، سەرچاوەی پێشوو.

هەندێکیان دەڵێن: هەڵدەوەشێنرێتەوە ئەگەر تێنەپەڕیبێ، ئەگەر تێپەڕیبوو و نەمابوو هەڵناوەشێنرێتەوە.[1]

هەندێکیان حوکمی فەساد و هەڵوەشانەوەیان لە فرۆشتندا قەتیس کردوە، لەبەرئەوەی شتێتر دەگمەنە و ئەگەر رووی دا هەڵناوەشێنرێتەوە.[2]

هەندێکیان غەیری فرۆشتنیشیان لەسەر فرۆشتن پێوانە کردوە لەبەر هاوبەشبوونیان لە عیللەدا ئەویش خەیاڵ رۆیشتن و سەرقاڵبوونە لە چوون بۆ نوێژ و گوتویانە نیکاح و بەکرێدان و باقیی عەقدەکانیتریش هەڵدەوەشێنرێنەوە.[3]

ج- هەرچی زاهیرییە، پاش جەختکردنیان لە بەتاڵیی فرۆشتن لە روانگەی ئەسڵەکەیانەوە کە دەڵێ نەهیکردن بەرەهایی فەساد دەخوازێ، دەڵێن: حوکمەکە تەنها فرۆشتن دەگرێتەوە و باقیی گرێبەندەکانیتر ناگرێتەوە، بەڵام هەموو مرۆڤێکی باڵق و ژیر دەگرێتەوە چ موسڵمان بێ یان نا، نێر بێ یان مێ، لەبەر عوزرێك لە نوێژ بەخشرابێ یان نا.[4]

---

[1] لەوانەی ئەم رایەیان هەبووە موغیرەیە.سەرچاوەی پێشوو.

[2] بڕوانە: أحكام القرآن لإبن العربي، سەرچاوەی پێشوو... الجامع لأحكام القرآن للقرطبي، سەرچاوەی پێشوو.

[3] ابن العربي دەڵێ (سەرچاوەی پێشوو): "راستیەکە هەڵوەشاندنەوەی سەرجەمیانە، لەبەرئەوەی فرۆشتن لەبەر پێوە سەرقاڵبوونیەوە قەدەغە کراوە، هەر جۆرە عەقدێك مرۆڤ لە جومعە سەرقاڵ بکا لەرووی شەرعیەوە حەرامە و لەپێناو سڵەماندنەوەدا هەڵدەوەشێنرێتەوە".

ئیبن روشد لە (بدایة المجتهد ١٤١/٢)دا دەڵێ: "هەرچی باقیی عەقدەکانیترن ئەگەری ئەوە هەیە بخرێنە پاڵ فرۆشتنەکان، لەبەرئەوەی ئەو مانایەی فرۆشتنیان تێدایە کە مرۆڤ لە چوون بۆ جومعە سەرقاڵ دەکا، ئەگەریش هەیە نەخرێنە پاڵ، لەبەرئەوەی بەدەگمەن لەم کاتەدا روو بدەن، بەپێچەوانەی فرۆشتنەکان".

[4] لە: المحلی (٢٦/٨-٢٧) دا هاتووە: "پاش دابەزینی خۆر لە رۆژی هەینی، بەئەندازەی تەواوبوونی دوو خوتبەکە و نوێژەکە، فرۆشتن دروست نیە نە بۆ باوەڕدار نە بۆ بێباوەڕ نە بۆ ژن نە بۆ نەخۆش.. هەر عەقدێك لەوکاتەدا بکرێ هەڵوەشاوە (مفسوخ)ە. بەڵام هێنانەناوەوەی باسی بەکرێدان و مارەبڕین هەڵەیەکی ئاشکرایە لەبەرئەوەی خوا نەهی لە فرۆشتن کردوە، ئەگەر بیویستایە نەهی لە نیکاح و ←

زاڵكردن:

رای شایسته بە هەڵبژاردن ئەوەیە ئیبن ئەلماجشون و هیتر گوتویانە كە فرۆشتنەكە پاش دووبارەكرانەوەی بە فاسید دادەنرێ و وەك سڵەماندنەوە (ردع) هەڵدەوەشێنرێتەوە. رەچاوكردنی دووبارەكردنەوە بۆ لێبوردەیی ئیسلام دەگەڕێتەوە كە نایەوێ شت لەسەر مرۆڤ قورس بكا.. ﴿... وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ...﴾[1].

هەرچی هەڵوەشاندنەوەیە پاش دووبارەكردنەوە، لەبەرئەوەیە نوێژی جومعە بەئیجماع واجبە، هەر شتێكیش واجب لەسەری بوەستێ واجبە، وازلێهێنانی واجبیش یاخییە و شایستەی سزایەكی تەمێكارانەیە و نزیكترینیشیان لە دادپەروەری و گیانی ئیسلامیش حوكمدان دەخوازێ بە فەسادی رەفتارەكەی و لێنەكەوتنەوەی ئاسەوارەكانی.

رای زاهیری لە چەند روویەكەوە رەخنەی لێ دەگیرێ:

١- گوتارەكە رووی لە بڕواداران كردوە و كەسانیتری جگە لەوان ناگرێتەوە.

٢- گوتارەكە تایبەتە بە بەرپرسیار لە چوون (ـە نوێژ) و بەخشراو لە جومعە ناگرێتەوە.

٣- غەیری فرۆشتن لەو عیللەیەی حوكمەكەی لەپێناودا هاتووە، وەك فرۆشتن وایە.

## چوارەم- جیاوازی لە ئەحكامی عیبادەتەكان

شەرعزانی موسڵمان لەبارەی حوكمی هەندێ عیبادەت كە لە هەندێ دۆخی تایبەتدا ئەنجام دەدرێن لەرووی كاریگەریی ئەو بارودۆخانە لەسەر دروستییان، رای

---

بەكرێدان بكا دەیتوانی بیكا، هەرچی ئەوەیە ئەبوحەنیفە و شافیعی رێگەیان بەوە داوە لەو كاتەدا فرۆشتن بكرێ، پێچەوانەی فەرمانی خوایە".

[1] الحج: ٧٨.

جیاوازیان هەیە. بناغەی ئەم ناکۆکیەیش جیاوازییانە لەو ڕێسا ئوسولیەی دەڵێ: (النهي يقتضي الفساد)، کە ئاخۆ ئەو حاڵەت و بارودۆخانە دەگرێتەوە و عیبادەتەکە بەتاڵ دەکەنەوە و پێویستە دووبارە بکرێتەوە، یان بەتاڵی ناکەنەوە، بەڵام ئەنجامدەرەکەی بە گوناهبار دادەنرێ لەو ڕووەوە کارەکەی سەرپێچی یان زێدەڕەوی بۆ سەر مافی کەسیتر تێدا بووە؟.

لەو لقانەی تێیاندا ناکۆکن ئەمانەن:

١- نوێژ لە زەویی زەوتکراودا:

شەرعزان لەبارەی دروستییەوە جیاوازن:

ئەوانەی وتویانە نەهیکردن بەڕەهایی فەساد دەخوازێ -وەك زاهیری و حەنبەلیەکان- دەڵێن نوێژکردن لە ماڵی زەوتکراو یان هەر شوێنێکیتری زەوتکراودا فاسیدە و پێویستە دووبارە بکرێتەوە.[1]

ئیبن حەزم دەڵێ: "نوێژکردن لە زەویەکی زەوتکراو یان بەناهەق بەموڵککراوی وەك فرۆشتنی فاسید یان پێشکەشکردنێکی فاسیددا، دروست نیە".[2]

ئەوانەیش وتویانە نەهیکردن فەسادی شتەکە ناخوازێ تا نەگەڕێتەوە بۆ خودی شتەکە یان بەشێکی یان وەسفێکی وابەستەی -وەك جمهور- دەڵێن نوێژەکە دروستە، لەبەرئەوەی نەهیکردنەکە لەبەر دەرەکیەکی ناوابەستەیە (خارج غير لازم)، ئەویش زێدەڕۆییکردنە بۆ سەر مافی کەسانیتر بەبێ پاساو و هیچ پەیوەندیەك لەنێوان نوێژەکە و ئەو زێدەڕۆییەدا نیە، لەبەرئەوەی خوا نوێژی بەڕەهایی واجب کردوە و زەوتکردنیشی بەڕەهایی حەرام کردوە.[3]

---

[1] الإحكام في أصول الأحكام لإبن حزم ٣٠٧/٣.. الفروق للقرافي ٨٥/٢.

[2] المحلى ٣٣/٤.

[3] الدسوقي والشرح الكبير ٥٤/٣. الفروق، سەرچاوەی پێشوو.

←

٢- حەجكردن بە ماڵی زەوتكراو (یان بە ماڵی حەرام):

هەمان ناكۆكیی نوێژكردن لە زەویی زەوتكراودا ئەمیش دەگرێتەوە، ئەوانەی رایان وایە نەهیكردن بەڕەهایی فەساد دەخوازێ، ئەو حەجە بەبەتاڵ[1] و دووبارەكردنەوەی بەواجب دادەنێن.

ئەوانەیش وتویانە: نەهیكردن لەبەر وەسفێكی ناوابەست (وصف غير لازم) فەسادی نەهیلێكراو ناخوازێ، دەڵێن ئەو حەجە دروستە و ئەرك (تەكلیف) لەسەر شان دەخا، بەڵام هێشتا لەسەریەتی ماڵەكە بۆ خاوەنە شەرعیەكەی بگەڕێنێتەوە.

٣- نوێژكردن لە گۆڕستاندا:

ئەبوسەعیدی خودری دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر فەرمویەتی: ((الأرض كلها مسجد إلا المقبرة والحمام)).[2]

ئەوە روونە نەهیكردن لە لە نوێژكردن لە گۆڕستاندا نە لەبەر خودی خۆی و نە لەبەر وەسفێكی وابەستەی نیە، بەڵكو لەبەر شتێكە لە دەرەوەی، واتە لەبەر شتێك كە نە روكنە و نە مەرج، لەو روانگەیەیشەوە شەرعزان لەبارەی حوكمی ئەو نوێژەوە رایان جیاوازە:

أ- زاهیری[3] و حەنبەلی و هادەویەكان و هەندێ لە هاوەڵان[4] و تابیعین[5] بەبەتاڵیان داناوە لەو رووەوە نەهیكردن بەڕەهایی فەساد دەخوازێ.

---

المهذب ٦٤/١. تێیدا هاتووە: "دروست نیە لە زەویەكی زەوتكراودا نوێژ بكا، لەبەرئەوەی مانەوە تێیدا لە دەرەوەی نوێژدا حەرامە، بۆیە حەرامبوونەكەی لەكاتی نوێژكردندا لەپێشترە، بەڵام ئەگەر نوێژی كرد نوێژەكەی دروستە، چونكە مەنعكردنەكە تایبەت نیە بە نوێژەكە".

[1] بڕوانە: الفروق للقرافي ٨٥/٢. الإحكام في أصول الإحكام، سەرچاوەی پێشوو.

[2] رواه الخمسة إلا النسائي. نيل الأوطار ١٤٨/٢. بلوغ المرام مع سبل السلام ١٨١/١.

[3] المحلى لأبن حزم ٢٧/٤. ئیبن حەزم دەڵێ: حەدیسەكانی نەهیكردن لای گۆڕ و نوێژكردن لە گۆڕستان موتەواتیرن.

[4] كعمر بن الخطاب وعلي بن ابي طالب وابن عباس.. نيل الأوطار ١٤٨/٢.

[5] كإبراهيم النخعي ونافع بن جبير وعمرو بن دينار... بڕوانە: نيل الأوطار... سەرچاوەی پێشوو.

ب– مالیك بە جائیز و نامەكروهی داناوە، لەو رووەوە نەهێكردن لەلای ساغ نەبوەتەوە.

ج– شوری و ئەوزاعی و ئەبوحەنیفە و شافیعی ئەوانەی هاوڕایانن[1] وتویانە نوێژكردن لە گۆڕستان دروستە بەڵام كەراهەتی هەیە، لەبەرئەوەی نەهێكردن فەساد ناخوازێ.

**زاڵكردن:**

أ– سەبارەت بە نوێژكردن لە زەویی زەوتكراو یان ماڵی زەوتكراودا، یان ئەوەتا نوێژخوێن زەوتكار نیە بەوەی رێبوار یان میوان یان ناچار بێ و لە كاتی نوێژدا رێی لەو شوێنە زەوتكراوە كەوتوە و نوێژی تێدا كردوە. لەم حاڵەتەدا پێویست نیە نوێژەكەی بەبەتاڵ دابنرێ لەو رووەوە پەیوەندی نیە لەنێوان نوێژەكە و بوونی ئەو بەشێوەیەكی كاتی لەو شوێنەدا و ئەو لە تاوانی زەوتكردنەكە بێبەرییە.

بەڵام ئەگەر نوێژخوێنەكە خۆی زەوتكارەكە بێ و بەئەنقەست كاری زەوتكردنەكەی كردبێ و پێی رازی بێ، ئەوكاتە نوێژی بۆ نیە تا حوكمی دروست یان فەسادی بەسەردا دەدرێ، لەبەرئەوەی نوێژی راستەقینە كە لای خوا مەبەستە ئەوەیە نوێژخوێن لە خراپە بگرێتەوە، وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿... إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ ...﴾[2]. ئەوەیش روونە زەوتكردن لە گەورە مونكەرەكانە.

ب– حەجكردنیش بە ماڵی نامەشروع هیچ روویەك بۆ بەبەتاڵدانانی نابینم، لەبەرئەوەی پاش گەیشتنی بە شاری مەككە ئەو ئایەتە دەیگرێتەوە كە خوا

---

[1] نيل الأوطار ٢/١٤٨–١٤٩، بلوغ المرام مع سبل السلام ١/١٨١.

[2] العنكبوت: ٤٥

ئەفەرموێ: ﴿... وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً ...﴾[1]، کە توانای کرداریی مەشروعی بۆ بەدیدێ بەچاوپۆشین لە نامەشروعیی وەسیلەکە، ئەوکاتە حەجی لەسەر واجب دەبێ، جا ئەگەر ئەنجامی دا و سەرجەم روکن و مەرجەکانی لەبەرچاو گرت ناکرێ حوکمی بەتاڵی بەسەردا بدرێ.

ج– لەبارەی نوێژکردن لە گۆڕستان: ئەگەر عیللەتی نەهیکردنەکە پیسیی شوێنەکە بێ ئەوا هیچ کێشە لەوەدا نیە کە بە دروست دانەنرێ، لەبەرئەوەی پاکوخاوێنی لە مەرجەکانی دروستییە. ئەگەریش عیللەکە پیرۆزکردنی گۆڕستان یان گۆڕێك لە گۆڕەکانی ناوی بێ، وەك لە نەفامیدا باو بوو، یان وەك لەمڕۆدا بۆ هەندێ شوێن و هەندێ خەڵك باوە، ئەسڵ ئەوەیە حوکم بە نادروستیی نوێژ بدرێ مادام نوێژخوێن دوو پیرۆزکردن کۆدەکاتەوە: پیرۆزکردنی شوێنەکە و پیرۆزکردنی پەروەردگار کە سوجدە و رکوعی بۆ دەبا، چونکە ئەوە بەشێك لە شیرکی تێدایە با بە رێژەیەکی کزیش بێ.

بەڵام ئەگەر جگە لە ت پیرۆزکردنی پەروەردگاری هیچیتر لە زەینی نوێژخوێندا نەبێ و شوێنەکەیش پاکوخاوێن بێ، بە بڕوای من نوێژەکە دروستە و هیچ ڕوویەك نیە بۆ حوکمدان لەسەری بەبەتاڵی، مادام حوکم بەبوون و نەبوونی لەگەڵ عیللەکەی دەسوڕێ.

---

[1] آل عمران: ٩٧

## خواستی چوارەم:
## ڕەها و بەند و کاریگەرییان لەسەر جیاوازیی ئەحکام

ڕەها (المطلق) و بەند (المقید) کاریگەریی گەورەیان لەسەر جیاوازیی شەرعزان هەیە، لەو ڕووەوە ئیعتیباری ڕەها لای هەندێکیان بەڕەهایی ماوەتەوە و لای هەندێکیتریان بەگوێرەی بەڵگەیەك بە بەندێك سنووردار کراوە.

بۆ زیادە ڕوونی و کەڵك، وردەکاریی ئەم بابەتە بەسەر دوو لقدا دابەش دەکەین، بەشێوەیەك یەکەمیان حەقیقەتی ڕەها و بەند و حوکمەکانیان، دووەمیشیان حوکمەکانی لەفزێك کە لە دەقێکدا بە ڕەها و لە دەقێکدا بە بەند هاتووە، لەخۆ دەگرێ.

### لقی یەکەم:
### حەقیقەتی ڕەها و بەند و حوکمەکانیان

ڕەها و بەند دوو جۆرن لە جۆرەکانی تایبەت و هەریەکەیان بەرانبەر ئەویتریانە.

ڕەها (المطلق): لەفزێکە ئاماژەیە بۆ تاك یان کۆمەڵە تاکێکی باو، کە قەیدێکی سەربەخۆی پێوە نەبەستراوە کە لە باویەکەی کەم بکاتەوە. وەك: شایەت، بەخێوکەر (وەلی)، تاوان، سزا، ڕۆژان... ئەمانە و هەر لەفزێکیتر کە ئاماژەیە بۆ ئەوی وەك باو بۆی دانراوە. هەروەها لە وەسف یان مەرج یان شوێن یان کات یان شتێکی لەو جۆرەدا نەبەستراوەتەوە.

بەند (المقیّد): لەفزێکە ئاماژەیە بۆ تاك یان کۆمەڵە تاکێکی باو، بەڵام قەیدێك یان زیاتری پێوە بەستراوە کە لە باویەکەی کەم کردۆتەوە، وەك: شایەتی دادپەروەر،

بەخێوکەری ڕێنوێنیکەر، شایەتیی ساختە، تاوانی کوشتن، سزای قیساس، ڕۆژانی لەدوای یەك..

ئاستەکانی بەند لەڕووی زۆر و کەمیی قەیدەکانەوە جیاوازن کە هەندێ جار قەیدەکان لە یەکێك زیاترن، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجاً خَيْراً مِّنكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُّؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَاراً﴾[1].

## حوکمی ڕەها:

ئاشکرایە لەفزێك ئەگەر لە دەقێکدا بەڕەهایی هات، ئەسڵ وایە هەر بەهەمان ڕەهایی کاری پێ بکرێ تا بەڵگەیەك پەیدا نەبێ لەسەر بەستنەوەی.

واتە لەکاتی تەفسیری دەقدا، موفەسیر یان موجتەهید یان قازی... بۆیان نیە لە بڵاویی لەفزی ڕەها کەم بکەنەوە تا بەڵگەیەك پەیدا نەبێ لەسەر بەندکردنی، بەشێوەیەك بسەلمێ مەبەست لە لەفزە باوەکە دانەیەکی دیاریکراوە.

بۆ نموونە وشەی (ايام) ڕەها لە قەیدی بەدوای یەکداهاتن هاتووە لەو ئایەتەی ئەفەرموێ: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ...﴾[2]، بۆیە هەر بەڕەهاییەکەی دەمێنێتەوە تا بەڵگەیەك پەیدا دەبێ لەسەر بەستنەوەی، چونکە جۆرێکە لە جۆرەکانی تایبەت و بەشێوەیەکی گومانبڕ ئامارەیە بۆ ئەوەی بۆی دانراوە. ماناکەیشی ئەوەیە هەرکەس لە ڕۆژانی مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا بەڕۆژوو نەبێ جا لەبەر نەخۆشی بێ یان سەفەر یان هەر عوزرێکیتر، واجب نیە لەسەری ئەو ڕۆژانەی قەرزارە بەسەریەکەوە بگرێتەوە، بەڵکو بۆی هەیە بەسەریەکەوە، یان بەجیا بیانگرێتەوە.

بەهەمان شێوە وشەی (نسائکم) بەڕەها لە قەیدی چوونەلا (دخول) باس کراوە لە

---

[1] التحريم: ٥

[2] البقرة: ١٨٤

ئایەتی ﴿...وَأُمَّهَاتُ نِسَآئِكُمْ...﴾.[1]، واتە دایکانی ژنەکانتان لەسەرتان حەرام کراون و بەڵگەیەك ساغ نەبووەتەوە لەسەر بەستنەوەی بە مەرجی چوونەلا. بەگوێرەی ئەم رەهاییەیش تەنها بە بەستنی گرێبەندی هاوسەرگیریی کچ، دایکی کچەکە (خەسووی پیاوەکە) لە مێردی کچەکەی حەرام دەبێ. ئەگەر بەر لە بەزاوابوون تەڵاقی دا بۆی نیە دایکی مارە بکا، لەبەرئەوەی لەگەڵ مارەکردنی کچەکەیدا بۆ هەتاهەتایە لێی حەرام بووە.

هەروەها وشەی (أزواجاً) بە رەها لە قەیدی چوونەلا باس کراوە لە ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً ...﴾[2]..

لە روانگەی ئەم رەهاییەوە پێویست ژنی مێرد مردوو لەو ماوە دیاریکراوەدا چاوەڕوان بکا، جا چ مێردەکەی سەرجێیی لەگەڵ کردبێ یان نا[3].

بەهەمان شێوە ئایەتەکانی تایبەت بە میرات کە بەرەها هاتوون سەبارەت بە میراتگرتنی ژن و مێرد لە یەکتر، جا ئەگەر یەکێکیان پاش هاوسەرگیری و پێش سەرجێیی مرد، لە روانگەی رەهایی دەقەکەوە ئەویتریان میراتی لێ دەبا.

بەڵام ئەگەر بەڵگەیەك هەبوو لەسەر بەستنەوەی رەها و لادانی لەو مانایەی بەرواڵەت لێی مەبەستە، ئەوکاتە مەدلولەکەی بەند دەبێت و باوی لە تاکەکانیدا نامێنێ، وەك لەفزی (وصیة) کە لە ئایەتی ﴿...مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ

[1] خوای گەورە لەبارەی ئەوانەی بەئەبەدی مارەکردنیان حەرام کراوە ئەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ ...﴾﴿النساء: ٢٣﴾

[2] البقرة: ٢٣٤

[3] بەو مەرجەی دووگیان نەبێ ئەگینا بەلای جمهورەوە عیددەکەی بوونی منداڵەکەیەتی، بەلای غەیری ئەوانیشەوە بە دوورترین ماوە لە دانانی سك و ئەو عیددەیەی لە ئایەتەکەدا باس کراوە، یاسادانەری عێراقیش لە مادەی (٣/٤٧)دا کاری بەمە کردوە.

دێن...﴾[1] و هەروەها لە هەندێ ئایەتیتردا بە ڕەها هاتووە. بەڵام بەڵگە پەیدابووە لەسەر بەستنەوەی لە سنووری سێ-یەکدا، لەبەرئەوەی ساغ بووەتەوە پێغەمبەر(ﷺ) نەهیکردوە لە وەسیێتکردن بە زیاتر لە سێ-یەکی میرات کاتێ بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسی گوت: ((الثلث والثلث كثير))[2]، بەوەیش لە ڕوانگەی کارکردن بە قسەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) مەبەست لە وەسیێت لەو ئایەتە پیرۆزەدا وەسیێتی بەند (موقەیەد)ە بە سنووری سێ-یەک، لەبەرئەوەی بەپێی ئەو سەرپشککردنەی لە ئایەتی ﴿...وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ...﴾[3]دا هاتووە، ئەرکی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونکردنەوەی قورئانی پیرۆزە.

## حوکمی بەند:

وەك چۆن پێویستە دەست بە ڕەهایی ڕەهاوە بگیرێ تا بەستنەوەی دەسەلمێ، بەهەمان شێوە پێویستیشە کار بە بەند بکرێ و ڕەچاوی بەستنەوە بکرێ نەك کار بە ڕەها و پشت لە قەید بکرێ، تابەڵگەیەك لەسەر هەڵوەشانەوەی ئەو بەندە پەیدا دەبێ.[4]

لەوانە بۆ نموونە لەدوای یەکیی دوو مانگەکەیە لە کەفارەتی کوشتنی بەهەڵەدا وەك لە خوا ئەفەرموێ: ﴿... فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ ...﴾[5]، هەروەها لە کەفارەتی (ظهار)دا وەك ئەفەرموێ: ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ

---

[1] النساء: ١١

[2] روي عن سعد بن أبي وقاص(رضي الله عنه) أنه قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَنَا ذُو مَالٍ-وَفي رواية كثير المال- لا يرثني إلا إبنة واحدة، أفأتصدق بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: لَا. قلت إفأتصدق بشطره (نصفه)؟ قَالَ: لا. فقلت: أفأتصدق بثلثه؟ قَالَ: نَعَمْ، الثُّلُثَ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ يَتَكَفَّفُونَ الناس.. سبل السلام ١٣٧/٣.

[3] النحل: ٤٤

[4] ارشاد الفحول للشوكاني ص١٦٤.. شمس الأصول ٧٧/١.

[5] النساء: ٩٢

أن يَتَمَاسَّا ...﴾[1].

لەم دوو گوناهشۆری (کەفارەت)ەدا دەق ئەندازەی ماوە زەمەنیەکەی دیاری کردوە و بەندی کردوە بە وەسفی بەدوایەکداهاتن (التتابع)ەوە، بۆیە پێویستە کار بەو قەیدە بکرێ تا بەڵگەیەك پەیدا دەبێ جیاواز لەوە بسەلمێنێ. هەروەك ناکرێ ئەو ئەندازەی دیاری کراوە کە دوو مانگە کەم بکرێتەوە. هەروەك دروست نیە ئەو وەسفەی پێی بەستراوەتەوە پشتگوێ بخرێ کە بەدوای یەکداهاتنەکەیە لەکاتی ئەنجامدانیدا، ئەگینا کەفارەتەکە ئەرکەکە لە کۆڵ ناخا.

بەلام ئەگەر بەڵگەیەك هەبوو لەسەر هەڵوەشاندنەوەی قەیدەکە و لەبەرچاونەگرتنی، ئەوا بەندەکەیش هەمان حوکمی رەهاکەی دەبێ کە لە بنەرەتدا قەید نەکراوە، وەك وشەی (ربائبکم) کە لە ئایەتی ﴿...وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ...﴾[2] دا (حجور)ی بەستۆتەوە. ئەم قەیدە (فی حجورکم) (واتە: لای ئێوە بژین) بەڵگە لەسەر هەڵوەشاندنەوە و لەبەرچاونەگرتنی پەیدا بووە، ئەویش ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿...فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ...﴾[3]، بەم پێیەش حەڵاڵە رەبیبە (کچی ژن لە مێردی پێشووی کە لە ماڵی مێردە تازەکەی گەورە بووە) مارە بکرێ ئەگەر دایکی بەر لە چوونەلا تەلاق بدات، لەبەرئەوەی قەیدی موعتەبەر لەو ئایەتە پیرۆزەدا چوونەلایە، جا چ لەلاژیان (حجور) بەدیهاتبێ یان نا، کە بوون و نەبوونی یەکسانە، بەپێچەوانەی قەیدی چوونەلا کە موعتەبەرە.

نهێنیی حەرامکردنی دایکی ژنیش لە هەمان ساتی گرێدانی عەقدی هاوسەرگیریی کچەکەیدا و حەرامنەکردنی کچ بە هاوسەرگیریی دایکی تا چوونەلا روونەدات، ئەوەیە مێرد پێویستی بە دایکی ژنەکەی هەیە لە ساتی هاوسەرگیریکردنەوە لەرووی

---

[1] المجادلة: ٤
[2] النساء: ٢٣
[3] النساء: ٢٣

چاودێری و ئەنجامدانی کاروبارەکانی تایبەت بە پێویستیەکانی ئەو پرۆسەیە، بەو پێیەش مێردەکە پێویستی بە تێکەڵبوون دەبێ لەگەڵ دایکی ژنەکەی بەنهێنی و بەئاشکرا، لەم روانگەوە شەرعی خوا هەر لەگەڵ مارەکردنی کچەکەی، دایکی بەئەبەدی لە زاواکەی حەرام کردوە، بەپێچەوانەی مارەکردنی دایك، لەبەرئەوەی پێویستی بە یارمەتی و چاودێریی کچەکەی نیە.

جیاوازیی بۆچوونەکان لەمەڕ کارکردن بە رەها بەو رەهاییەی هاتووە و لە بەستنەوەی بەقەیدێك کە بەڵگە لەسەر ئەو بەستنەوەیە هەیە، کاریگەری گەورەی لە جیاوازیی شەرعزان لە هەندێ ئەحکامی شەرعیدا هەبووە، لەوانە جیاوازی لەبارەی شیرپێدان لەرووی ئەو ئەندازەیەی (شیردەر لە شیرپێدراو) حەرام دەکا پاش ئەوەی دەقەکە بەرەها لەو دیاریکردنە هاتووە وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿...وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ...﴾[1]، واتە ئەو دایکانەتان لێ حەرام کراوە کە شیریان داونەتێ. هەروەها بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ((يحرم من الرضاع ما يحرم من النسب)). (واتە: ئەوەی بە نەسەب حەرام دەبێ بە شیریش حەرام دەبێ).

أ- حەنەفی[2] و مالیکی[3] و حەنبەلیەکان لە ریوایەتێکدا[4]، هەروەها هەندێ لە هاوەڵان و شوێنکەوتوان بۆ ئەوە چوون زۆری و کەمیی شیرپێدان لە حەرامکردندا

[1] النساء: ٢٣

[2] لە: فتح القدير وتكملته والهداية شرح بداية المبتدي (٤٤١/٣)دا هاتووە: "ئێمە فەرمایشتی خوا ﴿وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ﴾ و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: ((يحرم من الرضاع ما يحرم من النسب))مان هەیە. بەبێ جیاکردنەوە لە کیتاب و سوننە. زیادە خستنەسەر قورئانیش بە یەکینە هەواڵ (خبر الواحد) جائیز نیە".

[3] لە: الشرح الصغير مع الصاوي (٤٧٧/١- ٤٧٨)دا هاتووە: "شیردان حەرام دەکا ئەگەر هاتوو شیری ئافرەتێك، با مردوو یان بچوکیش بێ و توانای جووتبوونی نەبێ، گەیشت بە گەرووی شیرەخۆرێك نەك گەورە با یەك مژیش بێ، بە زیادەرەویی شافیعیەت بەرپەرچ دراوەتەوە کە دەڵێن بە پێنج شیرپێدانی جیا نەبێ حەرام ناکا".

[4] لە: المغني لإبن قدامة (٥٣٥/٧)دا هاتووە: "لە ئەحمەدەوە ریوایەتێکی دووەم هەیە کە شیردان کەم و زۆری حەرام دەکا، ئەوە لە عەلی و ئیبن عەباس ریوایەت کراوە و سەعید بن مسەیب و مالیك و ئەوزاعی و ئەهلی را هەر وایان گوتوە و ئەوەیان کردۆتە بەڵگە کە خوا ئەفەرموێ: ﴿...وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ
←

هیچ جیاوازییان نیە، لەبەرئەوەی دەق لە قورئانی پیرۆز و سوننەدا بەرەها لە هەر وردەکاری و بەستنەوەیەك هاتووە، رەهایش لە تایبەتە و دیلالەتێکی گومانبڕ هەیە بۆ حوکمەکە، بۆیە بەبێ بەلگەیەکی گومانبڕ نابێ لە ماناکەی لابدرێ، ئەوەیش نەسەلماوە، هەروەها لەبەرئەوەی بەستنەوەی رەها زیادکردنە، زیادکردن بۆ قورئانیش بە سوننەتی تاکینە (ئاحاد) دروست نیە.

ب- جمهوری شەرعزان لەگەڵ بەستنەوەی ئەو رەهایەن لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە بەو حەدیسانەی لە پێغەمبەرەوە گێڕدراونەتەوە و ئەو ئەندازەیە لە شیر دیاری دەکەن کە حەرام دەکا، لەبەرئەوەی یەکێك لە ئەرکەکانی سوننە تایبەتکردنی گشتی و بەستنەوەی رەهایە. لەوانەی کاریان بەم بەستنەوەیە کردوە: شافیعی[1] و زاهیری[2] و حەنبەلیەکان لە ریوایەتە بەناوبانگەکەدا[3]. دیاریکردن بەلای ئەو شەرعزانەوە ئەوەیە لە پێنج شیرپێدان کەمتر نەبێ. جەعفەری باسیان لەو ژمارەیە زیاتریش کردوە بەگوێرەی ئەو وردەکاریەی لە سەرچاوە فیقهیەکانیاندا هاتووە.[4]

---

وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ...﴾ هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ((یحرم من الرضاع ما یحرم من النسب)).

[1] لە: شرح التحریر مع الشرقاوي (٢/٣٢٥)دا هاتووە: "حەرامبوونی جێگیر نابێ تا شیرەکە هی ئافرەتێك نەبێ کە تەمەنی گەیشتبێتە نۆ ساڵ، بگاتە گەروو (الجوف)، شیرەخۆرەکەیش دوو ساڵی تەواو نەکردبێ، هەروەها شیرخوارندنەکە لە ژیانی سەقامگیریدا بێ، واتە بەشیری مردوو ناسەلمێ، هەروەها دەبێ پێنج شیرپێدانی دڵنیا بێ، لەوە کەمتر هیچ کاریگەریەکی نیە و هیچ جێی گومانیش نیە".

[2] لە: المحلی (٩/١٠)دا هاتووە: "بە کەمتر لە پێنج شیردانی دڵنیا حەرام نابێ، لەوە کەمتر هیچ کاریگەریەکی نیە و هیچ جێی گومانیش نیە".

[3] لە: المغني (٧/٥٣٥)دا هاتووە: "ئەوەی پەیوەندی بە حەرامکردنەوە هەیە پێنج شیرپێدان و بۆ سەرەوەیە، ئەمە راستەکەیە لە مەزهەبدا".

[4] لە: المختصر النافع (ص٢٠٠)دا هاتووە: "لە شیرپێدان لە هۆکانی حەرامکردنە، مەرجەکانیشی چوارن:
١- شیرەکە لە مارەکردنەوە بێ، ئەگەر لەخۆیەوە هات یان لە زیناوە بوو بڵاو نابێتەوە.
٢- برەکەی، ئەوەندەی گۆشت پتەو و ئێسك توند بکا، یان شیرپێدانی شەو و رۆژێك بێ، هیچ حوکمێك بۆ خوار دە ژەم نیە.
٣- لە ماوەی دوو ساڵی یەکەمی تەمەندا بێ.
←

لەم خستنەڕووەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە سەرچاوەی ناکۆکییەکە تێکیگرانە لەنێوان ئەو رەهاییەی لە قورئانی پیرۆز و ئەو سنووردارکردنەی لە هەندێ حەدیسی پێغەمبەردا هاتووە، لەوانە ئەوەیە لە عائیشە (رەزای خوای لێبێ)وە ریوایەت کراوە: ((لا تحرم المصة ولا المصتان))، (واتە مژتێك و دووان حەرام ناکا). هەر لەوەوە هاتووە: ((وکان فیما نزل من القرآن عشر رضعات معلومات یحرمن ثم نسخن بخمس معلومات)). (واتە: لەوەی لە قورئاندا دابەزی دە شیرپێدانی دڵنیا حەرامیان دەکرد، پاشان نەسخ کرانەوە و بوو بە پێنجی دڵنیا). هەروەها لەوەوە دەگێڕنەوە: "پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی بە ژنەکەی ئەبوحوزەیفە کرد پێنج جار شیری دایە سالم و بەو شیردانە ئیتر دەچووە ژوور بۆ لای". [1]

ئەوانەی رەهایی قورئانیان بەم حەدیسانە و هیتر بەستۆتەوە ئەو برە لە شیرەیان دیاری کردوە کە حەرام دەکا و بەگوێرەی بەستنەوەکە کاری کردوە. ئەوانەیش وتویانە رەهای قورئان بە حەدیسی تاکینە قەید ناکرێ بەو رەهاییەی هاتووە کاریان کردوە و وتویانە کەم و زۆری شیر دەبێتە هۆی حەرامکردنی هەمیشەیی.

من زیاتر بەلای پێنج شیرپێدانەکەدا دەچم، لەبەرئەوەی ئەو حەدیسانەی باسی دەکەن لەڕووی هێزی حوجیەتەکەوە یەکتر بەهێز دەکەن، هەروەها لەبەرئەوەی قەیدکردن نەسخکردنەوە نیە بەڵکو روونکردنەوەیە، بۆیە دروستە رەهای قورئان بە حەدیسی تاکینە روون بکرێتەوە.

---

٤- شیرەکە لە یەك نێرینە بێ، واتە دوو منداڵ کە لەیەك شیر بخۆنەوە حەرام دەبن با شیردەرەکەیش جیاواز بێ". لا١٦٥

[1] ئیبن روشد لە (بدایة المجتهد ٢/٢٩)دا دەڵێ: "هەرچی ئەندازەی ئەوەیە حەرام دەکا هەندێ گوتویانە دیاریکردنی ناوێ، ئەوەیش مەزهەبی مالیك و هاوەڵانیەتی.. کۆمەڵێکیش رایان وابووە ئەو ئەندازەیە دیاری بکرێ کە حەرام دەکا، هۆی جیاوازیشیان تێکگیرانی قورئانە لەگەڵ ئەو حەدیسانەی لەبارەی دیاریکردنەوە هاتوون".

## لقى دووەم:
## رێکخستنی رەها لەسەر بەند

زانایانی ئوسولّ و فیقه لە سەرپێوکردنی تەواو بۆ ئەو دەقانەی لەفزێکی رەها و یەکێکیتری بەندیان تێدایە بەبێ بوونی بەلگەیەك ئاماژە بێ بە پێویستیی کارکردن بەیەکێکیان، بۆیان دەرکەوتوە وێنەکانیان لەم حاڵەتانەدا کورت بوونەتەوە:

١- یەکگرتنی هەردوو حوکم و هۆکە لە هەردوو دەقەکە و رەهاکردن و بەستنەوە (الاطلاق و التقیید) لە حوکمەکەدا.

٢- یەکگرتنی هەردوو حوکم و هۆکە لە هەردوو دەقەکە و رەهاکردن و بەستنەوە لە هۆکەدا.

٣- جیاوازیی هەردوو حوکم و هۆکە لە هەردوو دەقەکە و رەهاکردن و بەستنەوە لە حوکمەکەدا.

٤- جیاوازیی هەردوو حوکمەکە و جیاوازیی هۆکە و رەهاکردن و بەستنەوە لە حوکمەکەدا.

وەك سەرەتا لەسەر رێکخستنی رەها لەسەر بەند (حمل المطلق علی المقید) رێك کەوتوون، بەلاّم سەبارەت بەو حاڵەتانەی ئەم رێکخستنەیان تێدا دروستە رایان جیاوازە. ئەمەیش سەری کێشاوە بۆ جیاوازییان لە هەندێ ئەحکامی لاوەکیدا، لەبەرئەوەی جیاوازیی تێڕوانین لە ئوسولّدا جیاوازبوون لەو حوکمە فەرعیانەی لەسەر بینا دەکرێ کە لێیان دەکەونەوە.

لەبەرئەوە لە خوارەوە باس لە هەڵوێستی زانایان دەکەین لەبارەی رێکخستنی رەها لەسەر بەند لەو شێوانەدا کە باس کران:

## وێنەی یەکەم: یەکگرتنی حوکم و هۆ و ڕەهاکردن و بەستنەوە لە حوکمدا:

هەندێ زانا باسیان لە ڕێکەوتن لەبارەی ڕێکخستنی ڕەها لەسەر بەند لەم بارەدا کردوە. شەوکانی[1] دەڵێ: "هەریەك لە قازی ئەبوبەکر ئەلباقلانی و قازی عەبدولوەهاب و ئیبن فورك و ئەلکیا ئەلتەبەری و هیتر باسیان لەوە کردوە لەم بەشەدا کۆکبوون هەیە". هەروەها سالمی ئیبازیش[2] پاڵپشتی ئەم کۆکبوونەی کردوە و هەمان ڕای هەبووە. هەروەها ئامەدی هەمان ڕای هەبووە و دەڵێ: "ئەگەر حوکمی هەردووکیشیان جیاواز نەبێ، ئەوا لەوە بەدەر نین یان هۆکەیان یەکدەگرن یان یەکناگرن، ئەگەر هۆکەیان یەکی گرت، ئەوا لەفزەکە یان ئاماژە دەبێ بۆ سەلماندنیان یان بۆ ڕەتکردنەوەیان، ئەگەر یەکەمیان بوو وەك ئەوەی لە زیهاردا بڵێ: کۆیلەیەك ئازاد بکەن، پاشان بڵێ: کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکەن، نەمانزانیوە ناکۆکیەك هەبێ لەوەی ئالێرەدا ڕەهاکە لەسەر بەندەکە ڕێك دەخرێ".[3]

پاش بەدواداچوون بۆم دەرکەوت بوونی ئەو کۆکبوونە و نکوڵیکردن لە بوونی ڕاجیایی تێیدا، ڕاست نیە، چونکە لەو ڕووەوە ئەبوحەنیفە و شافیعی ڕایان جیاواز بووە، کە ئەوە جیاوازبوونیانی لە هەندێ مەسەلەی فەرعیدا لێ کەوتۆتەوە. بەلگەیش ئەو قسەیەی زنجانییە کە لە کتێبی (تخریج الفروع علی الأصول)دا دەڵێ: "ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) و ئەو ئوسوڵناسانەی شوێنی کەوتوون پێیان وابووە ڕەها و بەند ئەگەر لە یەك ڕووداودا هاتن، ڕەها لەسەر بەند ڕێك ناخرێ،

---

[1] بڕوانە: ارشاد الفحول للشوكاني ص١٦٤- ١٦٥.

[2] شمس الأصول مع طلعة الشمس للسالمي الأباضي. ٨١/١.

[3] بڕوانە: الإحكام في أصول الأحكام للآمدي (١٦٣/٢. تێبینی دەکرێ ئامەدی کۆکبوونی بەستۆتەوە بەوەی ڕەها و بەند ئەرێ (مثبت) بن بەڵام پاشتر کۆکبوونەکەی گشتاند و دەڵێ: "بەڵام ئەگەر ئاماژە بێ بۆ نەرێبوونیان یان نەهیلێکرانیان، ئەمەیش ناکۆکی نیە لەوەی کار بە مانایان دەکرێ و کۆدەکرێنەوە، ئاشکرایشە کۆکرنەوە بە ڕێکخستنی ڕەها لەسەر بەند نەبێ، نابێ". هەروەها تەلمەسانی لە مالیکی باس لە بوونی کۆکبوون دەکا. مفتاح الوصول ص١٠٧.

لەبەرئەوەی قسەی خوای دانا بەگوێرەی خوتسـنە قسـەکە رێك دەخـرێ، خواسـتی رەهایش رەهایی و هی بەندیش بەستنەوەیە.. شافیعی (رەحمـەتی خـوای لـێبێ) دەڵـێ: رەها بەپێی بەند رێك دەخرێ، لەبەرئەوەی خوای دانا کاتێ قسە زیاد دەکا بۆ زیـادە روونکردنەوە دەیکا، بۆیە هەڵوەشاندنەوەی ئەو زیادەیەی بـەباش نـەزانیوە بـەڵکو وا دەکا وەك ئەوەی پێکەوەی گوتبن، هەروەها لەبەرئەوەی واجبکاری بەنـد دڵنیـایی و واجبکاری رەها شیمانەیە".[1]

مالیکی[2] و حەنبەلیەکان[3] لەگەڵ شافیعی کۆکن لە رێکخستنی رەها لەسەر بەند لەم حاڵەتەدا.

لەو مەسەلە خیلافیانەیش لەم ئەسڵە بوونەتەوە ئەمانەن:

أ- ئەبوحەنیفە و شافیعی رای جیاوازیـان دەربـارەی شـایەتیدانی فاسـیق هەیـە، شافیعی و ئەوانەی هـاوڕاین رایـان وایـە هاوسـەرگیری بـە ئامـادەبوونی دوو شـایەتی فاسیق دانامەزرێ لەبەر ئەو حەدیسەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەڵـێ: ((لا نكـاح إلا بـولي وشـاهدي عـدل)).[4]، کـە حەدیسـەکە بـەڕوونی شـایەتیدانی بـە دادپەروەریـەوە بەسـتۆتەوە، (دەقەکـە) بـە گـوتراوی ئامـاژەیـە بـۆ دروسـتیی هاوسـەرگیری بـە دوو شایەتی دادپەروەر، بە مەفهومەکەیشی ئاماژەیە بۆ ناردوستیی دوو شایەتی فاسیق.

بەڵام ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین رایان وایـە هاوسـەرگیری بـەئامادەبوونی دوو شـایەتی فاسـق دادەمـەزرێ، لەبەرئـەو حەدیسـەی دەڵـێ: ((لا نكـاح إلا بـولي

---

[1] تخريج الفروع ص١٣٤ و پاشتر.

[2] مختصر التحرير ص١٤

[3] مختصر التحرير ص١٤

[4] الحديث رواه عن عمران بن حصين عن النبي (ﷺ) الإمام أحمد في رواية ابنه عبدالله وباللفظ نفسه أخرجه البيهقي من رواية عائشة. وقال الشافعي (رحمه الله) روي عن الحسن ابن أبي الحسن، أن رسول الله(ﷺ) قال: ((لا نكاح إلا بولي وشاهدي عدل))، كما رواه البيهقي بهذا اللفظ. السنن الكبرى للبيهقي ١٢٥/٧-١٢٦، الطبعة الأولى.

وشهود)).[1]، که لێرەدا دەقەکە بەرەهایی هاتووە و هەر بەرەهاییەکەیشی کاری پێ دەکرێ.[2]

ب- هەردوو پێشەوا سەبارەت بە ویلایەتی فاسقیش ناکۆکن، شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین رایان وایە فاسق ناتوانێ وەك خزم ببێتە وەلی لە هاوسەرگیریدا، لەبەر ئەو حەدیسەی ئەفەرموێ: ((لا نكاح إلا بولي مرشد وشاهدي عدل)).[3]، لەبەرئەوەی حەدیسەکە بە گوتراوەکەی ئاماژەیە بۆ دروستیی هاوسەرگیری بە وەلیی رابەر (الولی المرشد)، بە مانا واتە مەفهوم)ـەکەیشی ئاماژەیە بۆ ئەوەی کارەکە بە وەلی فاسق ناکرێ.

ئەبوحەنیفە رای وایە فاسق وەك خزم دەتوانێ بێتە وەلی لە هاوسەرگیریدا، لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((لا نكاح إلا بولي وشهود))، کە لێرەدا دەقەکە بەرەها هاتووە بۆیە پێویستە بەرەهاییەکەی کاری پێبکرێ.

وای دەبینم ناکۆکیی نێوان شافیعی و ئەبوحەنیفە لە رێکخستنی رەها لەسەر بەند بۆ ناکۆکییان لەسەر حوججیەتی (مەفهوم) دەگەڕێتەوە. شافیعی باوەڕی بە حوججیبوونی مەفهوم هەیە، بەڵام ئەبوحەنیفە رای وانیە، وەك لەمەدوا روون دەکرێتەوە.

### وێنەی دووەم: یەکگرتنی هەردوو حوکم و هۆکە و رەهاکردن و بەستنەوە لە هۆکەدا:

وەك ئەوەی پێشتر هەندێ لە زانایان باسیان لە کۆکبوون کردوە لەسەر رێکخستنی رەها لەسەر بەند، لەوانە ئامەدی.[4] بەڵام زانراوە کە لەوبارەوە ناکۆکیش

---

[1] الحديث رواه ابو بردة بن أبي موسى عن أبيه قال رسول الله (ﷺ) ((لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ)). رواه احمد والأربعة وصححه ابن المديني والترمذي وابن حبان واعله بارساله. سبل السلام ٣/١٩٩.

[2] بداية مع الهداية وشرح فتح القدير ٣/١٩٩.

[3] أخرجه البيهقي من طريق الشافعي عن ابن عباس. راجع السنن الكبرى ٧/١١٢.

[4] بروانه: الأحكام في أصول الأحكام ٢/١٦٣.

لـەنێوان حەنەفیـەت و ئەوانـەی هاوڕایـانن و شـافیعیەت و ئەوانـەی هاوڕایـانن هەیـە. حەنەفیەت پێی وایە ڕەها لەسەر بەند ڕێك ناخرێ[1] لەبەرئـەوەی ئەسـڵ پابەندبوونـە بەوەی لەلایەن شەرعدانەرەوە هاتووە لـە دیلالـەتی لـەفزەکانی لەسـەر حوکمـەکان، واتە ڕەها بەرەهایی و بەند بەبەندیی خۆی وەردەگیرێ، لەبەرئەوەی هەر دەقێك بـۆ خـۆی بەلگەیـەکی سـەربەخۆیە. بەسـتنەوە (التقییـد) بەرتەسـککردنەوەیەکە بـەبێ فەرمانی شەرعدانەر(واتە خـوا). هـەروەها لەبەرئـەوەی ڕێکخسـتنەکە بـۆ نەهێشـتنی تێکگیرانە لەنێوان دوو دەقەکەدا، جا ئەگەر هیچ ناکۆکیەك لەنێوانیاندا نەبوو ئەوا هیچ ڕێگرێـك نیـە حوکمێـك زیـاتر لـە هۆیـەکی هـەبێ، وەك گواسـتنەوەی خاوەنـدارێتی (الملکیە)، کە زۆر هۆی هەیە و بەهەریەکەیان جێگیر دەبێ.[2]

شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین لەگەڵ ڕێکخستنی ڕەهـان لەسـەر بەنـد و پێیـان وایـە بەنــد ڕوونکردنــەوەی ڕەهایــە، ئــەویش چــونکە ڕوودانــی نــاکۆکی لــەنێوانیان حاشاهەڵنەگرە، لەبەرئەوەی لەیەك بابەتدا هاتوون، یەك بابەتیش ناکرێ لە یەك کاتدا هەم بەند و هەم ڕەهایش بێ، هەربۆیە پێویستە بەند بکرێتە ئەسڵێك کە ڕەهـای پـێ ڕوون بکرێتەوە، لەبەرئەوەی ڕەها لە بەستنەوە بێدەنگە و بەندیش گوێ دەکا، بۆیـە ئەو لەپێشترە کە ئەسـڵ بـێ، چـونکە ڕێکنەخسـتن (بـەپێی بەنـد) بێسـوودیی قەیـد دەگەیەنێ، دەقەکانی شەرعدانەریش لە گاڵتەوگەپەوە دوورن.

ئەم ناکۆکییە کاریگـەری هـەبووە لـە جیاوازییـان لـە هەنـدێ ئـەحکامی فیقهیـدا، شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین پێیان وایە سەرفیترەی کۆیلەی کـافر لەسـەر گەورەکـەی واجب نیە، بەڵکو تەنها هی کۆیلەی موسڵمانی واجبە. بـەڵام حەنەفیـەت و و ئەوانـەی هاوڕایانن بۆ کۆیلەی کافر و موسڵمان وەك یەك بە واجبی دەزانن.

---

[1] بڕوانە: التحریر مع التقریر والتحبیر ١/٢٩٦.

[2] شرح التوضیح علی التنقیح لصدر الشریعة ١/٢٧٥– ٢٧٦.

ئەسڵ لەم مەسەلەیەدا تێکگیرانی دوو حەدیسە یەکێکیان رەها و ئەویتریان بەندە، هەندێکیان رەهایان پێش بەند خستوە و بەو گوێرەیە کاریان کردوە، هەندێکیشیان رەهایان لەسەر بەند رێکخستوە و بەپێی بەستنەوەکە کاریان کردوە. لە ئیبن عومەرەوە دەگێڕنەوە گوتویەتی: ((فرض رسول الله (ﷺ) زكاة الفطر صاعاً من تمر وصاعاً من الشعير على العبد والحر والذكر والأنثى والصغير والكبير من المسلمين، وأمر بها أن تؤدى قبل خروج الناس إلى الصلاة)) متفق عليه.[1]

لێرەدا کۆیلە (عبد)ەکەی قەید کردوە بەوەی موسڵمان بێ، جمهور ئەم رایەیان هەڵبژاردوە.

هەروەها بەبەهەقی لە حەدیسی (عبدالله بن أبي ثعلبة) یان (ثعلبة بن عبدالله) بەبەرزکراوەیی دەگێڕێتەوە: ((أدّوا صاعاً من قمح عن كل انسان ذكر أو انثى، صغيرا أو كبيراً، غنياً أو فقيرا أو مملوكاً، أما الغني فيزكيه الله وأما الفقير فيرد الله عليه أكثر مما أعطى)).[2]

لە ریوایەتێکیتردا: ((أدوا صدقة الفطر عمن تمونون))[3]، لێرەدا دەقەکە بە رەها هاتووە و حەنەفیەکان ئەوەیان پەسەند کردوە.[4]

شایانی گوتنە حەنەفیەکان لە زەکاتی وشتردا لە حەدیسی (في خمس من الآبل شاه) هەروەها حەدیسی (وفي خمس من الإبل السائمة شاة)[5] بەم رێسایەوە پابەند نەبوون ئەگەرچی بابەتەکە یەکە و رەهایی و بەستنەوە (ئیتلاق و تەقیید) لە هۆی حوکمەکەدایە، کە لەوەدا هاوشێوەی شافیعیەکان لەگەڵ رێکخستنی رەهان لەسەر

---

[1] بڕوانە: سبل السلام ٢/١٢٥– ١٢٦.

[2] بڕوانە: سبل السلام ٢/١٣٨.

[3] دار ئەلقوتنی وبەبەهەقی گێڕاویانەتەوە، سەنەدەکەی لاوازە.. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

[4] بڕوانە: المهذب للشيرازي ١/١٦٣. والمغني لإبن قدامة ٣/٥٦. حاشية الدسوقي على الدردير (١/٥٠٥). نيل الأوطار (٤/١٥٤). تخريج الفروع للزنجاني ص١٣٥. الأحكام لأبن دقيق العيد (١/٤٠٥).

[5] بڕوانە: السبب الكبرى ٤/٩٨– ١٠٢ بۆ درێژەی دوو حەدیسەکە.

بەند و زەكاتیان تەنها لە ئاژەڵی ئالیكنەخۆردا واجب كردوە نەك ئالیكدراو (المعلوفە)، بەپێچەوانەی رێساكەیان لە هێشتنەوەی رەها بە رەهاییەكەی.

دەشێ لەباتییان وەڵام بدرێتەوە[1] كە ئەوە لەسەر رێكخستنی رەها لەسەر بەند دانەمەزراوە، بەڵكو لەسەر نەسخ دامەزراوە چونكە بەندەكە پاشتر هاتووە. بەڵام ئەم وەڵامە لەباری راستبوونی دواكەوتنی بەندداپە لە رەها، كاتێ دروستە كە مانای پێچەوانە (مەفهومی موخالەفە) بە حوججە دابنرێ تا تێكگیران بكەوێتە نێو دوو دەقەكە، لەبەرئەوەی ئەوە مەرجی نەسخە، ئەوانیش ئەوە ناڵێن، پاشان ئەگەر گریمان وایش بێ، دیلالەتی گوتراو (مەنتوق) لە مانا (مفهوم) بەهێزترە، بۆیە كاری پێدەكرێ و هۆكە رەها دەبێ.[2]

**وێنەی سێیەم: هەردوو حوكم و هۆكە جیاواز بن، لێرەدا شەرعزان كۆكن لەسەر رێكنەخستنی رەها لەسەر بەند:**

قازی ئەبوبەكری باقلانی و ئیمامی حەرەمەین و ئەلكیا ئەلهیراسی ئەلتەبەری و ئیبن ئەلبورهان ئامەدی و سالمی و ئیبازی و هیتر باسیان لە رێكەوتن لەسەر ئەوە كردوە.[3]

ئەویش وەك وشەی دەستەكان (الایدی) لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا﴾.[4] ، كە لە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ

---

[1] بڕوانە: فتح القدیر ٢/١٧ و پاشتر.

[2] بەڵام هەموو ئەمە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی حەنەفیەت دانیان بە رێكخستنی رەها لەبەر بەند نەناوە، بەڵكو لە هەندێ بواردا كاریان بەم رێسایە كردوە و لە هەندێكیتردا لێیان لادلوە، بەڵگەیش ئەوەیە ئیبن عابدین دەڵێ باركردنی رەها لەسەر بەند لەكاتی یەكگرتنی حوكم و رووداوەكەدا لای ئێمە بەناوبانگە و لە مەتنی (المنار والتوضیح والتلویح) دا بەراشكاوی وتراوە. بۆیە ئەوەی لە قسەی (النهایە) پشتی پێ بەستراوە راست نیە. بڕوانە: رد المحتار ٥٥٤/٤.

[3] بڕوانە: لرشاد الفحول للشوكاني ص١٦٤. شمس الأصول للسالمي الأباضي ٨١/١. المحصول القسم التحقيقي ج١، ق٢١٤/٣.

[4] المائدة: ٣٨

فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ﴾.[1] دا به (المرافق)ەوە بەستراوەتەوە.

حوکم لە دوو دەقەکەدا جیاوازە، لە یەکەمیان واجیبوونی بڕین و لە دووەمیاندا واجیبوونی شۆردنە. هۆیش بەهەمان شێوە. لە یەکەمیاندا دزیکردن و لە دووەمدا ویستی نوێژکردن یان نوێژکردنە.

**وێنەی چوارەم: دوو حوکمەکە جیاواز بن و دوو هۆکە یەکبگرن:**

ئەویش وەك وشەی دەستەکان (الایدی) کە لە ئایەتی تەیەمومدا بەڕەها هاتووە: ﴿...فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيداً طَيِّباً فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ...﴾.[2]، لەگەڵ ئەوەی لە ئایەتی دەستنوێژدا بە قەیدکراوی بە ئانیشکەکان (المرافق) هاتووە، هەردوو حوکمەکەیش جیاوازن، لەبەرئەوەی یەکەمیان واجبکردنی مەسح و دووەمیان واجبکردنی شۆردنە، دوو هۆکەیش یەکگرتوون لەبەرئەوەی بریتین لە هەستان بۆ نوێژ و ویستنی کردنی.

هەندێ ئیدیعای ئەوەیان کردوە ئەمەیش جێی ناکۆکی نیە بەڵکو هەموو کۆکن لەسەر نەکرانی رێکخستن (ی رەها لەسەر بەند)، لەوانە ئامەدی، کە دەڵێ: "ئەگەر حوکمەکەیان جیاواز بوو ناکۆکی نیە لەوەی ناکرێ یەکێکیان لەسەر ئەویتریان رێك بخرێ، چ فەرمان بن یان نەهیکردن، یان یەکێکیان فەرمان و ئەویتریان نەهیکردن بێ، هەروەها چ هۆکەیان یەك بێ یان جیاواز بێ.[3]

بەڵام واقیع لەوە جیاوازە، لەبەرئەوەی بەدڵنیاییەوە لەم وێنەیەشدا جیاوازی هەبووە.

---

[1] المائدة: ٦

[2] المائدة: ٦

[3] بروانە: الاحکام في اصول الاحکام للامدي ١٦٢/٢.

ئەوەوەی لە (المجموع)دا[1] دەڵێ: "هەرچی ئەندازەی هەردوو دەستە –لە تەیەمومدا– بەناویانگ لە مەزەبی ئێمەدا تا هەردوو ئانیشکە، مالیك و ئەبوحەنیفە و زۆربەی زانایانیش وایان گوتوە".

هەریەك لە عطاو ومەكحول وئەوزاعی و ئەحمەد و ئیسحاق وتویانە تا هەردوو ناولەپە. ماوەردی و هیتر لە زوهرییان گواستوتەوە كە پێویستە تا هەردوو بنباڵ مەسح بكرێ.

پاشان ئەوەوی دەڵێ: هاوەڵانمان زۆر شتیان كردۆتە بەڵگە، كە پێناچێ برێنە بەڵگە، بۆیە وازم لێ هێنان، نزیكترینیان ئەوەیە: خوا لە دەستنوێژدا فەرمانی شۆردنی هەردوو دەست تا ئانیشكەكانی كردوە.

لە كۆتایی ئایەتەكەشدا دەڵێ: ﴿...فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيداً طَيِّباً فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ ...﴾، ڕواڵەتەكەی وادیارە كە مەبەستی ئەوەیە كە سەرەتا بە هەتا (المرافق) باسی بردوە، ئەم ڕەهایەیش لەسەر ئەو بەندە ڕێك خراوە، بەتایبەت كە یەك ئایەتە.[2]

پاشان دەڵێ: شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) بە دەربڕینێكیتر باسی ئەم بەڵگەیەی كردوە كە ماناكەی ئەوەیە: خوا لە سەرەتای ئایەتەكەدا پاكیی چوار ئەندامەكەی لە دەستنوێژدا واجب كردوە، لە تەیەمومدا دوانیانی لابردوە لە كۆتایی ئایەتەكەدا، بەوەیش لە تەیەمومدا دوو ئەندام مانەوە لەوانەی لە دەستنوێژدا باس كراون، ئەگەر جیاواز بوونایە ڕوونی دەكردنەوە".[3]

حەنەفیەتیش كاركردن بە بەندیان بە واجب داناوە، بەڵام نەك لەڕێی ڕێسای ڕێكخستنی ڕەها لەسەر بەند (حمل المطلق علی المقیّد)، بەڵكو لەڕێی دەستگرتن بە

---

[1] بڕوانە: المجموع النووي ٢/٢١٣.
[2] سەرچاوەی پێشوو.
[3] المجموع ٢/٢١٤.

هەندێ ئەسەرەوە[1]، یان لەبەرئەوەی مەبەست لە هەردوو لەپ هەردوو باڵن بەرەهایی وەك ناونانی بەش لە هەموو. [2]

جمهوری مالیکی[3] و حەنبەلیەکان[4] رایان وایە رەها لەسەر بەند رێك ناخرێ و مەسحیش تا هەردوو ئانیشك واجب نیە، بەڵکو تا هەردوو مەچەك بەسە.

## وێنەی پێنجەم: لە هۆدا یەك بگرن و لە حوکمدا جیاواز بن:

وەك ئازادکردنی کۆیلە لە کەفارەتی زیهار کە لە ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ...﴾[5]دا هاتووە و بەستنەوەی بە ئیمانەوە لە کەفارەتی کوشتنی بەهەڵە لە ئایەتی ﴿... وَمَن قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَئاً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ...﴾ [6]. دا.

حوکمی هەردوو دەقەکە یەکە ئەویش پێویستیی ئازادکردنی کۆیلەیە، بەڵام هۆکەیان جیاوازە، کە لە دەقی یەکەمدا زیهار و لە دووەمیاندا کوشتنی بەهەڵەیە.

حەنەفیەت و هاوڕاکانیان لەگەڵ هێشتنەوەی رەهان لەسەر رەهاییەکەی و بەند لەسەر بەندیەکەی و هەریەکەیان لە بواری خۆیدا کاری پێبکرێ.[7]

شافیعیەت و هاوڕاکانیان لەگەڵ حەملی رەهان لەسەر بەند، بەڵام لە وردەکاریدا جیاوازن، جمهورەکەیان لەگەڵ حەملە بەبێ مەرج، ئەوە حەملە لە رێگەی لەفزەوە.

---

[1] وەك حەدیسی جابر بن عبدالله، کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((التیمم ضربة للوجه وضربة للذراعین الی المرفقین)) رواه الحاکم والدار قطني. (واتە: تەیەموم لێدانێك لە روومەت و لێدانێك لە هەردوو باڵە تا ئانیشکەکان).

[2] بڕوانە: فتح القدیر ١/١٢٦.

[3] بلغة السالك ١/٦٨.

[4] الاحکام لابن دقیق العید ١/١٥١–١٥٢.

[5] المجادلة: ٣

[6] النساء: ٩٢

[7] بڕوانە: التوضیح مع التلویح ١/٢٧٥.

شیرازی دەڵێ: هەندێ لە هاوەڵانمان گوتویانە لەڕووی زمانەوە حەمل دەکرێ، لەبەرئەوەی قورئان لە سەرەتایەوە تا کۆتایی وەك یەك وشە وایە.[1]

لێکۆڵەران لەوانە شیرازی[2] و بەیزاوی[3] لە پاشینەکان رایان وایە رەها بەقیاس لەسەر بەند ببەسترێتەوە. ناڵێن ئەو قیاسە واجبە بەڵام دەڵێن ئەگەر قیاسی دروست کرا بەستنەوە جێگیر دەبێ، ئەگینا نابێ. ئەوانە لەگەڵ ئەوەن رەها لەسەر بەند حەمل بکرێ ئەگەر عیللەی کۆکەرەوە لەنێوانیاندا هەبوو، بەپێچەوانەوە رەها بە بەند دانانرێ. رازی ئەم رێبازەی بە رێکترین رێباز داناوە.

حەنەفیەت دەڵێن: نابێ، لەبەرئەوەی زیادەیە لە دەقەکەدا و بەلای ئێمەوە نەسخە و نابێ بە قیاس نەسخ بکرێ.[4]

ئامەدی و موختار دەڵێن ئەگەر وەسفی کۆکەرەوەی نێوان رەها و بەند کاریگەر بوو، واتە بە دەق یان ئیجماع جێگیر بووبوو، پێویستە لەروانگەیەوە بڕیاری بەستنەوە بدرێ، بەڵام ئەگەر لە حوکمی مقیدەوە هەڵێنجرابێ، نابێ.[5]

زانایانی مالیکیش چوونەتە ناو هەمان وردەکاری[6]. هەرچی حەنبەلیەکان لەم وێنەیەدا لەسەر یەك را رێك نەکەوتون ، قازی ئەبویەعلا لەگەڵ رێکخستنی رەهایە لەسەر بەند، ئەبوئیسحاق بن شاقلا ئەو رێکخستنە بە دروست نابینێ و لەگەڵ ئەوەیە کار بە هەریەك لە رەها و بەند لەجێی خۆیدا بکرێ.

ئیبن قودامەی مەقدیسی باس لەوە دەکا شتێکی لە ئەحمەدەوە گێردراوەتەوە

---

[1] بڕوانە: اللمع للشیرازي ص٢٤. التبصرة في أصول الفقه ص٢١٢-٢١٣.
[2] اللمع، سەرچاوەی پێشوو، تێدا هاتووە: "ومنهم من قال بحمل من جهة القیاس وهو الأصح". وقال في التبصرة ص٢١٥: "یجوز حمل المطلق في أحد الحکمین علی المقید في الحکم الآخر من جهة القیاس".
[3] بڕوانە: البیضاوي بشرح الأسنوي مع البدخشي ١٣٩/٢.
[4] أصول السرخسي ٢٦٧/١. الکشف ٢٨٧/٢. تیسر التحریر ٣٣٠/١.
[5] بڕوانە: الأحکام للآمدي ١٦٥/٢.
[6] مفتاح الوصول في علم الأصول ص١٠٨.

که بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

ئەبولخەتاب دەڵێ: ئەگەر قیاسێك پاڵپشتی کرد لەسەری حەمل دەکرێ، ئەگینا نا.

بەم پێیە حەنبەلیەکان سێ رایان لەم مەسەلەیەدا هەیە:

١- رایەك تێیدا لەگەڵ ئەوانەی باقیی مەزەبەکانیتر کە پێیان وایە رێکخستنی رەها لەسەر بەند بەهیچ شێوەیەك نیە، کۆکن.

٢- رایەك تێیدا لەگەڵ جمهوری شافیعی کۆکن کە دەڵێن بەرەهایی لەسەری رێك ناخرێ.

٣- لە رایەکدا هاورای هەندێ لە توێژەرانی شافیعی و بەشێك لە مالیکیك کە دەڵێن حەمل لەرێگەی قیاسەوە دەکرێ نەك لە رێگەی لەفزەوە.[1]

بەرهەمی ناکۆکیش لەنێوان ئەو بۆچوونەی پێی وایە رەها بەلەفز لەسەر بەند حەمل دەکرێ و ئەوەی پێی وایە بەقیاس دەکرێ، ئەوەیە رازی لە (المحصول)دا گوتوێتی کە ئاخۆ ئەگەر حوکمەکە لە جێیەکدا رەها کرا و هاوشێوەیشی لە دوو شوێنی دژیەیەکدا قەید کرا ئایا حوکمی چۆن دەبێ، ئەویش وەك قەزاکردنەوەی رۆژووی رەمەزان کە لە ئایەتی ﴿... فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ...﴾[2].دا هاتووە، هەروەها رۆژووی (تمتع) کە بە جیاکردنەوە (تفریق) بەند کراوە لە ئایەتی: ﴿... فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ...﴾[3].. هەروەها رۆژووی کەفارەتی زیهار کە بە بەدوای یەکداهاتن (تتابع) بەند کراوە لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿... فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ...﴾[4].

دەڵێ: ئەوەی گومانی وایە رەها لەڕووی لەفزەوە بە بەند دەبەسترێتەوە، لێرەدا رەهاکەی بەرەهایی بەجێهێشتوە، لەبەرئەوەی بەستنەوەی بە یەکێکیان لە

---

[1] بڕوانە: روضة الناظر ١/١٩٤. قواعد ابن اللحام ص١٢٠-١٢١.
[2] البقرة: ١٨٤
[3] البقرة: ١٩٦
[4] المجادلة: ٤

بەستنەوەی بەویتریان لەپێشتر نیە. ئەوەیش رەهای لەسەر بەند رێکخستوە، ئەوا قیاسکردنی حەملکردنی لێرەدا لەسەر ئەوەی قیاسەکەی لەسەر بووە لەپێشترە، ئەم رێسایەیش کاریگەری لە زۆر حوکمدا دەردەکەوێ.

زاڵکردن:

بە بڕوای من رای زاڵ ئەوەیە جمهور بۆی چووە لە رێکخستنی رەها لەسەر بەند لەو وێنانەی رێکخستنیان تێدا جائیزە جا چ بڵێین لەرێی لەفزەوە یان لەرێی قیاسەوە، ئەویش لەبەر چەند هۆیەك، لەوانە:

١- بەند بگۆیە و رەها بێدەنگە، بۆیە لەپێشترە بەند روونکەرەوەی رەها بێ مادام حوکمەکە یەك بێ یا هۆکەیش جیاواز بێ.

٢- دانا بۆ زیادە روونکردنەوە قسەی زیاتر دەکا، بۆیە هەڵوەشاندنەوەی ئەو زیادەیە باش نیە، بەڵکو وا وەردەگیرێ کە پێکەوە گوتونی، وەك شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ[1].

٣- واجبکاری رەها یەقینە و واجبکەری رەها شیمانەیە، کارکردنیش بە بەقین لە کارکردن بە ئەگەر لەپێشترە.

٤- هەرچی لەبارەی یەکێتیی کەلامی خواوە بگوترێ، ئەوا مانای ئەوە دەگەیەنێ دۆستی و تەبایی حوکمەکانی شتێکی راستەقینەیە، لە هەردوو حاڵەتی کوشتن و زیهاردا کەفارەتی گوناه هەیە.

٥- حەنەفیەت کاتێ لەم ئەسڵەدا پێچەوانەی جمهور بوون نەیانتوانی بە رێساکەیانەوە پابەند بن لە رێکنەخستنی رەها لەسەر بەند لە حاڵەتی یەکگرتنی بابەت و حوکمەکە و (ئیتلاق و تەقیید)ی هۆکەدا، هەربۆیە زەکاتیان تەنها لە ئاژەڵی ئالیکنەخۆردا واجب کردوە.

---

[1] تخريج الفروع ص١٣٥.

# باسی دووەم:
# گشتی و کاریگەری لە جیاوازیی شەرعزان لە ئەحکامدا

## خواستی یەکەم:
## بەشەکانی گشتی و دیلالەتی

گشتی (العام): لەفزێکە سەرجەم ئەوەی بۆی بشێ دەگرێتەوە بە یەك بار و بەبێ شومار[1]، دابەشیش دەبێ بۆ زمانەوانی و عورفی و ئەقڵی، زمانەوانیەکە ئەوەیە لە باری زمانەکە وەردەگیرێ و دوو دۆخی هەیە: گشتی بە خۆی (عام نفسه) و گشتی بە میانە (عام بالوساطة)[2]، گشتی بەخۆی سێ جۆرە:

١- ناوی مەرج (أسماء الشرط): گشتیبوون (عموم) دەگەیەنێ بۆ هەموو شتێك کە بۆی بشێ، لەوانە (من) واتە هەرکێ، وەك ئەوەی پێغەمبەر ئەفەرموێ: ((من بدل دينه فاقتلوه))[3]، شەرعزان گشتیبوونەکەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر کوشتنی لەئاین وەرگەڕاو (مورتەد).

٢- ناوی ئیستیفهام: لەوانە (ما)ی ئیستیفهامییە، نموونەی ئەوەیە لە موعازەوە دەگێڕنەوە کە لە پێغەمبەری پرسیوە: ((ما يحل للرجل من امرأته وهي حائض، قال مافوق الإزار))[4]، مالیکی ئەمەیان کردە بەڵگە لەسەر حەرامکردنی چێژبینین لە خوار ناوقەدی حەیزدار[5]، جمهور بە حەدیسی " اصنعوا كل شيء إلا النكاح"[1]،

---

[1] المحصول-ی رازي، مخطوطة دار الكتب المصرية.

[2] البيضاوي بشرح الأسنوي مع البدخشي ٢/٥٦.

[3] أخرجه الشيخان وأصحاب السنن عن إبن عباس سبل السلام ٣/٢٦٥

[4] رواه ابو داود وضعفه - سبل السلام ١/ ١٠٥.

[5] بڕوانە: أصول التلمساني ص ٨٤.

بەرهەڵستییان کردوە.

٢- مەوسوڵەکان: لەوانە (الذین) وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم﴾ الآیة[2]، هەندێ لە هاوەڵانی شافیعی گشتیبوونەکەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر ئەوەی زیمیش (ظهار)ی[3] گشتی لەسەرە بە میانە، وەك جەمعی ناسراو بە ئەلیف لامی ئیستیغراق وەك وشەی (المطلقات) لە ئایەتی ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ﴾[4].

هەروەها وەك جەمعی موعەڕەف بە ئیزافە وەك "أولادكم" لە ئایەتی ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾[5]. هەروەها نموونە لە گشتی بە میانە، ئەو نەکیرەیەیە دەکەوێتە سیاقی نەفی وەك (وەسێت) لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((إن الله أعطى كل ذي حق حقه فلا وصية لوارث))[6].

**عمومی عورفی:**

کۆی ئەو مانایانەیە بەپێی عورف دەیگرێتەوە وەك بۆ نموونە حەرامیی جۆرەکانی چێژوەرگرتن لە دایکان نەك خودی خۆیان لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ﴾، لەوەوە ئیستیدلالی مالیکی لەسەر حەرامکردنی... چونکە کاتێ نەکرا حەرامکردنەکە ببەسترێ بە مردارەکە خۆیەوە شاردنەوە واجب بوو، کاتێکیش هیچ دیاری نەکرا شاردنەوەی هەر سەرچاوەیەك کە دروست بێ بشارێتەوە و سوودی لێ وەربگیرێ واجب بوو، بۆیە بەسترانەوەی حەرامکردن پێیەوە بوو بە واجب[7]. هەندێ

---

[1] رواه مسلم – سبل السلام ١/١٤.. مەبەست لە نیکاح جووتبوونە (الوطء).
[2] المجادلة/ ٢.
[3] التلمساني ص٨٤.
[4] البقرة/ ٢٢٨.
[5] النساء/ ١١.
[6] رواه أحمد والأربعة النسائي – سبل السلام ٣/ ١٠٦.
[7] مفتاح الوصول ص ٨٩.

له شەرعزان ئەم عمومە قەدەغە دەکەن و بە ئیجماڵەوە پابەند دەبن، یان پێیان وایە عورف جەرگەی مەبەستە ئەویش خواردنە[1].

## عمومی ئەقلی:

لەوانە گشتیبوونی حوکم لەبەر گشتیبوونی عیللەکەی وەك لە قیاسدا، هەروەها لەوانە گشتیبوونی مەفعولەکان کە فیعلی مەنفی دەیخوازێ وەك (وەڵاهی ناخۆم)، کە ئەوە سوێندە بۆ هەموو جۆرە خواردنێك.[2]

دیلالەتی گشتی (عام) لەنێو گومانبڕی (القطعیة) و گومانگری (الظنیة)دا:

ئەم خاڵە خولگەی ناکۆکییە لە زۆر لە مەسەلە فەرعیەکاندا. هیچ ناکۆکی نیە لە گومانبڕیی دیلالەتی گشتییەك کە لەبەر قەرینەیەك مەبەست پێی بەدڵنیاییەوە عموم بووە وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللهِ رِزْقُهَا﴾[3]، ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾[4]. هەروەها ناکۆکی نیە لە گومانگریی دیلالەتی (گشتی) پاش تایبەتکردنی و گومانبڕنەبوونی دیلالەت لەسەر باقیی تاکەکان، لەبەرئەوەی ئەو بەڵگەیەی ئاماژەیە بۆ تایبەتکردن بەزۆری بەمانایەك کە تایبەتکردنی لەسەر دامەزراوە تەعلیلکراو دەبێ و ئەگەر هەیە لە هەندێ لە باقی تاکەکانیتردا بێتەدی، لەگەڵ ئەم ئەگەرەیشدا دیلالەت لەسەر باقیەکەی گومانبڕ نابێ.

ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾[5] پاش ئەوەی زیممی و (موستەئمەن)ی لێ تایبەت کرد بوو بە گومانگر، هەموولا کۆکن لەسەر ئەوەی دەکرێ بە یەکینە هەواڵ تایبەت بکرێ، ئەویش ئەوەیە ئیبن عومەر دەگێڕێتەوە کە

---

[1] الأسنوي ٢/ ٦٨.

[2] مفتاح الوصول ص ٩٠.

[3] هود/ ٦.

[4] الانبياء/ ٣٠.

[5] البقرة/ ١٩٣.

پێغەمبەر(ﷺ) لە یەکێك لە شەڕەکانیدا ژنێکی کوژراوی بینی، هەربۆیە سەرکۆنەی کوشتنی ئافرەت و منداڵانی کرد[1]. هەروەك دەکرێ کەسی ئیفلیجیش لەسەر ئەو دوو توێژە قیاس بکرێ، بەو خاڵی هاوبەشەی کە هەموویان ئەهلی کوشتار نین. بەڵکو ناکۆکی لە گشتیی رەها (العام المطلق)دایە کە قەرینەیەکی تێدا نەهاتووە ئەگەری تایبەتکردن رەت بکاتەوە و تایبەتکردنی بە تایبەتکارێکی جێپسەندی هەمووان نەسەلماوە.

زۆربەی حەنەفی و هەندێ لە خەواریج و شاتبی لە مەزەبی مالیکی بۆ ئەوە چوون دیلالەتی گشتی لەسەر هەموو تاکێك لە تاکەکانی قەتعییە و وەك دیلالەتی تایبەتە لەسەر ماناکەی[2]، بۆ ئەوەیش ئاماژەیان بە چەند بەڵگەیەك داوە، لەوانە:

عموم، پێویستی وا دەخوازێ بە لەفز گوزارشتی لێ بکرێ، هەربۆیە لەفزی بۆ دانراوە، ئەوەیش بۆی دانراوە وابەستەیەکی گومانبڕە بۆ ئەوەی بۆی دانراوە تا بەڵگەیەك پەیدا دەبێ جیاواز لەوە بگەیەنێ[3]. هەروەها لەوانە: هاوەڵان لەفزەکانی عمومیان کردۆتە بەڵگە لەبارەی ئەو دۆخەی لەفزەکان لێی دەدوێن و بەڵگەیشیان (ئیستیغراق و شمول)ە، کەسیش بەرپەرچی ئەو کارەی نەداونەتەوە، بۆیە بووەتە ئیجماع[4].

مەزەبەکانی مالیکی و شافیعی و حەنبەلی و هەندێ لە حەنەفی وەك ئەبو مەنسوری ماتریدی و شێخەکانی سەمەرقەند و موعتەزیلە و ئیبازییە لەگەڵ تایبەتکردنی بوون بە گومان (ظن) وەك هەواڵی تاکینە و قیاس و چەند بەڵگەیەکیان بۆ ئەوە هێناوەتەوە لەوانە: بە سەرپێو (ئیستیقرا) سەلماوە زۆر لە لەفزە گشتیەکان

---

[1] متفق علیە سبل السلام ٤/ ٦٥.

[2] کشف الأسرار مع البزدوي ٢/٣٠٦ و پاشتر.

[3] أصول السرخسي ١/ ١٣٢.

[4] سەرچاوەی پێشوو.

تایبــەت کــراون و ئــەوە بــڵاو بوەتــەوە تــا ئــەوەی گــوتراوە هــیچ گشــتییەك نیــە تایبەتکارێکی نەبێ.

دبیسان لەوانە: ئەگەری تایبـەتکردن لـە گشـتیدا شـوبهەیەکی بـەهێزە، هەربۆیـە بەوەی بەئەگەر بۆی دانراوە ناکرێ بـاس لـە گومـانبڕبوونی بکـرێ. هـەروەها لەوانـە: تایبەتکردنی قورئانی پیرۆز بە یەکینە هـەواڵ لەلایـەن هاوەڵانـەوە وەك تایبـەتکردنی گشتیبوونی لە ئایەتی ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاءَ ذَلِكُمْ﴾، بە حەدیسی "لا تنكح المرأة علـى عمتها ولا على خالتها".[1]

**ناکۆکی لەبارەی ئەم ئەسڵە جیاوازی لە هەندێ مەسەلەی فیقهیدا لێ کەوتۆتەوە، لەوانە:**

أ- شەرعزان لەبارەی دروستیی کورتکردنەوەی نوێژ و رۆژوونەگرتنی رەمەزان بـۆ ئەو کەسەی بەسەفەرکردنەکەی بێفەرمانی دەکات، رای جیاوازیان هەیە. حەنەفیەکان و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن لە روخسەتی سەفەردا بێگوێ (العاصـی) و گوێڕایـەڵ وەك یەکن، ئەویش لەبەر عمـومی ئـەو دەقانـەی لـەو بـارەوە هـاتوون، وەك ئـەوەی خـوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ﴾[2] و ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾[3]. مـالیکیش دەڵێن بەکارهێنانی روخسـەتەکە حەرامـە بـەڵام بـەتاڵ نـابێ[4]. شـافیعی و حەنبـەلی[5] بـۆ دروستیی روخسەت بەمـەرجیان دانـاوە سـەفەرەکە موبـاح بـێ و بـەبێ ئـەو مەرجـە روخسەت دروست نیە.

---

[1] بڕوانە: شرح تنقیح الفصول ص ٢٠٣، الاسنوي مع البدخشي ٢/٦٨ مختصر التحرير ص ٢٠٩ مشكاة الانوار في أصول المنار ١/ ٨٦ طلعة الشمس مع الشمس الأصول ١/ ١٠٣ مختصر المنتهى مع العضد والسعد ٢/ ١٤٩.

[2] النساء/ ١٠١.

[3] البقرة/ ١٨٤.

[4] الشرح الصغير مع بلغة السالك ١/ ١٦٠.

[5] المهذب ١/١٠٢ نيل المأرب ١/ ٦٣.

سەرچاوەی ئەم ناكۆكیەیش ئەوەیە ئەوەی مانەوەی دەقەكانی روخسەتی بە بارە گشتیەكەی وەرگرتوە، سەفەری موباح و سەرپێچی وەك یەك داناوە. ئەوەیش تایبەتی كردوە بەو شێوەیەی روخسەتەكە تەنها سەفەری موباح بگرێتەوە، وتویێتی لە سەفەری سەرپێچیدا كورتكردنەوەی نوێژ و رۆژووشكاندن دروست نین.[1]

ب- شەرعزان لەبارەی دروستیی كۆكردنەوە لەنێوان ژن و پووری -لە هەردوو سەری دایك و باوكیەوە، واتە خوشكی باوك و خوشكی دایكی- (واتە مارەكردنیان لەلایەن پیاوێكەوە-وەرگێڕ)، دوو رای جیاوازیان هەیە: جمهور رایان وایە ئەو هاوسەرگیرییە بەتاڵە، بەڵام شیعەی ئیمامی و خەواریج بە دروستیان داناوە، هۆی ناكۆكیشیان جیاوازیانە لە كاركردن بەگوێرەی گشتیبوونی ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاء ذَلِكُمْ﴾، كە جمهور پێی وایە ئەوە بەو حەدیسەی پێغەمبەر(ﷺ) كە دەڵێ: ((لا يجمع بين المرأة وعمتها ولا بين المرأة وخالتها متفق عليه))[2] تایبەت كراوە، لەكاتێكدا شیعەی ئیمامی و خەواریج بەشێوەیەكیتری دەبینن. ئەلتوسی دەڵێ: " يجوز الجمع بين المرأة وعمتها وخالتها إذا رضيت العمة والخالة بذلك" واتە: دروستە ژن لەگەڵ پووری -لە هەردوو سەریەوە- كۆبكرێتەوە ئەگەر پوورەكە بەوە رازی بوو. بەڵگەمان كۆدەنگیی فیرقەیە، هەروەها ئەسڵ ئەوەیە رێگەپێدراو بێ و رێلێگرتن پێویستی بە بەڵگەیە، هەروەها لەبەرئەوەی خوای گەورە پاش باسكردنی مەحرەمەكان فەرمویەتی: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاء ذَلِكُمْ﴾.[3]، واتە لەوانە بترازێ هەموویتان بۆ حەڵاڵە.

خەواریج پێیان وایە ئەوە لە هەموو بارێكدا جائیزە.

---

[1] المغني في أصول الفقه لعمر الخباز مخطوطة مكتبة الأوقاف العامة بغداد – المجموع للنووي ٤/ ٢٠٢.

[2] سبل الاسلام ٣/١٢٤.

[3] الخلاف للطوسي ٢/ ١٦٠.

## خواستی دووەم:
# تایبەتکردنی گشتی

### تایبەتکردن:

تایبەتکردن (التخصیص) بریتییە لە سنووردارکردنی گشتی (العام) لە بەشێك لەوەی باسی دەکا[1]. یان لێدەرکردنی بەشێك لەوەی لەفزەکە باسی دەکا[2].
تایبەتکراوەکان دوو بەشن: یەکەمیان لکاو (متصل) و دووەمیان نەلکاو (منفصل)ـە، لکاو بریتییە لە:

١- هەڵاوێران (الاستثناء): وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَالْعَصْرِ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾.[3]
٢- مەرج (الشرط): وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ﴾.[4]
٣- سیفەت: وەك: ((في الغنم السائمة الزكاة)). (زەکات لە ماڵاتی ئالیکنەخۆردایە).
٤- ئامانج (الغاية)، وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ﴾.[5]

نەلکاویش دوو جۆرە: یەکێکیان لەلایەنی ئەقڵەوەیە وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿قُلِ اللّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾[6]، ئەقڵ ئاماژە بەوە دەکا کە خوای گەورە خۆی و

---

[1] شرح التوضيح على التنقيح ١/ ٢٠٧.
[2] البيضاوي بشرح الأسنوي ١/٢٠٧.
[3] العصر ٣، ٢، ١.
[4] النساء ١٢.
[5] المائدة ٦.
[6] الرعد١٦.

سیفەتەکانی خەلق ناکا. دووەمیشیان لە لایەنی شەرعەوەیە و چەند روویەکی هەیە، لەوانە:

أ- تایبەتکردنی کیتاب (واتە قورئان) بە کیتاب، وەك تایبەتکرنی عمومی ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ﴾[1] بەئایەتی ﴿وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾.[2]

ب- تایبەتکردنی قورئان بە سوننەتی موتەواتیر وەك تایبەتکردنی گشتیبوونی ئایەتی ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ﴾[3] بەوەی لە پێغەمبەرەوە ریوایەت کراوە لە رەجمکردنی هاوسەرداری زیناکار لە بەسەرهاتی ماعز و هیتردا.[4]

ج- تایبەتکردنی قورئان بە سوننەتی بەناوبانگ وەك تایبەتکردنی گشتیبوونی ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾ بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ((لا يرث المسلم الكافر ولا الكافر المسلم))[5].

د- تایبەتکردنی قورئان بە یەکینەهەوالْ، پاشتر باسی ناکۆکی لەوبارەوە دەکەین.

هـ- تایبەتکردنی سوننە بە سوننە وەك تایبەتکردنی گشتیبوونی قسەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی ئەوەی بە باران یان کانی ئاودراوە، یان عشری بی[6]، عەشر[7] ئەوەیە کەم و زۆر دەگرێتەوە بەوەی لە ئەبوسەعیدی خودری ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر فەرمویەتی: ((ليس فيما دون خمسة أوسق صدقة)).[8] (واتە

---

[1] البقرة ٢٢٨.

[2] الطلاق ٤.

[3] النور ٢.

[4] شرح تنقيح الفصول ص ٢٠٢ سبل السلام ١٨/٣.

[5] متفق عليه سبل السلام ٩٨/٣.

[6] بكسر الراء وتشديد المثناة هو الذي يشرب بعروقه لأنه عثر على الماء سبل السلام ٢/ ١٣٢.

[7] رواه مسلم – سبل السلام ٢/ ١٣٢.

[8] شرح عمدة الاحكام لابن دقيق العيد ١٣٢/٢.

کەمتر لە پێنج وەسق[1] زەکاتی ناکەوێ)).
و- تایبەتکردن بە عورف، ئەمیش جێی ناکۆکییە.
ئەوەی لەم باسەدا بەلامانەوە گرنگە تایبەتکردنە بە یەکینە هەواڵ و قیاس و عورف، کە هەوڵ دەدەین ئەوە لە سێ لقدا بخەینە روو:

## لقی یەکەم:
## تایبەتکردنی گشتی بە یەکینە هەواڵ

ناکۆکی نیە لە تایبەتکردنی گشتی بە یەکینەهەواڵ (خبر الواحد) ئەگەر گشتیەکە بە بەڵگەیەکیتر پێش خۆی تایبەت کرابێ، هەروەها ناکۆکی نیە لە تایبەتکردنی گشتی بە یەکینەهەواڵ کە ئیجماع لەسەر حوکمەکەی[2] دروست بووە وەك هەواڵی ((لیس للقاتل من المیراث شيء)).[3].
بەڵکو ناکۆکی لە گشتیەکدایە پێشتر بە یەکینەهەواڵ، کە ئیجماع لەسەر حوکمەکەی دانەمەزراوە، هیچی لێ تایبەت نەکرابێ:
حەنەفیەت -لە روانگەی ئەو ئەسڵەیانەوە کە دەڵێ دیلالەتی گشتی (العام) گومانبڕە- بە ناجائیزیان داناوە. جمهوریش بە جائیزیان داناوە لەو روانگەی دیلالەتی گشتی گومانگرە، هەروەها گشتی لە کیتاب و سوننەی جەمینە (السنة المتواترة) ئەگەرچی ساغبوونەوەی گومانبڕە بەڵام دیلالەتی لە گرتنەوەی هەموو تاکەکانیدا شتێکە بەزۆری[4] گومانگرە، هەروەها یەکینەهەواڵ ئەگەرچی ساغبوونەوەی گومانگرە بەڵام لەبەرئەوەی تایبەتە دیلالەتی گومانبڕە ، بۆیە لە هێزدا یەکسان دەبن، لەبەرئەوە دەشێ هەریەك لە کیتاب و سوننەی جەمینە تایبەت بکا.

---

[1] وەسق (الوَسْقُ): شەست صاعە، صاعێکیش پێنج رەتڵە-وەرگێر.
[2] إرشاد الفحول للشوكاني ص ١٥٨.
[3] سبل السلام ٢/ ١٣٢.
[4] شمس الأصول للسالمي ١/ ١٠٧. مختصر المنتهي مع العضد والسعد ٢/ ١٤٩.

**لەو مەسەلە فیقهییە جێناکۆکانەی لە خیلاف لەم ئەسڵە دەکەونەوە، ئەمانەی خوارەوەن:**

لەبارەی کوشتنەوەی موسڵمان لەسەر کوشتنی زیممی رایان جیاوازە بەم شێوەیە:[1]

جمهور، لەوانە مەزەبی مالیکی و شافیعی و حەنبەلی بۆ ئەوە چوون موسڵمان لەسەر زیممی ناکوژرێتەوە، ئەوە لە عومەری کوڕی خەتاب و عوسمانی کوڕی عەفان و عەلی کوڕی ئەبوتالیب و زەیدی کوڕی ثابت و هیترەوە ریوایەت کراوە.

بەڵام ئەبو حەنیفە و ئەبو یوسف و محەمەد و زەفر و ئیبن ئەبی لەیلا و عوسمان ئەلبەتی دەڵێن: موسڵمان لەسەر زیممی دەکوژرێتەوە.[2]

هۆی ناکۆکیشیان جیاوازییە لە تایبەتکردنی عمومی دەقەکانی قیساس، لەوانە ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى﴾[3] بە حەدیسی تاکینە (ئاحاد)، لەوانە ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((المؤمنون تتكافأ دماؤهم ويسعى بذمتهم أدناهم وهم يد على من سواهم))[4]، ئەوانەی گوتویەتی دیلالەتی (عام) و ئەوەی کە دەڵێ موسڵمان لەسەر کافر و خاوەن پەیمان لە پەیمانەکەیدا ناکوژرێتەوە، گومانگرە (ظني)، پێی وایە دەکرێ گشتیبوونی دەقەکانی قیساس بە هەواڵەکانی ئاحاد تایبەت بکرێ. بەڵام ئەوانەی ئەوەیش پێی وایە دیلالەتەکەی گومانبڕ (قەتعی)یە دەڵێ پێویستە ئەو دەقانە بە گشتیبوونەکەیانەوە وەربگیرێن بەبێ جیاکاری لەنێوان موسڵمان و زیممی لە قیساسدا.[5]

---

[1] ناکۆکی نیە لە کوشتنی موسڵمان لەسەر موسڵمان و کافر بە کافر و نەکوشتنی موسڵمان بە کافری جەنگی.

[2] بڕوانە: المغني لابن قدامة ٧/٦٥٢

[3] البقرة/ ١٧٨

[4] صححه الحاكم سبل السلام ٣/ ٢٣٤

[5] بڕوانە: فتح القدير/ ٢١٧ فما بعدها نيل الاوطار ٧/ ١٠ نصب الراية للزيلعي ٤/ ٣٣٥

## لقی دووەم:
## تایبەتکردنی گشتی بە قیاس

دیدی زانایان لە ئوسولناس و شەرعزان لەبارەی تایبەتکردنی گشتی بە قیاس بەسەر چەند بۆچوونێکدا دابەش بووە، گرنگترینیان ئەمانەن:

أ- بەرەهایی جائیزە، ئەوەیش رای جمهورە.[1] پشتیان بە هەندێ بەلگە بەستووە لەوانە: ئەوەیە قیاس بەلگەیەکی شەرعییە و عام-یش بەلگەیەکی شەرعییە و تێکگیراون، جا یان دەبێ کار بە هەردووکیان بکرێ و بەوە دوو دژ کۆ ببنەوە یان کاریان پێ نەکرێ و دژیەکیەکە نەهێلرێ، یان گشتی پێش تایبەت بخرێ کە ئەوە پێچەوانەی ئەسڵە، لەبەرئەوەی دیلالەتی عام لەسەر ئەو تایبەتە لە دیلالەتی تایبەت خۆی لاوازترە، لاوازتریش پێش بەهێزتر ناخرێ، بۆیە دەبێ تایبەت پێشی بخرێ، ئەوەیش داواکراوە.[2]

ب- بەرەهایی قەدەغەیە، کە ئەوە رای جەبائیی موعتەزیلییە، هەروەها سەلیم ئەلرازی لە ئەحمەد بن حەنبەلی گواستۆتەوە و ژمارەیەك لە هاوەڵانی ئەوە بۆچوونیان بووە. غەزالی دەڵێ ئەوە رای کۆمەڵێ موتەکلیم و شەرعزانە[3] پشتیشیان بە هەندێ بەلگە بەستوە لەوانە: قیاس لقی دەقەکانە، هەرچیش مەرج بێ لە دەقەکاندا مەرجە لە قیاسیشدا، بەبێ پێچەوانەکەی. جا ئەگەر قیاس پێش بخرایە ئەوا پێشخستنی لق بەسەر ئەسڵی دەخواست[4].

---

[1] إرشاد الفحول ص١٥٩ المستصفى ص٢٥٣ الاحكام للأمدي ٢٥٩/٢ شمس الاصول ١٠٨/١ مختصر المنتهى مع العضد والسعد ١٥٣/٢.

[2] شرح تنقيح الفصول ص٢٠٣، المستصفي، سەرچاوەی پێشوو ، اللمع للشيرازي ص٢١، شمس الأصول ١٠٨/١.

[3] سەرچاوەکانی پێشوو.

[4] شرح تنقيح الفصول ص ٢٠٤.

ئەمە بەوە رەت دەکرێتەوە کە ئەو دەقەی کە ئەسڵی قیاسە جیایە لەو دەقەی پێی تایبەت کراوە.

ج- وردەکاری (التفصیل):

١- عیسا کوڕی ئەبان لە مەزەبی حەنەفی دەڵێ ئەگەر پێشی بەبەڵگەیەکی گومانبڕ تایبەت بکرێ جائیزە، ئەگینا نا، ئەوەیش ڕێبازی زۆربەی هاوەڵانی ئەبوحەنیفەیە[1]. بەڵگەیشی ئەوەیە ئەم تایبەتکردنە بەتێهاتنی مەجاز لاواز دەبێ بۆیە دەکرێ قیاسی بەسەردا زاڵ بکرێ، بەڵام ئەگەر بە بەڵگەیەکی گومانگر تایبەت کرا پێداگری لە لاوازی ناکرێ.[2]

٢- ئەبولحەسەنی کەرخی دەڵێ ئەگەر بە نەلکاو (منفصل)ێك تایبەت کرا دەکرێ بە قیاس تایبەت بکرێ ئەگینا نا[3]. بەڵگەیشی ئەوەیە تایبەتکردن بە لکاو (المتصل) تایبەتکردنە بە هەندێ شت کە ناتوانن سەربەخۆ بوەستن، بۆیە پێویستە لەگەڵ ئەو قسەیەی هاتۆتە ناوی یەك قسە بێت و بۆ ئەوە دانرابێ کە پاش تایبەتکردنەکە دەمێنێ، بەوە دەبێتە راستەقینە و قیاسی بەسەردا زاڵ ناکرێ.

هەرچی نەلکاوە وەك (لا تبیعوا البر بالبر) سەبارەت بە عمومی ئەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ﴾ ناکرێ بکرێنە یەك قسە، لەبەرئەوە پێویستە لە باقیەکەیدا مەجاز بێ و قیاسی بەسەردا زاڵ دەبێ[4]. هەندێ رایتریش هەن بواری باسکردنیان نیە[5].

---

[1] کشف الاسرار مع البزدوي ١/ ١٥٤

[2] شرح تنقیح الفصول المرجع السابق.

[3] کشف الاسرار مع البزدوي ١/ ١٥٤

[4] سەرچاوەی پێشوو.

[5] بڕوانە: من المستصفى ص ٣٥٥-٣٥٦. الاحکام للآمدي ٢/ ١٥٩.

ناکۆکی لەبارەی ئەم ئەسڵەوە جیاوازی لە هەندێ بابەتی فیقهیدا لێکەوتۆتەوە، لەوانە:

أ- شەرعزانی هاوەڵان و مەزەبەکان رای جیاوازیان هەیە لەبارەی دیاریکردنی پشکی باپیرە لە بارێکدا لەگەڵ برا و خوشکدا کۆ ببێتەوە، هەر کەسێکیش رای خۆی لەسەر قیاسێك بنیات ناوە کە گشتیبوونی ئایەتی کیلالە[1] تایبەت دەکا ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾.

ئەبوبەکری سدیق و ئیبن عەباس و ئیبن عومەر (رەزای خوایان لێبێ) و ئەو هاوەڵانەیتر کە هاوڕایانن دەڵێن خوشك و براکان بێبەش دەکرێن ئەویش قیاس لەسەر باوك بەلای ئەبوبەکر و ئەوانەی لەگەڵین، هەروەها قیاس لەسەر کوری کوڕ بەلای ئیبن عەباس و ئەوانەی لەگەڵین، ئەبوحەنیفە و ئەو شەرعزانانەی مەزەبەکان کە هاوڕاین کاریان بەمەیان کردوە.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوای لێبێ) و ئەوانەی لە هاوەڵان هاوڕاین دەڵێن: باپیرە لەگەڵ خوشك و براکان میراتەکە بەش دەکا بەو مەرجەی پشکی ئەو لە شەش-یەك کەمتر نەبێ، ئەویش بە قیاسکردنی حاڵی لەگەڵ ئەوان لەسەر حاڵی لەگەڵ کوڕ.

ئیبن مەسعود و ئەوانەی هاوڕاین دەڵێن: پێویستە بەشی ئەو لە دابەشکردندا بە تەعصیب لە سێ-یەك کەمتر نەبێ، ئەویش بە قیاسکردنی حاڵی لەگەڵ رئەوان لە حاڵی لەگەڵ کچەکان.

زەیدی کوڕی سابت دەڵێ لەگەڵ کچ وەك برایەکی هەقودا (برای باوك و دایکی واتە: الشقيق) بەشی دەکا، ئەویش بە قیاس لەسەر حاڵی لەگەڵ برا، سێ

---

[1] النساء/١٧٦.

ئیمامەکەیش ئەم رایەیان وەرگرتوە.

وەك دیارە سەرجەم ئەم قیاسکردنانە عموم (گشتیبوون)ی ئایەتی کیلالە تایبەت دەکەن.

ب- شەرعزان لەبارەی سووداریی (ریوی) هەندێ شت رای جیاوازیان هەیە، سەرچاوەی جیاوازیەکەیشیان تێیدا ئەوەیە وشەی فرۆشتن (البیع) لە ئایەتی﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ﴾[1] گشتییە و هەموو جۆرە فرۆشتنێك دەگرێتەوە جا چ ریبەوی بێ یان نا، لەبەرئەوەی ئەلیف و لامەکە بۆ ئیستیغراقە، کە بە حەدیسی ((الذهب بالذهب والفضة بالفضة والبر بالبر والشعير بالشعير والتمر بالتمر والملح بالملح مثلا بمثل سواء بسواء يداً بيد فان اختلفت هذه الاصناف فبيعوا كيف شئتم اذا كان يداً بيد))[2] تایبەت کراوە.

شەرعزان سەبارەت بە تایبەتکردن بەو ئەندازەیەی لەم حەدیسەدا هاتووە کۆکن، بەڵام ناکۆکییان لەبارەی تایبەتکردنی ئایەتەکەیە بە جگە لەم شەش جۆرە لەرێی قیاسکردن لەسەر ئەوانەوە، جا ئەوانەی تایبەتکردنی گشتیبوونی قورئانی بە قیاسی بەلاوە پەسەندە وەك جمهور، لەگەڵ تایبەتکردنی ئەو ئایەتە بوون بە سەرجەم ئەو شتانەی لە عیللەی سوودا لەگەڵ ئەو شەش جۆرەدا هاوبەشن، دیارە (ئەو زانایانە) لە دیاریکردنی ئەو عیللەیەدا هەندێ جیاوازییان هەیە. ئەوانەیش بەلایەوە پەسەند نیە تایبەتکردنەکە لە بازنەی ئەو شەش جۆرەدا حەسر دەکەن، جگە لە شیعەی ئیمامی، کە رایان لەگەڵ تایبەتکردنی ئایەتەکەدایە بە هەرشتێکیتر لە دەرەوەی ئەو جۆرە باسکراوانە کە عیللەی سوویان تێدا بێ، ئەویش لەرێی مەفهومی حەدیسەکەوە نەك لە رێی قیاسەوە.

---

[1] - البقرە/٢٧٥.

[2] . رواه مسلم، سبل السلام ٣/٣٧.

ج- شەرعزان سەبارەت بە قیساس لە تاوانبارێك كە پەنا دەباتە بەر ماڵی خوا جیاوازن، ئەویش بەهۆی جیاوازییان لە تایبەتكردنی گشتیبوونی ئایەتی ﴿وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِناً﴾[1] بە قیاس پاش ئەوەی رێككەوتون لەسەر ئەوەی هەر كەس كارێك بكا قیساس واجب بكا لە پەلوپۆكان قیساسی لێ دەردەكرێ با پەنایش بباتە حەرەم. هەروەها ئەو كەسەی تاوان دەرهەق بەگیان یان خوار ئەوە لەناو حەرەمدا ئەنجام بدات.

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن گشتیبوونی ئەم دەقە تایبەت ناكرێ نە بە یەكینەهەواڵ و نە بە قیاس لەسەر ئەو كەسەی تاوانی كوشتنی لەناو حەرەمدا ئەنجام داوە كە بەئیجماع تۆڵەی لێ دەكرێتەوە، نە لەسەر پەلوپۆكان، لەبەرئەوەی وەك ماڵ حسێبە و دەقەكە نایگرێتەوە، بەڵام وتویانە: پەنا بۆ دەرچوون[2] دەبرێ، تایبەتنەكردنی قورئانیشیان بە قیاس بەوە شی كردۆتەوە كە تایبەتكردن وەك نەسخ وایە لەو رووەوە هەردووكیان لەكارخستنی ئەوەن لەفزەكە واجبی كردوە.

شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین دەڵێن: خوێن حەڵاڵ ئەگەر پەنای بۆ حەرەم برد پەنابردنەكە گیانی ناپارێزێ وەك بەگوێرەی قیاسی رۆشن (القیاس الجلي)، واتە قیاسكردن لەسەر پەلوپۆكان و لەسەر ئەو كەسەی تاوان لە ناو حەرەمدا ئەنجام دەدا، ئەوەیشیان بەوە شی كردۆتەوە كە قیاس بەڵگەیەكی شەرعی كارپێكراوە بەواجبكەری ئەوەی قیاس لەسەر كیتاب و یەكینەهەواڵ دروستە تایبەتكردنی پێ بكرێ، هەروەها لەبەرئەوەی باوەڕبوون بە تایبەتكردنی عموم بە قیاس كاركردن دەبێ بە كۆكردنەوە لەنێوان دوو بەڵگەدا و پشتكردنە قیاس دەبێتە هۆی كاركردن بەیەكێك لە دوو بەڵگەكە و پەكخستنی ئەویتریان.[3]

---

[1] -آل عمران/٩٧.

[2] بڕوانە: تفسیر الطبري ٣٤/٧ كشف الاسرار مع البزدوي ٢٩٦/١.

[3] بڕوانە: تخریج الفروع للزنجاني ص ٧٥ فما بعدها، كشف الاسرار المرجع السابق.

## لقی سێیەم:
## تایبەتکردنی گشتی بە عورف

عـورف ئەوەیـە خـەڵك خوویـان پێـوە گرتـوە و لەسـەری ڕۆیشـوون تـا بووەتـە عادەتیان. ئەمیش دابەش کراوە بۆ گشتی و تایبـەت. گشـتی ئەوەیـە خـەڵك هـەموو پێی ئاشنان وەك چوونە گەرماو بەبێ دیـاریکردنی بـڕی ئـاوی بـەکارهێنراو و مـاوەی مانـەوە تێیـدا. تایبـەتیش ئەوەیـە کۆمـەڵێك پێـی ئاشـنان وەك عـورفی بازرگـانی. هەردووکیشـیان یـان گوفتـارین وەك کـوڕ بـۆ نێرینـە، یـان کـردارین وەك فرۆشـتنی بەیەکتردان (المعاطاة). هەموویشیان یان ڕاست و دروستن، کە ئەوانەن لەگـەڵ بنـەما نەگۆڕەکانی شەریعەتی ئیسـلامیدا لێـك نـادەن، بـەڵام ئەگـەر لێکیـان دا ئـەوا خـراپ (فاسد)ن، وەك قومارکردن و چوونەدەرەوەی ئافرەتان بە دانەپۆشراوی و ڕازاوەیی.

ئەو عورفەی جێی ناکۆکییە عورفی دروستە، هەرچی عورفی نادروسـتە بێنرخـە و وەك نەبوو وایە. زانایان سـەبارەت بـە تایبـەتکردنی عـام بـە عـورف ڕایـان جیـاوازە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- تایبەتکردن بەڕەهایی دروستە، ئەوەیش ڕای حەنـەفی و مـالیکی و هەنـدێ لـە حەنبەلیەکانە.[١]

٢- تایبەتکردن بەڕەهایی نادروستە، ئەوەیش ڕای هەنـدێ لـە شـافیعیەکانە وەك ئەبوئیسحاقی شیرازی[٢] و هەندێ لە مالیکی و هەندێ لە حەنبەلی[٣]، هـەروەها مـەزەبی جمهور لە موعتەزیلە و ئەشـعەریە، ئیبازیـەیش هـەمان ئاراسـتەی هـەبووە[٤]. سـالمی

---

[١] - بڕوانە: التحرير مع التقرير والتحبير١/٢٨٢ بلغه السـالك ١/٣٣٧.المسـودة اصـول الفقـه الحنبلـي ص١٢٥ العرف والعادة لابي سنة ص ٩١.

[٢] - بڕوانە: اللمع في الاصول لأبي لسحاق الشيرازي ص ٢١.

[٣] - بڕوانە: المسوده ص ١٢٤.

[٤] - طلعه الشمس مع شمس الاصول ١/١٩٥.

دەڵێ: ئەگەر شەرعدانەر گوتی سووم لە خواردندا حەرام کرد، عادەتی قسەبۆکراوانیش بۆ نموونە خواردنی گەنم (البر) بوو، ئەوا ئەو گشتییە تەنها بە گەنم وەرناگیرێ، بەڵکو هەموو شتێك دەگرێتەوە کە خوراندنی پێ بوترێ، ئەمە مەزەبی ئێمە و مەزەبی جمهورە لە موعتەزیلە و ئەشعەریە.

٣- وردکردنەوە (التفصيل):

أ- تایبەتکردن بە عورفی گوفتاری نەك کرداری، ئەمە رای غەزالییە لە (المستصفى) و حەسەنی بەسری لە (المعتمد) و ئامەدی لە (الاحکام)[1] و قەرافی لە مەزەبی مالیکی و ئەوانەی شوێنیان کەوتوون.

ب- ئەو عورفەی تایبەت دەکا ئەوەیە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا ئاشنا بووە و پەسەندی کردوە بۆیان، نەك باقیی عورفەکانیتر. ئەوەیش رێڕەوی ئیمامی رازی و بەیزاوی و حیللی لە شیعەی ئیمامی و شەوکانییە لە مەزەبی زەیدی.[2]

لەو پیادەکردنە فیقییە جێناکۆکانەی لە ناکۆکی سەبارەت بە تایبەتکردن بە عورف کەوتونەتەوە ئەمانەن:

١- دەربارەی حوکمی شیردانی دایك بە منداڵەکەی جیاواز بوون، سەرچاوەی جیاوازیەکەیشیان ئەوەیە لەفزی دایکان (الوالدات) لە ئایەتی ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾[3] گشتییە و هەرچی دایکە دەگرێتەوە چ پایەبەرز بێ یان نا. ئیمامی مالیك[4] بینا لەسەر ئەسڵەکەی بە تایبەتکردنی گشتی بە عورف، بۆ ئەوە چووە کە عورفی کرداری دایکە پایەبەرزەکانی تایبەت کردوە، ئەگەر منداڵەکە مەمکی جگە لەوی قبوڵ کرد و

---

[1] - بڕوانە: الاسنوي بشرح البدخشي ١٢٨/٢.

[2] - بڕوانە: الاسنوي بشرح البدخشي ١٨٢/٢ مبادئ الوصول الى علم الاصول للحلي ص ١٣٨ لرشاد الفحول للشوكاني ص ١٦١

[3] البقرة٢٣٣

[4] الاحكام لابن العربي ٢٠٤/١

منداڵەکە سامانی هەبوو یان باوکی دەوڵەمەند بوو یان شیردەرەکە رازی بوو بەخۆڕایی شیری بداتێ. جمهور لەگەڵ ئەوەن دەست بە گشتیبوونی دەقەکەوە بگیرێ و بە عورف تایبەت نەکرێ، بەڵام لە وردەکاریدا جیاوازییان هەیە:

أ– مەزەبەکانی حەنەفی و شافیعی و حەنبەلی: لەگەڵ زۆرلێنەکردن بوون بەهەموو شێوەیەك و شتەکەیان وەك پێخۆش(نەدب) لێکداوەتەوە لەبەرئەوەی شیردانی دایك بەمنداڵەکە باشترە[1]. حەنەفیەتیش لێرەدا رێسای تایبەتکردن بە عورفیان جێبەجێ نەکردوە، ئەویش لەبەرئەوەی راستیی بۆچوونەکەیان بۆ ساغ بووەتەوە.

ب– شیعەی ئیمامی فەرمانەکەیان بەمانای رێپێدان (ئیباحە) وەرگرتوە لەبەر نەبوونی بەڵگەیەك و کارکردن بە رێسای: (الاصل براءة الذمة) واتە: ئەسڵ ئەستۆپاکییە[2].

ج– ابو ثور دەڵێ: فەرمانەکە بۆ واجببوونە، بۆیە ژن بەپەهایی ناچار دەکرێ بە شیردان.[3]

٢– لەبارەی حوکمی فرۆشتنی بەروبوم لەگەڵ مەرجی مانەوەی تا پێدەگا جیاواز بوون، محەمەد ئەلشەیبانی و ئەوانەی هاوڕاین دەڵێن لە ئیستیحساندا دروستە (واتە تایبەتکردنی دەق بە عورف) لەبەرئەوەی خەڵك دەقیان بەوەوە گرتوە.

ئەبوحەنیفە و ئەبویوسف دەڵێن دروست نیە، لەبەرئەوەی گرێبەندەکە ئەو مەرجە ناخوازێ، ئەویش گرتنی موڵکی کەسیترە، یان ئەوە دەستەوارە (صفقە)یەکە، لەبەرئەوەی یان ئیعارەیە یان بەکرێدانە لە فرۆشتندا.[4]

پێغەمبەری خوایشﷺ نەهی کردوە لە دوو دەستەوارە لە یەك سەفقەدا.[1]

---

[1] المهذب للشيرازي ١٦٧/٢

[2] – راجع الخلاف للطوسي ٣٣٥/٢

[3] سەرچاوەی پێشوو، الاحكام لابن العربي ٢٠٤/١.

[4] الهداية مع فتح القدير ٢٨٨/٦.

محەمەد پێی وایە ئەو عادەتەی سەرچاوەکەی پێویستی و بەرژەوەندیی خەڵك بێ دەقی گشتی تایبەت دەکا، ئەویش حەدیسی پێشوو یان حەدیسی نەهیکردنە لە فرۆشتن و مەرج.[2]

بەڕای مەزەبی شافیعی فرۆشتنی بەروبوم بەر لە دەرکەوتنی نیشانەی بەکەڵکهاتن بەبێ مەرجی لێکردنەوە دروست نیە، بەڵگەیشیان گشتیبوونی ئەو ئەسەرانەن کە هەن، هەروەها بەوەی ئەگەر بەر لە دەرکەوتنی نیشانەی بەکەڵکهاتن فرۆشتی، گەرەنتی نیە دەردێك لێی نەدات و لەناو بچێ، ئەوەیش نادڵنیاییەکی زیادەیە، بەڵام ئەگەر بەمەرجی لێکردنەوە (واتە رنیی بەروبومەکە) فرۆشتی دروستە.[3]

---

[1] عن ابي هريره(ﷺ) قال نهى رسول الله ﷺ عن بيعتين في بيعة، رواه احمد والنسائي وصححه الترمذي وابن حبان، سبل السلام ٣/١٦.

[2] بڕوانە: سبل السلام حديث عائشة وبريرة ٣/١٠.

[3] – المهذب ١/٢٨١.

## باسی سێیەم:
## هاوبەشی لە لەفز و کاریگەری لەسەر جیاوازیی شەرعزان

هاوبەش (المشترك) ئەو لەفزەیە کە دوو مانای جیاواز یان پتر دەگەیەنێ لە زمانێکدا کە گفتوگۆی پێدەکرێ، ئەوەیش: مەعنەوییە، ئەگەر لەفز و دۆخەکەی یەکیان گرت و ئەوەی بۆی دانراوە تاکەکانی فرە بوون وەك مرۆڤ کە بۆ ئەندازەی هاوبەش (حەیوانی ناتیق) لەنێوان هەموو تاکەکانی دانراوە.

هەروەها لەفزییە: ئەگەر لەفزەکەی یەکی گرت بەڵام دۆخ و ماناکەی فرە بوون وەك (عین) و (قرء)... ئەم بەشەی دوایی خولگەی ناکۆکیی زانایان و ئوسوڵناس و شەرعزانە، کە لە بوون و بەکارهێنان و حەملکردنی لەسەر مەدلولەکەی رایان جیاوازە، ئەوەیش لە سێ خواستدا کورت دەکەینەوە:

## خواستی یەکەم:

## خواستی یەکەم: جیاوازی لەبارەی بوونی

زانایان لەبارەی بوونی هاوبەشیی لەفز (المشترك اللفظي) بەسەر پێنج رادا دابەش بوون:

یەکەم: بەئەقڵ واجبە، ئەمە رای کۆمەڵێ لە زانایانە و پشتیان بە چەند بەڵگەیەك بەستووە، لەوانە: ئەگەر نەبوایە زۆربەی ناوەرۆکەکان (المسميات) لە لەفز بەتاڵ دەبوون، چونکە لەفزەکان کۆتان لەبەرئەوەی لە پیتە کۆتاکان پێکدەهێنرێن.[1]

دەکرێ وەڵامی ئەم بۆچوونە بدرێتەوە، یان بەوەی لەفزەکان بێکۆتان لەبەرئەوەی دەکرێ هەر پیتێك لەگەڵ یەکێکیتر بە بێکۆتا شێوە رێك بخرێ، یان بەوەی ماناکان کۆتان، لەبەرئەوەی بارەکە لقی وێناکردنی خۆی هەیە، وێناکردنی بێکۆتایش مەحاڵە.

دووەم: بەئەقڵ مەحاڵە، لەبەرئەوەی گفتوگۆکردن بە لەفزی هاوبەش تێگەیشتنی مەبەست بەتەواوی ناگەیەنێ، هەرچی بەو شێوەیەیش بێ دەبێتە سەرچاوەی فەساد، چونکە لەفزی هاوبەش سەرچاوەی خراپەیە و خوای دانا لەوە بەدوورە[2].

بەڵام ئەمە بەوە وەڵام دەدرێتەوە کە ناوی رەگەزەکان هەڵیدەوەشێنێتەوە، وەك (حەیوان) کە ئاماژە نیە بۆ ناوەرۆکی خود سەرباری جێگیربوونی لە زماندا.[3]

سێیەم: شیانی روودانی بەئەقڵ نەك بەزمان، لەبەرئەوەی هاوبەشی لەفز روودانی مەحاڵی لێ ناکەوێتەوە، بۆیە جائیز دەبێ، هەرچی روونەدانیەتی لەرووی زمانەوە

---

[1] - الأسنوي ٢٤٤/١ لرشاد الفحول ص ١٩ التقرير والتحرير مع التحبير ١٨٢/١.

[2] - سەرچاوەکانی پێشوو.

[3] - الاسنوي ٢٢٦/٢ لبو النور زهير ٣٩/١.

لەبەرئەوەیە ئیستیقرا و بەدواداچوونی لەفزەکانی زمان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گومان دەبڕێ هاوبەش بێ، واتە ئەوە یان رێکەوتوو (متواطئ) یان حەقیقەتە یان مەجاز.

چوارەم: شیانی روودانی بەئەقڵ و زمان نەك بەشەرع (لەرووی شەرعیەوە)، لەبەرئەوەی ئەگەر لە قورئان یان سوننەدا رووی دا ئەوە لە دوو شت بەدەر نیە: یان ئەوەتا روونکەرەوەیە ئەوەیش درێژدادڕیەکی بێسوود دەگەیەنێ، کە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) پاکن لەوە، یان روونکەرەوە (مبین) نین ئەوەیش بێسوود و بێمانا (لغو) دەبێ، لەغویش لەو دوانەدا بەتاڵە.

دەتوانین بەشی یەکەم هەڵبژێرین بەبێ ئەوەی هیچ لەنگیەك بەسەر رەوانبێژیی قورئان و سوننەدا بسەپێنێ، لەبەرئەوەی راڤەکردن پاش تەمومژ بە رەوانبێژی حسێبە، پاشان دەشێ قەرینەکە ئانی بێ و بەوەیش درێژدادڕی نابێ. یان بەشی دووەم هەڵبژێرین بەبێ ئەوەی هیچ قەدەغەیەك بخوازێ وەك بێسوودی بەبەڵگەی ئەوەی بەکردەوە لە قورئاندا رووی داوە، وەك (قرء) کە هاوبەشە لەنێوان حەیز و پاکبوونەوە لە ئایەتی ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ﴾، هەروەها عسعس لە ئایەتی ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ﴾[1] ، کە هاوبەشە لەنێوان هات و چوو (اقبل و أدبر)دا.

پێنجەم: شیانی روودانی بەئەقڵ و زمان و شەرع، هەروەها لەبەر لێنکەوتنەوەی هیچ مەحاڵێك لە روودانی و دوودڵیمان لە مەبەست لە القرء –بۆ نموونە– لە قورئاندا کە ئایا حەیزە یان پاکبوونەوە، دوودڵیش لە دوو شت یان زیاتردا بەڵگەی هاوبەشییە (الاشتراك).[2]

رای زاڵ بەلای منەوە ئەمەی دواییە لەبەرئەوەی واقیع پشتیوانی دەکا.

---

[1] – التكوير/١٧

[2] – كشف الاسرار مع البزدوي ٣٩/١ الاسنوي ٢٢٦/٢.

## خواستی دووەم:
## لە بەکارهێنانی هاوبەش لە هەموو ماناکانیدا

بابەتی ناکۆکییەکە یەك لەفزە لە یەك قسەکەرەوە لە یەك کاتدا کە هیچ قەرینەیەك نیە مەبەستەکە دیاری بکا، دژیەکیش لەنێوان ماناکانیدا نیە[1]، ئەو هاوبەشەی ئەم خاڵانەی تێدا بێ شەرعزان لەبارەیەوە بوونەتە چوار قسە:

یەکەم- بەکارهێنانی لە هەموو ماناکانیدا بەڕەهایی راست و دروستە (بەتاك یان هیتر، ئەرێ یان نەرێ)ن ئەمە رای شافیعی و کۆمەڵێ لە هاوەڵانیەتی، هەروەها قازی ئەبوبەکری باقلانی و بەشێك لە موعتەزیلە وەك جیبائی و قازی عەبدولجەبار، ئیبن حاجبی مالیکیش هەڵیبژاردوە[2]. شەوکانی دەڵێ جمهور و زۆر لە ئیمامانی ئالی بەیتیش ئەمەیان گوتوە[3]. چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە لەوانە: ئەگەر رێژە (نیسبە)ی ماناکان یەکسان بوون ئەوا دیاریکردنی هەندێکیان لە هەندێکیتریان لەپێشتر نیە، بۆیە وەك ئیحتیات بەهەموویان وەردەگیرێ. هەروەها لەوانە رووداني لە قورئانی پیرۆزدا کە وشەی (الصلاة) لە ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ... الآية﴾[4] هاوبەشە لەنێوان مانای لێخۆشبوون لەلایەن خواوە و داوای لێخۆشبوون لەلایەن فریشتەکانەوە و بەیەك تەوژم تێیدا بەکار هاتوون. هەروەها سوژدەبردن (السجود) لە ئایەتی ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ... الآية﴾[5] هاوبەشە لەنێوان دانانی ناوچاوانی مرۆڤ لەسەر زەوی لەگەڵ

---

[1] - اذ لا خلاف في جواز استعمال القرء في معنيه لتنافيهما.
[2] - مختصر المنتهى مع العضد والسعد ١٢٧/١
[3] - ارشاد الفحول ص ٢٠
[4] - الاحزاب/٥٦
[5] - الحج/١٨

ملکەچی و گوێڕایەڵی بەبێ ئەوە، جا ئەگەر نەکرایە مەبەست لە هاویەش سەرجەم ماناکانی بێ ئەوا مەبەست لە (سجود) هەردوو ماناکە پێکەوە نەدەبوو.

دووەم– بەهیچ شێوەیەك دروست نیە؟

عەبدولعەزیزی بوخاری لە مەزەبی حەنەفی دەڵێ: رای هاوەڵانمان و هەندێ لە توێژەران لە هاوەڵانی شافیعی و سەرجەم ئەهلی زمان و ئەبوهاشم و ئەبو عەبدوڵا ئەوەیە وەك پۆشاکە بۆ ماناکان، یەك پۆشاکیش لەیەك کاتدا لەلایەن دوو کەسەوە لەبەر ناکرێ، بەهەمان شێوە یەك لەفز ئاماژە بۆ دوو مانا یان کۆمەڵە مانایەك لە یەك کاتدا، ناکا.

سێیەم– لە نەرێ (نەفی)دا دەبێ بەلاّم لە ئەرێ (ئیسپات)دا نابێ. ئەمە رای هەندێ لە حەنەفیەکانە، لەبەرئەوەی هاویەش ئەگەر لە نەفیدا روو بدا گشتی دەبێ، لەبەرئەوەی نەکیرەیە لە جێبەندی نەفیدا، ئەوەیش دەبێتە گشتی. ئەم رایە بەوە رەخنەی لێ دەگیرێ کە هەر لەفزێك لە دەقدا هەمان مەبەست دەگەیەنێ کە لە حاڵەتی ئیسپاتدا دەیگەیەنێ.

چوارەم– دروستە ئەگەر هاویەشەکە کۆ بوو لەبەرئەوەی کۆ وەك دووبارەکردنەوە وایە. مەبەست لە هەر تاك (مفرد)ێك مانایەکە لە ماناکانە.

بەلاّم ئەمە کاتێ دەبێ موفرەدەکان لە مانادا یەکسان بن، وەك ئەوەی مەبەست لە (العیون) یەك لق بێ وەك ئاڵتون، یان ئەو کانیەی لەبەری دەڕوات.

## خواستی سێیەم:
## وەرگرتنی هاوبەش بەگوێرەی مەدلولەکەی[1]

لەفزە هاوبەشەکان لە دەقەکانی قورئان و سوننەدا کاریگەریی بەرچاویان لە جیاوازیی شەرعزان لەبارەی حوکمە شەرعیەکان هەیە، لەبەرئەوەی ئەگەر یەکێك لە ماناکانیان بە قەرینەیەك دیاری نەکرێ جۆرە لێڵیەکی تێدەکەوێ کە پێویستە لابرێ تا بتوانرێ کاری پێ بکرێ و بەرئەرك (موکەلەف)یش بەرچاو روون بێ، لەبەرئەوەیە وتراوە هاوبەشی (الاشتراك) پێچەوانەی ئەسڵە، جا ئەگەر لە دەقێك لە دەقەکاندا هات موجتەهید لەنێوان دوو باردا دەبێ:

١- ئەگەر هاوبەش بوو لەنێوان مانایەکی زمانەوانی و مانایەکی شەرعیدا، پێویستە دووەمیان وەربگیرێ، وەك لە لەفزەکانی (الصلاة، الزکاة، الصیام،الحج، البیع، الطلاق)دا. مانا زمانەوانیەکەی مەبەست نابێ مەگەر بە قەرینەیەك کە لەوانەیە دیدی زانایان لە هەڵسەنگاندن و پێشخکەشکردنیدا جیاواز بێ، لەوانەیە ئەوەی بەلای کۆمەڵێکەوە بەکەڵکی زاڵکردن دێ بەلای کۆمەڵێکیترەوە بەکەڵك نەیەت، ئەمەیش سەردەکێشێ بۆ ئەوەی هەرکەسێك روو لە مانایەك بکا جیاواز لەوەی هاوەڵەکەی رووی تێکردوە.

٢- ئەگەر شەرعدانەر عورفێکی تایبەتی نەبوو کە یەکێك لە ماناکانی هاوبەشەکە دیاری بکا، پێویستە ئیجتیهاد بکرێ بۆ دیاریکردنی ئەو مانایەی مەبەستە، بۆ ئەوەیش موجتەهید پشت بە قەرینە و نیشانەکان و حیکمەتی یاسادانان و

---

[1] - جیاکاری لەنێوان دانان (الوضع) و بەکارهێنان و وەرگرتن (الحمل)دا ئەوەیە: دانان لەفزەکە بکرێتە دەلیل سەر ماناکەی، ئەمەیش پەیوەندی بە دانەرەکەوە هەیە. بەکارهێنان راگەیاندنی لەفزە و ویستنی مانایش لە سیفەتەکانی قسەکەرە. وەرگرتن-یش باوەڕی گوێگرە بە ویستی قسەکەر یان ئەوەی مەبەستەکەی دەگرێتەوە، وەك وەرگرتنی هاوبەش بەهەردوو ماناکەی، ئەوەیش لە سیفەتەکنی گوێگرە.

ئامانجەکانی دەبەستێ... لەمەوە دەردەکەوێ لەو لەفزە هاوبەشانەی لە قورئان و سوننەدا هاتوون چ کاریگەریەکیان لەسەر جیاوازیی شەرعزان هەیە.

لەم پیادەکردنە فیقهییە خیلافیانەیش کە لە ناکۆکی لە دیاریکردنی مانای (هاوبەش) دەکەونەوە، ئەمانەن:

### أ- لەبارەی دیاریکردنی کاتی سەربڕینی قوربانی لە حەجدا جیاواز بوون:

زۆربەی شەرعزان بۆ ئەوە چوون کاتەکەی ئەو رۆژە زانراو (الایام المعلومات)انەن کە لە ئایەتی ﴿لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ عَلَى مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ﴾[1] دا هاتووە، بەڵام لەوەدا جیاوازن کە ئایا ئەو رۆژانە شەوەکانیشیان دەگرێتەوە یان نا؟

جمهوری شەرعزان رایان وایە لە روانگەی ئەو شمولەوە لە شەویشدا هاوشێوەی رۆژ سەربڕینەکە دروستە، لەوانە ئەبوحەنیفە و شافیعی و ئەحمەد لە راسترین قسەی لێیەوە، هەروەها ئیسحاق و ئەبو ثور، بەڵام شافیعی سەربڕینی شەوی پێ خۆش نیە لەترسی هەڵەکردن و ئامادەنەبوونی هەژاران[2]. ئیمام مالیك لە رای بەناوبانگیدا و ئەحمەد لە ریوایەتی خەرقیدا رایان وایە لە رۆژدا نەبێ دروست نیە[3]. هۆی ناکۆکیەکەیشیان جیاوازییانە لە دیاریکردنی مانای (الیوم) کە هاوبەشە لەنێوان رۆژ و شەودا، کە هەندێ جار بە هەردوو ماناکە هاتووە وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ﴾[4] ﴿قَالَ آيَتُكَ أَلاَّ تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ إِلاَّ رَمْزاً﴾[5] ، هەندێ

---

[1] - الحج/٢٨

[2] - الام للشافعي ١٧٤/٢.

[3] - لە: الشرح الصغيرى (دردير) ٢٨٧/١ دا هاتووە، مەرجی دروستبوونی چوارن، یەکەمیان ئەوەیە رۆژ بێ، بۆیە بەشەو دروست نیە.

[4] - هود/٦٥.

[5] - ال عمران/٤١

جاریش تەنها بەمانای رۆژ هاتووە وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُوماً﴾[1]، لێرەدا مەبەست لە (الیوم) تەنها رۆژە بە قەرینەی بەرانبەرکردن (لەگەڵ شەو). ئەوەی پێیان وابووە مەبەست لە (الیوم) لە ئایەتی حەجدا رۆژە وەك مالیك و ئەوانەی هاوڕاین گوتویانە بەرۆژ نەبێ سەربڕین دروست نیە، ئەوانەیش گشتاندویانە بەسەر رۆژ و شەودا وەك جمهور، گوتویانە بەشەویش وەك رۆژ جائیزە.

**ب- لەبارەی واجبیی تەرتیبی دەستنوێژ دوو رای جیاوازیان هەیە:**

هەریەك لە مەزهەبەکانی شافیعی و حەنبەلی و شیعەی ئیمامی و ئەوانەی هاوڕایانن بەواجبیان داناوە، ئەوەیش رێبازی عوسمانی کوڕی عەفان و ئیبن عەباس و ریوایەتێکە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە[2]. هەریەك لە حەنەفی و مالیکی و ئەوانەی هاوڕایانن لەگەڵ ئەوەن واجب نیە، ئەوەیش رێبازی ئیبن مەسعود و سەعید بن موسەیب و ئەوزاعی و داودە.

هەندێ لە زانایانی هەردوولا ناکۆکیەکەیان لەسەر هاوبەشیی (واو) لەنێوان تەرتیب و کۆکردنەوە بینا کردوە لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُؤُوسِكُمْ﴾[3]، ئەوانەی دەڵێن بۆ کۆکردنەوەیە تەرتیبیان بە واجب دانەناوە و دەستنوێژی دەستنوێژگر بە دروست دادەنێن با لە شۆردندا ئەندامێکیش پێش ئەندامێکیتر بخا، ئەوەیش پێی وایە بۆ تەرتیبە دەڵێ تەرتیبەکە لە مەرجەکانی دروستیی دەستنوێژەکەیە.

---

[1] – الحاقة/٧.

[2] – المجموع للنووي ٤٣٤/١

[3] الهداية مع فتح القدير ٣٥/١ القواعد لابن اللحام ص ١٣١. الخلاف للطوسي ١٧/١

**ج- شەرعزان لەبارەی ئیستیعابی سڕین (مەسح)ی سەر جیاوازن:**

دوای کۆکبوونیان لەسەر ئەوەی سڕینی سەر لە فەرزەکانی دەستنوێژە و سڕینی هەمووی بە فەرز هاتووە و هۆی جیاوازیەکەیشیان ئەو هاویەشییە لە لەفزی (الباء) دا هاتووە لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ﴾، چونکە دەگونجێ هەیە بۆ بەشبەشکردن (التنعیض) یان پێوەلکان (الالتصاق)، یان زیادە بێ، هەروەك پێوەلکاندن (الصاق) بە سڕینی هەمووی و بە سڕینی هەندێکیشی راستە.

مالیکی و حەنبەلیەکان سڕینی تەواوی سەریان لە دەستنوێژدا بەلاوە واجبە، بۆ ئەوەیش بەلگەی نەقلی و نەقلی دێننەوە. هەرچی بەلگەی نەقلییە قورئانە، رووی دیلالەتەکەیشی ئەوەیە پیتی (ب)ەکە دەکرێ زیادە بێ ئەوکاتەیش خواست (موقتەزا)ی دەقەکە سڕینی هەمووە نەك تەنها هەندێ، لە بارەی ئەگەری زیادنەبوونیشیدا بۆ پێوەلکاندنە و مانای ئایەتەکە دەبێتە ئەوەی مەسح بلکێنن بە سەرتانەوە، ناوی سەریش لە هەموودا راستەقینە و لە هەند (بعض)دا مەجازە. هەرچی بەلگەی ئەقلییە بریتییە لە قیاسکردنی مەسحی سەر لە دەستنوێژدا لەسەر مەسحی دەموچاو لە تەیەمومدا.

حەنەفیەت دوو ریوایەتیان هەیە: ریوایەتی پێشینانیان کە مەسحکردنی سەر بەئەندازەی سێ پەنجەیان بە واجب داناوە، لەگەڵ ریوایەتی پاشینان کە پێی وایە چواریەکی سەر مەسح دەکرێ یان مەسحکردنی پێش سەر. بەناوبانگ لە مەزەبی شافیعیدا هەرئەوەندە بەسە کە پێی دەوترێ مەسح با کەمیش بێ.[1]

---

[1] بروانە: القواعد والفوائد الاصولية لابن اللحام ص ١٤١ فتح القدير ١/١٤ المهذب ١/٧ الشرح الصغير للدردير ١/٤٠

**د– لەبارەی دیاریکردنی مەبەست لە (القرء)ی هاویەش لەنێوان پاکبوونەوە و بێنوێژی (حەیز)دا جیاوازن:**

سەبارەت بەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ﴾. عائیشە و ئیبن عومەر و زەیدی کوڕی سابت خوا لێیان ڕازی بێ، هەروەها مالیك و شافیعی و ئەحمەد لە یەکێك لەو دوو ڕیوایەتەی لێی دەگێڕنەوە، بۆ ئەوە چوون کە مەبەست پاکبوونەوەیە (الطهر). بەڵام هەریەك لە ئەبوبەکری سدیق و عومەر و عوسمان و عەلی و ئیبن مەسعود و ئەبوحەنیفە ڕایان وابووە مەبەست پێی بێنوێژییە. هەردوولایش کۆمەڵێ بەڵگەی نەقڵی و زمانەوانی دێننەوە کە پاڵپشتی لە ڕاکەیان دەکەن، ئەوەی زانیاریی زیاتری دەوێ پێویستە بگەڕێتەوە بۆ کتێبە فیقهیەکان.[1]

**هـ– لەبارەی جێگیربوونی نەسەب (المصاهرة) بە زینا بە دوو ڕای جیاواز هەیە:**

جمهور ڕایان وایە جێگیر نابێ، بەڵام ئەبوحەنیفە و ئیمام ئەحمەد و ئەوانەی هاوڕایانن لەگەڵ ئەوەن جێگیر دەبێ، هۆی ناکۆکیەکەیشیان جیاوازییە لە دیاریکردنی مانای مەبەست لە وشەی (نکاح) کە هاوبەشە لەنێوان جووتبوون (الوطء)، لەگەڵ ئەو عەقدەی لە ئایەتی ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾[2]دا هاتووە، چونکە لە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ﴾[3] تەنها بەمانای عەقد هاتووە، هەروەها لە ئایەتی ﴿وَابْتَلُواْ الْيَتَامَى حَتَّىَ إِذَا بَلَغُواْ النِّكَاحَ﴾[4] دا تەنها بەمانای (الوطء) هاتووە. بە هەردوو ماناکەیش پێکەوە هاتووە وەك لەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ

---

[1] بڕوانە: بدائع الصنائع ٣/ ١٩٨ المهذب ٢/ ١٤٣ بداية المجتهد ونهاية المقتصد ٢/ ٧٤ و پاشتر.
[2] النساء/ ٢٢
[3] الأحزاب/ ٤٩
[4] النساء/ ٦.

لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾[1] كە نیکاحی حەڵاڵکەر لێرەدا هەم عەقدەکە و هەم جووتبوونیشە.

جا ئەوەی گوتوێتی مەبەست لە نیکاح لە دەقی ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم﴾ عەقدە، دەڵێ پێویست نیە زیناکردن لەگەڵ ئافرەتێك ئافرەتەکە لە کوڕی زیناکەرەکە حەرام بکا، لەبەرئەوەی دەقەکە کوڕ لەو ئافرەتەکە حەرام دەکا کە باوکی مارەی کردوە. ئەوەیش گوتوێتی مەبەست پێی جووتبوونە دەڵێ: زیناکردن لەگەڵ ئافرەتەکە حەرامکردنی لەسەر کوڕەکەی واجب دەکا، چونکە بەپێی زاهیری دەقەکە جیاوازی لەنێوان جووتبوونی موباح و جووتبوونی حەرامدا نیە.[2]

**و: لەبارەی حوکمی دەستکوژ(نبیحة)ی ئەو کەسەی لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵدا بیسمیلای لەسەر نەکردوە:**

مالیك دەڵێ هەردەستکوژێك بەئەنقەست بێ یان بەسەهو (لەکاتی سەربڕینیدا) بیسمیلای لەسەر نەکرابێ حەرامە. شافیعی دەڵێ: بەڕەهایی حەڵاڵە. ئەبوحەنیفە دەڵێ: ئەگەر بەسەهو نەیکرد حەڵاڵە، ئەگینا حەرامە.[3]

هۆی جیاوازییان ئەوەیە پیتی (و) لەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ﴾ لە ئایەتی ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ﴾[4] هاوبەشە لەنێوان دەستپێکردن (ئیستیئناف) و حاڵ و عەتفدا. حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕاین پێیان وایە بۆ ئیستیئناف یان عەتفە، ئەوەیش پاڵپشتی ڕێڕەوەکەیان بووە لە تێگەیشتنی ئەم دەقەدا لەوەی نەهیکردنەکە لەو دەستکوژەیە بەهیچ شێوەیەك ناوی خوای لەسەر نەبراوە جا ئیتر هیتری وەك بت ناو برابێ یان نا، لەبەرئەوە گوتویانە ئەوەی

---

[1] البقرة/ ٢٣٠.
[2] فتح القدير ٢/ ٣٥٧، المهذب ٢/ ٤٣.
[3] بڕوانە: الرسالة (٢٦) من الرسائل الزينية لابن نجيم مخطوطة المكتبة الازهرية رق م (٢٧)
[4] الأنعام/ ٢١

بەئەنقەست بیسمیلای لێنەکراو خواردن و هەر جۆرە مامەڵە و سوود لێبینێکی حەرامە.

مەزەبی شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین پێیان وایە واو–ەکە بۆ حاڵە و لێرەیشەوە وتویانە مەبەست لە ئایەتەکە نەهیکردنە لەوەی ناوی غەیری خوای لەسەر براوە، وەك بتەکان.[1]

[1] بڕوانە: تخريج الفروع على الأصول للزنجاني ص ١٩٤ فتح القدير ٨/ ٥٤ – ٥٥ المهذب ١/ ٢٥٢.

# بەشی دووەم:
# دابەشکردنی لەفز بەلەبەرچاوگرتنی دیلالەت

دیلالەت: لەڕووی زمانەوانیەوە چەند مانایەکی هەیە: لەوانە ئیرشاد و هیدایەت. لەڕووی زاراوەییشەوە: ئەوەیە شتێك بەشێوەیەك بێ، لە لێ تێگەیشتنی تێگەیشتن لە شتێکیتر بخوازێ. ئەویش یان لەفزییە یا نالەفزییە، دووەمیان یان وەزعییە وەك دیلالەتی نیشانەکانی هاتوچۆ لەسەر سیستمی ڕۆیشتن لە ڕێگەو شەقامەکاندا، یان ئەقڵییە وەك دیلالەتی گەردوونی مەزن لەسەر بوونی بەدیهێنەرێك، یان سروشتییە وەك دیلالەتی هەندێ نیشانە بۆ هەندێ نەخۆشی.

لەفزیش یان ئەوەتا ئەقڵییە وەك دیلالەتی لەفزە بیستراوەکان لە رادیۆوە بۆ بوونی پەخشکارێك، یان سروشتییە وەك دیلالەتی ناڵەی نەخۆش لەسەر ئازار، یان دانراو بە پڕاوپڕ (وضعية مطابقة) -کە ئەمە مەبەستی لێکۆڵینەوەکەیە- ئەگەر لەفزەکە دیلالەت بوو بۆ تەواوی ناونراوەکەی، وەك دیلالەتی مرۆڤ بۆ ئاژەڵی گۆیا (ناطق). هەروەها ئەگەر دیلالەت بوو بۆ بەشێك لە ناونراوەکەی، تێدابوو (تضمين)ـە وەك دیلالەتی مرۆڤ تەنها بۆ گۆیا لەنێو کۆمەڵێکدا، هەروەها ئیلتیزامییە ئەگەر دیلالەت بوو بۆ لازمی ماناکەی، وەك دیلالەتی ئاگر بۆ گەرمی.

لەفزی دانراو بەپڕاوپڕ یان ئاوێتە (مرکب)ـە ئەگەر بەشێکی ئاماژە بوو بۆ بەشێك لە ماناکەی وەك پزیشکی مرۆڤ، ئەگینا تاك (مفرد)ـە، تاکیش ئەگەر بەماناکەی سەربەخۆ نەبێ ئەوا پیتە (حەرف)، بەڵام ئەگەر سەربەخۆ بوویەوە و بە حاڵەتە تەسریفیەکەی ئاماژەی کرد بۆ رابردوو یان حاڵ یان ئایندە ئەوا فەرمان (فيعل)ـە، ئەگینا ناو (اسم)ـە، ئیسمیش یان کوللییە یان جوزئی، کوللیش ئەوەیە خودی

وێناکردنی مەفهومەکەی ڕێگر نیە لە هاوبەشی، ئەگەر لەنێوان تاکەکانیدا یەکسان بوو بەبێ جیاوازی بەتوندی یان لەپێشبوون، ئەوا ڕێکەوتووە وەك مرۆڤ، ئەگینا گومانکارە وەك سپێتی[1] کە لە هەندێ لە بەشەکانیدا تۆخترە، هەروەها وەك بوون کە لە خالیقدا لەپێشتر و یەکەمە.

جورئیش ئەوەیە خودی وێناکردنی مەفهومەکەی ڕێگرە لە هاوبەشی، ئەویش ئەوەیە مەدلولەکەی بەبێ قەرینە عەلەمە وەك خالید ئەگینا شاراوەیە وەك (هـو) و (هي).. ئەمانە بەشەکانی لەفزن بەگوێرەی دیلالەتە زمانەوانی و مەنتیقیەکانیان. زانایانی ئوسولێ هەندێ زاراوەیتریان بۆ زیاد کردوە لە ڕووی دیلالەتە موعتەبەرەکان لایان، ئەو زاراوانەن کە لەم توێژینەوەیەدا بەلای ئێمەوە گرنگن.

بەلام ئوسولناسان لە خستنەڕووی زاراوە ئوسولیەکاندا یەك ڕێبازیان نەگرتۆتەبەر، لەبەرئەوە هەولێ دەدەین دوو ڕێبازی سەرەکی بخەینە ڕوو، ئەوانیش بریتین لە ڕێبازی حەنەفیەت و ڕێبازی جمهور لە دوو باسی سەربەخۆدا.

---

[1] وا ناونراوە تاماشاکەر یان بیسەر دەخاتە گومان کە ئەو متواطیء یان بەشدارە.

## باسی یەکەم:
## ڕێبازی حەنەفیەت

حەنەفیەت دەڵێ: دیلالەتی دەق لەسەر حوکم یەکەم شت یان بە لەفزەکە خۆیەتی، یەکەم ئەگەر مەبەست لە لەفزەکە ئەوە بێ پێی دەوترێ گوزارەی دەق (عبارة النص) ئەگینا پێی دەوترێ ئاماژەی دەق (اشارة النص)، دووەمیان ئەگەر لەڕووی زمانەوانیەوە لە لەفزەکە دەفامرا پێی دەوترێ دیلالەتی دەق، ئەگەر لەڕووی شەرعیشەوە لێی دەفامرا پێی دەوترێ دیلالەتی خواستن (دلالة الإقتضاء).[1]

لە لقی سەربەخۆدا بەکورتی باسی هەریەك لەو چوار بەشە دەکەین.

---

[1] بڕوانە: تیسیر التحریر ١/ ٨٦.

## لقی یەکەم:
## گوزارەی دەق

گوزارەی دەق بریتییە لەوەی لەفزەکە بەخۆی دیلالەتێکی روون بکا بۆ ئەو حوکمەی بۆی هێنراوە بەئەسڵی یان بەپاشکۆیی (تەبەعی). لە دەقەکانی قورئاندا زۆر نموونەی دیلالەتی گوزارە هەیە، لەوانە:

أ- خوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً﴾[1]، ئەم دەقە ئاماژەیە بۆ چەند حوکمێك، ئەوانیش رێگەدان بەهاوسەرگیری و دیاریکردنی ژمارەی رێپێدراو پاش دڵنیابوون لە دادپەروەری بە چوار، هەروەها پێویستیی رازیبوون بە یەك دانە ئەگەر ترس هەبوو لە فرەژنیدا دادپەروەری نەکرێ. حوکمی یەکەم -رێدان بە هاوسەرگیری- بە تەبەعی مەبەستی دەقەکەیە، دوو حوکمەکەیتر کە رێدانە بە چوار ژن و هێنانی تەنها یەك دانە، بەئەسڵی مەبەستی دەقەکەن.

ب- خوا ئەفەرموێ: ﴿وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾[2]، مەدلولی ئەم دەقە دوو حوکمە کە هەردووکیان لە جێبەند (سیاق)ی دەقەکەدا مەبەستن، ئەوانیش رەتکردنەوەی لێکچوونی فرۆشتن و سووە، لەگەڵ حەلاڵیی فرۆشتن و حەرامیی سوو، یەکەمیان بەئەساڵەت مەبەستە لە جێبەندەکەوە، لەبەرئەوەی وتویانە فرۆشتن وەك سوو وایە، دووەمیش بەتەبەعی لە جێبەندەکە مەبەستە.[3]

---

[1] النساء/ ٣

[2] البقرة/ ٢٧٥

[3] كشف الأسرار مع أصول البزدوي ١/ ٦٨.

## لقی دووەم:
## ئامارەی دەق (دیلالەتی ئامارە)

ئامارەی دەق بریتییە لە دیلالەتی لەفز لەسەر حوکمێکی نامەبەست بە هێنانی لەفزەکە، بەڵام وابەستەی ئەو حوکمەیە کە قسەکەی لەپێناودا هێنراوە و لە هەموو روویەکەوە دیار نیە[1]، لە نموونەکانی:

١- خوا ئەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ... الآية﴾.[2]

ئەم دەقە بە گوزارە بەڵگەیە لەسەر رێگەدان بە خواردن و خواردنەوە و چێژوەرگرتن لە ژن لە سەرجەم شەوانی رەمەزان لە مەغریبەوە تا هەڵاتنی سپێدەی راستەقینە.

هەروەها بەئامارە بەڵگەیە لەسەر دروستیی رۆژووی ئەو کەسەی بە لەشپیسی (جەنابەت) رۆژ دەکاتەوە مادام تا هەڵاتنی کازیوە چێژبینین دروست بێ.

٢- خوا ئەفەرموێ: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[3].

ئەم دەقە بەگوزارەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەفەقەی دایك و منداڵەکانی -لە خواردن و بەرگ- لەسەر باوکان واجبە و کەس لەوەدا هاوبەشیان نیە. بە ئامارەیش

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] البقرة/ ١٨٧.

[3] البقرة ٢٣٣.

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەسەبی منداڵ دەدرێتە پاڵ باوکی نەك دایكی، لەبەرئەوەی بە پیتی (لام) کە بۆ تایبەتکردنە منداڵەکەی وەپاڵ ئەو داوە.

وەپاڵدانی نەسەب بۆ لای باوکیش هەندێ حوکمیتری لێ دەکەوێتەوە:

١- منداڵ قورەیشی دەبێ ئەگەر باوکی قورەیشی بوو با دایکیشی قورەیشی نەبێ، کاریگەریی ئەم بابەتە زیاتر بەلای ئەوانەوە دەردەکەوێ کە ئەوە بۆ لێوەشاوەیی و ئیمامەتی گەورە بەمەرج دادەنێن.

٢- نەفەقەی منداڵ لەسەر باوکیەتی و لەوەدا کەس هاوبەشی نیە لەبەرئەوەی بەتایبەت وەپاڵ ئەو دراوە.[1]

٣- تەنها باوك مافی ئەوەی هەیە لەکاتی پێویستدا ببێتە خاوەنی ماڵی منداڵەکەی.[2]

بەئاماژەی دەقەکان وەك مانای ئیلتیزامی مەدلولەکانیان یان وەك سەرخەسی دەڵێ (ئاماژە بەبەراورد بە گوزارە وەك کینایە و ئاماژە وایە لەچاو راشکاوی، یان وەك کێشەدار لەچاو روون).[3]

لەبەرئەوە زانینی پێویستی بە تێگەیشتنی زیاتر هەیە لە لەفزەکانی شەریعەت و مەدلولەکانی زمان، یان بە دەربڕینێکیتر پێویست بە بەهرەیەك دەکا کە لەم بوارەدا رێگە روناك بکاتەوە. لەم روانگەوە جیاوازیی ئەقڵ و تێگەیشتنەکان لە زانینیان لای شەرعزان بووەتە مایەی جیاوازییان لەو حوکمانەی لە دەقەکان لەرێی دیلالەتی ئاماژەوە هەڵدەهێنجرێن، ئەویش لەبەر جیاوازیی تێڕوانینیان لە رێگەی دیلالەتەکان و شێوازەکانی قورئانی پیرۆز لە روونکردنەوەی حوکمە شەرعیەکان، لەو حوکمە خیلافیانەیش:

---

[1] أصول السرخسي ١/ ٢٣٧ المراة ٢/ ٧٥.
[2] كشف الاسرار لعبد العزيز البخاري مع البزدوي ١/ ٧٠.
[3] أصول السرخسي ١/ ٢٤٠.

أ- جیاوازی له دروستیی رۆژووی ئەو کەسەی بەئەنقەست بە لەشپیسی تا بەیانی ماوەتەوە، جمهوری شەرعزان لەگەڵ ئەوەن زیان بە رۆژوو ناگەیەنێ لەبەرئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ﴾ ، کە بەئامارە بەڵگەیە بۆ دروستیی رۆژوو لەگەڵ لەشپیسیدا لەبەر ئەوەی بەڵگەیە لەسەر دروستیی چێژوەرگرتن لە ژن تا دوا بەشی شەو، جا ئەگەر لەشپیسی رۆژووی بشکاندایە دەبوو رۆژووگر بەر لە بەیان خۆی بشوات، کە گوزارەی دەقەکە ئەوە رەت دەکاتەوە.

هەندێ شەرعزان وەك شیعەی ئیمامی رایان وایە ئەو کەسەی بەئەنقەست بە لەشپیسی بمێنێتەوە تا بەیانی رۆژووەکەی فاسیدە.[1] توسی دەڵێ: "بۆی هەیە ئەگەر هێندە کات بۆ خۆرهەڵاتن مابوو کە بتوانێ خۆی تێدا بشوات، بەڵگەیشمان کۆدەنگیی فیرقەیە لەسەر ئەوەی هەرکەس بەئەنقەست و بەبێ زەرورەت بەلەشپیسی بەیانی بکاتەوە قەزا و کەفارەتی لەسەرە".[2] ئەمە مانای ئەوەیە حسابیان بۆ ئامارەی دەقەکە نەکردوە لەو ئایەتەدا، لەبەرئەوەی ئیمامەکانیان کۆدەنگن لەسەر کارکردن بەپێچەوانەی.

ب- جیاوازی لەبارەی لەپێشتربوونی یەکێك لە دایك و باوك بۆ نەفەقەکێشان ئەگەر کوڕەکەی نەیدەتوانی نەفەقەی هەردووکیان بکێشێ، کە شەرعزانی حەنەفی سێ رایان لەوبارەوە هەیە[3]، یەکەمیان ئەوەیە دایك پێش دەخرێ لەبەرئەوەی بێتوانایە، دووەمیان پێشخستنی باوکە لەبەر ئەوەی لە منداڵیدا نەفەقەی کوڕەکە لەسەر ئەو واجب بووە، سێیەمیان دابەشکردنی نەفەقەکەیە لەنێوانیاندا لەبەر یەکسانییان لە پلەی خزمایەتیدا.

---

[1] كنز العرفان في فقه القرآن للحلي ١/ ١٧٢

[2] الخلاف للطوسي ١/ ٣٨٠.

[3] البدائع ٤/ ٣٦ و پاشتر. فتح القدير ٣/ ٣٤٧.

ئەوەی باوکی پێشی دایك خستوە پشتی بە دیلالەتی ئاماژە لە ئایەتی ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ﴾ بەستووە و دەڵێ باوك لە مافی نەفەقەكێشانی لەلایەن كوڕەكەیەوە لەپێش هەر كەسێكیترەوەیە لەو خزمانەی مافی نەفەقەكێشرانیان هەیە بەدایكیشەوە، لەبەرئەوەی تەنها باوك نەفەقەكێشانی منداڵەكەی لەسەر واجب كراوە، لەبەرئەوە پێویستە لە نەفەقەكێشرانیشی لە ماڵی ئەو منداڵەی تەنها ئەو بێ.

ئەوەیش دایكی پێش خستوە پشتی بەو حەدیسەی ئەبوهورەیرە بەستوە كە دەگێڕێتەوە: ((أن رجلاً جاء إلى النبي (ﷺ) فقال من أحق الناس بحسن صحابتي يا رسول الله قال: أمك، قال: ثم من؟ قال: أمك، قال: ثم من؟ قال أمك، قال ثم من؟ قال أبوك))[1].

---

[1] رواه البخاري ومسلم.

## لقی سێیەم:
## دیلالەتی دەق

دیلالـەتی دەق بریتییـە لـە دیلالـەتی لـەفز لەسـەر جـێگیری (ثبـوت) حوکمـە راگەیەنراوەکەی بێدەنگی لێکراو (المسکوت عنه) لەبەر هاویەشییان لـە مانایەکدا کـە هەموو شارەزایەکی زمان، بەبێ ئەوەی پێویسـت بـە بیرلێکردنـەوە و ئیجتیهـاد بکـا، دەزانێ ئەو مانایە عیللە یاخود هۆ (مناط)ی حوکمەکەیە. لەوەیشدا هیچ جیاوازی نیە لەنێوان ئەوەی ئاخۆ ئەوەی بێدەنگی لێکراوە لەپێشترە بـۆ حوکمەکـە لـەوەی بـاس کراوە یان یەکسانە پێی.[1]

لێرەوە زانایان گوتویانە ئەو حوکمەی بە دیلالـەتی دەق جـێگیر بـووە، بەرێگـەی چەمکی زمانەوانی جـێگیر بـووە نـەك بەرێگـەی ئیجتیهـاد و هـەڵێنجان، لەبەرئـەوەی واجبکەری حوکمەکە کە لە بێدەنگلێکراودا بەدیهاتووە -وەك لە گوزارەی دەقەکـەدا بەدیهاتووە- زانینی تەنها بە شارەزایی لە زمان بووە ئەگەرچی دەرکەوتن و روونبیان بەپێی چەند ئاستێك بـەگوێرەی سروشـتی دەقەکـە و زانـایی ئـەو کەسـەی دەیـەوێ حوکم لە دەقەکە هەڵێنجێ، جیاوازە.[2]

هەندێ کەس ئەم دیلالەتەی بە دیلالەتی دیلالەت ناو بـردوە، لەبەرئـەوەی حـوکم تێیدا لە مانای دەقەکەوە وەردەگیرێ نەك لە لەفزەکـەی، زۆر کەسـیش ناویـان نـاوە فەحوای قسە ماناکەیەتی.[3]

---

[1] التوضیح مع التلویح ١/ ١٣١.

[2] کشف الاسرار مع البزدوي ٧٣/١. تفسیر النصوص للدکتور محمد أدیب صالح ١/ ٥١٦.

[3] أساس البلاغة ص ٢٣٥ و پاشتر. هەندێ لە ئوسوڵناسان وتویانە فـەحوای گوتـاری بێدەنگی لێکـراو لـە گوتراو لەپێشتر بۆ حوکم.

لای شافیعیش پێی دەوترێ (مەفهومی موافەقە) لەبەرئەوەی مەدلولی لەفزەکە لە شوێنی بێدەنگبوون (السکوت) لەگەڵ مەدلولەکەیدا لە شوێنی گوتراو (المنگوق)دا کۆکە. ئەوەی گوزارە (عیبارەت)ەکە ئاماژەی بۆ کرد و ئەوەی دیلالەتەکە ئاماژەی بۆ کرد لە واجبکەری حوکمەکەدا کۆکن[1]، لە نموونەکانی ئەم دیلالەتە:

أ- ئەوەی خوای گەورە لەبارەی تاوانەکانی ماڵەوە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْماً إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَاراً وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيراً﴾[2]، ئایەتەکە بەگوزارەکەی ئاماژەیە بۆ حەرامیی خواردنی ماڵی هەتیو بەستەم، بە دیلالەتیش ئاماژەیە بۆ حەرامیی هەر شتێکیش ببێتە هۆی فەوتاندنی ئەو ماڵە وەك سوتاندن یان فەوتاندن یان کەمتەرخەمیی بەخێوکەر لە پاریزگاری لێکردنی، لەبەرئەوەی قسەبۆکراو (موخاتەب) بە زمان تێدەگا کە مەبەستی شەرعدانەر لە ئایەتەکە حەرامکردنی دەستدرێژییە بۆ سەر ماڵی هەتیوان، ئیتر جۆری دەستدرێژیەکە هەرچی بێ.

ب- ئەوەی خوای گەورە لەبارەی ئەحکامی ئافرەتانی مەحرەمەوە ئەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ﴾[3]، ئایەتەکە بە گوزارەی دەقەکە ئاماژەیە بۆ حەرامکردنی هاوسەرگیری لەگەڵ خوشك و پوور و هتد. هەروەها بە دیلالەتی دەق بۆ حەرامکردنی داپیرە و کچانی رۆڵە بۆ نموونە، لەبەرئەوەی شارەزا لە زمان دەزانێ حەرامکردنەکە لەرووی خزمایەتیەوەیە کە جۆرە شانازی و رێزگرتنێك دەخوازێ، هەمان ئەو هۆیە لەو جۆرە خزمانەیشدا هەیە.

---

[1] کشف الاسرار مع البزودي ٧٣/١ .

[2] سورة النساء/ ١٠

[3] النساء/٢٣.

تویـژەر لای هەنـدێ لـە پاشـینەکان لـە زانـا ئوسولناسـەکانی حەنەفیـەت وەك عەبدولعـەزیز ئـەلبوخاری و کـەمال بـن هـەمام دەبـینێ دیلالـەتی دەق بـۆ گومـانبڕ و گومانگر دابەش دەکەن[1]. گومانبڕ ئەوەیە بەگوێرەی ئەو حوکمەی بەدەق هاتوە و بـە بوونی لە بێدەنگی لێکراودا کە دەویسترێ حوکمەکـەی بـۆ تێپـەڕێ، قسـەی یـەکلای تێدا کراوە، وەك ئەوەی خوا دەفەرموێ ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً﴾[2] دیلالەتی نەهیکردن لە ئۆفکردن (لەدەستیان) بۆ حەرامکردنی ئازاردانی دایـك و بـاوك بەهـەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی ئـازاردان وەك لێـدان و جـوێن پێـدان دیلالەتێکی گومانبڕە، لەبەرئەوەی ئەو مانایەی حوکمەکـەی لەسـەر بینـا کـراوە، لـە لێدان و جوێندا بەباشتر بەدیدەکرێ.

گومانگریش ئەوەیە بەگوێرەی ئـەو حوکمـەی یەکـەم جـار بـەدەق باسـی کـردوە قسەی کۆتای تێدا نەکراوە، کە دەکرێ دڵنیایی بدرێ لە بـوونی لـە بێـدەنگیلێکراودا، لەبەرئەوەی دەکرێ مەبەست غەیری ئەو بێ.

کاتێ دیلالەتی دەق گومانبڕ بێ ئیتر بەئاستەم هیچ جێگەیەك بۆ ناکۆکی لەبارەی جێگیریی حوکمی بەدەق باسکراوی بێدەنگیلێکراو دەمێنێ، بەڵام نـاکۆکی سـەبارەت بەوەی حوکمەکەی بۆ بێدەنگیلێکراو پێ جێگیر بووە بەسەر سێ بۆچووندا دابـەش بووە: رایەك پێی وایە بە قیاسی رۆشن (القياس الجلي) جـێگیر بـووە، کـە ئـەوە رای جمهوری شافیعی و موختـاری بەیزاوییـە + بۆچـوونێك پێـی وایـە بـە دیلالـەتی دەق جێگیر بووە، ئەوەیش رای حەنەفیەتە + بۆچوونێکیش پێی وایە بە گوتراو (مەنتوق) جێگیر بووە ئەوەیش رای هەندێ لە ئوسولناسەکانە.

---

[1] كشف الاسرار مع البزدوي ١/ ٣٧ التحرير مع التقرير والتحبير ١/ ١١٣ فما بعدها.

[2] الأسراء/ ٢٣.

بەلام ئەگەر دیلالەتی دەق گومانگر بوو بەوەی واجبکەری حوکمەکە لە هەردووکیان یان یەکێکیاندا جێگومان بوو، ئەوا زانایان لە ئوسولناس و شەرعزان بۆچوونیان جیاوازە لە بوون و نەبوونی مانای واجبکەری حوکمەکە لە بێدەنگیلێکراودا، ئەم جیاوازیەیش وای کردوە لە زۆر مەسەلەی فیقهیدا جیاواز بن، لەوانە:

أ- شەرعزان لەبارەی حوکمی نێربازی (اللواطة)وە چەند رایەکی جیاوازیان هەیە:

ئەبوحەنیفە رای وابووە سزای بکەری ئەم تاوانە تەنها تەعزیرە، ئەبو یوسف و محەمەد بن ئەلحەسەن و شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن پێیان وابووە ئەم تاوانە وەك زینا وایە و بکەرەکەی حەدی زینای دەکەوێتە سەر. ئەوە رای ئیمام ئەحمەدیشە لە ریوایەتێك لێیەوە، بەر لەوانە عوسمان ئەلبەتی و حەسەن بن سالح و ئیبراهیم و عطاء ئەو بۆچوونەیان هەبووە. ئیمام مالیك و لیث و ئەوانەی هاوڕایانن رایان وابووە کە سزایان بەردبارانکردنە جا تاوانبارەکە بەهاوسەر (محصن) بێ یان بێ هاوسەر (غیرمحصن) ئەوەیش ریوایەتێکیترە لە ئیمام ئەحمەدەوە.

ئەسڵ لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ... الآیة﴾.[1] کە بەرێگەی گوزارە (العبارە) ئاماژەیە بۆ پێویستیی جێبەجێکردنی حەد لەسەر زیناکاری ژن و پیاو، بەشێوەیەکی دیلالەتیش پێویستبوونی لەسەر نێرباز، ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین بۆچوونیان وابووە کار بە دیلالەتی دەقەکە نەکرێ، لەبەرئەوەی عیللەی حەد لە زینادا فەوتانی نەفسێکە بە مانا و حوکم، لەبەرئەوەی ئەو منداڵەی لە داوێنپیسی دەکەوێتەوە لە چەندین رووەوە وەك نەبوو وایە، لەوانە فەوتانی نەسەب و نەبوونی کەسێك خەرجی بکێشێ، ئەمەیش لە نێربازیدا نیە، لەبەرئەوەی شوێنەکە شوێنی وەچەخستنەوە نیە، هەروەها لەبەرئەوەی لە زینادا شەهوەت بۆ هەردوولا سەلماوە، بەپێچەوانەی نێربازی،

[1] - النور/٢.

هەروەها لەبەرئەوەی ئەم کارە لەو رەفتارانەیە سروشتی ساغ قیزی لێدەکا و تەنها کەسانی شاز رووی تێدەکەن.

هەندێکیتر رایان وابووە دەست بە دیلالەتی دەقەکەوە بگیرێ، لەبەرئەوەی عیللەی حەدی زینا رژاندنی ئاوە لە شوێنێکی حەرامی ئارەزووکراودا، ئەم مانایەیش لە نێربازیدا زیاترە، بۆیە حەرامیەکەی زیاترە.[1]

ب- شەرعزان لەبارەی واجببوونی کەفارەت لە کوشتنی بەئەنقەستدا جیاوازن:

جمهور- لەوانە حەنەفی و مالیکی و حەنبەلیەکان- رایان وایە لە کوشتنی بەئەنقەستدا کەفارەت واجب نیە، شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین پێیان وایە هاوشێوەی کوشتنی بەهەڵە لەویشدا واجبە، ئەسڵیش لەوەدا ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَئاً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾[2]، ئەم دەقە بەگوزارەی دەق ئاماژەیە بۆ واجبیی کەفارەت لە کوشتنی بەهەڵەدا -کە رەگەزی مەبەستی تێدا نیە، بۆیە بۆ هی بەئەنقەست -کە رەگەزی بەئەنقەستکردنی تێدایە- شایانترە و شایستەترە.[3]

جمهور رای وایە ئەو عیللەیەی کەفارەت واجب دەکا بریتییە لە قەرەبووکردنەوەی ئەو خەمساردی و وردنەبوونەوەیەی هەڵەکوژ کە بووەتە مایەی فەوتانی نەفسێکی رێزدار و مەعسوم، نەک سزادان لەبەرئەوەی هەڵەکردوو گوناهبار نیە، واتە ئەو عیللەیەی لە کوشتنی بەهەڵەدا هەیە لە کوشتنی بەئەنقەستدا بەدی نەهاتووە. مەرج نیە قەرەبووکردنەوەی خەمساردی لە کوشتنی بەهەڵەدا بەکەفارەت، قەرەبووی لەوە بەهێزتر بسەپێنێ. ئەوەی قەرەبووی سووکتری پێ بکرێ بۆ ئەوە دەست نادا

---

[1] - بڕوانە: أحكام القرآن للجصاص ٣/ ٣٠٣ المغني لابن قدامة ١٨٦/٨ و پاشتر. المهذب للشيرازي ٢٦٨/٢ نيل الاوطار للشوكاني ١٢٢/٧ حاشية الدسوقي على الشرح الكبير ٤/ ٣١٤ و پاشتر. فتح القدير ٤/ ١٥٠ و پاشتر.

[2] - النساء/٩٢.

[3] -مسلم الثبوت مع فواتح الرحموت ٤٠٩/١ التحرير مع التقرير والتحبير ١/ ١١٣.

قەرەبووی بەهێزتری پێ بکرێ.[1]

حەنەفیەت گوتویەتی دەستگرتن بە دیلالەتی دەق لێرەدا، لەگەڵ دیلالەتی ئاماژە لە ئایەتی: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُّتَعَمِّداً فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً﴾[2] تێکدەگیرێ، چونکە ئەم دەقە بەڕێگەی ئاماژە بەڵگەیە لەسەر واجبنەبوونی کەفارەت لەسەر بکوژی دەستدرێژکار، لەبەرئەوەی تەواوی بەشەکان لەخۆ دەگرێ بەوەی باسی نەمربوونی لە جەهەنەم و دووچاربوونی بە غەزەب و نەفرەتی خوا و ئەو سزایەی بۆی ئامادە کراوە، کردوە[3]. دیلالەتی ئامـاژەیش لە دیلالەتی دەق بەهێزترە، لەبەرئەوەی دیلالەتی ئاماژە دیلالەتێکی راستەوخۆیە لەڕێی پابەندیەوە، بەڵام دیلالەتی دەق دیلالەتە لەڕێی ئەو مانایەی عیللەی حوکمەکەیە، کە بەبێ میانە (واسطة)یەك بەهێزتر لە بەمیانە دیلالەت دەکا، هەربۆیە لەکاتی تێکگیراندا ئاماژە بەسەر دیلالەتدا زاڵ بووە.[4]

---

[1] – تبيين الحقائق شرح الكنز للزيلعي ٦/١١ و پاشتر.

[2] – النساء/ ٩٣.

[3] – مسلم الثبوت مع فواتح الرحموت ١/ ٢٥٣ و پاشتر.

[4] – المنار وشرحه لابن مالك ١/٥٢٩.

## لقی چوارەم:
## خواستی دەق

دیلالەتی خواستی دەق (اقتضاء النص) بریتییە لە دیلالـەتی قسـە بـۆ مانایـەکی دەرەکـی، کـە راسـتیی ئـەو قسـە یـان دروسـتییە شـەرعی یـان ئەقڵیەکـەی لەسـەر دەوەستێ.[1] واتە ئەگەر راستیی قسە یان دروستییە شەرعی یـان ئەقڵیەکـەی لەسـەر مانایەکی دەرەوی لەفزەکە وەستا، بە دیلالەت لەسەر ئەو مانا تەقـدیرکراوە دەوتـرێ دیلالـەتی خواسـتن (دلالـة اقتضـاء)، لەبەرئـەوەی دامـەزراویی قسـەکە ئـەو مانایـە دەخوازێ و دەگەیەنێ. پاڵنەر بۆ تەقدیر و زیادکردن بریتییە لـە بخـواز (المقتضـي)، زیادکراو (المزید) خوازراوەکە و دیلالەتە بۆ ئـەوەی ئـەم قسـەیە بـەبێ ئـەو تەقـدیرە دانامەزرێ. زیادەکەیش بریتییە لە خواستن و ئەوەیش پێی جێگیر بـووە بریتییـە لـە حوکمی خوازراو (المقتضى).

لەم روانگەوە دیلالەت بۆ ئەو حوکمەی لە دیلالەتی ئیقتیزاوە وەرگیراوە لە هەمان لەفز نابێ، هەروەك نە لەوەی وابەستەیەتی و نە لـە مەفهومـە زمانەوانیەکـەی دەبـێ، بەڵکو بە فەرمانێکی زیادە دەبێ کە راستی (صدق) یان دروسـتی (صـحە)ی قسـەکە خواستویەتی.

ئەو مانایەی راستیی قسە یان دروستی لای ئوسوڵناسان لەسـەر دەوەسـتێ سـێ بەشە:[2]

١- ئەوەی زەرورەتی راسـتیی قسـەکە مەزەنـدەکردنی واجـب کـردوە، وەك ئـەو حەدیسەی کە ئیبن عەباس ریوایەتی کردوە: ((إن الله وضع عن امتي الخطأ والنسياء

---

[1] التلويح على التوضيح ١/ ١٣٧.

[2] البزودي مع الكشف ١/ ٧٦.

وما استكرهوا عليه))[1]، ئاشكرايه هەڵە و لەبیرچوون هەڵنەگیراون بەبەڵگەی ئەوەی ئوممەت دەکەوێتە هەردووکیان، بۆیە پێویست بە تەقدیرێکی حەزفکراو دەکا وەك: دانانی گوناهی هەڵە یان حوکمەکەی.

٢- ئەوەی زەرورەتی راستیی قسەکە لەرووی ئەقڵیەوە تەقدیرکردنی واجب کردوە وەك لەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿فَلْيَدْعُ نَادِيَه﴾[2]، ئەم قەسەیە لەرووی ئەقڵیەوە راست نابێ بەبێ تەقدیرێکی حەزفکراو لەبەرئەوەی (النادی) -کە شوێنەکەیە- بانگ ناکا لەبەرئەوە پێویست بە تەقدیرکارێك هەیە تا قسەکەی پێ رێك بێتەوە ئەویش خەڵکەکەیەتی: با بانگی خەڵکی نادیه بکا.

٣- ئەوەی زەرورەتی راستیی قسەکە لەرووی شەرعەوە تەقدیرکردنی واجب کردوە وەك فەرمان بە ئازادکردن لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾، کە بەمانای فەرمانکردنە، واتە کۆیلە ئازاد بکەن، ئەم فەرمانە موڵك دەگەیەنێ، وەك ئەوەی بڵێ ئازادکردنی کۆیلەیەکی بەموڵککراو.[3]

ئەم سێ جۆرە دەچنە ناو دیلالەتی خواستن (الاقتضاء) بەلای ئوسوڵناسانەوە بەگشتی لە پێشینانی حەنەفی و هاوەڵانی شافیعی و ئەوانەی شوێنیان کەوتون.

---

[1] هذا الحديث يروي في كثير من كتب الاصول والفقه رفع عن امتي الخطا والنسيان وما استكرهوا عليه وجاء في اللالالي قول السيوطي لا يوجد بهذا اللفظ وأقرب ما وجد ما رواه ابن عدي في الكامل عن ابي بكر بلفظ رفع الله عن هذه الامة ثلاثا الخطأ والنسيان والأمر يكرهون عليه. انظر المقاصد الحسنة للسخاوي ص ٢٢٨ - ٢٢٩ كشف الخفاء ومزيل الالباس للعجلوني ١/ ٤٣٢.

[2] العلق/ ١٧.

[3] كشف الاسرار مع البزدوي ١/ ٧٦٠ التوضيح مع التلويح ١/ ١٤٠.

## گشتیبوونی خوازراو (عموم المقتضی)

موقتەزا (خوازراو) ئەوەیە -وەك پێشتر باس کرا- لەپێناو راستیی قسەکە یان دروستییە ئەقڵی یان شەرعیەکەی تەقدیرکردنی واجب کراوە[1]، تەقدیریش بەکەڵك نایەت ئەگەر بەهۆی جیاوازیی هەردووکیان

چەند شتێك لە مانایەکدا جیاواز بن، لەباری نەبوونی قەرینەیەکدا مەبەست دیاری بکا دیاریکردنەکە دەبێتە جێناکۆکی ئەگەر رارا بێ. دیدی زانایان لە لە خواستی ئەوەی ئەگەر زۆر تاك بگرێتەوە جیاوازە، جیاوازیەك کاریگەری لەسەر زۆر لق و حوکم بووە، هۆی ئەوەیش ناکۆکییە لە گشتیبوون و گشتینەبوونی خوازراودا، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- کۆمەڵێ رایان وایە خوازراو (المقتضی) لە سەرجەم ئەوەی دەیگرێتەوە، بەعموم وەردەگیرێ لەبەرئەوەی سوودی گشتیترە[2]، هەندێ لە شافیعی و حەنەفیەکان ئەم قسەیەیان داوەتە پاڵ شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ)[3]، خاوەنانی ئەم رایەیش پشتیان بە چەند بەڵگەیەك بەستوە لەوانە:

أ- شاردنەوەی یەکێك لە دوو حوکمەکە لەویتریان لەپێشتر نیە، جا یان ئەوەتا هیچ حوکمێك بەهیچ شێوەیەك ناشارێتەوە کە ئەوە جائیز نیە لەبەرئەوەی پەکخستنی دیلالەتی لەفزەکەیە، یان دەبێ هەموو بشارێنەوە کە ئەوە داواکراوە[4].

---

[1] أي عند المتقدمين من الحنفية دون المتأخرين.

[2] أرشاد الفحول ص ١٣١ كشف الاسرار مع البزدوي ٢/ ٥٦٤.

[3] بروانە: تخريج الفروع على الأصول للزنجاني ص ١٤٥البزدوي مع الكشف ٧٦/١.

[4] بروانە: ارشاد الفحول ص ١٣١.

ب- موقتەزا داواکراو و مەبەستی دەقە و وەك ئەوەی لێهاتووە کە بەدەق باس کراوە، ئەگەر باس بکرایە عموم و خسوسی دەبوو، بەهەمان شێوە ئەگەر موقتەزای دەقیش رووی دا[1].

٢- حەنەفیەت و زۆریتر جگە لەوان وەك ئامەدی و غەزالی لە زانایانی شافیعی بۆ ئەوە چوون موقتەزا عمومی نیە، بەڵکو ئەوەی دەلیلێك ئاماژە بوو بۆ ویستنی، تەقدیر دەکرێ، بەڵام ئەگەر دەلیلەکە ئاماژە نەبوو بۆ یەك ویست کە دروستە تەقدیر بکرێ، موجمەل دەبێ. شەوکانی لە مەزەبی زەیدی دەڵێ ئەمە راستە و ئەبوئیسحاقی شیرازی و ئیبن سەمعان و فەخرەدینی رازی و ئیبنولحاجب[2] هەڵیانبژاردوە.

**خاوەنانی ئەم قسەیە پشتیان بە چەند بەڵگەیەك بەستووە لەوانە:**

١- گشتیبوون (عموم) بۆ لەفزە نەك بۆ مانا. ئەبوئیسحاقی شیرازی دەڵێ: قسەی موجمەل کە پێویستی بە شاردنەوەی هەبێ لە شاردنەوەیدا بانگشەی گشتیبوون ناکرێ، ئەویش وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ﴾ ، کە پێویستی بە شاردنەوە (اضمار) هەیە، هەندێکیان کات ئیحرامی حەج چەند مانگێکی دیاریکراو دەشارنەوە، هەندێکیان کاتی کردەوەکانی حەج چەند مانگێکی دیاریکراو دەشارنەوە، بۆیە رێکخستن لەسەر ئەوانە دروست نیە بەڵکو لەسەر ئەوە رێك دەخرێ کە بەڵگە ئاماژە بێ بەوەی مەبەست ئەوەیە، لەبەرئەوەی عموم لە سیفەتەکانی گۆکردن (نوتق)ـە، بۆیە داواکردنی لە ماناکاندا دروست نیە.[3]

---

[1] تخريج الفروع على الاصول الزنجاني ص ١٤٥.

[2] ارشاد الفحول ص ١٣١.

[3] اللمع لأبي اسحاق الشيرازي ص ١٦ .

٢- جێگیربوون (سبوت)ی زەرورەت بوو، زەورەراتیش بەئەندازەی خۆیان مەزەندە دەکرێن مادام قسەکە بەبێ ئەوە مانا بگەیەنێ.[١]

٣- کۆمەڵێ رایان وابووە بەپێی حوکمە جێناکۆکەکە وەردەگیرێ، چونکە جگە لەوە بەئیجماع زانراوە، ئەبوئیسحاقی شیرازی[٢] رەخنەی لەم رایە گرتوە و بەهەڵەی داناوە و دەڵێ: دروست نیە بەپێی شوێنی ناکۆکیەکە وەربگیرێ لەبەرئەوەی زاڵکردن (ترجیح)ە بەبێ زاڵکەر، چونکە ئەگەری بۆ شوێنی ناکۆکیەکە و جگە لەویش یەکە، بۆیە دروست نیە بۆ شوێنی ناکۆکیەکە تایبەت بکرێ.

**ئەم ناکۆکییە جیاوازیوونی لە هەندێ مەسەلەی فیقهیدا لێ کەوتۆتەوە، لەوانە:**

أ- شەرعزان سەبارەت بە بەتاڵیی نوێژی ئەو کەسەی بەسەهو یان هەڵە قسە بکا رای جیاوازیان هەیە، ئەوەی باوەڕی بە (عمومی موقتەزا) هەیە وەك شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین دەڵێن نوێژ بەتاڵ نابێتەوە لەبەرئەوەی حوکمی لەسەرهەڵگرتنی گوناه کە لە حەدیسەکەی ئیبن عەباسدا هاتووە دنیایی و ئوخرەوی دەگرێتەوە، لەبەرئەوە نوێژ بە قسەیەکی کەم بەسەهو یان بەهەڵە لە دنیادا بەتاڵ نابێتەوە، هەروەك ئەو نوێژخوێنەی لە نوێژەکەیدا بەهەڵە یان لەبیرکردن قسەی کردوە لەودنیا گوناهبار نابێ.[٣]

ئەوەیش پێی وایە گشتیبوون لە (موقتەزا)دا نابینێ وەك حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن ئەوەی بەهەڵە یان لەبیرچوون قسە بکا، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە ئەوەی لە حەدیسەکەدا لەسەر ئوممەت هەڵگیراوە ئەو

---

[١] بڕوانە: المستصفي للغزالي ص ٣١٧ .

[٢] اللمع ص ١٧ .

[٣] بڕوانە: منهاج النووي مع مغني المحتاج ١/ ٤٣٠ .

گوناهەیە سزای لەسەرە لەودنیا نەك ئەو بەتاڵیەی دووبارەکردنەوە دەخوازێ، کە حوکمە دنیاییەکەیە.[1]

ب- لەبارەی بەتاڵیی رۆژوو بە خواردن بە هەڵە یان زۆرلێکردن رای جیاوازیان هەیە، حەنەفی[2] و مالیکیەکان[3] لەگەڵ ئەوەن هەرکەس -لەکاتی بەرۆژووبوندا- بەهەڵە یان بەزۆر خواردن بخوات دەبێ قەزای بکاتەوە، بەڵام حەنەفیەت گوتویانە هەڵەکردوو و زۆرلێکراو بەقیاس رۆژوو دەشکێنێ، بەڵام بە ئیستیحسان نایشکێنێ.

رووی ئیستیحسانەکەیش ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) بەو کەسە گوت کە بە لەبیرچوون خواردی و خواردیەوە: رۆژووەکەت تەواو بکە، چونکە ئەوە خوا خواردن و خواردنەوەی داویتێ[4]. شافیعی[5] و حەنبەلیەکان[6] و ئیبن حەزمی زاهیری[7] و ئەوانەی هاوڕایانن[8] رایان وایە قەزا ناکرێتەوە. بەڵگەی شافیعیەکان و ئەوانەی هاوڕایانن تەنها (عمومی موقتەزا) نیە، بەڵکو ئەوەیشیان بەبەڵگە هێناوەتەوە کە ئەبوهورەیرە ریوایەتی کردوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: " من نسي وهو صائم فأكل أو شرب فليتم صومه فإنما أطعمه الله وسقاه "[9]

---

[1] بڕوانە: فتح القدير ١/ ٣٩٥ .
[2] فتح القدير ١/ ٣٩٥ البدائع ٣/ ١٠٠.
[3] حاشية الدسوقي على الشرح الكبير ١/ ٥٢٥ .
[4] وفي رواية أبي هريرة " من نسي وهو صائم فأكل أو شرب فليتم صومه."
[5] المجموع النووي ٦/ ٢٨٥ .
[6] نيل المارب ١/ ١٠٠.
[7] المحلى ٦/ ٢٢٠ .
[8] نيل الأوطار ٦/ ٢٤٩ .
[9] رواه أبو هريرة سبل السلام ٢/ ٢١٢ .

گوتویانە، زۆرلێکراو لەپێشترە بۆ بەتاڵنەبوونی ڕۆژووەکەی لە لەیادکردوو، چونکە ئەو داوای لێکراوە بۆ دوورخستنەوەی زیان لەخۆی خواردن بخوات.

ج- لەبارەی کەوتنی تەڵاقی زۆرلێکراو جیاوازن، حەنەفیەت[1] پێی وایە زۆرلێکراو تەڵاقی دەکەوێ. ئەم قسەیەیش لە هەریەك لە ئەلنەخعی و ئیبن ئەلمسەیب و (الثوري) و ئەلشەعبیەوە گوێزراوەتەوە. گوتویانە زۆرلێکراو لەقسەکردندا توانای تەواوی هەڵبژاردنی هەیە لە هۆدا، بەڵام بەحوکمەکە ڕازی نیە لەبەرئەوەی هەردوو شەڕەکەی زانیوە و سووکترینیانی لەسەر خۆی هەڵبژاردوە[2]، هەروەها لەڕووی کەوتنی تەڵاقەوە قیاسیان کردوە لەسەر ئەو کەسەی بەسوعبەت تەڵاق دەخا، ئەویش بەو خاڵە هاوبەشەی کە لە هەردوو حاڵەتەکەدا هۆکە (لەفزی تەڵاق) بەکارهاتووە بەبێ ئەوەی بوێژەکە مەبەستی ماناکەی بێ.[3]

حوکمی تەڵاقکەوتنی شۆخیکار بە حەدیسی سەحیح ساغ بووەتەوە کە ئەبوهورەیرە لە پێغەمبەری خواوە گێڕاویەتیەوە: (ثلاث جدهن جد وهزلهن جد النكاح والطلاق والرجعة).[4]

مەزەبی مالیکی[5] و شافیعی[6] حەنبەلی[7] و شیعەی ئیمامی[8] و زەیدی[1] و زاهیری[2]، ڕایان وایە لەبەر (عمومي موقتەزا) تەڵاقی زۆرلێکراو ناکەوێ[3]،

---

[1] فتح القدير ٣/ ٤٨٨.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] البدائع ٣/ ١٨٢ .

[4] رواه احمد وأبو داود والترمذي وابن ماجه وقال الترمذي حديث حسن غريب، انظر نيل الاوطار ٦/٤٩. تێبینی دەکرێ بەناوبانگ لە کتێبە فیقهیەکاندا لەباتی (الرجعە) (العتاق)ە.

[5] الشرح الكبير مع حاشية الدسوقي ٢/ ٣٦٧.

[6] المهذب للشيرازي ٢/ ٧٨.

[7] المغني لابن قدامة ٧/١١٨.

[8] المختصر النافع ١/١٩٧.

ئەوەیش قسەی عومەر و عەلی و ئیبن عەباس و ئیبن زوبێرە، رەزای خوایان لێبێ.

تێبینی دەکرێ مالیکی لەگەڵ حەنەفی کۆکن لەسەر پێویستی قەزاکردنەوەی رۆژوو لەلایەن ئەو کەسەی بەزۆر رۆژووی پێ شکێنراوە، بەڵام لە تەڵاقی زۆرلێکراودا پێیان وایە ناکەوێ، هۆکەیشی ئەوەیە مالیکی لەگەڵ حەنەفی هاوڕان لە بەمەرجنەکردنی رەزامەندی لە رێگرەکانی عیبادەتەکاندا بەپێچەوانەی شافیعی و حەنبەلی و زاهیریەکان.. بەڵام لە بەمەرجکردنی رەزامەندی بۆ ئەو هۆیانەی موڵکایەتی دەگوێزنەوە و هەڵوەشاندنەوە قبوڵ ناکەن وەك تەڵاق و خولع و ئەو شتانە، رایان لەگەڵیان جیاوازە.[4]

من وای دەبینم رای زاڵ رای جمهورە کە تەڵاقی زۆرلێکراو ناکەوێ لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ﴾[5]. شیرکیش لە تەڵاق گەورەترە، جا ئەگەر بەهۆی زۆرلێکردنەوە مرۆڤ لەسەر شیرك و کوفری گوناهبار نەبێ، ئەوا لەپێشترە کە لە هەمان دۆخدا پابەند نەکرێ بە ئەسەری تەڵاقەکەیەوە.

٢- ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((لا طلاق ولا عتاق في إغلاق))، زانایانی حیجاز (الاغلاق)یان[6] بە زۆرلێکردن لێکداوەتەوە، واتە ئەو کەسەی دەرگای

---

[1] منهاج الوصول في شرح معيار العقول في أصول الزيدية (ق ١٤٢) مخطوط دار الكتب المصرية.

[2] المحلی ١٠/ ١٠٢.

[3] ئەگەر زۆرلێکردنەکە بەناڕەوا بێ.

[4] بڕوانە: الإكراه بين الشريعة والقانون لزكريا البرديسي ص ٣٩٣ و پاشتر.

[5] النحل/ ١٠٦.

[6] خەڵکی عێراق بە (تووڕەیی) تەفسیریان کردوە. بڕوانە: إغاثة اللهفان في حكم طلاق الغضبان. ص١١.

مەبەست و ئیرادەی بۆ ئەو شتەی زۆری لێکراوە بیکا لێ دابخرێ، تەلاقی ناکەوێ.

٣- ئەوەی ئەبوحەنیفە بۆی چووە هیچ دەقێك پشتگیری ناکا، بەڵکو تەنها لەسەر سەرنجدانی رووت دامەزراوە وەك شوێنکەوتنی ئەسڵەکەیان کە حوکمی تەقدیرکراو لە حەدیسەکەی ئیبن عەباسدا حەزفکراوە نەك موقتەزا، کاتێ نەیانتوانیوە بڵێن حەزفکراو گشتیبوونی نیە، باسیان لە هاوبەشی (اشتراك) کردوە، هاوبەشیش گشتیبوونی نیە، پێشینانیان ئەگەرچی رایان وابووە تەقدیرکراو بریتییە لە موقتەزا، بەڵام گوتویانە موقتەزا گشتیبوونی نیە. بەم شێوەیە هەندێ حوکمیان لەسەر زاراوەیەك بینا کردوە کە لەوانەیە بەلای ئەوانیترەوە پەسەند نەبێ.

## باسی دووەم:
## ڕێبازی جمهور

جمهور لەفزیان بە ئیعتیباری دیلالەتی بۆ گوتراو (منطوق) و مانا (مفهوم) دابەش کردوە. مەنتوقیش بۆ راشکاو و ناڕاشکاو، ناڕاشکاویش بۆ مەبەست و نامەبەست. هەروەها مەفهوم بۆ مانای راستەوانە (مفهوم الموافقة) و مانای پێچەوانە (مفهوم المخالفة).

### دیلالەتی گوتراو:

بریتییە لە دیلالەتی لەفز بۆ حوکمێك لە شوێنی گوتندا (محل النطق)دا[1]، وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾، ئایەتەکە ئاماژەیە بۆ حەرامیی کچی ژن (لە مێردیتری) (ڕەبیبە) بەڕەهایی جا چ لەلای مێردی دایکی بێ یان نەبێ، بەڵام ڕەبیبە کاتێ حەرام دەبێ کە ئەو پیاوە لەگەڵ دایکەکە س بێ.

هەروەها وەك ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((في الغنم السائمة زكاة))، دەقەکە بە گوتراو ئاماژەیە بۆ واجبیی زەکات لە ماڵاتی ئالیکنەخۆردا.

گوتراویش دابەش دەبێ بۆ راشکاو و ناڕاشکاو، گوتراوی راشکاو بریتییە لە دیلالەتی لەفزەکە بۆ حوکمەکە بەڕێگەی پڕاوپڕی (المطابقة) یان تێدابوون (تضمن، کە لای حەنەفی پێی دەوترێ گوزارەی دەق)، وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾، دەقەکە بە مەنتوقی راشکاوی ئاماژەیە بۆ رەتکردنەوەی لێکچوون لەنێوان فرۆشتن و ریبادا، هەروەها بۆ حەڵاڵیی یەکەم و حەرامیی دووەم.

---

[1] بڕوانە: مختصر المنتهى مع شرح العضد وحاشية السعد ١٧١/٢

هەرچی گوتراوی ناڕاشکاوە بریتییە لە دیلالەتی لەفز بۆ حوکمەکە بەڕێگەی پابەندی، لەفزەکە بۆ حوکمەکە دانەنراوە بەڵام حوکمەکە وابەستەی ئەو مانایەیە کە ئەو لەفزەی بۆ دانراوە، ئەویش وەك دیلالەتی ئایەتی ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾، لەسەر ئەوەی نەسەب بۆ باوك دەبێ نەك دایك، هەروەها نەفەقەی منداڵ لەسەر ئەوە نەك دایکی.

گوتراوی ناڕاشکاو بە سەرپێو سەبارەت بە دیلالەتی حوکمەکە بۆ سێ جۆر دابەش دەبێ کە بریتین لە دیلالەتی خواستن و دیلالەتی کلەچاو (ایماء) و دیلالەتی ئاماژە، لەبەرئەوەی مەدلولی ئیلتیزامی یان ئەوەتە لای قسەکەر مەبەست دەبێ لە خودی لەفزەکە یان مەبەست نابێ، یەکەمیان بە حوکمی سەرپێو (ئیستیقرا) دوو بەشە، ئەوانیش دیلالەتی خواستن و دیلالەتی کلەچاون، دووەمیشیان دیلالەتی ئاماژەیە[1].

١- دیلالەتی خواستن (دلالة الاقتضاء): بریتییە لە دیلالەتی لەفز بۆ لازمێك کە لای قسەکەر مەبەستە کە راستی (صدق)ی قسەکە یان دروستیی ئەقڵی و شەرعی لەسەری دەوەستێ، کە هەمان دیلالەتی خواستنە لەلای حەنەفیەت، لای جمهوریش هەمان ئەو جیاوازیەی نێوان شەرعزانی لێ دەکەوێتەوە کە لای حەنەفیەکان لێی کەوتۆتەوە.

دیلالەتی کلەچاو (دلالة الایماء): بریتییە لە بەسترانەوەی وەسفەکە بە حوکمێکەوە کە ئەگەر ئەو یان هاوشێوەی عیللەت نەبن پێوە بەسترانەکەی دوور دەبێ، وەك ئەوەی خوای گەورە لەبارەی سزای دزیکردنەوە ئەفەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا﴾، دەقەکە بە کلەچاو دەلیلە بۆ ئەوەی وەسفی دزی عیللەتە بۆ واجببوونی دەستبڕین.

---

[1] بڕوانە: الأسنوي بشرح البدخشي ٣١١/١

هـەروەها وەك ئـەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) لـە مامەڵـە دارایيەكانـدا كـاتێ لـەبارەی دروستيی فرۆشتنی روتاب بە خورما پرسياری لێكرا، ئەفەرمویٚ: (أيـنقص الرطـب إذا يـبس)؟ فقـالوا: نعـم فقـال: (فـلا إذن). دەقەكـە بـەئاماژە بەڵگەيـە لەسـەر ئـەوەی كەمكردن عيللەی حەرامكردنی روتابە بە خورما.

ئەم جۆرە لەگەڵ هيچكام لـە چـوار جۆرەكـەی پێشـووی ديلالـەت لای حەنـەفی يەكناگرێتەوە.

٢- ديلالەتی ئاماژە (دلالة الاشارة): : بريتييە لە ديلالەتی لەفز بۆ لازمێـك كـە لای قسەكەر مەبەست نيە و نە راستيی قسەكە و نە دروستی لەسـەر ناوەسـتێ. ئامـەدی هەمان نموونەی هێناوە كە حەنەفيەت بۆ ديلالەتی ئاماژە هێناويەتی و دەڵێ: خـوای گەورە ئەفەرمویٚ ﴿فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ﴾ چوونە لای ژنی تا بەرەبەيان درێـژ كردۆتـەوە، بەوەی فەرمويەتی: ﴿حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ﴾، مەبەسـت لە دەقەكەيش روونكردنەوەی ئەوەيە، لەگەڵ ئەوەيشدا ئەوەی لیٚ لازم بووە كە ئـەو كەسەی لە شەوی رەمەزاندا جيماع بكا و بە لەشيسـی بـەيانی بكاتـەوە رۆژووەكـەی بـەتاڵ نـابیٚ، چـونكە ئـەوەی لـە كۆتـايی شـەودا جيمـاع بكـا خۆشـۆردنەكەی هـەر دەكەوێتە رۆژ، ئەگەر زيانی بە رۆژوو بگەياندايە رێگەی بە جيماع تـا دوا بەشـی شـەو نەدەدا.[1]

كەواتە ناكۆكی لەنێوان رێچكەی جمهور و رێچكەی حەنەفيەتيشدا نيە لە ديلالەتی ئاماژەدا لەرووی ماهيەت و هەروەها لەرووی كاريگەری لەسەر جياوازيی شەرعزان.

## ديلالەتی مانا (المفهوم)

بريتييە لە ديلالەتی لەفز بۆ جێگيربوونی حوكمی گوتراو بـۆ بێدەنگيلێكراو، وەك ئـەوەی خـوا ئەفـەرمویٚ ﴿فَـلاَ تَقُـل لَّهُمَـا أُفٍّ﴾، كـە بـە گوتراوەكـەی ئامـاژە بـۆ

---

[1] بروانە: الإحكام في أصول الأحكام للآمدي ٢/٢٠٩.

حەرامكردنی ئۆفكردن دەكا، بە مەفهومەكەیشی بۆ حەرامكردنی هەموو جۆرە ئازاردانێك، كە ئەویش یان (مەفهومی موافەقە)یە، كە بریتییە لە دیلالەتی لەفز بۆ جێگیربوونی حوكمی گوتراو بۆ بێدەنگیلێكراو و كۆكبوون لەگەڵی بە نەرێ یان بەئەرێ لەبەر هاوبەشییان لە مانایەكدا كە هەر بە زانینی زمان و بەبێ ئەوەی پێویست بە لێكۆڵینەوە و ئیجتیهاد بكا پەی پێ دەبرێ، كە بەلای حەنەفیەتەوە پێی دەوترێ دیلالەتی دەق لەبەرئەوەی جیاوازی لەنێوان ئەو دووانەدا نیە چ لەڕووی ماهیەت و چ لەڕووی كاریگەری لە جیاوازیی شەرعزان لەبەر تیشكی ئەوەی لە دیلالەتی دەقدا باس كرا.

هەرچی مانای پێچەوانە (مەفهومی موخالەفە)یە بریتییە لە دیلالەتی لەفز لەسەر جێگیربوونی پێچەوانەی حوكمی گوتراو بۆ بێدەنگیلێكراو، نموونەیمان پێشتر باس كرد.

لە خوارەوە بەجیا باسی هەردوو مەفهومەكە دەكەین.

## لقی یەکەم:
## مانای راستەوانە

مانای راستەوانە (مەفهومی موافەقە) لەو رووەوە جگە لە ئیبن حەزمی زاهیری و ئەو زاهیریانەی هاوڕاین کەس نکوڵی لێنەکردوە. لەسەر ئەوە ئیبن روشد رەخنەی لێگرتوە و دەڵێ مەفهومەکە لە بابی بیستنە و ئەوەی رەتی کردۆتەوە جۆرێك لە گوتار رەت دەکاتەوە. ئیبن تەیمیە دەڵێ: نکوڵیکردنەکەی لوتبەرزیەکی رووتە. بەڵام زانایان لە ئوسوڵناسان و شەرعزان لەبارەی مانای راستەوانە لە دوو شتدا جیاوازن:

١– ئایا لەپێشتربوونی بۆنە لە بێدەنگلێکراودا مەرجە یان نا؟

٢– ئایا دیلالەتی بۆ بێدەنگلێکراو دیلالەتێکی لەفزییە یان قیاسی؟.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم دوو بۆچوونی جیاوازیان هەیە، یەکەمیان ئەوەیە بۆ بەدیهاتنی مانای راستەوانە مەرجە کە عیللەی حوکم لە بێدەنگلێکراودا زیاتر بۆنە بێ وەك لە حەرامکردنی لێدان (ی دایك و باوك) کە بە مەفهوم جێگیر بووە، ئازاردانیش لە لێداندا لە ئازاردانی ئۆفکردن سەختترە. جوینی لە (البرهان)دا ئەم بۆچوونەی لە شافیعی[1] گواستۆتەوە، هەروەها ئامەدی[2] و ئیبنول حاجب[3] هەڵیانبژاردوە، هەروەها بۆچوونی شیعەی ئیمامیشە[4].

دووەمیان ئەوەیە ئەو مانایەی حوکمەکەی لەسەر بینا کراوە کەمتر بۆنەی هەبێ، جا چ لەپێشتربوون هەبێ یان یەکسانبوون. ئەمە بۆچوونی جمهورە[5].

---

[1] مخطوطة المكتبة المركزية بغداد.

[2] بروانە: الأحكام للأمدي ٢/٢١٠.

[3] مختصر ابن الحاجب مع العضد والسعد ٢/١٩٧٣. التقرير والتحبير مع التحرير ١/ ١١٢.

[4] مبادئ الوصول إلى علم الأصول.

[5] تقويم الأدلة للدبوسي (٢٤٠) و پاشتر. أصول البزدوي ١/٧٤ و پاشتر. اصول السرخسي ١/ ٢٤٥ و پاشتر.

ئەنجامی ئەم خیلافە ئەوەیە ئـەوەی لەپێشـتربوونی بۆنـە دەكاتـە مـەرج لەگـەڵ ئەوە نیە بێدەنگیلێكراو لـەڕێی مەفهومـەوە لـە حاڵـەتی یەكسـانبووندا، بخرێتـە پـاڵ گوتراو، بەڵكو ئەوە لە ڕێگەی قیاسەوە دەبێ، ئـەو دوو ڕێگەیـەیش جیاوازیـان هەیـە وەك پاشتر روون دەكرێتەوە.

سـەبارەت بـە بابـەتی دووەمـیش دوو ڕای جیاوازیـان هەیـە، یەكـەمیان ئەوەیـە دیلالەتەكەی قیاسییە، شافیعی ڕای لەگەڵ ئەمەیە و هیندی لە (النهایة)دا لـە زۆربـەی گواستۆتەوە[1]، هەروەها حەنەفی و شافیعی و مالیكی و حەنبلەیەكان هەمان قسـەیان كردوە[2]، زۆر لە زەیدیەكانیش دەستیان بەم بۆچوونەوە گرتوە[3].

بەڵگەیشیان لەسەری ئەوەیە جێگیربوونی حوكم بۆ بێدەنگیلێكراو لەسـەر زانینـی ئەو مانایە دەوەستێ كە (مناط) واتە عیلـلەی حـوكمی زاهـیرە بـۆ ئـەو كەسـەی ورد بێتەوە، چونكە چاوپۆشی لەو مانایە بكەین كە قسەكەی بـۆ هێنـراوە لـە ئازارنـەدانی دایك و باوك —بۆ نموونـە— و لـەوەی جوێنـدان و لێدان لـە ئـۆفكردن توندترن، ئـەوا بەئیجماع بڕیار لەسەر حەرامی جوێندان و لێدان نەدەدرا، قیاسیش هیچ مانایەكی نیە ئەمە نەبێ[4].

دووەمیـان ئەوەیـە ئـەو دیلالەتـە لـە گـوتن (نوتـق) وەردەگـیرێ، كـە ئـەوە ڕای سەرلەبەری موتەكلیمین و هەروەها ئەشعەری و موعتەزیلە و شیعەی ئیمامییە. شـێخ ئبوحامیدی ئیسرافیینی دەڵێ ڕای ڕاستی مەزهەبەكان ئەوەیە وەك نوتـق وایـە. بـەڵام لەوەدا جیاواز بـوون كـە ئـاخۆ ئـەو دیلالەتـە حەقیقـەتێكی عورفییـە یـان مـەجازە؟ هەندێكیان لەگەڵ یەكەمن و گوتویانە قەدەغـەكردنی ئـۆفكردن بـە عـورف لـە بابەتـە

---

[1] إرشاد الفحول ص ١٧٨.

[2] التقرير والتحبير مع التحرير ١٠٩/١ روضة الناظر لابن قدامة ٢٠١/٢.

[3] منهاج الوصول في أصول الزيدية (ق ١٠٩) مخطوطة دار الكتب المصرية.

[4] الإحكام للآمدي ٢١١/٢.

زمانەوانیەکەی گوێزراوەتەوە بۆ قەدەغەکردنی جۆرەکانی ئازاردان.[1]

هەندێکیشیان لەگەڵ دووەمدان و دەڵێن دیلالەتەکە مەجازییە لە بابی بەکارهێنانی تایبەتتر و ویستنی گشتیتر و بە جێبەند و قەرینەیش لەوە تێدەگەین. بەشێك لە توێژەران وەك غەزالی و ئیبن ئەلقوشەیری و ئامەدی و ئیبنول حاجب بەلای ئەم رایەدا شکاندویانەتەوە.[2]

هەندێ پێیان وایە کێشە لەوەی ئاخۆ دیلالەتەکە لەفزییە یان قیاسی کێشەیەکی لەفزییە، لەبەرئەوە هەموو کۆکن لەسەر ئیعتیباری ئەم جۆرە لە دیلالەت لەسەر حوکمەکە جا چ ناوی بنێن مانای راستەوانە یان ناوی بنێن قیاس.

ئەوەی وەك لکاندنی فەرع بەئەسڵەوە لە لکاندنی بێدەنگ بە گوتراو دەڕوانێ لەبەر هاوبەشییان لە عیللەیەکی نێوانیان، بە قیاسێکی رۆشنی داناوە، ئەوەیش تەماشای ماناکەی کردوە کە عیللەی حوکمەکەیە و هەر بە زانینی زمان دەزانرێ بەبێ ئەوەی پێویست بە ئیجتیهاد و هەڵێنجان بکا، ناوەکانی مانای راستەوانە (یان دیلالەتی دەق) دەزانێ.

ئەمە لە قسەی ئیمامی حەرەمەین و غەزالی و بەیزاوی و تەفتازانیەوە بەڕوونی دیارە[3].

تەنانەت بەیزاوی جارێك ئەو دیلالەتەی کردۆتە مەفهوم و جارێکیتر بە قیاس و لە باسی مانای راستەوانەدا گوتویێتی وەك دیلالەتی ئۆفکردن لەسەر حەرامیی لێدان[4]، لە باسی قیاسیشدا گوتویێتی قیاس یان گومانبڕە یان گومانگر، ئەوا لق (فەرع)ـەکە بۆ

---

[1] إرشاد الفحول ص ١٧٨.

[2] إرشاد الفحول للشوكاني ص١٧٨ .

[3] بڕوانە: حاشية سعد مع العضد ومختصر المنتهى ١٧٣/٢ تێیدا هاتووە: ئێمە بە لە دڵنانی قیاس جەختمان لەوە کردوە ئەو سیغانە ئەم مانایانە دەگەیەنن.

[4] البيضاوي مع الاسنوي والبدخشي ٣١١/١.

حوکمەکە لەپێشترە وەك حەرامکردنی لێدان لەچاو حەرامکردنی ئۆفکردندا.[1]

بەڵام پێویستە لە دوو شتدا جیاوازی لەنێوان هەڵوێستی شافیعی و ئیبن حەزمی زاهیری و ئەوانەی هاورایانن لەلایەك، لەگەڵ هەڵوێستی حەنەفیەت و شیعەی ئیمامی لەلایەکیترەوە بکرێ، یەکێکیان ئەوەیە ئاخۆ دەکرێ حدود و کەفارەتەکان بە قیاس جێگیر بکرێن یان نا؟ دووەمیشیان ئەوەیە ئایا دەکرێ بوترێ قیاس بەکاردێ یان نا؟

شافیعیەکان سەبارەت بە سەلماندنی حدود و کەفارەتەکان هیچکام لەو دوو زاراوەیە کار لە هەڵوێستیان ناکا، چونکە ئەوان چ بە قیاس چ بە (مفهومی موافقە) ئیسپاتیان دەکەن.

هەڵوێستی ئیبن حەزمی زاهیریش هیچکام لەو دوو زاراوەیە کاری تێناکەن، چونکە ئەو کارکردن هەم بە (مەفهومی موافەقە) و هەم بە قیاس رەت دەکاتەوە[2].

هەرچی حەنەفیەکانن ئەو جیاوازییە کار لە هەڵوێستیان دەکا، لەبەرئەوەی ئەوان حدود و کەفارەتەکان بەقیاس ئیسپات ناکەن با قیاسی رۆشن (جلي)ش بێ، بەڵام بە دیلالەتی دەق (مەفهومی موافەقە) ئیسپاتی دەکەن. ئیمامی دەبوسی پیادەکردنی فیقهیی زۆری لەم رووەوە باس کردوە و سەلماندویەتی کە لە دەق وەرگیراون نەك قیاس.[3]

سەرخەسیش هەمان رێچکەی گرتوە و لە ئوسوڵەکەیدا دەڵێ: "لەبەرئەوە بەجائیزمان دانا سزا و کەفارەتەکان بە دیلالەتی دەق ئیسپات بکرێن ئەگەرچی بە قیاس بە جائیزی دانانێین"[4]. لێرەوە خاوەنی (التقریر والتحبیر)[5] دەڵێ، گوتراوە کێشەکە لەفزییە، بەلای منیشەوە ئەوەی شێخەکانمانی لەسەرە جێی سەرنجە کە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ٣/٢٦.

[2] الأحكام لابن حزم ٧/٩٢٩.

[3] تقويم الأدلة مخطوطة دار الكتب المصرية (٢٣٧-٢٤٤).

[4] بڕوانە: أصول السرخسي ١/٢٤١-٢٤٢.

[5] التقرير والتحبير مع التحرير ١/١١٠.

پێیان وایە ئیسپاتکردنی حدود و کەفارەتەکان بە قیاس دروست نیە و بە دیلالەتی دەق دروستە.

شتەکە سەبارەت بە شیعەی ئیمامیش جیاوازە، لەبەرئەوەی ئەگەر قیاس لەڕاستی و مانادا یەکسان بوایە بە مانای راستەوانە، ئەوا پاش داکۆکی کردنیان لە (مەفهومی موافەقە) نکوڵییان لە قیاس نەدەکرد. کەواتە هەڵوێستی ئەوانیش جیاوازی نێوان ئەم دوو زاراوەیە کاری تێدەکا.

**زاڵکردن:**

وای دەبینم رای زاڵ ئەوەیە بوترێ مانای راستەوانە جیایە لە قیاس بەمانای راستەقینەی قیاس کە لەسەر هەڵێنجان و رامان دەوەستێ بۆ زانینی ئەو عیللەیەی قیاسکراو و (قیاس لەسەرکراو) کۆدەکاتەوە، لەبەرئەوەی دیلالەت و بناغەی مانای راستەوانە بریتییە لە زانینی ئەو مانایەی حوکمی گوتراو و بێدەنگی لەسەر بیناکراو تەنها بە زانینی زمان، هەربۆیە ناونانی مانای راستەوانە بە قیاس لەلایەن شافیعیەوە تەنها ناونانێکە بەگوێرەی رواڵەت و هیچ کاریگەریەکی لە هەڵێنجانی ئەحکام لێ ناکەوێتەوە... جگە لەوەیش مانای راستەوانە (یان دیلالەتی دەق) جا چ بە قیاسی رۆشن دابنرێ یان دانەنرێ، لە شانازیەکانی شەریعەتی ئیسلامییە لە هەڵێنجانی ئەو حوکمانەی دەکرێ ئاماژەیان بۆ بکرێ[1].

پاشان مەسەلەکە ئاماژەیە بۆ ئەو توانایەی بە زانایانی موسڵمان دراوە لە دەرککردن بە نهێنیەکانی ئەم شەریعەتە و مانای گوتارەکە، کە وای لێکردوون لە سنووری لەفزی رووتەوە بکەونە رێ بۆ ئەوەی دەکرێ لەڕێی زەوقی فیقهیی ساغەوە لە سنووری ئەو زمانەی قورئانی پیرۆزی پێ دابەزیوە و گوتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)ی پێ هاتووە لێی تێبگەن، ئەوەیش رەحمەتی ناهێڵێ و لە پێشکەشکردنی چارەسەر بۆ ئەو رووداوانەی دەشێ بێنە پێش و بەتێپەڕینی کات تەواو نابن، بەشداری دەکەن.

---

[1] تفسير النصوص ص ٤٩١.

لەو پیادەکردنە فیقهییە جێناکۆکانەی لە جیاوازی لە دەستگرتن بە مانای راستەوانە دەکەونەوە:

جیاوازبوون لە واجببوونی کەفارەت لەسەر ئەو کەسەی بەجگە لە جووتبوون (جیماع) رۆژووی رەمەزان بشکێنێ. ناکۆکی لەوەدا نیە کە ئەو کەسەی لە رۆژی رەمەزاندا بەهۆی جووتبوونەوە بەئەنقەست رۆژوو بشکێنێ کەفارەتی لەسەر واجب دەبێ کە ئەویش ئازادکردنی کۆیلەیەکە، ئەگەر ئەوەی دەست نەکەوت دەبێ دوو مانگی لەسەریەك بەرۆژوو بێ، ئەگەر نەیتوانی ئەوا دەبێ نانی شەست هەژار بدات، ئەویش لە روانگەی گوتراوی ئەوەی ئەبوهورەیرە دەیگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و لێی پرسی: نیتە کۆیلەیەك ئازاد بکەیت؟ ئەویش گوتی: نا. گوتی: ئەی دەتوانیت دوو مانگ لەسەریەك بەرۆژوو بیت؟ گوتی: نا. گوتی: ئەی دەتوانیت سی هەژار تێر بکەیت؟ گوتی: نا. پاشان دانیشت. پووشێکیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێنا خورمای تێدا بوو و وتی: ئەمە بکە بەخێر. ئەویش وتی: بەسەر هەژارترین کەسماندا؟ هیچ ماڵێك نیە لە خۆمان زیاتر پێویستی پێی بێ، پێغەمبەریش پێکەنی تا ددانەکانی دەرکەوتن، پاشان وتی: برۆ بیدە ماڵ و مناڵەکەت.[1]

شەرعزان کۆکن لەسەر دیلالەتی حەدیسەکە بە گوتراوەکەی لەسەر پێویستیی کەفارەت لەسەر ئەو کەسەی لە رۆژی رەمەزاندا جیماع بکا بەدەستدرێژی[2] جا نەدار بێ یان دارا، بەپێی هەندێ گوتە نەدار دەکەوێتە ئەستۆی.[3] بەڵام لە دیلالەتیدا بە مانای راستەوانەن بۆ واجببوونی کەفارەت لەسەر ئەو کەسەی بەدەستدرێژی بەبێ جیماع لە خواردن و خواردنەوە جیاوازن.

---

[1] رواه السبعة واللفظ لمسلم سبل السلام ١٦٣/٢.

[2] المجموع للنووي ٢٩٥/٦.

[3] سبل السلام، سەرچاوەی پێشوو.

حەنەفی[1] و مالیکیەکان[2] و شیعەی ئیمامی[3] لەگەڵ دەستگرتن بە مانای راستەوانەن لەم دەقەدا و دەڵێن بەجگە لە جیماعیش کەفارەت هەر واجبە لەبەرئەوەی عیللەی ئەم حوکمە دەستدرێژییە بۆ سەر رۆژوو و فەوتاندنی روکنەکەیەتی کە خۆگرتنەوەیە لە رۆژووشکێنەکان، لەوانە جیماع، خواردن و خواردنەوەیش ئەم عیللەیەیان تێدایە، بۆیە لەرێی مانای راستەوانە (یان دیلالەتی دەق)ـەوە حوکمی جیماع کە بە گوتراو (گوزارەی دەق) ئاماژەی بۆ کراوە، بۆ هەردووکیان جێگیر دەبێ.[4]

سەعیدی کوڕی جوبێر و نەخعی و ئیبن سیرەین و حەماد و شافیعی و ئەحمەد پێیان وایە عیللەکە فەوتاندنی روکنی رۆژووە بە جیماعکردن نەك شتیتر، بۆیە ئەگەر بەبێ جیماع، وەك بە خواردن و خواردنەوە، رۆژووی شکاند کەفارەتی ناکەوێتە سەر.

لەم شیکردنەوەیەوە ئەوە دەردەکەوێ جیاوازیەکە ناگەڕێتەوە بۆ ناکۆکی لە کارکردن بەئەسڵی مانای پێچەوانە (مەفهومی موخالەفە) بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ دیاریکردنی ئەو مانایەی حوکمی گوتراوی لەسەر دامەزراوە، کە ئاخۆ تەنها جیماعە و شتیتر ناگرێتەوە، یان مانایەکە کە جیماع و شتیتریش دەگرێتەوە بەوە پەل بۆ هەموو رۆژووشکێنێك دەهاوێژێ، یان ئیفساد بە شێوەیەکی مەبەست تا پەل بۆ خواردنەوە و خواردنەوەکان بکێشێ، بەڵام قوتدانی وردە بەرد و ناوك نەگرێتەوە.[5]

---

[1] بداية مع الهداية وفتح القدير ٢/٣٣٨. تێیدا هاتووە: ئەگەر شتێکی خوارد یان خواردەوە کە خۆراك یان دەرمان بوو بۆی قەزا و کەفارەتی لەسەرە.

[2] بداية المجتهد ١/٢٥٨ بلغة السالك ١/٢٣٦.

[3] الخلاف للطوسي ١/٣٨٨.

[4] أصول السرخسي ١/٢٤٤ فما بعدها مسلم الثبوت مع شرح فواتح – الرحموت ١/٤٠٩ المنار لابن ملك وحواشيه ١/٥٣٢.

[5] شفاء الغليل للغزالي ص ٦٣.

شافیعی و حەنبەلیەکان و ئەوانەی هاوڕایانن پێیان وایە ئەو مانایەی حوکمەکەی لەسەر بینا کراوە جیماع خۆیەتی، هەربۆیە شتیتر کەفارەتی لەسەر نیە.[1]

مالیك رای وایە هۆکەی ئەتککردنی حورمەتی رۆژوی رەمەزانە بۆیە کەفارەت بۆ هەر شتێك ئەتککار بێ واجبە جگە لە هەلگەڕانەوە لە ئاین.[2]

ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین[3] پێیان وایە ئەو مانایەی حوکمەکەی لەسەر بینا کراوە جیماع یان خواردن یان خواردنەوەیە، بەو مەرجەی خواردن و خواردنەوەکە لەو شتانە بن کە خۆراکن یان چارەسەریان پێ دەکرێ، لەبەرئەوە ئەگەر چەو یان ناوکێکی قوت دا کەفارەتی لەسەر نیە، ئەوەیش رای عطاء و حەسەنی زەهری و ثوري و ئەوزاعی و ئیسحاق بن راهویەیە.

---

[1] المجموع للنووي ٦/٢٩٥. المهذب ٢/٢١٧.

[2] بداية المجتهد ١/٢٥٨ الموطأ المنتقى ٢/٥١-٥٢.

[3] بدائع الصنائع ١/٩٧ و پاشتر.

## لقی دووەم:
## مانای پێچەوانە (مفهوم المخالفة)

پێشتر ئەوەمان روون کردەوە کە مەفهومی موخالەفە بریتییە لە دیلالەت لەفز لەسەر جێگیربوونی پێچەوانەی حوکمی گوتراو بۆ بێدەنگلێکراو، زانایانیش لە ئوسولناس و شەرعزان لەبارەی حوجیەتی ئەم مەفهومە رای جیاوازیان هەیە بەم شێوەیە:

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن رایان وایە مانای پێچەوانە کە ناویان ناوە (بەتایبەت باسکراو) لە دەستپێوەگرتنە خراپەکانە، یان بریتییە لە کارکردن بە دەقەکان بەشێوەی خراپ، بەجیاوازی دەربڕینیان[1]، کۆکن لەسەر کارپێنەکردنی لە دەقەکانی کیتاب و سوننەدا، بەڵام سەبارەت بە جگە لەوانە رایان جیاوازە.

چینی پێشینانیان لە کارپێنەکردنیدا جیاوازی ناکەن لەنێوان دەقەکانی شەرعدانەر و قسەی خەڵکدا، جەصاص ئەمەی بەڕاشکاوی گوتوە، هەروەها ئەبوحەسەنی کەرخیش لە شێخەکەی گواستۆتەوە.

هەرچی پاشینەکانیانن تەنها لە قسەی شەرعدانەردا حەسریان کردوە و لە دانراوە فیقیهەکاندا بە حوججەیان داناوە، هەروەها لە قسەی خەڵك لە گرێبەند و مەرجەکانیان و باقیی گوزارەکانیاندا، ئەویش لەڕووی ملکەچبوون بۆ حوکمی عورف و عادەت.

سەرخەسی دەڵێ: لە گوتارەکانی شەرعدانەردا حوججە نیە، بەڵام لە زاراوە و عورفی خەڵکدا حوججەیە.[2]

---

[1] البزدوي مع كشف الأسرار ٥٧٣/٢. إرشاد الفحول ص١٧٩.
[2] أصول السرخسي ٢٤٦/١.

هەندێ لە پێشینانی شافیعی بەپێچەوانەوە دواون و مانای پێچەوانەیان لە گوتەی خوا و پێغەمبەردا(ﷺ) بە حوججە داناوە و لە قسەی جگە لەواندا بە حوججەیان دانەناوە، زەرکەشی بەم شێوەیە باسی کردوە.[1]

جمهوری زاهیری بەرەهایی مفهومەکەیان رەت کردۆتەوە جا چ مانای راستەوانە بێ یان مانای پێچەوانە[2]

جمهوری مالیکی[3] و شافیعی[4] و حەنبەلی[5] و ئەوانەی هاوڕایانن پێیان وایە مانای پێچەوانە حوججەیە لە هەڵێنجانی ئەحکام لە دەقەکانی کیتاب و سوننە، هەروەها رێگەیەکە لە رێگەکانی ئاماژە بە حوکم، بەڵام لەبارەی چەمکی نازناو رایان جیاوازە و زۆربەیان گوتویانە حوججە نیە.

بەڵگەی ئەوانەی رەتی دەکەنەوە: ئەوانەی حوججیەتی مانا پێچەوانەکە رەت دەکەنەوە چەند بەڵگەیەکیان هەیە، لەوانە:

أ- **جێگیربوونی حوکم بۆ گوترلو بە گوزارەی دەق دەبێ**، جا یان نەفیکردنی لە بێدەنگلێکراو بەپشتبەستن بە گوزارەکە، یان بە ئەقڵ جێگیر دەبێ یان بە نەقڵ دەبێ، ئەقڵیش هیچ بواری نیە لە ئیسپاتی زمانەکاندا، نەقڵیش یان ئەوەیە بە رێگەی جەمینەیە یان تاکینە، جەمینە (تواتر)یش وجودی نیە ئەگینا ناکۆکی دروست نەدەبوو، هەواڵی تاکینە (ئاحاد)یش تەنها گومان دەگەیەنێ، گومانیش زمانێکی پێ جێگیر نابێ کە بکرێ قسەی خوا و پێغەمبەری پێ دابەزێ، لەبەر ئەگەری هەڵەکردن تێیدا، کەواتە بەڵگەیەك نەما بکرێتە بەڵگە لەسەر نەفیکردنی حوکم لە

[1] إرشاد الفحول، سەرچاوەی پێشوو.
[2] الأحكام في أصول الأحكام لابن حزم الظاهري ٨٨٧/٧ و پاشتر.
[3] التلمساني ص١١٤.
[4] الأسنوي مع البدخشي ٣١٥/١ و پاشتر.
[5] المسودة ص ٣٥١.

بێدەنگلێکراو.[1]

ئەم بەڵگەیە بەوە دەدرێتە دواوە کە گواستنەوەی تاکینەیی لە ئیسپاتی زماندا بەکرداری پشتی پێ دەبەسترێ، لەبەرئەوەی بەمەرجکردنی تەواتور لە گواستنەوەی زماندا مانای پەکخستنی زۆربەی زمانە لەبەر نەبوونی تەواتور تێیدا، ئەوەیش سەردەکێشێ بۆ پەکخستنی کارکردن بە زۆربەی لەفزەکان لە دەقەکانی کیتاب و سوننە و ئەحکامی شەرعی.

**ب- لادانی حوکمی گوترلو لە بێدەنگلێکرلو لە دەقێك لە دەقەکاندا سەرچاوەکەی نەبوونی ئەسڵی یان بەرائەتی ئەسڵییە** لە حەڵاڵ یان حەرامبووندا، هەروەها دەقەکان لە کیتاب و سوننە شتێکیان تێدا نیە کە ئاماژە بێ بە دەستگرتن بە (مەفهومی موخالەفە)وە، بەڵکو بەشێوەیەك دێ کە ئاماژەیە بۆ خراپی گرتنەبەری ئەم رێچکەیە لە دانانی بە رێگەکانی دیلالەت بۆ ئەحکام، لەوانە ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْراً فِي كِتَابِ اللّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَات وَالأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلاَ تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾[2]، ئەم دەقە بە گوتراوەکەی ئاماژەی بۆ حەرامیی ستەمکردنی لە ماوەیەکی زەمەنیدا تێدایە کە ماوەکەی چوار مانگە، ئەگەر بە (مەفهومی موخالەفە) وەربگیرێ ئەوە دەگەیەنێ نەهی لە ستەمکردن لە جگە لەو چوار مانگە نەکراوە.

ئەم بەڵگەیە بەوە دەدرێتە دواوە کە لە مەرجەکانی دەستگرتن بە (مەفهومی موخالەفە) ئەوەیە بێدەنگلێکراو دەقێکی تایبەتی نەبێ کە ئاماژە بێ بۆ حوکمەکەی وەك پاشتر باس دەکرێ، ئەم مەرجەیش لێرەدا نەهاتۆتە دی لەبەرئەوەی حەرامیی ستەم لە هەموو کات و شوێنێکدا بە دەقیتر لە قورئان و سوننە جێگیر کراوە.

---

[1] مختصر المنتهى مع شرح العضد وحاشية السعد ١٧٩/٢.

[2] التوبة/٣٦.

بەڵگــەی ســەلمێنەران: ئەوانــەی دەڵــێن مانــای پێچــەوانە حوججەیــە چــەند بەڵگەیەکیان هەیە لەوانە:

أ- ئەبوعوبێـد ئەلقاسـم بـن سـەلام کـە لـە پێشـەوایانی زمانـە کـاتێ گـوێی لـەو گوتەیـەی پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو: (لَـيُّ الواجـد ظلـمٌ يُحـلُّ عرضَـه وعقوبتَـه)[1] (واتـە: پێچلێدانی دارا ستەمە و....) گـوتی ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی پێچلێدانی نـەدار سـتەم نیـە، شـافیعیش وای وتـوە کـە ئـەویش لـە پێشـەوایانی زمانـە، بـەم پێیـە باسکردنیان لە مانای پێچەوانە گواستنەوە بووە لە زمانی عەرەبەوە.

وەڵامم بۆ ئەم بەڵگەیە ئەوەیە کە پێچەوانەی قسەی ئەلئەخفـەش و محەمـەد بـن حەسەنی شەیبانییە، کە ئەوانیش لە پێشەوایانی زمانن و ناڵێن مانای پێچەوانە هەیە.

ب- ئەوەی موسلیم و ئەبوداودا و کەسانیتر لە یەعلا بن ئومەیە گێڕاویانەتەوە کـە یەعلا بە عومـەری کـوڕی خـەتابی وتـوە، بۆچـی نوێـژ کـورت دەکەینـەوە لەکاتێکدا ترسمان نەماوە، خوایش ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾[2].

عومـەر (ڕەزای خـوای لـێبێ) وتـی: وەك تـۆ منـیش سـەرم لـەوە سـوڕما، بۆیـە لـە پێغەمبەرم پرسی، ئەویش گوتی (صدقة تصدق الله بها عليكم فاقبلوا صدقته).

بەڵگەبوونی ئایەتەکە ئەوەیە هەریەك لە یەعلا و عومەری کوڕی خەتاب وا لە بەستنەوەی کورتکردنـەوەی نوێـژ بـە حاڵـەتی ترسـەوە تێگەیشـتن، کـە لـەکاتی نەمانی ترسدا نوێژ کورت ناکرێتەوە.[3]

ج- بەتایبەت باسکردنی شتێك دەبێ سوودێکی تێدا بێ، کە ئـەوە حـاڵی قسـەی ڕەوانبێژانە لە دەربڕینەکانیاندا، ئەی دەبێ قسەی خوای دانا و شەرعدانەر چۆن بـێ؟

---

[1] لیە، بە فەتحی لام، ئەویش پاڵپێوەنانی و شیکردنەوەی دانەوەی ئەو مافەیە لەسەریەتی. لە حەدیسەکەی ئەبوهورەیرەدا هاتووە: مطل الغنى ظلم. بڕوانە: العدة ١١٧/٤.

[2] النساء/١٠١

[3] مختصر المنتهى مع شرح العضد وحاشية السعد ١٧٨/٢.

جا ئەگەر هیچ سوودێکی نەبێ جگە لەوەی کە بێدەنگکراو (المسکوت) حوکمێکی جیاواز لە حوکمە باسکراوەکەی هەیە، ئەوا دەبێ دان بای لەو سوودە بکرێ.

وەلامم بۆ ئەم بەڵگەیە ئەوەیە دەگونجێ ئەو سوودە شتێکیتر بێ کە بۆ هەندێ تێگەیشتن دەرنەکەوتوە.

**زاڵکردن:**

وای دەبینم رای زاڵ ئەوەیە بوترێ مانای پێچەوانە حوججەیە، لەبەرئەوەی لەگەڵ مەنقول و مەعقولدا رێکە.

هەرچی مەنقولە لەبەرئەوەی ژمارەیەك دەق لە قورئان و سوننە هەن بەڕوونی ئەوەیان لێ وەردەگیرێ کە بەستنەوەی دەق بە قەیدێك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە باری نەبوونی ئەو قەیدەدا، جێگیر ئەوەیە پێچەوانەی حوکمی جێگیرە لەباری بوونی ئەو قەیدەدا، وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾، کە سەرجەم زانایان -جگە لە زاهیری- کۆکن لەسەر حەرامنەبوونی رەبیبە ئەگەر قەیدی چوونەلای دایکی نەبوو.

هەروەها وەك ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی (في الغنم السائمة زكاة)، کە زانایان -جگە لە مالیك و لیث بن سعد- کۆکن لەسەر دەستگرتن بە مانای پێچەوانەی (سائمة) و گوتویانە: زەکات لە ئاڵفدراودا واجب نیە.[1]

هەرچی مەعقولە، لەو رووەوە ئەوەی لەگەڵ مەنتیقی روونکەرەوەی ساغدا دەگونجێ ئەوەیە قەید چ وەسف بێ یان مەرج یان ئامانج یان هەر شتێکیتر ناکرێ بێهودە بێ، بەڵکو لەبەر سوود و هۆیەکە، جا ئەگەر مەبەستیتری روونکارانە لەپشت باسکردنی قەیدەکەوە نەبوو لە هاندان یان ترساندن و ئەو جۆرە شتانە، بەڵگەیەکی تایبەتیش نەبێ لەسەر حوکمی بێدەنگکراو جگە لە وەرگرتنی لە قەیدەکە، پێویستە

---

[1] بڕوانە: الموطأ مع شرحه للزرقاني ١١٣/٢. تبين الحقائق للزيلعي ٢٥٩/١. المهذب للشيرازي ١٤٢/١. المغني لابن قدامة ٥٧٦/٢.

دەست بەم ڕێگەیە لە ڕێگەکانی دیلالەتەوە بگیرێ، جا ئەگەر چارەسەرەکە بە قەیدێك بەسترابووەوە، ئەوا حەرامکردن لەکاتی نەبوونی ئەو قەیدەدا دەبێ، پێچەوانەکەیشی بەپێچەوانەوە.

## مەرجەکانی دەستگرتن بە مانای پێچەوانەوە:

مانای پێچەوانە کۆمەڵێ مەرج هەیە کە دەست پێوەگرانی لەسەری کۆکن، ئەوانیش:

١- بێدەنگیلێکراو بەڵگەیەکی تایبەتی تێدا نەبێ کە ئاماژە بێ بۆحوکمەکەی، لەبەرئەوە مانای پێچەوانە لەم ئایەتەدا لەبەرچاو ناگیرێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى... الآيَة﴾.[1] و ناگوترێ نێرینە لەسەر کوشتنی مێینە ناکوژرێ، ئەویش لەبەر بوونی دەقێکی تایبەت کە حوکمی کوشتنی نێرینە لەسەر مێینە روون دەکاتەوە وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ... الآيَة﴾.[2]

٢- ئەو قەیدەی دەقەکەی پێ بەستراوەتەوە سوودێکیتری نەبێ جگە لە ئیسپاتی پێچەوانەی حوکمی گوتراوی بێدەنگکراو، لەبەرئەوە وا دانەنراوە کە مانای پێچەوانە لەوەدا هەبێ کە خوا ئەفەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافاً مُّضَاعَفَةً﴾[3] و ناوترێ ئەگەر سوو چەند جاران نەبوو[4] خواردنی دروستە، لەبەرئەوەی ئەم وەسفە بۆ هاندانی دوورکەوتنەوە بوو لەوەی عەرەب لە سەردەمی نەفامیدا لەسەری بوون لە خواردنی سوو بە چەند قات (اضعافا مضاعفة)، پاشان ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ

---

[1] البقرة/١٧٨.
[2] المائدة/٤٥.
[3] ال عمران/١٣٠
[4] الطبري ٧/٢٠٤

أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ﴾[1] بەلگەی ئەوەیە سوو حەرامە جا چ وەسفی (ئەزعافەن موزاعەفە) هەبێ یان نا.

٣- ئەو قسەیەی قەیدەکەی تێدا هاتووە سەربەخۆ بێ، جا ئەگەر وەك جۆرە پاشکۆییەك بۆ شتێتر باس کرا نابێتە ئەو مانایە[2]، لێرەوەیە قەیدی مانەوە لە مزگەوت (ئیعتیکاف) ئەو مانایەی نیە لەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾[3]، بەپێچەوانەی مەزەبی زاهیری کە ئەم دەقەیان کردووە بە بەلگە لەسەر ئەوەی موعتەکیف بۆی هەیە لە دەرەوەی مزگەوتدا لەگەڵ خێزانەکەی سەرجێیی بکا و گوتویانە ماناکەی ئەوەیە: ئەگەر لە مزگەوت نەبوون سەرجێییان لەگەڵ بکەن.

٤- باسکردنی قەیدەکە وەك حاڵەتی زۆرینە (غالب) نەبێ، لەبەرئەوە ماناکە لە قەیدی (الحجور)دا نیە لەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم﴾، لەبەرئەوەی حاڵەتی زۆرینە وایە رەبیبەکان لە لە ماڵی مێردی دایکانیان دەژین[4]، بۆیە خواستنی رەبیبە جائیز نیە، کە کچی ژنە لە پیاوێکیتر، جا چ رەبیبەکە لە ماڵی باوەپیارەکە بێ یان نا مادام سەرجێیی لەگەڵ دایکی کردبێ.

---

[1] البقرة/٢٧٩

[2] إرشاد الفحول ص ١٨٠

[3] البقرة/١٨٧.

[4] التلمساني ص ١١٩.

## گرنگترین جۆرەکانی مانای پێچەوانە:

### چەمکی سیفەت[1]:

بریتییە لە دیلالەتی لەفزی وەسفکراو بە وەسفێکی تایبەت بۆ جێگیرکردنی پێچەوانەی ئەو حوکمەی بۆ بێدەنگکراو باس کراوە کە ئەو وەسفەی نیە. مەودای جیاوازی نێوان زانایان لەبارەی حوججیەتی چەمکی سیفەت کە لە گرنگترین جۆرەکانی مەفهومی موخالەفەیە، فراوان بووە، دیارترین بۆچوونەکان تێیدا سیانن:

١- بەڕەهایی حوججەیە و بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکانی دیلالەت بۆ حوکم دادەنرێ. ئەمە بۆچوونی مالیك و شافیعی و ئەحمەد و زۆربەی هاوەڵانیانە، هەروەها ئەشعەری و کۆمەڵێ لە موتەکەلیمین و ئەبوعوبەیدە و کۆمەڵێ لە ئەهلی زمان.

٢- بەڕەهایی حوججە نیە و بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکانی دیلالەت بۆ حوکم دانانرێ، جا ئەگەر حوکمەکە بە سیفەتێك قەید کرا ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ڕەتکردنەوەی ئەو حوکمە لە جگە لەوەی هەڵگری ئەو سیفەتەیە، ئەگەر نەبوو ئەوە لەبەر بەڵگەیەکیترە، ئەمەیش بۆچوونی حەنەفی و زاهیری و هەندێ لە شافیعی و مالیکی و زەیدییە و هەندێ لە پێشەوایانی زمانیش هاوڕایان بوون وەك ئەخفەش و ئیبن فارس و ئیبن جنی.[2]

٣- حوججەیە ئەگەر وەسفەکە بۆ حوکمەکە گونجاو بێ وەك لە حەدیسی (في سائمة الغنم زكاة) کە لە قەیدکردن بە (سوم)دا -ئەویش لەوەڕاندنە لە گژوگیای بەرەڵا و بێ خەرج بەبێ ماندوکردنی خاوەن ماڵاتەکە بە پارەی ئالیك- هەست بە ئاسانیی سوودوەرگرتن و مشەمەری (واتە زۆری) دەکرێ، ئەوەیش لەگەڵ فەرزکردنی زەکات لەسەر ئەو جۆرە ماڵاتەی لەو جۆرە لەوەڕگایە دەژی گونجاوە.

---

[1] المهذب للشيرازي/٢/١٩٤ فتح القدير ٢/١١٣.

[2] لای ئوسوڵناسان مەبەست لە سیفەت قەیدکردنی لەفزێکی هاوبەشە بە لەفزێکیتر کە تایبەتە بە بەشێ لە ماناکانی نە بە مەرج یان ئامانجێك.

لەو مەسەلە خیلافیانەی لە ناکۆکی لە دەستگرتن لە چەمکی سیفەت دەکەونەوە:

جیاوازیی شەرعزان لەبارەی گواستنەوەی خاوەندارێتی بەروبومی دارخورمای موتوریەنەکراو ئەگەر دارخورماکە بەبێ باسکردنی بەروبوم فرۆشرا،هۆی خیلافەکەیان جیاوازییانە لە دەستگرتن بە چەمکی سیفەت کە لەو فەرموودەیی پێغەمبەر(ﷺ)دا هاتووە کە ئەفەرموێ: (من باع نخلًا قد أُبِّرَتْ، فثمرتُها للبائعِ، إلا أن يشترطَ المُبتاعُ)[1]، ئەم دەقە بە گوتراوەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دارخورمای موتوریەکراو ئەگەر فرۆشرا و بەروبومی لەسەر بوو ئەو بەروبومە ناچێتە ناو فرۆشتنەکە بەڵکو هەر موڵکی فرۆشیارەکە دەمێنێتەوە مەگەر لە عەقدەکەدا کرابێتە مەرج. ئەمەیش ناکۆکی تێدا نیە بەڵکو ناکۆکی لە حوکمی بەروبومەکەدایە ئەگەر دارخورماکە موتوریەکراو نەبوو.

ئەوەی دەستی بە چەمکی سیفەت لە دەقەکەدا گرتوە دەڵێ بەری درەختی موتوریەنەکراو دەچێتە ناو فرۆشتنی دارخورماکە و دەبێتە موڵکی کڕیار، ئەمەیش رای جمهوری زانایانە[2]. ئیبن قودامە دەڵێ حەدیسەکە موتوریەکردنی کردوە بە سنوورێك بۆ خاوەندارێتیی فرۆشیار بۆ سەمەرەکە و ئەوەی پێش ئەوە هی کڕیار دەبێ، ئەگینا نە دەبێتە سنوور و نە باسکردنی موتوریەکردنیش بەسوود دەبێ[3].

ئەوەیش دەستی بە چەمکی سیفەت لە دەقەکەدا نەگرتوە دەڵێ سەمەری دارخورماکە ناچێتە ناو فرۆشتنەکە جا چ موتوریە بێ یان نا، ئەمەیش بۆچوونی حەنەفەفیەکان و ئەوانەیە هاوڕایانن و دەڵێن، سەمەرەکە ناچێتە ناو فرۆشتنی

---

[1] الإحكام للآمدي ٢/٢١٤ القواعد لابن اللحام ص ٢٨٦. شرح تنقيح الفصول ص ٥٤ التلمساني ص ١١٧ إرشاد الفحول ص ١٨٠ منهاج الوصول إلى شرح معيار العقول في أصول الزيدية (٤٦) فما بعدها، الأعلام للزركلي ٣/٢١٥.

[2] المهذب للشيرازي ١/٢٧٩ المغني مع الشرح الكبير ٥/١٩١. البدائع ٥/١٦٤. أسباب اختلاف الفقهاء للخفيف ص ١٥٢.

[3] المغني والشرح الكبير ٥/١٩١.

دارخورماکه مەگەر عەقدەکە بەڕاشکاوی باسی ئەوەی کردبێ کە ئەویش حسێبە، یان کڕیار بەمەرجی دلنابێ سەمەرەکە بۆ ئەو بێ.

### چەمکی مەرج (مفهوم الشرط)[1]:

بریتییە لە ئاماژەی ئەو لەفزەی حوکمەکە تێیدا بە مەرجێکەوە بەستراوە، بۆ جێگیرکردنی پێچەوانەی ئەو حوکمە بۆ بێدەنگکراوی بەتاڵ لەو مەرجە، کە ئەمە بەلای جمهورەوە حوججەیە، هەروەها کۆمەڵێك لەوانەی لەگەڵ حوججیەتی چەمکی سیفەت نین هەمان رایان هەیە وەك ئیبن سەریج و ئیمام فەخرەدینی رازی لە شافیعی و کەرخی لە حەنەفی[2]، هەرچی حەنەفیەکان و ئەوانەن هاوڕایانن بە حوججەی دانانێن.

ئەم ناکۆکیەیش جیاوازی لە هەندێ مەسەلەی فەرعیدا لێکەوتۆتەوە لەوانە:

جیاوازی لە نەفەقەی ژنی بەیەکجاری تەڵاقدراو (واتە بائن) کە دووگیان نەبێ.

جمهور لە مالیکی و شافیعی و حەنبەلی و شیعەی ئیمامی و زەیدی و ئەوانەی هاوڕایانن رایان وایە واجب نیە ئەویش بە دەستگرتن بە چەمکی مەرجەوە لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾[3]، ئەم دەقە بە گوتراوەکەی بەڵگەیە لەسەر واجبی نەفەقی سێ جار تەڵاقدراو ئەگەر ژنەکە دووگیان بوو، هەروەها بە چەمکی مەرج لەسەر واجبنەبوونی ئەگەر دووگیان نەبوو.

بەڵام حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن رایان پێچەوانەی ئەوەیە و نە چەمکی مەرجیان بە حوججە بینیوە و نە هیچ جیاوازیەکیان لەنێوان سکپڕ (حامل) و نەزۆك

---

[1] مەبەست مەرجی زمانەوانییە، ئەویش ئەوەیە یان یان هاتۆتە سەر یانەوەی جێیان دەگرێتەوە، کە ئاماژەیە بۆ هۆبوونی یەکەم و بەرهۆبوونی دووەم، لەبەرئەوەی لە زمانی موتەکەلیمەکاندا (مشروط) لەسەر (شرط) دەوەستێ و لەناویشیدا نابێ.

[2] القواعد لابن اللحام ص ٢٨٦ إرشاد الفحول ص ١٨١.

[3] الطلاق/٦.

(حائل)دا دیوه جا چ ژنەکە حامیل بێ یان نەزۆك، چونکە دەق کاتێ لە حوکمی نەفەقەی نەزۆك بێدەنگ بووە ئەوا لەسەر ئەسڵەکەی دەمێنێتەوە کە واجببوونە، ئەویش واجببوونی نەفەقەیە بەرەهایی بەر لە تەلاق. حیکمەتی واجببوونەکەیشی — کە بەندبوون (احتباس)ـە— بەدرێژایی عیددە دەمێنێ بەچاوپۆشین لە بوون یان نەبوونی سك.

لەوانەی ئەم رایەیان هەبووە: ئیبن شەبرمە و ئیبن ئەبی لەیلا و ثوری و حەسەن بن سالّح و عوسمان ئەلبەتین، کە لە هاوەڵان لە عومەری کوڕی خەتاب و ئیبن مەسعودەوە ریوایەت کراون[1].

چەمکی ژمارە:

هەڵواسینی حوکمە بە ژمارەیەکی تایبەتەوە کە جێگیربوونی پێچەوانەی حوکمەکەی لە جگە لەو ژمارەیەدا لێ دەخوێنرێتەوە، جا چ لەو ژمارەیە زیاد بێ یان کەم. هەریەك لە شافیعی و تەبەری و ماوەردی و هیتر دەستیان بەم چەمکەوە گرتوە، هەروەها ئەبولخەتاب ئەلحەنبەلی لە ئیمام ئەحمەدی گواستۆتەوە، هەریەك لە مالیك و داودی زاهیری و خاوەنی (الهدایە) لە حەنەفیەتیش ئەم رایەیان هەبووە.

ئەوانەیش رێگری لە کارپێکردنی دەکەن کە رێگە لە کارکردن بە چەمکی سیفەت دەگرن، تەنانەت لای هەندێ لەوانەی لەگەڵی بوون وەك ئەبی یەعلا، لە موفرەدەکانی سیفەت[2] ژمێردراوە.

## زاڵکردن:

لە دیدی مندا رای زاڵ دروستیی تایبەتکردنی گشتیبوونی قورئان و سوننەی جەمینە (متواتر)ـە بە قیاسی رۆشن لەبەرئەوەی کارپێکراوە و هێزی دیلالەتی دەگاتە

---

[1] المغني لابن قدامة ٩/٢٨٩ أصول الفقه للبرديسي ص ٣٨٠.
[2] إرشاد الفحول ص ١٨١ القواعد لابن اللحام ص ٢٨٨.

رادەیەك كە هاوتەریبی دەقەكانە، هەروەها بەوەی عیللەكەی بەدەق باس كراوە یان كۆدەنگی لەسەر بێ. جگە لەوە، دژیەكیك دەبینم لەنێوان قسەكەی حەنەفیەت لە كاركردن بەگوێرەی عمومی ﴿وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِناً﴾ لەگەڵ ناچاركردنی تاوانباری پەناگرتوو بە بەیت بۆ دەرچوون كە دەڵێن: نە خواردن و نە خواردنەوەی نادرێتێ و قسەی لەگەڵ ناكرێ تا دەردەچێ.

هەندێ لە هاوەڵانی ئیمام مالیك (رەحمەتی خوای لێبێ) گشتیبوونی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) كە دەڵێ: ((طهور إناء أحدكم إذا ولغ فيه الكلب أن يغسله سبع مرات أولاهن بالتراب))[1] بە قیاسكردنی سەگی رێگەپێدراو بۆ راگرتن لەسەر پشیلە تایبەت كردوە، ئەویش بەوەی هەردووكیان لەوەدا هاوبەشن كە بە ناوماڵدا دێن و دەچن و پێیان وانەبووە ئەم حوكمە بیگرێتەوە.[2]

لەم مەسەلە خیلافیانەی لە ناكۆكی لە دەستگرتن بە چەمكی ژمارە كەوتوونەتەوە:

أ– لەبارەی حوكمی ئاوێك پیسی بەركەوتووە و بڕەكەی خوار قولەتێنەوەیە رایان جیاوازە، هۆی جیاوازیەكەیشیان ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (إذا بلغ الماء قلتين لم يحمل الخبث)[3] ، كە ماناكەی ئەوەیە ئەگەر لە قولەتێن كەمتر بوو پیسی هەڵدەگرێ.[4]

مالیك و زاهیری و ئیمام ئەحمەد لە یەكێك لە دوو گوتەكەی و كۆمەڵێ لە هاوەڵانی رایان وایە ئاو كەم بێ یان زۆر هەر پاكە، ئەویش لە روانگەی كاركردن بە حەدیسی (إن الماء طهور لا ينجسه شيء)[5]، بەلام ئەگەر پیسیەكە یەكێك لە وەسفەكانی

---

[1] اخرجه مسلم وفي روايه له فليرقه وللترمذي احداهن او اولاهن بالتراب سبل السلام ٢٢/١.

[2] بڕوانە: مفتاح الوصول للتلمساني ص ١٠٥.

[3] سبل السلام ١٦/١

[4] التلمساني ص ١١٩.

[5] رواه أبو سعيد الخدري وأخرجه الثلاثة من أصحاب السنن ما عدا ابن ماجة وصححه أحمد سبل السلام ١٦/١.

ئاوەکەی گۆڕیبێ حوکمی پاکنەبوونیان بۆ داوە، لەبەرئەوەی ئیجماع لەسەر ئەوە هەیە، نەك بە چەمکی ژمارە.

حەنەفی و شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن ئاویان دابەش کردوە بۆ: کەم کە پیسی بەرەهایی زیانی پێدەگەیەنێ + زۆر کە زیانی پێ ناگەیەنێ مەگەر یەکێك لە وەسفەکانی بگۆڕێ. پاش ئەوە لە دیاریکردنی کەم و زۆردا رایان جیاوازە:

ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین ئاوی زۆریان بەوە دیاری کردوە کە بە جولاندنی لایەکی لاکەیتری نەجولێ. وتویانە ئەگەر پیسی کەوتە لایەکی دروستە لە لاکەیتری دەستنوێژ بگیرێ، لەبەرئەوەی بەڕواڵەت پیسیەکە بەوێ ناگا، ئەبوحەنیفە و ئەبویوسف جولاندن بە خۆ لێ شۆردن و محەمەد بن حەسەن ئەلشەیبانی بە دەستنوێژ لێگرتن دادەنێن.

هەندێ لە حەنەفیەکان بۆ ئاسانکاری رووبەرەکەیان بە دە بە دە مەزەندە کردوە بە باڵی کریاس، فتوایش لەسەر ئەوەیە، جگە لەوە بە کەم حسێبە.[1]

شافیعی وەك گوتمان ئاوی زۆری بەئەندازەی قولەتێن لە قولەکانی هجر کە نزیکەی پێنجسەد رەتڵە دیاری کردوە، ئەویش لە روانگەی دەستگرتن بە چەمکی ژمارە لە حەدیسی قولەتێندا، لەوە کەمتر بە کەم حسێبە.

ب- شەرعزان سەبارەت بە بژارەی مەرج لە سێ رۆژ زیاتر رایان جیاوازە، هۆی جیاوازیەکەیشیان ئەوەیە لە ئیبن عومەر (خوای لێ رازی بێ) ریوایەت کراوە، دەڵێ پیاوێك کە حبان بن منقذ بوو بە پێغەمبەر(ﷺ)ی گوت کە لە فرۆشتندا دەخەڵەتێنرێ ، ئەویش پێی گوت: (إذا بايعت فقال لا خلابة)[2]. متفق عليه. (واتە: ئەگەر کڕین و فرۆشتنت کرد بڵێ). ئیبن ئیسحاق لە گێڕانەوەکەی یونس بن بەکیر و عەبدولئەعلا لێیەوە، ئەوەی زیاد کردوە ((ثم أنت بالخيار في كل سلعة ابتعتها ثلاثة

---

[1] البداية مع الهداية بشرح فتح القدير ٧٩/١ فما بعدها.

[2] بكسر الخاء وتخفيف اللام أي لا خديعة... سبل السلام ٣٥/٣.

ليال فإن رضيت فأمسك وإن سخطت فاردد)). [1]. (واتە: پاشان تۆ بۆ ماوەی سێ شەو سەرپشکیت لە هەر کالآیەك کڕیوتە).

لێرەوە ئەبوحەنیفە و شافیعی و زوفر و ئەوانەی هاوڕایانن رایان وایە لە سێ رۆژ زیاتر جائیز نیە، شافیعی (مەفهومی موخالەفە)ی ژمارەی کردۆتە بەڵگە [2]، ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین ئەوەیان کردۆتە بەڵگە کە بەمەرجکردنی زیاتر لەسێ رۆژ پێچەوانەی قیاسە.

مالیك چووەتە ناو وردەکاریی بابەتەکە و دەڵێ، ئەگەر فرۆشراوەکە لەو شتانە بوو کە لە رۆژێك زیاتر نامێنێتەوە وەك میوە، نابێ مەرجی بژارە بۆ زیاتر لە رۆژێك هەبێ، ئەگەریش ملکێك بوو کە نەدەکرا لە ماوەی سێ رۆژدا ببینرێ، دروستە زیاتر لە سێ رۆژ بۆ بژارە دابنرێ، پێدەچێ ئیمام ئەحمەدیش هەمان رای هەبووبێ. [3]

هەندێ زانا [4] رایان وایە جائیز نیە حەدیسی حەبانی کوڕی مونقیز بکرێتە بەڵگە لەسەر بژارەی مافخوران لەبەرئەوەی تایبەتە بەو، واتە بژارەی مافخوران بۆ کەسیتر جگە لەو جێگیر ناکا، ئەویش لەبەر گشتیبوون و بەرکاربوونی بەڵگەکانی فرۆشتن بەبێ جیاکاری لەنێوان مافخوران و شتیتردا، حەدیسەکە تایبەت کراوە بەو و بژارەکە بۆ ئەو دانراوە لەبەر لاوازیی ئەقڵی، چونکە رەفتاری لە رەفتاری منداڵی فامداری مۆڵەتپێدراو دەرنەچووە، هەربۆیە بژارەی بۆ جێگیر کراوە لەگەڵ مافخوران.

پێم وایە رای زاڵ ئەوەیە ئیمام مالیك بۆی چووە، ئەویش لەبەر شیکردنەوە زانستیەکانی لە بابەتەکەدا و باسکردنی بە وردەکاریەك کە لەگەڵ سروشتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوەی لەو وردەکاریەدایە لە رەچاوکردنی بەرژەوەندیی هەریەك لە فرۆشیار و کڕیار، کۆکە.

---

[1] سبل السلام ٣٥/٣.

[2] المهذب للشيرازي ١٥٨/١.

[3] المغني لابن قدامه ٩٥/٤ و پاشتر.

[4] فتح القدير ٣٠١/٦، أسباب اختلاف الفقهاء للشيخ على الخفيف ص ١٥٧ سبل السلام ٣٥/٣ و پاشتر.

## بەشی سێیەم:
## دابەشکردنی لەفز
## بەلەبەرچاوگرتنی روونی و شاراوەیی دیلالەت

دیاریکردنی دیلالەتی لەفز بۆ ماناکەی لەڕووی روونـی و ناڕوونیـەوە کاریگەریـەکی بەرچاوی لە جیاوازبوون لە هەڵێنجانی ئەحکامدا هەیـە. لەبەرئـەوە زانایـان بایـەخیان داوە بە دابەشکردنی ئـەو لەفزانـەی لـە دەقـەکانی قورئـان و سـوننەدا هـەن لـەڕووی روونی لە دیلالەت بۆ حوکمەکان بۆ دوو بەشی سەرەکی:

١- دیلالەتی رۆشن بۆ ماناکەی تێگەیشتن لە مەبەستی، یان پیادەکردنی لەسـەر رووداوەکان پێویست بە شتێك لە دەرەوەی خۆی نەکا.

٢- دیلالـەت شـاراوە بـۆ ماناکـەی بەشـێوەیەك تێگەیشـتن لـە مەبەسـتی، یـان پیادەکردنی پێویستی بە شتێك لە دەرەوەی خۆی هەبێ.

ئەو لەفزانەی دیلالەتیان روونە لە روونیدا لەیەك ئاستدا نین، بەڵكو هەندێكیان لـە هەندێکیتریان روونترن، هەروەها لەفزە شاراوەکانیش لـە شـاراوەییدا یەکسـان نـین، بەڵکو هەندێکیان لە دیلالەت بۆ حوکمەکان لە هەندێکیتر شاراوەترن.

لەبەر تیشکی ئەم جیاوازییە لە هەردوو لایەنی روونی و شـاراوەییەوە هەریـەك لـە حەنەفیەت و جمهور رێگەیەکی تایبەتیان لە دابەشکردندا گرتۆتە بەر.

زانایانی حەنەفی لەفزیان لـەڕووی روونیـی دیلالەتیـەوە دابـەش کـردوە بـۆ: دیـار (ظاهر)، دەق (النص)، راڤەکار (مفسر) و دامەزراو (محکم) کەوتون. هەروەها لەڕووی شـاراوەییان بـۆ: شـاراوە (الخفـي)، بـەگرێ (مشـکل) و کۆبێـژ (مجمـل) و لێکچـوو (متشابە).

جمهوریش رێبازێکیتری لە دابەشکردنی لەفز لەڕووی روونیەوە گرتۆتەبەر و دابەشی کردوە بۆ: دیار و دەق، لەڕووی شاراوەییشەوە بۆ کۆبێژ و لێکچوو گرتۆتەبەر.

هەوڵ دەدەین لە چوار باسدا ئەم دوو میتۆدە بخەینە روو، یەکەمیان لە دابەشکردن لەڕووی روونی لای حەنەفیەت، دووەمیان لە دابەشکردن لەڕووی روونی لای جمهور، سێیەمیان لە دابەشکردن لەڕووی شاراوەییەوە لای حەنەفیەت، چوارەمیش لە دابەشکردن لەڕووی شاراوەییەوە لای جمهور.

## باسی یەکەم:
## دابەشکردن بە لەبەرچاوگرتنی روونی لای حەنەفیەت

لای حەنەفیـەت لـەفزەکان لـەڕووی روونیـی دیلالەتـەوە بـۆ چـوار بـەش دابـەش دەکرێن، کە بریتین لە دیار و دەق و راڤەکار و دامەزراو، لە خوارەوە بەدرێژی باس لە هەریەك لەو بەشانە دەکەین:

### ١- دیار (الظاهر):

ئەوەیە خۆی ئاماژە بۆ ماناکەی دەکا لەگەڵ بوونی ئەگەری تایبەتکردن و تەئویل و قبوڵکردنی نەسخدا[1]. پاشینەکانی حەنەفیـەت کۆتێکیـان بـۆ ئـەم پێناسـەیە زیـاد کردوە ئەویش: ئەوەیە مەبەست لە هێنانەکە ئەو نەبێ[2]. وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾، کە لە بنەڕەتدا ئاماژەیە بۆ رەتکردنـەوەی لێکچـوون لەنێوان فرۆشتن و سوودا، هەروەها بە تەبەعی–ش بەڵگەیە لەسەر حەڵاڵیی فرۆشـتن و حەرامیی سوو، بە ئیعتیباری ئەم دیلالەتە تەبـەعی (پاشـکۆ)ییەیش پێـی دەوتـرێ (ظاهر). هەریەك لە (بيع) و (ربا) لەفزی گشتین و تایبەتکردن هەڵدەگرن کە بازنـەی گرتنەوەکەی بەرتەسك دەکاتەوە.

هەروەها خوا ئەفەرموێ: ﴿فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً﴾ ئاشـکرایە لـە ئیباحـەکردنی خواسـتنی ئـەوەی باشـە لـە ئافرەتان کە ئەوە مەدلولە پاشکۆکەیەتی، چونکە دەقەکە لە بنەڕەتدا بۆ دیاریکردنی

---

[1] واتە پێش مردنی پێغەمبەرﷺ چونکە پاش سەردەمی ئەو نەسخ نیە.
[2] تسير التحرير ١/١٣٦ فما بعدها، الازميري ١/٣٩٨

ژمارەکە بە چوار لە باری دادپەوەریبوون و یەك دانە لەکاتی ترسان لە ستەمکردندا، هێنراوە.

دیسان خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النبي إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ لە بنەڕەتدا بۆ پیشاندانی رەچاوکردنی کاتی تەڵاق لەکاتی ویستنیدا هێنراوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرایە لە فەرمانکردن بەوەی تەڵاقدەر لە یەك تەڵاق زیاتر نەدات.

حوکمی زاهیریش بریتییە لە پێویستیی کارکردن بەو حوکمانەی ئاماژەیان پێدەکا تا بەڵگەیەکی راست پەیدا دەبێ لەسەر تایبەتکردنی یان تەئویلکردنی یان نەسخکردنی.

## ٢- دەق (النص):

لەفزێکە بەڕوونی ئاماژە بۆ حوکمێك دەکا کە لەپێناویدا هێنراوە و شیمانەی تایبەتکردن و تەئویلکردن هەڵدەگرێ، شیمانەیەك کە لاوازترە لە شیمانەی زاهیر لەگەڵ قبوڵکردنی بۆ نەسخ لە سەردەمی پەیامەکەدا[1].

ئەو سێ ئایەتەی وەك نموونە لەسەر زاهیر هێنانمان نموونەن بۆ دەقیش لەڕووی دیلالەتی بنەڕەتیان بۆ حوکمەکان، ئەویش رەتکردنەوەی لێکچوونە لەنێوان فرۆشتن و سوود لە یەکەمیان، دیاریکردنی ژمارەی ژنان لە دووەمیان و رەچاوکردنی کاتی تەڵاقدان لە کاتی ویستنی لە سێیەمدا.

حوکمیشی حوکمی زاهیرە لەڕووی پێویستی کارکردن بەوەی ئاماژەی پێدەکا تا بەڵگەی تایبەتکردن یان تەئویلکردن یان نەسخکردن پەیدا دەبێ. بەڵام ئەم شیمانەیە لە دەقدا زیاترە تا زاهیر لەبەر ئەوەی روونترە.

---

[1] اصول السرخسي ١٦٤/١. كشف الاسرار مع البزدوي ٤٦/١.

### ٢- راڤەکار (المفسر):

ئـەو لەفزەیـە بەشـێوەیەکی وا روون ئامـاژە بـۆ ماناکـەی دەکـا لەگەڵیـدا هـیچ شیمانەیەك بۆ تایبەتکردن یان تـەئویلکردن نـامێنێ، بـەڵام لـە سـەردەمی تەشـریعدا ئەگەری نەسخکردنەوەی هەیە[1]. بەوەیش لە روونیدا لـە زاهـیر و (نـص) روونـتر و لـە تێکگیراندا پێشیان دەخرێ، وەك ئەوەی خوا ئەفـەرموێ: ﴿وَقَـاتِلُواْ الْمُشْـرِكِينَ كَآفَّـةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾.[2]

لێرەدا لەفزی موشریکان (المشرکین) گشتییە و شیمانەی تایبەتکردن هەڵدەگرێ، بـەڵام وشـەی (کافـة) ئـەم شـیمانەیە رەت دەکاتـەوە، لەبەرئـەوە حوکمەکـە لێـرەدا دەبێتە واجبیی شەڕکردن نەك هیچیتر و جێبـەجێکردنی فەرمانەکـە بـەبێ شـەڕکردن لەگەڵ گشت موشریکان بەبێ جیاوازی بەدی نایەت.

هەروەها لـەفزی کۆبێـژ (موجمـەل)یش کـە دەقێـك لـە شـەرعدانەرەوە هـاتووە و روونی کردۆتەوە و کۆبێژیەکەی نەهێشتوە هەر لە راڤـەکار حسـێبە، وەك لـەفزەکانی (الصـلاة، الزکـاة، الحـج) کـە شـەرعدانەر مانایـەکی دیـاریکراوی جیـاواز لـە مانـا زمانەوانیەکەی بە هەریەکەیان داوە.

لێـرەوە راڤـەکار دوو سەرچـاوەی هەیـە، یـەکێکیان ئەوەیـە لـە سـیغەکە خـۆی وەردەگیرێ، دووەمیشـیان ئەوەیـە لـە روونکردنـەوەی راڤـەکردنێکی گومـانبڕی پاشـکۆی سـیغەکەوە وەردەگـیرێ کـە لەلایەنێکـەوە دەرچـووە دەسـەڵاتی روونکردنەوەی هەیە، وەك موجمـەل کـە سـوننە بەشـێوەیەکی یەکلاکـەرەوە روونـی کردۆتـەوە[3].. ئـەوە روونـە دیلالـەتی راڤـەکار بـۆ حـوکم لـە دیلالـەتی دەق و زاهـیر

---

[1] أصول السرخسي ١٦٥/١.

[2] التوبة/ ٣٦.

[3] أصول البزدوي مع الكشف ٥٠/١ أصول عباس حمادة ص ٤٣٨.

بەهێزترە، لەبەرئەوە لە تێکگیراندا پێشیان دەخرێ.[1]

حوکمی راڤەکار بریتییە لە پێویستیی کارکردن بەوەی ئاماژەی بۆ دەکا بەو شێوەیەی یاسادانەرەکەی روونی کردۆتەوە تا بەڵگە لەسەر نەسخکردنەوەی پەیدا دەبێ، واتە بە تەئویل یان تایبەتکردن لە ماناکەی ناترازێنرێ.

### ٤- موحکەم:

ئەو لەفزەیە بەشێوەیەکی روون و بنبڕ کە تەئویل و تایبەتکردن و نەسخ هەڵناگرێ ئاماژە بۆ ماناکەی بکا، حوکمەکانیشی پەیوەندییان بە یەکێك لەم دووانەی خوارەوە هەیە:

أ- حوکمە بنچینەییەکانی تایبەت بە رێساکانی ئاین و چاکە گەورەکان و بناغەی شەریعەت.

ب- ئەو حوکمە تەکلیفیانەی نەسخ و بەتاڵکردنەوە لەلایەن شەرعدانەرەوە قبوڵ ناکەن وەك ئەو حوکمە جوزئیانەی بەراشکاوی باس لە هەمیشەبوونیان کراوە، لەوانە ئەوەی خوا لەبارەی حەرامکردنی شووکردنەوەی ژنانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) پاش ئەو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا﴾[2]، یان ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((الجهاد ماض إلى يوم القيامة))[3].

موحکەمیش یان لەبەر خودی خۆی لەبەر غەیری خۆیەتی، موحکەم لەبەر خودی خۆی ئەوەیە لەبەر خودی خۆی نەسخ قبوڵ ناکا وەك ئەو نموونانەی پێشوو، موحکەم لەبەر غەیری خۆیشی ئەوەیە بە شتێك لە دەرەوەی دەقەکە موحکەمە وەك

---

[1] كشف الأسرار مع البزدوي ٤٤/١.

[2] الأحزاب/٥٣.

[3] الحديث ورد بروايات اخرى رلجع نيل الأوطار ١٤٣/٦.

تەواوبوونی بواری نەسخکردنی بە مردنی پێغەمبەرﷺ، موحکەمیش بەم مانایە ئەو چوار بەشە دەگرێتەوە کە لەبارەیانەوە دواین.

جیاوازیی رادەی روونی لەنێوان ئەم چوار بەشەدا کاریگەریی بەرچاوی هەبووە لە جیاوازیی شەرعزان لە هەڵێنجانی ئەحکام لە دەقەکان، ئەو ناکۆکیەیش لەم بوارانەدا دەرکەوتوە:

أ- جیاوازی لە دانانی دەقێك لە دەقەکانی کیتاب (قورئان) یان سوننە بەبەشێك لەم بەشانە.

ب- جیاوازی لە بوونی تێکگیران لەنێوان دوو بەش لەم بەشانە.

ج- جیاوازی لە چۆنێتی نەهێشتنی تێکگیران لەنێوان دوو بەشە تێکگیراوەکەدا.

وا لە خوارەوە چەند نموونەیەك لەو ناکۆکییە فیقهیانەی لەسەر ئەو ناکۆکیەی باس کرا دامەزراون دەخەینە روو:

١- شەرعزان رایان جیاوازە لەبارەی خوێندنی سورەتی فاتیحە لەلایەن مەئمومەوە لەپشتی ئیمام، ئەویش بەهۆی ئەو -بەرواڵەت- تێکگیرانەی لەنێوان ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ (لا صلاة إلا بفاتحة الكتاب) [1] و ئەوەی ئەفەرموێ (من كان له إمام فقراءة الإمام له قراءة)[2]دا هەیە، چونکە لە یەکەمیاندا دیارە کە نوێژێك فاتیحەی تێدا نەخوێنرێ بە دروست دانانێ جا چ نوێژخوێنەکە بەتەنها بێ یان لەپشتی کەسێکیترەوە نوێژ بکا، لەبەرئەوەی ئەو (لا)یە بۆ نەفی جنسە، لەبەرئەوە نوێژی پشت ئیمام و هی تاکەکەسیش دەگرێتەوە.

---

[1] لە ریوایەتێکی عوبادەدا، لای (أحمد وأبي داود والترمذي وابن حبان)دا هاتووە: پێدەچێ ئێوە لەپشت ئیمامەکەتان (وتراوی بەشەکانی نوێژ) بخوێنن؟ وتیان: بەڵێ. وتی: وا مەکەن تەنها فاتیحە نەبێ چونکە هەر نوێژێك ئەوەی تێدا نەخوێنرێ دروست نیە. سبل السلام ١/١٧٠ و پاشتر.

[2] من صلى خلف الإمام فقراءة الإمام قراءة له. (ئەوەی لەپاش ئیمام نوێژ بکا خوێندنی ئیمام خوێندنە بۆ ئەویش). رواه جابر عن النبي صلى الله عليه وسلم وصححه احمد سبل السلام ١/١٧١.

بەڵام دووەمیان دەقە، لەبەرئەوەی لە گەیاندنی ماناکەیدا لە یەکەمیان روونترە، کە ئاماژەیە بەوەی خوێندنی ئیمام جێی خوێندنی مەئمومیش دەگرێتەوە.

بۆچوونەکانیش پێنجن:

أ- واجبیی خوێندنی مەئموم لەپشت ئیمامەکەی لەوەی بەدەنگ یان بەبێدەنگ دەیڵێ چ گوێی لە خوێندنی ئیمام بێ یان گوێی لێ نەبێ. ئەمە رای مەکحول و ئەوزاعی و شافیعی و ئەبو ثورة، لەبەرئەوەی حەدیسی (لا صلاة لمن لم يقرأ بها) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی وەك تایبەتکردن خوێندنی فاتیحە لەپشت ئیمامەوە واجبە، هەروەها لە نوێژی ئاشکرا (بەدەنگ) و نهێنی (بێدەنگ)دا بەگشتی و لە هەموو رکاتێکیشدا دیارە.[1]

ب- واجبیی خوێندنی مەئموم لەپشت ئیمامەکەی لە نوێژە نهێنیەکان نەك ئاشکراکاندا، ئەمەیش رای زوهری و هەندێ لە مالیکی و ئیبن موبارەك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە.[2]

ج- هادەویە دەڵێ مەئموم لە نوێژی ئاشکرادا لەپشت ئیمامەوە ناخوێنێ ئەگەر گوێی لێ بوو، ئەگەر گوێی لێ نەبوو دەیخوێنێ.

رەنگە گرنگترین شت کە خاوەنانی رای دووەم و سێیەم دەستیان پێوە گرتوە ئەوەبێ خوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ﴾.[3] هەروەها حەدیسی ((إذا قرأ فأنصتوا))[4].

د- حەنەفیەت و سوفیانی ثوري دەڵێن مەئموم نە لە نهێنی و نە لە ئاشکرادا ناخوێنێ. عەبدولعەزیز ئەلبوخاری داکۆکی لەم بۆچوونە کردوە و پێی وابووە

---

[1] سبل السلام ١٧١/١.

[2] نيل المارب ٥٧/١ .

[3] الأعراف/ ٢٠٤.

[4] سبل السلام ١٧١/١ منهج السالك في مذهب الإمام مالك ص ٣٣.

حوكمی خوێندن لەپشتی ئیمامەوە لەنێوان دوو حەدیسدایە، یەكێكیان دەقە وئەویتریان زاهیرە -وەك باسمان كرد- شتێكی سروشتیشە دەق پێش زاهیر بخرێ و زاهیر لەسەر ئەو بار بكرێ.

هەروەها ئەوانەیش گوتویانە واجبە لەپشتی ئیمام بخوێنرێ رایان جیاوازە، هەندێكیان وتویانە لەكاتی وەستانی ئیمام لەنێوان ئایەتەكاندا دەیخوێنێ، هەندێكیتریان وتویانە لەكاتی بێدەنگبوونیدا پاش تەواوكردنی فاتیحە دەخوێنرێ، ئەم دوو قسەیە هیچ بەڵگەیەكیان لە حەدیسی عیبادەدا نیە، چونكە ئاماژەیە بەوەی لەكاتێكدا ئیمام فاتیحە دەخوێنێ، دەخوێنرێ.

٢- شەرعزان جیاوازن لەبارەی حوكمی ئەو پیاوەی ژنێك بۆ نموونە بۆ ماوەی مانگێك دێنێ ئایا ئەوە موتعەیە یان زەواجە؟ سەرخەسی لە ئوسوڵەكەیدا دەڵێ: لە تێكگیرانی نێوان دەق و رەڤەكاردا ئەوەیە كەسێك ژنێك بێنێ بۆ ماوەی مانگێك، ئەوە موتعە دەبێ نەك نیكاح، چونكە ئەوەی دەڵێ (تزوجت) دەقە لە نیكاحدا، بەڵام ئەگەری موتعەی تێدا هەیە، ئەوەیش دەڵێ مانگێك (شهرا) راڤەكارە لە موتعەدا و شیمانەی نیكاحی تێدا نیە، لەبەرئەوەی نیكاح بەهیچ شێوەیەك كاتبەندی (تەوقیت) هەڵناگرێ، جا ئەگەر لە قسەدا كۆببوونەوە راڤەكار تەرجیح دەكەین و دەبێتە موتعە نەك نیكاح. ئەمەیش رای جمهورە.[1]

زوفەر دەڵێ: بە نیكاحێكی دروست دادەنرێ نەك موتعە، لەبەرئەوەی كاتبەندی مەرجێكی فاسیدە نیكاحیش بە مەرجی فاسید بەتاڵ نابێتەوە بەڵكو مەرجەكە بەتاڵ دەبێتەوە و نیكاحەكە دروست دەبێ، هەروەها ئەگەر مارەی كرد بەو مەرجەی پاش مانگێك تەڵاقی بدات دروستە و مەرجەكە بەتاڵە.[2]

---

[1] أصول السرخسي ١/١٦٦ البزدوي مع الكشف ١/٥٠-٥١.
[2] فتح القدير مع الهداية والعناية ٣/٢٤٩.

٣- شەرعزان لەبارەی قبولکردنی شایەتیدانی ئەوانەی حەدی قەزفیان لێدراوە رایان جیاوازە، لە هۆکانی ئەم جیاوازیەیش تێگیرانی دوو دەقە یەکێکیان راڤەکار و ئەویتریان موحکەمە، ئەوانیش یەکەمیان ئەوەی خوا لە بارەی شایەتی و شایەتەوە ئەفەرموێ ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾[١]، لەگەڵ ئەوەی لەبارەی ئەوانەی حەدی قەزفیان لێدراوە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا﴾.

دەقی یەکەم راڤەکار لە قبولکردنی شایەتیی کەسانی دادپەروەر (عدول) و قبولکردنی شایەتیی جگە لەوان هەڵناگرێ، لەبەرئەوەی بەشایەتکردن بۆ قبولکردنە لەکاتی ئەنجامداندا، ئەوە بە گشتیبوونی قبولکردنی شایەتیی قەزفکار دەخوازێ ئەگەر تەوبەی کرد، چونکە ئەوەی لەسەر راست دەگەڕێ کە پاش تەوبەکردن بووەتە دادپەروەر.

دەقی دووەم موحکەمە لەبەر ئەوەی بەڕاشکاوی بەئەبەدیکردنی تێدایە و دەخوازێ شایەتیی حەدلێدراو قبول نەکرێ با تۆبەیشی کردبێ.

ئەوانەی رایان وایە شایەتی حەدلێدراوانی قەزف قبول ناکرێ وەك حەنەفیەت، دەڵێن دەقی دووەم بەسەر یەکەمدا زاڵ دەکرێ و شایەتی ئەوەی حەدی قەزفی لەسەر جێبەجێ کراوە قبول ناکرێ با لەکاتی شایەتیدانەکەیشدا عەدل بێ، بەوەی پاش جێبەجێکردنی حەدەکە تەوبەی کردبێ.

ئەوانەیش رایان وابووە شایەتییان قبول دەکرێ -کە ئەوە رای جمهورە- تێکگیرانیان لەنێوان ئەو دوو دەقەدا نەدیوە لەبەرئەوەی هەڵاوێران لەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا﴾ روو لە هەریەك لە ﴿وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا﴾ و ﴿وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ دەکا، چونکە هەڵاوێران (ئیستیسنا) ئەگەر پاش چەند

---

[١] الطلاق/٢

رستەیەك هات بۆ هەموویان دەگەڕێتەوە. رووی لە رستەی یەکەم ﴿فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾ نەکردوە لەبەرئەوەی ئەوە مافێکە لە مافەکانی قەزفکراو و بە تەوبە ناکەوێ.

بەبڕوای من رای زاڵ قبوڵکردنی شایەتی حەدلێدراوانی قەزفە، لەبەرئەوەی گەورەترین رێگرەکانی شایەتیدان کوفر و قەتڵ و ئەزیەتدانی دایك و باوك و زینایە، جا ئەگەر ئەو کەسەی ئەم گوناهە گەورانە دەکا تۆبەی کرد، هەموولا کۆکن لەسەر ئەوەی شایەتی قبوڵە، کەواتە ئەوەی تۆبە لە قەزف دەکا بۆ قبوڵکردن لەپێشترە.

هەروەها لەبەرئەوەی عیللەی رەتکردنەوەی شایەتیی قەزف بریتییە لە فیسق و ئەویش بە تەوبەکردن نەماوە، بۆیە پێویستە ئەوەیش لەو کەوتۆتەوە نەهێڵرێ، کە رێگرتنە لە شایەتیدان، هەروەها لەبەرئەوەی قەزفکەر بە قەزفکردنەکەی بووەتە فاسق جا حەدی لێ بدرێ یان لێی نەدرێ، جا چۆن لە باری فیسقیدا شایەتیەکەی قبوڵ دەکرێ و پاش نەمانی رەت دەکرێتەوە؟ هەروەها لەبەرئەوەی لە شەریعەتی ئیسلامیدا گوناهێك نیە تۆبەی لێ بکرێ و ئەو ئەسەرەی لێی دەکەوێتەوە هەر بمێنێ، وەك رەتکردنەوەی شایەتی.[1]

---

[1] إعلام الموقعين ١/١٤٩.

## باسی دووەم:
## دابەشکردن بە لەبەرچاوگرتنی روونی لای جمهور

بەلای جمهوری زانایانەوە لەفزەکان بەگوێرەی روونی دیلالەت بۆ زاهیر (دیار) و دەق دابەش دەبن، بە جیاوازییان لە وردەکاریدا.

شافیعی وەك لە کتێبەکانی و لە گێڕانەوەی زانایان لێیەوە زانراوە، زاهیر و دەقی لەیەك جیا نەکردۆتەوە بەڵکو لە دەربڕینی ئەودا هەردووکیان دوو ناون بۆ یەك ناولێنراو، وەك هەریەك لە ئەبوحوسێنی بەصری[1] و ئەلکیا ئەلهەراسی و غەزالی[2] لێی دەگێڕنەوە.

وادیارە شافیعی لێکی جیا نەکردونەتەوە لەبەرئەوە سەرنجی مانا زمانەوانیەکەی داوە، وەك لەو قسەیەی ئیمامی حەرەمەینەوە دیارە کە دەڵێ: (هەرچی شافیعییە لە قسەکانیدا زاهیرەکان بە (نصوص) ناو دەبات، هەروەها قازیش، لەڕووی زمانەوانیشەوە راست دەکا، لەبەرئەوەی (نص) بەمانای دەرکەوتن (الظهور) دێ.

هەرچی زانایانی شافیعی و جگە لەوانن لە موتەکەلیمین ڕێچکەی شافیعییان نەگرتوە لە دانانی سنوور لەنێوان زاهیر و نەصدا، بەڵکو هەریەکەیان بە جیاواز لەویتر لێکداوەتەوە با لەسەر یەك پێوەریش بۆ لێك جیاکردنەوەیان کۆك نەبن، بەڵام قسەی زۆربەیان لەسەر ئەوە کۆکە کە (نص) ئەوە دیلالەتەکەی گومانبڕ بێ، بەڵام زاهیر ئەوەیە دیلالەتەکەی گومانگر بێ.

توێژەر وای دەبینێ ئەم ڕەهاکردنەی (نص) بۆچوونی زۆربەی موتەکەلیمین بووە لە زانایانی ئوسوڵ لە سەدەی شەشەمدا.

---

[1] بڕوانە: المعتمد ٣١٩/١.

[2] المستصفى للغزالي ٣٨٤/١ و پاشتر.

ئیبن قودامەی مەقدیسی[1] لە زانایانی حەنبەلی پێناسەی کردوە بەوەی: ئەوەیە بەخۆی مانا دەگەیەنێ بەبێ شیمانە.

ئیبنول حاجبی مالیکی پێناسەی کردوە بەوەی، ئەوەیە دیلالەتێکی گومانبڕ بکا، بەوەیش زاهیر ئەوەیە دیلالەتێکی گومانگر بکا وەك قازی عەزد تەفسیری کردوە.[2]

زەیدی دەڵێن: (نص) یان روونە یان شاراوە، رۆشن (جلي) ئەو لەفزەیە ئاماژەیە لەبەر زەرورەتی روونی جا ناو بێ یان پیت، بۆ مانایەك و جگە لەو هیچیتر ناگرێتەوە، شاراوە (خفي)ش ئەو لەفزەیە ئاماژەیە بۆ مانایەك ئەگەری جگە لەوی لێ ناکرێ بە زەرورەتی تێروانین (النظر) نەك بە زەرورەتی بار (الوضع)[3]. حیللیش لە شیعەی ئیمامی دەڵێ: لەفزە گەیەنەرەکە ئەگەر جگە لەوەی هەڵنەگرت کە لێی دەفامرێ ئەوە (نص)ە، ئەگەر هەڵیگرت ئەگەر یەکسان بوون ئەوە (مجمل)ە، ئەگینا رای زاڵ ئەوەیە زاهیرە و بنزاڵ ئەوەیە تەئویلکراوە.[4]

لەبەر تیشکی ئەوەی رابورد دەکرێ بڵێین (نص) لای جمهور -جگە لە هەندێ رەهاکاری- هاوبەشکە (قسیم)ی زاهیرە و بریتییە لەوەی تەئویل هەڵناگرێ.

## بەراورد لەنێوان میتۆدی حەنەفی و میتۆدی جمهور:

١- ئەوەی لای جمهور زاهیرە لای حەنەفیەت بەشێکە لە (نص)، لەبەرئەوەی بەبڕوای ئەوان شیمانە لە هەردووکیاندا هەیە.[5]

٢- (نص) لای جمهور -زۆربەیان- لەگەڵ راڤەکار لای حەنەفیەت یەك دەگرێتەوە، بەڵام زاراوەی راڤەکار بەو مانایەی حەنەفیەت مەبەستی بووە لای

---

[1] (لە ٦٢٠ك مردوە) بڕوانە: روضة الناظر مع بدران ٢/٢٧.

[2] مختصر المنتهى مع العضد ٢/١٦٨.

[3] الفصول اللؤلؤية لابراهيم عبد الهادي مخطوطة دار الكتب المصرية.

[4] مبادئ الوصول إلى علم الأصول ص ٦٤-٦٥.

[5] التقرير والتحبير مع التحرير ١/١٥١.

جمهور بەناوبانگ نەبوە، بەڵام شافیعی لەبەرانبەر ئەوەی بە موجمەلی داناوە بەکاری هێناوە[1]. رازی-ش بۆ دوو جۆر لە لەفز بەکاری هێناوە یەکێکیان ئەو لەفزەیە تەفسیرەکەی هاتووە لەبەر پێویستبوون پێی.[2]

٣- موحکەم لای جمهور (نص) و زاهیر دەگرێتەوە، قازی عەزد پێناسەی کردوە بەوەی: ئەوەیە ماناکەی روون بووەتەوە جا چ (نص) بێ یان زاهیر.[3]

ئەلسەبکی لە (الابهاج)دا دەڵێ: موحکەم رەگەزە بۆ هەردوو جۆرەکەی، (نص) و زاهیر.[4]

## زاهیر و تەئویلکراو:

ئیبنول حاجب دەڵێ: زاهیر ئەوەیە دیلالەتێکی گومانگر دەگەیەنێ ج بە دانان بێ یان بە عورف، تەئویلیش وەرگرتنی زاهیرە بەگوێرەی ئەگەری بنزاڵ (مرجوح).[5]

بەڵام ئەبوبەکری باقلانی بازنەی زاهیری تەسک کردۆتەوە و پێناسەی کردوە بەوەی (لەفزێکی مانا ماقووڵە کە حەقیقەت و مەجازی هەیە، ئەگەر بە حەقیقەتەکەی بەکارهات زاهیر دەبێ، ئەگەریش بۆ مەجاز لایدا دەبێتە تەئویلکراو).[6]

پێم وایە دابەشکردنی زاهیر بۆ زاهیر و تەئویلکراو لە قسەی ئیبنول حاجب و باقلانی و ئەوانەی رێچکەیان گرتوون شتێکی راست نیە، چونکە وەك دابەشکردنی شتە بۆ خۆی و جگە لە خۆی. ئەمە جگە لەوەی قسەکەی باقلانی لە لایەکیتریشەوە جێی رەخنەیە، ئەویش ئەوەیە دەشێ لایەنی مەجاز زاڵ بێ وەك ئەو مەجازە شایعە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ١/١٢٥ الأم للشافعي ٧/١٨٠

[2] المحصول للرازي مخطوطة دار الكتب المصرية.

[3] التحرير وشرحه التيسير ١/١٤٣.

[4] الإبهاج في شرح المنهاج لتاج الدين السبكي ١/١٣٦.

[5] بروانە: مختصر المنتهى مع العضد والسعد ٢/١٦٨.

[6] البحر المحيط للزركشي كما اقتبسه الشوكاني، إرشاد الفحول ص ١٧٥.

زۆر و زەوەندانەی هەن.

نزیکترین لە راستیەوە ئەوەیە بوترێ ئەو لەفزەی تەئویل هەڵدەگرێ ئەگەر بە مانا زاڵەکەی وەرگیرا پێی دەوترێ زاهیر، ئەگەر بە مانا بنزاڵەکەیشی وەرگیرا پێی دەوترێ تەئویلکراو.

**هەڵوێستی زاهیری لە زاهیر:**

زانراوە کۆڵەکەی مەزەبی زاهیری دەستگرتنە بە رواڵەتی دەقەکانی کیتاب و سوننە، ئەگەر ئەو دوانە نەبوون، ئیجماع. سەرجەم دەقەکان حوکمی دەقی راڤەکاریان هەیە کە پێویست بە تەئویل یان تەعلیل ناکا. تەئویل لای ئیبن حەزم گواستنەوەی لەفزە بەو شێوەیەی رواڵەتەکەی دەیخوازێ و ئەوەی لەرووی زمانەوانیەوە بۆی دانراوە، بۆ زمانێکیتر. ئەگەر گواستنەوەکەی بە بەڵگەیەک راست بوو و گوێزەرەوەکەی گوێڕایەڵی واجب بوو ئەوە راستە، ئەگەر وا نەبوو وازی لێدەهێنرێ و ئاوڕی لێنادرێتەوە و حوکمی بەتاڵی بەسەردا دەدرێ[1].

**مەرجەکانی تەئویل:**

تەئویل بریتییە لە لادانی لەفز لە مانا رواڵەتی (زاهیری)یەکەی بۆ مانایەکیتر کە لەفزەکە لەبەر بەڵگەیەک هەڵیدەگرێ. دەچێتە سەر تایبەت و مانای لەفزەکە لەوەی بە راستەقینە بۆی دانراوە دەگۆڕێ بۆ مەجاز[2]. هەروەها دەچێتە سەر گشتی و لە گشتیبوونەکەی لایدەدا بۆ تایبەتکردن لەبەر بەڵگەیەک کە ئاماژەی بۆ دەکا، هەروەها دەچێتە سەر هاوبەش و مەبەستی شەرعدانەر لە یەکێك لە دوو ماناکەی یان ماناکانی بەو قەرینە و نیشانانەی ئاماژەی بۆ دەکەن، روون دەکاتەوە.

---

[1] الإحكام في أصول الأحكام لابن حزم ٣/٢٩١.

[2] مستصفى الغزالي ص ٢٨٢.

زانایان له ئوسولناسان و شەرعزان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەسڵ لە بەڵگەکانی لقەکان (فروع)دا پێویستی کارکردنە بە زاهیر یان (نص) لە مانای لەفزەکان لەبەرئەوەی ئەسڵ تەئویلنەکردنە و بەبێ بەڵگەیەك کە ئاماژە بۆ راستبوونی بکا لێی لانادات و ئەو حوکمانەی بەڕێگەی تەئویل جێگیر دەکرێن دیلالەتیان گومانگرە و جێگەی ئیجتیهادن.

لەبەر گرنگیی تەئویل و کاریگەریی بەرچاوی لەسەر هەڵێنجانی ئەحکام و لێرەیشەوە لە جیاوازیی شەرعزاندا، زانایان کۆمەڵێ مەرجیان بۆ دروستی داناوە گرنگترینیان ئەمانەن[1]:

١- مەرجە لەفزەکە تەئویل هەڵبگرێ، ئەگەر راڤەکار یان موحکەم بوو[2] تەئویل قبوڵ ناکا.

٢- لەگەڵ دۆخی زمان یان عورفی بەکارهێنان یان زاراوەی شەرعدا بگونجێت و فاسید نەبێ.

٣- بەڵگەیەك لە کیتاب یان سوننە یان ئیجماع هەبێ کە مەبەستی شەرعدانەر مانا تەئویلکراوەکەیە کە لە پێناویدا واز لە لەفزە زاهیرەکە یان (نص)ەکە دەهێنرێ. لەبارەی ئەو بەڵگەیەی دەبێتە قیاس رایان جیاوازە کە ئاخۆ تەئویلی پێدەکرێ یان نا؟ هەندێکیان بەرەهایی قەدەغەیان کردوە، هەندێکیشیان بەرەهایی رێگەیان پێداوە، هەندێکیش گوتویانە ئەگەر قیاسی رۆشن بێ، دەبێ.

٤- ئەو کەسەی تەئویلەکە دەکا شیاو بێ بۆ ئەو کارە، بەوەی لەو کەسانە بێ لەڕووی فیقهیەوە بەتوانان و دەتوانن لە دەقەکان تێبگەن و حوکمیان لێ هەڵێنجن.

---

[1] بڕوانە: الموافقات للشاطبي ٤/١٠٥ و پاشتر. المدخل الى مذهب الامام أحمد لعبد القادر بدران ص ١٨٣و پاشتر. المدخل للفقه الإسلامي محمد سلام مذكور ص ٢٨٦ و پاشتر.

[2] واتە لای حەنەفیەت، ئەگینا محکم لای جمهور تەئویل هەڵدەگرێ لەبەرئەوەی رەگەزە بۆ دەقی زاهیر.

## جۆرەكانی تەئویل[1]:

تەئویلی پەسەند دەبێ بە دوو جۆرەوە: یەكێكیان تەئویلی نزیكە، كە ئەوەیە بە خەیاڵدا دێ، ئەمە كەمترین بەڵگە بەسە بۆ سەلماندنی. دووەمیان تەئویلی دوورە، ئەوەیە بەخەیاڵدا نایەت بەڵكو قەرینە و نیشانە ئاماژەی بۆ دەكەن. پێویستە ئەو كەسەی ئەم جۆرە تەئویلە دەكا بەڵگەیەكی هەبێ كە شیمانەی تەئویلكردنەكە بەهێز بكا و وای لێبكا قابیلی قبوڵ بێ.[2]

پێوەرێكی بابەتی نیە بۆ جیاكردنەوەی تەئویلی نزیك لە هی دوور بەڵكو پێوەرەكە شەخسییە، دەشێ تەئویلێك بەلای كەسێكەوە نزیك و بەلای یەكێكیترەوە دوور بێ. ئەمە هۆی سەرەكیی جیاوازیی شەرعزان بووە لە هەڵێنجانی ئەحكام لە دەقەكان لەرێی تەئویلەوە، ئەویش بەگوێرەی جیاوازیی زانابیان. تەئویلێكی نزیك – بۆ نموونە– لای حەنەفی هەیە، شافیعی –بۆ نموونە– بەرهەڵستی دەكا بەوەی دوورە، بەپێچەوانەیشەوە.

ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەكن لەسەر جیاوازییە فیقهییە خیلافیەكان كە زادەی جیاوازین لە تەئویلكردنی دەقەكاندا:

**١– شەرعزان لەبارەی لە شەوەوە نیتەهێنان بۆ رۆژووگرتن جیاوازن[3].** هۆی ناكۆكیەكەیشیان جیاوازییانە لە تەئویل یان دەستگرتن بە رواڵەتەوە لەبەرئەو حەدیسەی ئیبن عومەر ریوایەتی كردوە كە دەڵێ: (من لم يبيت الصيام قبل الفجر فلا صيام له).[4]

---

[1] بروانە: مختصر المنتهى مع العضد والسعد ١٦٩/٢.

[2] روضة الناظر ٣١/٢ و پاشتر. إرشاد الفحول للشوكاني ص، ١٧٧ مستصفى الغزالي ص ٢٨٢.

[3] مختصر المنتهى مع العضد والسعد ١٦٩/٢.

[4] اخرجه النسائي راجع سنن النسائي ١٦٩/٤.

مەزەبی شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن نیەتهێنان لە شەودا مەرجە بۆ دروستیی ڕۆژوو -جگە لە سوننەت- جا چ ڕۆژووی ڕەمەزان بێ یان ڕۆژووی کەفارەت و ڕۆژووی نەزر بەڕەهایی بێ یان بەدیاریکراوی، بەڵگەیشیان زاهیری ئەو حەدیسەیە.

بەڵگەبوونی ئەو دەقەیش لەو ڕووەوەیە کە (لا صیام) نەکیرەیەکە لە جێبەندی نەفیدا و هەموو ڕۆژوویەك دەگرێتەوە. بۆیە لەو زاهیرە دەرناچێ لەوەدا نەبێ کە بەڵگە لەسەری هەبێ. بەبڕوای ئەوان نەفیەکە ڕوو لە دروستی، یان لە خودی شەرعیەکە دەکا. بەوەیش حەدیسەکە دیلالەتێکی زاهیری دەبێ لەسەر پێویستی نیتەتهێنان لە شەودا لە سەرجەم ڕۆژووەکاندا بەبێ جیاوازی لەنێوان فەرز و سوننەت، جا چ فەرزەکە دیاریکراو بێ یان دیارینەکراو[1]، ئەمە مەزەبی ئیمام مالیك[2] و ئەحمەد[3] و شیعەی ئیمامییە[4].

ڕۆژووی سوننەت لە گشتیبوونی ئەم حەدیسە دەرچووە، ئەویش بەوەی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) ریوایەتی کردوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ڕۆژێك هاتە لامان و وتی: هیچتان هەیە (مەبەست خواردنە)؟ وتمان: نەخێر. وتی: کەواتە من بەڕۆژووم. ڕۆژێکیتر هاتەلامان و وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (حیس)ێکمان بەدایری بۆ هاتووە. ئەویش وتی: پیشانم بدەن، ڕۆژووم گرتوە و خواردی)[5].

لەبەرئەوە دروستە ڕۆژووی سوننەت بەڕۆژ نیەتی بۆ بهێنرێ بەو مەرجەی- بەڕای زاڵ لای شافیعیەت و ئەوانەی هاوڕایانن - بەر لە لادان (زوال)ی خۆر بێ (واتە لادانی

---

[1] المهذب للشيرازي ١/١٨٠ و پاشتر.
[2] بلغة السالك في الفقه المالكي ١/٢٢٨.
[3] نيل المارب في الفقه الحنبلي ١/٩٧.
[4] الخلاف للطوسي ١/٣٧٦ و پاشتر.
[5] رواه أحمد ومسلم وأصحاب السنن واللفظ لمسلم.

لە ناوەڕاستی ئاسمان).[1]

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن پێیان وایە ڕۆژووی واجب هەندێکی پەیوەندی بە کاتێکی دیاریکراوەوە هەیە، هەندێکیشی پەیوەندی بە کاتێکی دیارینەکراوەوە هەیە، ئەوەی پەیوەندی بە کاتێکەوە وەك هەیە ڕۆژووی ڕەمەزان و نەزری دیاریکراو مەرج نیە شەو نیەتیان بۆ بهێنرێ، بەڵکو بەڕۆژیش دروستە نیەت بهێنرێ بەو مەرجەی بەر لە ناوەڕاستی ڕۆژ بێ.

هەرچی ئەوەیە پەیوەندی بە کاتێکی دیاریکراوەوە نیە وەك قەزاکردنەوەی ڕەمەزان و نەزری ڕەها و ڕۆژووی کەفارەت، بۆ دروستبوونی، نیەتی شەویان بەمەرج داناوە لەبەرئەوەی دیاریکراو نیە، لەبەرئەوە پێویستە لە سەرەتاوە دیاری بکرێ. نیەتهێنانی شەویان لە حەدیسەکەی ئیبن عومەردا تەئویل کردوە، یەکەم شت ڕۆژووی سونەتیان بە حەدیسەکەی عائیشە لێ دەرکرد -کە ئەوە ڕای جمهورە- هەروەها ڕۆژووی ڕەمەزان و ڕۆژووی نەزری دیاریکراویان لێ دەرکرد، ئەوەیش بە پشتبەستن بەوەی بوخاری و موسلیم لە سەحیەکەیاندا لە سەلەمە بن ئەلئەکواعەوە ریوایەتیان کردوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی عاشورا پیاوێکی نارد بۆ لای خەڵك کە هەرکەس خواردویەتی با تەواوی بکا یان بەڕۆژی، ئەوەیش نەیخواردوە با نەخوات[2].

دەڵێن ئەم حەدیسە ئاماژەیە بەوەی ئەو کەسەی ڕۆژووی ڕۆژێکی لەسەرە بەشەو نەیزانی، بۆی هەیە لە ڕۆژدا نیەتی ڕۆژووەکەی بێنێ، ئەویش لەو ڕوانگەوە ڕۆژووی عاشورا واجب بوو و هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان ئەم دیاریکراوە و ڕۆژووی سوننەت (النفل)دا، کۆبوونەوەی چەند بەڵگەیەکیان لەوەدا دیوە.

بۆچوونە حەنەفییەکە وەڵام دراوەتەوە بەوەی بارکردنی حەدیسی شەو نیەتهێنان لەسەر ڕۆژووی واجبی دیارینەکراو، دوورە، لە چەند ڕوویەکەوە، لەوانە:

---

[1] بڕوانە: فتح الباري ٤/١٠٠.

[2] فتح الباري ٤/١٠٠، صحيح مسلم بشرح النووي ١٣/٨.

أ- حەدیسەکە دیارە لەبارەی هەموو ڕۆژوویەکە لەبەرئەوە بە گشتی هاتووە، تایبەتکردنی ئەم گشتیەیش بە کردنە دەرەوەی زۆریەی تاکەکانی و هێشتنەوەی کەمترین و دەگمەن، بە لادان دادەنرێ بەلای زاڵکردنی شیمانەی دوور بەسەر زاهیری بەهێزدا، ئەگەر مەبەستی شەرعدانەر لە رەتکردنەوەی ڕۆژوگرتن تەنها واجبی دیارینەکراو بێ ئەوا ئەم گوتارەی جۆرێك دەبێ لە لوغز[1] مادام قەرینەیەك نەبێ لە رواڵەتی گشتیبوونەکەی لایبدات.

ب- ئەو حەدیسەی لە تەئویلەکەیاندا پشتیان پێ بەستووە لە میانەی باسی ڕۆژووی عاشورادا هاتووە، ئەوەیش فەرزبوونی نەسخ بوەتەوە و چووەتە خانەی سوننەت. عائیشە (خوا لێی رازی بێ) دەگێڕێتەوە: قورەیش لە سەردەمی نەفامیدا لە عاشوردا بەڕۆژوو دەبوو، پێغەمبەری خوایش دەیگرت، کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە ڕۆژووەکەی دەگرت و فەرمانی بە گرتنی کرد. کاتێ مانگی رەمەزان فەرز کرا فەرموی: هەرکەس ویستی با بیگرێ و هەر کەسیش ویستی با وازی لێ بێنێ.[2]

ج- پاشان واجبیی ڕۆژووی عاشورا شتێك نیە هەموولا لەسەری کۆك بن، بگرە هەندێ دەڵێن موستەحەب بووە، لەبەرئەوە بە نیەتی ڕۆژ دروستە، ئەمەیش دوو بەناوبانگترین رووەکانە لای شەرعزانی شافیعی وەك ئەوەوی دەڵێ.[3]

**٢- شەرعزان لەبارەی دروستیی هاوسەرگیریی ئافرەت ئەگەر بەبێ مۆڵەتی وەلیەکەی خۆی مارەکرد جیاوازن** -پێشتر قسە لەم مەسەلەیە کرا- بەلای هەردوو ئیمامی مالیك و شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن مارەکردن بەبێ وەلی نابێ و ویلایەت

---

[1] بڕوانە: مختصر ابن الحاجب مع شرح العضد وحاشية السعد ٢/١٧١.
[2] صحيح مسلم بشرح النووي ٨/٤.
[3] صحيح مسلم بشرح النووي ٨/٨.

مەرجە بۆ دروستیی هاوسەرگیری، ئەویش لەبەر زاهیری ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: (أيما امرأة نكحت نفسها بغير إذن وليها فنكاحها باطل – ثلاث مرات).[1].

بەڵام حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن پێیان وایە خۆمارەکردنی ئافرەت بەبێ ئیزنی وەلیەکەی دروستە، حەدیسەکەیشیان تەئویل کردوە بەوەی تایبەتە بە کچی بچوك و موکاتیبە و شێت و ناتەواو و ئەوانەی وەك ئەوانەن، هەروەها بەشێوەیەکیتریش تەئویلیان کردوە ئەویش ئەوەیە مەبەست لە بەتاڵیی نیکاحەکەی ئەوەیە بەزۆری سەری لە بەتاڵییەوە دەردەچێ لەبەر بەرهەڵستیکردنی وەلی بەوەی دەیسەپێنێ، وەك لێنەوەشاوەیی یان ناتەواویەکی زەق لە مارەیی هاوشاندا.

ئەم تەئویلەیشیان بەوە شی کردۆتەوە کە ئافرەت خاوەنی داوێنی خۆیەتی، لەبەرئەوە حوکمی کارەکەی وەك حوکمی فرۆشتنی کاڵایەکیەتی، کە تێیدا رەزامەندیی ئەو لەبەرچاو دەگیرێ.

ئەم بۆچوونە بەوە وەڵام دراوەتەوە، کە ئەوە بەتاڵکردنەوەیە لەبەر ئەوەی دیارە پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی گشتاندن بووە لە هەموو ئافرەتێکدا، هەروەك ئەگەر هەیە مەبەستی گشتی بووبێ بۆ رێگرتن لە سەربەخۆبوونی لەو شتانەی نەریتی باش وا ناخوازێ تێیاندا سەربەخۆ بێ.[2]

**٣- شەرعزان لەبارەی دروستیی لادان لە شت (عین)ەوە بۆ نرخ لە زەکاتی ماڵاتدا رایان جیاوازە**، حەنەفیەت دەڵێ زەکاتدەر بۆی هەیە تا چل مەڕ، زەکاتەکەی بە نرخ بدات، جمهور رایەکی جیاواز لەوەیان هەیە و گوتویانە پێویستە هەر کار بە مەڕ خۆی بکرێ.

---

[1] عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: أيما امرأة نكحت نفسها بغير إذن وليها فنكاحها باطل فإن دخل بها فلها المهر بما استحل من فرجها فإن اشتجروا فالسلطان ولي من لا ولي لها. أخرجه الأربعة إلا النسائي. سبل السلام ٣/١١٧-١١٨.

[2] راجع التحرير مع التقرير والتحبير ١/١٥٣-١٥٤ مختصر المنتهى مع العضد والسعد ٢/١٧٠.

هۆی ناکۆکیەکەیشیان جیاوازییە لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ (في كل أربعين شاة شاة).[1] (واتە: لە هەر چل مەڕدا مەڕێك).

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن، مەبەست لەوە نرخی مەڕە، لەبەرئەوەی مەبەست لە دانانی زەکات پڕکردنەوەی پێداویستیی موحتاجە، پێویستیش بەنرخی مەڕەکە وەك پێویستییە بە خودی مەڕەکە.[2]

شافیعیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن ئەوەی حەنەفیەت بۆی چووە لە تەئویلکردنی حەدیسەکە و دوورخستنەوەی لە رواڵەتەکەی تەئویلێکی دوورە، لەبەرئەوەی ئەگەر وابێ واجبکردنی مەڕ خۆی پێویست نیە[3]، لەبەرئەوەی واجب نرخەکەیەتی، ئەوکاتە خۆی واجب نابێ لەکاتێکدا هەموولا کۆکن کە ئەوانە جیان. هەروەها ماناکە —ئەویش نەهێشتنی پێویستییە کە لە موحکەمەوە لەسەر حوکمەکە هەڵێنجراوە —کە واجبکردنی مەڕە— بەبەتاڵکردنەوە دەگێڕێتەوە، هەر مانایەکیش لە حوکمێك هەڵێنجرێ و بەتاڵی بکاتەوە بەتاڵە، لەبەرئەوەی بەتاڵکردنەوەی ئەسڵەکەی واجب دەکا کە بەتاڵیەکەی دەخوازێ، هەربۆیە دروستیی (دانی نرخ لەباتیی مەڕ)، کۆبوونەوەی دروستی و بەتاڵی دەگەیەنێ، ئەوەیش مەحاڵە، لەبەرئەوە دروستیەکەی نامێنێ و بەتاڵ دەبێ.[4]

حەنەفیەت وەڵامی ئەمەیان داوەتەوە بەوەی: فەرمانکردن بە پێدان بە هەژاران گەیاندنی رزقیانە کە خوا بەڵێنی پێداون، رزقیش هەمەجۆرە لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك، بابەتی زەکات مەڕ یان نرخەکەیەتی و ئەو بەتاڵ نەکراوەتەوە، بەڵکو ئەوەی بەتاڵ کراوەتەوە دیاریکردنیەتی.

---

[1] رواه البخاري، راجع سبل السلام ١٢٢/٢.

[2] تێبینی دەکرێ ناکۆکیەکە هەر لەسەر مەڕ نیە، بەڵکو لە مەڕ و شتیتردا هەیە وەك وشتر و مانگا.

[3] مختصر المنتهى مع العضد والسعد ١٧٠/٢

[4] بڕوانە: التحرير مع التقرير والتحبير ١٥٣/١.

هەروەها لەبەرئەوەی لە مەعازی کوڕی جەبەل دەگێڕنەوە کە بە خەڵکی یەمەنی گوتوە: لەباتیی جۆ و گەنمەشامی خەمیس یان لەبیسم بۆ بێنن[1] بۆ ئێوە ئاسانتر و بۆ هاوەڵانی پێغەمبەریش لە مەدینە باشترە. ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە باسکردنی مەڕ بۆ مەزەندەکردنی نرخەکەیەتی و لەبەرئەوەیش بۆ خاوەن ماڵاتەکان ئاسانترە نەك بۆ دیاریکردنی مەڕ.[2]

بەبڕوای من لادان بۆ نرخ جائیزە بەو مەرجەی ئازادی بەدەست زەکاتدەر نەبێ، بەڵکو بۆ ئەو کەسە بێ زەکاتەکەی پێ دەدرێ. ئەگەر پارەکە لە بەرژەوەندیی کەسە شایستەکە بوو و بەوە ئاسانتر پێویستی پڕ دەکردەوە و سوودی زیاتر بوو، یان وەك چۆن بە زیندەماڵەکە رازی بوو بە نرخەکەیشی رازی بوو، ئەوا هیچ لاریەك نیە لە گۆڕینەکە مادام حیکمەت لە دانانی زەکات پڕکردنەوەی پێویستییە.

**٢- شەرعزان رایان لەبارەی دانی کەفارەتی (ظهار) بە یەك کەس لە شەست رۆژدا جیاوازە**، حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن زیهارکار بۆی هەیە بۆ ماوەی شەست رۆژ کەسێك نان بدات، هەروەك بۆی هەیە لە یەك رۆژدا شەست هەزار نان بدات و ئەوەی خوا ئەفەرموێ (فإطعام ستين مسكيناً) تەئویلیان کردوە بەوەی مەبەست دابینکردنی خواردنی شەست کەسە، لەبەرئەوەی مەبەست لە کەفارەتەکە پڕکردنەوەی پێداویستیی هەژارانە، پێویستیی کەسێکیش لە شەست رۆژدا هەر دەکاتە پێویستیی شەست هەژار، جا ئەگەر یەك هەژاری بۆ ماوەی شەس رۆژ نان دا لەباتی دانی بە شەست هەژار، دروستە.[3]

---

[1] خەمیس جلێکی درێژە کە پێنج باڵ درێژە، لەبیس هەر پۆشاکێکە بپۆشرێ.
[2] التحرير، سەرچاوەی پێشوو ١٥٧/١.
[3] التحرير مع التقرير والتحبير ١٥٣/١ مختصر المنتهى مع العضد والسعد ١٦٩/٢.

بەڵام جمهور بە دەستگرتن بە ڕواڵەت واتە زاهیری دەقەکەوە ڕایەکیتریان هەیە و تەئویلەکەی حەنەفیەتیان بە تەئویلێکی دوور داناوە، لەبەرئەوەی شتێکی تێدا لەبەرچاو گیراوە باس نەکراوە، ئەویش ئەوەیە خراوەتە سەری، هەروەها سڕینەوەی شتێك کە باسی کراوە ئەویش ژمارەی هەژارەکانە. کەمال بن ئەلهەمامیش لەبەر لاوازیی تەئویلەکە ڕای جمهوری پەسەند کردوە.[1]

ڕای زاڵیش ئەوەیە جمهور بۆی چووە لەبەر دووریی تەئویلەکەی حەنەفیەت، لەبەرئەوەی ژمارە ئاماژەیە بۆ ماناکەی بەبێ زیاد و کەم، لەفزی شەست هەژار ئاماژە بۆ شەست لەوانە دەکا بەبێ زیاد یان کەم، چونکە هیچ بەڵگەیەك نیە ئەو دیلالەتە لەو مانایە بترازێنێ.

[1] التحرير مع التقرير والتحبير ١/١٥٣ مختصر المنتهى مع العضد والسعد ٢/١٧٠.

# باسی سێیەم:
# دابەشکردن
# بە لەبەرچاوگرتنی شاراوەیی لای مەزهەبی حەنەفی

لای حەنەفیەت لەفزەکان لەڕووی شاراوەیی دیلالەتیانەوە دەبن بە چوار بەشەوە: شاراوە (الخفي) + بەگرێ (المشكل) + کوێبێژ (المجمل) + لێکچوو (المتشابه).

ئەم چوار ناوە بە دژی ئەوانەی پێشتر باس کران دادەنرێن، واتە: دیار (ظاهر) + دەق (نص) +ڕاڤەکار (مفسر) + دامەزراو (محكم) لە باسی ڕابردوودا، کە ئەمانە بەدوای یەکداهاتنیان هەڵکشانە لە پلەی لێڵی و شاراوەییدا، لەکاتێکدا بەشەکانی ڕابردوو بەدوای یەکداهاتنیان هەڵکشان بوو لە ڕوونیی دیلالەتدا، چونکە (خفي) لە (مشكل) کەم لێڵترە، (مشكل) لە (مجمل) کەمتر شاراوەیە، (مجمل) لە (متشابه) کەمتر شاراوەیە.

لە خوارەوە بەدرێژی باسی هەریەك لەو بەشانە دەکەین:

## یەکەم: شاراوە (الخفي):

ئەوەیە ماناکەی گومانهەڵگر و مەبەست لێی شاراوەیە لەبەر بەربەستێك لە سیغەکەدا کە ڕێگە لە بەدەستهێنانی مەبەست لێی دەگرێ بە داواکردن نەبێ[1]. واتە شاراوە لەفزێکە دیلالەتی بۆ ماناکەی دیارە بەڵام لە دەرەوەی سیغەکەی خۆی خستویەتیە روو کە وای کردوە لە جێبەجێبوونیدا لەسەر هەندێ لە تاکەکانی جۆرە

[1] بڕوانە: أصول السرخسي ١٧٦/١.

لێڵی و شاراوەییەك دروست بكا، كە بەبێ داواكردن و ئیجتیهاد لاناچێ. لەبەرئەوە لەفزەكە بۆ ئەو هەندە تاكانە بە شاراوە دادەنرێ.

لێڵی لە شاراوەدا لەوەوە پەیدا دەبێ كە ئەو تاكەی دەویستری حوكمەكەی بدرێتێ ناوێكی تایبەت بەخۆی هەبێ، یان سیفەتێكی ناتەواو بێ یاخود سیفەتێكی لە باقیی تاكەكانی زیاد بێ، ئەم ناونانە تایبەتە، یان كەم و زیادە تەمومژ لە دەوری ئەم ناوە دروست دەكات و لە دیلالەتكردن بۆ ماناكەی بەنیسبەت ئەو تاكەی دەویستری حوكمەكەی زانراو بێ شاراوە دەبێ، كە لە خودی لەفزەكە یان ئەوەی باسی دەكا نازانرێ، بەڵكو بۆ گەیشتن بەو زانینە دەرەكییە پێویست بە شتێكی دەرەكی دەكا، لێڵییەكە بە بەراوردكردن و ئیجتیهادی موجتەهید لەسەری لادەچێ، كۆڵەكەی ئەوەیش گەڕانەوەیە بۆ ئەو دەقانەی پەیوەندییان بەو مەسەلەیەوە هەیە كە مەبەستی حوكمەكەیە.، هەروەها لەبەرچاوگرتنی تەعلیل و ئامانجەكانی شەریعەت.

حوكمی شاراوەیش پێویستیی بیركردنەوە و رامانە بۆ زانینی سەرچاوەی لێڵییەكە، ئەگەر لە زیادەیەكەوە پەیدا بووبێ، موجتەهید بەگوێرەی ئەوەی ئیجتیهادەكەی پەی پێدەبا كار دەكا بۆ گەیاندنەوەی ئەو تاكە بەوەی ماناكەی تێدا دەردەكەوێ، تا حوكمەكەی بەسەردا بچەسپێ.

خۆ ئەگەر بەهۆی ناتەواوییەكەوە یان هاتنەپاڵی هەندێ وەسفەوە بوو كە دووری دەخستەوە لەو مانایەی حوكمی زاهیری لەسەر بینا كراوە، حوكمی دەردێ بە نەگەیاندنەوەی و بەوەی حوكمەكە لەسەری ناچەسپێ.

نموونەیەك لە ناكۆكیی فیقهی هەیە كە لەسەر ناكۆكی لەم ئەسڵە دامەزراوە:

گوتمان شاراوە شاراوەییەكەی لەبەر سەرهەڵداوێكە نەك لەبەر خودی لەفزەكە، لەبەرئەوە دەكرێ لەگەڵ زاهیر لە یەك لەفزدا كۆببنەوە بەنیسبەت ماناكەی لە هەندێ بواردا. لەو لەفزانەی تێیدا كۆدەبنەوە لەفزی دز (السارق)ـە، كە لە مانا شەرعیەكەیدا

دیاره کەسێکی ئاقڵ و باڵقە کە بەدزی بەئەندازەی حەدی نیساب لە ماڵێکی گوێزراوە کە زوو خراپ نابێ لە شوێنێکی پەنهاندا بردوە و هیچ شوبهە لەوەدا نەبێ[1].

هەروەها لە لە کفنـدز (النبـاش) و باخـەڵبڕ (الطـرار)دا شـاراوەیە (یەکـەمیان واتـە بردنی کفنی مردوو لە گۆڕ بەدزی، دووەمیشیان واتە بردنی مـاڵ لـە کەسـی بێـدار لـە غەفڵەتدا بە باخەڵبڕین یان هەر ڕێگەیەکیتر)، بـەڵام لـە هەردووکیانـدا شـاراوە بـووە لەبەر تایبەتبوونی هەردووکیان بەناوێکیتر جگـە لـە دز[2]. سـابتبوونی حـوکمی دز بـۆ باخەڵبڕ لەڕێی مانای ڕاستەوانە (مفهوم موافقه)وە دەبێ (واتە لای غەیری حەنەفیەت) یان لـەڕێی دیلالەتـەوە لای حەنەفیـەت، ئـەویش لەبەرئـەوەی ئـەو مانایـەی حـوکمی گوتراوی باخەڵبڕی لەسەر دامەزراوە لەودا زیاتر ساغ بووەتەوە چونکە ئەویش دزێکی تەواوە و لـە حاڵـەتی ئامـادەبوون و بێـداریی خاوەنەکەیـدا ماڵەکـە دەبـات، هەربۆیـە کارەکەی لە دزیی ئەو دزە گەورەترە کە بە سوود وەرگرتن لـە بێئاگـایی کەسـێك بـە خەوتنی یان لەوێ نەبوونی یان خافڵبوونی، دزی لێدەکا.[3]

حوکمەکە بە قیاسیش جێگیر نابێت و بەرپەرچـی حەنەفیـەت نادرێتـەوە بـەوەی حدود لای ئەوان بە قیاس ناسەلمێنرێ.

زانایان سەبارەت بە ساغبوونەوەی حوکمی دز لە باخەڵبڕدا کۆکن و هـیچ نـاکۆکی لەوەدا نیە کە وەك باسمان کرد بە زیادیشەوە دزە، بـەوەی خـەڵك زەقـەی چاویان دێ ئەو دزییان دەکا، ئەویش بەکەڵك وەرگرتن لە زرنگی و دەستسوکی لـە رفانـدن و ڕاهاتنی لەسەر ئەنجامدانی تاوانەکەی، هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر زیـادەڕەویکردنی لە تاوانەکەیدا، ئەویش وادەکا مەترسی لەسەر کۆمەڵگـە لـە دزی ئاسـایی زیـاتر بـێ، لەبەرئەوە هـەمووڵا کـۆکن لەسـەر ئـەوەی ئـەو دەقـەی لـەبارەی دز هـاتووە بەسـەر

---

[1] التحرير مع التقرير والتحبير ١٥٨/١.

[2] سەرچاوەی پێشوو، مشكاة الأنوار في أصول المنار ١١٥/١.

[3] بڕوانە هەردوو سەرچاوەی پێشوو.

ئەویشدا دەچەسپێ[1]. ئەگینا ئەوەی (مەفهومی موافەقە)ی ناوناوە (قیاسی جەلی) – وەك شافیعی– رای وایە بە قیاس جێگیر بووە. پێشتر روونمان کردەوە ئەمە تەنها زاراوەیەکە لەلایەن شافیعیەوە و هیچ ناکۆکیەکی لێ ناکەوێتەوە.

بەڵام شەرعزان لەبارەی حوکمی کفندز دوو رای جیاوازیان هەیە، هەندێکیان رایان وایە حەدی دەستبڕینی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، هەندێکیش رایتریان هەیە و پێیان وایە تەنها سزایەکی تەعزیری دەدرێ، بەم وردەکاریەی خوارەوە:

١– ئەبوحەنیفە (رەحمەتی خوای لێبێ) و محەمەد بن حەسەنی شەیبانی و ئەوانەی هاورایانن رایان وایە تایبەتکردنی ناوی کفندز (النباش) بەو ناوە لەبەر ناتەواویی ماناى دزییە تێیدا، لەبەرئەوەی ئەو ماڵەی دەیبات کفنە، ئەوەیش شتێکی خۆش نیە بگرە دڵ تێکدەدات و حەزی لێناکا. براوەکەیش مولکی کەس نیە، جا ئەگەر خاوەننەبوونی لەلایەن مردووەوە دیار بێ ئەوا وەرەسە تەنها ئەوە مولکیانە کە لە پێویستی ئەو مردوە زیاترە لە سنووری ئەوەی شەرعدانەر کێشاویەتی، جگە لەوە کفندز ماڵەکە لە شوێنێکی قایمکراودا نابا، چونکە گۆڕەکە چیتر شوێنی پاراستنی ماڵ نیە بەڵکو بۆ شاردنەوەی مردووەکان ئامادە کراوە.

لەبەر هەموو ئەمانە مەرجەکانی دز لە کفندزی گۆڕهەڵدەرەوەدا نیە و لەفزی (السارق) لە ئایەتی ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا﴾ نایگرێتەوە، لەبەرئەوە سزاکەی جگە لە تەعزیر هیچیتر نیە بەشێوەیەك لەو کارە بەدە بیسڵەمێنێتەوە.

ئەوەیش ئەم دوو پێشەوایە بۆی چوون قسەی ئیبن عەباس و ثوری و ئەوزاعی و مەکحول و زوهرییە[2].

٢– جمهوری شەرعزان لەناویاندا هەندێ لە شەرعزانی حەنەفی وەك ئەبویوسف بۆ ئەوە چوون لەفزی (السارق) لە ئایەتی ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا﴾

---

[1] بروانە: تقويم الأدلة للدبوسي ص ٢٠٤ مخطوطة دار الكتب المصرية.

[2] بروانە: فتح القدير مع الهداية والعناية ٣٧٤/٥ المحلى لابن حزم ٣٥٠/١١ و پاشتر.

کفنـدزیش دەگرێتـەوە و حـەدی دزی بەسـەردا پیـادە دەکـرێ[1]، ئـەویش لەبـەر ئاماژەکردنی بۆ ڕێگەکانی دزیکردن لەوانـە گۆڕهەڵدانـەوە، تـەرێزکردنی دڵ و دەروون لە کفن لە بازنەی ماڵی بەکەڵك (متقوم) دەریناکـا، بـەڵکو حـوکمی مـاڵی مردوەکـەی هەیە و کەسوکارەکەی داوای دەکەنەوە ئەگەر کەسێك دەستدرێژی کردەسەری، وەك وەلی منداڵ کە چاودێریی بەرژەوەندیەکانی منداڵ دەکات و داوایان دەکا.

پاشان نەشاراوەیی گۆڕەکە شتێکی بەڵگەنەویسـت نیـە، لەبەرئـەوەی شـاراوەیی (حرز) هەر شتێك بەگوێرەی کرانە تێیدا، لەو ڕووەوە ناکرێ مردوەکە بەڕووتی بـەجێ بهێڵـرێ، لەبەرئـەوە پێویسـت دەکـا گۆڕەکـە بـە حەشـارگە دابنـرێ. ئـەوەی خـوا ئەفەرموێ ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتاً، أَحْيَاء وَأَمْوَاتاً﴾[2] بەڵگەیە لەسەر ئـەوە، واتـە تـا بەزیندوویی تێیدا (لە زەویدا) نیشتەجێ بێ و بەمردووییش تێیدا بشاردێتەوە.

**زاڵکردن:**

رای زاڵ ئەوەیە جمهور لەم مەسەلەیەدا بۆی چووە، کە بریتییە لە جێبەجێکردنی حەد لەسەر کفندز (گۆڕهەڵدەر) وەك چۆن لەسـەر دز جێبـەجێ دەکـرێ، لەبـەر ئـەم هۆیانەی خوارەوە:

١– وەك باسمان کرد مانای دزی لە کفندز (نبـاش)دا هەیـە هـەم لـەڕووی زمـان و هەم لەڕووی شەرعەوە.

٢– پێغەمبەر(ﷺ) گۆڕی بە ماڵ ناوبردوە، ئەبوداود لە ئەبوزەڕەوە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا پێی وتم: ئەی ئەبا زەڕ. وتم: لبيكَ يا رسولَ اللهِ وسعْدَيْكَ. وتی: تۆ چۆن دەبی ئەگەر مردنێك تووشی خەڵك ببێ تێیدا ماڵ بە وەسیف دەبێ[3].

---

[1] فتح القدير مع الهداية والعناية ٣٧٥/٥.

[2] المرسلات/ ٢٥، ٢٦.

[3] معلم السنن للخطابي ٣١٣/٣ فقد روى أبو داود عن أبي ذر قال: قال لي رسول الله (ﷺ)يا أبا ذرّ، قلتُ لبيكَ يا رسولَ اللهِ وسعْدَيْكَ، قال : كَيْفَ أنتَ إذا أصابَ الناسَ موتٌ يكونُ البيتُ فيه بالوصيفِ.

٣– بەرژەوەندیی کۆمەڵگە ئەوە دەخوازێ کە جمهور بۆی چووە، لەبەرئەوەی گۆرهەڵدەر کاری قۆڕ دەکات و پەنا بۆ کفندزی دەبا، ئەتکی حورمەتی مردوو دەکا، لەبەرئەوە پێویستە سزای لەسەر قورس بکرێ تا ببێتە چاوترسێن بۆ ئەوانەی بیر لەوە دەکەنەوە سووکایەتی بە کەرامەتی مرۆڤ بکەن.

## دووەم: بەگرێ (المشكل):

مشکل: لەڕووی زمانەوانیەوە لە: اشكل الامر–ەوە هاتوە ئەگەر کێشەی تێکەوت و بوو بەگرێ و هاوشێوەکانی بەشێوەیەك بەبەڵگەیەك نەبێ جیای بکاتەوە، ناناسرێ.

لەڕووی زاراوەییشەوە، ناوە بۆ ئەو شتەی کێشە لە زانینی مەبەستەکەیدا دروست دەبێ، ئەویش لەبەر ئاماژەی بۆ چەند مانایەکی تێکەڵ بەشێوەیەك بەبەڵگەیەك نەبێ جیای بکاتەوە نەزانرێ مەبەست پێی چییە.[١]

واتە: موشکەل ناوێکە مەبەستەکەی بەهۆی لەفزەکە خۆیەوە شاراوەتەوە لەبەر کێشە تێکەوتنی، بەشێوەیەك مەبەست لێی نازانرێ بەقەرینەیەك نەبێ لە هیتری جیا بکاتەوە، ئەویش لەڕێی لێکۆڵینەوە و رامانەوە پاش داواکردن.

### بەشەکانی موشکەل:

موشکەل لەڕووی سەرچاوەی ئیشکالەکەیەوە بۆ سێ بەش دابەش دەبێ:

١– موشکەل بەهۆی لێڵیەك لە مانادا ئەویش کاتێ لەفزەکە لە ئەسڵی دۆخی خۆیدا چەند مانایەك هەڵدەگرێ و مەبەست یەکێکیانە. یان کاتێ مانای مەجازیی لەفزێك لە لەفزەکان بەکار دێ تا بەو مانایە بەناوبانگ دەبێ،

---

الوصيف: واتە کۆیلە یان کەنیزەك. خەتابی دەڵێ: بۆشایی لە سەر زەوی لە گۆڕدا تەسك دەبێتەوە و خەڵك بەهۆی خەریکبوون بە خۆیانەوە سەرقاڵ دەبن لە هەڵکەندنی گۆڕ بۆ مردووەکانیان تا نرخی گۆڕ دەگاتە نرخی کۆیلە. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ٣/٣١٢ و پاشتر.

[١] بڕوانە: أصول السرخسي ١/١٦٨ مشكاة الأنوار في أصول المنار ١/١١٥.

بەوەیش بەهۆی هاتن و چوونی لەفزەکە لەنێوان مانا مەجازیەکە و مانا ڕاستەقینەکەیدا، لێڵی دروست دەبێ.

٢- موشکەل بەهۆی تێکگیرانی ڕواڵەتیی هەندێ دەق لەکاتی بەرانبەربوون و کۆبوونەوەیاندا: وەك تێکگیرانی ئایەتی ﴿قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ اللّهِ﴾[1] لەگەڵ ئایەتی ﴿مَّا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ﴾[2]، هەردوو دەقەکە دیلالەتیان بۆ ماناکەیان دیارە، بەڵام ئیشکال کاتێ ڕوودەدا کە دەویسترێ تەوفیق و جەم بکرێن، لەبەرئەوەی زاهیری دەقی یەکەم ئەوەیە چاکە و خراپە لە خواوەن، بەڵام لە دەقی دووەم ئەوەیە چاکە لە خواوە و خراپە لە مرۆڤەوەیە.

بەڵام سەرنجدانی ورد بۆ کەسی وردبینی دەردەخا کە ئەوەی تووشی مرۆڤ دەبێ لە چاکە یان خراپە لەلایەن خواوەیە لەڕووی خەلق و تەقدیرەوە، هەروەها دەزانێ خراپە لەلایەن خاوەنەکانیانەوەیە لەڕووی خۆلانەدان لەوەی دەبێتە بایسی و کردنی ئەوەی ڕێگەی لێدەگرێ.

لەوانەیشە موشکەل لە لێڵیی ئەو مانایەی لە لەفزەکە مەبەستە پەیدا ببێ وەك ئیشکال لە بابەتی دەم یان ناولوت کە ئایا ئەوانە بە زاهیری جەستە حسێبن و پێویستە بەگوێرەی ئایەتی ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُباً فَاطَّهَّرُواْ﴾ بشۆردرێن، یان بەشێکن لە ناوەوەی جەستە و شۆردنیان پێویست نیە؟[3].

---

[1] النساء/٧٨.

[2] النساء/٧٩.

[3] بروانە: حاشية الازميري على شرح مراة الوصول ١/٤٠٨.

لەو مەسەلە جێناکۆکە لاوەکیانەی لە ناکۆکی لەبارەی مەبەست لە موشکەل دەکەونەوە ئەمانەن:

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلاَّ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ﴾ الآية.[1]

شەرعزان رایان جیاوازە لەبارەی دیاریکردنی ئەو کەسەی گرێبەندی مارەکردن (عقدة النکاح)ی بەدەستە: عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوای لێبێ) و ئەو هاوەڵانەی لەگەڵی هاوڕان، هەروەها سەعید کوڕی مسەیب و ئەو تابیعیانەی هاوڕاین و شافیعی لە رای نوێی.و ئەحمەد لە زاهیری مەزەبەکەیدا رایان وایە: مەبەست مێردە لەبەرئەوەی ئافرەت ئەگەر مارەیی بۆ دانرا و پاشان بەر لە چوونەلای (دخول) تەڵاق درا نیوەی مارەییەکەی دەکەوێ مەگەر ئەو لە مافی خۆی خۆش بێت و ئەو نیوەیە بۆ مێردەکەی بگێڕێتەوە و هیچ نەبات، یان مێردەکە لە هەقی خۆی خۆش دەبێ — کە نیوەکەیتری مارەییەکەیە— و مارەییەکە هەمووی بۆ ژنەکە دەبێ[2]، لەبەرئەوەی مافی بەخشین هی ئەو کەسەیە خاوەنیەتی، وەلیش خاوەنی نیە، هەروەها وەك چۆن دروست نیە وەلی بەر لە تەڵاقدان گەردنی مێردەکە لە مارەییەکە ئازاد بکا، بەهەمان شێوە پاش ئەوەیش هەر دروست نیە.

ئیبن عەباس و ئەو هاوەڵانەی هاوڕاین، هەروەها تاوس و عەتا و شەعبی و ئەو تابیعیانەی هاوڕایانن و ئیمام مالیك و ئەو شەرعزانەی مەزەبەکان کە هاوڕاین، رایان وایە مەبەست وەلییە، لەبەرئەوەی ئەو کەسەی گرێبەندی مارەکردنی بەدەستە وەلییە، چونکە مێرد پاش تەڵاق گرێبەندی مارەکردنی بەدەست نیە، هەروەها لەبەرئەوەی ئەگەر قورئان مەبەستی مێردەکان بوایە دەیفەرموو (إلا أن تعفو أو

---

[1] البقرة/ ٢٣٧.

[2] بروانە: أحكام القران للشافعي ١/٢٠٠، الام للشافعي ٥/٦٦. أحكام القران لابن العربي ١/٢١٩. المغنى لابن قدامة ٦/ ٧٢٩. بداية المجتهد ٢/٢٣.

تعفون)، کاتێ له ئاخاوتن لەگەڵ حازر که لەسەرەتای قسەکەدا دەستی پێکرد گۆڕی بۆ لەفزی غایب، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەبەست کەسانیتری جگە لەوانە.

بەلای منەوە رای زاڵ ئەوەیە خاوەنانی رای یەکەم بۆی چوون کە ئەوەی گرێبەندی مارەکردنی بەدەستە مێردە، لەبەرئەوەی بەخشین تەنها لە کەسێکەوە چاوەڕوان دەکرێ کە مافێکی هەیە و دەستبەرداری دەبێ بۆ کەسانیتر، هەروەها لەبەرئەوەی ئەو فەزڵەی نەهی کراوە لە لەبیرکردنی لە ئایەتی ﴿وَلَا تَنسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ﴾ بۆ ئەو کەسەیە کە خاوەنی فەزڵە، دیسان لەبەرئەوەی گرێبەندەکە بۆ ئەو کەسەیە بچڕێن و هەڵوەشاندنەوە و دەستپێوەگرتنی نیکاحەکەی بەدەستە.

## سێیەم: کۆبێژ (موجمەل):

لەڕووی زمانەوانیەوە بەمانای لێڵ (مبهم) دێ، لەڕووی زاراوەیشەوە ئەو لەفزەیە لە خۆیەوە شتێکی لێ شاراوەتەوە وای لێکردوە بە روونکردنەوەیەك نەبێ لەلایەن کۆبێژەر (المجمل)ەوە نەزانرێ، جا ئاخۆ شاراوەییەکەی بەرهەمی گواستنەوەی لەفزەکە بێ لە مانای زمانەوانیەوە بۆ مانای شەرعی، یان لە تێکسپڕانی مانا یەکسانەکانی، یان لە نامۆیی لەفزەکە خۆیەوە بێ.[1]

### جۆرەکانی:

موجمەل لەڕووی سەرچاوەی کۆبێژی (ئیجمال)یەکەیەوە سێ جۆرە:

یەکەم: ئەوەی هۆی کۆبێژیەکەی گواستنەوەی لەفزەکە بێ لە مانا زمانەوانیەکەیەوە بۆ مانایەکی تایبەتی نەزانراو (واتە پێش روونکردنەوە) کە شەرعدانەر سەرلەنوێ ویستویەتی، ئەمە زۆرترین جۆری کۆبێژە لە دەقە شەرعیەکاندا، وەك (الصلاة، الزكاة، الحج، الصيام، البيع، النكاح) کە لە زمانی

---

[1] أصول السرخسي ١٦٨/١ تقويم الأدلة ص ٣٠٦ البزودي مع الكشف ٥٤/١.

عەرەبیدا مانایەکی دیاریکراویان هەیە، بەڵام ئیسلام هات و مەدلولێکی نوێی تازەی پێ بەخشیون، سوننەی گوفتاری و کرداریی پێغەمبەریش(ﷺ) بەسەرپشککردنی لەلایەن خواوە روونکردنەوەی ئەو مەدلولەی گرتۆتە ئەستۆ، قورئانی پیرۆز لە چەند ئایەتێکی کۆبێژدا فەرمانی بە نوێژ کردوە، موسڵمانان ژمارەی رکات و کات و مەرج و سونەتەکانیان نەدەزانی، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانەی بەقسەو کردار روون کردەوە، پاشان فەرمووی: (صَلُّوا كما رأيتُموني أُصَلِّي).

هەروەها زەکات لەڕووی زمانەوانیەوە بەمانای گەشە دێ، ئیسلام هات مانایەکی نوێی تایبەتی پێ بەخشی بەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾[1]، لەگەڵ مانەوەی پەیوەندی بە مانا زمانەوانیەکەی لەو رووەوە زەکات هۆیەکە بۆ گەشەکردن بەهۆی دروستبوونی پەیوەندی و خۆشەویستی لەنێوان هەژار و دەوڵەمەنددا، بەوەیش ماڵی دەوڵەمەند لە هەر هەڕەشە و دەستدرێژیەکی کەسانی بێبەش پارێزراو دەبێ. ئایەتەکە کۆبێژ (مجمل)ـە و روونی نەکردۆتەوە زەکات لە چیدا واجبە و ئەندازەی چەندە و مەرجەکانی چین، پێغەمبەر(ﷺ) هەموو ئەوانەی روون کردۆتەوە. باقیی زاراوە شەرعیەکانیتریش بەهەمان شێوە.

دووەم: کۆبێژی بەهۆی فرەیی و کەڵەکەبوونی مانا یەکسانەکان لەسەر لەفزەکە بەبێ بەستنەوە بە قەرینەیەکەوە مەبەست پێی دیاری بکا وەك (عين) بۆ بینین و (عين) بۆ کانی و هیتر، هەروەها وەك (القرء) کە هاوبەشە لەنێوان پاکبوونەوە و حەیزدا.

سێیەم: کۆبێژی بەهۆی نامۆیی لەفزەکە لەو مانایەی تێیدا بەکار هاتوو وەك وشەی (هلوع) لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعاً﴾[2]، واتە کەم سەبر و

---

[1] التوبة ١٠٣.

[2] المعارج ١٩.

زۆر پەرۆش، هەربۆیە خوا روونی کردۆتەوە بەوەی ﴿إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعاً وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعاً﴾.[1]

حوکمی موجمەلیش باوەڕبوونەوە بەوەی مەبەستە و کارپێنەکردنی تا مەبەست پێی روون دەکرێتەوە، هەروەها داواکردن لە کۆبێژەر (موجمیل) و لێپرسینی تا روونی بکاتەوە[2].

## چوارەم: لێکچوو (المتشابه):

لەڕووی زمانەوانییەوە لە: اشتبهت الأمور وتشابهت-ەوە هاتووە، واتە لەبەر لێکچوونی هەندێکی لەگەڵ هەندێکیتری تێکەڵ و پێکەڵ بوو: (اشتبه عليه الأمر) واتە شتەکەی لێ تێکەڵ بوو.[3]

لای حەنەفییەت بە دوو قۆناغدا تێپەڕیوە، لە یەکەمیاندا لەڕووی مانا زمانەوانییەکەوە تەماشای دەکرا، واتە تێکەڵبوون (التباس) و هاوچەشنی (تماثل) و لێکچوون (تشابه)، لەبەر تیشکی ئەوەدا ئەبولحەسەنی کەرخی پێناسەی کردوە بەوەی: ئەوەیە دوو روو یان زیاتر هەڵدەگرێ، یەکێك لە دوو مانا یان ماناکانیش بە قەرینەیەك زاڵ دەبێ. ئەم ئاراستەیە لای قوتابییەکەی واتە جەصاص[4] دەردەکەوێ. واتە لەفزێکە لەنێوان دوو مانا و بۆ سەرەوەدا دێ و دەچێ و بەقەرینەیەك یەکێکیان زاڵ دەبێ. (تشابه) بەم مانایە بوارێکی لە بازنەی حوکمە تەکلیفیەکاندا هەیە. شێوەی لابردنیشی -بەبڕوای کەرخی- بە بارکردنی دەبێ لەسەر ئەو موحکەمەی تەنها یەك روو هەڵدەگرێ...

---

[1] المعارج ٢٠، ٢١ .

[2] بڕوانە: أصول السرخسي ١٦٨/١.

[3] بڕوانە: النهاية في غريب الحديث لابن الأثير ٢٠٣/٢.

[4] بڕوانە: أصول الفقه للجصاص موضوع المتشابه مخطوطة دار الكتب المصرية لوحة (٥٥ - ٥٦).

لـه قۆنـاغی دووەمـدا وا تەماشـای دەکـرا ئەوەیـە لـە لێڵیـدا گەیشـتۆتە لوتکـە بەنیسـبەت جۆرەکـانی لـەفزی تەمومـژاوی، بەشـێوەیەك ئومێـد بـە زانینـی بـڕاوە، هەروەها هەندێ پێناسەیتریان کردوە کە هەموو بەدەوری یـەك مانـادا دەخولێنـەوە، ئەویش ئەوەیە، ئەو لەفزەیە مانا مەبەستەکەی لە خۆیەوە شاراوەتەوە، نە بە قورئان و نە بە سوننە تەفسیر نەکراوە، بۆیە ئومێد نیە کەس بیزانێ، یان مەگەر ئەوانەی بـە (الراسـخون فی العلـم) ناسـراون. (متشـابە) بـەم مانایـە لەگـەڵ سروشـتی حوکمـە تەکلیفیەکاندا ڕێك ناکـەوێ، بـەڵکو بوارەکـەی مەسـەلەکانی بیروبـاوەڕ و بنـەماکانی ئاینە.[1]

لە خوارەوە دوو نموونە لە پیادەکردنـە فیقهییـە خیلافییـەکان دەخەینـە ڕوو کـە لەسەر جیاوازی لەم ئەسڵە دامەزراون:

**١- زانایـان سـەبارەت بـە فـەرزبوونی شـۆردنی پێکـان یـان مەسـحکردنیان لـە دەستنوێژدا چوار ڕای جیاوازیان هەیە،** هۆی ناکۆکیشیان جیاوازییە لە تـەئویلکردنی ئەو (متشابە)ـەی لە جیاوازیی خوێندنەوە بۆ لـەفزی (وأرجلكم) کەوتۆتـەوە لـەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ﴾. خوێندنەوەی بە (نصب) جگە لە عەتفکردنی لـە شـۆردندا هـەڵناگرێ، خوێندنەوەیشی بە نزمکردنەوە (الخفض) عـەتفکردنی لەسـەر شـۆردن هەڵدەگرێ و نزمکردنـەوەی بـە موجـاوەرە دەبـێ و ئەگـەری عـەتفکردنی لەسـەر مەسـحیش هەڵدەگرێ، بـەوەیش بـە خوێندنـەوەی یەکـەم موحکـەم و بـە خوێندنـەوەی دووەم متشابە دەبێ، بۆ نەهێشتنی لێڵیەکـەیش (متشـابە) لەسـەر موحکـەم بـار دەکـرێ و

---

[1] بروانە: اصول السرخسي ١٦٩/١ أصول البزدوي مع الكشف ٥٥/١ التوضيح مع التلويح ١٢٧/١ فما بعدها، المرآة ٤١٢/١ و پاشتر.

حوكمی واجبكردنی شۆردنی پێكانیش وەك دەست و دەموچاو دەدرێ، جمهووریش دەستی بەمەوە گرتوە.[1]

شیعەی ئیمامی رایان وایە مەسحكردن واجبە، توسی لە كتێبەكەیدا لەبارەی جیاوازیەكەوە دەڵێ: بەڵگەمان ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ﴾، كە بە زاهیری لەفز شۆردنی دەموچاوی فەرز كردوە پاشان هەردوو دەستی لەسەر عەتف كردوە، بەوەیش شۆردنی ئەوانیشی واجب كردوە، پاشان حوكمێكیتر دەست پێكراوە و دەڵێ: سەرتان مەسح بكەن و بەوە مەسحی سەری واجب كرد، پاشان هەردوو پێكانیشی لەسەر عەتف كردوە لەبەرئەوە پێویستە حوكمی ئەوانیش حوكمی سەر بێ لە واجبی مەسحكردن بەگوێرەی عەتفەكە، وەك كە فەرزكردنی شۆردنی هەردوو دەستیش تەنها بە عەتف بووە[2].

هەروەها دەڵێ ئەم رایە لە كۆمەڵێ لە هاوەڵان و شوێنكەوتوان ریوایەت كراوە، لەوانە ئیبن عەباس و عەكریمە و ئەبو ئەلعالیە و شەعبی.

كۆمەڵێ بۆ ئەوە چوون بەرئەرك (موكەلەف) سەرپشك بكرێ لەنێوان مەسح یان شۆردنی پێكاندا، ئەوەیش رای ئەبوحەسەنی بەصری و محەمەد بن جەریری تەبەری و ئەیبن عەلی ئەلجەبائییە[3]. ئەوەوی دەڵێ: هاوەڵانمان لە محەمەد بن جەریریان گێراوەتەوە كە سەرپشك دەكرێ لەنێوان شۆردن و سرینی پێكاندا. هەروەها خەتابییش لە جیبائیی موعتەزیلیەوە گێراویەتیەوە[4].

هەندێ لە ئەهلی زاهیر شۆردن و مەسحیان پێكەوە واجب كردوە[5].

---

[1] بروانە: المجموع للنووي ١/٤١٤ و پاشتر.

[2] بروانە: الخلاف للطوسي ١/١٦ و پاشتر.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

[4] المجموع ١/٤١٤.

[5] سەرچاوەی پێشوو.

**زاڵکردن:**

رای زاڵ ئەوەیـە جمهـور بـۆی چـووە ئـەویش لەبـەر کـارکردنی بـەردەوامی پێغەمبەر(ﷺ) بە شۆردن و شوێن پێهـەڵگرتنی لەلایـەن هـاوەڵان و شـوێنکەوتوان و ئەوانـەی پـاش ئـەوان هـاتن، هـەروەها لەبەرئـەوەی کـردەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) لـەم مەسەلەیەدا گەیشتۆتە رادەی تەواتور، بەشێوەیەك مانای واجبیی شۆردن دەگەیـەنێ نەك مەسح.

بۆ وەڵامی ئەوەیش کە (وأرجلکم) دەکرێتە بەڵگە بۆ مەسـحی پێکـان، ئەگـەر بـە (نصـب) بخوێنرێتـەوە ئـەوا بەڕاشـکاوی باسـی شـۆردن دەکـا، ئەگـەر بـە (جـر)یش بخوێنرێتەوە ئەوا خوێندنەوەکە بۆ موجاوەرە دەبـێ و ئەسـڵ لـە لەفزەکـەدا نصـبە، ئەمەیش لە زمانی عەرەبدا بەناوبانگە.[1]

**٢- شەرعزان رای جیاوازیان هەیە لـەبارەی رێگـەدان بـە جووتبـوون (الوقـاع)[2] بەپچڕانی خوێن لە سووڕی مانگانە بەر لە خۆشۆردنی حەیزدارەکە، ئاخۆ بە نەمانی خوێن حەڵاڵ دەبێ یان پێویستە بەر لەوە خۆی بشوات؟**

هۆی ناکۆکیەکەیشیان ئەو (تشابە)ـەیە لە خوێندنەوەی (یطهرن) دروست بـووە لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّـى يَطْهُـرْنَ فَـإِذَا تَطَهَّـرْنَ فَـأْتُوهُنَّ مِـنْ حَيْـثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ﴾[3].

بەخوێندنەوەی پیتی (الطاء) بەسووکی مەبەست لە لەفزەکە پچڕانی خوێن دەبێ و ئەگەرێکیتری نیە، بەخوێندنەوەیشی بە شەددەداری هەردوو شتەکە، واتـە نـەمانی

---

[1] هەندێ شیعر هەن لەم بابەتە، لەوانە:

| | |
|---|---|
| لم يبق إلا أسير غير منفلت | موثوق في عقال الأسر مكبول |
| فخفض الأشعر مجاورة لمنفلت | وإلا فهو مرفوع معطوف على أسير |

[2] وقاع، واتە سەرجێییکردن لەگەڵ ژن.

[3] البقرة ٢٢٢.

خوێن و خۆشۆردن، دەگرێتەوە. بەپێی خوێندنەوەی یەکەم لەفزەکە موحکەم دەبێ، بەدووەم (متشابە) دەبێ، بۆ نەهێشتنی تەومژ دووەمیان لەسەر یەکەمیان بار دەکرێ و مانای هەردوو خوێندنەوەکە لەسەر یەك روو روودەدات و ئەوەیان لێ دەردەکەوێ تەنها بە نەمانی خوێن جووتبوون دروستە، ئەمە رای ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی و ئەوانەیە هاورایانن. جمهوریش لەوانە مالیك و شافیعی بۆ رووی دووەم چوون و گوتویانە جووتبوون تا پاش خۆشتن دروست نیە، لەبەرئەوەی سیغەی (تفعل) لەسەر ئەوە پیادە دەکرێ کە کاری موکەلەفەکان بێ، لێرەیشەوە ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ﴾ زیاتر مانای شۆردن بە ئاوی لێ دەخوێنرێتەوە تا پاکبوونەوە، کە پچڕانی خوێنە، کامەیش دیارتر بێ پێویستە ئەوە وەربگیرێ تا ئەوکاتەی بەڵگەیەك لەسەر پێچەوانەکەی پەیدا دەبێ.[1]

[1] بڕوانە: أحكام القران للجصاص ٤١٢/١ فتح القدير ١١٨/١ بداية المجتهد ٤٥/١ و پاشتر.

## باسی چوارەم:
## دابەشکردن لەرووی شاراوەییەوە لای جمهور

جمهور لەفزەکانیان بەگوێرەی شاراوەیی دیلالەتیان بۆ دوو بەش دابەش کردوە، یەکێکیام کۆبێژ و دووەمیان لێکچووە، لە خوارەوەیش باسی هەریەکەیان بەدرێژی دەخەینە روو:

### کۆبێژ (مجمل):

زانایان چەندین پێناسەیان کردوە کە هەموویان بەدەوری ئەوەدا دەسوڕێنەوە کە لەفزی موجمەل دیلالەتی بۆ ئەو مانایەی مەبەستە رۆشن نیە[1]، رەنگە گرنگرتینیان لەرووی گشتگیریەوە پێناسەکەی قەرافیی مالیکی بێ کە دەڵێ: "ئەوەیە لەنێوان دوو ئەگەر و بەسەرەوەدا دەسوڕێتەوە، جا چ بەهۆی دانان (وضع)ەوە بێ وەك هاوبەش، یان لەرووی ئەقڵەوە وەك رێکەوتوو (متواطئ) بەنیسبەت وردە بەشەکانیەوە"[2].

من پێم باشە پێناسە بکرێ بەوەی: ئەوەیە بەبێ دیاریکەرێك ئامارژە بۆ مانا مەبەستەکە ناکا، جا چ هۆی ئەوە دۆخی زمان بێ یان عورفی شەرع یان بەکارهێنان.

#### جۆرەکانی:

موجمەل بەگوێرەی سەرچاوەکەی (هۆکانی) بۆ چەند بەشێك دابەش دەبێ، گرنگترینیان:

---

[1] الإحكام لابن حزم ٤٢/١ شمس الأصول ١٧٣/١ مبادئ الوصول إلى علم الأصول ص ٦٧. اللآمدي ١٦٢/٢.
[2] شرح تنقيح الفصول ص ٢٧٤.

أ- ئـەو موجمەلـەی لـە هاوبەشـیی لـەفز كەوتۆتـەوە لای ئەوانـەی بـاس لـە عمومنەبوونی هاوبەش دەكەن جا چ لەفزەكە تـاك بـێ وەك لـەفزی (عـین) بـۆ ئالتون و كانی و چاو، هـەروەها وەك لـەفزی (المختـار) بـۆ اسـم فاعـل و اسـم مفعول[1]، یان مركب بێ وەك ئەوەی خوا ئەفەرمویْ: ﴿بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ﴾ ، كە وەك پێشتر باس كرا حەنەفیەت لە ریزی موشكەلدا دایناوە و لـەنێوان مێـرد و وەلی (بەخێوكەر)دایە.

ب- ئـەو موجمەلـەی بـەهۆی گواسـتنەوەی لەفزەكـەوە دروسـت بـووە لـە مانـا زمانیەكەیەوە بـۆ مانایـەكی نـویْ لـە عـورفی شـەرعدا، ئـەوەیش بـەر لـەوەی شەرعدانەر دیاری بكا وەك لەفزەكانی (صلاة، صیام، حج، زكاة).

ج- ئەو موجمەلەی لە رارایی لـەنێوان دووشـت كەوتۆتـەوە، وەك رارایـی لـەنێوان لكانـدنی دەم و لـوت بـە دەرەوەی جەسـتەوە لەگـەڵ لكانـدنی بـە نـاوەوەی جەستە لە واجبیی وسلْدا.

د- ئەو موجمەلەی لە (ئیستیسـنایەكی مـەجهول) كەوتۆتـەوە وەك ئـەوەی خـوا ئەفەرمویْ: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ [2]، كە ئەوەی لـە (بهیمـة الانعـام) حـەڵاڵ بـووە بووەتـە موجمـەل وەك ئەبوئیسحاقی شیرازی دەڵێ[3].

لەڕووی سروشتی مەدلولەكەیشەوە بۆ ئەم بەشانەی خوارەوە دابەش دەبیْ:

- موجمەل لەنێو راستەقینەكانیدا، واتە لـەنێوان هەنـدیْ مانـادا كـە لەفزەكـە بـۆ هەموویان دانراوە وەك (القرء) كە بۆ دوو راستی دانراوە ئەوانیش حەیز و تـوهرن[4] لـە ئایەتی ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ﴾..

---

[1] فأصل مختار مختير بكسر الياء في الفاعل وبفتحها في المفعول ويقلب الياء ألفاً حصل الاشتراك بينهما.

[2] المائدة ١.

[3] اللمع ص ٢٧

[4] الأسنوي مع البدخشي ١٤٣/١.

– موجمەل لەنێوان تاکەکانی یەك ڕاستقینەدا، وەك ئەوەی خوا ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُواْ بَقَرَةً﴾.[1]، کە لەفزی (البقرە) بۆ یەك بابەتی زانـراوە دانـراوە کـە تاکی زۆری هەیە و مەبەستیش یەکێکی دیاریکراو لەوانەیە.

– موجمەل لەنێوان مەجازەکانیدا لەبارێکدا ڕاستەقینە (حەقیقـەت) نـەبوو، واتـە دەرکەوت مەبەست ڕاستەقینەکە نیە و مەجازەکان لە ئاستێکدا بوون بەوەی هیچیان بەسەر ئەویتردا زاڵ نەبوو[2]. ئەوەیش کاتێ دەبێ ڕاستەقینەکە مـەحاڵ بـێ یـان وازی لێ هێنرابێ و بەڵگەیەك نەبێ لەسەر ویستنی شتێکیان بەدەر لەوانیتر. ئەو لەفزە ڕاڕا (متردد) دەبێ لەنێو ئەو مەجازانەدا لەبـەر ئـەوەی بـۆ هـەموویان دەسـت دەدا، وەك لـەوەی خـوا ئەفـەرموێ: ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾[3] ، کـە دەسـتی ڕاسـتەقینە لـە (جاریحەی تایبەت)ە و لێرەدا ئاستەمە لەبـەر مـەحاڵیی چـواندن بـۆ خـوا و ئەگـەری ئەوەی مەبەست پێی نیعمەت و توانای بێ و دەست تێیاندا مەجاز بێ.[4]

**بەراورد لەنێوان موجمەل لای جمهور و موجمەل لای حەنەفیەت:**

١– موجمەل لای جمهور (شـاراوە و بـەگرێ و کۆبێـژ/ خفـی و مشـکل و مجمـل) دەگرێتەوە کە لای حەنەفیەت تەمومژاوین، هەروەها لێکچوو–یش دەگرێتـەوە بەو مانایەی پێشینانی حەنەفی گرتویانەتە بەر، لێرەوە لای جمهور موجمـەل لـەڕووی ئەوانـەی بەسـەریاندا ڕاسـت دەگـەڕێ (الماصـدقات) بـەڕەهایی لـە موجمەلی حەنەفیەت گشتیترە ، ئـەوەی لای حەنەفیـەت بـۆ موجمـەل ڕاسـتە لای جمهوریش بۆی ڕاستە، بـەڵام بەپێچـەوانەکەی نـا، چـونکە دز بەنیسـبەت کفندز لای حەنەفیەت (خەفی) و لای جمهور موجمەلە، هەروەها ئەوەی عەقدی

[1] البقرة ٦٧.
[2] سەرچاوەی پێشوو. ٢/١٤٤.
[3] المائدة ٦٤.
[4] شمس الأصول للسالمي ١/١٧٥.

نیکاحی بەدەستە لەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ﴾ لای حەنەفیەت موشکەل و لای جمهور موجمەلە.[1]

٢- گشتیتربوونی موجمەل لای جمهور، ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە دەکرێ بەبێ موجمەل بەنیسبەت هەندێ لەوانەی بەسەریدا دەچەسپن تەفسیر بکرێ، وەك (خەفی) یان موشکەل کە دەکرێ لەلایەن جگە لە شەرعدانەریشەوە تەفسیر بکرێن.

٣- هەموولا کۆکن لەسەر ئەوەی مجمل ئەوەیە دیلاتەکەی روون نابێتەوە.

**کاریگەریی موجمەل لەسەر جیاوازیی شەرعزان:**

موجمەل لە دەقەکانی قورئان و سوننەدا بەیەکێك لە گرنگترین هۆکانی جیاوازیی شەرعزان لە حوکمە فیقهیەکاندا دانرێ، وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دیارە:

١- سەبارەت بەئایەتی﴿وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ﴾ جیاوازن، حەنەفیەت رای وایە موجمەلە و لەوانەیە پێویست بێ هەمووی مەسح بکرێ و لەباری خراپیشدا مەسحی بەشێکی. پێغەمبەریش(ﷺ) روونی کردۆتەوە و پێشی سەری مەسح کردوە کە ئەندازەی چواریەکە و بەوەیش چواریەك واجبە.

جمهور رای وایە ئیجمالی تێدا نیە، بەڵام لەبارەی ئەندازەی ئەوەی پێویستە مەسح بکرێ جیاوازن، مالیك و قازی عەبدولجەبار و ئیبن جنی رایان وایە بەحوکمی دۆخی زمان دیارە کە مەسحی هەموو سەرە[2]، لەبەرئەوەی (باء)ەکە بۆ پێوەلکاندن و زیادەیە. شافیعیەت دەڵێ مەسحی سەر راستەقینەیە بۆ ئەوەی پێی دەوترێ مەسح، کە ئەندازەیەکی هاوبەشە لەنێوان هەموو و هەندێك-دا، لەبەرئەوەی ئەم تەرکیبە جارێك بۆ مەسحی هەموو و جارێکیتر بۆ مەسحی هەندێ دێ، وەك دەوترێ: مسحت بيدي رأس اليتيم. (دەستم هێنا بەسەر هەتیوەکەدا) لەکاتێکدا دەستی تەنها بەسەر

---

[1] بڕوانە: الأحکام للامدي ٢/١٦٧.

[2] سەرچاوەی پێشوو.٢/ ١٦٩.

هەندێ لەسەری هەتیوەکەدا هێناوە. ئەگەر بکرێتە راستەقینە لە هەردووکیاندا – هەموو و هەندێ– هاوبەشبوون پێویست بێ، ئەگەر لە یەکێکیاندا بکرێتە راستەقینە لەویتر مەجاز پێویست دەبێ، راستەقینە و مەجازیش پێچەوانەی ئەسڵن لەبەرئەوە کراوەتە راستەقینە لە ئەندازە هاوبەشەکەدا. هەندێ لە شافیعیەکان شیکارێکیتریان کردوە و دەڵێن: باء–ەکە بۆ (هەندێ)یە (التبعیض) لەبەرئەوە مەسحی هەندێ بەسە.[1]

٢– لەبارەی ئیجمالی دەست و برین لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا﴾. جیاوازن. هەرچی ئیجمالی برینە لەبەرئەوەی دەکرێ بە جیاکردنەوەی ئەندام لە ئەندام بوترێ، هەروەها بە برینی پێستە دیارەکەی ئەندامەکە بە بریندارکردن بەبێ جیاکردنەوە ئەندامەکەیش دەوترێ.[2]

هەرچی ئیجمالی دەستە، لەبەرئەوەیە لەفزی (الید) بە تەواوی دەست تا شان دەگوترێ، هەروەها تا مەچەك و هەروەها تا ئانیشکیش دەگوترێ، هیچکام لەمانەیش لەویتر دیارتر نیە، هەربۆیە لەفزی دەست و برینەوە موجمەلن.[3]

هەندێکیتر بۆ ئەوە چوون ئایەتەکە هیچ ئیجمالی تێدا نیە نە لەبارەی دەست و نە لەبارەی برینەوەوە، لەبەرئەوەی (الید) بەراستەقینە هەموو ئەندامەکە و بە مەجاز هەندێکیەتی، هەروەها (القطع)یش بەراستەقینە جیاکردنەوەیە، قڵیشاندن و بریندارکردنیش دیسان جیاکردنەوەن لەبەرئەوەی جیاکردنەوەی هەندێ بەشی گۆشتیان تێدایە لە هەندێکیتری و (متواطیء) دەبێ.[4]

٣– هەروەها جیاوازن لەبارەی ئیجمالی ئەو دەقانەی نەرێیان تێدایە لە کردەوە شەرعیەکاندا وەك ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: (لا صلاة إلا بفاتحة الکتاب) (ولا

---

[1] بڕوانە: الأسنوي مع البدخشي ٢/١٤٧.
[2] بڕوانە: الإحکام للآمدي ٢/١٧٣.
[3] سەرچاوەی پێشوو.
[4] الأسنوي مع البدخشي ٢/١٤٨.

صيام لمن لم يبيت من الليل)، كه حەقیقەتی ئەوە هەواڵدانە لەبارەی رەتکردنەوەی خودی رۆژوو و نوێژەکە لەکاتی نەبوونی فاتیحە و نیەتهێنان بەشەودا، ئەمەیش ویستی شەرعدانەر (الشارع) نیە لەبەرئەوەی ئێمە دەبینین خودەکە بەبێ ئەوەیش روودەدات بۆیە دەبێ لەسەر مەجاز بار بکرێ، کە یان شاردنەوەی دروستییە، واتە نە نوێژی دروست و نە رۆژووی دروست نیە، یان شاردنەوەی تەواوییە، واتە نە نوێژی تەواو و نە رۆژووی تەواو نیە.

ئەوانەی دەڵێن ئیجمال نیە رایان جیاوازە، هەندێکیان دەڵێن دوو مانا مەجازییەکە هاوشان نین و لەگەڵ ئەوەن کە شاردنەوەی دروستی (اضمار الصحة) زاڵترە لەبەرئەوەی زووتر بە بیردا دێ، بۆیە لەفزەکە بەگوێرەی ئەو وەردەگیرێ، چونکە مانا راستەقینەکە نەفیکردنی خودە، نەفیکردنی خودیش نەفیکردنی سەرجەم سیفەتەکان دەخوازێ، نەفیکردنی دروستی لە نەفییکردنی تەواوی نزیکترە لەم مانایە، لەبەرئەوەی لەگەڵ نەفیکردنی دروستیدا هیچ وەسفێك نامێنێ، بەپێچەوانەوەی نەفیکردنی تەواوی.[1]

هەندێکیشیان گوتویانە دروستی (الصحة) بەشێکە لە چەمکی ناوی شەرعی، بۆیە تەقدیرکردنی بوون پێویست دەکا، لەبەرئەوەی نەبوونی شەرعی نەبوونی دروستیی شەرعییە، ئەمە بینا لەسەر ئەوەی دروستی بەشێکە لە چەمکی بوونی شەرعی وەك لە (لا صلاة إلا بطهور)[2] . بەڵام ئەوە ساغ نەبوویەوە ئەگەر لادانی بۆ تەواوی باو بوو، تەقدیرکردنی تەواوی پێویست دەکا، وەك لە (لا صلاة لجار المسجد إلا في المسجد [3])

. بەڵام ئەگەر لادانی بۆ تەواوی لەرووی شەرعەوە باو نەبوو پێویستە تەقدیری دروستی بکرێ، چونکە ئەوە لە تەقدیرکردنی تەواوی لە نەفیکردنی خودەوە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.٢/١٤٤.

[2] التقرير والتحبير مع التحرير ١/١٦٦.

[3] أخرجه الدار قطني والحاكم في مستدركه.

نزیکترە، کە ئەوە حەقیقەتە ئاستەمەکەیە لە تەقدیرکردنی تـەواوی، چـونکە ئـەوەی دروست نەبێ لە بێکەڵکیدا وەك نەبوو وایە.

### لێکچوو (المتشابە):

بەرانبەر موحکەمە، ئەگەر لەفزی موحکەم (دامەزراو) ئەوە بێ کـە مەبەسـت لێـی بە دەرکەوتن و تەئویل زانراوە، (متشـابە) بەپێچـەوانەی ئـەوە دەبـێ، لەبەرئـەوە لـە پێناسەیدا وتراوە ئەوەیە خوا زانینی بـۆ خـۆی هێشـتۆتەوە. خـوا ئەفـەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ﴾[1].

ئەگەر کار بەو پێناسەیەی رابردوو بکرێ، ئەوا لێکچـوو لـە حوکمـە تەکلیفیەکانـدا وجودی نابێ، چونکە خوای گەورە ئەرکێکمان ناخاتـە سـەر شـان کـە تێگەیشـتنمان پەی پێ نەبات، لەبەرئەوە ئـیبن حـەزم حەسـری کردوە لـەو پیتـە پچرپچڕانەی لـە سەرەتای سورەتەکاندان.

زانایان پێناسەی جۆراوجۆریان بۆ لێکچوو (متشابە) کردوە[2]، هەنـدێ پێیـان وایـە موجمەلە، هەندێکیان پێیان وایە هاوبەشە لەنێوان موجمـەل و تـەئویلکراودا، هەنـدێ پێیان وایە لە موجمەل گشتیترە. هەنێکیش پێیان وایە (خەفی و موشکەل و متشابە) بەو مانایەی پێشینان لـە زانایـانی حەنەفیـەت بـۆی چـوون دەگرێتـەوە. ئەگـەر لـەم گۆشـەیەوە بـۆی بڕوانـرێ لـە دەقـە شـەرعییە تەکلیفیەکانـدا وجـودی دەبـێ و ئـەو ئەسەرانەی لێ دەکەونەوە کـە لـەوێ لێـی کەوتونەتـەوە لـە جیـاوازیی شـەرعزان لـە حوکمە شەرعیەکاندا.

---

[1] ال عمران ٧.

[2] بڕوانە: الاتقان في علوم القرآن للسيوطي ٢/٢، اللمع ص٢٩، البرهان لوحة ١١٢، المخطوطة منهاج البيضـاوي مع حاشية بخي ٢/، ٦١ مبادئ الوصول إلى علم الأصول ص ٦٦.

# بەشی چوارەم:
# دابەشکردنی لەفز

بە لەبەرچاوگرتنی بەکارهێنان بۆ حەقیقەت و مەجاز و کینایە[1]
هەریەك لەم سێ بەشە لە باسێکی سەربەخۆدا دەخەینە روو.

## باسی یەکەم:
## راستەقینە (حەقیقەت)

حەقیقەت: ئەو لەفزەیە کە لەو زاراوەیەی بۆی دانراوە و گفتوگۆی پێ دەکرێ بەکارهاتووە. دانانیش لێرەدا دیاریکردنی مانایە لەلایەن لەفزەکەوە بەشێوەیەك بەبێ قەرینە ئاماژەی بۆ بکا جا چ ئەو دانانە لەلایەن دانەری زمانەوە بێ یان ئەهلی عورفی گشتی یان تایبەت یان شەرعدانەرەوە، بەم مانایە حەقیقەت بۆ چوار بەش دابەش دەبێ:

١- حەقیقەتی زمانەوانی: ئەو لەفزەیە بۆ ئەوەی لەرووی زمانەوانیەوە بۆی دانراوە بەکارهاتووە وەك مرۆڤ و شێر.

٢- حەقیقەتی عورفیی گشتی: ئەو لەفزەیە لەروی زمانەوانیەوە بۆ مانایەك دانراوە، پاشان ئەهلی عورفی گشتی بۆ مانایەکیتر بەکاریان هێناوە و ئەو بەکارهێنانە لەناویاندا بووەتە باو وەك لەفزی (الدابە) کە لەروی زمانەوانیەوە بۆ هەر شتێك دانراوە کە بەسەر زەویدا بڕوات لە مرۆڤ یان ئاژەڵ، پاشان

---

[1] لەبەر بێبایەخیی (صریح) لە جیاوازیی شەرعزاندا، تەنها باسی کینایەمان کرد.

ئەهلی عورف بەکاریان هێناوە و تایبەتیان کردوە بە رەشە وڵاخە سمدارەکان (ذوات الحوافر) وەك ئەسپ و هێشتر.

٣- حەقیقەتی عورفیی تایبەت: ئەو لەفزەیە لەڕوی زمانەوانیەوە بۆ مانایەك دانراوە، پاشان ئەهلی عورفی تایبەت لە هیتردا بەکاریان هێناوە و ئەوە لەناویاندا بووەتە باو تا وای لێهاتووە لای ئەوان تەنها بەو مانایە وەردەگیرێ وەك زاراوە ئوسوڵی و مەنتیقی و نەحویەکان، بۆ نموونە (النقض) لەڕوومانی زمانەوە بەمانای هەڵوەشاندنەوە دێ، ئوسوڵناسان لە دواکەوتن (تخلف)ی حوکم لە عیللە لە قیاسدا بەکاریان هێناوە.

٤- حەقیقەتی شەرعی: لەفزێکە لەڕوی زمانەوانیەوە بۆ مانایەك دانراوە، پاشان لە مانایەکی شەرعیدا بەکارهاتووە کە پەیوەندیەکی لەگەڵ مانا زمانەوانیەکەدا هەیە وەك (صلاة و صیام).

## حوکمەکانی حەقیقەت:

حەقیقەت کۆمەڵێ حوکمی هەیە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- جێگیرکردنی ئەوەی بۆی دانراوە بەڕەهایی، جا چ گشتی بێ یان تایبەت، فەرمان بێ یان نەهیکردن، نیەتی هەبێ یان نەیبێ، وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا﴾ [1] ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ [2] ، کە هەردوو دەقەکە لەوەی فەرمان بەکردنی کراوە و نەهی لە کردنی کراوە تایبەتن، هەروەها لەو فەرمانەی کراوە و لەوەی نەهی لێکراوە گشتین[3].

---

[1] الاية ٧٧/الحج

[2] الاية ١٥١/ الأنعام.

[3] كشف الأسرار مع البزدوي ٣٥٩/٢.

٢- ئەكرانی ئەرێكردنی لەوەی بۆی دانراوە، بۆ نموونە بە باوكی شـەرعی نـاوترێ ئەوە باوك نیە.

٣- زاڵبوون (رجحان)ی بەسەر مەجازدا لەبەر بێنیازبوونی لـە قەرینـەی دەرەكـی بەپێچـەوانەی مـەجاز، هـەروەها زاڵبـوونی بەسـەر هاوبەشـدا لەبەرئـەوەی بـە ئیستیقرا مەجاز لە هاوبەش (مشترك) زۆرترە، لێرەیشەوە زاڵبوونی حەقیقـەت بەسەر هاوبەشدا لەپێشتر دەبێ، ئەمەیش ئەوەی لێدەكەوێتەوە كـە لەفزەكـە لەسەر مەجازەكە وەریگیرێ نەك هاوبەش ئەگـەر لەفزەكـە لـە یـەكێك لـە دوو مەدلولەكەیـدا حەقیقـەت و لەویتریانـدا راڕا بـوو لـەوەی لـە مەدلولەكـەیتردا حەقیقەت و لەوێشەوە هاوبـەش بـێ یـان نـا، ئەوكاتـەیش مـەجاز دەبـێ وەك لەفزی (نكاح) سەبارەت بە (وطء) و عقد).

ئەمەیش لقێكی لێ دەبێتـەوە، كـە لـەفز لـە قسـەی یاسـادانەر (مشـرع)دا ئەگـەر لەنێوان مانا شەرعی و زمانەوانیەكەیدا دەسوڕایەوە، بەلای هەندێ شەرعزانەوە لەوانە شافیعیەكان و ئەوانەی لەگەڵیاندان، وەرگرتنی لەسـەر مانـا شـەرعیەكە زاڵ دەكـرێ، لای هەندێكیتریش لەوانە حەنەفیـەكان و ئەوانـەی هاوڕایـانن مانـا زمانەوانیەكـەی زاڵ دەكرێ.[1]

لەو مەسەلە فەرعیانەی لەم جیاوازییە كەوتونەتەوە، ئەمانەن:

١- لەبارەی جێگیربوونی نەسەب (المصاهرة) بە زینا رایان جیاوازە: شافیعیەت و ئەوانـەی هاوڕایـانن پێیـان وایـە حـەرامیی نەسـەب واجـب ناكـا. ئـەوزاعی و ثـوري و ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن:

ئەو حوكمانەی نەسەب كە بـە هاوسـەرگیریی دروسـت حـەرام دەبن بـە زینـایش حەرام دەبن[2]، بەڵام ئیمام مالیك لـە (الموطـأ)ەكەیـدا شـتێكی وەك ئـەوەی شـافیعی

[1] بروانە: تخریج الفروع علی الأصول ص ١٣٩ و پاشتر.
[2] فتح القدیر ٢١٩/٣ و پاشتر.

هەیە، ئیبنول قاسمیش شتێکی لێ دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ رای ئەبوحەنیفە کۆکە. سەحنون دەڵێ هاوەڵانی مالیك لەوەدا هاوڕای ئیبنول قاسم نین و ئەو رایەیان هەیە کە لە (الموطأ)دایە.

هۆی جیاوازیەکەیان ئەو لەفزی نیکاحەیە کە لە ئایەتی ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم﴾دا هاتووە، ئەوەی مانا زمانەوانیەکەی لەبەرچاو گرتووە دەڵێ نەسەب بە زینا جێگیر دەبێ، ئەوەیش مانا شەرعیەکەی وەرگرتوە پێچەوانەکەی دەڵێ.

٢٠- شەرعزان لەبارەی هاوسەگیریی ئەوەی ئیحرامی حەج و عومرەی پۆشیوە رایان جیاوازە: شافیعیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن دروست نیە ئیحرامبەستوو هاوسەرگیری بکا یان رێك بخا، حەنەفیەت و ئەوانەی لەگەڵیاندان پێیان وایە دروستە، هۆی خیلافەکەیشیان جیاوازیانە لە وەرگرتنی وشەی نیکاح لە حەدیسی (لا يَنْكِحُ المُحْرِمُ، ولا يُنْكَحُ)[1] بە مانا شەرعی یان مانا زمانەوانیەکەی[2].

---

[1] رواه أبو داود معالم السنن ١٨٢/٢ ورواه النسائي بزيادة ولا يخطب/ نيل الأوطار ١٦/٥.

[2] النكاح حقيقة شرعية في العقد وحقيقة لغوية في الوطء.

## باسی دووەم:
## مەجاز و حوکمەکانی

مەجاز: یان لەفزییە یان ئەقڵی. لەفزییەکە بریتییە لە بەکارهێنانی لەفزەکە بۆ شتێك جگە لەوەی لە زاراوەدا کە گفتوگۆی پێدەکرێ بۆی دانراوە، ئەویش لەبەر پەیوەندی بە قەرینەیەکەوە کە رێگرە لە ویستنی ئەو مانایەکی بۆی دانراوە. ئەقڵی-ش بریتییە لە دانەپاڵی کردارەکە یان ئەوەی مانای ئەوی هەیە، بۆ لای شتێك کە هی ئەو نیە، ئەویش لەبەر تێکەڵبوون بە قەرینەیەك کە رێگرە لە ویستی دانەپاڵی بۆ لای ئەوەی هی ئەوە، وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾، واتە خوا قورساییەکانی ناو زەوی دەرهێنا، دانەپاڵی دەرکردن بۆ لای زەوی مەجازییە.

مەجازی لەفزی لەڕووی ئەو زاراوەیەی گفتوگۆی پێدەکرێ دەبێتە چوار بەش:

١- مەجازی زمانەوانی: ئەو لەفزەیە لە جێیەکدا بەکارهاتووە جیاواز لەوەی لەڕووی زمانەوانیەوە بۆی دانراوە، ئەویش لەبەر پەیوەندی و قەرینەیەکی رێگر لە ویستنی ئەوەی بۆی دانراوە، وەك ئەوەی دەوترێ: شێرێکم دی سەرکردایەتیی سوپاکەی دەکرد لە شەڕەکەدا.

٢- مەجازی عورفیی گشتی: ئەو لەفزەیە لە جێیەکدا بەکارهاتووە جیاواز لەوەی لەم عورفەدا بۆی دانراوە، ئەویش لەبەر پەیوەندی و قەرینەیەکی رێگر وەك بەکارهێنانانی وشەی ولاّخ بۆ مرۆڤی هێڕ.

٣- مەجازی عورفیی تایبەت: ئەو لەفزەیە لە جێیەکدا بەکارهاتووە جیاواز لەوەی لەم عورفەدا بۆی دانراوە، ئەویش لەبەر پەیوەندی و قەرینەیەکی رێگر وەك ئەوەی نەحویەکان بە گوتەیەکی تەواوی بەسوود دەڵێن (الكلمة).[1]

---

[1] ابن مالك دەڵێ: واحده كلمة والقول عم وكلمة بها كلام قد يؤم.

٤- مەجازی شەرعی: ئەو لەفزەیە لە جێیەکدا بەکارهاتووە جیاواز لەوەی لە زاراوی شەرعیدا بۆی دانراوە، ئەویش لەبەر پەیوەندی و قەرینەیەکی ڕێگر وەك بەکارهێنانی وشەی الصلاة بۆ نزا و پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوون لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ﴾ [1] الآية.

زانایان لە ساغبوونەوە یان نەبوونەوەی (بوونی) مەجازدا سێ بۆچوونی جیاوازیان هەیە:

## جیاوازی لە ساغبوونەوەی مەجازدا:

١- جمهور دەڵێن لە زمان و لە قورئان و سوننەدا هەیە و پشتیان بە چەند بەڵگەیەك بەستووە لەوانە: مەجاز لە حەقیقەت بەهێزترە و پێچەوانەی پاراوی و ڕەوانبێژیی زمان نیە، لەوانە ڕوودانی لە قورئانی پیرۆزدا وەك خوا ئەفەرموێ ﴿جِدَاراً يُرِيدُ أَنْ يَنقَضَّ﴾ ﴿وَاسْأَلِ الْقَرْيَةَ﴾، ئەمە و هیتریش. [2]

٢- هەندێ دەڵێن بەهیچ شێوەیەك وجودی نیە، ئەمە دراوەتە پاڵ ئەبو ئیسحاقی ئیسفەراییني و ئەبو عەلی فارسی و چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە، لەوانە: مەجاز پێچەوانەوەی تێکەڵکردنی مەبەست بە نامەبەستی تێدایە و گوێگر لە لەفزەکە ئەوە حاڵی نابێ کە قسەکەر مەبەستی بووە لێی. ئەمەیش پێچەوانەی مەبەست (مقصود)ـە لە زماندا، کە دەبێ لەفز ئەوە بگەیەنێ کە بۆی بەکار دێ.

٣- هەندێکیش ڕایان وایە لە قورئان و سوننەدا نیە، لەوانە زاهیریەکان و ئیبنول قازی لە شافیعی و هەندێ مالیکی و هەندێ حەنبەلی. پشتیان بە چەند

---

[1] الاية ٥٦/ الأحزاب.

[2] بڕوانە: الإشارة إلى الإيجاز في بعض أنواع المجاز لابن عبد السلام ص ٩ و پاشتر/ أصول الفقه لأبي النور زهير ٦٤/٢.

بەڵگەیەك بەستووە لەوانە: مەجاز برای درۆیە یان پەنابۆبردنی بەهۆی بەرتەسکیی راستەقینەکەیە، قورئان (هەروەها سوننە) لە یەکەمیان پاکە و دووەمیش بۆ خوا مەحاڵە.

رای زاڵ بەلای منەوە رای یەکەمە، لەبەرئەوەی مەجاز لەبەر بەکارهێنانی وێنەگرتنی ئەقڵیی ورد تێیدا، لە راستەقینە کاریگەرترە، هەروەك دەشێ بەئەدەبانەتر بێ وەك گوزارشتکردن لە جیماع بە وشەی (لمس) لەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاءِ﴾، یان گوزارشتکردن لە حەیز بە پێکەنین لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ﴾، ئەمانە و چەندین نموونەیتری زۆر و زەوەندە، کە لەوپەڕی رەوانبێژیدان.

وەڵامی بەڵگەی رای دووەمیش بەوە دەدرێتەوە کە مەجاز بەبێ قەرینەیەك کە مەبەست لێی دیاری بکا، نایەت لەبەرئەوە هیچ تێکەڵییەك روونادات، هەروەها بەڵگەی رای سێیەمیش رەت دەکرێتەوە بەوەی ئەوەی بۆی چوون تەنها گومانێکی بەتاڵە کە بەرهەمی جیانەکردنەوەی مەجاز و درۆیە و دەرکنەکردنە بەوەی دەشێ هەندێ جار مەجاز –لەگەڵ بەردەستبوونی راستەقینەکەیشدا لە راستەقینەکە بەهێزتر بێ.

## حوکمەکانی مەجاز:

مەجاز زۆر حوکمی هەیە هەندێکیان جێکۆك و هەندێ جێناکۆکن، واز لەوانە دێنین کە جێکۆکن لەبەرئەوەی ناکۆکییان لە ئەحکامی فیقهیدا لەسەر دانامەزرێ و قسە لەسەر ئەوانە دەکەین جیاوازییان لەسەرە، لەو حوکمانەی رای جیاوازیان لەسەر هەیە ئەمانەن:

١- جێگیربوونی ئەوەی بۆی خوازراوە ئەگەر گشتی بوو:

وتمان یەکێك لە حوکمەکانی حەقیقەت جێگیربوونی ئەوەیە لەفزەکەی بۆ دانراوە، جا فەرمان بێ یان نەهیکردن، تایبەت بێ یان گشتی، ئەمە سەبارەت بەو هەموولا

لەسەری کۆکن، بەڵام لە مەجازدا رای جیاواز هەیە سەبارەت بە گشتیبوون (عموم): هەندێ لە هاوەڵانی شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین رایان وایە مەجاز عمومی نیە، ئەم بۆچوونە لەلایەن زیاتر لە کەسێکەوە دراوەتە پاڵ شافیعی خۆی. بەڵام حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن پێیان وایە عمومی هەیە.

بەڵگەی ئەوەی وتویێتی مەجاز عمومی نیە ئەوەیە دەڵێ ئەسڵ لە قسەدا راستەقینەیە، لەبەرئەوەی لەفزەکان بۆ گەیاندن دانراون و مەجاز دەبێتە هۆی تێکدانی تێگەیشتن، بەڵام لە حاڵەتی زەرورەتدا دەبێ، ئەوەیش زەروری بێ بەبێ پێویستی دەستی بۆ نابرێ، لەبەرئەوەی زەرورەتیش بەئەندازەی خۆی وەردەگیرێ.[1]

بە دیدی من ئەم ئیستیدلالە بەنیسبەت شافیعیەوە لەگەڵ باوەڕی بە (عمومی مقتضی) تێکدەگیرێ، لەبەرئەوەی شاردنەوە (اضمار) لە ئیقتیزایشدا بۆ زەرورەتە و بەئەندازەی خۆی وەردەگیرێ.

ئەوانەی لەگەڵ گشتیبوونی مەجازن بەڵگەیان ئەوەیە دەڵێن مەجاز یەکێك لە دوو جۆرەکەی قسەیە. لەبەرئەوە لە (عموم) و (خصوص) و جگە لەو دوانەیشدا وەك حەقیقەت (راستەقینە) وایە، هەروەها لەبەرئەوەی عمومی حەقیقەت لەبەر ئیعتیباری مانای حەقیقەت نیە، چونکە ئەگەر وابوایە دەبوو حەقیقەت نەبوایە بەبێ ئەوەی گشتی بێ، واقیعیش پێچەوانەی ئەوەیە، بەڵکو عمومەکەی لەبەر بەڵگەیەکیترە کە ئاماژەی بۆ کردوە، وەك: ئەلیف و لام، هەروەها وەك نەکیرە لە سیاقی نەرێ و غەیری ئەو لە ئامرازەکانی عموم کە مەجاز و راستەقینە تێیدا یەکسانن، لەبەرئەوەی

---

[1] بڕوانە: التقرير والتحبير مع التحرير ٢/٣٥، كشف الأسرار مع البزدوي ٢/٣٦٠.

مەجاز خوازراوە تا جێی راستەقینە بگرێتەوە و کاری ئەو بکا، ئەوەیش بەبێ جێگیربوونی سیفەتی (عموم) بۆی وەك حەقیقەت بەدینایەت.[1]

ئەم ناکۆکیەیش کاریگەریی خۆی هەبووە لە جیاوازبوون لە هەندێ حوکمی فیقهیی کە لەوە بوونەتەوە، لەوانە جیاوازییان لە سووداریی هەندێ فرۆشتندا وەك فرۆشتنی مشتێك بە دوو مشت، سێوێك بە دوو سێو، کە ئەوەی لەگەڵ عمومی مەجازە رێگەی پێداوە و ئەوەیش وتویێتی مەجاز عمومی نیە، رێگەی پێنەداوە.

سەرچاوەی ناکۆکیەکە ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لا تبیعوا الطعام بالطعام إلا سواء بسواء)[2]، لەگەڵ ئەوەی ئەفەرموێ: (لا تبیعوا الدرهم بالدرهمین ولا الصاع بالصاعین).[3]

دەقی یەکەم بە گوزارە و گشتیبوونەکەی ئاماژەیە بەوەی فرۆشتنی خوراو (المطعوم) بە خوراو بە زیادەوە چ کەم بێ یان زۆر حەرامە، یەکسان بێ یان نایەکسان، لەبەرئەوەی وشەی (العام) ئەل-ی تەعریفی لەگەڵە و ئیستیغراق دەخوازێ، بەڵام (ئیستیسنا) لە زۆردا بەرهەڵستی کردوە، لەبەرئەوەی مەبەست لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەڵێ (سواء بسواء) بەئیجماع یەکسانییە لە زۆردا و لەوە بەدەر دەچێتە ژێر خانەی عموم و بۆ نموونە فرۆشتنی مشتێك بە مشتێك و بە دوو مشت، سێوێك بە سێوێك و بە دوو سێو حەرام دەبێ.

هەروەها ئەوە بەئاماژە دەخوازێ خواردن عیللە بێ، لەبەرئەوەی حوکم هەرکات لە ناوێکی داتاشراو کەوتەوە -کە لێرەدا خواردنە- لێوەرگیراوەکەی (مأخذ) عیللەی

---

[1] بڕوانە: کشف الأسرار مع البزدوی ٢/، ٣٦١ المغنی في أصول الفقه لعمر الخباز مخطوطة مكتبة الأوقاف العامة، التقریر والتحبیر مع التحریر ٢/، ٣٢ حاشیة الأزمیری ص ٤٤١ و پاشتر. أصول السرخسي ١/١٧٠.

[2] ورد هذا الحدیث بروایات مختلفة أخرجه ابن ماجة ٢/١٥ والبیهقي في السنن الكبری ٥/٣١٥-٣١٦ بروایة (لا تبیعوا الطعام بالطعام إلا كیلاً بكیل) ورواه مسلم بلفظ: الطعام بالطعام مثلا بمثل ١/ ٦٩٤-٦٥.

[3] وفي روایة مسلم: لا تبیعوا الدینار بالدینارین ولا الدرهم بالدرهمین صحیح مسلم ٣/٩، ١٢٠.

ئەو حوکمە دەبێ[1]، هاوشێوەی دزی (السرقه) لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا﴾ [2] الآية ، هەروەها زینا لە: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا﴾[3]، بەهەمان شێوە (الطعام)یش ناوە بۆ ئەو شتەی دەخورێ و لە خواردن داتاشراوە ئەویش خواردنە، ئەگەر دەرکەوت عیللەیە و ئیجماعیش هەیە لەسەر ئەوەی عیللە تەنها یەکێکە لە وەسفەکانی دەق، پێوانە (کەیل) بە عیللە دانانرێ و فرۆشتنی شتی نەخوراوی وەك گەچ و نورە و چیمەنتۆ بەزیادە حەرام نابێ لەبەر نەبوونی ئەو عیللەیەی حەرامکردنەکەی واجب کردوە، کە خواردنە.

دەقی دووەم (لا تبيعوا الدِّينارَ بالدِّينارينِ ولا الدِّرْهَمَ بالدِّرْهمينِ ولا الصَّاعَ بالصَّاعينِ)، بە گوزارە و عمومەکەی ئاماژەیە بەوەی سوو لە شتی نەخوراویشدا هەیە وەك گەچ و چیمەنتۆ، لەبەرئەوەی صاع بە لامی تەعریف رازێنراوەتەوە، هەربۆیە هەموو ئەو شتانەی پێی دەپێورێن لە خوراو و شتیتر دەگرێتەوە، بەوەیش فرۆشتنی گەچ و چیمەنتۆ بە زیادەوە حەرام دەبێ. بە ئاماژەکەی بەڵگەیە بۆ ئەوەی کەیلەکە عیللەتی حەرامکردنە لەبەرئەوەی لەو رووەوە مەبەست لە صاع ئەوەیە پێوانەی پێ دەکرێ، مانا یاخود تەقدیری قسەکە دەبێتە ئەوەی: نە ئەوەیش بە صاع دەپێورێ بەوەی بە دوو صاع دەپێورێ، یان نە پێوراو بە دوو پێوراو (مکیل)، ئەوەیش دروستیی فرۆشتنی مشتێك بە دوو مشت و سێوێك بە دوو سێو دەخوازێ لەبەر نەبوونی مانای پێوانە بەپێچەوانەی ئەوەی حەدیسی یەکەم دەیخوازێ، بەوەیش تێکگیران لەنێوان دوو حەدیسەکەدا رووی داوە و زانایان لە چۆنێتیی نەهێشتنیدا رای جیاوازیان هەیە.

---

[1] بڕوانە: التقرير والتحبير مع التحرير ٢/٢٣.

[2] الاية ٣٨/ المائدة.

[3] الاية ٢/ النور.

شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین رایان وایە صاع لە دەقی دووەمدا مەجازە و گوزارەیە بۆ ئەوەی دەچێتە ناوی و نزیکیەتی بە رێگەی لێنانی ناوی شوێن (المحل) لە حاڵ وەك لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾[1]، واتە نوێژ، لەبەرئەوە ناکرێ بە عومەکەی وەربگیرێ، لەبەرئەوەی عموم لە راستەقینەکاندا نەبێ نابێ، مەبەستیش خوراوی مەزەندەکراو بە دوو صاع بووە، بەم تەقدیرەیش دیلالەتێك نەماوە لەسەر حەرامیی فرۆشتنی جگە لە خوراو بەزیادەوە، یان لەسەر ئەوەی کەیلەکە عیللە بێ، بەوەیش حەدیسی دووەم لەگەڵ یەکەم رێك بوویەوە و هیچ تێکگیرانێك روونادات.

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن پێیان وایە حەدیسی یەکەم لەلایەن حەدیسی دووەمەوە بەرهەڵست کراوە ئەویش لەبەر گشتیبوونی مەجاز، ئەو تێکگیرانەیش بەوە دەبێ خواردن لە حەدیسی یەکەمدا بە خواردنی پێوانەکراو دابنرێ، بەوە دروستە مشتێك بە دوو مشت و سێوێك بە دوو سێوە بفرۆشرێ، بەم شێوەیە لەبەرئەوەی جائیزنەبوون بەبەدیهاتنی زیادەکە دەبێ ئەوەیش لە نەبوونی یەکسانیدا دەردەکەوێ و یەکسانی بە کەیلدا دەردەکەوێ، لە مشتێك و دوو مشتیشدا پێوانە نیە[2]، بەپێچەوانەی فرۆشتنی کەیلێك گەچ بە دوو کەیلی، کە ئەوە حەرامە لەبەر بوونی عیللە و زیاد و کەمی.

**٢- ویستنی لەگەڵ راستەقینە لە یەك لەفز و یەك حاڵەتدا:**

زانایان لە ئوسولناس و شەرعزان رایان جیاوازە لەبارەی دروستیی بەکارهێنانی یەك لەفز بۆ مەدلولە راستەقینە و مەدلولە مەجازیەکەی لە یەك کاتدا، حەنەفیەت و ئەهلی زمان بەگشتی و لێکۆڵەران لە هاوەڵانی شافیعی و موتەکەلیمان بەگشتی و

---

[1] الاعراف/٣١.

[2] بڕوانە: كشف الاسرار مع البزدوي ٣٦٠/٢، شرح فتح القدير لكمال بن الهمام ١٠/٧، التقرير والتحبير مع التحرير، سەرچاوەی پێشوو.

کۆمەڵێ لە موعتەزیلە پێیان وایە ئەوە ناکرێ، بەڵام شافیعی و هاوەڵانی بەگشتی و ئەهلی حەدیس و ئەبوعەلی جەبائی لە موعتەزیلە و عەبدولجەبار بن ئەحمەد لە موتەکەلیمان، رایان وایە بەرەهایی دەبێ.

غەزالی و ئەبولحوسێنی بەصری دەڵێن لەرووی ئەقلیەوە بەکارهێنانی لە هەردووکیاندا راستە نەك لەرووی زمانەوانیەوە، ئیبن هەمامیش ئەمەی هەڵبژاردوە[1] لە جگە لە تاکدا کە لەرووی زمانەوانیشەوە دروستە لەبەرئەوەی فرەیی تێدایە، هەرلایەکیش راکەی خۆی بە کۆمەڵێ بەڵگە پشتئەستور کردوە کە رەخنە و گفتوگۆ هەڵدەگرن، لەبەرئەوە لەترسی درێژکردنەوەی باسکردنیانم پشتگوێ خست.

**ئەم جیاوازییە هەندێ مەسەلەی فیقهیی خیلافی لێکەوتەوە، لەوانە:**

**أ- جیاوازی لە دەستنوێژشکان بەبەریەکەوتنی پێستی نێر و مێی نامەحرەم و بالْق.** ئەبوحەنیفە و ئەبویوسف و زوفر و ثوري و ئەوانەی هاورایانن دەڵێن دەستدان لە ئافرەت بە شەهوەت بێ یان بێ شەهوەت دەستنوێژ ناشکێنێ، ئەوە قسەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب و ئیبن عەباس و ئەبو موسا و حەسەن و عوبەیدە و شەعبییە.[2]

شافیعی و ئەوانەی هاورایین دەڵێن ئەگەر پیاو دەستی دا لە پێستی ئافرەت[3] دەستنوێژەکەی دەشکێ، جا دەستلێدانەکە بە شەهوەت بووبێ یان بەبێ شەهوەت.

هۆی ناکۆکیەکە ئەوەیە حەنەفیەت و ئەوانەی لەگەڵیانن دەڵێن مەبەست لە (الملامسة) لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿أو لمستم النساء﴾[4] جووتبوون (جیماع)ـە نەك دەست لێدان، لەبەرئەوەی هەموولا کۆکن لەسەر ئەوەی مەبەست جیماعە کە مانا مەجازیەکەیەتی، جا ئەگەر مەبەست مەجاز بێ راستەقینەکە دەچێتە لاوە و نابێ

---

[1] التحرير مع التقرير والتحبير ٢/٢٤.

[2] بروانە: تفسير ايات الأحكام مقرر للسنة الثانية جامعة الأزهر ١٣٧٣ هـ ١٩٥٣ م ص ١١٠.

[3] بلا حائل.

[4] المائدة/ ٦ النساء/ ٤٣.

هەردووكیان پێكەوە بویسترێن. بۆچوونەكەیشیان بـە هەنـدێ ئەسـەر[1] پشتئەسـتوور كـردوە، هـەروەها بـەوەی زاهـیری مـادەی (مفاعلـه) تایبەتـە بـەوەی فیعلەكـە لـە هەردوولاوە مەبەست بێ، ئەمەیش لە دەستلێداندا رووندادات، بەڵكو لە جیماعدا هەیە، هەروەها لەبەرئەوەی لەمس لە هەندێ ئایەتیتردا وەك كینایە بۆ جیماع بەكار هاتووە، لەوانە: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾.

شافیعی و ئەوانەی لەگەڵین دەڵێن لەمس لێرەدا بە مەجاز جووتبوون (وطء) و بە راستەقینە دەسـت لێـدان دەگرێتـەوە و لـەم دەقـەدا هـەردوو ماناكـە لـە یـەك كاتـدا ویستراوە.[2]

بەبڕوای من رای زاڵ ئەوەیە ئیمامی مالیك (رەحمەتی خوای لێبێ) بۆی چووە، ئەویش ئەوەیە دەستلێدان بە شەهوەت وەك چێژ لێبینین، دەستنوێژ شكاندن واجـب دەكـا. هۆی زاڵیشی ئەوەیە رایەكی مامناوەندە لەنێوان دوو راكەی پێشوودا، هەروەها لەگەڵ ئامانجەكانی شەریعەتی ئیسلامیدا رێك دەكەوێ، كە بریتییـە لـە قورسـنەكردنێكی وا زەحمەت دروست بكا، هەروەها ئاساننەكردنێكی وایش سنووری ئەرك ببەزێنێ.

**ب– جیاوازی را لەبارەی شمولكردنی كوڕەزاكان لە وەسێتكردندا بۆ كوڕەكان،**

ئەگەر كەسێك وەسێتی كرد سێیەكی ماڵەكەی بدرێتە منداڵانی فـلان، ئـەویش كـوڕ و كوڕەزای هەبوو، ئـەوەی رای وایـە دەكـرێ هـەردوو مانـا راسـتەقینە و مەجازیەكـەی بویسترێ گوتوێتی وەسێتەكە هەمووان دەگرێتەوە، ئەوەیش رای وایە ناكرێ هەردوو ماناكە بویسترێ، گوتـوێتی وەسـێتەكە تـەنها منداڵـەكانی دەگرێتـەوە، لەبەرئـەوەی مەبەست لەم لەفزە راستەقینەكە بووە و مانا مەجازیەكەیشی ناویسترێ.[3]

---

[1] وەك ئەو حەدیسەی عائیشە (رەزای خوای لێبێ) كە دەڵێ: پێغەمبەر ژنەكانی ماچ كرد و چـوو بـۆ نوێـژ و دەستنوێژی نەگرت. أخرجە أحمد.

[2] أسباب اختلاف الفقهاء للاستاذ الخفيف ص ٢٨ المهذب للشيرازي ٢٣/١.

[3] أصول السرخسي ١٧٣/١ التقرير والتحبير مع التحرير ٢٥/٢ و پاشتر.

**٣- وەرگرتنی لەفزەکە بەپێی راستەقینەی بنزاڵ (الحقیقة المرجوحة) یان لەسەر مەجازی زاڵ ئەگەر لەنێوانیاندا دەجولا:**

زانایان لە ئوسوڵناس و شەرعزان لەبارەی ئەمەیشەوە رایان جیاوازە، بەلای ئەبوحەنیفەوە بە راستەقینە وەردەگیرێ چونکە ئەوە ئەسڵە، ئەبویوسف و ئەوانەی لەگەڵین لەبەر زاڵبوونی دەڵێن بە مەجاز وەردەگیرێ، ئەمەیش قەرافی لە (شرح التنقیح)دا هەڵیبژاردوە لەبەرئەوەی بەزاهیر ئەوە داوا کراوە، هەندێ بۆ ئەوە چوون هەردووکیان یەکسانن لەبەرئەوە بەبێ بەڵگە بەلایەکیاندا نابرێ، چونکە هەر یەکێکیان لە روویەکەوە زاڵە.[1]

ئەم ناکۆکییە جیاوازی لە هەندێ مەسەلەی فیقهیدا لێ کەوتۆتەوە، لەوانە جیاوازی لەبارەی سوێندکەوتنی ئەو کەسەی بۆ نموونە سوێندی خواردوە کە ئاو لە دیجلە نەخواتەوە، ئەوەی مەجازی راجیحی پێش خستوە دەڵێ ئەگەر بە جامێك یان شتێکی لەو جۆرە لێی هەڵگوست و خواردیەوە، سوێندەکەی دەکەوێ، ئەمەیش رای ئەبویوسف و حەنبەلیەکان و ئەوانەیە هاوڕایانن[2]. ئەوەیش حەقیقەتی بنزاڵی پێش خستوە دەڵێ سوێندەکەی ناکەوێ تا هەڵینەلوشێ، ئەمەیش قسەی ئەبوحەنیفەیە.[3]

**٤- زانایان لەبارەی مەجازی زیادە و مەجازی نوقسان ئەگەر هاتوو قسەکە بەبێ یەکێکیان رێک نەدەبوو، جیاوازن:**

لەم خیلافە جیاوازی لە هەندێ مەسەلەی فیقهیش کەوتونەتەوە، لەوانە: ئەگەر پیاوێك بە هەردوو ژنەکەی گوت: ئەگەر کەوتنە حەیزێك تەڵاقتان کەوتبێ. جا لەو رووەوە بەشداربوونی هەردووکیان لە یەك حەیزدا مومکین نیە، لەبەرئەوە قسەکەی رێك نابێ بە دەعوای زیادە نەبێ ئەویش ئەوەیە دەڵێ (حەیزێك)، شەرعزان لەم

---

[1] بڕوانە: الأسنوي مع البدخشي ١/٣٧٨ القواعد لابن اللحام ص ١٢٤.

[2] القواعد لابن اللحام، سەرچاوەی پێشوو.

[3] الكشف مع البزدوي، سەرچاوەی پێشوو.

مەسەلەیەدا چوار رایان هەیە:

یەکەمیان، سلوکی زیادە، بەوەیش مانای قسەکە دەبێتە ئەوەی ئەگەر هەردووکتان کەوتنە حەیز ئەوە تەڵاق دراون. جا ئەگەر کەوتنە حەیز تەڵاق دەدرێن، ئەمەیش قسەی قازی ئەبو یەعلایە.

دووەم سلوکی نوقسان ئەویش شاردنەوەیە (الإضمار)ە، هەربۆیە هیچکامیان تەڵاق نادرێن تا هەریەکێکیان نەکەوێتە حەیزێك، ماناکەیش بەو شێوەیە دەبێ: ئەگەر هەریەکێکتان کەوتە حەیزێك ئەوا ئێوە تەڵاق دراون وەك لەوەی خوا ئەفەرموێ ﴿فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾ [1] واتە هەریەکەیان هەشتا جەڵدی لێ بدەن، ئەمەیش هەڵبژاردنی ئیبن قودامە خاوەنی (المغنی)یە و لەگەڵ رێساکەدا کۆکە.

سێیەم بەیەك حەیزی یەکێکیان تەڵاق دەدرێن لەبەرئەوەی کە نەکرێ لە هەردووکیانەوە بێ پێویستە بخرێتە پاڵ یەکێکیان.

چوارەم: بەهیچ شێوەیەك تەڵاق نادرێن، لەبەرئەوەی تەڵاقی هەڵواسراو بە مەحاڵدا ناکەوێ. ئەوەیش وەك ئیبن ئەللەحام باسی دەکا رای هەندێ لە حەنبەلیەکانە.[2]

هەندێ ئەحکامیتری مەجاز هەن رای جیاوازیان لەبارەوە هەیە و کۆمەڵێ مەسەلەی فیقهیی خیلافییان لێ کەوتۆتەوە، بەڵام ئیستیعابی هەمووی قورسە، ئەمە ئەگەر مەحاڵ نەبێ. پاشان ئێمە مەبەستمان لەم باسە خستنەرووی ئەوەیە دابەشبوونی لەفزەکان بۆ حەقیقەت (راستەقینە) و مەجاز هۆیەك بووە لە هۆکانی جیاوازیی شەرعزان لە حوکمە شەرعیەکاندا. لەبەرئەوە بەوەندە واز دێنین و ئەوەی دەیەوێ زانیاریی زیاتری دەست بکەوێ با بگەڕێتەوە بابەتە دوور و درێژەکانی ئوسوڵی فیقه و فیقه و رێسا فیقهیەکان.

---

[1] النور/٤.

[2] بڕوانە: القواعد لابن اللحام ص ١٢٥.

# باسی سێیەم:
# کینایە

کینایە، لەڕووی زمانەوانیەوە سەرچاوەیە، کە دەڵێین:(کنیت عن کذا) مەبەست ئەوەیە واتە بەڕاشکاوی نەمگوت. لە زاراوەی بەیانیەکاندا ئەوەیە بوترێ و مەبەست پێی لازمی مانا راستەقینەکەی بێ لەگەڵ شیانی ویستنی ماناکەیشی لەگەڵی[1]، وەك ئەوەی بوترێ: لەماڵی خالید پارە بەزۆری خەرج دەکرێ، وەك کینایە بۆ بەخشندەییەکەی، حەقیقەت و مەجاز بەرانبەرین و وەك هاوبەشکە (قسیم)یانە.

لە زاراوەی ئوسولناساندا ئەوەیە مەبەست لێی لە خۆیدا شاراوە بێ جا چ مەبەست تێیدا مانایەکی راستەقینە بێ یان مانایەکی مەجازی. بەرانبەرەکەی (صریح)ـە کە ئەوەیە مەبەست لێی لە خۆیدا ئاشکرا دەبێ، لێرەوەیە هەندێ لە ئوسولناساندا (مفسر) و (موحکەم)یان لە (صریح)، هەروەها (خفی) و (مجمل)یشیان لە کینایە داناوە.[2]

بەلای شەرعزانەوە کینایە بەرانبەر راشکاو (صریح)ـە نەك حەقیقەت و مەجاز، چونکە لەوانەیە لەگەڵیان کۆببێتەوە. عەبدولعەزیزی بوخاری دەڵێ: "ئەگەر لەفزەکە لە بابەتەکەیدا بەکارهاتبوو ئەوە یەکەم شت حەقیقەتە و مەجازیشە، هەردووکیشیان ئەگەر مەبەستەکە بەهۆی بەکارهێنانەوە دیار بوو ئەوە صەریحە ئەگینا کینایەیە".[3]

[1] الصاوي علی الدردیر ص ۱۷.
[2] التوضیح علی التنقیح مع الحواشي ۲۹٤/۱ الکشف مع البزدوي ۵۲۳/۲.
[3] کشف الاسرار مع البزدوي.

## بواری بەکارهێنانی کینایە لای شەرعزان:

ڕێسای باو لای شەرعزانی موسڵمان ئەوەیە هەر ڕەفتارێك کەسێك بەسەربەخۆ بیکا وەك تەڵاق و بەخشینی قەرز بە کینایە لەگەڵ نیەت دادەمەزرێ هاوشێوەی دامەزرانی بە (صریح). ئەوەیش بەسەربەخۆ نایکات و پێویستی بە ئیجاب و قبوڵ هەیە دوو جۆرە:

١- ئەوەی شایەتیدان مەرجە تێیدا وەك مارەبڕین و فرۆشتن لەلایەن بریکار (وەکیل)ەوە کە شایەتیدان تێیدا مەرجە، ئەمە بە کینایە دانامەزرێ، لەبەرئەوەی شایەتەکە نیەتەکە نازانێ.

٢- ئەوەی شایەتیدان تێیدا مەرج نیە، کە مەبەستەکەی هەڵپەسێران قبوڵ دەکا وەك خولع و بەلای جمهورەوە بە کینایە لەگەڵ نیەت دادەمەزرێ، یان قبوڵی ناکات وەك بەکرێدان و فرۆشتن و هیتر. لە دامەزرانی ئەو ڕەفتارانە بە کینایە دوو ڕووی هەیە، ڕاستترینیان دامەزرانە. پێوەری کینایەیش تێیاندا ئەوەیە هەر شتێك لە بابەکەیدا ڕاشکاو بێ و بەرکاربوونی لە بابەتەکەیدا بینرا، کینایەتەکەی لە غەیری خۆیدایە، بۆ نموونە وەك حەواڵە ئەگەر مەبەست لێی تەوکیل بێ.[1]

## کینایە لە تەڵاقدا:

لەو ڕووەوە تەڵاق لەو بابەتە فیقهیانەیە زۆرترین جار لەفزەکانی کینایەیان تێدا بەکار دێ، ئەوەم وەك نموونەیەك بۆ پیادەکردنە فیقهییە خیلافیەکان لە بابی کینایاتدا هەڵبژارد. دیدی زانایانی فیقهی لە حسابکردن بە کینایەکانی تەڵاق و لە دیاریکردنی پێوەرەکانیان و جیاکردنەوەیان لەنێوان ئەوان و ڕاشکاودا و لەو ئەنجامانەی لە بەکارهێنانیان دەکەونەوە، جیاوازە..

---

[1] بڕوانە: الأشباه والنظائر للسيوطي ص ٣١٨ و پاشتر.

**لەو مەسەلە جێناکۆکانەی لەم ئیعتیبارانەوە دەبنەوە ئەمانەن:**

١- دەستەواژەکانی سەرفرازی و جیابوونەوە (سراح و فراق) لای شافیعی بە راشکاو (صریح) حسێبن و بەبێ نیەت تەڵاقیان پێدەکەوێ، لای حەنەفیەت و ئەوانەی هاورایانن بە کینایات حسێبن و بەبێ نیەت تەڵاقیان پێ ناکەوێ.

٢- وەك بەرچاوم کەوت، لای حەنەفیەت و زاهیری قسەی ئیبازیەتدا حاڵەتی توورەیی و دوژمنایەتی و داواکردنی تەڵاق لە هەندێ شێوەدا پێویستیان بە نیەت نیە، لای حەنبەلیەکانیش بەپێچەوانەی باقیی شەرعزان بەشێوەیەکی رەهایی.

٣- ئەو لەفزەی ئامارە نیە بۆ تەڵاق و جیابوونەوە (وەك اسقینی)، بەلای مالیکیەوە بەنیەتەوە تەڵاقی پێدەکەوێ بەپێچەوانەی باقیی شەرعزان، لەبەرئەوەی مەرجی کینایە لای جمهور ئەوەیە لەفزەکە لە تەڵاق بچێ و لەکاتی بەکارهێنانیشیدا شیمانەی ئەوە هەڵبگرێ.

٤- ئەگەر وتی: عارەبانەکەت راکێشە (حبلك علی غاربك)، یان تۆ وەك مردوویت بەرەهایی سیانی پێدەکەوێ، ئەگەر یەکێکی بائینی وت لای مالیکی بۆ ژنێك سەرجێیی لەگەڵ کردبێ بە سیان حسێبە، بەڵام لای جمهور هیچ لەوانە زیاتر لە تەڵاقێکیان پێ ناکەوێ مەگەر خۆی نیەتی زیاتر لە یەکێکی هەبووبێ.

٥- ئەگەر لەفزێك لە تەڵاقدا بەناوبانگ بوو بەشێوەیەك جگە لەو هەڵنەگرێ، بەلای حەنەفیەت و حەنبەلیەکان و مالیکیەوە صەریحە و بەبێ نیەت تەڵاقی پێدەکەوێ، لای شافیعیەت بە کینایە دەمێنێتەوە، لای شیعەی ئیمامی و زاهیری نە صەریح و نە کینایەیە و بەهیچ شێوەیەك تەڵاقی پێناکەوێ.

٦- تەڵاقدان بە لەفزەکانی کینایە بەپێی رای راستی شافیعیەتدا ناکەوێ تا لەفزەکە لە سەرەتا تا کۆتای نیەتی لەگەڵ نەبێ، بەپێچەوانەی ئەوەی بەراوردی تەواو ناکاتە مەرج.

٧- نووسینی تەڵاق لای حەنەفیەت و حەنبەلیەکان بە صەریح دادەنرێ و تـەڵاقی پێدەکەوێ، بەڵام لای شیعەی ئیمامی و زاهیری و هەنـدێ لـە شـافیعی بـەهیچ شێوەیەك تەڵاقی پێناکەوێ. بەلای هەندێکیتر لەشافیعیەوە تەڵاقی پێدەکەوێ ئەگەر نیەتی هەبێ.

٨- بـەلای شـیعەی ئیمـامی و زاهیریـەوە تـەڵاق بـە لـەفزەکانی کینایـە بـەهیچ شێوەیەك ناکەوێ، جا چ نیەتی تەڵاقدانیان لەگەڵ بێ یان نا.

٩- ئەگەر بە سەرجێیی لەگەڵ کراو (مدخول بها) بڵێ: تۆ یـەکیت (أنـت واحـدة)، بەلای مالیکیەوە سیانی پێدەکەوێ جا چ نیەتی سێ بێ یان یەك، لە راسترین گوتەی حەنەفیەتیشدا یەك تەڵاقی رەجعی پێدەکەوێ با نیەتی زیاتریش بێ.

١٠- کینایەی دیار بەلای راسترین گوتەی حەنبەلیەکانەوە جیاواز لە شـەرعزانیتر سیانی پێ دەکەوێ، با نیەتیشی یەك دانە بێ.

ئەمـە هەنـدێ بـوو لـەو ئاسـەوارە خیلافیانـەی شـەرعزان کـە لـە جیاوازییـان لـە کینایەتەکانی تەڵاق کەوتونەتەوە.[١]

## زاڵکردن:

رای زاڵ بەلای منەوە ئەوەیە پێویستە عـورف پێـوەر بـێ لـە دانـانی لـەفزێك بـە صـەریح یـان کینایـە جـا چ گشـتی بـێ یـان تایبـەت، عـورفیش لـە زەمانێکـەوە بـۆ زەمانێکیتر و لە جێیەکەوە بۆ جێیەکیتر جیاوازە، زۆربەی لەفزەکانی کینایەیەکانیش وەك: (برية، خلية، بتة، حبلك على غاربك، أنت كالـدم) چـەندین سـەدەیان بەسـەردا تێپەڕیوە و دروست نیە موفتی لەم سەردەمەماندا فتوایان پـێ بـدات مەگـەر بـۆ ئـەو

---

[١] بڕوانە: الشرح الصغير مع بلغة السالك في الفقة المالكي ١/ ٤٢٥ و پاشتر. نيل المارب في الفقه الحنبلي ٢م ٩٣ و پاشتر. شرح فتح القدير ٣/٤ و پاشتر. الدر المختار مع حاشية ابن عابدين ٣/٣٠٢-٣٠٣ بدائع الصنائع ١٠٦/٣ و پاشتر. المهذب لابي اسحاق الشيرازي في الفقه الشافعي ٨٢/٢ الخلاف للطوسي في فقه الشيعة الأمامية ٢٣١/٢ المحلى لابن حزم الظاهري ١٨٥/١٠ و پاشتر. شمس الأصول في المذهب الإباضي ٢٥٣/١-٢٥٤.

کەسەی ماناکانیان بزانێ و عورفیش لە کارپێکردنیان لە تەڵاقداندا بەردەوام بوو، چونکە ئەمڕۆ ئێمە کەسێك نادۆزینەوە بەو لەفزە بەسەرچووانە  کە ناویان مەگەر لە سکی کتێبەکاندا مابێ، ژنەکەی تەڵاق بدات. پاشان دەبێ ڕەچاوی بوونی پەیوەندی لەنێوان تەڵاق و (فیراق) و ئەو لەفزەی تێیدا بەکار دێ، بکرێ. باسکردن لەوەی هەرکەس بە ژنەکەی بڵێ (ئاوم بدەرێ) و مەبەستی تەلاق بێ، تەڵاقەکەی پێی دەکەوێ مەنتیقی شەریعەتی ئیسلامی قبوڵی ناکا.

# دەروازەی دووەم

## جیاوازیی شەرعزان بەهۆی جیاوازییان لەبارەی سوننە

ئەو هۆیانەی لە دەروازەی یەکەمدا باسمان کردن لە جیاوازی لە ڕێسا ئوسولّی و زمانەوانیەکانی وەك تایبەت و گشتی و هاوبەش و نەص و زاهیر و موجمەل و حەقیقەت و مەجاز و هیتر قورئانی پیرۆز و سوننە، تا رادەیەکی زۆر وەك یەك تێیاندا هاوبەشن.

بەلاّم ئەو هۆیانەی جیاوازیی شەرعزان کە لەم دەروازەیەدا هاتوون تایبەتن بە سوننە و لەو چوارچێوەیەدا قەتیس دەبێ و سەرچاوەی یەکەمی تێدا نیە.

جیاوازی لە ئەحکام بەهۆی سوننەوە بۆ خودی سوننە ناگەڕێتەوە، واتە لەو رووەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە، ئەویش لەبەرئەوەی ئوممەتی ئیسلامی کۆدەنگە لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) لە قسە و کردار و پەسەندکردنەکانی لەوەی تایبەتە بە یاسادانان، هەروەها لەبەر کۆکبوونیان لەسەر ئەوەی سوننە سەرچاوەی دووەمە پاش قورئانی پیرۆز بۆ هەلّێنجانی ئەحکامی شەرعی، تاقمێکی شاز نەبێ کەس لەمە دەرنەچووە، ئەوانەیش وەك نەبوو حسابیان بۆ دەکرێ.

هیچ پێشەوایەکی موسلّمان نەیدرکاندوە کە لە هیچ شتێکدا سەرپێچی پێغەمبەری کردوە.

عوزری شەرعزان لە کارنەکردن بە سوننەتێك لە سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەگەڕێتەوە بۆ:

أ- یان لەبەر ئەوە بووە قەناعەتی نەبووە کە ئەوەی پێی گەیشتووە هی پێغەمبەرە، لەبەرئەوە هەندێ لە شەرعزان بەکۆمەلّێ مەرجی تایبەت نەبێ کاریان بە هەندێ حەدیس نەکردوە.

ب- یان ئەوەتا حەدیسەکەی پێ نەگەیشتوە، یان پێی گەیشتوە و لەیادی کردوە، هەربۆیە لە بابەتێکدا بەگوێرەی دەلیلێکیتر قسەی کردوە کە دەشێ لەگەڵ ئەو حەدیسە کۆك یان ناکۆك بێ.

ج- یان ئەوەتا باوەڕی وانەبووە ئەو حەیسە مەبەستی ئەو مەسەلەیەیە، ئەویش لەبەرئەوەی پێی وابووە دیلالەتەکەی شتێك بەرهەڵستی کردوە کە بەلگەیە لەسەر ئەوەی ئەوە مەبەست نیە، وەك بەرهەڵستیی گشتی بە تایبەت، یان رەها بە بەند، یان فەرمانی رەها بەوەی واجیبوون رەت دەکاتەوە، یان حەقیقەت بەوەی ئاماژەیە بۆ مەجاز و بەو شێوەیە.[1]

د- یان لەبەرئەوەی بەرهەڵستی کراوە بەشتێك کە بەلگەیە لەسەر لاوازی یان نەسخکردنەوە یان تەئویلکردنی ئەگەر تەئویلی قبوڵ دەکرد، یان هەر هۆیەکیتر.

سەرچاوەی هەموو ئەمانە ئەوەیە سوننە جیایە لە قورئانی پیرۆز لەوەدا قورئان بەشێوەی جەمینە (تواتر) پێمان گەیشتوە، بەڵام سوننە ئەندازەیەکی کەمی نەبێ بە جەمینە پێمان نەگەیشتوە، ئەوەیش وای کردوە بەسەر چەندین پلەدا دابەش بێ لەڕووی بەهێزی و لاوازییەوە بەگوێرەی دابەشبوونیان بەپێی خود، یان بەپێی بەردەوامی یان پچڕانیان یان پێگەکەیان کە کراوەتە حوججە تێیدا، یان بەرهەڵستیکردنیان.

لەبەرئەوە ئەم دەروازەیە بۆ چوار بەش دابەش دەکەین:

یەکەمیان لەبارەی حەقیقەتی سوننە و بەشەکانی بەگوێرەی خود و پێگە و گرنگی لە شەریعەتی ئیسلامیدا. دووەمیان تایبەتە بە ئاستەکانی گەیشتنی سوننە بەئێمە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) و جیاوازیی شەرعزان لە کارکردن بەو ئاستانە بەهەندێ مەرجی تایبەت.

---

[1] بروانە: رفع الملام من الأئمة الاعلام لابن تيمية ص ١١.

سێیەم لە سوننەدایە لەڕووی بەردەوام نەبوونی و ئەو جیاوازیەی بەهۆیەوە لەنێو شەرعزاندا پەیدا بووە و سەربەخۆبوونی هەریەکەیان بە هەندێ مەرجی دیاریکراو بۆ کارپێکردنیان.

چوارەمیشیان تایبەتە بە جیاوازبوون بەهۆی گەیشتنی حەدیس بە هەندێك و نەگەیشتنی بە هەندێکیتر، یان بەهۆی جیاوازییان لە تێگەیشتن لە مەبەستی حەدیس، یان بەهۆی تێکگیرانی زاهیری ئەسەرەکان و جیاوازییان لە چۆنێتیی نەهێشتنیدا.

# بەشی یەکەم:
# حەقیقەتی سوننە و بەشەکانی

بەگوێرەی خود و پێگە و گرنگیەکەی
که سێ باس لەخۆ دەگرێ:

## باسی یەکەم:
## سوننە و بەشەکانی

سوننە (السنة): لەڕووی زمانەوانیەوە بریتییە لە ڕێگەی باو، جا باش بێ یان خراپ.[1]

لە زاراوەی ئوسوڵناساندا بریتییە لە هەموو ئەوەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەرچووە لە قسە یان کردەوە یان پەسەندکردن (تقریر)، لەو ڕووەوە یەکێکە لە سەرچاوەکانی یاساداناني ئیسلامی.[2]

لای شیعەی ئیمامی ئەوەیە لە مەعسوم دەرچووە قسە یان کردەوە یان پەسەندکردن، بۆیە هی پێغەمبەر(ﷺ) و هی ئەو ئیمامانەیش دەگرێتەوە کە لای ئەوان مەعسومن.[1]

---

[1] بەم مانایە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە وەك ئەوەی ئەفەرموێ: (وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَى وَيَسْتَغْفِرُوا رَبَّهُمْ إِلَّا أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ الْأَوَّلِينَ) سورة الكهف/٥٥ أي ما كان عليه الأولون من العمل وفي الحديث الشريف: من سن في الأسلام سنة حسنة فله أجرها وأجر من عمل بها إلى يوم القيامة ومن سن سنة سيئة كان عليه وزرها ووزر من عمل بها إلى يوم القيامة، صحيح مسلم/ ٧٠٥.

[2] بڕوانە: السعد على التوضيح على التنقيح مع الحواشي ٢/٢٤٢.

## بەشەکانی سوننە لەڕووی خودی خۆیەوە:

سوننە لەڕووی خودەوە بۆ گوفتاری و کرداری و پەسەندکردن دابەش دەبێ:

سوننەی گوفتاری (السنة القولية): ئەو حەدیسانەیە پێغەمبەر(ﷺ) لە بۆنەی جیاوازدا وتونی، وەك ئەوەی فەرمویەتی: (رفع عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه)[2]، (لا نكاح إلا بشاهدي عدلٍ وولي مرشد)[3]، (البينة على المدعي واليمين على من أنكره)،[4]، ئەمانە و باقیی سوننەتە گوفتاریەکانی کە بوارە جیاجیاکانی ژیانیان گرتۆتەوە.

سەرجەم ئەو ڕێسا ئوسولّی و زمانەوانیانەی لە دەروازەی یەکەمدا روون کرانەوە، هاوشێوەی قورئانی پیرۆز لەسەر سوننەی گوفتاری جێبەجێ دەکرێن.

سوننەی کرداری (السنة الفعلية): بریتییە لە کارەکانی تایبەت بە نوێژکردن و زەکاتدان و جێبەجێکردنی ڕێوڕەسمەکانی حەج و قەزا بەیەك شایەت و سوێندخواردنی داواکار (مدعي) و باقی ئەو کارانەیتر کە بەناونیشانی پێغەمبەر(ﷺ) کردونی.

**هەرچی کارەکانیەتی بەگشتی دەکرێ بکرێنە چەند جۆرێك:**

١- ئەوانەی وەك مرۆڤێك کردونی لە خواردن و خواردنەوە و خەوتن و پۆشین، بەلای جمهورەوە[5] ئەمانە سەرمەشق نین، لەبەرئەوەی دیلالەتن بۆ ڕێپێدان (ئیباحە)، باقلانی لە کۆمەڵێکی گواستۆتەوە کە پێخۆش (مەندوب)ن.

---

[1] أصول الاستنباط ص ١٢.

[2] أخرجه ابن ماجه وابن حبان وغيرهما وهو حديث صحيح كما قال أهل العلم، وقد ورد بألفاظ متقاربة منها: إن الله تجاوز عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه.

[3] رواه الإمام أحمد / كشاف القناع٥/٥٤: خلاصة حكم المحدث: أصح شيء في هذا قول ابن عباس

[4] رواه البيهقي بإسناد صحيح سبل السلام ١٣٢/٤.

[5] الأسنوي مع البدخشي ١٩٨/٢ إرشاد الفحول ٣٥.

٢- ئەوەی تایبەتە بە کەسی خۆی، وەك زیاتر لە چوار ژن و تهجد بەشەو، ئەم جۆرە تایبەتە کەس هاوبەشی نیە تێیدا، مەگەر پێغەمبەر خۆی روونـی بکاتـەوە کـە بـۆ ئێمە واجب یان مەندوبە، ئەوکاتە کردنی لەلایەن ئێمـەوە لەبـەر قسـەکەی ئـەوە، نەك لەبەرئەوەی واجب بێ لەسەرمان.

٣- ئەوەی واناسراوە روونکردنەوەی دەقێکە لە دەقەکانی قورئانی پیرۆز، ئەم جۆرە هەموولا کۆکن لەسەر ئـەوەی بەڵگەیـە و حوکمیشـی حـوکمی روونکراوەکەیـە لـە واجببوون و نەدب و ئیباحە، وەك ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: (صـلوا کمـا رأیتمـوني أصـلي)[1] وەك روونکردنـەوەی ئەوەیـە خـوا ئەفـەرموێ ﴿وَأَقِيمُـواْ الصَّلاَةَ﴾، هەروەها کە ئایەتی ﴿وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ﴾ روون دەکاتەوە.

٤- ئەوەی وەك روونکردنەوە نەهاتووە، بەڵکو وەك سەرەتا هـاتووە و سـیفەتەکەی[2] بـۆ ئـەو زانـراوە لـە واجببـوون یـان نـەدب یـان ئیباحـەی روونکردنـەوەی یـان قەرینەیـەك[3]، لەوەیشـدا چـەند رایـەکی جیـاواز هەیـە: لەوانـە ئوممەتەکـەی لـەو کردەوەیەدا وەك ئەون مەگەر بەڵگەیەك هەبێ ئاماژە بێ بۆ ئەوەی تایبەتە بـەو[4]. هەروەها لەوانە: ئوممەتەکەی لە عیبادەتەکانـدا نـەك شـتیتر وەك ئـەون، دیسـان لەوانە وەستان (التوقف).

٥- ئەوەی بە روونکردنەوە نەهاتبێ و سیفەتی بۆ ئەو نـەزانرابێ و مەبەسـتی نزیکـی تێدا دەربکەوێ، زانایان لەم بارەوە چوار رای جیاوازیان هەیە:

أ- بۆ واجببوونـە مەگـەر بەڵگـە لەسـەر شـتێکیتر هـەبێ، ئەمـە رای کۆمـەڵێ لـە موعتەزیلـە و ئـیبن شـورەیح و ئەبوسـەعیدی ئەسـتەخری و ئـیبن خـیران و

---

[1] رواه مسلم، سبل السلام ١/١٧٠.
[2] مثل صلاة الرواتب.
[3] الأسنوي مع البدخشي ٢/١٩٨.
[4] اللمع لأبي اسحاق الشيرازي ص ٣٧. الأسنوي مع البدخشي ٢/١٩٨. إرشاد الفحل ص ٣٦.

ئەبوهورەیرەیە. قەڕاڤ لە ئیمام مالیکی گوێزاوەتەوە، هەروەها ئیبن خویز منداديش لێیەوە گێڕاوەتەوە.[1]

ب- بۆ نەدبە: جوێنی لە (البرهان)دا دەڵێ[2]: لە قسەی شافیعیدا هی وا هەیە بەڵگەیە لەسەری، رازی لە (المحصول)دا دەڵێ[3]: ئەم قسەیە دراوەتە پاڵ شافیعی. زەرکەشی لە (البحر)دا باسی ئەوە دەکا لە قەفال و ئەبوحامیدی مروزی گێڕاوەتەوە، زاهیریش دەستی بەوەوە گرتوە[4].

ج- بۆ ئیباحەیە: رازی لە (المحصول)دا دەڵێ مالیك ئەوەی گوتوە، جوێنی باسی ئیباحەی نەکردوە.

د- وەستان (التوقف): رازی لە (المحصول)دا دەڵێ ئەوە قسەی صەیرەفی و زۆربەی موعتەزیلەیە، شەوکانی دەڵێ ئەبوئیسحاق لە زۆربەی هاوەڵانی شافیعی گێڕاوەتەوە.

٦- ئەوەی بە روونکردنەوە نەهاتبێ و سیفەتەکەی بۆ ئەو (واتە پێغەمبەر ﷺ) نەزانرێ و مەبەستی نزیکی (قصد القربة) تێدا دەرنەکەوێ، ئەم بەشەیش چوار رای جیاوازی لەسەرە[5]:

أ- واجبە لەسەرمان، ئەمە لە ئیبن سەریحەوە ریوایەت کراوە، هەروەها تەبەری و ئەبوسەعیدی ئەستەخری و زۆربەی پاشینانی شافیعی گوتویانە. سەلیمی رازی دەڵێ ئەوە زاهیری مەزەبی شافیعییە.

ب- مەندوبە، ئەوەیش قسەی زۆربەی حەنەفی و موعتەزیلەیە[1]، بەیزاوی دەڵێ: ئەوە قسەی شافیعییە[2].

---

[1] مفتاح الوصول للتلمساني ص ١٢١.

[2] مخطوطة المكتبة المركزية بغداد.

[3] مخطوطة دار الكتب المصرية.

[4] إرشاد الفحول ص ٣٧ الأحكام لابن حزم ١/ ١٣٩

[5] إرشاد الفحول ص ٣٨.

ج- موباحە، بەدوسی لە (التقویم)دا[3] لە ئەبوبەکری رازی (ئەلجەصاص)ی گواستۆتەوە. گوتویەتی ئەوە راستەکەیە، جوێنیش لە (البرهان)دا[4] هەڵیبژاردوە. بەیزاوی دەڵێ ئەوە قسەی مالیکە[5]، ئەوە لای حەنبەلیەکان[6] راجیحە و ئەبوئیسحاقی شیرازی[7] هەڵیبژاردوە.

د- وەستان تا بەڵگە پەیدا دەبێ: ئیبن سەمعانی لە زۆربەی ئەشعەریەکانی گواستۆتەوە، دەڵێ دەقاق هەڵیبژاردوە. لە ئیمام ئەحمەد شتێك ریوایەت کراوە بەڵگەیە لەسەری، ئەوە قسەی ئەبوبەکری صەیرەفی و موختاری بەیزاوییە[8]..

خاوەنی هەریەك لەم بۆچوونانە کۆمەڵێ بەڵگە بۆ خۆیان دێننە، کە لەبەر درێژنەکردنەوە لێرەدا نەمخستنە روو.

## زاڵکردن:

بەڕای من رای زاڵ ئەوەیە هەر شتێك پێغەمبەر(ﷺ) وەك مرۆڤێك نەك وەك پێغەمبەرێك ئەنجامی دابێ بە موباح بۆ خۆی و ئوممەتەکەی دادەنرێ و چاولێکردنی (موستەحەب)ـە، هەرچیش دەربکەوێ لە شتە تایبەتەکانی خۆیەتی بە بەڵگە نەبێ چاوی لێناکەین، هەرچی ئەوەیش روونکردنەوەیە حوکمی روونکراوەکەی دەبێ، جگە

---

[1] بروانە: منهاج البیضاوي، مع الأسنوي والبدخشي ٢/١٩٧ اللمع لأبي أسحاق الشیرازي ص ٣٧ إرشاد الفحول للشوکاني ص ٣٨.

[2] البیضاوي مع الأسنوي والبدخشي، سەرچاوەی پێشوو.

[3] مخطوطة دار الکتب المصریة القاهرة.

[4] مخطوطة المکتبة المرکزیة بغداد.

[5] البیضاوي مع الأسنوي والبدخشي، سەرچاوەی پێشوو.

[6] المسودة في أصول الفقه الحنبلي ص ٦٧.

[7] اللمع للشیرازي ص ٣٧.

[8] البیضاوي المرجع السابق المسودة، سەرچاوەی پێشوو.

لەوانە پێویستە کردنەکەی بە نەدب وەربگیرێ ئەگەر قەرینەیەك نەبوو بیگۆڕێ بۆ واجبکردن لەبەرئەوەی هەرشتێك وەك پێغەمبەرێك کردبێتی بە موباح وەرناگیرێ لەبەر بوونی بەر لە تەشریع، هەروەها بەبێ قەرینە یان روونکردنەوە بە واجبیش وەرناگیرێ، لەبەرئەوەی ناکرێ سیفەتی واجببوونەکە لای هاوەڵانی نەزانراو بووبێ تا پاش مردنی تا ببێتە مایەی ناکۆکیی نێوان ئوسوڵناس و شەرعزان، چونکە ئەوە لەگەڵ ئەرکی پەیامەکە و پێویستیی گەیاندنی شەریعەتی خوادا لێك دەدا.

**کاریگەریی ئەم ناکۆکیانە لە مەسەلە فەرعیەکاندا[1]:**

جیاوازی لەبارەی حوکمی قوربانی. کۆمەڵێ رایان وایە واجبە، کە ئەوە قسەی رەبیعە و مالیکە لە ریوایەتێك لێیەوە، هەروەها رای ئەوزاعی و لیث بن سەعد و زوفر و حەسەن و هەردوو هاوەڵەکەی ئەبوحەنیفەیە لە یەکێك لە دوو ریوایەت لێیانەوە.[2]

ئەبوحەنیفە وردکردنەوەیەکی لەوەدا هەیە و دەڵێ: ئەگەر نیصابی لەگەڵ بوو لەسەری واجب دەبێ، ئەگەر نیصابی لەگەڵ نەبوو لەسەری واجب نابێ، لای ئەوان لەسەر نیشتەجێ واجبە و لەسەر رێبوار واجب نیە و ئەگەر کاتەکەی تێپەڕی قەزاکردنەوەی واجب نیە.[3]

جمهور رایان وایە (سوننەی موئەکەدە)یە بۆ ئەو کەسەی بتوانێ بیکا، لە هاوەڵان ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و ئیبن مەسعود و ئیبن عەباس و ئیبن عومەر ئەمەیان گوتوە. لە شوێنکەوتوان (تابیعین) عەتار و عەلقەمە، هەریەك لە شافیعی[4] و ئەحمەد

---

[1] محل الخلاف: ئەو کارەیە خوڵق (جبلي) نەبێ و تایبەت نەبێ بەو، هەروەها روونکردنەوە کە مەشروعیەتەکەی نەسەلمابێ و حوکمەکەی بەر لەوە نەزانرابێ.

[2] فتح القدير ٥٠٦/٩ و پاشتر. بداية المجتهد ٤١٥/١.

[3] فتح القدير، سەرچاوەی پێشوو.

[4] المهذب للشيرازي ٢٣٧/١.

بن حەنبەل[1] رایان وابووە. تەحاوی دەڵێ ئەوە قسەی ئەبویوسف و محەمەدە[2]. ئەوە لە مەزەبی مالیکدا[3] بەناوبانگە، هەروەها ئەوە رای شیعەی ئیمامیشە[4].

هۆی جیاوازیەکەیشیان جیاوازییانە لەوەی ئاخۆ کردەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە قوربانیکردندا بە واجب وەردەگیرێ یان بە نەدب، لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) وەك لێی دەگێڕنەوە قەت وازی لە قوربانی نەهێناوە، تەنانەت لە سەفەریشدا[5].

جا ئەوەی کردەوەکەی پێغەمبەری بە واجب وەرگرتوە گوتویێتی قوربانیکردن واجبە، ئەوەیش بە نەدب وەریگرتوە گوتویێتی سوننەی موئەکەدەیە لەبەر بەردەوامبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری.

## سوننەتی پەسەندکردن (السنة التقريرية):

بریتییە لە بێدەنگبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەو قسە و کردارانەی لە هاوەڵانیەوە دەرچوون جا چ کردنەکە بەحزوری خۆی بووبێ یان لە غیابیدا و پاشان پێی گەیشتبێتەوە، چونکە ئەو بۆ روونکردنەوەی شەریعەت و بەتاڵکردنەوەی ئەوەی پێچەوانەیەتی هاتووە، لەبەرئەوە بێدەنگبوونی لە رەتکردنەوەی دانپێدانان و پەسەندکردنی ئەو کردار یان گوفتارە و بەڵگەی دروستبوونیەتی.

نموونە لەسەر ئەوەی لە غیابی ئەودا کراوە و ئیقراری کردوە ئەوەیە هاوەڵەکانی کە لە شەڕی بەنی قورەیزەدا یاوەری بوون، پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) گوتی (لا يصلين أحد إلا في نبي قريظة) لەنێو خۆیاندا پەرت بوون: هەندێکیان نەهیکردنەکەیان بە مانا راستەقینەکەی وەرگرت و لەکاتی خۆیدا نوێژیان نەکرد، هەندێکیشیان وای لێ

---

[1] نيل المارب بشرح دليل الطالب ١/١١٢.

[2] فتح القدير مع الهداية، سەرچاوەی پێشوو.

[3] بلغة السالك ١/٢٨٦.

[4] الخلاف للطوسي ٢/٥٢٦.

[5] بداية المجتهد ١/٣٤٧-٣٤٨.

تێگەیشتن کە مەبەست پەلەکردن و دوانەکەوتنە لە هێرشکردنە سەر دوژمن، لەبەرئەوە لەکاتی خۆیدا کردیان، کاتێ هەواڵەکەی پێ گەیشتەوە هەردووکیانی پەسەند کرد.

لەو مەسەلە خیلافیانەی لە ناکۆکی لەبارەی سوننەتی تەقریری کەوتونەتەوە ئەمانەن:

لە عەمری کوڕی عاص-ەوە دەگێڕنەوە گوتویەتی: لە شەوێکی سارددا لە غەزوەی (ذات السلاسل)[1] ترسام ئەگەر خۆم بشۆم بفەوتێم، بۆیە تەیەمومم کرد و نوێژی بەیانیم بۆ هاوەڵانم کرد، ئەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرا، فەرموی: ئەی عەمر بە لەشپیسی نوێژت بۆ هەواڵانت کرد، وتم: گوتەی خوام بیست کە فەرمویەتی (ولا تقتلوا أنفسكم إن الله كان بكم رحيما)[2]، پێغەمبەریش رەخنەی لێ نەگرت.

لەبەرئەوە جمهور رایان وایە تەیەمومکردن لەکاتی بوونی ئاودا دروستە ئەگەر کەسەکە لەبەر زۆر ساردیی ئاوەکە لە بەکارهێنانی دەترسا، زۆربەیشیان پشتیان بە ئیقرارەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ عەمری کوڕی عاص بەستوە، هەندێکیشیان قیاسیان لەسەر نەخۆش کردوە[3].

حەنەفیەت دەڵێ: لەبەر زۆر ساردیی ئاو تەیەموم ناکرێ مەگەر تووشی قەومانی گەورە (الحدث الاكبر) (مەبەست لەشپیسییە) بووبێ، چونکە ئەو ئەوەی تێدا چاوەڕوان دەکرێ، هەرچی ئەوەیە تووشی قەومانی بچوک (الحدث الاصغر) (مەبەست دەستنوێژشکانە) بووبێ، تەیەموم ناکا مەگەر لە زیانپێگەیشتن دڵنیا بێ.[4]

---

[1] المهذب للشيرازي ٣٥/١.

[2] النساء/٢٩.

[3] المجموع للنووي ٢٨٩/٢.

[4] الهداية مع فتح القدير ١٢٤/١ غير أنها لم يتفقوا على ذلك أيضاً.

شافیعی[1] و مالیکی[2] و حەنبەلی[3] و شیعی ئیمامی[4] دەڵێن بەرەهایی بۆی هەیە تەیەموم بکا، ئەگەر لەبەر زۆر ساردی لە بەکارهێنانی ئاو ترسا.

کۆمەڵێ زانا لەوانە حەسەنی بەصری و عەتا بن ئەبی رەباح رایان وایە ئەوەی ئاوی دەست بکەوێ دروست نیە تەیەموم بکا(٥)، ئەویش لە روانگەی دەستگرتن بە زاهیری ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مِّنكُم مِّن الْغَآئِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء﴾(٦). بەڵگەبوونی ئەمەیش لەو رووەوەیە ئایەتەکە عوزرەکانی تەیەمومی دیاری کردوە، کە ترس لەبەکارهێنانی ئاو لەبەر زۆر ساردی تێدا نیە.

هۆی جیاوازیشیان، جیاوازییانە لە دەستگرتن بە سوننەی تەقریرییەوە لە چیرۆکەکەی عەمری کوڕی عاصدا، کە حەنەفیەت کاری پێکردوە بە لەبەرچاوگرتنی بوونی قەومانی گەورە لەبەرئەوەی عەمری کوڕی عاص لە قەومانی گەورەدا بووە.

جمهور هەلومەرجی رووداوەکەیان لەبەرچاو نەگرتوە لەوەی کە ئاخۆ تەیەمومکارەکە قەومانی گەورەی هەیە یان نا، بەڵکو بەرەهایی بۆ قەومانی گەورە و بچوك رێگەیان پێداوە، ئەویش لەبەر جیانەکردنەوەیان.

هەندێ شەرعزان دەستیان بە زاهیری ئایەتی تەیەمومەوە گرتوە و کاریان بەم سوننەتە تەقریرییە نەکردوە.

بە دیدی من ئایەتەکە بەڕوونی سەفەری بە عوزرێکی رەها لە عوزرەکانی تەیەمومکردن داناوە.

---

[1] المهذب للشيرازي ٣٥/١.

[2] بلغة السالك ٦٣/١.

[3] نيل المارب ١٢٦/١.

[4] الخلاف للطوسي ٣٨/١.

[5] المجموع للنووي ٢٨٩/٢ بداية المجتهد ٦٤/١.

[6] النساء/٤٣.

## باسی دووەم:
# پێگە و گرنگیی سوننە

موسڵمانان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی سوننە بنەمایەکە لە بنەماکانی شەریعەت و پاش قورئانی پیرۆز بە پلەی دووەم دێ لە سەرچاوەبوونی بۆ ئەحکامی شەریعەت، لەوەیشدا بە قورئانی پیرۆز و سوننە و ئیجماع و ماقووڵ، پشتئەستوورن.

١- کیتاب (قورئان):

خوای گەورە لە زۆرئایەتدا گوێڕایەڵیکردنی پێغەمبەرەکەی فەرز کردوە، لەوانە: {قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ }[1]، {وَمَا أَرْسَلْنَا من رَّسُولٍ إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللّهِ}[2]. {مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللّهَ}[3]. { وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ }[4]. { وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالاً مُّبِيناً}[5]. { وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا }[6].

ئەمانە و زۆر ئایەتیتری لەم جۆرە کە بەڵگەن لەسەر حوججیەتی سوننە و لەسەر ئەوەی سەرچاوەیەکە بۆ ئەحکامی شەرعی.

٢- سوننە:

أ–عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله (ﷺ): من أحدث في أمرنا هذا ما

---

[1] آل عمران/٣١.
[2] النساء/٦٤.
[3] النساء/٨٠.
[4] النحل/٤٤.
[5] الأحزاب/٣٦.
[6] الحشر/٧

ليسذ منه فهو رد.[1]

ب‌—عن عبد الله بن عمر (ﷺ) قال رسول الله (ﷺ): لا يؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعا لما جئت به[2].

ئەمانە و زۆر حەدیسیتر کە جەخت لەوە دەکەن سوننە پاش قورئانی پیرۆز سەرچاوەیەکە بۆ ئەحکامی شەرعی.

٣- ئیجماع:

هاوەڵان لە ژیانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆك بوون و پاش وەفاتیشی کۆدەنگ بوون لەسەر پابەندبوون بە کارکردن بە سوننەتەکەی و گوێڕایەڵیکردنی لەوەی داوەری تێدا کردوە یان فتوای داوە لەوەی لە قورئاندا نیە، ئەگەر حوکمی شتێکیان لە قورئانی پیرۆزدا نەدۆزیایەتەوە بۆ سوننە دەگەڕانەوە.

٤- ماقول:

هەرکەس ژیری یان فامی هەبێ دەزانێ هەرکەس پێغەمبەرایەتیەکەی سەلمابێ، ئەوا لەوەی دەیڵێ ڕاست دەکات و شوێنکەوتنی پێویستە.[3]

لەبەر ئەم ئاماژەیە و هیتر موسڵمانان لەسەر واجبیی شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها لەسەر ئەوەی هەموو کەسێك دەکرێ قسەی وەربگیرێ و ڕەت بکرێتەوە پێغەمبەری خوا نەبێ، کۆکن. ئەگەر شەرعزانێك لە مەسەلەیەکدا سەرپێچی پێغەمبەری کردبێ، ئەوە یان لەبەرئەوەیە سوننەی پێنەگەیشتوە، یان پێی گەیشتوە بەڵام بەلایەوە ڕاست (صحیح) نەبووە، یان هەر هۆیەکیتر کە لەم دەروازەیەدا باسیان دەکەین.

---

[1] رواه البخاري ومسلم وأبو داود ولفظه من صنع أمرا على غير أمرنا فهو رد راجع قواعد التحديث ص٥٣.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] تيسير التحرير١/٢٢.

ئەوانەی گوتویانە کار بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) ناکرێ شـازن و شـازیش وەك نەبوو وایە.

## گرنگیی سوننە لە یاسادانانی ئیسلامیدا:

گرنگی سوننە لە دابەشبوونیدا بەگوێرەی ئەو حوکمانەی هێناونی بۆ ئـەم بەشـانە دابەش دەبێ:

١- ئەو سوننەیەی حوکمەکانی قورئانی پـیرۆزی ئیقرار و دووپـات کردۆتـەوە، بەوەیش ئەو حوکمانە دوو سەرچاوە و دوو بەڵگەیان دەبێ، بەڵگەیەك لە قوئان و بەڵگەیەکی دووپاتکردنەوە لە سوننە، ئەمەیش لە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)دا زۆرە، لەوانە:

فەرمانکردنی بە نوێژکردن و زەکاتدان و رۆژووی رەمەزان و حەجکردنی ماڵی خـوا و پابەندبوون بە گرێبەند و گرتنەبەری رێگـەی راسـت و خـۆ رازاندنـەوە بـە رەوشـتی جوان و چەندین فەرمانیتری لەو جۆرە.

هەروەها نەهیکردنی لە هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا و شایەتیدانی ساختە و ئەزیەتدانی دایك و بـاوك و کوشـتنی بەناهـەق و نزیککەوتنـەوە لـە بەدڕەوشـتی و خواردنـەوەی مەستکەرەکان و دزی و ناپاکیکردن لە ئەمانەت و بوهتانی زینا بۆ داوێنپاکان و باقیی نەهیکردنەکانیتر.

٢- ئەو سوننەیەی ناوەرۆکی قورئانی روون کردۆتەوە لەو جێیانەی پێویستیان بە روونکردنەوە هەیە، کە گشتیی قورئانی تایبەت، رەهـای بەنـد و کۆبێـژ (موجمـەل)ی ورد دەکاتەوە، نـاڕوونی قورئـانی روون و بـەگرێ (موشـکەل)ی راڤـە دەکـا. بـۆ ئـەو ئەرکەیش لەلایەن خوا سەرپشك کراوە وەك ئەفـەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾[1].

---

[1] النحل/٤٤

نموونه بۆ ئەم جۆره: ڕوونکردنەوه گوفتاری و کرداریەکەیەتی بۆ کاتەکانی نوێژ و ژمارەی ڕکاتەکانی هەریەك لە پێنج فەرزەکە و چۆنێتیی کردنیان و تەکبیر و تەسلیم و ڕکوع و سجود و هەستان دانیشتنەکان و خوێندن و تەحیات و باقیی فەرز و سوننەتەکانی نوێژ، هەروەها ڕوونکردنەوەی زەکات و نیصابەکەی و ئەو ماڵانەی زەکاتیان تێدا دەکەوێ و ئەندازەکانیان کە پێویستە دەربکرێن و بدرێنە شایستەکانیان و باقیی ورده حوکمەکانیتری زەکات.

هەمان شت لەبارەی مەناسیکی حەج و چۆنێتیی ڕۆژووگرتن و فەرزەکانی و نیصابی دزیەکان و چۆنێتیی جێبەجێکردنی حەدی دەستبڕین، هەروەها لە ڕوونکردنەوەی وردەکاریی حوکمەکانی فرۆشتنەکان و سوو، لە ڕوونکردنەوەی حوکمی خواردن و خواردنەوەکان و مامەڵەکان و باری کەسایەتی و باقیی حوکمەکانیتر کە قورئانی پیرۆز لە هەندێ بوارياندا بەئیجمالی باسی کردون.

٣- سوننەتی بەدیهێنەری ئەو حوکمانەی قورئانی پیرۆز لێیان بێدەنگ بووه و سەرچاوەیان دەبێتە سوننە، لەوانە حەرامکردنی خواردنی گۆشتی هەموو ئاژەڵێکی چڕنوکدار و هەموو باڵندەیەکی قولاپدار و حەرامکردنی پۆشینی ئاوریشم و ئەڵقەی ئاڵتون بۆ پیاوان و فەرزکردنی پشکی داپیره لە میرات و دروستیی ڕەهنکردن لە غەیری سەفەردا و حوکمدان بە (شایەتێك و سوێندی داواکار) و واجبی سەرفیتره و نوێژی ویتر و باقی ئەو حوکمانەیتر کە بەزاهیر تەنها سوننە باسی کردون. پێغەمبەر(ﷺ) شتێك ناڵێ پێچەوانەی قورئان بێ، لەبەرئەوەی لە هەموو خەلقی خوا زاناتره بەوەی لە خواوه رایدەگەیەنێ و لە هەموويان لە ئامانجەکانی شەریعەت ئاگەدارتره و لە گوێڕایەڵیدا لە هەموو لەخواترستر و لە گەیاندنی ئەرکی پەیامەکەیدا جێمتمانەتره، لەبەرئەوەی هەرچی وەك شەرع بڵێ لەژێر وەحی و ئیلهامدایە ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾.

## بەشی دووەم:
## سوننەی نەپچڕاو (السنة المتصلة)

لـەم بەشـەدا بـاس لـە ئاسـتەکانی نەپچـڕانی سـوننە و مەرجـەکانی راوی (حەدیسگێڕەوە) و کاریگەری لەسەر جیاوازبوون و مەرجەکانی کارکردن بـە یەکینـە هەواڵ و کاریگەری لەسەر جیاوازبوون دەکرێ، ئەوەیش لە سێ باسدا دەخەینە روو:

### باسی یەکەم:
### ئاستەکانی سوننەی نەپچڕاو و کاریگەریی لەسەر جیاوازیی شەرعزان

سوننە لەڕووی سەنەدیەوە[1] بۆ سوننەی نەپچڕاو، کـە تێیـدا راویـەکان لـە یەکـەم سەنەدەوە تا دەگاتە پێغەمبەری خوا باس کراون بەبێ ئەوەی هیچکام لـە راویـەکان کەوتبن، لەگەڵ سوننەی نابەردەوام ئەویش ئەوەیە راویەك یان زیـاتری لـێ کـەوتوە، هەروەها پێی دەوترێ (المرسل)، هەروەك بە (الخبر المنقطع)یش ناو دەبرێ.

ئاستەکانی نەپچڕان بەلای حەنەفی و ئیبازی و ئەوانەی هاوڕایانن بریتین لە:[2]

---

[1] السند: سەنەدی حەدیس ڕێگەیەتی بەرەو ئەو پیاوانـەی گێڕاویانەتـەوە. یـان هەواڵدانـە لـەڕێی مەتنـەوە. قواعد التحدیث ص ٢٠٢.

الاسناد: بەرزکردنەوەی حەدیسە بۆ بوێژەکەی. سەرچاوەی پێشوو..

المـتن: بریتییـە لـە لـەفزەکانی حـەدیس کـە ماناکـانی پـێ دادەمـەزرێ. النخبـە النهائیـە في علـم مصـطلح الحدیث١٤.

[2] کشف الاسرار مع البزدوي٢/٦٨٠ شرح تنقیح الفصول للقرافي ص٣٤٩ شمس٢/١٣ و پاشتر.

١- نەپچڕانی تـەواو کـە هـیچ گومـانی لەسـەر نیـە، ئـەوەیش هـەواڵی جەمینـە (متواتر)ـە.

٢- نەپچڕانێك بەڕواڵەت جۆرە گومـانێکی لەسـەرە، ئـەوەیش هـەواڵی بەناوبانگـە (الخبر المشهور).

٣- نەپچڕانێك بەڕواڵـەت و بـەمانا گومـانی لەسـەرە، ئـەوەیش هـەواڵی تاکینەیـە (الخبر الآحاد).

ئاستەکانی نەپچڕان لای جمهور تەنها دوو بەشن، چـونکە پلـەی دووەم و سـێیەم دەچنە خانەی یکینە هەواڵ (خبر الواحد) و زاراوەی هەواڵی بەناوبانگ لای ئەوان نیە.

## خواستی یەکەم:
## سوننەی جەمینە

### جەمینە (التواتر):

لەڕووی زمانەوە: بەدوای یەکداهاتنی شـتەکان یـەك لـەدوای یـەك. لـە (الـوتر)ەوە هەیە، دەوترێ: تـواترت الکتـب، واتـە کتێبـەکان یـەك لـەدوای ئـەویتر هـاتوون بـەبێ ئەوەی بپچڕێ. هەروەها دەوترێ: جاءوا تترى، واتە یەك لەدوای یـەك هـاتن[1]. لەوانـە خوا ئەفەرموێ: (ثم ارسلنا رسلنا تترى[2]).

لە زاراوەی ئوسولیەکاندا: سوننەی جەمینـە (السـنة المتـواترة) ئەوەیـە کۆمـەڵێك کەس لەبارەی بابـەتێکی بەرهەسـتەوە دەیگێڕنـەوە کـە وابـاوە مەحاڵـە لەسـەر درۆ رێکەوتبن، ئەوەیش هەر لە سەرەتای سـەنەدەکەوە تـا کۆتـایی، وەك حەدیسـەکانی

---

[1] شرح تنقیح الفصول للقرافي ص ٣٤٩طلعة الشمس مع الشمس الاصول٢/١٢.

[2] المؤمنون/٤٤ ولتە یەك لەدوی یەك بە ماوەیەك.

تایبەت بە ژمارەی نوێژەکان و ژمارەی رکاتەنیان و ئەندازەکانی زەکات، کە ئەوانە بەرێگەی جەمینە بۆ ئێمە گوێزراونەتەوە.

## مەرجەکانی جەمینە:

بۆ بەدیهاتنی جەمینە بوونی چوار مەرج پێویستە کە ئەمانەن:

١- هەواڵەکەیان لەرووی زانینەوە بێ نەك گومان، غەزالی دەڵێ ئەگەر خەڵکی بەغدا هەواڵیان دابنێ لەبارەی باڵندەیەك کە وایان زانیوە کۆترە، یان لەبارەی کەسێکەوە کە وایان زانیوە زەیدە، ناتوانین بزانین ئەوە کۆتر بووە یان زەید بووە.[1]

٢- زانینەکەیان زەروری بێ واتە پشت بە بەرهەستێك ببەستێ لە بینین یان بیستن، جا ئەگەر هەواڵێکیان دا کە پشتی بە بەڵگەی زانستی دەبەست بۆ نموونە وەك پەیدابوونی دنیا، زانین ناگەیەنێ، لەبەرئەوەی شیمانە دەکرێ بەڵگەیان لێ تێکەڵ ببێ.[2]

٣- ژمارەیەکی پێویست بن، لەبەرئەوەی عادەتەن بەو شێوەیە رێکەوتن لەسەر درۆ مەحاڵ دەبێ.[3]

٤- بەرانبەریی هەردوولا و ناوەندەکە لەم سیفەتانەدا، بەوەی سیفەتی زانین و هەست و ژمارە لەنێوان چینە بینەر و هەواڵدەرەکە و ئەوەی دەکەوێتە بەینیان هەبێ.[4]

---

[1] المستصفى ص١٥٨.

[2] الاسنوي مع شرح البدخشي ٢/٢٢٢ و پاشتر، شمس الاصول للاباضي٢/١٠.

[3] المستصفى، سەرچاوەی پێشوو، شمس الاصول للسالمي الاباضي٢/٨.

[4] الأسنوي مع البدخشي ٢/٢٢٥شمس الأصول٢/١١.

## جۆرەکانی سوننەی جەمینە:

### ١- جەمینەی لەفزی:

ئەوەیە سەرجەم ئەوانەی حەدیسەکە دەگێڕنەوە لەسەر لەفز و ماناکەی کۆك بن، وەك ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: (من كذب عليّ متعمداً فليتبوّ مقعده من النار)، کە ئەم حەدیسە کۆمەڵێ لە هاوەڵان ریوایەتیان کردوە کە مەحاڵە لەسەر درۆ رێکەوتبن، پاشان هێندەی ئەوان لە تابیعین و پاشان تابیعی تابیعین کە سەردەمی نووسینەوەی سوننەیە، ریوایەتیان کردوە.

هەندێ لە زانایان نکوڵیان لە بوونی سوننەی قەولیی جەمینە کردوە وەك ئیبن سەلاحی شارەزوری[1]، بەلام باسی لە بوونی کردوە وەك ئەو حەدیسە و حەدیسی مەسح لەسەر خوف.[2]

### ٢- جەمینەی مەعنەوی:

ئەوەیە کە ئەوەی هەریەك لەو کۆمەڵە راوییە دەیگێڕنەوە لە لەفزدا جیایە لەوەی ئەوانیتر دەیگێڕنەوە، بەلام هەواڵەکانیان لە مانایەکی هاوبەشدا کۆکن لەوەی گێڕاویانەتەوە با بەرێگەی (التزام)یش بێ[3]. ئەم جۆرە لە جەمینەدا زاڵە. حوکمی سوننەی جەمینە ئەوەیە وەك چۆن کارکردن بە قورئانی پیرۆز واجبە ئاوا کارکردن بەویش واجبە بەبێ دوودڵی یان گومان، لەبەرئەوەی زانینی یەقینی دەگەیەنێ کە بەلای جمهورەوە وەك بینین وایە.

---

[1] المستصفى، سەرچاوەی پێشوو، شمس الأصول للسالمي الاباضي٢/٨.

[2] الآسنوي مع البدخشي ٢/٢٢٥ شمس الاصول٢/١١.

[3] شێخ حافز ئەبوعومەر عوسمان (ئیبن سەلاح)ی شارەزوری دانیشتووی دیمەشق و خاوەنی کتێبی (علوم الحديث)ە کە بە (مقدمة ابن الصلاح) بەناوبانگە. لە ٦٤٣ك مردوە.

٤ لە ئەبوحەنیفەوە دەگێڕنەوە وتویتی: نەموتوە مەسحی خوف دروستە بەلام وەك رۆژی روناك هاتووە و لە کوفری ئەوە ئەترسم کە نکوڵی لێبکا.. مسلم الثبوت ٢/١٢٠.

٥ سەرچاوەی پێشوو ٢/١٠٩

## خواستی دووەم:
## سوننەتی بەناوبانگ

سوننەی بەناوبانگ ئەوەیە ئەو کەسانەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاویانەتەوە نەگەیشتونەتە ئاستی جەمینە (تواتر)، بەڵام پاش ئەوە گەیشتونەتە ئەو ئاستە، ئەگەر حەدیسەکە یەك یان دوو هاوەڵ لە زاری پێغەمبەرەوە گێڕابێتیانەوە، پاشان کۆمەڵێ لە شوێنکەوتوان (واتە تابیعین) کە ڕێی تێناچێ لەسەر درۆ ڕێك بکەون، لەوانەوە بیگێڕنەوە، بەو شێوەیە تا دەگاتە سەردەمی نووسینەوەی سوننە، ئەوا ئەو حەدیسە بەبەناوبانگ (مشهور) دادەنرێ. ئەوەی لە ناوبانگدا پشتی پێ دەبەسترێ چینی دووەم و سێیەمی راویەکانن کە بریتین لە تابیعین و تابیعی تابیعین، لەبەرئەوەی هەر سوننەیەك لە چینی چوارەمدا پاش بڵاوبوونەوەی تۆمارکردن بەناوبانگ بێ، بەزاراوە پێی ناوترێ سوننەی بەناوبانگ.

**ئاستی لە بەهێزیدا:**

بەلای حەنەفی و ئیبازیەوە[1] سوننەی بەناوبانگ لە ئاستەکانی نەپچڕاندا بەپلەی دووەم دێ پاش سوننەی جەمینە. هۆی بەدووەم هاتنیشی ئەوەیە جۆرە گومانێك لە شێوە نەك ماناکەیدا هەیە، چونکە لەو رووەوە لە بنەڕەتدا لە تاکینە (ئاحادە) لەرووی شێوەوە جۆرە گومانێك هەیە.

کاتێ ئوممەت لە سەردەمی تابیعین و تابیعی تابیعیندا بەو دادپەروەری و دامەزراوەییەی لە ئایندا هەیانبووە، پەسەندی کردوە، ئیتر وەك جەمینەی لێهاتووە، بەوەیش لە شێوەدا وەك تاکینە و لە مانادا لە جەمینە دەچێ، واتە پێگەیەکە لەنێوان دوو پێگەدا.

---

[1] شمس الاصول٢/١٣-١٤

**حوكمی:**

لەبارەی حوكمی سوننەی بەناوبانگ رای جیاواز هەیە بەم وردەكاریەی خوارەوە:

١- هەندێ لە حەنەفیەت لەوانە ئەبوبەكری جەصاص و هیتر و هەندێ لە ئیبازیەت وەك بەدری شەماخی پێیان وایە حوكمی، حوكمی سوننەی جەمینەیە و زانینی یەقین (علم الیقین)ی پێ جێگیر دەبێ بەلام بە رێگەی (ئیستیدلال) نەك زەرورەت. بەلگەیشیان ئەوەیە دەلێن: كاتێ تابیعین كۆدەنگ بوون لەسەر قبولكردن و كارپێكردنی ئەوە راستی دەسەلمێنێ، لەبەرئەوەی ناكرێ خەیالّ بۆ ئەوە بچێ ئەوان بەبێ كۆكەرەوەیەك لەسەر قبولكردنی رێك كەوتبن، ئەویش هیچ نیە جگە لە دیاریكردنی لایەنی راستی (الصدق) لە ریوایەتەكەدا، لەبەرئەوەیە ئەو زانیاریەی پێی جێگیر دەبێ پێی دەوترێ ئیستیدلالی نەك زەروری.[١]

عەبدولعەزیزی بوخاری دەلێ (هەندێ لە هاوەلانی شافیعی ئەمە بۆچوونیان بووە، لەنێو گومانبڕەكاندا باسی یەكینە هەوالی كراوە كە ئوممەت قبولی كردوە كە راستیەكەی گومانبڕە، وەك هەوالی عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف لە وەرگرتنی جزیە لە مەجوس، هەروەها هەوالی ئەبوهورەیرە لەبارەی حەرامكردنی ژن لە پوورەی).[٢]

ب- عیسا بن ئافان لە حەنەفیەت[٣] و هەندێ لە زانایانی ئیبازی[٤] رایان وایە زانینی دلنیایی (علم الطمأنینة)[٥] واجب دەكا نەك زانینی یەقین، بۆیە لە خوار سوننەی جەمینە (متواتر) و لەسەروو یەكینە هەوالّ دەبێ، بەشێوەیەك رێگە بەوە درا بۆ كتێبی خوا زیاد بكرێ و هاوتای نەسخە.

---

[١] شمس الاصول سەرچاوەی پێشوو.

[٢] كشف الاسرار مع البزدوي٢/٦٨٨،

[٣] سەرچاوەی پێشوو.

[٤] شمس الاصول ٣/١٤.

[٥] دلنیایی دامەزران و داسەكناندنی زیاتری دەروونە بەهۆی ئەوەی زانیوەتی.

عەبدولعەزیزی بوخاری دەڵێ ئەوە هەڵبژاردنی قازی ئەبی زەید ئەلدیوسی و هەردوو شێخ و کۆی پاشینەکانە (لە زانایانی حەنەفی). ئەوەی کردۆتە بەڵگە کە بەشایەتیی سەلەف بووەتە حوججە بەشێوەیەك دروست بێ بۆ کتێبی خوا زیاد بکرێ، بەڵام هێشتا گومانی دابڕان و بەخەیاڵداهاتنی درۆی تێدا ماوە لەو رووەوە راویەکانی لە بنەڕەتدا نەگەیشتونەتە ئاستی تەواتور، لەبەرئەوە زانینی یەقینی پێ دەخرێ، لەبەرئەوە ئەو کەسەی نکوڵی لێبکا کافر نەکراوە.[1]

ج- جمهور رای وایە پاشبەندی هەواڵی یەك کەسە و تەنها گومان دەگەیەنێ، لێرەوە لای جمهور دابەشبوونە سیانینەکە نیە، بەلای ئەوانەوە سوننە یان جەمینە یان یەکینە هەواڵە.

بەرهەمی ناکۆکیەکە:

حەنەفیەت بۆچوونەکەیان لەمەڕ دروستی زیادکردن لەسەر کتێبی خوا بە سوننەی بەناوبانگ نەك یەکینە هەواڵ لەسەر جیاکاری لەنێوان سوننەی بەناوبانگ و یەکینە هەواڵ بنیات ناوە.

ئەلبەزدەوی دەڵێ: (حەدیسی بەناوبانگ بەشایەتیی سەلەف وەك جەمینە بووەتە حوججە بۆ کارپێکردنی، بۆیە زیادکردنی بۆ کتێبی خوا دروستە و ئەوە لای ئێمە نەسخە، ئەویش وەك زیادکردنی بەریارانکردن (رەجم) و مەسح لەسەر خوف و بەدوای یەکداهاتنی رۆژی کەفارەتی سوێند).[2]

حەنەفیەت دەڵێ ئەم وێنانە و جگە لەوانە تایبەتکردن نین، لەبەرئەوەی یەکێك لە مەرجەکانی -لە دیدی ئەواندا- ئەوەیە تایبەتکەر وەك لێ تایبەتکراو بێ لە هێزدا، هەروەها بەردەوام (متصل) بێ نەك متراخی و هەردوو مەرجەکە پێکەوە نەبن.[3]

---

[1] كشف الاسرار، سەرچاوەی پێشوو.

[2] أصول البزدوي مع كشف الاسرار ٢/٦٨٨

[3] كشف الاسرار مع البزدوي ٢/٦٨٩

تێبینی دەکرێ نالێن قورئان بە سوننەی بەناوبانگ نەسخ دەکرێ، بەڵام پێیان وایە زیادکردن بۆ قورئان وەك نەسخ وایە، هەربۆیە بۆ سوننەی جەمینە و بەناوبانگ دەبێ، نەك یەکینە هەواڵ.[1]

جمهور ئەو زیادەیە نە بە نەسخ دەبینن نە وەك نەسخ، بەڵکو بە روونکردنەوەیەکی دەبینن لە رێگەی تایبەتکردنی گشتی، یان بەندکردنی رەها یان هیتر وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾.

ئەم ناکۆکیەیش بووەتە مایەی جیاوازییان لە زۆر مەسەلەی فەرعیدا، لەوانە جیاوازی لەسەر دوورخستنەوە لەگەڵ جەڵدلێدان، کە ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی دەڵێن: دوورخستنەوە بەهیچ شێوەیەك نیە وەك بەشێك لە حەدەکە یان تەواوکەری، بەڵکو ئەوە وەك جۆرە تەمێکردن (تەعزیر)ێکە و بۆ را و ئیجتیهادی ئیمام دەگەڕێتەوە، ئەگەر بەپێویستی زانی پیادەی دەکا، ئەگینا نا.

جمهور دەڵێن: دوورخستنەوە بەبەشێکی تەواوکەر بۆ حەد دادەنرێ لەپاڵ بوونی سەد جەڵدا، بە جیاوازییان لە وردەکاریدا، لە دەروازەی یەکەمدا بەدرێژی باسی ئەمەم کرد.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

## خواستی سێیەم:
## هەواڵی تاکینە (ئاحاد)

حەدیسی ئاحاد (یان هەواڵی یەك): ئەوەیە یەك کەس یان دوان و بۆسەرەوە لە سەرەتای سەنەدەکە تا کۆتایی دەیگێڕنەوە و راویەکانی ناگەنە ئاستی جەمینە لە سێ چینەکەدا: (چینی هاوەڵان و تابیعین و تابیعی تابیعین)، چونکە عیبرەت تەنها بە پێش تۆمارکردنە لەڕووی پلەی حەدیسەکە کە ئاخۆ جەمینەیە یان بەناوبانگ یان تاکینە.[1]

ئاستی لە بەهێزیدا:

هەواڵی یەك لای جمهور لە پلەی دووەم و لای حەنەفی و ئیبازی[2] لەپلەی سێیەمدایە لەبەر بوونی شوبهە لە شێوە و مانادا. سەبارەت بە دڵنیایی لە بوونی شوبهە لە شێوەدا لەبەرئەوەیە پەیوەندیکردن بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەشێوەیەکی قەتعی نەسەلماوە، هەرچی مانایشە، لەبەرئەوەیە ئوممەت لە سەردەمی هاوەڵان و تابیعین و تابیعی تابیعیندا پەسەندی نەکردوە، بەپێچەوانەی جەمینە (متواتر) و بەناوبانگ.

حوکمی:

زانایان لەبارەی حوکمی هەواڵی تاکینە رای جیاوازیان هەیە، گرنگترینیان ئەمانەن:

---

[1] شرح التوضیح علی التنقیح٢/٢٤٦ کشف الاسرارمع البزدوي٢/٦٩٠.
[2] طلعة الشمس مع شمس الاصول٢/١٥.

أ- كارپێكردنی واجبە نەك هەر زانینی، ئەوەیش رای زۆریەی ئەهلی عیلمە لەناویاندا كۆمەڵێ لە شەرعزان[1]، چەند بەڵگەیەكیان هەیە، لەوانە:

١- ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾.[2]

لەبەرئەوەی مەبەست لەو كۆمەڵەی پێویستە دەربچێ بۆ فێربوون و ئاگەداركردنەوە یان ئەوەتا ئەو ژمارەیە بێ كە دەگاتە ئاستی جەمینە یان خوار ئەو، یەكەمیان دروست نیە، چونكە ئەگەر وابێ دەبێ لەسەر هەموو خەڵكی ئاوەدانیەك پێویست دەبێ كە لە خوار ئاستی جەمینە بن كە هەر هەموویان دەربچن بۆ فێربوون و ئاگەداركردنەوە، كەسیش ئەمەی نەوتوە، ئیتر هیچیتر نەمایەوە جگە لەوە. ئەگەر سەلما هەواڵی ئەو ژمارەیەی ناگاتە ئاستی جەمینە حوججەیەكی واجبكەرە لەم شێوەیەدا، وەك زەرورەت پێویستە لە هیتریشدا حوججە بێ، چونكە كەس نەیوتوە جیاوازییان هەیە.[3]

٢- ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا﴾، لەبەرئەوەی خوا واجبكردنی لێوردبوونەوە (تثبت) بە هەواڵدانی كەسی فاسقەوە هەڵواسیوە، ئەمەیش مانای ئەوەیە هەواڵی جگە لەو بەشێوەیەكیترە، ئەویش یان بە سووربوون لەسەر رەتكردنەوەی یان قبولكردنی، یەكەمیان جائیز نیە ئەگینا هەواڵی مرۆڤی دادپەروەر لە هی فاسق پلەی نزمتر دەبوو، بۆیە هەر دووەم دەمێنێتەوە، ئەوەیش داواكراوە.

٣- پێغەمبەر(ﷺ) تاكە تاكەی هاوەڵانی دەنارد بۆ ناوچە و هۆز و وڵاتەكان بۆ گەیاندنی هەواڵ و حوكمەكان و یەكلاكردنەوەی كێشەكان و وەرگرتنی زەكات و ئەو

---

[1] بڕوانە دوو سەرچاوەی پێشوو.
[2] التوبة/١٢٢.
[3] الاحكام للامدي ١/٢٥٠ و پاشتر.

جۆرە شتانە، لەکاتێکدا دەزانین ئەو خەڵکانەی ئەو کەسانەیان بۆ رەوانەکراوە داوالێکراو بوون کە گوێڕایەڵ و ملکەچی نێردراوەکە بن و بەقسەی بکەن، لەکاتێکدا ئەو جێبەجێکارە تاکەکەس بووە، جا ئەگەر هەواڵی یەك کەس حوججە نەبوایە بەو شێوەیە نەدەبوو.

ب- کارپێکردنی واجب ناکا لەبەرئەوەی زانین ناگەیەنێ:

ئەمە رای قاشانی و ئەبوداود و کۆمەڵێ لە موتەکەلیم و هەندێ لە فەرمودەناسان و هەندێ لە موعتەزیلە[1]. هەندێ بەڵگەیان هێناوەتەوە لەوانە ئەوەیە شەرعدانەر (واتە خوا) خاوەن ئەوپەڕی توانایە و دەتوانێ بە روونترین بەڵگە تەشریع بکا، ئیتر چ زەرورەتێك هەیە باز بەسەر بەڵگەی گومانبڕدا بدات بۆ شتێك کە تەنها گومان بگەیەنێ. هەروەها تەکلیفەکان پشت بە بەدەستهێنانی سوود و بەرژەوەندی و دوورخستنەوەی زیان و خراپە دەبەستن، ئەوەیش دەخوازێ بەرژەوەندی و خراپە زانراو بن، یەکینە هەواڵیش تەنها گومان دەگەیەنێ کە دەکرێ هەڵە دەربچێ، بەوەیش بەرئەرك (مكلف) دەکەوێتە ناو نەزانی و فەساد، ئەوەیش جائیز نیە.[2]

ئەمە بەوە رەت دەکرێتەوە کە زەنبردن پێکانی غالب و هەڵەی دەگمەنە، خواستی رێساکانیش ئەوەیە بەرژەوەندییە غالبەکان بۆ خراپەی دەگمەن بەجێ بهێڵرێن، هەربۆیە شەرعدانەر لەبەر زاڵیی راستیەکەی و دەگمەنیی هەڵەکەی، زەن (ظن)ی لەجێی زانین (العلم) داناوە.

ج- زانین و کارپێکردن واجب دەکا:

ئیمام ئەحمەد و شوێنکەوتوانی و داودی زاهیری و ئەوانەی شوێنی کەوتون ئەم بۆچوونەیان هەبووە[3]. بەڵگەیشیان ئەوەیە دەڵێن ئێمە لەو یەکینە هەواڵەی

---

[1] فتح الغفار بشرح المنار ٧٩/٢.

٢.كشف الاسرار مع البزدوي ٢٤٦/٢ و پاشتر. شرح تنقيح الفصول للقرافي ص ٣٥٧.

٣-فتح الغفاربشرح المنار ٧٩/٢. كشف الاسرار مع البزدوي ٦٩/٢ و پاشتر.

مەرجەكانی تێدان بەزەرورەت دروستیی زانینی ئـەو هەواڵـەی گەیاندویـەتی دەبینین بەبێ بەڵگەسازی و وردبوونەوە، بۆیە پێگەی ئەو زانینەی هەیە كە بە تەواتور دەست كەوتوە.

بەڵام راستیەكەی ئەگەر زەروری بوایـە خیلافـی تـێ نەدەكـەوت. داودی زاهـیری و ئەوانەی هاوڕاین بەوە بەڵگەیان لەسەر ئەوە هێناوەتەوە كە زانینێكی بەڵگەسـازییانە (استدلالي) دەگەیەنێ كە ئەگەر زانینی تیـۆری نەگەیاندایـە زانینـی واجـب نـەدەبوو، بەڵام كارپێكردنی بەقەتعی واجبە، بۆیە زانینی تیۆری دەگەیەنێ.

**زاڵكردن:**

بەدیدی من رای زاڵ ئەوەیـە: یەكینـە هـەواڵ حوججەیـە و پێویسـتە لـەو حوكمـە كردارییانەی بەڵگەن لەسەریان كاری پێبكرێ، بەڵام لە بابەتـە عەقائیدیەكانـدا ناكرێتـە بەڵگە، لەبەرئەوەی تەنها گومـان دەگەیـەنێ و گومـانیش لـە بابەتـەكانی بیروبـاوەڕدا نرخی نیە.

نزیكترین بەڵگە لەم مەسەلەیەدا دەستی پێوە بگـیرێ و لـە هـەر مشـتومڕێك دوور بێ بڕیتییە لە كۆدەنگیی هاوەڵان لەسەر كاركردن بە یەكینە هەواڵ، لەو رووەیشـەوە ژمارەیەكی زۆر رووداوی جیاوازیان لێ دەگێڕنەوە كە دەیسەلمێنێ لەسەر كاركردن بە یەكینە هەواڵ و واجبی كارپێكردنی كۆك بوون، لەوانە:

لەوانە: ئەوەی لە ئەبوبەكری سدیق دەگێڕنـەوە كـە كـاری بـە هـەواڵی مـوغیرە و محەمـەد بـن سـەلەمە كـردوە لـە میراتـی داپـیرەدا كـە پێغەمبـەر(ﷺ) شەشـیەكی داوەتێ، ئەویش شەشیەكی بۆ بڕیاردا.

هەروەها كاركردنی عومەری كوڕی خەتاب بە هەواڵی عەبدوڕەحمانی كوڕی عـوف لە وەرگرتنی جزیە لە مەجوس، كە ئەویش ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: (سنوا بهم سنة أهل الكتاب).[1]

---

[1] سبل السلام ٤/٦٥.

## باسی دووەم:
## مەرجەکانی راوی و
## کاریگەری لەسەر جیاوازیی شەرعزان

بۆ قبولّ و کارپێکردنی حەدیس پێویستە چوار مەرج لە گێڕەرەوە (واتـە راوی)ی حەدیسەکەدا هەبێ.

کە بریتین لە: ئەقلّ و زەبت و ئیسلام و دادپەروەری.

١- ئەقلّ: بۆ کارکردن بە هەوالّ پێویستە راویەکەی ئاقـلّ (ژیـر) بـێ لەبەرئـەوەی ئـەو هەوالّـەی ئەیگێڕێتـەوە قسـەیەکی رێکخـراوە و مانایـەکی زانـراوی هەیـە، بـوونی ئـەقلّ لـە قسـەکەردا پێویسـتە تـا قسـەکەی موعتەبـەر بـێ، قسـەی موعتەبەریش لە شەرعدا بە فام و (بیان) دەبـێ، ئـەو فامـەیش بەئـەقلّ نـەبێ ناکرێ.[1]

٢- زەبت: لەڕووی زمانـەوە ضـبط الشـيء[2]: بـەمانای بـەجوانی لەبەرکردنیـەتی، لەویشەوە (الاضبط) دێ کە مەبەست پاراستنی شتە بە هەولّ بۆدان و پاشـان دامـەزران لەسـەری بـە پاراسـتنی سـنوورەکانی و چـاودێریکردنی لـەڕێی یادخستنەوەی گومانبردنی خراپ بەخۆی[3] تا کاتی ئەنجامدانی[4]، ئەویش دوو جۆرە:

---

[1] أصول السرخسي١/٣٤٦شمس الأصول للسالمي٢/٣١.

[2] شرح تنقيح الفصول للقرافي ص٣٥٨ شمس الاصول ٢/٣١.

[3] واتە پشت بەخۆی نەبەستێ کە لەیادی ناکا و لە زەبتی حەدیسەکەدا نەرمی لەگەلّ خۆی نەنوێنێ، بـەلکو هەمیشە گومانی خراپ بەخۆی ببات و هەمیشە یادی بخاتەوە.

[4] بڕوانە: البزدوي مع الکشف ٢/٧١٦شمس الاصول٢/٣١.

أ- زەبتكردنی مەتن بە دارِشتە و ماناكەی لەرِووی زمانـەوە: واتـە زەبتكردنـی خودی حەدیسەكە و لەفزەكەی بەبیّ گۆرِین و هەڵەكردن لەگەڵ زانینی مانا زمانیەكەی.

ب- جگە لەمە زەبتكردنی ماناكەی لەرِووی فیقھ و شەریعەتەوە، وەك ئـەوەی بزانیّ حەرامیی داوەریكردن بەپێی ئەم حەدیسـە (لا يقضـي القاضـي وهـو غضبان)[1] پەیوەستە بە سەرقاڵیی دڵەوە.

زەبتكردنـی حەدیسـیش بـەمانا زمـانی و شـەرعیەكەی تـەواوترینی دوو جۆرەكەیە كە بە مەرجێك دادەنریّ، كە ئەویش زەبتی تەواوە نەك ناتەواو.

٣- ئیسلام: ناكۆكی لەنێوان زانایان لە ئوسولناس و شەرعزاندا نیە كە گێرِانەوەی مرۆڤی بێباوەرِ قبوڵ ناكریّ لەبەرئەوەی باسەكە باسی ئاینە، ئەگەرچی بـەلای ئەبوحەنیفـەوە شـایەتییان لەسـەر یـەكتر قبولـە، ئـەویش لـە رەتكردنـەوەی ریوایەتیاندا نەیار نیە[2] ، بـەلام لای جمهـور دەكـریّ منـداڵی كـافر حەدیسـەكە هەڵبگریّ و پاش موسڵمان و باڵقبوونی بیگێرِێتەوە.[3]

٤- دادپـەروەری (العدالة): لەرِووی زمانەوە: بریتییە لە دامـەزراوی (ئیسـتیقامە) چ لە ئایندا بیّ یان نا، دەوتریّ: (طريق عدل للجادة)، ئەو دادپەوەریـەی بـۆ راوی مەرجی جێبایەخە بریتییـە لـە زاڵبـوونی لایـەنی ئـاین و ئـەقڵ بەسـەر هـەوا و ئارەزوودا، هەركات گوناهێكی گەورەی كرد یان لەسەر گوناهێكی بچووك سوور بوو، عەدالەتەكەی دەكەویّ لەبەرئەوەی ئیتر بە درۆ تۆمەتبارە.

ناكۆكی نیە لەوەدا كە مەرج نیە ئەو كەسە لە هەموو گوناھ و سەرپێچیەك پـاك و دوور بیّ. هەروەها ناكۆكی نیە لەوەی تەنها دووربوون لـە گونـاهی گـەورە بـەس نیـە

---

[1] حديث ابي بكره رواه الجماعه، بروانه: صـحيح البخـاري٩/٦٥مسـلم ٦٢/٢السـنن الكبرى١٤/١٠وفي روايـه لا يحكم احد بين اثنين وهو غضبان. متفق عليه. سبل السلام١٢٠/٤.

[2] بروانه: المستصفى ص١٨٢ .

[3] شرح تنقيح الفصول ص ٣٥٩.

بەڵکو نابێ لەسەر گوناهی بچوکیش سوور و بەردەوام بێ، بەڵام لەبارەی کارکردن بە هەواڵی کەسی نەناسراو (مجهول) رایان جیاوازە: کە یان ئەوەتا بەدیار و نادیار عەدالەتەکەی نەزانراوە، ئەمە بەلای جمهورەوە ریوایەتەکەی قبوڵکراو نیە، یان عەدالەتە نادیار (باطن)ەکەی نەزانراوە کە بەلای هەندێکەوە پێی دەوترێ شاراوە (المستور)، ئەمە هەندێ (زانا) ریوایەتیان قبوڵ کردوە و هەندێکیتر نا. یان کەسەکە خودی خۆی نەناسراوە، لەوانەیە ئەوەی ریوایەتی کەسی نەناسراو قبوڵ ناکا ریوایەتی عەدالەت نەزانراو قبوڵ بکا. لای حەنەفیەت نەناسراو ئەو کەسەیە تەنها بە گێڕانەوەی حەدیسێك یان دووان ناسراوە[1].

## رای زانایان لەبارەی کارکردن بە هەواڵی کەسی نەناسرلو:

أ- شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە کار بە هەواڵی نەناسراو ناکەن:

١- زانینی ئەو کەسە بۆ ئەو حەدیسەی ریوایەتی کردوە و سەلماندنی، لەسەر زانینی عەدالەتی کەسەکە دامەزراوە، ئەوەیش نەزانراوە.

٢- بەدەقی قورئان فاسق شایەتی و ریوایەتی وەرناگیرێ: ﴿إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا﴾الایة.[2]

٣- شایەتیدانی قبوڵ ناکرێ بەهەمان شێوە ریوایەتی.

---

[1] صدر الشریعە دەڵێ: راوی یان ئەوەیە بە گێڕانەوە ناسراوە یان نەناسراوە واتە جگە لە یەك دوو حەدیس هیچیتری نەبووە. ناسراویش یان ئەوەتا بە فیقە و ئیجتیهاد ناسراوە وەك خەلیفە راشیدەکان و عەبدوڵاکان، ئەمە حەدیسی قبوڵ دەکرێ جا لەگەڵ قیاس کۆك بێ یان ناکۆك، یان تەنها بە گێڕانەوە (ریوایەت) ناسراوە وەك ئەبوهورەیرە و ئەنەس، ئەمە ئەگەر لەگەڵ قیاس کۆك بوو قبوڵ دەکرێ، هەروەها ئەگەر لەگەڵ قیاسێك کۆك و لەگەڵ یەکێکیش ناکۆك بێ بەهەمان شێوە، بەڵام ئەوەی پێچەوانەی سەرجەم قیاسەکان بێ لای ئێمە قبوڵ ناکرێ. بڕوانە: شرح التوضیح علی التنقیح مع الحواشی ٢/٢٥٠-٢٥١.

[2] الحجرات : ٦

٤- هەموولا کۆکن لەسەر ئەوەی ئەو موفتیەی نازانێ گەیشتۆتە پلەی ئیجتیهاد یان نا دروست نیە خەڵکی ئاسایی قسەی قبوڵ بکەن، دیسان ئەگەر نەزانرێ ئەو زانایە یان نا و دادپەروەری و فیسقی نەزانرێ. جا چ جیاوازیەك هەیە لەنێوان ئەوەی موفتی ئیجیتهادەکەی خۆی بگێڕێتەوە، یان هەواڵێك لە کەسیترەوە بگێڕێتەوە.

٥- کاری هاوەڵان: هەواڵی کەسی نەناسراویان رەت کردۆتەوە، عومەر هەواڵی[1] فاتیمەی کچی قەیسی رەت کردەوە، عەلی هەواڵی ئەشجەعی رەت کردەوە، ئەو کەسەیان هەواڵی کەسی نەناسراوی رەت بکردایەتەوە رەخنەی لێنەدەگیرا، بۆیە لەنێوان رەتکردنەوە و بێدەنگدا بوون، هەروەها کۆکن لەسەر قبوڵکردنی هی دادپەروەر نەك هیتر.

٦- پێغەمبەر(ﷺ) داوای دادپەروەری و پاکی و دەروون دروستی لەو کەسانە دەکرد کە بۆ ئەنجامدانی کار و گەیاندنی پەیام رایدەسپاردن.[2]

٧- لە قسەی قەڕافی ئەوە تێدەگەین کە ئەوەی شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ) بۆی چووە رای جمهورە لە مالیکی و حەنبلەیەکان و هیتر جگە لەوان کە دەڵێ: ئەبوحەنیفە دەڵێ قسەی نەناسراو وەردەگیرێ لەوەیشدا جمهور لەگەڵی نین، ئەویش لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: (یحمل هذا العلم من کل خلف عدوله) ، ئەمەیش سیغەکەی سیغەی هەواڵە و مانایشی فەرمانە، تەقدیرەکەی ئەوەیە: با لە هەر نەوەیەك دادپەروەرەکانی ئەم زانستە

---

[1] لە زانستی حەدیسدا هەندێ جار لەباتیی وشەی فەرموودە یاخود حەدیس (حدیث)ی پێغەمبەر ﷺ وشەی هەواڵ (خبر، اخبار..) بەکار دێ، بەڵام ئەسەر (أثر) بۆ گوتەی پێغەمبەر بەکار نایەت و زیاتر بۆ زانایانی سەلەف، کە دەکرێ صەحابیش بگرێتەوە، بەکاردێ. وەرگێڕ.

[2] بڕوانە: المستصفي للغزالي ص ١٨٣-١٨٤.

هەڵبگرێت، جا ئەگەر دادوەری مەرجێك نەبێ حیکمەتی ئەم فەرمانە نامێنێ، چونکە ئەوکاتە دادوەری و هیتر وەك یەکن.[1]

ب- حەنەفیەت نەناسراویان کردوە بە پێنج جۆرەوە:

جۆری یەکەم: ئەگەر سەلەف لێیانەوە ریوایەت کرد، ئەوا حەدیسەکەی وەك حەدیسی ئەو کەسەی لێدێ کە بە فیقھ و دادپەروەری و زەبت ناسراوە، بۆیە قبوڵ دەکرێ و پێش قیاس دەخرێ، لەبەرئەوەی ئەوان ئەهلی فیقھ و زەبت و تەقوا بوون و، بە کەمتەرخەمی لە کاروباری ئاین تۆمەتبار نەکراون و حەدیسیان قبوڵ نەدەکرد تا لایان ساغ نەبێتەوە کە لە پێغەمبەری خواوە ریوایەت کراوە.

سەرخەسی دەڵێ: قبولکردنیان بۆی یان لەبەرئەوە بووە لە دادپەروەری و زەبتی ئاگەدار بوون، یان لەگەڵ ئەو حەدیسانەدا کۆك بووە کە لەلایان بووە و لە پێغەمبەری خوا یان لە کەسانی بەناوبانگیان بیستوە، کە ئەوان لە پێغەمبەریان گێڕاوەتەوە[2].

سەدر ئەلشەریعە دەڵێ: ئەگەر سەلەف حەدیسێك بگێڕنەوەو شایەتی بۆ راستیەکەی بدەن، وەك ئەوەی لێدێ کە بە گێڕانەوە ناسراوە"[3]. عەبدولعەزیزی بوخاری دەڵێ: "ناکۆکی لەوەدا نیە ئەم جۆرە ریوایەتکرنی قبولکراوە"[4].

جۆری دووەم: ئەگەر پاش ئەوەی گێڕانەوەی هەواڵی نەناسراویان پێ گەیشت و لە رەتکردنەوە و تانەلێدانی بێدەنگ بوون، ئەویش قبولکراوە، لەبەرئەوەی بێدەنگی لە شوێنێکدا کە پێویست بە روونکردنەوە بکا خۆی روونکردنەوەیە، ئەگەر بەتاڵ بێ پێویستە بەتاڵیەکەی روون بکرێتەوە، جا بێدەنگبوونیان لە رەتکردنەوەی بەڵگەیە لەسەر پەسەندکردن (تەقریر) وەك ئەوەی قبوڵیان کردبێ و لێیان گێڕابێتەوە ئەگەر وا نەبێ کەمتەرخەمی ئەوانیش دەگرێتەوە، کە ئەوان بەوە تۆمەتبار نەکراون.

---

[1] بروانە: شرح تنقیح الفصل للقرافي ص٣٦٤.

[2] اصول السرخسي١/٣٤٢.

[3] شرح التوضیح علی التنقیح٢/٢٥٤.

[4] کشف الاسرار مع البزدوي٢/٧٠٢.

سەرخەسی دەڵێ: "بێدەنگبوون لەکاتێکدا پێویست بەقسەکردن هەبێ لەبارێکدا بێدەنگیەکە رازیبوون بە بیستراوەکە بگەیەنێ، دروست نیە، جا بێدەنگبوونیان لە رەتکردنەوە بەڵگەی پەسەندکردنە و لە ئاستی ئەوەدایە قبوڵیان کردوە و لێیان گێڕاوەتەوە".[1]

عەبدولعەزیزی بوخاری دەڵێ: "پێویستە ئەم بەشەیش بەبێ خیلاف قبوڵکراو بێ، لەبەرئەوەی گومانی ئەوەیان لێ ناکرێ لەکاتی زانینی بەتاڵیدا بێدەنگ بووبن"[2]. ئیبن نەجیم دەڵێ: "ئەگەر بێدەنگ بوون ئەوە راگەیاندنی ئەوەیە کە قبوڵکراوە، بەوەیش راویێ نەناسراو وەك راویی ناسراو لێ هاتووە".[3]

جۆری سێیەم: ئەگەر ریوایەتەکەیان رەت کردەوە و لەوەدا ناکۆك نەبوون، ئەوە ناکرێ کار بە ریوایەتی بکرێ لەبەرئەوەی ئەوان بە رەتکردنەوەی حەدیسی سەلماوی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، یان کارپێنەکردن یاخود زاڵکردنی را بەپێچەوانەی ئەو تۆمەتبار ناکرێن، جا رێکەوتنیان لەسەر رەتکردنەوە بەڵگەی ئەوەیە لەو ریوایەتەدا بەدرۆیان خستۆتەوە و زانیویانە ئەوە وەهمێکە لەلایەن ئەوەوە.

جۆری چوارەم: ئەوەیە حەدیسی لەلایان بەناوبانگ نەبێ و بەرەتکردنەوە بەرهەڵستییان نەکردبێ، ئەوا کارپێکردنی واجب نیە لەبەرئەوەی ریوایەتی لەلای ئەهلی سەلەف بەناوبانگ نەبووە و تۆمەتی وەهم کەوتۆتە حەدیسەکەی، بەڵام دروستە کاری پێبکرێ ئەگەر لەگەڵ قیاس کۆك بوو لەبەرئەوەی لە ئەوەی یەکەمدا بووە، دادپەروەرییان بەرواڵەت حاشاهەڵنەگرە، بەلەبەرچاوگرتنی لایەنی راستی لە هەواڵەکەیدا زاڵ دەبێ.[4]

---

[1] أصول السرخسي ٣٤٢/١.

[2] كشف الأسرار مع البزودي٧٠٦/٢.

[3] مشكاة الأنوار في أصول المنار ٨٣/٢.

[4] أصول السرخسي٧٠٧/٢ و پاشتر. الكشف مع البزدوي٣٤٣/١-٣٤٤.

سەدر ئەلشەریعە دەڵێ: "لە سەردەمی ئەبوحەنیفەدا کارپێکردنی جائیزە ئەگەر لەگەڵ قیاس کۆك بوو لەبەرئەوەی لەو سەردەمەدا راستگۆیی غاڵب بووە، بەڵام پاش سەدەی سێیەم نا، لەبەرئەوەی درۆکردن غاڵب بووە. لەبەرئەوە بەلایەوە داوەریکردن بە زاهیری عەدالەت راستە بەڵام لای ئەو دووانە[1] نا، ئەویش لەبەر جیاوازیی سەردەم.[2]

جۆری پێنجەم: ئەوەیە لە وەرگرتنی حەدیسی ئەو جۆرە کەسەدا، لەگەڵ گواستنەوەی کەسانی جێمتمانە لێیانەوە، جیاواز بێ، بەوەی هەندێ کەس کاری پێ بکەن وەك حەدیسی بروع کە عەلی بن ئەبوتالیب رەتی کردەوە و ئیبن مەسعود وەریگرت، لەبەرئەوە شەرعزان لە کارکردن بەم جۆرە رایان جیاوازە:

شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ) و ئەوانەی هاورِاین لەگەڵ کارکردنن بە هەواڵی ئەم جۆرە کەسە نەناسراوانە ئەگەر کەسانی جێمتمانە لێیانەوە وەرگرت و لەگەڵ قیاس دەگونجا، واتە ئەگەر ئەم دوو مەرجەی تێدا بوو.

چەند بەڵگەیەکیان بۆ ئەوە هەیە:

١- لە سێ سەدەی یەکەمدا بە هەواڵدانی پێغەمبەر(ﷺ) عەدالەت ئەسڵ بووە، وەك ئەفەرموێ: (خير القرون قرني الذي أنا فيهم ثم الذي يلونهم ثم الذي يلونهم ثم يفشو الكذب)[3].

٢- لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی ئەعرابیەکەی لە بینینی مانگدا وەرگرت بەبێ ئەوەی لە عەدالەتی بکۆڵێتەوە، بەڵکو تەنها لە موسڵمانبوونی کۆڵیەوە و کاتێ هەواڵی بینینی هیلالیدا پێی گوت: ئایا شایەتی دەدەیت کە هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله)، وتی: بەڵێ. وتی: ئایا شایەتی دەدەیت محەمەد پێغەمبەری

---

[1] لای دوو هاوەڵەکە.

[2] شرح التوضيح على التنقيح ٢/٢٥٥.

[3] شرح التوضيح على التنقيح ٢/٢٥٥ الكشف مع البزدوي ٢/٧٠٦.

خوایە؟ وتی: بەڵێ.. جا فەرمانی بە بیلال کرد خەڵك لە ڕۆژووگرتن ئاگەدار بکاتەوە.

عەبدولعەزیزی بوخاری دەڵێ: (ئەمە تەئویلی ئەوانە ڕەت دەکاتەوە کە وتویانە: پێغەمبەر(ﷺ) بە وەحی یان هەواڵپێدان عەدالەتەکەی زانیوە، لەبەرئەوەی ئەو بە موسڵمانبوونەکەی نەدەزانی چ جای عەدالەتەکەی).[1]

٣- وەڵامی ئیستیدلالەکەی شافیعی بە ڕەتکردنەوەی هەواڵی کەسی نەناسراو لەلایەن هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە، بەوە دەدەنەوە کە ئەوە لەبەر بەریەستیتر بووە کە وای کردوە هاوەڵان لە وەرگرتنی ئەوەدا دوودڵ بن[2].

ئەم خیلافە جیاوازبوونی لە هەندێ مەسەلەی فیقهیدا لێکەوتۆتەوە، لەوانە: جیاوازیی شەرعزان سەبارەت بە واجیبوونی مارەیی بۆ ئەو ژنەی مێردەکەی بەر لە چوونەلا و بەر لە دیاریکردنی مارەیی مردوە. سەرچاوەی ئەم خیلافەیش ئەوەیە عەلقەمە لە ئیبن مەسعود ریوایەتی کردوە، کە پرسیاری لێکراوە دەربارەی پیاوێك ژنێکی خواستوە و مارەیی بۆ دیاری نەکردوە و لەگەڵی جووت نەبو تا مرد، ئیبن مەسعود وتی: مارەیی ئافرەتانی خۆی هەیە بەبێ کەم و زیاد، هەروەها عیددەی لەسەرە و میراتیشی دەکەوێ. جا میعقەل بن سەنانی ئەشجەعی دەڵێ: پێغەمبەری خوا لەبارەی بروعی کچی واشقەوە کە ئافرەتێکی ئێمە بوو بەو شێوە بڕیاری دا کە تۆ دات، ئیبن مەسعودیش بەوە خۆشحاڵ بوو[3].

ئەم کارەی ئیبن مەسعود بە ڕا بووە، چونکە کاتێ مەسەلەکەی خرایە بەردەم پێش ئەوەی حەدیسەکەی پێبگا، سەرەتا دوودڵ بوو لەوە ئیجتیهاد بە ئەقڵی خۆی بکا پاش ئەوەی دەقێکی تێدا نەبینی و پاش ماوەیەك گوتی: بە ڕای خۆم ئیجتیهادی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.
[2] سەرچاوەی پێشوو.
[3] رواه أحمد والأربعة وصححه الترمذي وحسنة جماعة، سبل السلام ٢/١٩٧-١٩٨..

تێدا دەکەم، ئەگەر راست بێ ئەوە لە خواوەیە، ئەگەر هەڵەیش بێ ئەوا لە کوڕی (أم عبد)ەوەیـە، پـێم وایـە مـارەیی ئافرەتـەکانی دەکـەوێ بـەبێ کـەم و زیـاد. کـاتێ حەدیسەکەی لە میعقەل بن سەنانی ئەشجەعی و ئوبەییەوە بیست زۆر خۆشحاڵ بـوو کاتێ زانی داوەریکردنەکەی لەگەڵ داوەریکردنی پێغەمبەرەی خوا رێك بووە.

بەڵام عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوای لێبێ) ئـەم حەدیسـەی رەت کردۆتـەوە و گوتویەتی: ما تصنع بقول أعرابي بوال على عقيبه حسبها الميراث ولا مهر لها. (چـی دەکەیت بە قسەی ئەعرابیەکی میـز بەخۆداکـەر، تـەنها میراتـی دەکـەوێ و مـارەیی نیە).

پـاش ئـەوەی هـاوەڵان لـەبارەی قبـوڵکردنی ئـەم هەواڵـە جیاوازییـان تێکـەوت، شەرعزانیش لە کارپێکردنیدا جیاواز بوون، ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی و ئیمام ئەحمەد و هاوەڵانی و شافیعی لە یەکێك لە دوو قسەکانیدا و ئەوانەی هاوڕایانن لەگەڵ ئەوەن کار بە حەدیسەکە دەکرێ و هەموو ئافرەتێك لە هاوشێوەی ئـەم مەسـەلەیە و لـە دۆخـی ئـەودا شایسـتەی مـارەیی هاوشـانی خۆیـەتی و میراتیشـی دەکـەوێ و عیددەیشـی لەسەرە، ئەوەیش وەك پێشتر گوترا رای ئیبن مەسعود و ئەهلی کوفە و ئیبن شـبرمە و ئیبن ئەبی لەیلا و ثورییە.[1]

بەڵگەیشیان لەوەدا ئەوەیە: ئیبن مەسـعود لـە باوەڕپێکراوانـە و کـاری پێکـردوە، هەروەها لەبەرئەوەی پێیان وایە لەگەڵ قیاس کۆکە، چونکە ئەسڵ لای ئەوان ئەوەیە مـارەیی بـەخودی گرێبەندەکـە واجـب دەبـێ و بـە دڵنیـابوون لـە مـردن دووپـات دەبێتەوە، هەروەها بەجووتبوون دووپات دەبێتەوە، لەبەرئەوەی بە مردن نیکـاح کـە عەقدی تەمەنە کۆتایی دێ، شتیش ئەگەر کۆتایی هات بڕیاری لـەبارەوە دەدرێ، کـە وەك وەرگرتنی عەقدلەسەرکراوە ئەویش جووتبوونە، لەبەرئەوە عیـددە واجـب بـووە

[1] بڕوانە: سبل السلام، سەرچاوەی پێشوو. كشف الأسرار مع البزدوي ٧٠٦/٢ شـرح التوضـيح علـى التنقـيح لصدر الشريعة مع الحواشي ٢٥٥/٢ التحرير مع التقرير والتحبير ٢٥٠/٢.

وەك چۆن تەواوی مارەیی هاوشـان واجـب دەبـێ، جـا ئەگـەر حەدیسـەكەی میعقـەل لەگەڵ ئەم قیاسە رێك بێ، پێویستە كاری پێ بكرێ.

مالیك و ئەوزاعی و شافیعی لە یەكێك لە دوو راكەیدا و شیعەی ئیمـامی و هـادەوی بۆ ئەوە چوون ئەو ژنە تەنها میراتی دەكەوێ، كە ئەوە وەك باس كرا رای عەلی كوڕی ئەبوتالیبە و ئیبن عـەباس و ئـیبن عومـەر و زەیـد و رەبیعـە دەسـتیان پێـوە گرتـوە لەبەرئەوەی جگە لەوەی هەواڵی نەناسراوە پێچەوانەی قیاسیشە لەبەرئـەوەی ئەسـڵ لای ئەوان ئەوەیە مارەیی بە دیاریكردن و رەزامەندیی دووسەرە یان قەزای قازی یـان وەرگرتنی عەقدلەسەركراو نەبێ واجب نابێ، ئەگەر یەكێك لەوانـە نـەبوو تـا پیاوەكـە مرد هیچ واجب نـابێ لەبەرئـەوەی عەقدلەسـەركراو بەسـەلامەتی گەڕاوەتـەوە، بۆیـە وەك ئەوە وایە بەر لە سەرجێییكردن تەڵاقی دابێ یان وەك فەوتانی فرۆشراو بـەر لـە وەرگرتنی، ئەگەر وایش بوو پێویستە ئەو حەدیسە رەت بكرێتەوە و كاری پێنـەكرێ. شـافیعی دەڵـێ: ئـەم حەدیسـەم لـە رووپەكـەوە لەبـەر نیـە كـە هاوشـێوەی ئـەوە بسەلمێنێ، ئەگەر حەدیسەكەی بروع بسەلمێ منیش دەیڵێم.[1]

پـاش ئـەم كورتەیـەی خرایـە روو وای دەبیـنین رای حەنەفیـەت لـە شـیكردنەوە زانسـتیەكەیان بـۆ نەناسـراو و جۆرەكـانی راجیحتر و نـزیكترە لـە واقیـع و مـەنتیق، لەبەرئـەوەی بـەهیچ شـێوەیەك ریوایـەتی كەسـی نەناسـراویان وەرنـەگرتوە، هـەر ئەوەیشـیان بـەرەهایی رەت نـەكردەوە، بـەڵكو هەسـتاون بـە روونكردنـەوەی ئـەو شوێنانەی پێویستە تێیاندا كار بە یەكینە هەواڵ بكرێ ئەگەر راویەكە نەناسراو بـوو و ئەو حاڵەتانەی پێویستە واز لە كارپێكردنی بهێنرێ لەگەڵ بەهێزیی بەڵگەكانیان.

---

[1] بڕوانە: كشف الأسرار مع البزدوي ٢/٧٠٧ سبل السلام ٣/١٤٩ الخلاف للطوسي، سەرچـاوەی پێشـوو. لـە شافیعی دەگێڕنەوە كە لە میسر لە قسەكەی پاشگەز بووەتەوە و كاری بە حەدیسی بروع كردوە.

## باسی سێیەم:
## مەرجەکانی کارکردن بە یەکینە هەواڵ و
## کاریگەری لەسەر جیاوازیی شەرعزان

پێشەوایانی موجتەهید و شوێنکەوتوانیان لە پەسەند و واجبکردنی کارکردن بە یەکینە هەواڵی ئیسناد نەپچڕاو هاوڕێباز نەبوون، بەڵکو لە پەسەندکردنیدا پێی بەگوێرەی ئەو ژینگەیەی تێیدا ژیاون لەنێوان تەسککردنەوە و فراوانکردندا بوون: بۆ نموونە ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ژینگەی عێراق کاری تێکردوە کە لێکترازان و دابەشبوونی موسڵمانانی بۆ چەندین تایفە بەخۆوە بینی و دوژمنایەتی ئاینی تێدا دەرکەوت لەوانەی دەمامکی ئیسلامیان پۆشی وەك عەبدوڵای کوڕی سەبەئی جولەکە و هاوشێوەکانی، هەروەها مەرامە بێنرخەکانیان لەپشت شیعەگەریەوە شاردەوە و خۆشەویستی ئالوبەیتیان کردە بیانوو بۆ دانانی حەدیس تا بیانخزێننە ناو موسڵمانان، هەروەك مەبەستیان بوو نوری خوا بکوژێننەوە، خوایش ڕازی نابێ و بڕیاری داوە نوری خۆی سەردەخا با بێباوەڕانیش پێیان ناخۆش بێ. هەروەها لەم ژینگەیەدا دەمارگیریی ئاینی سەری هەڵدا و گەشەی کرد بەشێوەیەك هەندێ فیرقەی ئاینیی ئیسلامی لە دەمارگیریی پەڕگیرانەیان بۆ بیر و باوەڕەکانی خۆیان، پەنایان بۆ حەدیس دانان دەبرد تا ببێتە بەڵگە لەسەر ڕاستی بۆچوونەکەیان. هەمان شت بۆ ئەوانەیش ناوی زانستیان لەخۆیان نابوو و لەبەر ئارەزووی میر و خەلیفەکان هەمان شتیان دەکرد و بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی لەدەستیاندایە، چییان بویستایە بۆیان دادەنان.

هەروەها هەندێکیان لە دەروازەی چاکەخوازی و ترساندن و هاندان و هۆکاریتر وایان لە خەڵك کرد بەسووك سەیری دانانی حەدیس بکەن، بەڕادەیەك هەندێ ڕێگە بەوە بدەن هەموو شتێکی هەق بدەنە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ) با قسەی فەیلەسوف و

حەکیمانیش بێ. بۆیە هیچ سەیر نیە بەلای ئەبوحەنیفەوە (رەحمەتی خوای لێبێ) کە بوارێکی بەرتەسك بۆ کارکردن بە یەکینە هەواڵ بدەن و مەرجی ئەوتۆ بۆ کارپێکردنی دابنێن کە دەکرێ ئەو کەسانەی ئاگەداری ئەو هەلومەرج و ژینگەکەی ئەبوحەنیفە و زاناکانی (رەحمەتی خوایان لێبێ) نەبن، بە مەرجە سەختەکان ناویان ببەن.

ئیمام مالیك لە زێدی وەحی لە شاری پێغەمبەری خوادا ژیا و کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەو ژینگە پیرۆزە بەرادەیەك وتوێتی کارکردن بە یەکینە هەواڵ واجب نیە ئەگەر پێچەوانەی کاری خەڵکی مەدینە بوو، لەبەرئەوەی هاوسەردەمی دابەزینی وەحی بوون و کارەکانی پێغەمبەر(ﷺ)یان دیوە و کارەکانیان ئیعتیباری لە یەکینە هەواڵ زیاترە، چونکە کارەکانیان بەرانبەر هەواڵدانی کۆمەڵێکە لە پێغەمبەرەوە، هەر کارێکیش بەو شێوەیە بێ ئەوا بەڵگەی لە یەکینە هەواڵ بەهێزترە. لەکاتێکدا دەبینین شافیعی و ئیمام ئەحمەد و هاوشێوەکانیان نەکەوتونەتە ژێر کاریگەریی ئەوەی کاری لە ئەبوحەنیفە و مالیك و هاوەڵانیان کردوە، لەبەرئەوە وتویانە: ئەگەر یەکینە هەواڵ سەنەد و نەپچڕانی دروست بوون، پێویستە بەبێ لەبەرچاوگرتنی هەر مەرجێکیتر کاری پێ بکرێ.

لەبەر ئەم ئیعتیبارانە و هیتر شەرعزان لەبارەی مەرجەکانی کارکردن بە یەکینە هەواڵ رایان جیاوازە، ئەم جیاوازیەیش کاریگەریی بەرچاوی لەسەر جیاوازیی حوکمە فیقهیەکان هەبووە وەك لە خوارەوە بە خستنەڕووی مەرجەکانی کارکردن بە یەکینە هەواڵ و هەندێ مەسەلەی پراکتیکیی خیلافیدا، روون دەبێتەوە، ئەویش لە دوو خواستدا:

# خواستی یەکەم:
# مەرجەکانی حەنەفیەت
# بۆ کارکردن بە یەکینە هەواڵ

شەرعزانی حەنەفی بۆ واجببوونی کارکردن بە یەکینە هەواڵ کۆمەڵێ مەرجیان داناوە، گرنگترینیان ئەوەیە: پێچەوانەی قیاس نەبێ، لەوەدا نەهاتبێ کە بەلای پێ بڵاو دەبێتەوە (تعمّ به البلوی)، بەڵگەیەکی بەهێزتر لە قورئان یان سوننەی جەمینە یان بەناوبانگ دژی نەبێ، راویەکەی بەپێچەوانەی ئەوەی ریوایەتی کردوە نەجوڵێتەوە.

**مەرجی یەکەم: یەکینە هەواڵەکە پێچەوانەی قیاس نەبێ ئەگەر راویەکە شەرعزان نەبوو، روونکردنەوەیشی بەم شێوەیە:** حەنەفیەکان دەڵێن: راوی لەرووی قبوڵکردن و رەتکردنەوەی گێرانەوەکەیەوە دابەش دەبێ بۆ ناسراو (معروف) و نەناسراو (غیر معروف) بە گێرانەوەی حەدیس. لە باسی پێشوودا حوکمی هەواڵی کەسی نەناسراو (مجهول)مان روون کردەوە. هەرچی ناسراو (المعروف)ـە دوو جۆرە: ناسراو بە فیقە و فتوادان + نەناسراو بەوانە. ناسراو بە فیقە و فتوادان لە هاوەڵانیش بریتین لە خەلیفە راشیدەکان و عەبدوڵاکان (العبادلة) و زەیدی کوڕی ثابت و معاذ کوڕی جەبەل و ئەبوموسای ئەشعەری و عائیشە (رەزای خوایان لێ بێ)[1]، ئەمانە و هیتر لەو هاوەڵانەی

---

[1] مەبەست لە عەبدوڵاکان هەریەك لە: (عبدالله بن مسعود، عبدالله بن عباس، عبدالله بن عمر)ـە، ئەمە بەپێی لێکدانەوەی سەدر ئەلشەریعە لە (التوضیح)دا. ئەلفەنری دەڵێ: لای فەرمودەناسان وا بەناوبانگە عەبادیلەی رەها چوارن و ئیبن مەسعود لەوان نیە، پاشان دەڵێ: بەگواستنەوە لە ئیمامی نەوەویەوە لە (تهذیب الأسماء واللغات)، عەبدوڵای کوڕی زوبێر یەکێکە لە چوار عەبادیلەکە کە بریتین لە: عبدالله بن عمر، عبدالله بن عباس، عبدالله بن الزبیر، وعبدالله بن عمرو بن العاص. ئەحمەد بن حەنبەل و باقیی فەرمودەناسانیتریش وایان وتوە. بڕوانە: راجع حاشیة الفندي علی التلویح علی التوضیح ٢/٢٥٠

که به فیقهزان بهناویانگن، تابیعیهکانیش شهرعزانیان ههیه... ههیشیانه به فیقهزان نهناسراون.

زانایانی موسڵمان له حهنهفیهت و هیتر یهکقسهن لهوهدا ههر ههواڵێك ساغ ببێتهوه که له یهکێك یان زیاتر لهوانهوه ریوایهت کراوه پێویسته کاری پێبکرێ، جا چ لهگهڵ قیاس کۆك بێ یان ناکۆك و به حوججه له ئهحکامی شهرعیدا دادهنرێ، ئهگهر لهگهڵ قیاس رێك بوو دهبێته پاڵپشت، ئهگهریش رێك نهبوو کار به حهدیسهکه دهکرێ نهك قیاس.[1]

ههرچی ئهو هاوهڵانهن به فیقه و ئیجتیهاد نهناسراون، وهك ئهبوهورهیره و ئهنهسی کوڕی مالیك و سهلمانی فارسی و بیلالی حهبهشی و هیتر، ئهوا عیسا بن ئهبان که یهکێکه له زانایانی حهنهفی رای وایه قیاس پێش ههواڵێك دهخرێ ئهوانه گێڕابێتیانهوه، قازی ئهبوزهیدی دهبوسی ئهم رایهی پهسهند کردوه و زۆر له پاشینانی حهنهفیهت شوێنی کهوتون.[2]

ئهمانه پشت به چهند بهڵگهیهك دهبهستن لهوانه:

١– ههندێ له هاوهڵان بهوه بهناوبانگن که دهستیان به قیاسهوه گرتوه و یهکینه ههواڵیان رهت کردۆتهوه، لهوانه:

ئیبن عهباس کاتێ گوێی له ئهبوهورهیره بوو باسی دهستنوێژگرتن لهوهی ئاگری بهرکهوتوه دهگێڕێتهوه، وتی: ئهگهر به ئاوی گهرم دهستنوێژت گرت، ئایا لهبهرئهوه دهستنوێژ دهگریتهوه.[3]

---

[1] بروانه: کشف مع البزودي ٦٩٨/٢ شرح التوضیح علی التنقیح مع حواشیة ٢٥٠/٢ فتح الغفار بشرح المنار ٨٠/٢

[2] کشف الاسرار مع البزدوي ٧٠٣/٢.

[3] ئهم حهدیسه به لهفز و رێگهی جیاواز ریوایهت کراوه لهگهڵ ئهوهی دژیهتی، یان به نهسخکهرهوه خودیان تایبهتکهری دادهنرێ. بروانه: ورد هذا الحدیث بألفاظ أخری من طرق متعددة مع ما یعارضه أو یعتبر ناسخاً أو مخصصاً له راجع صحیح مسلم ١٥٤/١ سنن أبي داود ٤٨/١ نیل الأوطار ٢٤٥/١ و پاشتر.

هەروەها کاتێ گوێی لێ بوو دەگێڕێتەوە: هەرکەس جەنازەیەکی هەڵگرت با دەستنوێژ بگرێ، وتی: ئایا بۆ هەڵگرتنی چەند دارێکی وشك دەستنوێژمان دەکەوێتە سەر.[1]

وەك پێشتر باس کرا عەلی بن ئەبوتالیب (رەزای خوای لێبێ) بە قیاس حەدیسی بروعی رەت کردەوە.

عومەری کوڕی خەتاب حەدیسی فاتیمەی کچی قەیسی رەت کردەوە.

ئیبراهیمی نەخعی یان شەعبی ئەوەیان رەت کردەوە کە دەگێڕنەوە (أن ولد الزنى هو شرّ الثلاثة) و دەڵێ: ئەگەر منداڵی زینا سێیەمی خراپە بوایە لە چاوەڕوانکردنی گەیشتنی ئەو منداڵەدا جێبەجێکردنی سزاکەیان لەسەر دایکی دوانەدەخست تا منداڵەکەی دەبێ، ئەمەیش جۆرێکە لە قیاس.[2]

ئەم بەڵگەیە بەوە رەت دەکرێتەوە کە رەتکردنەوەی هەندێ حەدیس لەلایەن هاوەڵانەوە لەبەر هەندێ مانای سەرهەڵداو بووە، نەك لەبەرئەوەی لای ئەوان قیاس لە یەکینە هەواڵ لەپێشتر بووە.

٢- وتویانە بەکۆدەنگیی سەلەف لە هاوەڵان قیاس حوججەیە، لە گەیشتنی یەکینە هەواڵیش بە پێغەمبەر(ﷺ) گومانێك هەیە، هەربۆیە ئەوەی بە قیاس جێگیر (ثابت) بووە کە بەئیجماعیش جێگیر بووە لەوەی بە یەکینە هەواڵ جێگیر بووە بەهێزترە، بۆیە کارپێکردنی لەپێشترە.[3]

وەڵامی بۆ ئەمە ئەوەیە: ئەم بەڵگەیە تەواو بێمانایە، لەبەرئەوەی یەکینە هەواڵیش بە ئیجماع حوججەیە، گومانیش لە قیاسدا لە گومان لە یەکینە هەواڵدا بەهێزترە، ئیتر

---

[1] ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەڵێ حەدیسەکەی ئیبن عومەر لە عەبدوڵا بن ئەحمەدەوە کە دەڵێ: ئیسنادەکەی دروستە، بەڵام ئەوەی دەڵێ کەسێك شك نابەم لەوانەی باسیان کردوە بڵێ بۆ ئەو کەسەی مەیت هەڵدەگرێ دەستنوێژ واجبە، مەندوبیش نیە. . بلوغ المرام مع سبل السلام ٢/٦٩-٧٠

[2] بڕوانە: كشف الأسرار مع البزدوي ٢/٦٩٨.

[3] كشف الأسرار مع البزدوي ٢/٦٩٩.

چۆن لەو بەهێزترە؟

٣- وتویانە: قیاس لە یەکینە هەواڵ مەحکەمترە، لەبەرئەوەی دەکرێ راوی سەهو یان درۆ بکا بەڵام شتی وا لە قیاسدا نیە. ئەم بەڵگەیە بەوە رەت دەکرێتەوە کە ئەگەری ئەوەی حوکمەکە پەیوەندی بە وەسفە هەڵێنجراوەکەوە نەبێ لە قیاسدا جێگیرە، نەك لە یەکینە هەواڵدا.

٤- وتویانە: قیاس ئەگەری تایبەتکردن (تخصیص)ی لێ ناکرێ، بەڵام هەواڵ لێی دەکرێ، لەبەرئەوە لێنەکراوەکە لەپێشترە.

بەوە وەڵام دەدرێتەوە: کە ئەمە دەرچوونە لە بابەتی کێشەکە لەبەرئەوەی قسە لە هەواڵێکە رەت دەکرێتەوە، لەبەرئەوەی قیاس پێچەوانەیەتی، لەم بارەیشدا ئەگەر لە ئارادا نیە.

**رای جمهور:**

جمهوری شەرعزان لە شافیعی و حەنبەلی و هەندێ حەنەفی و هەندێ لە مالیکی و ئیمام مالیك لە یەکێك لە دوو قسەکانیدا[1] و ئیمامانی ئەهلی حەدیس، لەگەڵ ئەوەن تەنها حەدیسێك ئەو کەسانەی بە ریوایەت ناسراون بیگێڕنەوە، نەك بە فیقه و فتوا، لە شەریعەتی ئیسلامیدا بە حوججە دادەنرێ جا چ لەگەڵ قیاس کۆك بێ یان ناکۆك[2]، بۆ ئەوەیش چەند شتێکیان کردۆتە بەڵگە:

١- کۆدەنگیی هاوەڵان: هاوەڵان دەستبەرداری ئەو حوکمدانەیان دەبوون بە قیاس دابوویان ئەگەر یەکینە هەواڵیان ببیستایە، لەوانە:

عومەری کوڕی خەتاب(رەزای خوای لێبێ) بەحەدیسی حەمل بن نابغە[3] وازی لە رای خۆی لەبارەی کۆرپەلە هێنا و حوکمی پێ دەرکرد، ئەم حەدیسەیش پێچەوانەی

---

[1] شرح تنقيح الفصول للقرافي ص ٢٨٧.

[2] أصول السرخسي ٣٣٩/١ فما بعدها أصول البزدوي مع الكشف ٦٩٨/٢ التوضيح على التنقيح ٢٥٠/٢

[3] عن أبي هريرة (رض) قال: اقتتلت امرأتان من هُذَيلٍ . فرمت إحداهما الأُخرى بحجَرٍ فقتلتْها وما في بطنها. فاختصموا إلى رسولِ الله (ﷺ). فقضى رسولُ الله (ﷺ) أنَّ دِيَةَ جنينها غُرَّةٌ: عبدٌ أو وليدةٌ. وقضى بديَةِ ←

قیاسه، لەبەرئەوەی کورپەلە ئەگەر زیندوو بێ خوێنبایی تەواوی واجب دەبێ، ئەگەر زیندویش نەبێ هیچی لەسەر نیە، بۆیە گوتی خەریك بوو بە رای خۆمان حوکمی تێدا بکەین لەکاتێکدا سوننەتی پێغەمبەری خوای لەسەرە.

هەروەها دەوترێ زەحاك لە میراتبردنی ژن لە خوێنبایی مێردەکەی سەرپشکی کردوە لەکاتێکدا قیاس بەپێچەوانەی ئەوە بوو، لەبەرئەوەی میرات بۆ ئەو شتانەیە کە میراتدەر هەیەتی، مێردیش بەر لە مردن خاوەنی خوێنبایی نیە چونکە پاش مردنی واجب دەبێ. ئاشکرایشە نە حەمل و نە زەحاك لە شەرعزانی هاوەلآن نەبوون.

ئیبن عومەر رای خۆی لەبارەی موزارەعە[1]. بەو حەدیسە واز لێهێنا کە لە (رافع بن خدیج)ی بیست کە ئەویش شەرعزان نەبوو[2]. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز(رەزای خوای لێبێ) ئەو حوکمەی هەلّوەشاندەوە کە دابووی لە گێڕانەوەی دانەوێڵە بۆ فرۆشیار لەکاتی گێڕانەوەی بە عەیبەوە، ئەویش پاش بیستنی ئەوەی پێغەمبەر ئەفەرموێ: (الخراج بالضمان).[3]

٢- ئەسڵ لە هەواڵدا یەقینە لەبەرئەوەی قسەی پێغەمبەر(ﷺ) شیمانەی هەڵە هەڵناگرێ، بەلآم گواستنەوە و تێکەوتنی میانە و ئەگەری هەڵەکردن و لەبیرچوونەوەی تێدایە، هەربۆیە شیمانەکە تێیدا لابەلاییە و ئەسڵیش لە رادا شیمانە و نایەقینییە، لەبەرئەوەی وەستان لەسەر ئەو وەسفەی کە عیللەی حوکمە بە رێگەی یەقین نایەتەدی تەنها بە دەق و ئیجماع نەبێ، ئەوەیش شتێکی سەرهەڵداوە

---

المرأة على عاقلتها. وورثها ولدها ومن معه.. وأخرجه أبو داود والنسائي من حديث لبن عباس(رض) ان عمر (رض) سألها من يشهد قضاء رسول الله(ﷺ) في الجنين قال فقال حمل بن النابغة: كنت بين أمرأتين فضربت أحداهما الأخرى. الحديث صححه أبن حيان والحاكم سبل السلام ٣/٢٣٨-٢٣٩ العدة ٤/٣٢٥

[1] مەبەست لە مزارعە: وەبەرهێنانی زەوی لەلایەن خاوەن زەوی و جوتیارەوە بەشەریکی بەو پێیەی لەسەری رێك دەکەون -وەگێڕ.

[2] عن رافع بن خديج قال كنا أكثر الأنصار حقلاً وكنا نكرى الأرض على أن لنا هذه ولهم هذه ربما اخرجت هذه ولم تخرج هذه فنهانا عن ذلك فأما بالورق فلم ينهانا العدة ٤/١٤١-١٤٢.

[3] روى بهذا اللفظ وبالمعنى من طرق عديدة راجع نبل الإطار/٢٤٠ معالم السنن ٣/١٤٧.

(عارض). شیمانەی ئەسڵیش لە شیمانەی سەرهەڵداو بەهێزترە وەك چۆن یەقینی ئەسڵی لە یەقینی سەرهەڵداو بەهێزترە. لەم روانگەوە پێویستە کار بە یەکینە هەواڵ بکرێ و پێش قیاس بخرێ ئەگەر پێچەوانەی بوو، با راویەکەیش شەرعزان نەبێ.[1]

٣- ئەو وەسفەی موجتەهید بۆ پێوە هەڵواسینی حوکمەکە دیاری کردوە وەك هەواڵ وایە لەو رووەوە هەر وەك هەواڵ حوکمەکە دەدرێتە پاڵی و ئاگەداربوون لە کاریگەریەکەی وەك بیستنی هەواڵەکە لە راوی وایە. وەسف لە سەلماندنی دەقێك لەلایەن ئەو کەسەی ئیدیعای دەکا بێدەنگە، لەبەرئەوەی قیاس بەجۆرە ئاماژەیەك لە شەرعدانەرەوە کردویەتی بە شایەتێك لەسەر حوکمەکە و هەواڵەکە خۆیشی حوکمەکە دەڵێ، لەبەرئەوە لە دەرخستنی حوکمەکە و سەلماندنیدا لە وەسف بەهێزترە، بیستنیش لە پێکاندا لەسەروو راوەیە، لەبەرئەوەی ئەگەری تێدا نیە، چونکە بەهەست ساغ بووەتەوە، هەڵەیش لە شتە هەستپێکراوەکاندا نیە بەپێچەوانەی را، بۆیە نابێ لەبەر لاواز واز لە بەهێز بهێنرێ.

**زاڵکردن:**

بە بڕوای من رای زاڵ ئەوەیە جمهور بۆی چووە لە پێشخستنی یەکینە هەواڵ بەسەر قیاسدا ئەگەر راویەکە بە ریوایەت ناسرابوو و مەرجەکانی تێدا بوون، جا چ بە فیقە ناسراو بێ یان نا، ئەویش لەبەر بەهێزیی بەڵگەکانی جمهور و لاوازیی بەڵگەکانی نەیاران، کە ئەوە لە گەنگەشەکردنیدا دەرکەوت، هەروەها لەبەرئەوەی باس لە جیاکاری لەنێوان ئەوەی بە فیقە و ئیجتیهاد ناسراوە و هیتردا قسەیەکی داهێنراوی نوێیە وەك خاوەنی (کشف الاسرار) ئاماژەی بۆ کردوە.[2]

---

[1] کشف مع أصول بالزدوي ٢/٦٩٨ و پاشتر. (مەبەست لەم حەدیسە -وەك سەرچاوە فیقهیەکان روونیان کردۆتەوە ئەوەیە: سوودی شت (خەراج) هەقبایی زامنکردنە و ئەو لایەنە دەبیات کە زەمانکردنەکەی لەئەستۆدا بووە، کە زیاتر کرپارە-وەرگێر)

[2] کشف الأسرار مع البزدوي ٢/٧٠٣.

جیاوازی له بەرمەرجدانانی پێچەوانەنەبوونی یەکینە هەوالْ لەگەلْ قیاس ئەگەر راویەکە شەرعزان نەبوو، کاریگەریی بەرچاوی لە جیاوازی شەرعزان لە هەندێ حوکمی فیقهیدا هەبووە، لەوانە جیاوازی لە حوکمی فرۆشتنی ئاژەڵی شیر تێزاو (المصراة)[1]:

چەند حەدیسێك بەمانای لێك نزیك لەم مەسەلەیەدا هاتوون[2] ، لەوانە: ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: قال لا تَصُرُّوا[3] الإبلَ ولا الغنمَ فمن ابتاعها فهو بخيرِ النَّظرَينِ[4] بعد أن يحلبَها ثلاثًا إن رضِيَها أمسكَها وإن سخِطها ردَّها وردَّ معها صاعًا من تمرٍ، متفق عليه.

له ریوایەتێکیدا لە سەحیحی موسلیم[5]: فهو بالخيار ثلاثة أيام[6]

شەرعزان لەم حوکمەدا رای جیاوازیان هەیە گرنگترینیان سیانن:

یەکەم: وەرگرتنی حەدیسەکەی ئەبوهورەیرە لە جێگیرکردنی بژارە بۆ کڕیار لە گێڕانەوەی ئاژەڵەکە یان هێشتنەوەی، ئەوەیش مەزەبی جمهورە لە هاوەڵان و تابیعین[7]، هەروەها بۆچوونی مەزەبی مالیکی و شافیعی و حەنبەلی و شیعەی ئیمامی و هەروەها ئەبویوسفە لە حەنەفی وەك لە (شەرحی تەحاوی)یدا لە هەندێ لە وانە وتنەوەکانیدا لێی گوێزراوەتەوە. بەڵام واباوە ئەبویوسف لەم مەسەلەیەدا لە مەزەبی حەنەفی دەرنەچووە.

---

[1] مصراة: بەو ئاژەڵە شیردەرە دەوترێ کە شیرەکە لە گوانیدا دەهێڵرێتەوە و نادۆشرێ، بەزۆری لەکاتی فرۆشتنیدا تا کڕیار وابزانێ شیری زۆرە.

[2] لەوانە ئەوەیە ئیبن مەسعود لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە دەگێڕێتەوە: هەرکەس مەڕێکی شیر تێزاو (محفلە)ی کڕی و گێڕایەوە با صاعێکی لەگەڵدا بگێڕێتەوە. رواه البخاري. سبل السلام ٣/٢٧.

[3] سبل السلام ٣/٢٧

[4] واتە دوو را–کە: رایەك بۆ خۆی بە هەڵبژاردن و هێشتنەوە، رایەکیش بۆ فرۆشیار بە بۆ گێڕانەوە و هەڵوەشاندنەوە.

[5] واتە لە ئەبوهورەیرەوە.

[6] سبل السلام ٣/٢٦.

[7] سەرچاوەی پێشوو.

ئەو زانایانە لەسەر کارکردن بە حەدیسەکەی ئەبوهورەیرە کۆکن، بەجیاوازییان لە کارکردنەکەدا بەم شێوەیە:

مالیکیەکان دەڵێن بۆی هەیە ئاژەڵەکە بگێڕێتەوە ئەگەر دۆشیبوی لەگەڵ صاعێك لە قوتی باو (غالب) خەڵکی وڵاتەکە، واتە مەبەست تایبەتکردنی خورما نیە، ناشبێ لەبری صاعەکە شیر بگێڕدرێتەوە با هەردوولایش رازی بن، چونکە ئەوە فرۆشتنی خواردن بەر لە وەرگرتنی تێدەکەوێ، لەبەرئەوەی خوا گێڕانەوەی صاعی لەبری شیر واجب کردوە.[1]

هاوەڵانی شافیعی رایان جیاوازە: ئەبولعەباس ئیبن سەریج دەڵێن لە هەر وڵاتێکدا لە قوتی باو دەگێڕدرێتەوە، ئەوەیش لەگەڵ رای مالیکیەتدا کۆکە، ئەبو ئیسحاقی مروزی دەڵێ صاع لە خورما ئەسڵە، جا لەگەڵ گەنم بەراورد دەکرێ ئەگەر لەو گرانتر بوو دەکرێ، ئەگەر لەو کەمتر بوو نابێ، ئەگەر لە شوێنێك بوو خورما دەست نەدەکەوت نرخی صاعێك خورما واجب دەبێ، بەهەمان شێوە ئەگەر نرخەکەی لەسەر نرخی مەڕەکە یان زیاتر بوو، هەندێکیشیان دەڵێن: خورما واجبە یان گەنم کە برێتیەتی.[2]

شیعەی ئیمامی دەڵێن: نابێ لە صاع و گەنمەوە بگۆڕدرێ بۆ شتیتر، لەبەر کۆدەنگیی فیرقە و هەواڵەکانیان، هەروەها لەبەر حەدیسەکەی ئەبوهورەیرە.[3]

دووەم: ئاژەڵە شیرتێزاوەکە و شیرەکە خۆی دەگێڕدرێتەوە ئەگەر مابوو یان هاوچەشنەکەی ئەگەر فەوتابوو یان نرخەکەی لە رۆژی گێڕانەوەیەدا ئەگەر هاوچەشنی نەبوو، ئەوەیش مەزەبی هادەوییە[4]، دەڵێن: بڕیار بووەتە ئەوەی زەمانی فەوتاو ئەگەر هاوچەشن بوو هاوچەشنەکەی و ئەگەر بەهاییش بوو بەهاکەیەتی.

---

[1] بلغة السالك ٢/٥٣.

[2] المهذب للشيرازي ١/٢٨٢ و پاشتر.

[3] الخلاف للطوسي ١/٥٥٠ و پاشتر.

[4] سبل السلام ٣/٢٦.

شیریش ئەگەر هاوچەشن بوو بە هاوچەشنەکەی زەمان دەکریَ، ئەگەر بەهاییش بوو بەیەکێك لە دوو نەختینەکە مەزەندە دەکریَ و بەوە زامن دەکریَ، ئەی خورما یان خواردن چۆن زامن دەکرێن؟ لەبەرئەوەی واجب ئەوە بوو زەمانەکە بەپێی ئەندازەی شیرەکە جیاواز بیَ و بە صاع مەزەندە نەکریَ جا چ زۆر بیَ یان کەم.

سێیەم: مەزەبی حەنەفی: لە ئەسڵی مەسەلەکەدا رایان جیاوازە و دەڵێن: فرۆشراوەکە بە عەیبی شیر تێزان (تصرية) ناگەرێنرێتەوە، بۆیە گێڕانەوەی صاعێك لە خورما واجب نیە و بەزۆر بیانوو خۆیان لە کارکردن بە حەدیسەکە لاداوە: عیسا بن ئەبان دەڵیَ (کە لەوەدا دەبوسی و زۆربەی پاشینانی حەنەفی شوێنی کەوتوون) حەدیسەکە پێچەوانەی قیاسە و راویەکەیشی ئەبوهورەیرەیە، شەرعزان نیە بۆیە کاری پێناکریَ و کار بە قیاس دەکریَ. باقیی زانایانی حەنەفیش عوزریان ئەوەیە کە حەدیسەکە پێچەوانەی قورئان و سوننەی بەناوبانگە.

لەبارەی شێوەی پێچەوانەبوونیشی بۆ قیاس وتویانە: حەدیسەکە پێچەوانەی قیاسی ئوسوڵە لە چەند روویەکەوە، لەوانە:

١- گەرەنتیکردنی هاوچەشنەکان بە هاوچەشنی خۆیان و هی نرخدارەکانیش بە نرخە: شیر ئەگەر هاوچەشن بوو بژاردنەکەی بە هاوچەشنی خۆیەتی، ئەگەر بەهاییش بوو بژاردنی بە نرخی هاوشێوەیەتی، گەرەنتیکردنی صاعی خورمایش لە هەردوو ئەسڵەکە بەدەرە.

٢- گەرەنتیکردن بەئەندازەی تەلەفەکە مەزەندە دەکریَ چ کەم بیَ یان زۆر، ئەوەیش بەئەندازەی صاعێك مەزەندە کراوە.

٣- ئەوەی لە شیرەکە فەوتاوە ئەگەر.. هەبوو ئەوا بەشێك لەوەی عەقدی لەسەر کراوە رۆیشتوە، ئەوەیش رێگرە لە گێڕانەوە وەك ئەوەی هەندیَ لە ئەندامانی فرۆشراوەکە نەمابن و پاشان عەیبێك دەرکەوتبیَ، ئەوا ناگێردرێتەوە، ئەگەر پاش کڕینەکەیش رووی دا ئەوا لەسەر موڵکی کڕیار رووی داوە و گەرەنتی ناکا، هەروەها تێکەڵبوونیش رێگرە لە گێڕانەوە.

٤- حەدیسەکە گێڕانەوە بەبێ عەیب و مەرجی جێگیر کردوە، چونکە ئەگەر ناتەواویی شیر عەیب بووایە ئەوا دەبوو بەبێ شیرتێزانیش گێڕانەوەی بۆ جێگیر بکرایە، لە شەرعیشدا گێڕانەوە بەبێ عەیب یان مەرج نابێ، لەبەرئەوە مالیك لەیەکێك لە قسەکانیدا کاری پێ نەکردوە.[1]

هەروەها وتویانە: لەبەر ئەوەی حەدیسی میصرات لەم رووانە و هیترەوە پێچەوانەی قیاسی ئوسوڵە، پێویستە یان رەت بکرێتەوە یان تەئویل بکرێ با دووریش بێ، بەوەی دژبەرییەکە لەبارەی مەڕێکی (محفلە)[2] بووە، پێغەمبەریش (ﷺ) هانی فرۆشیارەکەی دا بە سوڵح نەك بەحوکم ئەوەی بردویەتی بیگێڕێتەوە، بەڵام ئەو رازی نەبوو بە عیللەی شیر لە ماوەی سێ رۆژدا، لەبەرئەوە پێغەمبەر صاعێك لە خورمای زیاد کرد و فرۆشیارەکە بە مەڕ و خورماکە رازی بوو و پارەکەی گێڕایەوە بە سوڵح نەك بەحوکم. بەڵام راوی وای زانیوە ئەوە حوکمە، ئەوکاتیش رێگە بەوە دەدرا هەواڵ (حەدیس) بەو مانایەی لای خۆیانە بگێڕدرێتەوە، بۆیە تێگەیشتنەکەی خۆی بە دەربڕینی خۆی گوێزاوەتەوە.[3]

تێبینی دەکرێ مەرجی شەرعزانبوونی راوی وەك پێشتر باس کرا رای زانایانی حەنەفی لەسەر نیە. عەبدولعەزیز ئەلبوخاری روونی کردۆتەوە: ئەوە رێچکەی عیسا بن ئەبانە و قازی پێشەوا ئەبوزەیدی دەبوسی هەڵیبژاردوە و حەدیسی (المصراة) و هەواڵی رووتەکان (خبر العرایا)ی[4] لێ دەرچوە و زۆربەی پاشینان شوێنی کەوتون. بەڵام بەلای شێخ ئەبوبەکری کەرخی و ئەو شەرعزانە حەنەفیانەی شوێنی کەوتون

---

[1] بڕوانە: حاشية المرجاني على التوضيح بشرح التنقيح ٧٤/٣ و پاشتر.

[2] (محفلە)یش هەر میصراتە. ئەو شیردەرەی شیر لە گولنەکانیدا دەهێلرێتەوە، بەزۆری بۆ ئەوەی کڕیاری پێ فریو بدرێ کە وابزانێ شیردارە و بیکڕێ.

[3] كشف الأسرار مع البزدوي ٧٠٢/٢ فتح الغفار بشرح المنار ٨١/٢-٨٢.

[4] العرايا، کۆی (عريان)ە بەمانای رووت. بە رووتکردنەوەی دارخورما دەوترێ. لای شافیعیەت فرۆشتنی عەرایا (بيع العرايا) بریتییە لە فرۆشتنی روتاب بە دارخورماکەوە بە خورمای لێکراوەی سەر زەوی، یا فرۆشتنی ترێ بەدارەوە بە مێوژ لە خوار پێنج وسقەوە- وەرگێڕ.

فیقهی راوی مەرج نیە بۆ پێشخستنی هەواڵەکەی بەسەر قیاسدا بەڵکو هەواڵی هەموو کەسێکی دادپەروەری و زەبتکەر وەردەگیرێ ئەگەر پێچەوانەی کیتاب و سوننەی بەناوبانگ نەبێ و پێش قیاس دەخرێ. ئەبولیوسر دەڵێ زۆربەی زانایان مەیلیان بەلای ئەمەدایە.[1]

لەبەرئەوەی گۆڕین لەلایەن راویەوە پاش ساغبوونەوەی دادپەروەری و زەبتی شتێکی وەهمییە، بەزاهیر ئەو چۆنی بیستوە وای دەگێڕێتەوە، ئەگەر بشیگۆڕێ بەشێوەیەك نایگۆڕێ ماناکەی بگۆڕێ، ئەمە زاهیری حاڵی هاوەڵان و راوییە دادپەروەرەکانە.

لە هەندێ ئیملاکانیدا لە ئەبویوسفەوە دەگێڕنەوە کە کاری بە حەدیسی میصرات کردوە و بژارەی بۆ کڕیار جێگیر کردوە.[2]

لە ئەبوحەنیفەوە (رەحمەتی خوای لێبێ) دەگێڕنەوە گوتویەتی (ئەوەی لەلایەن خوا و پێغەمبەرەکەیەوە بۆمان هاتبێ لەسەر سەر و چاو)، ئەمە جگە لەوەی لە هیچکام لە سەلەف ریوایەت نەکراوە فیقهی راوی کردبێتە مەرج، بۆیە ئەمە داهێنراو (مستحدث)ە.

هەرچی رێکەوتنیانە لەسەر وەرنەگرتنی حەدیسی میصرات -جگە لەوەی دراوەتە پاڵ ئەبویوسف- لەبەرئەوەیە وتویانە: حەدسێکە پێچەوانەی کیتاب و سوننەی بەناوبانگە کە کارکردن بە قیاسیان لە فرۆشتنی میصراتدا واجب کردوە[3]، لەبەرئەوەی گەرەنتیکردنی دەستدرێژی (العدوان) لەو شتەی هاوچەشنی هەیە بە هاوچەشن مەزەندە کراوە بەپێی ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾[4] ، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا

---

[1] كشف الأسرار مع البزدوي ٢/٧٠٣.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

[4] البقرة/١٩٤.

عُوقِبْتُم بِـهِ﴾[1]. ئـەوەیش هاوچەشـنی نیـە بـە نـرخ مەزەنـدە كـراوە بـەگوێرەی ئـەو حەدیسە بەناوبانگەی دەڵێ: ((من أعتق شخصاً له في عبد قُوّم عليه نصيب شريكه إن كان موسراً))[2]، هەروەها ئەوەی ئەفەرموێ: (الخـراج بالضـمان)، هـەروەها كـۆدەنگی دروست بووە لەسـەر ئـەوەیش لـەكاتی فـەوتانی ماڵەكـە و مـەحاڵبوونی گێڕانەوەیـدا هاوچەشن یان نرخەكەی واجبە.[3]

**زاڵكردن:**

بەلای منەوە رای زاڵ ئەوەیە جمهور بۆی چووە لە چەند روویەكەوە، لەوانە:

١– ئەبوهورەیرە شەرعزان بوو و هیچ لە پێویستیەكانی ئیجتیهادی كەم نەبوو، لە سـەردەمی هاوەڵانـدا فتـوای دەدا، لـەو سەردەمەیشـدا تـەنها شـەرعزان و موجەهید فتوایان دەدا، لە گـەورە هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو، پێغەمبـەر داوای لەبەركردنی بۆ كرد و خـوایش نزاكـەی قبـوڵ كـرد تـا بـاس و خـواس و حەدیسی بە جیهاندا بڵاو بوویەوە.

٢– قیاس، گشتیبوون (عموم) لەخۆ دەگرێ لە سەرجەم فەوتاوەكانـدا، ئەمـەیش تایبەتە، تایبەتیش پێش گشتی دەخرێ.

٣– ئەم حەدیسە ئەسڵێكی سەربەخۆیە و ناوترێ پێچەوانەی قیاسی ئوسوڵە.

٤– ئـەوەیش حەنەفیـەت كردویەتیـە بەڵگـە، بـەوەی كـەمكردن كـاتێ رێگـرە لـە گێڕانەوە ئەگەر بۆ زانینی عەیبەكە نەبێ بەڵام لێـرەدا بـۆ زانینـی عەیبەكەیـە، رەت دەكرێتـەوە. هـەروەها بـەوەی دەڵـێ دیـاریكردنی مـاوەی بـژارە لـەم

---

[1] النحل / ١٢٦.

[2] عن أبن عمر (رض) قال: قال رسول الله (ﷺ) من اعتق شركاً له في عبد فكان له مال بمبلغ ثمن العبد قوم عليه قيمة عبد فأعطى شركائه حصصهم وعتق عليه العبد والا فقد عتق ما عتق متفق عليه، سبل السلام ١٣٩/٤ ورواه الجماعة عن ابي هريرة (ﷺ) أيضاً راجع فتح الباري ٧٧/٦، ٨٢ نصب الراية ٢٨٢/٣ نيل الأوطار ٧٣/٧.

[3] بروانە: التقرير والتحبير مع التحرير ٢٥٠/١ كشف الأسرار مع البزدوي ٧١١/٢ فتح الغفار ٨٢/٢.

مەسەلەیەدا لەبەرئەوە بووە بەزۆری بەو ماوەیە نەبێ کە تەنها تایبەتە بەو، حوکمی شیرتێزان (تصرية) دەرناکەوێ، دیسان بەوەی کاتێ کڕیار گوانی ئاژەڵەکە بەپڕی دەبینێ وەك ئەوە وایە فرۆشیارەکە بۆی کردبێتە مەرج کە ئەوە هەر خۆی وایە، بۆیە حوکمی بژارەی مەرجی هەیە لەڕووی ماناکەی، کارکردنیش بەگوێرەی مەرجی ناوەکی (الشرط الضمني) هاوشێوەی لە فیقهی ئیسلامی و یاسای وەزعیدا زۆرە.

**مەرجی دووەم: لای حەنەفیەت بۆ کارکردن بە یەکینە هەواڵ مەرج ئەوەیە لە بوارێکدا نەبێ بەلای پێ بڵاو ببێتەوە.** [1]

وتویانە: لەبەرئەوەی گێڕانەوەی بەرێگەی تاکینە (ئاحاد) لەگەڵ ئەوەدا لەو شتانەیە حەدیس لاواز دەکا، لەبەرئەوەی ئەو شتانەی دووبارە دەبنەوە و پێویستیەکی زۆر هەیە پێیان، پاڵنەر هەیە بۆ گواستنەوەیان بە رێگەی جەمینە یان ناوبانگ نەك بە رێگەی تاکینە، بۆیە هاتنی هەواڵ بە تاکینە لەم جۆرەدا ئاماژەیە بەوەی ساغ نەبۆتەوە هی پێغەمبەر(ﷺ) بێ، جمهور رایان وایە یەکینە هەواڵ ئەگەر نەپچڕاو بوو و مەرجەکانی راوی تێدا دەستەبەر بوو پێویستە بەرەهایی کاری پێ بکرێ جا چ لەبوارێکدا بێ بەلای پێ بڵاو بێتەوە یان نا، لەبەرئەوەی ئەو بەڵگانەی ئاماژەن بۆ حوججیەتی یەکینە هەواڵ، جیاوازییان نەکردوە لەنێوان ئەو هەواڵەی بەلایان پێ بڵاو دەبێتەوە و هیتردا.

---

[1] واتە تایبەت و گشتی پێویستیان بە زانینیەتی بۆ کارپێکردنی، بێناوبانگی و تەواتورنەبوونی نامۆیە، چونکە خاوەن شەرع فەرمانپێکراو بوو ئەوەی خەڵك پێویستیانە بۆیان روون بکاتەوە، ئەگەر رووداوەکە لەوانە بوو بەلای پێ بڵاو دەبوویەوە وادیارە خاوەن شەرع روونکردنەوەی ئەوەی بۆ هەموان بەجێنەهێشتوە، جا کاتێ گواستنەوەکە ناوبانگی پەیدا نەکردوە دەزانین سەهو یان نەسخکراوەیە. أصول السرخسي ١/ ٣٦٧ و پاشتر..

هەروەها لەبەرئەوە ویتر و حوکمی دەماربڕی (فصد) و حیجامە و قاقا و بەتاك وتن یان بەجووتبووتنی ئیقامەیش هەموویان بەلایان پێ بلاو دەبێتەوە و بە یەکینە هەوالیش جێگیر کراون.[1]

دانانی ئەم مەرجە بۆ کارکردن بە یەکینە هەوالْ کاریگەری خۆی هەبووە لە جیاوازیی شەرعزان لە هەندێ حوکمدا، لەوانە دەستنوێژشکان بە دەستدان لە عەورەتی پێشەوە:

سەرچاوەی ناکۆکیەکەیش جیاوازییە لە کارکردن بە حەدیسی بسرە کچی سەفوان کوڕی نوفلی ئەسەدی کە لەو ئافرەتانە بوو بە پێغەمبەر فرۆشرابوو، عەبدولای کوڕی عومەر و هیتر لێیەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (هەرکەس دەستی بەر زەکەری کەوت با دەستنوێژ بگرێ).[2]

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن عوزرخواییان هێناوەتەوە لە کارکردن بەم حەدیسە، لەبەرئەوەی ئەگەر حوکمەکەی سابت بوایە ژمارەیەکی زۆر دەیانگێڕایەوە، لەبەرئەوەی پالنەر بۆ گواستنەوەی هەبووە، چونکە پەیوەندی بە شتێکەوە هەیە هەموو کات دووبارە دەبێتەوە، مادام تەنها یەك کەس گواستبێتیەوە ئەوە بەلگەیە لەسەر سەهو یان هەلەی ئەو کەسەی گێڕاویەتیەوە، لەبەرئەوە وتویانە: دەستدان لە پێش یان پاش دەستنوێژ ناشکێنێ با بە شەهوەت یان بە ناولەپی دەست یان ناو پەنجەکانیش بێ.

جمهور لەگەلْ کارکردنن بە حەدیسەکەی بسرە، بەلگەیشیان ئەوەیە دەقە گشتیەکان گوێڕایەلیکردنی پێغەمبەریان واجب کردوە و لەوەدا جیاوازییان لەنێوان

---

[1] واتە حەنەفیەت.

[2] أخرجه الخمسة وصححه الترمذي وابن حيان وقال البخاري هو أصح شيء في هذا الباب وأخرجه الشافعي وأحمد وابن خزيمة والحاكم وابن الجارود وقال الدار قطني صحيح ثابت انظر سبل السلام ٦٦/١.

شته دووباره و نادووبارەکاندا نەکردوه تا ژماره بکرێته مەرج لەوەی دووباره دەبێتەوه.

پاشان گرنگ راستیی ریوایەتەکەیە نەك ژمارەی راویەکان[1]، هەروەها پێداگیری لەسەر دادپەروەری بوون گومان لە راستگۆیی دەگەیەنێ بۆیە پێویستە قبوڵ بکرێ لە بارێکدا بەلای پێ بلاو دەبێتەوه وەك چۆن ئەگەر بەلای پێ بلاو نەبێتەوە قبوڵ دەکرێ. هەروەها لەوەی بەلای پێ بلاو دەبێتەوه قیاس قبوڵ دەکرێ کە لە یەکینە هەواڵ لاوازترە، بۆیە کارکردن بە یەکینە هەواڵ لەپێشترە.

مەرجی سێیەم: لای حەنەفیەت و ئەوانەی هاورایانن مەرجی کارکردن بە یەکینە هەواڵ ئەوەیە بەڵگەیەکی بەهێزتر لە قورئان یان سوننەی جەمینە یان سوننەی بەناوبانگ پێچەوانەی نەبێ، لەبەرئەوەی هەردووکیان زیاتر لە یەکینە هەواڵ زانین دەگەیەنن، ئەویش لەبەر شوبهەی ئەگەری هەڵەکردنی راوی یان لەیادکردنی یان سەهوکردنی یاخود درۆکردنی، ئەوەیش شوبهەی تێدا بێ بەرهەڵستی ئەوەی پێ ناکرێ کە شوبهەی تێدا نیە.

بەڵام جمهور دانانی ئەم مەرجەیان پەسەند نەکردوه، لەبەرئەوەی دەکرێ لەکاتی تێکگیراندا گشتیبوونی دەقەکانی کیتاب یان سوننەی جەمینە یان سوننەی بەناوبانگ، بە یەکینە هەواڵ تایبەت بکرێ، هەروەك بە دروستی دەبینن رەهای ئەو دەقانەی پێ بەند بکرێ. دانانی ئەم مەرجە رۆڵی هەبووە لە جیاوازیی حەنەفیەت لەگەڵ جمهور لە هەندێ مەسەلەدا، لەوانە:

جیاوازیی لە دروستیی داوەریکردن بە یەك شایەت و سوێندخواردنی سکالاکار لە بابەتە ماڵیەکاندا:

---

[1] الأحكام في أصول الأحكام للآمدي ١٩٨/١

١- ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) و هاوەڵانی و زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسێن و ئیمام یەحیا و زوهری و نەخعی و ئیبن شبرمە و ئەوانەی هاوڕایانن رایان وایە داوەریکردن بەو شێوەیە دروست نیە.

٢- لەوانەی لەگەڵ دروستیی داوەریکردنن بە یەك شایەت و سوێندخواردنی سکاڵاکار (مدعي): کۆمەڵێ لە هاوەڵان لەوانە خەلیفە راشیدەکان و ئیبن عەباس و کۆمەڵێ لە تابیعین، لەوانە عومەڕی کوڕی عەبدولعەزیز و شورەیح و شەعبی و شەرعزانی مەدینە و سێ ئیمامەکە و شەرعزانیان و هادەوی.

هۆی ناکۆکیەکە: جیاوازییانە لە کارکردن بەوەی ئیبن عەباس لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە ریوایەتی کردوە کە بە شایەتێك و سوێندێك داوەری کردوە.[1]

ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین عوزرخواییان هێناوەتەوە لە کارکردن بەم حەدیسە لەبەرئەوەی یەکینە هەواڵە و پێچەوانەی کیتاب و سوننەی بەناوبانگە. هەرچی قورئانە ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ﴾[2]، لەبەرئەوەی دەستەواژەی (وَاسْتَشْهِدُواْ) فەرمانێکی کۆبێژ (مجمل)ە روونی کردۆتەوە بەوەی مەبەست بەشایەتگرتنی دوو پیاوە، ئەگەر نەبوو پیاوێك و دوو ژن، ئەگەر ئەوەیش سابت بوو هەواڵی داوەریکردن بە یەك شایەت و سوێند زیادە دەبێ بۆ سەری، لەبەرئەوەی وردکردنەوە پاش کۆبێژی بەشێوەیەکی گومانبڕ مەبەست دیاری دەکا و زیادە وەك نەسخکردنەوە وایە -بەلای حەنەفیەتەوە- پاشان ئەوەی خوا لە هەمان ئایەتدا ئەفەرموێ (وَأَدْنَى أَلاَّ تَرْتَابُواْ)، دەقە لەسەر ئەوەی کەمترین شت کە گومانی پێ دەڕەوێتەوە شایەتیی دوو شایەتە بەم سیفەتە، لەو ئاستەیش کەمتر گومانی پێ ناڕەوێتەوە، ئەمەیش ئاماژەیە

---

[1] عن ابن عباس (ﷺ) ان النبي (ﷺ) قضى بيمين وشاهد أخرجه مسلم وأبو داود والنسائي وقال اسناده جيد بلوغ المرام مع سبل السلام ١٣١/٤.

[2] البقرة ٢٨٢.

بـەوەی نـاکرێ بگـۆڕدرێ بـۆ شـایەتی یـەك کـەس و سـوێندخواردن، لەبەرئـەوەی حوکمەکەی لە شایەتیدانی دوو پیاوەوە گواستۆتەوە بۆ شایەتیدانی دوو ژن و پیاوێك لەکاتێکدا ئامادەبوونی ئافرەتـان لـە دانیشتنەکانی قـەزا بـۆ شـایەتیدان پێچـەوانەی عادەتە لەبارێکدا سکاڵاکار بتوانێ بەسوێندخواردنی بەڵگەکەی تەواو بکا.

لەکۆتاییشـدا ئـەوەی خـوا ئەفـەرموێ (أَوْ آخَـرَانِ مِـنْ غَيْـرِكُمْ) حوکمەکـەی بـۆ شـایەتیدانی دوو زیممـی لای دوو شـایەتی موسـڵمان گواسـتۆتەوە، جـا ئەگـەر یـەك شایەت لەگەڵ سوێندخواردنی سکاڵاکار بەڵگە بوایـە دەبـوو لـەکاتی پێویستدا ئـەوە روون بکرایەتـەوە، بێـدەنگبوونیش لـە شـوێنی روونکردنـەوەدا بەڵگەیـە لەسـەر نادروستیی وەرگرتنی ئەوە.[1]

هەرچـی سـوننەی بەناوبانگـە، ئەوەیـە پێغەمبـەر(ﷺ) ئەفـەرموێ: (البيّنـة علـى المدعي واليمين على من أنكر)[2]، وتویانـە: حەدیسـی داوەریکـردن بـە یـەك شـایەت و سوێندخواردنی سکاڵاکار پێچەوانەی ئەم حەدیسە بەناوبانگەیە، لەبەرئـەوەی هـەموو تاکـەکانی بەڵگـەی لەسـەر سـکاڵاکار و هـەموو تاکـەکانی سـوێندخواردنی لەسـەر حاشاکەر (المنكر) داناوە.

هەروەها پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: (شاهداك أو يمينه)[3] لەبەرئەوەی سکاڵاکاری لەنێوان دوو شتدا سەرپشك کردوە کە سێیەمیان نیـە، یـان بەڵگە و سوێندخواردنی سکاڵا لەسەرکراو (مـدعى عليـه)، سەرپشـککردنیش لـەنێوان دوو شتدا رێگرە لە تێپەڕاندن و کۆکردنەوەیان.

بەڵام کۆڵەکەی بەڵگەی جمهور: داوەریکردنی پێغەمبەرە(ﷺ) بە یـەك شـایەت و سوێندی سکاڵاکار، ئیبنول جەوزی باسی ژمارەیەك لەوانەی کردوە ئـەم حەدیسـەیان

[1] بڕوانە: أصول السرخسي ٣٦٦/١ أصول الشاشي ص ٨٤.
[2] صحيح الترمذي ٦١٧/٣
[3] سبل السلام ١٢٩/٤ عن الأشعر بن قيس (ﷺ) قال كان بيني وبين رجل خصومة في بئر فاختصمنا إلى رسول الله (ﷺ) فقال (ﷺ) شاهداك أو يمينه، إحكام الأحكام شرح عمدة الأحكام ٤٠١/٤.

گێڕاوەتەوە، کە لە بیست هاوەڵ زیاترن، راستترینی ئەو رێگایانەیش حەدیسەکەی ئیبن عەباسە کە شافیعی لەبارەیەوە دەڵێ ئەم حەدیسە سەلماوە و کەس لە ئەهلی عیلم رەتی ناکاتەوە ئەگەر هیچیتریشی لەگەڵ نەبێ، لەکاتێکدا هیتریش هەن کە پشتئەستووری دەکەن.[1]

لە ئەبوهورەیرەیشەوە شتێکی هاوشێوە ریوایەت کراوە کە ئەبوداود و تەرمزی هێناویانە و ئیبن حەبان بەڕاستی داناوە، ئیبن حاتەمیش لە (العلل)دا لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە کە سەحیحە.[2]

**زاڵکردن:**

زاڵ ئەوەیە جمهور بۆی چووە لە دروستیی قەزاوەتکردن بە یەك شایەت و سوێندخواردنی سکاڵاکار لە کاروبارەماڵیەکاندا، ئەویش لەچەند روویەکەوە، لەوانە:

١- بەهێزیی حەدیسەکەی ئیبن عەباس لەبەر ساغبوونەوەی ریوایەتەکەی و ریوایەتی هاوماناى ئەوە لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە، هەروەها پاڵپشتی کراوە بە قبولکردنی لەلایەن جەماوەری هاوەڵان و تابیعین و جمهوری شەرعزانی مەزەبە بەکۆمەڵەکان، کە ئەوە مەزەبی حەوت شەرعزانەکەی مەدینەیە.

٢- ئەوەی حەنەفیەت بۆی چووە لەسەر رێسای (أن الزيادة على الكتاب نسخ ولا تثبت بخبر الواحد) دامەزراوە لەکاتێکدا ساغ نەبوەتەوە لە زۆر فەرعە مەزەبیەکانیاندا پابەندی بووبن.

٣- ئەو ئایەت و حەدیسەی حەنەفیەت کردونی بەبەڵگە بە مەفهومی ژمارە ئاماژەن بە قبوڵنەکردنی شایەت و سوێند و حوکم بەڕووتی، ئەم مەفهومە لای زۆربەی ئەهلی ئوسوڵ پێچەوانەی گوتراو نیە، ئەویش ئەوەیە لە کارکردن بە

---

[1] مقارنة المذاهب ص ١٢٧.

[2] سبل السلام ١٣١/٤.

شایەتێك و سوێندخواردن هاتووە، پاشان کارکردن بە شایەتیی دوو ئافرەت لەگەڵ پیاوێکدا پێچەوانەی مەفهومی حەدیسی (شاهداك أو یمینه)یە، ئەگەر وتیان: گوتراو (مەنتوق)ی ئایەتەکەمان پێش ئەم مەفهومە خستوە، پێیان دەوترێ مەنتوقی ئەو حەدیسانەی لەم بابەدا هاتوون پێش ئەو مەفهومە دەخرێ. پاشان هەموو ئەمانە لەسەر ئەوە دامەزراوە کە حەنەفیەت و ئەوانەی لەگەڵیانن کار بە مەفهومی ژمارە دەکەن، ئەگەر کاری پێنەکەن ئەوا حوججەکە لەسەریان روونتر و تەواوترە.[1]

مەرجی چوارەم: بەلای حەنەفیەتەوە بۆ کارکردن بە یەکینە هەواڵ پێویستە راویەکە خۆی پێچەوانەی ئەو هەواڵە رەفتار نەکا: چونکە پێچەوانەی ریوایەتی خۆی ناجولێتەوە مەگەر بەڵگەیەکی گومانبڕی نەسخکەرەوەی دۆزیبێتەوە کە بەلایەوە بووەتە واجب واز لە ریوایەتەکەی بێنێ، بەم پێیە کردەوەی راویەکە لای حەنەفیەت لەپێش ریوایەتەکەیە جگە لە کەرخی، ئیبازیش ئەوەیان وەرگرتوە.[2]

جمهور لەوەدا لەگەڵیان نیە، رازی دەڵێ لەسەر ئەوە رێکەوتون کە سەرپێچیکردنی حوففاز رێگر نیە لە قبوڵکردن و کێشە نیە لەوەی مەزەبەکەی پێچەوانەی ریوایەتەکەی بێ.

قەرافی لە شیکردنەوەی بابەتی ناکۆکیەکەدا دەڵێ[3]: (ئەم مەسەلەیە پێویستە تایبەت بکرێ بە هەندێ راوی و بەپێی ئەو راوییەی راستەوخۆ لە پێغەمبەری گواستۆتەوە وەردەگیرێ تا بگونجێ بوترێ ئەو باشتر لە مەبەستی قسەکەر

---

[1] بڕوانە: مقارنة المذاهب في الفقه ص ١٣٠ و پاشتر.

[2] سالمی دەڵێ: مەرجی شەشەم ئەوەیە راویەکە بەپێچەوانەی ئەوەی گێڕاویەتیەوە کاری نەکردبێ، چونکە ئەو کەسەی حەدیسێ ریوایەت بکات و بەپێچەوانەی ناوەرۆکەکەی بجولێتەوە، ئەوە تۆمەتبارکردنی یان دڵنانی ریوایەتەکە یان لە ئاسانکاریی کارکردن واجب دەبێ، هەموویشیان کار لە قبوڵکردنی ریوایەت دەکەن.. شمس الأصول ٢/٣٥.

[3] شرح تنقیح الفصول للقرافي ص٣٧٠-٣٧١.

گەیشتوە، هەرچی نموونەکەی مالیك و سەرپێچیکردنیەتی بۆ حەدیسی بژارەی مەجلیس لە فرۆشتندا کە ریوایەتی کردوە، ناچێتە خانەی ئەم مەسەلەیە، لەبەرئەوەی راستەوخۆ قسەکەری نەدیوە تا بگونجێ بوترێ رەنگە هەندێ قەرینەی (حالی) یان (مەقالی) دیوە کە خواستویەتی سەرپێچی بکا، بۆیە مەسەلەکە بە گشتیبوونەکەی نابێ).

شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ حەدیس ئەگەر زاهیرێکی هەبوو بۆی دەگەڕێتەوە، چونکە بەڵگە لە رواڵەتەکانی شەریعەتدایە نەك لە مەزهەبەکانی راویەکاندا، بەڵام ئەگەر زاهیرێکی نەبوو بۆی بگەڕێتەوە، ئەوا لە بەڵگەبوون دەکەوێ و پشت بە لێکدانەوەی راوی دەبەسترێ، چونکە ئەو باشتر لە حاڵی قسەکەر شارەزایە و زاهیرێکی شەرعیش پێچەوانەی نەبووە.[1]

ئیبنول قەیم دەڵێ: (ئەوەی دینداری بۆ خوا پێدەکەین و جگە لەوە کار بەهیچیتر ناکەین، ئەوەیە حەدیس ئەگەر ساغ بوویەوە هی پێغەمبەری خوایە و بەڵگە نەبوو کە بە حەدیسێکیتری نەسخ کرابێتەوە، فەرزە لەسەرمان و لەسەر ئوممەت وەریبگرێ و واز لە پێچەوانەکەی بێنێ هەرچی بێ، لەبەرئەوەی دەکرێ راوی حەدیسەکە لەبیر بکا، یان لەکاتی فتواداندا بیری نەکەوێتەوە، یان بیری بۆ دیلالەتی لەسەر ئەو مەسەلەیە نەچێ، یان تەئویلێکی بنزالْ (مرجوح) وەربگرێ، یان شتێك بە خەیاڵیدا بێ کە دژی بێ و لەهەمان شتدا دژی نەبێ، یان لاسایی کەسێکتر بکاتەوە لە فتوادانی بە جیاواز لەوە لەو رووەوە بە زاناتری بزانێ و پێی وابێ ئەو کەسە لەبەر بەڵگەیەکی بەهێزتر پێچەوانەی فتوای داوە).[2]

لە خستنەرووی ئەم رایانە و هیتر دەگەینە ئەو دەرەنجامەی ئەسڵ لای جمهور کارکردنە بە رواڵەتی حەدیس نەك مەزهەبی راوی، هەربۆیە ناچێ بەلای‌ۆ وەرگرتنی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.
[2] إعلام الموقعین ٣/٣٥.

کردەوەی راویەکە تا بۆی دەرنەکەوێ سەرپێچیکردنەکەی لەبەر دژە بەڵگەیەکی بەهێزتر بووە لەوەی ریوایەتی کردوە.

لەبەرچاوگرتنی ئەم مەرجە کاریگەری هەبووە لە جیاوازیی شەرعزان لە هەندێ حوکمی شەرعیدا، لەوانە:

جیاوازییان لە دروستیی شووکردنی ئافرەتێك بەبێ رەزامەندیی وەلیەکەی کردبێتی، کە چەند رایەك هەیە لەوبارەوە هەن، گرنگترینیان ئەمانەن:

أ- ئەبوحەنیفە (رەحمەتی خوای لێبێ) و ئەبویوسف لە زاهیری ریوایەتدا، هەروەها زوفر و ئەوانەی هاوڕایانن لەگەڵ ئەوەن ئەم شووکردنە بەڕەهایی دروستە، بەڵام وەلی مافی پەڵپگرتن (ئیعتیراز)ی هەیە ئەگەر شووکردنە بە کەسی ناهاوشان بوو، بەو مەرجەی منداڵی نەبووبێ یان دیار نەبێ کە دووگیانە.[1]

ب- مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق و زۆر لە زانایان رایان وایە هاوسەرگیری بە عیبارەتی ئافرەت دروست نابێ، جا چ ئەسڵی بێ یان وەکیل.[2]

ج- ئەبو ثور دەڵێ ئەگەر وەلیەکە مۆڵەتی پێ دا دروستە، بەڵام ئەگەر مۆڵەتی پێنەدا بەتاڵە.[3]

د- دادودی زاهیری پێی وایە ئەگەر بێوەژن بوو دروستە، بەڵام ئەگەر عازەب بوو بەتاڵە.[4]

هـ- محەمەد بن ئەلحەسەن لە زانایانی حەنەفی دەڵێ دروستە و لەسەر مۆڵەتی وەلی وەستاوە ئەگەر مۆڵەتی پێدا، ئەگینا بەتاڵە. هەروەها دەڵێ ئەگەر وەلی مۆڵەتی نەدا قازی بۆی هەیە عەقدەکە نوێ بکاتەوە و گوێ بەو نەدا، دەوترێ

---

[1] فتح القدير مع الهداية ٣/٢٩٤ و پاشتر.

[2] المهذب للشيرازي ٢/٣٥.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

[4] مقارنة بين المذاهب في الفقه ص ٥٩

پاشتر گەڕاوەتەوە سەر رای ئەبوحەنیفە و باقیی هاوەڵانی.[1]

و- شەعبی و زەهری رایان وایە بۆ کەسی هاوشان دروستە و بۆ نەشیاو بەتاڵە، ئەوەیش ریوایەتی حەسەنە لە ئەبوحەنیفەوە.

کۆی ئەم بۆچوونانە دابەش بوون بەسەر: بەدروست دانانی بەرەهایی، بە نادروست دانانی بەرەهایی، دانانیدا بە وەستاو بەرەهایی و هەندێ رایتریش کە وردیان کردۆتەوە.

ناکۆکییان لە کارکردن بە حەدیسەکەی عائیشە گرنگترین هۆی جیاوازییانە لەم مەسەلەیەدا. عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: أيما امرأة نكحت نفسها بغير أذن وليها فنكاحها باطل فإن دخل بها فلها المهر بما استحل من فرجها، فإن اشتجروا وفي رواية فإن تشاجروا فالسلطان ولي من ولا ولي له.[2] (واتە: هەر ئافرەتێك خۆی مارە کرد بەبێ ئیزنی وەلیەکەی مارەکردنەکەی بەتاڵە، ئەگەر پیاوەکە چووەلای ئەوا بەهۆی حەڵاڵکردنی دامێنیەوە مارەییەکەی دەکەوێ، ئەگەر کێشەیان تێکەوت ئەوا دەسەڵات وەلی بێ وەلیەکانە).

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن عوزرخواییان لە کارکردن بەم حەدیسە هێناوەتەوە، لەبەرئەوەی یەکینە هەواڵە، عائیشە خۆیشی کە راویی حەدیسەکە بەپێچەوانەی ئەوە کاری کردوە و حەفسەی کچی عەبدوڕەحمان کچی ئەبوبەکری برازای کە باوکی ئامادە نەبوو و لە شام بوو، بەبێ ئیزنی وەلیەکەی بەشوودا.

هەروەها وتویانە: گومان لە عەدالەتی هاوەڵان و پەرۆشییان بۆ شوێنپێهەڵگرتنی پێغەمبەر(ﷺ) نیە، جا ئەگەر هاوەڵێك وازی لە ریوایەتەکەی هێنا لە بارێکدا حەدیسەکەی دەزانی، بۆمان دەردەکەوێ لەبەر نەسخەکەرەوەیەك وازی لە

---

[1] فتح القدير مع الهداية ٢٥٦/٣

[2] أخرجه الأربعة إلا النسائي وصححه أبو عوانة وابن حبان والحاكم سبل السلام ١١٨/٣ نيل الأوطار ١٣٤/٦ السر الكبرى ١١١/١.

ریوایەتەکەی هێناوە.

حەنەفیەت ئەم بۆچوونەیان بە قورئـان و سـوننە و مـاقوولْ (المعقول) پشـتقایم کردوە:

١- قورئان: دەلێن لە زیاتر لە ئایەتێکدا بەئاشکرا مارەکردن دراوەتە پـالْ ئـافرەت، ئەسلْ لە دانەپالْیشدا ئەوەیـە بکـەری راسـتەقینە بـێ، لەوانـە خـوا ئەفـەرموێ: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾[1] ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَـلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْـنَ فِـي أَنفُسِـهِنَّ بِـالْمَعْرُوفِ﴾[2] ﴿وَإِذَا طَلَّقْـتُمُ النِّسَـاء فَـبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾[3]، ئم ئایەتانە و هیتر بەئاشـکرا ئـەوە ئەگەیەنن کـە ئەگـەر ئـافرەت خـۆی مـارە کـرد، مارەکردنەکـەی دادەمـەزرێ و دروستە.[4]

٢- سوننە: ئەوەی لە هاوسەرگیریی پێغەمبەر(ﷺ) بە ئوم سەلەمەدا هـاتووە، کـە ناردیە لای و خـوازبێنی کـرد، ئـەویش گـوتی: کـەس لـە وەلیـەکانم حـازر نیـە، پێغەمبەری خوایش فەرموی: کـەس لـە وەلیـەکانت -چ حـازر یـان بـزر- بـەوە ناڕازی نیە.[5]

ئەم حەدیسە بەلگەیە لەسەر ئەوەی ئوم سەلەمە بەبێ ئیزنـی وەلیەکـەی خـۆی بەشـوو داوە، هـەروەك بەلگەیـە لەسـەر ئـەوەی وەلیـەکان تەنانـەت مـافی ئیعتیزاریشیان نیە ئەگەر لێوەشاوەیی هەبوو.

٣- ماقوولْ: نیکاح کۆمەلێ ئامانجی بەرایی هەیە تایبـەتن بـە ئـافرەت و کـەس لـە وەلیەکان تێیدا هاوبەش نیە، وەك حەلاْلبوونی چێژبینین و واجببوونی نەفەقە و

---

[1] البقره٢٣٠

[2] البقرة٢٣٤

[3] البقرة٢٣٢

[4] اصول الشاشي ص ٨٤

[5] سبل السلام ١٢١/٣

ماڵ و باقیی مافەکانیتر کە بەو عەقدە بەدەستیان دێنێ، جا ئەگەر بەبێ مۆڵەتی وەلیەکەی کردی، ئەوا ئەو مامەڵە بە مافێکی سافی خۆیەوە دەکا، ئەویش بۆ ئەو کارە شیاوە، لەبەرئەوەی ئاقڵ و بەفامە، داواکردن لە وەلی بۆ بەشوودانی بۆ ئەوەیە تۆمەتی بێڕەوشتی نەدرێتە پاڵ.[1]

ئەوانەیش بوونی وەلی بە مەرج دادەنێن قورئان و سوننە دەکەنە بەڵگە:

١- قورئان: زۆر ئایەت هەن لەگەڵ وەلیەکان دەدوێن، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی وتارەکەبۆ ئەوانە نەك بۆ ئافرەت، وەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ﴾[2] ﴿وَلاَ تُنكِحُواْ الْمُشِرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُواْ﴾[3]

٢- سوننە: ئەو حەدیسەیان کردۆتە بەڵگە کە پێنجەکە جگە لە نەسائی لە عائیشەوە ریوایەتیان کردوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (أيُّما امرأةٍ نكحَتْ نفسَها بغيرِ إذنِ وليِّها فنكاحُها باطلٌ).

جێی سەرنجە کە بەڵگەهێنانەوەی هەردوولا بەو ئایەتانە جێی مشتومڕە و نامانەوێ بچینە ناویەوە تا بابەتەکە نەبێتە درێژدادڕی، چونکە ئەوەی لەم بابەتەدا بەلامانەوە گرنگە جیاوازییە لە کارکردن بە حەدیسەکەی عائیشە، لەبەرئەوەی خۆی ریوایەتی کردوە و بەپێچەوانەیشی کاری کردوە. ئەبو ثور و ئەوانەی هاوڕاین ئەم حەدیسەیان کردۆتە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئافرەت بۆی هەیە پاش ئیزنی وەلیەکەی، خۆی خۆی مارە ببڕێ.

داود و ئەوانەی هاوڕاین بۆ جیاوازیکردن لەنێوان عازەب و بێوەژندا حەدیسی (الثَّيِّبُ أحقُّ بنفسِها من وليِّها)یان کردۆتە بەڵگە. محەمەدیش حەدیسەکەی عائیشە

---

[1] بڕوانە: المقارنة بين المذاهب. هەروەها سەرچاوەی پێشوو.

[2] النور٣٢

[3] البقرة٢٢١

کرۆنته بەڵگە و دەڵێ مۆڵەت لەوە گشتیترە کە پێش یان پاش بێ[1]. شەعبی و زەهری حەدیسی شووکردنی ئوم سەلەمەیان کردۆتە بەڵگە و دەڵێن: ئەگەر لێوەشاوەیی هەبوو دروستە و ئەگەر نەبوو بەتاڵە.[2]

**زاڵکردن:**

وای دەبینم رای پەسەند لەبەرچاوگرتنی رەزامەندیی هەردوولایە چ ئافرەتەکە و چ وەلیەکە جا چ ئافرەتەکە عازەب بێ یان بێوەژن، هەرچی رەزامەندیی وەلییە لەبەر دووربینیەتی لە بڕیاردانی لە بەرژەوەندیی ئافرەتەکە لە ئایندەی ژیانی هاوسەریدا، هەروەها لەبەر زاڵنەبوونی سۆز بەسەر ئەقڵی لە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانیدا، بەپێچەوانەی ئافرەت، چونکە لەوانەیە هەڵچوونە دەروونیەکەی وای لێبکا لە هەڵبژاردنی ئەو هاوبەشەدا هەڵە بکا.

رەزامەندیی ئافرەتەکەیش گرنگە لەبەرئەوەی بابەتەکە تایبەتە بەو، ئەو کاڵایەك نیە کڕین و فرۆشتنی پێ بکرێ، بەڵکو خاوەن مافی یەکەمە لە هەڵبژاردنی هاوبەشەکەیدا و پێویستە بەگژ دابونەریتی سوای هەندێ خەڵکدا بچێتەوە لە فشار و زۆرلێکردن تا شوو بە ئامۆزای یان خاڵۆزا یان هەر کەسێکیتر بکا کە وەلیەکەی سەرباری ناڕازیبوونی ئافرەتەکە بۆی هەڵدەبژێرێ. ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە لە ئیسلامدا بەتاڵە، هەموو زۆرلێکردنێك لە هاوسەرگیریدا بەتاڵکەرەوەیە، هەروەها هەموو زۆرلێکردنێك لە تەلاقدا بەتاڵکەرەوەیە.

لێرەوە، باشترین بۆچوون لەنێو ئەو رایانەی پێشوو کە پەسەند بکرێ رای محەمەد بن ئەلحەسەنە، کە ئیزنی پێشوەخت یان پاشوەخت بەمەرج دادەنێ بۆ دامەزرانی گرێبەندی هاوسەرگیریەکە، ئەگەر ئەمە پێش زەواجەکە هەبوو ئەوا دروست

---

[1] عن ابن عباس (رضي الله عنه)ان النبي ﷺ قال: (الثَّيِّبُ أحقُّ بنفسها من وليِّها والبكرُ يستأذنُها أبوها في نفسها وإذنُها صماتُها) رواه مسلم وفي لفظ من روايه ابن عباس (ليس للولي مع الثيب أمر واليتيمة تستأمر) رواه أبو داود والنسائي وصححه ابن حبان سبل السلام ٣/١١٩

[2] مقارنه بين المذاهب في الفقه ص ٦٢

و بەرکارە، ئەگینا لەسەر رێپێدانی دەوەستێ بەو ئیعتیبارەی مۆڵەتدانی پاشوەخت وەك رێپێدانی پێشوەخت دەوەستێ. خۆ ئەگەر مێردەکە لێوەشاوە بوو و وەلی بەبێ پاساوێکی شەرعی ئامادە نەبوو رێگەی پێبدا، ویلایەتی ئیزندان بۆ قازی دەگوێزرێتەوە و سەرلەنوێ گرێبەندەکە دەست پێدەکاتەوە.[1]

## خواستی دووەم:
## مەرجەکانی ئیمام مالیك
## بۆ کارکردن بە یەکینە هەواڵ

ئیمام مالیك دوو مەرجی بۆ کارکردن بە یەکینە هەواڵ داناوە: پێچەوانەی کاری خەڵکی مەدینە نەبێ، هەروەها پێچەوانەی قیاس نەبێ –واتە لە یەکێك لە دوو قسەکەیدا–.

مەرجی یەکەم: بۆ کارکردن بە یەکینە هەواڵ ئەوەیە پێویستە پێچەوانەی کاری خەڵکی مەدینە نەبێ، ئەگەر پێچەوانەی بوو کاری خەڵکی مەدینە پێش دەخرێ.

مەبەست لە کاری خەڵکی مەدینە کاری هاوەڵان و تابیعینە[2]، هاوەڵان لەبەرئەوەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ژیاون و دواین شت کە کارکردن لەسەری گیرساوەتەوە گواستویانەتەوە. هەرچی تابیعینە لەبەرئەوەیە چونکە ئەوەی هاوەڵان کاریان پێ کردووە، بەمیرات بۆ ئەمان ماوەتەوە.

ئەوەی دەوترێ ئەگەر هەیە هەندێکیان حەدیسەکەیان نەدیبێ، رەتکراوەیە بەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر تا پاش فراوانبوونی رووبەری وڵاتانی ئیسلامی و فتوحاتە گەورەکان، پەرت نەبوون.

---

[1] ئەوەی ئێمە هەڵمانبژاردوە کۆکردنەوەی نێوان بەڵگەکانیشی تێدایە.
[2] بڕوانە: ابن القيم الجوزية لعبد العظيم عبد السلام ص٢٤٦ و پاشتر.

بەڵگەی ئیمام مالیك ئەوەیە كاری خەڵكی مەدینە وەك گێڕانەوەیانە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، گێڕانەوەی كۆمەڵێ لە كۆمەڵێكیشەوە لە گێڕانەوەی تاكێك لە تاكێكەوە لەپێشترە.

مەرجی دووەم: بۆ كاركردن بە یەكینە هەواڵ لای ئیمام مالیك لە یەكێك لە دوو قسەكەیدا ئەوەیە قیاس پێچەوانەی نەبێ، ئەگەر پێچەوانەی بوو بەرەهایی قیاس پێش دەخرێ، چ راویەكە بە فیقە و ئیجتیهاد ناسراو بێ یان نا.

قەرافی دەڵێ: (قیاس لای مالیك (رەحمەتی خوای لێبێ) پێش یەكینە هەواڵ بخرێ، لەبەرئەوەی هەواڵەكە بۆ بەدەستهێنانی حوكمەكە هاتووە، بەڵام قیاس هەڵگری حیكمەتە بۆیە پێش هەواڵ دەخرێ، ئەوەیش لە شتە دنیاییەكاندا بە رێكەوتن حوججەیە. قازی عەیاز[1] لە (التنبیهات) و ئیبن روشد لە (المقدمات)دا ئاماژە بەوە دەدەن: مالیك لە پێشخستنی قیاس بۆ یەكینە هەواڵ دوو قسەی هەیە، وەك چۆن حەنەفیەتیش دوو قسەی هەیە).[2]

قەرافی دەڵێ: بەڵگەی پێشخستنی قیاس ئەوەیە لەگەڵ رێسا گشتیەكاندا كۆكە لەرووی لەخۆگرتنی بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەكان یان لادانی خراپەكان، بەڵام ئەو هەواڵەی پێچەوانەی ئەوە رێگرە لەوە، هەربۆیە ئەوەی لەگەڵ رێساكان كۆكە پێش ئەوە دەخرێ كە لەگەڵیان ناكۆكە.[3]

ئەم بۆچوونە لە چەند روویەكەوە جێی گەنگەشەیە:

أ- گوتەكانی پێغەمبەر(ﷺ) كە لەبارەی تەشریعەوە هاتوون لە رێسا گشتیەكانن و بە دەقی گشتی دادەنرێن و جێبەجێ دەكرێن بەو مەرجەی لەگەڵ دەقەكانی قورئانی پیرۆزدا لێك نەدەن، جا چ رێسا ئوسولی یان فیقهی یان زمانیەكان

---

[1] في إحدى مخطوطات شرح إبن القاضي عبدالوهاب.

[2] شرح تنقيح الفصول للقرافي ص ٣٨٧.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

دژیان بن یان نا. بۆیە هیچ مانای نیە بوترێ فلان هەواڵ لە حەدیسەکانی پێغەمبەر(ﷺ) پێچەوانەی رێسا گشتیەکانە.

ب- پاشان پێغەمبەر(ﷺ) وەك رۆشنکەرەوەی شەریعەت، فەرمان و نەهیەکانی بەرژەوەندی خەڵکیان تێدایە، بەڵام قیاس راستەوخۆ ئەوەی تێدا نیە، بەڵکو بەهۆی سەنەدەکەیەوەیە لە قورئان و سوننە.

ج- هەواڵ ئاماژەی راشکاوە بۆ ویستی شەرعدانەر بەڵام قیاس بە بەڵگەسازی ئەو ئاماژەیەی تێدایە، راشکاویش بەهێزترە بۆیە پێویستە ئەو پێش بخرێ.

بەمەرجدانانی ناکۆکنەبوونی یەکینە هەواڵ لەگەڵ کاری خەڵکی مەدینە و لەگەڵ قیاس لای ئیمام مالیك و ئەوانەی شوێنی کەوتون، کاریگەریەکی دیاری لەسەر جیاوازبوون لە هەندێ حوکمی فیقهیدا هەیە، لەوانە:

أ- حەدیسی عەبدوڵا بن عومەر (رەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرمویەتی: ((إذا تبايع الرجلانِ، فكلُّ واحدٍ منهما بالخيارِ ما لم يتفرَّقا ، وكانا جميعًا ، أو يخيرُ أحدُهما الآخرَ ، فتبايعا على ذلك ، فقد وجب البيعُ )).[1]

مەبەست ئەوەیە ئەگەر دوو کەس کڕین و فرۆشتنیان کرد، تا لەو مەجلیسەی سەوداکەیان تێدا کردوە هەڵنەسن و بڵاوەی لێنەکەن هەردووکیان سەرپشکن لەوەی پەشیمان ببنەوە، یان لەسەری بەردەوام بن.

ب- حەدیسی حەکەم بن حیزام کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: ((البَيِّعانِ بالخِيارِ ما لم يتفرَّقَا ، أو قال : حتى يتفرَّقَا ، فإن صَدَقَا وبَيَّنَا بُورِكَ لهما في بيعِهما ، وإن كَتَمَا وكَذَّبَا مُحِقَتْ بركةُ بيعِهما)).[2]

---

[1] ابن عبدالبر لە (التمهيد)دا دەڵێ: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی ئەم حەدیسە لە پێغەمبەرەوە سابت بووە و سەلماوترین حەدیسی ئاحادە. بڕوانە: العدة مع شرح عمدة الأحكام ٤/٣.

[2] بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ٤/٤

بـەگوێرەی ئـەم دوو هەواڵـە، هەریـەك لـە مەزهەبـەكانی شـافیعی[1] و حەنبـەلی[2] و شەرعزانی خاوەن حەدیس و ئـیبن حـەبیب لـە هـاوەڵانی مالیـك و شـیعەی ئیمـامی[3] بژارەی مەجلیسیان جێگیر كردوە.

هەروەها وتویانە: فرۆشتن بە ئیجاب و قبـوڵ دادەمـەزرێ و دوو لایەنەكـە تـا لێـك جیا نەبنەوە لەسەریان نابێتە مـاڵ و تـا ئەوكاتـەی جیـا دەبنـەوە یـان بڕیـار دەدەن بژارەی ئەوەیان هەیە پەسەندی بكەن یان هەڵیبوەشێننەوە. ئـەوەیش ڕێبـازی عـەلی كوڕی ئەبوتالیب و عەبدوڵا بن عومـەر و عەبـدوڵا بـن عـەباس و ئـەبوهورەیرە و ئـیبن بوردە (ابو برزە)ی ئەسلەمییە، هەروەها هەریەك لە حەسـەنی بەسـری و سـەعید بـن مسەیب و زەهری و عەتایش هەمان شتیان وتوە.

بـەڵام ئیمـام مالیـك و ئەبوحەنیفـە و هاوەڵانیـان لەگـەڵ جێگیركردنـی بـژارەی مەجلیسدا نین، ئەوەیش رای شورەیح و نەخعییە لە تابیعین. ئیمام مالیك عوزرخوایی هێناوەتەوە لە كاركردن بە حەدیسی بژارەی مەجلیس و بەڵگەی ئەوەیـە پێچـەوانەی كاری خەڵكی مەدینە و پێچەوانەی قیاسی ڕۆشنە.

بەڵگـەی ئیمـام مالیـك ئەوەیـە حەدیسـی بـژارەی مـەجلیس هـەواڵی ئاحـاد و پێچەوانەی ئیجماع و كاری خـەڵكی مەدینەیـە، لەبەرئـەوەی خواسـت (موقتەزا)كـەی لایـان زانـراو نیـە و كـارپێكراو نیـە، هەرچـیش وابـێ كـاری خـەڵكی مەدینـەی پـێش دەخرێ، لەبەرئەوەی ئەوان لە دابەزگەی وەحیدا بوون، ئاگایان لە ناسیخ و مەنسـوخ بوون، جا سەرپێچیكردنی ئەوان لە هەندێ هەواڵ بەڵگـەی بـوونی زانینـی شـتێكە لـە ناسیخ یان بەڵگەیەكی زاڵ، كە وازهێنان لە كارپێكردنی واجب كردوە.[4]

---

[1] المهذب للشيرازي ١/٢٥٧-٢٥٨

[2] نيل المارب ١/١٢٥.

[3] الخلاف للطوسي ١/٥٠٦

[4] بروانە: أحكام شرح عمدة الأحكام لابن دقيق العيد ٤/١٣.

ئەم ئیستیدلالە بەوە گەنگەشە دەکرێ کە ئەم کارەی خەڵکی مەدینە یان هی پێش سەردەمی مالیکە یان هی سەردەمی ئەوە، یەکەمیان بەتاڵە لەبەرئەوەی ئیبن عومەر سەرتۆپی فتوادەرانی شاری مەدینە بووە لە سەردەمی ئەودا و باوەڕی بە جێگیرکردنی بژارەی مەجلیس هەبوو، دووەمیش دیسانە بەتاڵە، لەبەرئەوەی سەعید بن مسەیب و ئیبن شەهاب کە لە گەورە شەرعزانەکانی مەدینەن بەدەق لێیان ریوایەت کراوە کە کاریان پێ کردوە. ئیمام مالیك –و ئەوانەی شوێنی کەوتون– دیسان بەڵگەیان ئەوەیە دەڵێن بژارەی مەجلیس پێچەوانەی قیاسی ڕۆشن و ئوسوڵە پێوانەییە حاشاهەڵنەگرەکانە، لەبەرئەوەی ڕێگریکردن لە (غەیر) لە بەتاڵکردنەوەی مافی ئەویتر پاش لێك جیابوونەوە (ی بکڕ و بفرۆش) جێگیربوونی بەرازیبوونی هەردوولا براوەتەوە، هەروەها پاش عەقدەکە و بەر لە جیابوونەوە کڕیار بەکڕینەکە مافی لەو ماڵە عەقدلەسەرکراوەدا بۆ جێگیر بووە، مافی نرخەکەیشی بۆ فرۆشیار جێگیر بووە، جێگیرکردنی بژارەی مەجلیس واجبکەری بەتاڵکردنەوەی مافی هەردووکیانە، لەبەرئەوەی مانای پێش جیابوونەوە وەك مانای پاش ئەوەیە، ئەویش لەبەر جێگیربوونی مافەکە بۆ هەردوولا لە هەردوو حاڵەتەکەدا، لەپێش و لەپاشبوون نەبێ هیچ جیاوازی نیە.[١]

ئەم بۆچوونە بەوە گەنگەشە کراوە کە فرۆشتن لەپڕ و بەبێ بیرلێکردنەوە ڕوودەدا، لەوانەیشە پاش کردنی پەشیمانی ڕوویدات، هەربۆیە لەبەر زیانی پەشیمانی جێگیرکردنی بژارەی مەجلیس بۆ هەردوو عەقدکارەکە گونجاوە، لەمەیشدا پێش و پاش جیابوونەوە یەکسان ناکرێ.

هەرچی هاوڕایی حەنەفیەتە لەگەڵ مالیکیەت لە وەرنەگرتنی حەدیسی بژارەی مەجلیس، لەسەر ئەسڵەکەیان دامەزراوە کە کارکردن بە یەکینە هەواڵ بەو مەرجە دەبێ لەوانە نەبێ بەلای پێ بڵاو دەبێتەوە. وەڵامی ئەمەیش بەوە دەدرێتەوە کە

---

[١] سەرچاوەی پێشوو.

بـەداننان بـە ئەسڵەکەیشـدا ئـەوا بابـەتی کێشـەکە فرۆشـتن نیـە، بـەڵکو بـژارەی هەڵوەشاندنەوەیە لە مەجلیسدا، ئەمەیش لەو شتانە نیە بەلایان پیێ بـڵاو دەبێتـەوە، لەبەرئەوەی حوکمی فەسخ غالب نیە.

## خواستی سێیەم:
## مەرجەکانی شیعەی زەیدی و ئیمامی
## بۆ کارکردن بە یەکینە هەواڵ

أ- شیعەی ئیمامی:

رای شیعەی زەیدی لە کارکردن بە یەکینە هەواڵ زۆر لە رای جمهور جیـاواز نیـە [1]، ئەگەر هـاتوو مەرجـە موعتەبـەرەکانی راوی بەردەسـت بـوون، بـەڵام لـەوەدا لەگـەڵ حەنەفیەت هاوڕان کە نابێ رووداوی یەکینە هەواڵ یـەك لەوانـە نـەبێ بـەلای پـێ بـڵاو بێتەوە. لێرەوە رەتکردنەوەیان بۆ ئەوەی شیعەی ئیمامی ئیدیعای دەکەن لە بوونی دەق لەسەر دوازدە ئیمام، لەسەر ئەوە بنیات دەنێن و دەڵێن: ئەگەر ئەو دەقە راست بوایە و هی پێغەمبەر بوایە هـەموو هـاوەڵان دەیـانزانی، چـونکە بـۆ هـەموو ئوممـەت جێبایەخە.

خاوەنی (الکاشف) دەڵێ: (یەکینە هەواڵ) لەو شتانەی بەلایان پێ بڵاو دەبێتـەوە رەت دەکرێتەوە، بەڵکو پێویستە ئـەوە بدرێتـە دواوە، لەبەرئـەوەی گوێزەرەوەکـەی درۆزنـە، وەك ئـەو هەواڵـەی ئیمـامی دەیگێڕنـەوە لـە دیـاریکردنی دوازدە ئیمـامی دیاریکراو بە ناوەکانیان.[2]

---

[1] بڕوانە: الکاشف مع أصول الزیدیة مخطوط رقم ١٣٢٣٥٤ دار الکتب المصریة ورقة ١٠، ٨.
[2] بڕوانە: الفصول اللؤلؤیة مخطوطة دار الکتب المصریة.

زەیدی نەیانکردوە بە مەرج کە راویەکە زەیدی یان لە ئالی بەیت بێ وەك کە ئیمامی کردویانەتە مەرج دەبێ لە ئیمامی بێ، بەڵام ریوایەتی ئالی بەیت پێش دەخرێ ئەگەر لەگەڵ ریوایەتی کەسانیتردا تێکگیرا.[1]

لەوەوە لەگەڵ جمهور لە هەندێ مەسەلەی فیقهیدا رایان جیاوازە، لەوانە:

جیاوازی لەبارەی ئەو زەکاتەی واجبە ئەگەر نیصابی وشتر گەیشتە بیست و پێنج وشتر: شەرعزانی موسڵمان[2] جگە لە زەیدی و شیعەی ئیمامی، کۆدەنگن لەسەر ئەوەی هەر پێنج وشتر مەڕ (شاة)ێك زەکاتی دەکەوێ تا دەگاتە بیست و چوار، ئەگەر بوونە بیست و پێنج ئەوا وشترێکی (بنت مخاض)ێك زەکاتی دەکەوێ تا دەگاتە سی و پێنج، ئەگەر (بنت مخاض) نەبوو ئەوا وشترێکی (ابن لبون)ێکی نێرینە.[3]

جمهوری زەیدی و شیعەی ئیمامی رایان وایە زەکاتی بیست و پێنج وشتر پێنج مەڕە.

ئیمام زەید (رەحمەتی خوای لێبێ) لە کتێبی (المجموع)دا پشتی بەوە بەستوە کە لە عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبەوە ریوایەتی کردوە، نەك بەوەی لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە ریوایەتی کردوە لە غەیری رێگەی عەلیەوە.

هەندێ لە پێشەوایانی زەیدی هاوڕای جمهوری شەرعزانن و تەئویلی جۆراوجۆریان بۆ ئەو دەقانە کردوە لە عەلیەوە ریوایەت کراون، لەوانە:

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] بدایة المجتهد ١/ ٢٥٠.

[3] ئەوەوی لە (المجموع) ٣٤٣/٥ دا دەڵێ: کۆدەنگن لەسەر ئەوەی بیست و پێنج (بنت مخاص)ێك دەکەوێ جگە لەوەی لە عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبەوە ریوایەت کراوە کە وتویەتی: پێنج مەڕی دەکەوێ، ئەگەر بوون بە بیست و شەش (بنت مخاچ)ێك دەکەوێ". بەڵگەیشمان حەدیسەکەی ئەنەسە کە دەڵێ "ئەگەر گەیشتنە بیست و پێنج بۆ سی و پێنج (بنت مخاچ)ێکی دەکەوێ، ئەگەر (بنت مخاچ) نەبوو ئەوان (ابن لبون)ێکی نێرینە".

١- گونجاندن لەنێوان ئەوەی لە عەلیەوە ریوایەت کراوە و ئەوەی لە غەیری ئەوەوە ریوایەت کراوە کە جمهور وەریان گرتوە بەوەی، ئەو پیاوەی زەکاتی وشتر لە ماڵەکەیدا واجب بووە (بنت مخاض)ی نیە، بۆیە عەلی (رەزای خوای لێبێ) بە پێنج مەڕ قەبڵاندی، عەلی رێگر نەبوو لە واجبیی (بنت مخاض)، بەڵام رێگەی داوە قەبڵاندنی داوە بەوە.

٢- وشتر هاوبەش بوو لەنێوان دوواندا، یەکێکیان دە و ئەویتر پازدەی هەبوو، بۆیە عەلی فتوای دا بەوەی لەسەر هەردووکیان واجبە نەك بەوەی لەسەر یەکێکیان واجبە. لە تێکەڵ (خلیط)یشدا لای جمهور (بنت مخاض) واجب نابێ بەڵکو پێنج مەڕ واجب دەبێ. شیعەی ئیمامی بۆ ئەوە چوون زەکاتی بیست و پێنج وشتر بەڕەهایی پێنج مەڕە وەك کە ئەوە رای ئیمام زەیدە. توسی دەڵێ: لە بیست و پێنج وشتردا پێنج مەڕ هەیە و لە بیست و شەشدا (بنت مخاض)، ئەمیرول موئمینینیش وای وتوە و لەوەدا پێچەوانەی سەرجەم شەرعزانە، بەڵگەیشمان ئیجماعی فیرقە و هەواڵەکانیانە.[1]

ب- رای شیعەی ئیمامی:

پاشینانی شیعەی ئیمامی لەگەڵ وەرگرتنی یەکینە هەواڵ بوون و پشتیان بە هەندێ بەڵگە بەستووە، کە زۆربەیان هەمان ئەو بەڵگانەن جمهور بۆ واجبی کارکردن بە یەکینە هەواڵ باسیان کردون[2]. حیللی دەڵێ: (راستیەکەی ریوایەتی یەکینە هەواڵ وەردەگیرێ ئەگەر راویەکەی دادپەروەر بێ،.... لەبەرئەوەی هاوەڵان گەڕاونەتەوە بۆ هەواڵی دادپەروەر با یەکیش بێ، هەروەها لەبەرئەوەی بەڵگەکان باسی دەکەن و مەرجیش نیە راوی شەرعزان بێ لەوەی پێچەوانەی قیاسە. مەرجیش نیە راوی سەرپێچی نەکردبێ لەبەرئەوەی دەکرێ راوی پەنا بباتە بەر ئەوەی بەخەیاڵی خۆی

---

[1] بڕوانە: خلاف للطوسي١/٢٩٩.
[2] واتە بە چوار بەڵگەکە: قورئان و سوننە و ئیجماع و ئەقڵ.

بەبەڵگەی دەزانێ و وایش نەبێ، دروستتر ئەوەیە گواستنەوەی لەفز نەکرێتە مەرج لەگەڵ هێنانی ماناکە بەتەواوی، چونکە هاوەڵان لەفزەکانیان نەگواستۆتەوە، لەبەرئەوەی نەیاننووسیونەتەوە و بەتێپەڕینی ڕۆژگار بەسەریاندا نەچوونەتەوە.
ئەگەر پێویستی کرد پێویستە قبوڵ بکرێ یا بەلایشی پێ بڵاو بێتەوە، ئەویش لەبەر گشتیبوونی بەڵگەکان، لەبەرئەوەی هاوەڵان لە حوکمی لوتپڕان و ڕشانەوە و قاقا لە نوێژدا گەڕاونەتەوە بۆ ئاحاد لەکاتێکدا بەلایش لەوانەدا بڵاوە[1]. خاوەنی (شارح معالم الدین)یش ئەمەی گوتوە)[2].
لەو گوتەیەی سەرەوەی حیللی و قسەی (شارح معالم الدین) ئەوە دەردەکەوێ کە ڕای شیعەی ئیمامی لەبارەی کارکردن بە یەکینە هەواڵ لەگەڵ ڕای جمهور کۆکە لە بەمەرج دانەنانی ئەوەی حەنەفیەت و مالیکیەت بەمەرجیان داناوە. لەکاتێکدا دەبینین مورتەزا دەڵێ: (ئێمە تەواو دەزانین کە زانایانی شیعە ڕایان وایە ناکرێ کار بە هەواڵی ئاحاد بکرێ). خاوەنی (معالم الدین) لە تەئویلی ئەم قسەیەدا دەڵێ (ئەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەو سەردەمە کۆنانەدا توانیویانە بە گەڕانەوە بۆ جەمینە (متواتر) یان پڕ قەرینە یان بۆ ئیمامە مەعسومەکانیان زانست بەدەست بێنن و پێویستیان بەو زانینە گومنئامێزە نەبووە کە لە یەکینە هەواڵ بەدەست دێ)[3].
ئەگەر ئەم قسەیە بەوەی حیللی بەراورد بکەین بۆمان دەردەکەوێ تەنها پاشینەکانیان کاریان بە هەواڵی ئاحاد کردوە.
لەڕاستیدا شیعەی ئیمامی بە پاشینەکانیشیانەوە بەهیچ شێوەیەك کاریان بە ڕای جمهور لە کارکردن بە یەکینە هەواڵ نەکردوە، بەڵکو بۆ کارپێکردنەکە دوو مەرجیان داناوە:

---

[1]: بڕوانە: مبادیء الوصول إلی علم الاصول للحلي ص٢٠٣.
[2] بڕوانە: شرح معالم الدین في الاصول ص٢٣٥ و پاشتر.
[3] سەرچاوەی پێشوو. ص٢٤٦.

یەکەم: فرەیی (التعدد): بەلای ئیمامیەوە بۆ کارکردن بە یەکینە هەواڵ مەرجە راویەکانی فرە بن، لەو رووەوە کە ئەوە رای عەلی کوڕی ئەبوتالیبە.

مامۆستا ئەبو زەهرە دەڵێ: (ئەم رایەی ئیمام عەلی لە کتێبەکانی سوننەدا هەیە وەك چۆن لە کتێبەکانی شیعەدا هەیە، توسی لە (العدة)دا باسی کردوە).[1]

بەڵام بە تێڕوانینی من ئەم بۆچوونەی ئیمام عەلی بەڕەهایی نەبووە، بەڵکو لە هەندێ مەسەلەی گوماناویدا بووە، وەك چۆن هاوەڵانی لە خەلیفە راشیدەکان و گەورە هاوەڵان بۆ قبوڵکردنی هەندێ حەدیس داوای ژمارەیان کردوە.

دووەم: یەکینە هەواڵ نابێتە بەڵگە بۆ کارپێکردن مەگەر راویەکەی لە تایفە راستەکە (الطائفة المحقة) بێ، توسی لە (عدة الاصول)دا باسی کردوە[2]. تایفەی راستیش لە تەفسیری توسی و شیعەی ئیمامیدا بریتییە لە شیعەی دوازدەیی.

ئەمەیش مانای ئەوەیە هەر هەواڵێك لە رێی تایفە ناڕاستەکانەوە بێ قبوڵ نابێ.[3]

زۆربەی ئیمامی لەسەر ئەوەن ریوایەتی نائیمامی وەرناگیرێ لە هەندێ باری تایبەتدا نەبێ، وەك ئەوەی نائیمامیەکە لەلایەن ئیمامیەوە جێمتمانە یان ستایشکراو بێ.

ئەبولمەعالی دەڵێ: (ئەگەر هەندێ لە پیاوانی سوننە نائیمامی بن و جێمتمانە یان ستایشکراو بێ، پێویستە باقیەکەی ئیمامیەکی جێمتمانە بێ.[4]

## پوختەی قسان:

پوختەی قسان ئەوەیە حەدیسەکانی ئەهلی سوننە کە راستەوخۆ دەگەنەوە بەپێغەمبەر(ﷺ) قبوڵ ناکەن مەگەر یەکێك لە ئیمامانی ئەهلی بەیت بکەوێتە ناوی.

---

[1] بڕوانە: الإمام صادق للأستاذ أبي زهرة ٣٧٨

[2] عدة الأصول للطوسي ص ٣١ و پاشتر.

[3] شرح معالم الدين ص ٢٤٩.

[4] رسائل أبي المعالي الرسالة التاسعة ص ٩ طبع حجر.

هەروەها ریوایەتی نائیمامی لە زاری ئیمامەکەیانەوە قبـولْ ناکـەن مەگـەر قەرینەیـەك هەبێ راستیی ریوایەتەکەی بسەلمێنێ.[1]

بەهۆی ئەمەیشەوە لە زۆر مەسەلەدا لەگەڵ جمهور جیاوازن:

١- ئەوان دەڵێن نیکاحی موتعە تا ڕۆژی قیامـەت جـائیزە و بەڵگەیشـیان ئەوەیـە خوا ئەفەرموێ: ﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً﴾، تووسـی دەڵـێ[2]: ئەوە رای عەلییـە وەك هاوەڵانمـان گێڕاویانەتـەوە. هەرچـی ئـەو هەواڵانـەن لـەبارەی حەرامکردنیەوە هاتوون هەرهەموویان هەواڵی تاکینەن، ئەمە جگە لەوەی شپرزیشیان تێدایە.[3]

بەڵام لای جمهور حەرامکردنی موتعە بەچەندین حەدیسی ساغ جێگیر بووە، بگرە ئیجماع لەسەر حەرامکردنی دروست بووە، ئەو ئایەتەی ئیمامی ئاماژەی پێدەکەن بە مارەبڕینە ناسراوەکە وەرگێراوە، لەبەرئـەوەی لـە جێبەنـدی باسـکردن لـە نیکـاح بـە عەقدی ناسراو هاتووە پاش باسکردنی ئەو جۆرانەی مارەکردنیان حەرامە.

بەلای ئیمامیـەوە، بەپێچـەوانەی جمهـور، دروسـتە ژن لەگـەڵ پـووری (خوشـکی دایکی یان باوکی) کۆبکرێتەوە.

توسی دەڵێ: (دەکرێ ئافرەت لەگەڵ پووری کۆبکرێتەوە ئەگەر پوورەکەی بـەوە رازی بوو)، هەروەها دەڵێ: بەڵگەمان ئیجماعی فیرقەیە، هەروەها ئەسڵ دروستیەتی و قەدەغەکردنی پێویستی بەبەڵگە هەیە.[4]

قسـەکەی توسـی ئـەوە دەگەیـەنێ حەدیسـەکەی ئـەبوهورەیرە کـە دەڵـێ (لا يُجمَعُ بينَ المرأةِ وعمَّتِها، وبينَ المرأةِ وخالتِها)[5] بەبەڵگە و حوججـە دانـانرێ لەگـەڵ

---

[1] بڕوانە: الإمام صادق للأستاذ أبي زهرة ص ٣٨٣ و پاشتر.

[2] النساء ٢٤.

[3] الخلاف للطوسي ١٨٠/٢

[4] سەرچاوەی پێشوو. ١٦٠/٢

[5] متفق عليه سبل السلام ١٦٢/٣.

ئەوەی حەدیسێکی بەناوبانگە و لە سەردەمی تابیعین و تابیعی تابیعین گەیشتۆتە ئاستی جەمینە، هەروەها خەواریجیش راکەی شیعەی ئیمامییان وەرگرتوە[1] لەبەرئەوەی باوەڕیان بەو حەدیسە نیە، چونکە لەڕێی ئیمامەکانی ئەوانەوە ریوایەت نەکراوە.

ئەم حەرامکردنە لای جمهور جێگیر بووە بەشێوەیەك ئەهلی سوننە لەسەری کۆدەنگ بووە.

٣- لە حەدیسەکەی بروع کچی واشق کە پێشتر باس کرا، توسی دەڵێ ئەوە یەکینە هەواڵە، لای ئێمە پێویست نیە کاری پێبکرێ لەبەرئەوەی لەڕێی ئێمەوە ریوایەت نەکراوە، بەڵکو لە رێگەیەکەوە ریوایەت کراوە کە عەدالەتی راویەکانی نازانرێ، ئەوەیش بەم شێوەیە بێ کارپێکردنی واجب نابێ.[2]

ج- رای خەواریج ئیمام لەبارەی کارکردن بە یەکینە هەواڵ:

خەواریج لەبارەی کارکردن بە سوننە رایان جیاوازە، هەندێکیان سەرچاوەی تەشریع تەنها لە قورئاندا قەتیس دەکەن و جگە لەو رەت دەکاتەوە، رەنگە ئەم فیرقەیە بێ کە تانەی لە حوججیەتی سوننە داوە. هەندێکیان سەرچاوەکانی تەشریعیان لە قورئان و ئەو سوننەیەدا قەتیس کردوە کە ئیمامەکانی خۆیان ریوایەتیان کردون و جگە لەوە رەت دەکەنەوە چەندە راستیش بێ. بەهۆی ئەمەیشەوە لە زۆر مەسەلەی فیقهیدا کە سەرچاوەیان سوننەیە رایان لەگەڵ جمهور جیاوازە، لەوانە:

١- کاریان بە حەدیسی (لا وصیة لوارث) نەکردوە لەکاتێکدا حەدیسێکی بەناوبانگە و لە سەردەمی تابیعین و تابیعی تابیعیندا گەیشتۆتە پلەی تەواتور،

---

[1] سبل السلام، سەرچاوەی پێشوو..
[2] بڕوانە: الخلاف للطوسي٢/ ١٩٥.

بەوەیش لەوەدا پێچەوانەی ئیجماعی جمهور بوون.[1]

٢- کاریان بە حەدیسی ((یحرم من الرضاع ما یحرم من النسب)) و گوتویانە: خوا لە ئافرەتە حەرامکراوەکاندا تەنها باسی دایك و خوشکی شیری کردوە[2] و بەلای ئەوانەوە نیکاح بەغەیری ئەو دوانە جائیزە و شیردەری بەدەر لەو دوانەدا بێ رێگر نیە.

٣- حەدیسی نەهیکردن لە کۆکردنەوە لەنێوان ژن و پووری رەت دەکەنەوە، کە بە حەدیسێکی بەناوبانگ دادەنرێ و لە سەردەمی تابیعین و تابعی تابیعیندا گەیشتۆتە رادەی تەواتور، هەروەها جمهوری موسڵمانان لە کارپێکردن بەگوێرەی، کۆدەنگن.

بەوەیش خەواریج و شیعەی ئیمامی لەو مەسەلەیەدا کۆکن.

حەدیسی مورسەل و کاریگەریی لەسەر جیاوازیی شەرعزان:

ئەم بەشە بە خستنەرووی کورتەیەك لەبارەی حەدیسی مورسەل، کۆتایی پێدێنم کە بەیەکێك لە گرنگترین هۆکانی جیاوازیی شەرعزان لە حوکمەکاندا دادەنرێ.

حەدیسی موسنەد ئەوەیە سەرجەم راویەکانی تێدا باس کراوە لە سەرەتای سەنەدەکەوە تا دەگاتە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەبێ ئەوەی هیچ لە راویەکانی لێ بکەوێ. جگە لە موسنەد لای ئوسولناس و شەرعزانەکان پێی دەوترێ مورسەل. مورسەل بەلەبەرچاوگرتنی چین و سەردەمەکانی راویەکان بۆ چوار جۆر دابەش دەبێ:

أ- مورسەلی هاوەڵ (صەحابی)، ئەویش ئەوەیە شتێك بگێڕێتەوە کە خۆی نەیدیوە و ئامادەی نەبووە، وەك ئەوەی عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە: أولُ مَا بُدِئَ به رسولُ اللّه (ﷺ) من الوَحْيِ الرؤيا الصادقَةُ في

---

[1] محاضرات الدکتور حسن الکاشف ص ١٤.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

النَّوْمِ.

ب– مورسەلی تابیعین (یان مورسەلی سەدەی دووەم).

ج– مورسەلی تابیعی تابیعین (یان مورسەلی سەدەی سێیەم).

د– مورسەلی پاش سێ سەدەکە.[1]

شەرعزان بەگشتی ناکۆکیان نیە لە کارکردن بە مورسەلەکانی هاوەڵان[2]. صەدر ئەلشەریعە دەڵێ "مورسەلی هاوەڵان قبوڵکراوە و وەك بیستن وەردەگیرێ"[3]. ئەبولبەرەکات دەڵێ: "ئەوە ئەگەر لە هاوەڵانەوە بێ بە ئیجماع قبوڵکراوە"[4]. ئامەدی دەڵێ: "هەرچی شافیعییە دەڵێ ئەگەر مورسەلەکە لە مورسەلەکانی هاوەڵان بوو ئەوا قبوڵکراوە"[5]. سالمی ئەلئیبازی دەڵێ "ئەگەر لە هاوەڵان بێ بەبێ هیچ ناکۆکیەك قبوڵ دەکرێ"[6].

**شەرعزان لەبارەی مورسەلی جگە لە هاوەڵدا رایان جیاوازە، بەم وردەکارییە:**

أ– حەنەفیەت: قسەی شەرعزانی حەنەفیەت یەکە لەسەر کارکردن بە مورسەلی سەدەی دووەم و سێیەم، لەبەرئەوەی ئەو عیللەیەی قبوڵکردنی مورسەلەکانی هاوەڵانی خواستوە کە بریتییە لە دادپەروەری، دەخوازێ مورسەلی تابیعیەکانیش قبوڵ بکرێ لەبەرئەوەی ئەوانیش دادپەروەرن[7]، بەدەر لەوانە سێ رای جیاوازیان هەیە:

---

[1] بڕوانە: شرح التوضيح على التنقيح مع الحواشي ٢٥٧/٢ كشف الأسرار مع البزدوي ٧٢٢/٣ النخبة النبهانية ص ٢٣.

[2] الياء للأشباع كما في الدراهيم والمصاريف الكشف ٧٢٢/٣

[3] شرح التوضيح، سەرچاوەی پێشوو.

[4] المنار بشرح فتح الغفار ٩٤/٢

[5] الأحكام في أصول الأحكام للامدي ٢٩٩/١.

[6] شمس الأصول ٤٥/٢.

[7] بڕوانە: المرجاني على التوضيح ٦٣/٣.

١- شێخ ئەبولحەسەنی کەرخی و ئەوانەی شوێنی کەوتون دەڵێن مورسەلی هەموو دادپەروەرێك لە هەموو سەردەمێکدا قبوڵ دەکرێ، لەبەرئەوەی عیللەکەی کە بریتییە لە دادپەروەری و زەبت باقیی سەدەکانیش دەگرێتەوە.[1]

٢- عیسا بن ئەبان دەڵێ مورسەلی ئەوانە نەبێ کە لە پێشەوایانی گواستنەوەن و لەناو خەڵکدا بەناوبانگن مورسەلیان وەرناگیرێ، وەك مورسەلی محەمەد بن ئەلحەسەن و هاوشێوەکانی، لەبەرئەوەی زەمانە زەمانی فیسق و درۆیە، ئەلبەزدەوی ئەم رایەی هەڵبژاردوە.[2]

٣- ئەبوبەکری رازیی ئەلجەصاص دەڵێ مورسەلی پاش سێ سەدەکە قبوڵ ناکرێ مەگەر بەناوبانگ بێ بەوەی لە کەسێکەوە ناگێرێتەوە کە دادپەروەر و جێمتمانە نەبێ، شەمسول ئەئیمەی سەرخەسی هەڵیبژاردوە.[3]

ب- ئیمام مالیك: ئیمام مالیك (رەحمەتی خوای لێبێ) مورسەلی حەدیس و راگەیاندنەکانی قبوڵ دەکرد[4]، لەوەوە دەردەکەوێ لەسەر رێچکەی زۆربەی شەرعزانی سەردەمەکەی رۆیشتوە. حەسەنی بەصری و سوفیان بن عویەینە و غەیری ئەوان مورسەلیان وەردەگرت و رەتیان نەدەکردەوە. ئەوەی تەماشای (الموطأ) بکا زۆر حەدیسی مورسەلی بەرچاو دەکەوێ، ئیمام مالیك پێشی قیاسی دەخست.[5]

ج- ئیمامی شافیعی: قسەکان لەبارەی کارکردنی شافیعی بە حەدیسی مورسەل جیاوازن: -وەك قەرافی دەڵێ- قازی عەبدولوەهاب لە (الملخص)دا دەڵێ: زاهیری رێرەوی شافیعی رەتکردنەوەی مورسەلەکانە، کە ئەوە قسەی ئەهلی حەدیسە، لە شافیعیشەوە گوێزراوەتەوە وتویەتی، جگە لە هی سەعید بن مسەیب

---

[1] فتح الغفار بشرح المنار لأبن نجيم ٩٦/٢.
[2] المرجاني على التوضيح ٦٨/٣.
[3] سەرچاوەی پێشوو.
[4] أي إيصال الخبر بدون ذكر المبلغ فيقول بلغني كذا بدلاً من سمعت.
[5] إعلام الموقين. ٣٥/١.

مورسەل قبولْ ناكەم. هەندێ لە هاوەڵانیشی هەمان ڕێڕەوی ئەویان گرتوە لە قبولكردنی مورسەلەكانی سەعید بن مسەیب و حەسەنی بەصری بەدەر لە هی كەسانیتر.[1]

لەڕاستیدا شافیعی بەم مەرجانەی خوارەوە مورسەلی قبولْ كردوە:

١- راویەكە صەحابی بێ.

٢- یان لە تابیعییە ناسراوەكان بێ وەك سەعید بن مسەیب و حەسەنی بەصری.

٣- یان مورسەلەكە لە مانادا موسنەد بێ.

٤- یان لە ناردنیدا دوو كەسی دادپەروەری جێمتمانە هەبێ، بەو مەرجەی شێخەكانیان جیاواز بن.

٥- ئایەتێك یاخود سوننەیەكی بەناوبانگ پشتگیری بكا.

٦- یان لەگەڵ قسەیەكی بەناوبانگ و مەنسور لە هەندێ هاوەڵان كۆك بێ.

٧- یان ئەهلی عیلم قبولّی بكەن و كۆمەڵێكیان وەك ئەوەی لە مورسەلەكەدا هاتووە فتوا بدەن.

د- ئیمامی ئەحمەد: قسەی دژبەیەك لەبارەی دیاریكردنی هەڵوێستی ئیمام ئەحمەد لە مورسەلەكان دەكرێ، هەندێ لە هاوەڵانی دەڵێن بەڕەهایی لەگەڵی بووە، هەندێكیان دەڵێن بەڕەهایی لەگەڵی نەبووە، هەندێكیشیان دەڵێن تەنها باوەڕی بە حوججیەتی مورسەلەكانی سێ سەدەی یەكەم هەبووە.[2]

لەڕاستیدا ئیمام ئەحمەد مورسەلی وەرگرتوە، بەلام لە وەرگرتنیدا لە شافیعی مامۆستای لێبوردەتر نەبووە و كاری بە مورسەل نەكردوە ئەگەر متمانەی تەواوی بە راویەكەی نەبووبێ، وەریدەگرت ئەگەر راویەكە جێمتمانە بووبێ، یان یەكێك لەو

[1] شرح تنقیح الفصول ص ٣٨٠.

[2] المسودة ص ٣٥٠-٣٥١ إعلام الموقعين ٣٤/١.

موجتەهیدانەی راست و لاوازی حەدیس دەزانن وتبێتیان ئەمە ساغ بوەتـەوە یـان راستە، یان بلێ پێغەمبەری خوا وای وتوە و ئەوەی کردبێتە بەلگە، یان بە شتێتر پشتئەستووری کردبێ..[1]

هـ- شیعەی ئیمامی: بەلای ئیمامیەوە ئەو سـەنەدەی نەگاتـەوە بـە مەعسـوم جـا چ مەعسـوم بیگەیەنێتـەوە بـە پێغەمبـەر(ﷺ) یـان نـا، جێـی خیلافـە، رای زاڵ بەلایانەوە ئەوەیە قبولّ ناکرێ، ئەگەر قبولێش بکرێ بە راست و بەهێز دانانرێ.[2]

و- شیعەی زەیدی: وادیارە هەڵوێستی زەیدی لـە قبـولکردنی مورسـەل بـەرەها لـە هەڵوێستی حەنەفیەت و مالیکیەت جیاواز نیە وەك لـە قسـەی خـاوەنی (الفصـول اللؤلؤیـة)وە تێدەگـەین "ریوایـەت بـەپێی ئاسـتە: خزمایـەتی، پاشـان صـەحابە، پاشان راڤەکارانی تـابیعین، پاشـان جێمتمانـەکان" ئـەم قسـەیە بەلگەیـە لەسـەر ئەوەی گەیشتنەوەی سەنەد بە پێغەمبەر(ﷺ) مەرج نیە بۆ وەرگرتنی حـەدیس، بەلکو مورسەلی حەدیس بەلایانەوە قبولە مـادام تابیعیەکـە جێمتمانـە بـێ، جـا چ موجتەهید بێ یان نا.[3]

ز- زاهیری: ئـەهلی زاهـیر گوتویانـە: مورسـەل قبـولکراو نیـە و نابێتـە حوججـە لەبەرئەوەی لە کەسی نەناسراو (مەجهول)ەوەیە، ئەوەیش بە دۆخی ئاشنا نـەبین لەسـەرمان پێویسـتە لـە قبـولکردنی هـەواڵ و شـایەتیدانی بوەسـتین تـا حـالّی دەزانین. هەروەها راوییە دادپەروەرەکە چ بلێ کەسی جێمتمانە قسەی بۆ کردوین یان نەلێ ئاوڕی لێ نادرێتەوە، مورسەلی سەعید بن مسەیب و حەسەنی بەصری و هیتر وەك یەکن لە وەرنەگرتنی و حوججەنەبوونی.[4]

---

[1] بروانە: هەردوو سەرچاوەی پێشوو.

[2] بروانە: الإمام صادق لابي زهرة ٤١٣- ٤١٥.

[3] بروانە: الإمام زيد لابي زهرة ص ٣٨٢.

[4] الإحكام في أصول الأحكام لابن حزم ١/ ١٣٦ و پاشتر.

**لەو مەسەلە فیقهییە جێناکۆکانەی لە جیاوازبوون لە وەرگرتنی حەدیسی مورسەل کەوتونەتەوە ئەمانەن:**

١- لەبارەی شکانی دەستنوێژ بە رشانەوە یان لوتپژان (الرعاف) یان هێڵنجدان (قلس)[1] رایان جیاوازە، سەرچاوەی ناکۆکیەکە جیاوازییە لە کارکردن بە حەدیسەکەی عائیشە (رەزای خوای لێبێ) کە دەڵێ: "إن رسول الله (ﷺ) قال من أصابهُ قَيء أو رعافٌ أو قلسٌ أو مَذْي فلينصرفْ فليتوضَّأ، ثم ليبنِ على صلاته، وهو في ذلكَ لا يتكَلمُ"[2]. حەنەفیەت و هادەویەت و ئەوانەی هاوڕایانن بەگوێرەی ئەم حەدیسە دەڵێن دەستنوێژ دەشکێ، بەڵام هادەویەت ئەوەیان کردۆتە مەرج رشانەوەکە لە مەعیدەوە بێ یان پڕی دەم بێ، بەلای زەیدی کوڕی عەلیەوە بەرەهایی دەستنوێژ دەشکێنێ.

جمهور لەوانە شافیعیەت و مالیك پێیان وایە دەستنوێژ ناشکێ و حەدیسەکەیان بە لاواز داناوە و کاریان پێ نەکردوە.[3]

٢- جیاوازن لەبارەی دەستنوێژشکان بە قاقاکردن. ئیبن ئەلهەمام دەڵێ "حەدیسی قەهقەهە بە مورسەلی و بە موسنەدی ریوایەت کراوە و ئەهلی حەدیس دانیان بەراستیدا ناوە وەك مورسەل، خولگەی مورسەلەکەیش لەسەر ئەبول عالیەیە. پاشان دەڵێ: ئەگەر مورسەل راست بوو کە لای ئێمە حوججەیە، ئەوا پێویستە بوترێ رۆژوی پێ دەشکێ"[4].

جمهور لەگەڵ نەشکانی دەستنوێژن بە قاقا و کاریان بە حەدیسی ئەبول عالیە نەکردوە لەو رووەوە مورسەل و پێچەوانەی ئوسوڵە، ئەویش ئەوەیە شتێك لە نوێژدا دەستنوێژ بشکێنێ و لە شوێنیتردا نەیشکێنێ.[5]

---

[1] قەلس: ئەوەیە لە گەروو بێتە دەرەوە جا پڕی دەم بێ یان پڕی نەبێ، ئەگەر گەڕایەوە ئەوە رشانەوەیە.

[2] أخرجه ابن ماجه وضعفه احمد وغيره، سبل السلام ٦٨/١.

[3] سبل السلام، سەرچاوەی پێشوو، فتح القدير ٤٠/١

[4] فتح القدير، سەرچاوەی پێشوو.

[5] بداية المجتهد ٣١/١.

٣- لەبارەی دروست یان نادروستیی سەرجێییکردن لەگەڵ ژن بەر لە پێدانی هیچ لە مارەییە حازریەکەی ئەگەر بەبێ ئەوە رازی نەبوو. ئەبوحەنیفە و مالیك و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن ئەگەر مارەییەکە دواخراو بوو بۆی هەیە سەرجێیی لەگەڵ بکا جا ژنەکە پێی خۆش بوو یان ناخۆش، کاتی هاتبوو یان نەهاتبوو. بەڵام ئەگەر مارەییەکە کاش بوو دروست نیە لەگەڵی جووت ببێ تا دەیداتێ و ئەگەر کردی ژنەکە بۆی هەیە رێگەی پێنەدا تا دەیداتێ، ئەگەر چوونەلاکە بەبێ رەزامەندیی ژنەکە بوو، هەروەها ئەگەر بە رەزامەندیی ئەوە بوو، لای ئەبوحەنیفە بەپێچەوانەی دوو هاوەڵەکە.[1]

ثوري و ئەوزاعی و زاهیری و ئەوانەی هاوڕایانن رایان وایە بەرەهایی دروستە، کە ئەوە یەکێك لە دوو قسەکەی شافیعییە[2]. ئیبن حەزم دەڵێ رێگریکارەکان پشتیان پێ بەستوە هەواڵێکە راست نیە، لەبەرئەوەی بە رێگەی مورسەل هاتووە.[3]

سەرچاوەی خیلافەکە ئەوەیە لە ئیبن عەباس ریوایەت کراوە کە دەڵێ: کاتێ عەلی فاتیمەی خواست، پێغەمبەری خوا پێی وت شتێکی بدەرێ. وتی هیچم نیە. وتی: ئەی قەڵغانە حوتەمیەکەت لەکوێیە؟[4]

لەم خیلافەوە جیاوازی دروست بووە لەبارەی واجبی نەفەقەی ئەو ژنەی ئامادە نیە خۆی بەدەستەوە بدات تا مارەییە کاشەکەی وەردەگرێ، جا ئەوەی خۆ بەدەستەوەنەدانی بەجائیز داناوە وتوێتی نەفەقە واجبە لەبەرئەوەی بەهەق مل نادات، ئەوەیش دەڵێ جائیز نیە دەڵێ نەفەقەی ناکەوێ لەبەرئەوەی بێگوێ (ناشزە)یە.[5]

---

[1] فتح القدير ٣٧١/٣ و پاشتر.

[2] المهذب ٥٧/٢.

[3] المحلى لابن حزم ٤٨٩/٩ و پاشتر.

[4] رواه أبو داود والنسائي وصححه الحاكم سبل السلام ١٤٩/٣

[5] المهذب، سەرچاوەی پێشوو.

# بەشی سێیەم:
# جیاوازی لە ئاگەداربوون لە حەدیس
# یان دیاریکردنی مەبەست لێی
# یان لە دروستبوونی تێکگیراندا

بۆ هەر هۆیەك لەم هۆیانە باسێکی سەربەخۆ تەرخان دەکەین.

## باسی یەکەم:
## جیاوازی لە ئاگەداربوون لە حەدیس

ئاشکرایە حەدیسەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە سەردەمی هاوەڵان و گەورە شوێنکەوانیاندا لە کتێبەکاندا کۆنەکرابوونەوە و رێك نەخرابوون، لەبەر دوو شت[1]:

یەکەمیان: سەرەتا نەهییان لێکرابوو لەوە، لەترسی تێکەڵبوونی هەندێکیان بە قورئانی پیرۆز.

دووەمیان: فراوانی لەبەرکردن و بەهێزیی زەینیان.

پاشان لە کۆتاکانی سەردەمی تابیعیندا دەست بە تۆمارکردنی حەدیس و پۆلبەندیکردنی هەواڵەکان کرا کاتێ زاناکان بە وڵاتاندا بڵاوبوونەوە و بیدعەکاری لەلایەن خەواریج و نکوڵیکارانی قەدەرەوە زۆر بوو.

---

[1] مقدمة فتح الباري للحافظ ابن حجر ص ٤ — القاهرة المطبعة الكبرى ١٣٠١هـ

لەم ڕوانگەوە بەشی سەرجەم شەرعزانان لە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) وەك یەك نەبوو، تەنانەت پاش تۆمارکردنیش هەموو شەرعزانەکان ئاگایان لە هەموو حەدیسەکان نەبوو، ئەوەیش بووە هۆی جیاوازییان لە هەندێ مەسەلەی فیقهیدا.

لەم گۆشەیەوە جیاوازی لە سەردەمی هاوەڵانەوە دەستی پێکرد و لە سەردەمەکانی پاش ئەواندا بەردەوام بوو:

أ- جیاوازیی هاوەڵان بەهۆی جیاوازییان لە ئاگەداربوون لە حەدیس:

کاتێ هاوەڵان پاش خیلافەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) بە وڵاتاندا بڵاو بوونەوە و هەریەکەیان بوونە سەرمەشق لە ناوچەیەك لە ناوچەکان، ڕووداوەکان زۆر بوون و کێشەکانیان دەخرایە بەردەم، هەریەکەیشیان لەبەر تیشکی کتێبی خوا و ئەو حەدیسانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لەبەریان بوو وەڵامیان دەدایەوە، ئەگەر لەوانەدا نەیدۆزیەوە بە رای خۆی ئیجتیهادی دەکرد و پشتی بەو عیللانە دەبەست کە حوکمەکان لە قورئان و سوننەدا بەدەوریانـدا دەسوڕانەوە، لێرەوە جیاوازی لەنێوانیاندا دروست بوو بە چەند شێوەیەك لەوانە: ئەگەر هاوەڵێك حوکم یان فتوای پێغەمبەری لە مەسەلەیەکدا نەبیستایە کە کەسانیتر بیستبویان بەڕای خۆی ئیجتیهادی دەکرد، پاش ئەوە دۆخەکە لە یەکێك لەم پێنج حاڵەتە بەدەر نەدەبوو:

١- یان ئیجتیهادەکەی لەگەڵ ئەو حەدیسەی نەیبیستبوو کۆك دەبوو وەك ئیجتیهادی ئیبن مەسعود لەو ژنەی مێردەکەی مردوە و مارەیی بۆ دیاری نەکردوە کە بڕیار دا مارەیی ئافرەتانی هاوشانی خۆی بدرێتێ و گوتی: (لا وكس ولا شطط، عليها العدة ولها الميراث ومهر نسائها) ، پاشان دەرکەوت قەزاوەتەکەی لەگەڵ قەزاوەتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێك بووە کاتێ (معقل بن سنان) هەستا و شایەتی دا کە پێغەمبەر لە ئافرەتێکی ئەواندا هەمان بڕیاری داوە.[1]

---

[1] كشف الأسرار مع البزدوي ٧٠٦/٢ فما بعدها، قواعد التحديث ص ٣٢٥.

٢– یان بەپێچەوانەی حەدیسەکە فتوا دەدا پاشان حەدیسەکەی پێدەگات و پێی قایل دەبێ و لە فتواکەی پاشگەز دەبێتەوە، وەك ئەوەی دەگێڕنەوە کە مەزەبی ئیبن عەباس بووە هەرکەس بە لەشپیسی ڕۆژ بکاتەوە ڕۆژووەکەی دروست نیە، تا هەندێ لە ژنانی پێغەمبەر(ﷺ) پێیان ڕاگەیاند کە وا نیە، ئەویش پاشگەز بوویەوە. [١]

٣– یان حەدیسەکەی پێدەگا بەڵام بەو شێوەیەی گومانی زاڵ (غالب الظن)ی پێ دروست دەبێ، بۆیە تانەی لێدەدات و واز لە ئیجتیهادەکەی ناهێنێ، وەك ئەوەی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێ) بڕیاری دا مبتوتە [٢] نەفەقە و سوکنای دەکەوێ، پاشان حەدیسەکەی فاتیمەی کچی قەیسی پێ گەیشت [٣]، تانەی لێدا و گوتی: کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکانمان واز لێ ناهێنین بۆ قسەی ژنێك کە نازانین لەوانەیە لەبەری کردبێ یان لەبیری کردبێ. عائیشە بە فاتیمەی گوت: ئایا لە خوا ناترسی؟ قسەکەی ئەوە دەگەیەنێ نە نەفەقە هەیە و نە سوکنا.

هەروەها وەك قەزاوەتی عەلی کوڕی ئەبوتالیب، کە ئەوەی ژنەکەی دەمرێ و هیچ مارەییەکی بۆ دیاری نەکردوە، مارەیی نیە بەڵام میراتی دەکەوێ، کاتێکیش حەدیسەکەی (معقل بن سنان)ی بیست لە ئیجتیهادەکەی پاشگەز نەبوویەوە و گوتی: واز لە کتێبی خوا ناهێنین بە قسەی ئەعرابیەکی میز بەخۆداکەر.

بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە لە مەزەبی عومەری کوڕی خەتابدا تەیەموم بۆ ئەو لەشپیسەی ئاوی دەست دەکەوێ نابێ، بەڵام عەماری کوڕی یاسر گێڕایەوە کە لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە، لەشی پیس بووە و ئاوی

---

[١] الإنصاف في التنبيه على أسباب الخلاف للدهلوي ص ٤ قواعد التحديث ص ٣٢٦.

[٢] واتە ئەو ژنەی بەتەڵاقی یەکجاری (بائن) تەڵاق دراوە.

[٣] مێردەکەی سێ بەسێ تەڵاقی دابوو و پێغەمبەر نە سوکنا و نە نەفەقەی بۆ بڕیار نەدا. عومەر و عائیشە لەسەر ئەو حەدیسە ڕەخنەیان لێگرت و عومەر وتی: کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکانمان واز لێ ناهێنین بۆ قسەی ژنێك کە نازانین لەوانەیە لەبەری کردبێ یان لەبیری کردبێ. نیل الأوطار ٢٢٨/٦.

دەست نەکەوتوە، بۆیە خۆی لە خۆڵ گەوزاندوە (تمعّك)[1]، ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا باس کراوە، ئەویش فەرمویەتی: هەر ئەوە بەس بوو بەم شێوەیە بکەیت: "دەستی دا لە زەوی و دەموچاو و دەستەکانی پێ سڕی". بەڵام عومەر ئەمەی پەسەند نەکرد و بەبەڵگەی دانەنا و لە مەزەبەکەی خۆی پاشگەز نەبوویەوە، لەبەرئەوەی لاوازییەکی شاراوەی تێدا بینی کە گومانی دەخاتە سەر. حەدیسەکەی عەممار لە چینی دووەمدا بەزۆری و لە زۆر رووەوە هاتووە.[2]

٤- یان حەدیسەکەی هەر پێناگا: ئیبن عەمر فەرمانی بە ژنان دەکرد ئەگەر خۆیان شۆرد پرچیان بکەنەوە، کاتێ عائیشە ئەوەی بیست گوتی: وای ئەم ئیبن عەمرە چەند سەیرە ! فەرمان بە ژنان دەکا ئەگەر خۆیان شۆرد پرچیان بکەنەوە. ئەی بۆ فەرمانیان پێناکا سەریان بتاشن. من و پێغەمبەری خوا لەیەك دەفر خۆمان دەشۆرد و لەوە زیاترم نەدەکرد کە سێ جام ئاوم دەکرد بەسەرمدا.[3]

٥- یان حەدیسەکەی پێدەگا بەڵام لەیادی دەکا یاخود سەهوی تێدا دەکا: وەك ئەوەی ئیبن عومەر (رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە رەجەبدا عومرەی کردوە، کاتێ عائیشە ئەوەی بیستەوە گوتی سەهوی کردوە.

ئەمانە و چەندین نموونەیتر کە هاوەڵان بەهۆی نەزانین بە حەدیسەکە یان متمانە نەبوونیان پێی، یان لەیادکردنیان یان سەهوکردنیان، رایان جیاواز بووە.

**ب- جیاوازیی شوێنکەوتوان بەهۆی جیاوازییان لە ئاگەداربوون لە حەدیس یان متمانەپێبوونی:**

جیاوازیی تابیعین (شوێنکەوتوان) بەهۆی حەدیسەوە بە درێژەی جیاوازیی هاوەڵان دادەنرێ، هەریەك لە تابیعین چی بەردەست کەوتبێ لە هاوەڵان وەریگرتوە،

---

[1] معك الشيء: واته دەست تێدانی شت، تمعك: تمرغ، تێی گەوزا.

[2] قواعد التحديث ص ٣٢٦.

[3] أخرجه مسلم وأحمد سبل السلام ٩٢/١.

هەر حەدیسێکی پێغەمبەری خوای یان ڕێبازی هاوەڵانی بیستبێ لەبەری کردوە و تێیان فکریوە، بەپێی توانا جیاوازەکانی کۆکردۆتەوە، هەندێ قسەی بەسەر هەندێکیتردا زاڵ کردوە و هەندێ قسە لەبەرچاوی لاواز بوون، بەم پێیە هەر زانایەك لە زاناکانی تابیعین ڕێڕەوێکی لەلا گەڵاڵە بووە، جا لە هەر وڵاتێك ئیمامێك پەیدا بووە وەك سەعید بن مسەیب و سالم بن عەبدوڵا بن عومەر لە مەدینە، عەتا بن ڕەباح لە مەککە، ئیبراهیم ئەلنەخعی و شەعبی لە کوفە.[1]

ئەو تابیعیانە لە زۆر مەسەلەی فیقهیدا جیاواز بوون، یەکێك لە هۆکانی ئەو جیاوازیەیشیان گەیشتنی حەدیس بووە بە هەندێکیان و نەگەیشتنی بە هەندێکیتریان، لەو مەسەلانەیش:

١- حەدیسی قولەتەین: لە عەبدوڵا بن عومەرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: إذا كان الماء قلتين لم يحمل الخبث، وفي لفظ لم ينجس.[2] (واتە: ئەگەر ئاو گەیشتە قولەتەین پیسی هەڵناگرێ).

ئەمە حەدیسێکی ڕاستە بە زۆر ڕێگە ڕیوایەت کراوە، بەڵام نە لە سەردەمی سەعید بن مسەیب و نە لە سەردەمی زەهریدا دەرنەکەوتوە، هەربۆیە کاریان پێ نەکردوە لەکاتێکدا ئەو تابیعیانەی پێیان گەیشتبوو کاریان پێدەکرد، ئەمەیش کاریگەری هەبووە لە جیاوازیی ئیمامە موجتەهیدەکانیش کە پاش ئەوان هاتوون، ئەوەتا مالیکیەکان و حەنەفیەکان و ئەوانەی هاوڕایانن کاریان بە حەدیسی قولەتەین نەکردوە، لەکاتێکدا شافیعیەکان و ئەوانەی هاوڕایانن کاریان پێکردوە.[3]

٢- حەدیسی بژارەی مەجلیس حەدیسێکی ڕاستە و بەزۆر ڕێگە ڕیوایەت کراوە و ئبن عومەر و ئەبو ڕزة[4] و سەحابەیتر کاریان پێ کردوە. پاشان زۆر لە تابیعین کاریان

---

[1] الإنصاف، سەرچاوەی پێشوو. لا٥ إعلام الموقعين ٢٢/١ و پاشتر.

[2] أخرجه الأربعة وصححه ابن خزيمة والحاكم سبل السلام ١٩/١.

[3] الإنصاف للدهلوي ص ٩ و پاشتر.

[4] إحكام الأحكام شرح عمدة الأحكام لابن دقيق العيد ٤م٤.

پێکردوه، بەڵام بۆ حەوت شەرعزانەکەی مەدینە و ئەوانەی هاوسەردەمیان بوون دەرنەکەوتوه بۆیە کاریان پێ نەکردوه، ئەمەیش بوەتە هۆی جیاوازیی ئیمامانی مەزەبەکان تێیدا، هەربۆیە شافیعی و ئەحمەد و ئەوانەی هاوڕایان بوون کاریان پێکردوه، بەڵام ئەبوحەنیفە و مالیك و ئەوانەی هاوڕایانن کاریان پێنەکردوه لەبەرئەوەی دەرنەکەوتنی لەسەر حەوت شەرعزانەکە و ئەوانەی لەگەڵیانن بە هۆیەکی عەیبدارکەر داناوە[١]، وەك لە بەشی پێشوودا باس کرا.

**ج- جیاوازیی پێشەوایانی مەزەبە بەکۆمەڵەکان بەهۆی جیاوازییان لە ئاگەداربوون لە حەدیس:**

جیاوازی بەهۆی رادەی ئاگەداربوون لە حەدیسەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە سەردەمی مەزەبە بەکۆمەڵەکاندا (المذاهب الجماعية) گەیشتە لوتکە ئەگەرچی حەدیسیش تۆمار کرابوو، ئەویش لەبەر سێ هۆ:

یەکەم: جیاوازیی هاوەڵان و تابیعین بەهۆی دابەشبوونی حەدیسەکان لەنێوان ئەوانەی حەدیسەکانیان بیستبوو، هەروەها ئاگەداریی هەندێ لە هاوەڵان و تابیعین و بێئاگایی هەندێکیتریان لێیان لەو هۆیانە بوون کە بوونە مایەی جیاوازیی ئەو شەرعزانەی پاش ئەوان هاتن، ئەویش لەبەر دەستگرتنیان بە قسەکانی هاوەڵان لە زۆر مەسەلەدا، هەربۆیە لەوانە و لە هاوشێوەکانیاندا جیاواز بوون لەبەرجیاوازیی ئەوانەی لێیان وەرگرتبوون، یان شوێنیان کەوتبوون، بگرە هەندێ جار لە یەك مەسەلەدا زیاتر لە رایەکی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە شەرعزانێك دەگەیشت، هەربۆیە لەبەر دەستگرتنی بە هەموویانەوە رای جیاوازی لەوبارەیەوە بۆ دروست دەبوو، ئەمەیش فرەیی گێڕانەوە جیاوازەکان لە ئیمام ئەحمەدەوە (رەحمەتی خوای لێبێ) لە یەك مەسەلەدا روون دەکاتەوە.

---

[١] الانصاف، سەرچاوەی پێشوو.

دووەم: دەرنەکەوتنی هەندێ حەدیسی راست (صحیح) لە چینی دووەم و سێیەمدا وای کرد هەندێ شەرعزان کاریان پێ نەکەن، لەبەرئەوەی دەرنەکەوتنیان لە سەردەمی تابیعین و تابیعی تابیعیندا بە عەیبێك زانیوە تێیاندا وەك پێشتر لە حەدیسی قولەتەین و حەدیسی بژارەی مەجلیسدا باس کرا.

سێیەم: هەندێ حەدیسی راست تەنها هەندێ راوی زانیویانە و تەنها جێمتمانەیەك لە هاوشێوەی خۆی یان راویگەلێکی کەم لە ژمارەیەکی کەمیان گواستۆتەوە و پاڵنەر نەبووە بۆ بڵاوبوونەوەی لەناو خەڵك و شەرعزانی سەرجەم وڵاتان، هەربۆیە شەرعزانی هەندێ وڵات دەیزانن و هەندێکیتر نایزانن، ئەوەی زانیوەتی کاری پێکردوە و ئەوەی پێی نەگەیشتوە بەرای خۆی ئیجتیهادی کردوە یان شوێن غەیری خۆی کەوتوە، لەوانەیشە ئیجتیهادەکەی یان شوێنکەوتنەکەی پێچەوانەی ئەوەی ناو حەدیسەکەی لێ بکەوێتەوە، جا لەسەر راکەی خۆی بەردەوام دەبێ و لایەنگری بۆ پەیدا دەبن و بەوەیش ئەو را پێچەوانەیەی سوننە بڵاو دەبێتەوە، کاتێکیش ئەو حەدیسە سەحیحەیان پێگەیشتوە کە لەوبارەوە هاتووە —بەتایبەت پاش کۆکردنەوە و تۆمارکردنی سوننە— کاریان پێنەکردوە لەو رووەوە گومانیان وابووە سەرپێچیکردنی لەو ماوەیەی رابردوودا لەبەر نەسخکەرەوەیەك بووە کە ئەوان نەیانزانیوە، یان لەبەر عیللەیەکی عەیبدارکەر بووە کە پێویستی کردوە کاری پێنەکرێ، لەبەرئەوە لەسەر بۆچوونەکەیان بەردەوام بوون و بەهۆیەوە خیلافەکە لەنێوانیان ئەوان و ئەوانەی سوننەکەیان زانیوە و دەستیان پێوە گرتوە جێگیر بووە، ئەوەیش جۆرە دەمارگیریەکە بۆ را، چونکە نابێ لەبەر ئەگەری بوونی نەسخکەرەوە یان هۆیەکی عەیبدارکەر بەهۆی گومانباشی بەوەی کاری بە حەدیسەکە نەکردوە، ببێتە هۆیەك بۆ وازهێنان لە سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

لەوانەیشە کارپێنەکردنی لەئەنجامی پێنەزانینی بێ، ئیدیعای ئەوەیش ئیمامانی پێشوو هەرچی لە پێغەمبەرەوە هاتووە زانیویانە ئیدیعایەکی بێمانایە، لەبەرئەوە رەخنە لە ئەبولحەسەنی کەرخی لە حەنەفیەت دەگرم لەبەرئەوەی دەڵێ "هەر

دەقێك بەپێچەوانەی ئەوەی لە ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی ریوایەت کراوە، یان نەسخکراوەیە یان تەئویلکراوە"[1]. بەوەیش ریوایەتەکانی مەزەبەکەی لە ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی لەسەروو پێگەی سوننە و حاکم بەسەریەوە دادەنێ. پاشان ئەم بانگەشەیە لەگەڵ ئاراستەی سەرۆکی مەزەبەکاندا لێکدەدا، ئەوەتا لە ئەبوحەنیفەوە (رەحمەتی خوای لێبێ) دەگێرنەوە گوتویێتی: "قسەی من لەبەر کتێبی خوا واز لێبێنن"، پێی وتراوە: ئەی ئەگەر هەواڵی پێغەمبەری خوا بوو؟ وتی: "قسەی من لەبەر هەواڵی پێغەمبەری خوا واز لێبێنن". پێی وتراوە: ئەی ئەگەر قسەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا بوو؟ وتی: " قسەی من لەبەر قسەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا واز لێبێنن"[2].

شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ئەگەر حەدیسێك بەپێچەوانەی قسەی من راست دەرچوو قسەکەی من بدەن بە دیواردا، ئەگەر بەڵگەت بینی لەسەر رێگە دانراوە ئەوە قسەی منە[3]. عەبدوڵای کوڕی ئەحمەد دەڵێ باوکم گوتی شافیعی پێی گوتین: ئەگەر بۆتان دەرکەوت حەدیسێك راستە و هی پێغەمبەرە، پێم بڵێن، تا منیش وەك ئەو بڵێم[4]. ئیمام ئەحمەد دەڵێ: باشترین شتی شافیعی بەلای منەوە ئەوەیە ئەگەر هەواڵ (حەدیس)ێکی ببیستایە لای خۆی نەبووبێ، ئەوەی دەگوت و وازی لە قسەکەی خۆی دەهێنا[5].

لەو پیادەکردنە فیقهییە خیلافیەکان کە لە جیاوازی لە زانینی حەدیس کەوتونەتەوە، جیاوازییە لە حوکمی فرۆشتن بە مەرج:

---

[1] بڕوانە: تأسيس النظر للدبوسي ص ١٦٦.

[2] بڕوانە: أسباب اختلاف الفقهاء للأستاذ الشيخ على الخفيف ص٥٦ فما بعدها نقلا عن صاحب روضة العلماء.

[3] قواعد التحديث ص ٣٥٢ اعلام الوقعين ٣٦١/٢

[4] إعلام الموقعين ٣٦٤/٢

[5] سەرچاوەی پێشوو.

له (عبدالوارث بن سەعید)ەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: چوومە مەککە ئەبوحەنیفە و ئیبن ئەبولەیلا و ئیبن شبرمەم بینی، له ئەبوحەنیفەم پرسی: چی دەڵێیت لەبارەی پیاوێك شتێکی فرۆشت و مەرجێکی دانا؟ وتی: فرۆشتنەکە بەتاڵە و مەرجەکە بەتاڵە. پاشان چوومە لای ئیبن ئەبو لەیلا و لێم پرسی، وتی: فرۆشتنەکە جائیزە و مەرجەکە بەتاڵە. پاشان چوومە لای ئیبن شبرمە و لێم پرسی، وتی: فرۆشتنەکە جائیزە و مەرجەکە جائیزە. وتم: سوبحانەڵا سێ شەرعزانی عێراق لە یەك مەسەلەدا جیاواز بوون. جا چوومە لای ئەبوحەنیفە و بۆم باس کرد، وتی: نازانم ئەوان چییان وتوە، عەمر بن شوعەیب لە زاری باوکیەوە لە باپیریەوە لە پێغەمبەری خواوە بۆی گێڕامەوە کە نەهی کردوە لە فرۆشتن بەمەرج کردوە، فرۆشتنەکە بەتاڵ و مەرجەکە بەتاڵە. گەڕامەوە بۆ لای ئیبن ئەبولەیلا و قسەی دوو هاوەڵەکەیم پێ ڕاگەیاند، وتی: نازانم ئەوان چییان پێ وتویت، هیشام لە عروەوە لە باوکیەوە لە عایشەوە بۆی گێڕامەوە: پێغەمبەری خوا فەرمانی پێکردم بەریرە بکڕم و ئازادی بکەم[1]، فرۆشتنەکە جائیزە و

---

[1] مەسەلەی بەریرە ئەوەیە: ئەوان ڕازی نەبوون بیفرۆشن بە عائیشە تا ڕازی نەبێ بەوەی پاش ئازادکردنی (وەلا)ی بۆ ئەوان بێ. پێغەمبەرﷺ ئاماژەی دایە کە ئەو مەرجەیان بدلتێ تا پێی بفرۆشن چونکە وەلایان بەسەریەوە نابێ لەبەرئەوەی مەرجێکی بەتاڵە.

لەمەوە دەتوانین ئەو جۆرە مەرجە بزانین کە (عبدالوارپ) دلوای فتوای سێ شەرعزانەکەی تێدا کردوە ئەویش لە ڕوانگەی قیاسکردنیان لەسەر مەرجی وەلا بۆ غەیری ئەو کەسەی کۆیلەکەی ئازاد کردوە و لەسەر مەرجی سوودبینینی فرۆشیار لەوەی فرۆشتیوەتی پاش فرۆشتنی، هەروەها ئەوە مەرجێك بووە سوودی هەبووە و لە عورفدا نەبووە و دەقێکی تێدا نەهاتوە، لەبەرئەوە لای ئەبوحەنیفە مەرجێکی موفسیدە بۆ فرۆشتن، لەبەرئەوە مەرج و فرۆشتنەکە لای ئەو بەتاڵن، واتە هیچ ئەسەرێك لە فرۆشتنەکە ناکەوێتەوە. لای ئیبن ئەبی لەیلا تەنها خۆی بەتاڵە و هیچ ئەسەرێکی لە دروستی و بەرکاری فرۆشتنەکەدا نیە، ئەویش بەقیاس لەسەر بەمەرجدانانی وەلا لەلایەن عائیشەوە بۆ ئەوانەی بەریرەیان پێ فرۆشت. هەروەها قیاس لەسەر ئەوەی جابر بەمەرج بۆ پێغەمبەری داناوە دروست بوو، هەروەها جائیز نیە ئەوەی لە پێغەمبەرﷺ ریوایەت کراوە کە نەهی لە فرۆشتن بەمەرج کردوە بکرێتە بەڵگە لەسەر بەتاڵی هەر مەرجێك لە عەقدی فرۆشتندا دابنرێ، ئەوە کەس نەیوتوە. بڕوانە: أسباب لختلاف الفقهاء للأستاذ الخفيف ص ٦٣.

مەرجەکە بەتاڵە. گەڕامەوە لای ئیبن شبرمە و و قسەی دوو هاوەڵەکەیم پێ ڕاگەیاند، وتی: نازانم ئەوان چییان پێ وتویت؟ (مسعر بن کدام بن محارب بن دثار) لە جابرەوە دەگێڕێتەوە: بعت النبي (ﷺ) بعيراً واشترطت حملانه إلى أهلي.[1] البيع جائز والشرط جائز.[2] فرۆشتنەکە جائیزە و مەرجەکە جائیزە.

بەم شێوەیە لەوانەیە لە یەك بابەتدا چەند حەدیسێك هەبن کە بەڕواڵەت دژیەکن، لەگەڵ ئەوەیشدا شەرعزان بە هەموویان نازانن، بەڵکو کۆمەڵێکیان هەندێکیان دەزانن و کۆمەڵێکیتر هەندێکیتریان و هەرلایەك کار بەوانەیان دەکا کە زانیونی، بەوەیش ناکۆکی لەنێوانیاندا دروست دەبێ، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن شوێنیان دەکەون بەبێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی لەو ئەسەرانە ریوایەت کراوە و لە بابەتی هەریەکەیان و شوێنی پیادەکردنیان دڵنیا بن، تا ئەو دژیەکیەی لەنێوانیاندا دیارە نەمێنێ.[3]

---

[1] عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنه) أنه كان على جمل له قد أعيا فأراد أن يسيّبه قال فلحقني رسول الله (ﷺ) فدعا لي وضربه فسار سيراً لم ير مثله قال: يعني بأوقية؟ قلت: لا. ثم قال: بعنيه، فبعته بأوقية واشترطت حملانه إلى أهلي. الحديث رواه مسلم متفق عليه، سبل السلام ٩/٣.

[2] عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنه) أنه كان على جمل له قد أعيا فأراد أن يسيّبه قال فلحقني رسول الله (ﷺ) فدعا لي وضربه فسار سيراً لم ير مثله قال: يعني بأوقية؟ قلت: لا. ثم قال: بعنيه، فبعته بأوقية واشترطت حملانه إلى أهلي. الحديث رواه مسلم متفق عليه، سبل السلام ٩/٣.

[3] الأستاذ الخفيف، سەرچاوەی پێشوو.

## باسی دووەم:
## جیاوازی لە تێگەیشتن لە مەبەست

پێشتر لە دەروازەی یەکەمدا ئەوەمان روون کردەوە کە جیاوازیی کیتاب و سوننە لە دیلالەتدا، لە هۆ سەرەکیەکانی جیاوازیی شەرعزانە لە تێگەیشتنی مەبەست لێیان و لەوێشەوە لە ئەحکامی شەرعیدا.

لێرەدا دەگەڕێمەوە و هەندێ مەسەلەی خیلافی دێنمەوە کە لە جیاوازی لە تێگەیشتنی مەبەست لە حەدیس کەوتونەتەوە:

لەبەرئەوەی هەندێ هۆکاریتری شەخسی هەن دەچنە پاڵ هۆکارەکانی دیلالەتی لەفزەکان وەك جیاوازی لە زیرەکی و پێگەی زانستی و نزیك و دووری لە هاوەڵیکدن و سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ).

هەروەها لەبەرئەوەی، ئەوەی لە دەروازەی یەکەمدا باس کرا تەنیا تایبەت بوو بە گوتەکان، هەرچی جیاوازییە لە تێگەیشتنی مەبەست، گوتە و کردار و پەسەندکردنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەگرێتەوە.

**أ- جیاوازیی هاوەڵان بەهۆی جیاوازییان لە تێگەیشتن لە مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) لە قسە یان کردەوەکەی.**

١- ئیبن عومەر لە زاری پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی :(المیت یعذب في قبره ببكاء أهله بما يُناح عليه، متفق عليه)[1]. (واتە: مردوو لە گۆڕەکەیدا بەهۆی گریانی کەسوکارەکەی بۆی سزا دەدرێ). کاتێ عائیشە (رەزای خوای لێبێ)

---

[1] بوخاری و موسلیم حەدیسێکی نزیك لەوەی ئیبن عومەریان لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ریوایەت کردوە. سبل السلام ١١٦/٢.

ئەوەی بیست بە وەهم و تێنەگەیشتنی مەبەستی پێغەمبەری دانا، لەبەرئەوەی پێغەمبەر بەتەنیشت گۆڕی ئافرەتێکی جولەکەدا تێپەڕی کە کەسوکارەکەی بۆی دەگریان ئەویش گوتی: ئەوان بۆی دەگرین و ئەویش لە گۆڕەکەیدا سزا دەدرێ، ئیبن عومەریش پێی وابوو سزادانەکە بەهۆی گریانەکەوەیە و وای زانی حوکمەکە گشتییە و هەموو مردوویەك دەگرێتەوە، کە کەسوکارەکەی بۆی بگرین.[1]

٢- کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ویستی دەوڵەتە ئیسلامییە نوێیەکە لە فیتنەی بەنی قورەیزە پاك بکاتەوە، فەرمانی بە هاوەڵان بکەن بچن بۆ لایان، پێی وتن: "لا يصلينّ أحدكم العصر إلا في بني قريظة". (واتە: کەستان نوێژی عەسر نەکا لە بەنی قورەیزە نەبێ) ، پاشان خۆی و هاوەڵانی بەپەلە بەرەو ئەوێ چوون کە سێ هەزار پیاو دەبوون، هەندێکیان بەڕێگەدا گەیشتنە عەسر و بەر لەوەی بگەنە بەنی قورەیزە نوێژەکەیان کرد، لەبەرئەوەی وا لە قسەکەی پێغەمبەر گەیشتن کە ئەوە تەنیا بەباشزانینە (ئیستیحسانە) و مەبەست پەلەکردن بووە بۆ رۆیشتن، هەندێکیتر نوێژەکەیان نەکرد تا گەیشتنە بەنی قەرەیزە و پاش بەسەرچوونی کاتەکەی، لەبەرئەوەی نەهیکردنەکەیان بە مانا راستەقینەکەی وەرگرت بەو مانایەی بەجدی نەهییان لێکراوە لە دەرەوەی ماڵی خۆیان نوێژی عەسر بکەن تا دەگەنە بەنی قورەیزە. پێغەمبەری خوایش بە کارەکەی هەردوولای زانی و هیچکامیانی لۆمە نەکرد، ئەوەیش پەسەندکردنی ئیجتیهادی هەریەك لە دوو تاقمەکە بوو.[2]

٣- پێغەمبەری خوا رێگەی بە موتعەدا و پاشان نەهی لێکرد. عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە، کە: (أن النبـي نَهَـى عَـنْ نِكَـاحِ الْمُتْعَـةِ وَعَـنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ زَمَنَ خَيْبَرَ).[3] (واتە: پێغەمبەر نەهی کردوە لە نیکاحی موتعە و

[1] الإنصاف في التنبيه على أسباب الخلاف للدهلوي ص ٥ المجموع للنووي ٢٦٣/٥.
[2] بروانە: اسباب الاختلاف للأستاذ الخفيف ص ١٢١.
[3] سبل السلام ١٢٥/٣.

گۆشتی كەرە ماڵیەكان لە سەروەختی خەیبەردا). هەروەها (سلمة بن الأكـوع) (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: رَخَّصَ لَنَا رَسُولُ اللّهِ (ﷺ) فِي مُتْعَةِ النِّسَاءِ عَامَ اَوْطَاسٍ ثَلَاثَـةَ أَيَّـامٍ ثُمَّ نَهَى عَنْهَا. رواه مسلم. (واتە: پێغەمبەری خوا لە ساڵی ئەوتاس بۆ داوەی سـێ رۆژ رێگەی پێداین بە موتعەی ئافرەتان و پاشان نەهی لێكرد).

نیكاحی موتعە بریتییە لە مارەكردنی ئافرەتێك لەلایـەن پیاوێكـەوە بـۆ ماوەیـەك، ئەوە رێپێدراو بوو پاشان نەسخ كرایەوە. ریوایەتەكان ئاماژە بەوە دەكـەن كـە پـاش نەهیلێكردن رێگەی پێدراوەتەوە، پاشان رێپێدانەكە نەسخ كراوەتەوە.[1]

حەدیسەكە لە ریوایەتی یەكەمدا ئاماژەیـە بـە نـەهیلێكردنی لـە رۆژی خەیبـەردا، ئیباحەكردنی لە ساڵی فەتحدا هاتووە و پاشان نەهیلێكردنی پاش رۆژی خەیبەر.[2]

ئیبن عەباس وا تێگەیشتوە روخسەتەكە لەبـەر زەرورەت و نەهیلێكردنەكـە لەبـەر نەمانی زەرورەتەكە بووە نەك نەسخكردنەوە و حوكمەكە لەسەر ئەوە ماوە.

بەڵام جمهوری هاوەڵان وا تێگەیشتون روخسەتەكە رێپێدان بووە و نەهیكردنەكـە نەسخكردنەوەی بووە. دەوترێ ئیبن عەباس لـە راكـەی خـۆی پاشـگەز بووەتـەوە و چووەتە سەر رای جمهور.[3]

٤- پێغەمبەر لە ئەبتەح[4] لای كۆمەڵێ حاجی دابەزی و دابـەزین لـە عەرەفـە و لـە تەوافەكەیدا لە عومرەی قەزادا بە هەروەلە رۆیشت.

جا جیاوازییان تێكەوت ئاخۆ ئەو دوانەی وەك رێـورەسمی حـەج كـردوە یـان نـا؟ ئەبوهورەیرە و ئیبن عومەر ئەوەیان وەرگرتوە، لەو رووەوە پێغەمبەر كردونی.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] إحكام الأحكام شرح عمدة الأحكام لابن دقيق العيد ١٩٣/٤-١٩٤.

[3] سەرچاوەی پێشوو ١٩٤/٤.

[4] ئەبتەح: سێلاوگەیەكی فراوانە لە موزدەلیفە كە وردە چەو و لمی تێدایە.

ئیبن عەباس و عائیشە پێیان وایە دابەزین لە ئەبتەح بەبێ مەبەست بووە، راکردنەکەیشی بۆ پیشاندانی چوستی بووە کاتێ موشریکەکان بە موسڵمانانیان وت: (تای یەسریب تێکیشکاندن) و بەشێك نین لە رێورەسمی حەج.[1]

**ب- جیاوازیی شەرعزان بەهۆی جیاوازییان لە تێگەیشتن لە مەبەست لە حەدیس:**

شەرعزان لە تێگەیشتنی مەبەست لە هەندێ حەدیس جیاواز بوون، ئەوەیش وای کردوە لە هەندێ مەسەلەی فیقهیدا رایان جیاواز بێ:

**١- لەبارەی دامەزرانی نوێژی هەینی (جومعە) بە کەمتر لە چل کەس رایان جیاوازە،** ئەویش لەبەرئەوەی عەبدورەحمان بە کەعب لە مالیکەوە ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: أول من جمع بنا هزم النبيت من حرة بني بياضة أسعد بن زرارة قبل مقدم النبي (ﷺ) المدينة في نقيع الخضمات قلت: كم كنتم يومئذ؟ قال أربعون رجلاً.[2]

شەرعزان لەبارەی مەبەست لە "اربعون رجلا" (چل پیاو) رای جیاوازیان هەبووە.

شافیعی و هاوەڵانی و ئەحمەد لە یەکێك لەو دوو ریوایەتەی لێیەوە هاتوون رایان وایە نوێژی جومعە بە کەمتر لە چل کەس دانامەزرێ. نەوەوی دەڵێ[3]: هاوەڵانمان پشتیان بەهەندێ حەدیس بەستوە هەرهەموویان لاوازن و نزیکترینی ئەوەی بکرێتە بەڵگە ئەوەیە بەیهەقی و هاوەڵان لە عەبدورەحمان بن کەعب بن مالیك کردویانە بەبەڵگە.

بەڵگەسازییەکە لەو رووەوەیە ئوممەت کۆدەنگە لەسەر بەمەرجدانانی ژمارە و ئەسڵ نیوەرۆیە، بۆیە جومعە بە ژمارەیەك نەبێ بەبەڵگە سەلمابێ دانامەزرێ،

---

[1] تاريخ الفقه الإسلامي الأستاذ محمد إسحاق الحداد ص ٢٥ رمل: هرول في مشيه.

[2] حديث حسن رواه أبو داود وابن ماجة وغيرهما بأسانيد نيل الأوطار ٢٦٢/٣.

[3] المجموع للنووي ١٣٢/٤.

دروستبوونیشی بە چل کەس سەلماوە بۆیە بەکەمتر لەوە نابێ بەبەڵگەیەکی راست نەبێ، ئەوەیش سەلماوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: "صلوا كما رأيتموني أصلي" (واتە: نوێژ بکەن وەك منتان بینی نوێژم کرد)، دەی ساغ نەبۆتەوە بە کەمتر لە چل کەسەوە کردبێتی.

جمهور رایان لەمە جیاوازە و وتویانە: حەدیسەکە ئەوەی لێ ناخوێنرێتەوە کە چل کرابێتە مەرج، لەبەرئەوە ئەمە رووداوێکی حەتمییە (واقعة عين)، چونکە جومعە لە مەککە و بەر لە کۆچ لەسەر پێغەمبەر فەرز کراوە وەك تەبەرانی لە ئیبن عەباسی گێڕاوەتەوە، بەهۆی کافرەکانەوە نەیتوانیوە لەوێ بیکا، کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە بۆی نووسین و فەرمانی بۆ کردن نوێژی جومعە بکەن و کردیان، وا رێکەوت ئەوکاتە ژمارەیان چل کەس بووە، بەڵام هیچ ئاماژەیەکی وای تێدا نیە کە جومعە بەکەمتر لە چل کەس دانامەزرێ. لە ئوسوڵیشدا ئەوە ئیقرار کراوە کە رووداوە حەتمیەکان ناکرێنە بەڵگە لەسەر گشتیبوون (العموم).

بەڵام جمهور لەسەر ژمارەیەکی دیاریکراو رێك نەکەوتون و لەنێوان خۆیاندا لەسەر دیاریکردنەکە جیاواز بوون هەریەکە و بەپێی ئیجتیهادی خۆی، تا ئەوەی حافز لە (فتح الباری)دا دەڵێ: (ناکۆکی لەم مەسەلەیەدا گەیشتۆتە پازدە رێچکە).

لەراستیدا لە هیچ شتێکی حەدیسەکاندا ژمارەیەکی دیاریکراو نەسەلماوە[1].

**٢- شەرعزان رایان جیاوازە لەبارەی مەبەست لە وشەی (الاغلاق) لەوەی** پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی "لا طلاق ولا عتاق في اغلاق" وفي رواية "فى غلاق".(واتە نە تەڵاق و نە ئازادکردن لە ئیغلاقدا نیە).

کۆمەڵێ رایان وایە مەبەست (توورەیی)ـە و بەوەیش گوتویانە تەڵاقی مرۆڤی توورە ناکەوێ. کۆمەڵێکیتر وتویانە مەبەست (زۆرلێکردن)ـە، بۆیە وتویانە تەڵاقی

---

[1] نیل الاوطار٣/٢٦٢ و پاشتر. سبل السلام ٢/٥٦.

زۆرلێکراو ناکەوێ. ئیبنول قەیم[1] دەڵێ جیاوازی لەبارەی ئیغلاق دروست بوو، خەڵکی حیجاز وتیان مەبەست زۆرلێکردنە، خەڵکی عێراقیش وتیان مەبەست توورەییە. کۆمەڵێکیش وتیان کۆکردنەوەی سیانە بە یەك وشە، وەك ئەوەی بە کۆکردنەوەی سیانەکە دەرگای گەڕانەوەی لە خۆی داخستبێ.

لەوانەی بە توورەیی تەفسیریان کردوە: مەسروق، شافیعی، ئیمام ئەحمەد، ئەبو داود، قازی ئیسماعیل. لەوانەیش بە زۆرلێکردن تەفسیریان کردوە: مالیکیەت و شیعەی ئیمامی[2] و هیتر.

دیارە حوکمی زۆرلێکردن جیایە لە توورەیی، زۆرلێکردن بەلای جمهورەوە تەلاقی پێ ناکەوێ، بەڵام لای حەنەفیەت پێی دەکەوێ.

بەڵام توورەیی چەند پلەیەکی هەیە، هەندێ لە زانایان وەك ئیبنول قەیم کردویانە بە سێ بەشەوە[3]:

یەکێکیان: سەرەتا و بنەماکانی لە مرۆڤ روودەدەن، بەشێوەیەك ئەقڵ و هۆشی لێ نەگۆڕێ و بزانێ چی دەڵێ، ئەمە هیچ کێشەیەك نیە لە کەوتنی تەلاقی و دروستیی گرێبەندکردنی، بەتایبەت ئەگەر پاش راڕابوونی فیکری.

دووەم: توورەیی بیگەیەنێتە ئەوپەڕی بەشێوەیێك دەرگای زانین و ئیرادەی لەسەر دابخرێ و نەزانێ چی دەڵێ و چی دەوێ، ئەمەیان هیچ ناکۆکی تێدا نیە کە تەلاقی ناکەوێ، ئەگەر توورەیی ئەقڵی لەناو برد، ئەوا بێگومان هیچ لە قسەکانی جێبەجێ ناکرێن.

سێیەم: ئەوەی لە ناوەڕاستی توورەییدا بێ، سەرەتاکانی لێ روودابێ بەڵام نەشگەیشتبێتە ئەوپەڕەکەی بەشێوەیەك وەك شێتی لێ بێ، ئەمە جێی ناکۆکی و تێڕوانینە، بەڵگە شەرعیەکان ئەوە دەگەیەنن تەلاق و عەقدەکانی جێبەجێ ناکرێن،

---

[1] اغاثة اللهفان ص١١.
[2] بڕوانە: الخلاف للطوسي ٢/٢٤٠.
[3] اغاثة اللهفان ص١١ و پاشتر.

لەبەرئەوەی لەوانەدا بوونی هەڵبژاردن و رەزامەندی مەرجن.

**٣– شەرعزان رایان جیاوازە لەبارەی بەکرێگرتنی خاوەن زەوی بۆ زەویەکەی لە کەسیتر بەبەشێك لە بەرهەمەکەی**، ئەویش لەبەر جیاوازییان لە تێگەیشتنی مەبەست لەو حەدیسەی عەبدوڵای کوڕی عومەر (رەزای خوای لێبێ) ریوایەتی کردوە کە: پێغەمبەر(ﷺ): عامل اهل خيبر بشطر[1] ما يخرج من ثمر أو زرع. متفق عليه.[2] (واتە: مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی خەیبەر کرد بە نیوەی ئەو بەروبومەی هەیەتی).

لە ریوایەتێکدا: داوایان لە پێغەمبەر کرد (لەسەر مەزراکانیان) بیانهێڵێتەوە و نیوەی بەرهەمەکەی بۆ ئەوان بێ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتی لەسەر ئەوە دەتانهێڵینەوە تا ئەوکاتەی ویستمان لێی بێ، بۆیە هێشتنیەوە تا عومەر رایگواستن. ریوایەتێکی لای موسلیم دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دارخورما و زەویەکانی خەیبەری دا بە جولەکەکانی خەیبەر تا بە ماڵی خۆیان کاری تێدا بکەن و نیوەی بەرهەمەکانیان بۆ پێغەمبەر بێ.[3]

یەکەم: دروستیی ئەم مامەڵەیە (واتە: موزارەعە)، ئەویش لە روانگەی زاهیری حەدیسەکەوە، کە ئەوە رای ئیبن ئەبو لەیلا و ئەبو یوسف و محەمەد و باقیی شەرعزانی کوفەیە جگە لە ئەبوحەنیفە و زوفر و شەرعزانی حەدیس و ئەهلی زاهیر: هەروەها رای ئەبوبەکر و عومەر و عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبە لە هاوەڵان.[4]

ئەوانە لە زاهیری حەدیسەکە ئەوە تێگەیشتوون کە ئاوبۆدان (المساقات) و موزارەعە[5] دروستە، چ بەکۆمەڵ بێ یان بەتاك تاك.[1]

---

[1] الشطر: نیوە–یە، بە ئاراستەیش دەوترێ وەك خوا ئەفەرموێ: (فولوا وجوهكم شطره).

[2] سبل السلام ٣/٧٧ و پاشتر.

[3] سبل السلام ٣/٧٨.

[4] بڕوانە: العدة مع احكام الاحكام ٤/١٤ سبل السلام ٣/٧٨

[5] جیاوازیی نێوانیان ئەوەیە ئاوبۆدان پێدانی زەوی و درەختەکانە بەو کەسەی سەرپەرشتی دەکات و گەشەی پێدەدا لەبەرانبەر بەشێك لێی یان لە بەروبومەکەی، بەڵام موزارەعە پێدانی زەوییە بەو کەسەی دەیچێنێ بەرانبەر بەشێك لێی. العدة ٤/١٤٠.

دووەم: ڕێگرتن لە بەکرێدانی زەوی بەبەشێك لە بەرهەمەکەی، کە ئەوە ڕای جمهورە و دەڵێن: ئاوبۆدان و موزارەعە لە ماوەی پەیمانەکەدا نەبێ دروست نیە[2]، چونکە ماوەکە نەزانراو نەبووە.

هەروەها دەڵێن: حەدیسەکە ئاماژە نیە بۆ دروستی موزارەعە، لەبەرئەوەی بەکرێدانە بە بەرهەمێکی نەبوو یان نەزانراو.[3]

سێیەم: کۆمەڵێ لەوانە ئەبوحەنیفە وا تێگەیشتوون ئەو مامەڵەیە بەشێوە ڕاستەقینەکەی نەبووە و تەنها بەناو موزارەعە ، لەبەرئەوەی زەویەکە بەبوونی بە غەنیمە کراوەتە موڵك و خەڵکەکەی بوونەتە کۆیلە، هەربۆیەماڵەکان هەموو هی پێغەمبەرن، کە هەندێ لەو ماڵەی پێدان تا سوودی لێ وەربگرن نەك ئەوە حەقیقەتی مامەڵەکە بێ، ئیبن دەقیق ئەلعید دەڵێ: ئەمە لەسەر سەلماندنی ئەوە دەوەستێ کە خەڵکی خەیبەر کرابنە کۆیلە، چونکە هەر مەرج نیە دەست بەسەرداگرتن ڕوودانی بەکۆیلەکردنی باڵقەکان بگەیەنێ.[4]

چوارەم: دروستیی موزارەعە بەدوای موساقاتدا، ئەوەیش بۆچوونی شافیعی و هاوەڵانی و ئەوانەیە هاوڕایان بوون، ئەوان وا لە حەدیسەکە گەیشتوون کە مامەڵەکە موساقات بووە لەسەر دارخورما و زەویی نێوان دارخورماکانیش کەم بوو، هەربۆیە موزارەعەیش لەگەڵ موساقاتەکەدا ڕوودەدا.[5]

ئیبن تەیمیە و ئیبنول قەیم ڕای یەکەمیان لەناو ئەم ڕایانەدا زاڵ کردوە.

---

[1] هەروەو سەرچاوەی پێشوو.

[2] سبل السلام ۳/۷۸.

[3] العدة ٤/١٤٠

[4] احكام الأحكام شرح عمدة الأحكام ٤/١٤١.

[5] شەرعزان لەبارەی ئەو درەختانەی ئاوبۆدان (مساقات)یان تێدا جائیزە ڕایان جیاوازە، داودی زاهیری دەڵێ تەنها لە دارخورمادا دروستە، شافیعی و هاوەڵانی دەڵێن تەنها لە خورما و ترێدا جائیزە، مالیك دەڵێ بۆ هەموو درەختەکان جائیزە، ئەبوحەنیفە و زوفەر دەڵێن مزارعە و ئاوبۆدان هەردووکیان فاسیدن چ بەیەکەوە بن یان بەجیا و وتویانە عەقدەکە هەڵدەوەشێنرێتەوە. العدة مع إحكام الأحكام ٤/١٤٠.

أ- ئەمە پوختەی رای ئیبن تەیمیەیە: ئەوانەی وتویانە موزارەبە و موساقات و موزارەعە بەپێچەوانەی قیاسن، وایان زانیوە ئەم عەقدانە لە رەگەزی بەکرێدانن، لەبەرئەوەی کارکردنن بە باتییەك، لە بەکرێدانیشدا مەرجە باتی و لەباتیدراو بزانرێن، کاتێ بینیویانە کارکردن بەم عەقدانە نەزانراوە و قازانج تێیاندا نەزانراوە وتویانە: پێچەوانەی قیاسن. ئەمەیش لە هەڵەی ئەوانە، چونکە ئەم عەقدانە لە رەگەزی هاوبەشین نەك لە رەگەزی ئاڵوێری تایبەت کە تێیدا مەرجە هەردوو باتیەکە بزانرێن. هاوبەشی (مشارکات)یش رەگەزێکە جیاواز لە رەگەزی ئاڵوێر (المعاوضة).

پاشان ئیبن تەیمیە ئەمە روون دەکاتەوە و دەڵێ: ئەو کارەی مەبەست تێیدا ماڵە سێ جۆرە:

یەکێکیان: ئەوەیە کارەکە مەبەست و زانراو بێ و توانای رادەستکردنی هەبێ، ئەمە بەکرێدانی پێویستە (الاجارة اللازمة).

دووەم: ئەوەیە کارەکە مەبەست بێ بەڵام نەزانراو یان نادڵنیایی (غرر) بێ، ئەمە جەعالەیە.

سێیەم: ئەوەیە کار تێیدا مەبەست نەبێ، بەڵکو مەبەست پارە بێ، ئەوەیش موزارەبەیە، کە بەشدارییە، ئەویان لاشەی سوود دەگەیەنێ و ئەویتر ماڵەکەی، ئەو قازانجەیش خوا بەشی کردوە بەهاوبەشی دەبێ لەنێوانیاندا، لەبەرئەوە دروست نیە یەکێکیان قازانجێکی مەزەندەکراوی بۆ تایبەت بکرێ، لەبەرئەوەی لەو دادپەروەرییە دەردەکا کە پێویستە لە شەراکەتدا هەبێ لە شەریکیان لە دەسکەوت و زیان، ئەگەر قازانجێك دەست کەوت لە دەسکەوتەکەدا شەریك دەبن ئەگەریش نەبوو لە بێبەشیدا شەریك دەبن، بەهەمان شێوە لە موزارەعەدا: ئەگەر بەرهەمی هەبوو تێیدا شەریکن ئەگەریش نەبوو لە بێبەشبووندا شەریکن، ئەمەیش لە بەکرێدان (ئیجارە)دا لە دادپەروەری نزیکتر و لە ستەم دوورترە، ئەسڵیش لە هەموو عەقدەکاندا

دادپەروەرییە، تا دوایی.[1]

ب- هەروەها ئیبنول قەیمیش بەرگری لە موزارەعە دەکا بەکۆ بێ یان بە تاك:

دەڵێ: چیرۆکەکە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە ئاوبۆدان و موزارەعە بەبەشێك لە حاسڵاتەکە دروستە چونکە ئەو بەو شێوەیەی لەگەڵ ئەهلی خەیبەر کرد و لەسەر ئەوە بەردەوام بوو تا مردنی و هەرگیزیش نەسخ نەکراوەتەوە، خەلیفە راشیدەکانیش لە کارکردن لەسەری بەردەوام بوون، ئەمەیش لە بابی بەکرێدان نیە بەڵکو لە بابی هاوبەشییە (المشارکە) کە وەك موزارەبە وایە، جا ئەوەی موزارەبەی موباح کردوە و ئەو (واتە موزارەعە)ی حەرام کردوە ئەوا جیاوازی لەنێوان دوو شتی هاوشێوەدا کردوە.[2]

وای دەبینم ئەوەی ئەم دوو شەرعزانە مەزنە بۆی چوون لە دانانی موزارەعە لە بابی (مشارکە) رایەکی دروستە و پێویستە دەستی پێوە بگیرێ، لەبەرئەوەی موزارەعە بریتییە لە بەشداریکردن لەگەڵ خاوەن زەوی تەنها بە زەویەکەی، یان لەگەڵ تۆو، هەروەها بەشداریی لایەنەکەیتر تەنها بە کارەکەی یان بە کار و تۆو، هەردووکیشیان لە زەرەر و قازانجدا شەریکن، موشارەکەیش هەرئەوە دەگەیەنێ.

پاشان ئەم مامەڵەیە -وەك ئیبن تەیمیە گوتی- لە بەکرێدان زیاتر دادپەروەری بەدیدێنێ، لەبەرئەوەی بەکرێگری زەوی ئەگەر دەرد و بەڵایەکی ئاسمانی تووشی کشتوکاڵەکەی بوو، پابەندیەکەی بەدانی کرێ بە خاوەن زەویەکە لەکۆڵ ناکەوێ، بەڵکو لەپاڵ زیانە مادیەکەیدا بەگوێرەی عەقدەکە هەر پابەندیش دەمێنێتەوە، بەپێچەوانەی موشارەکە، کە لایەنەکان لە زەرەر و قازانجدا بەشدارن.

**٤- شەرعزان لەبارەی بڕینی دەستی حاشاکەر لە خوازراو (جاحد العاریة) و جێبەجێکردنی سزای دزی لەسەری جیاوازن، ئەویش بەهۆی جیاوازییان لە**

---

[1] بڕوانە: القياس في الشرع الاسلامي لابن تيمية ص ٧ و پاشتر.

[2] زاد المعاد لابن القيم ١٤٣/٢.

تێگەیشتنی ئەو حەدیسەی ئیبن عومەر (رەزای خوای لێبێ) ریوایەتی کردوە: ئافرەتێکی مەخزومی هەبوو شتی وەردەگرت و حاشای لێدەکرد، پێغەمبەر(ﷺ)یش فەرمانی کرد بە دەستی برینی.[1]

ئیمام ئەحمەد و ئیسحاق و ئەهلی زاهیر و خەواریج لەگەڵ ئەوەن دەستی (جاحد العارية) دەبڕدرێ، لەبەرئەوەی بەگوێرەی ئەو حەدیسە حاشاکردن (جحد) لەناو ناوی دزیدا جێی دەبێتەوە.

بەلای جمهورەوە ئەو کەسەی حاشا لە شتی خوازراو بکا دەستبڕینی واجب نیە.

هۆی ناکۆکیەکەیش جیاوازییانە لە تێگەیشتنی دەقەکەدا:

ئەوەی فەرمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستبڕین لەبەر حاشاکردن لە خوازراو بووە وەك زاهیری حەدیسەکە دەیلێ، وتوێتی دەستی (جاحد العارية) دەبڕدرێ.

ئەوەیش جیاواز لەوە لێی تێگەیشتووە وتوێتی: پێغەمبەر(ﷺ) لەبەرئەوە فەرمانی کرد بە برینی دەستی ژنە مەخزومیەکە، چونکە لەپاڵ حاشاکردنی لەو شتانەی وەریدەگرتن، بەکردەوە دزیشی کردبوو، لەبەرئەوەی لە هەندێ ریوایەتدا وا باس کراوە کە دزی کردوە و پێغەمبەریش فەرمانی کردوە بە برینی دەستی لەبەر دزیکردنەکەی.

لە ریوایەتی عائیشەدا هاتووە: كَانَتْ امْرَأَةٌ مَخْزُومِيَّةٌ تَسْتَعِيرُ الْمَتَاعَ وَتَجْحَدُهُ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِقَطْعِ يَدِهَا، فَأَتَى أَهْلُهَا أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ فَكَلَّمُوهُ، فَكَلَّمَ النَّبِيَّ (ﷺ) فِيهَا، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): يَا أُسَامَةُ، لا أَرَاكَ تَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟، ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) خَطِيبًا فَقَالَ: إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِأَنَّهُ إِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الضَّعِيفُ قَطَعُوهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ كَانَتْ فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ، لَقَطَعْتُ يَدَهَا. فَقَطَعَ يَدَ الْمَخْزُومِيَّةِ.[2]

---

[1] رواه احمد والنسائي وابو داود وقال: فامر النبي(ﷺ) فقطعت يدها. بڕوانە: نيل الاوطار ١٤٧/٨.

[2] بڕوانە: نيل الاوطار، سەرچاوەی پێشوو.

## باسی سێیەم:
## جیاوازی لە دروستبوونی تێکگیران و نەهێشتنی

سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)،کە بریتییە لە هەرچی لەوەوە دەرچووە لە گوفتار و کردار و پەسەندکردن بەدرێژایی ماوەی پێغەمبەرایەتیەکەی کە ٢٣ ساڵ بووە، دەریایەکی گەورەیە کەس ناتوانێ بگاتە کەنارەکانی. دیارە دەقەکان لە بۆنەی جۆراوجۆر و لەبەر بەرژەوەندیی جیاواز هاتوون کە حوکمەکان بۆ لەبەرچاوگرتنیان دانراون.. لەبەرئەوە دەبینی مەسەلەیەك دوو حەدیسی دژبەیەکی لەبارەوە هاتوون، یەکێکیان لە بۆنەیەکدا وتراوە و ئەویتریان لە بۆنەیەکیتردا کە بەرواڵەت جیاوازە لەو، یان یەکێکیان بۆ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیەك کە لەوکاتەدا لەئارادا بووە هاتووە، پاشان ئەوە نەماوە و بەرژەوەندیەکی نوێ هاتۆتە کایە کە حوکمێکی نوێی خواستوە، کە لە حەدیسی دووەمدایە، بۆیە دەبێتە نەسخکەرەوەی یەکەمیان. پاشان بۆنەکان لەبیر دەکرێن، یان مێژوو نازانرێ، یان حەدیسێکیان دەگات بە شەرعزانێك و ئەویتریان بە یەکێکیتر، بەوەیش ناکۆکی لەبارەی حوکمی مەسەلەکە لەنێوانیاندا دروست دەبێ.

### تێکگیران (التعارض):

لەرووی زمانەوانیەوە: بەمانای (تمانع) دێ، واتە بەرهەڵستی کرد، معارچە، مومانەعەیە بەمانای بەرانبەر وەستان.[1]

لەرووی زاراوەوە: ئەوەیە ئاماژەی یەکێك لە دوو دەلیلە گومانگر (ظني)ەکە جێگیربوونی شتێك و ئەویتریان نەبوونی ئەو شتە بخوازێ، بەزاهیر لە یەك کات و یەك

[1] فتح الغفار ٢/١١٠.الکشف مع البزدوري ٣/٧٩٦.

شوێندا.[1]

تێکگیران لەنێوان دوو گومانبڕ (قەتعی)دا نابێ لەبەرئەوەی ناکرێ هەردوو پێچەوانەکە رووبدەن، لەنێوان گومانبڕ و گومانگرێکیشدا نابێ لەبەر نایەکسانییان لە هێزدا، هەروەك لەنێوان دوو گومانگریشدا لە واقیع و هەمان شتدا نابێ، کەواتە لە واقیع و هەمان شتدا تێکگیران لە دەلیلە شەرعیەکاندا نیە[2]، بەڵکو تێکگیرانەکە بەنیسبەت تێڕوانینی ئێمەیە، هەروەها تێکگیران لەنێوان دوو دەقدا نیە کە یەکێکیان حەڵاڵکردنی ئافرەتێکی مارەکراو دەگەیەنێ و ئەویتر حەرامیی دایکی لەبەر ئەوە شوێنیان یەك نیە، یان لەنێوان دوو دەقدا یەکێکیان رێگە بە چێژوەرگرتن لە ژن لەکاتی پاکیدا دەدات و ئەویتر لەکاتی حەیزدا حەرامی دەکا، لەبەرئەوەی کاتەکەیان یەك نیە.

## نەهێشتنی تێکگیران:

بۆچوونی شەرعزان لەبارەی نەهێشتنی تێکگیران لەنێوان ئەو حەدیسانەی لە مەسەلەیەکدا هاتوون جیاوازە. لەبەرئەوە ئەم بابەتە بە گرنگترین هۆی جیاوازیی شەرعزان دادەنرێ لە حوکمە شەرعیەکاندا. لەبەرئەوە ئەم بابەتە لە گرنگترین هۆکانی جیاوازیی شەرعزانە لە حوکمە شەرعیەکاندا.

بەڵام هەندێ بنەمای گشتی هەن زانایان لە شەرعزان و ئوسوڵناسان کۆکن لەسەر شوێنکەوتنیان بۆ نەهێشتنی تێکگیران، کە بریتین لە:

١- بەپێی توانا هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی دوو حەدیسەکە و کارکردن بە هەردووکیان.

---

[1] بڕوانە دوو سەرچاوەی پێشوو.

[2] بڕوانە: ابن السبکي جمع الجوامع ٢/٢٢٦ و پاشتر.

٢- ئەگەر نەكرا بەشێوەيەك لە شێوەكان كۆبكرێنەوە مێژوويان دەزانرا ئەوا دووەميان بە نەسخكەرەوەی يەكەم دادەنرێ وەك حەديسی نەهيكردن لە موتعە لەگەڵ حەديسی روخسەتپێدانی. جمهوری موسڵمانان كۆدەنگن لەسەر نەسخكردنەوەی موتعە لەبەرئەوەی ساغ بۆتەوە حەديسی نەهلێكردن پاش حەديسی ئيباحەكردنی هاتووە، كە پێشتر باس كرا.

٣- ئەگەر كۆنەدەكرانەوە و مێژوويشيان نەدەزانرا دەگەڕێنەوە بۆ حەديسيتر بۆ زاڵكردنی يەكێكيان بەسەر ئەويترياندا.

## زاڵكەرەكان (المرجحات):

زاڵكردن (الترجيح): لەڕووی زمانەوە زاڵكردنی شتێكە.

لەڕووی زاراوەوە: روونكردنەوەی زاڵی يەكێك لە دوو تێكگيراوەكەيە لەهێزی بەسەر ئەويترياندا و پێشخستنی زاڵ (راجح) بەسەر بنزاڵ (مرجوح)دا. رای جمهوری لەكاتی لە بەرانبەركردنی راجيحدا دەليل نيە، كەواتە لە پشتگوێخستنيدا پشتگوێخستنی دەليل نيە، بە راجيحكەرەكان دەكرێ لە تێكگيرانی نێوان دوو بەڵگە رزگار ببين. هەروەها لەبەر كۆكبوونی هاوەڵان و سەلەف لەسەر پێشخستنی هەندێ بەڵگە بەسەر هەندێكيتردا ئەگەر شتێكی وای لەگەڵ بوو بەسەر بەرانبەرەكەيدا زاڵ بێ، ئەوا هەواڵی عائيشەيان لە پێويستيی بەريەككەوتنی دوو خەتەنەكراوەكە بۆ واجببوونی وسڵ (الغسل) پێش ئەو هەواڵە خستوە كە دەڵێ: (ان لا ماء إلاّ من الماء).[1] (واتە: تا ئاو (ی پياو) نەيەت شۆردن بەئاو واجب نابێ).

هەندێ دەڵێن: لەكاتی تێكگيراندا واجب وەستان يان سەرپشكبوونە بەبێ كردنزال لەبەرئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الأَبْصَارِ﴾ ، خوا فەرمان بەپەندوەرگرتن دەكا، كاری مەرجوحيش پەند وەرگرتنە. هەروەها لەبەرئەوەی

---

[1] كشف الاشرار مع البزدوري ١١٩٦/٣.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: "نحن نحكم بالظاهر" و حوكمدان بە زاهیر. هەروەها لەبەرئەوەی نیشانە گومانگرەكان لە (بینات) زیاتر نابن، لە (بینات)یشدا تەرجیح بایەخی نیە، تەنانەت شایەتی چوار بەسەر شایەتی دوودا راجیح نەبووە، نیشانەكانیش بەهەمان شێوە.[1]

بەم شێوەیە ئەم بەڵگانە هەڵدەسەنگێنین:

أ- مانای ئایەتەكە پێویستیی تێڕوانینە و هیچی وای تێدا نیە دژی بە پێویستدانانی كاركردن بە راجیح بێ.

ب- لەبارەی كردنەبەڵگە لە سوننەدا دەوترێ: بنزاڵ (مرجوح) زاهیر نیە، بەڵكو زاهیر ئەوەیە یەكێك لە دوو لاكەی بەسەر ئەویتردا زاڵ بێ، بەڵام بنزاڵ لەگەڵ زاڵ (راجح) بەو شێوەیە نیە.

ج- پێشنەخستنی شایەتیی چوار بەسەر شایەتیی دوو كەسدا، لەبەرئەوەیە شایەتی دووان عیللەیەكی تەواوە بۆ حوكمەكە.

نامەوێ بچمە ناو وردەكاریی رووەكانی زاڵكردن (ترجیح) و زاڵكەرەكان و روونكردنەوەی حەسر یان ناحەسرییان، لەبەرئەوەی ئەو بابەتە لە شوێنی خۆیدا لە كتێبەكانی ئوسوڵدا شی كراوەتەوە، بەڵكو ئەوەی بەلامانەوە گرنگە لەم باسەدا هێنانی نموونەیەكیەتی لەگەڵ ئاماژەدان بەوەی جیاوازیی بۆچوونی شەرعزان لەو زاڵكەرانەدا هۆیەك بووە لە هۆكانی جیاوازییان لە حوكمداندا.

زاڵكردن دەكرێ لە رووی سەنەدەوە بێ و دەشكرێ لەڕووی مەتنەوە بێ، هەروەك دەكرێ لەبەر لەبەرچاوگرتنی شتێكی دەرەكی رووبدات.

---

[1] كشف الاسرار، سەرچاوەی پێشوو.

زاڵكردنی حەدیسێك بەسەر یەكێكیتردا –بە لەبەرچاوگرتنی سەنەد– لەكاتی تێكگیرانی رواڵەتیدا، كۆمەڵێ هۆی هەیە، لەوانە:

١– بەتەمەنیی راوی: بەلای مالیكیەت و ئەوانەی هاوڕایانن، ئەگەر یەكێك لە دوو راویەكە بەتەمەنتر بوو حەدیسەكەی پێش حەدیسی تەمەن بچوكترەكە دەخرێ، لەبەرئەوەی تەمەن گەورەتر دامەزراوترە و لە گێڕانەوەیدا وردترە. وەك ئەوەی مالیكیەت و ئەوانەی لەگەڵیانن دەڵێن حەجكردن بەتەنها باشترە و ئەو حەدیسە ئیبن عومەر دەكەنە بەڵگە كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) كاتێ ئیحرامی بەست بەتەنها حەجی كرد.[1]

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن: ئەمە حەدیسەكەی ئەنەس دژی دەوەستێ كە گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە تەلبیەی بۆ حەج و عەمرە پێكەوە كردوە.[2]

مالیكیەت دەڵێ: ئیبن عومەر لە حەجی ماڵئاواییدا بەتەمەن و ئەنەس بچوك بوو، لەبەرئەوە ریوایەتەكەی ئیبن عومەر راجیحترە. جێمتمانەكان لە زەید بن ئەسلەم و هیتر ریوایەتیان كردوە كە: بم اهل رسول الله(ﷺ) فقال: لم تأت العام الأول؟ فقال: بلى ولكن أنس بن مالك زعم أنه قرن، فقال ابن عمر: إن أنس بن مالك كان يُوكل على النساء، وهن مكتشفات الرؤوس، وإني كنت تحت ناقة رسول الله (ﷺ) يمسني لعابها، اسمعه يلبي.[3]

٢– راویەكە خۆی چیرۆكەكە بگێڕێتەوە، چونكە ریوایەتی ئەو لە ریوایەتی ناڕاستەوخۆ زاڵترە لەبەرئەوەی راستەوخۆ بەوەی گێڕاویەتیەوە زاناتر و دامەزراوترە. وەك تەرجیحی جمهور بۆ ریوایەتی ئەبو رافع بەسەر ریوایەتی ئیبن عباسدا. ئەبو رافع

[1] عائیشە لە پێغەمبەری گێڕاوەتەوە. متفق علیه، سبل السلام٢/١٨٨.

[2] مفتاح الوصول في علم الأصول للتلمساني ص١٤٦.المسودة ص ٣٦٠.

[3] التلمساني ص ١٤٦ـ١٤٧.المسودة ص ٣٠٦.

دەڵێ: تزوج رسول الله (ﷺ) ميمونة وهو حلال، وبنى بها وهو حلال، وكنت أنا السفير بينهما[1]. وقال ابن عباس: تزوجها وهو محرم.[2]

رووی زاڵکردنەکەیش لای جمهور ئەوەیە ئەبورافیع راستەوخۆ چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە لەبەرئەوە لەپێشترە.[3]

هەروەها حەدیسەکەی میمونەیان کردۆتە بەڵگە کە خاوەنی رووداوەکەیە، دەڵێ: (تزوجني رسول الله (ﷺ) ونحن حلالان).. بۆیە وتویانە: ئەم حەدیسە بەسەر حەدیسی ئیبن عەباسیشدا زاڵ دەکرێ. حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن ریوایەتی ئیبن عەباسیان زاڵ کردوە لەبەر تەواویی زەبت و فیقهی و راکەیان کە دەڵێن ئیحرام لە رێگرەکانی دروستیی نیکاحە، لەسەر ئەوە دامەزراندوە.

٣- ئەوەیە یەکێك لە دوو راویەکە هاوەڵیکردنی لەگەڵ پێغەمبەر زیاتر بێ، کە ئەوە لەپێشترە و حەدیسەکەی پێش ئەوە دەکرێ هاوەڵیکردنی کەمترە، وەك زاڵکردنی حەدیسەکەی عائیشە و ئوم سەلەمە کە دەڵێ: "ان رسول الله (ﷺ) كان يصبح جنبا من غير احتلام ثم يصوم"،[4] بەسەر حەدیسەکەی ئەبوهورەیرەدا کە دەڵێ: (أن رسول الله (ﷺ) قال: من أصبح جنبا فلا صوم له) مالیکیەت و ئەوانەی هاوڕایانن.[5]

هۆی زاڵکردنەکە: ئەوەی هاوەڵیکردنی درێژتر بێ شارەزایی لەو سونەنانەی بەردەوام دەبن و ئەوانەی بەردەوام نابن زاناترە، لەبەرئەوە کاتێ مەروان بن ئەلحەکەم کەسێکی نارد بۆ لای ئەبوهورەیرە تا وەڵامی بداتەوە بەوەی لە

---

[1] اخرجه الترمذي وفيه وكنت الرسول بينهما، وصححه ابن خزيمة وابن حبان نحوه الدار قطني، وارسله مالك.

[2] اخرجه الشيخان: وفي رواية البخاري وبني بها حلال. واخرجه الدار قطني.

[3] كشف الاسرار مع البزدوي ٢/٧١٧.فتح القدير٣/٢٣٣.

[4] اخرجه الشيخان بزياده في رمضان. وفي رواية جنابة من جماع، متفق عليه وزاد مسلم بحديث ام سلمة ولا يقضي، سبل السلام ٢/١٦٥.

[5] اخرجه النسائي ونحوه مسلم.

حەدیسەکەی عائیشە و ئوم سەلەمەدا ریوایەتی کردوە. ئەبو هورەیرە وتی: ئایا ئەوان (عائیشە و ئوم سەلەمە) پێیان وتیت؟ وتی: بەڵێ. ئەبو هورەیرە وتی: دەی ئەوان باشتر دەزانن.[1]

شیعەی ئیمامی خواستی حەدیسەکەی ئەبوهورەیرەیان وەرگرتوە و وتویانە: هەرکەس بەبێ عوز بە لەشپیسی رۆژ بکاتەوە، رۆژوی بۆ نیە و دەبێ قەزای بکاتەوە و کەفارەتیش بدات.[2]

هەروەها جمهوری هاوەڵان و تابیعین و شەرعزان حەدیسەکەی عائیشەیان زاڵ کردوە لە واجببوونی وسڵ بە بەیەکگەیشتنی دوو خەتەنەکراوەکە بەسەر ئەوەدا کە عوسمانی کوڕی عەفان ریوایەتی کردوە لە حەدیسی "الماء من الماء" (ئاو لە ئاوە). لای موسلیم بە لەفزی (إنما الماء من الماء) هاتووە و حەدیسەکە وەك حەسر ئاماژەیە بەوەی وسڵ بە ئاوهاتنەوە (انزال) نەبێ واجب نابێ و بەیەکگەیشتنی دوو خەتەنەکراوەکە وسڵی ناوێ. ئەوە رای داودی زاهیری و هەندێ هاوەڵ و کۆمەڵێ لە تابیعینە. عوسمانی کوڕی عەفان (رەزای خوای لێبێ) لەبارەی ئەو کەسەی لەگەڵ ژنەکەی جیماع دەکات و ئاوی نایەتەوە پرسیاری لێکرا، وتی: بۆ نوێژ دەستنوێژ دەگرێ و زەکەری دەشوا. وتی: ئەوەم لە پێغەمبەری خواوە بیست[3]. هەریەك لە عەلی و زوبێر و تەڵحە و ئوبەی کوڕی کەعب و ئەبوئەیوبیش وایان وتوە و بەرزی کردۆتەوە بۆ پێغەمبەری خوا.[4]

رای زاڵ رای جمهورە، لەبەرئەوەی ئەم مانایە حەدیسەکەی عائیشە و گوتراوەکەی لەدژیەتی. ئەویش (واتە عائیشە) لە عوسمانی کوڕی عەفان و باقیی راویانیتری حەدیس دامەزراوترە لەبەر زۆریی یاوەریکردنی بۆ پێغەمبەر(ﷺ).

---

[1] التلمساني ، سەرچاوەی پێشوو .

[2] الخلاف للطوسي ٣٨٠/١.

[3] رواه البخاري . بڕوانە: سبل السلام ٨٥/١.

[4] سەرچاوەی پێشوو.

هەروەها پێچەوانەی حەدیسەکەی ئەبوهورەیرەیە کە دەڵێ: قال رسول الله (ﷺ) اذا جلس بين شعبها الأربع ثم جهدها فقد وجب الغسل.[1]

٤- زۆریی ریوایەتی یەکێك لە دوو هەواڵدەرەکە وەك زاڵکردنی مالیکیەت و شافیعیەت و ئەوانەی هاوڕایانن بۆ حەدیسی واجببوونی دەستنوێژ بۆ ئەوەی دەست لە زەکەری بدا بەسەر حەدیسی "انما هو بضعة منك"دا.[2]

مالیکی و شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن: حەدیسی واجبکردنی دەستنوێژ ئەبوهورەیرە و ئیبن عومەر و زەید بن خالد و سەعد بن ئەبی وەقاص و جابر بن عەبدوڵا و عائیشە و ئوم سەلەمە و ئوم حەبیبە و هیتر ریوایەتیان کردوە. وتویانە: ئەوەی زیاتر ریوایەت کرابێ زاڵترە.

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن: زاڵکردن (ترجيح) بەزۆریی راوی نیە، چونکە ئەگەر نەگەنە ئاستی جەمینە (تواتر) یان بەناوبانگ وەسفێك لە هەواڵەکەدا روونادا کە پێی بەهێز بێ، بەڵکو هەروەك خۆی بە تاکینە هەواڵ دەمێنێتەوە. بەڵام ئەگەر گەیشتە ئاستی جەمینە یان بەناوبانگ ئەوا وەسفێك تێیدا رووی داوە پێی بەهێز بووە و دەوترێ هەواڵێکی بەناوبانگ یان جەمینەیە و ئەو زۆرییە بۆ زاڵکردن لەبەرچاو دەگیرێ نەك یەکەم.[3] کاریان بە حەدیسی (بسرة) نەکردوە لەبەرئەوەی ئاحادە، ئەگەرچی لەوەشدا هاتوە کە بەڵای پێ بڵاو دەبێتەوە.

٥- یەکێك لە دوو راویەکەی گێڕانەوە لێیەوە جیاواز نەبێ بەپێچەوانەی ئەویتریان: وەك زاڵکردنی حەدیسی ئیبن عومەر کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێ: (اذا زادت

---

[1] متفق عليه وزاد مسلم وان ينزل . سەرچاوەی پێشوو.

[2] عن طلق بن علي قال: قال رجل مست ذكرى او قال رجل يمس ذكره في الصلاة أعليه وضوء؟ قال النبي (ﷺ) انما هو بضعة منك. اخرجه الخمسة وابن حيان. وهذا الحديث يتعارض مع حديث بسرة (كانت من المبايعات للرسول) ان رسول الله (ﷺ) ((قال من مسّ ذكره فليتوضأ)) أخرجه الخمسة وصححه ابن حبان، سبل السلام ٨٨/١ـ ٨٩.

[3] بڕوانە: كشف الأسرار مع البزدوري ١١٩٩/٣.

الإبـل عشـرين ومائـة، ففـي كـل أربعـين بنـت لبـون، وفي كـل خمسـين حقـة)[1] بەسـەر حەدیسی عەمر بن حەزمـدا کـە پێغەمبـەر ئەفـەرموێ: (اذا زادت الابـل علـى عشـرين ومائة استؤنفت الفريضة)[2]، چونکە هەمان ڕیوایەتی ئیبن عومەر لە عەمر بن حەزمـەوە ڕیوایەت کراوە[3].

شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین ئەمـەیان وەرگرتـوە و حەدیسـەکەی ئـیبن عومـەریان بەسەر حەدیسەکەی عەمر بن حازمدا تەرجیح داوە، لەبەر جیاوازیی ڕیوایەتی دووەم، نەك یەکەم.

حەنەفیـەت و ئەوانـەی هـاوڕاین حەدیسـەکەی عـەمر بـن حـەزمیان زاڵ کـردوە، لەبەرئەوەی زیادەیەکی تێدایە، حەدیسەکەی ئیبن عومـەریش شـتێکی وای تێـدا نیـە ئەو زیادەیە ڕەت بکاتەوە.[4]

زاڵکردن بەلەبەرچاوگرتنی مەتنیش زۆر هۆی هەیە لەوانە:

١- ئەوەیە مەتنی یەکەم قسە بێ و ئەویتریان کردەوە بێ، لای هەندێ شـەرعزان قسـە بەسـەر کـردەوەدا زاڵ دەکـرێ، وەك بەبەڵگەهێنانـەوەی مالیکیـەت و ئەوانـەی هاوڕایانن بە حەدیسەکەی عوسمان، کە پێغەمبەری خـوا(ﷺ) ئەفـەرموێ:((لا یـنکح المحرم ولا يُنكح) و زاڵکردنی بەسەر حەدیسەکەی ئیبن عەباسدا کە پێغەمبـەری خـوا

---

[1] أخرجه ابو داود والنسائي والدارقطني واحمد، ورواه البخاري . سبل السلام ١٢٢/٢.

[2] أخرجه ابو داود في المراسيل والطحاوي في المشكل .

[3] التلمساني ص ١٥٠.

[4] الهداية مع فتح القدير ١٧٧/٢ و پاشتر.المهذب للشيرازي ١٤٥/١. دەستپێکردنی فەرز مانای وایە ئەگـەر لـە سەد و چل زیادی کرد ئەوا سەبارەت بە زیادە لە پێنجدا مەڕێك و لە دەدا دوو مەڕ و لە پازدەدا سێ مەڕە و بەو شێوەیە.

ئەفەرموێ: (ان رسول الله نكح ميمونة وهو محرم)، لەبەرئەوەی كردەوەكە ئەگەری تایبەتبوونی لێدەكرێ.[1]

٢- ئەوەیە یەكێك لە دوو مەتنەكە بە گوترلو (مەنتوق)ەكەی ئاماژەدەر بوو ئەویتریان بە مەفهومەكەی، جا بەلای هەندێكەوە ئاماژەدەر (دال) بە گوتراو لەسەر حوكمەكە پێش حەدیسی ئاماژەدەر بە مەفهومەكەی دەخرێ، وەك زاڵكردنی ئەوەی ریوایەت كراوە كە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ (الجار أحق بشفعة جاره) بەسەر مەفهومی ئەوەی ئەفەرموێ: (الشفعة فيما لم يقسم) لەلایەن حەنەفیەتەوە.[2]

٣- ئەوەیە یەكێكیان لە ئەسڵی بەرائەتەوە بگوێزێتەوە و ئەویتریان نەفیكار بێ، كە بەلای هەندێكەوە گوێزەرەوەكە لەپێشترە وەك كە مالیكیەت و ئەوانەی هاوڕایانن حەدیسەكەی ئەبوهورەیرە لە واجبكردنی دەستنوێژ بۆ ئەوەی دەستی لە زەكەری دابێ، كە ئەوە لەو ئەسڵەوە كە بریتییە لە تەكلیفنەكردن دەگوێزێتەوە، بەسەر حەدیسەكەی (طلق بن علي) لە واجبنەكردنیدا، زاڵ دەكەن، كە ئەوە ئەسڵە.

**رووی زاڵكردن:** پێشخستنی حەدیسی تەلق بەسەر حەدیسی ئەبوهورەیرەدا نەسخكردنەوەی حەدیسەكەی ئەبوهورەیرەی تێدایە، بەپێچەوانەی پێچەوانەكەی، لەبەرئەوەی گواستنەوە لە بەرائەتی ئەسڵیەوە نەسخكردنەوە نیە.[3]

---

[1] بروانە: التلمساني ص ١٥٢.

[2] حەدیسی یەكەم حەدیسی (الشريد بن سويد)ە كە بەم شێوەیە: قلت يارسول الله (ﷺ) أرض لي ليس لأحد فيها شرك ولا قسمٌ إلاّ الجوار؟ قال: ((الْجَارُ أَحَقُّ بِصَقَبِه)) (قربة). ئەمە بەگوتراوەكەی ئاماژەیە بۆ جێگیركردنی شەفیعی بۆ دراوسێ لە دابەشكراو (مقسوم) و دابەشنەكراودا. حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەستیان بەمەوە گرتوە. حەدیسی دووەم جابر بن عەبدولڵا ریوایەتی كردوە كە دەڵێ: قضى رسول الله (ﷺ) في الشفعة في كل ما لم يقسم. لە ریوایەتێكدا: انما الشفعة فيما لم يُقسم. كە بە گوتراوەكەی ئاماژەیە بۆ جێگیركردنی شەفیعی لە غەیری دابەشكرلو و بە مەفهومەكەی ئاماژەیە بۆ جێگیرنەبوونی لە دابەشكرلو یان دراوسێدا. شافیعیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەستیان بەمەوە گرتوە. بروانە: سبل السلام ٣/٩٧-٩٤.بدائع الصانع ٦/٢٦٨٢.

[3] بروانە:اصول التلمساني ص ١٥٥.

٤- ئەوەیە یەکێکیان ئیسپات و ئەویتریان نەفی بێ، ئیسپات لای هەندێ لە شەرعزان کە ژمارەیان لە سەد و چل زیاترە، زاڵترە، بەوەیش سەبارەت بە زیادەیەك لە پێنجدا مەڕێك و لە دەدا دوو مەڕ و لە پازدەدا سێ مەڕ دەبێ و بەم شێوەیە. وەك ئەوەی مالیکیەت و ئەوانەی هاوڕایانن حەدیسەکەی بیلال کە دەڵێ (ان النبي (ﷺ) دخل البيت فصلى فيه))[1] بەسەر حەدیسەکەی ئوسامەدا زاڵ دەکەن کە دەڵێ: ((دخل البيت ولم يصل فيه)).[2]

٥- ئەوەیە یەکێك لە دوو مەتنەکە بەبێ هۆ هاتبێ، چونکە ئەوەی بەهۆیەك هاتبێ لە هۆدا زاڵتر و ئەوەی بەبێ هۆ هاتبێ بەبێ هۆ زاڵترە.

یەکەمیان وەك زاڵکردنی ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ریوایەت کراوە کە: (مرّ بشاة ميتة فقال: أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ))[3] بەسەر ئەوەدا کە دەڵێ: ((لا تَسْتَنْفِعُوا مِنْ الْمَيْتَةِ بِإِهَابٍ وَلا عَصَبٍ))،[4] کە حەدیسی یەکەم لە پێستی ئەو ئاژەڵەی گۆشتی دەخورێ زاڵترە، لەبەرئەوەی وەك ئەوەیە (نەص) بێ تێیدا، چونکە ئەوە هۆکەیە. هەروەها زاڵکردنی حەدیسی دووەم بەسەر یەکەمدا لەوەدا کە ئەوەی گۆشتی ناخورێ سوود لە پێستەکەی وەرناگیرێ با خۆشەیش بکرێ، لەبەرئەوەی جیاوازی دروست بووە لە کارکردن بەو گشتیەی لە بێ هۆدا بەسەر هۆدا هاتووە.[5]

وەك ئەوەی یەکێك لە دوو بەڵگەکە لەگەڵ بەڵگەیەکیتر کۆك بێ، دژە بەڵگەکەیشی هیچ بەڵگەیەك نیە پشتگیری بکا، بۆیە یەکەم پێش دووەم دەخرێ.

---

[1] اخرجه الشيخان واحمد.

[2] اخرجه الشيخان.

[3] اخرجة الخمسة، وانما اختلف لفضه سبل السلام ١/٣٠.

[4] اخرجه احمد والبخاري والدار قطني والبيهقي وابن حيان سبل السلام ١/٣١.

[5] بڕوانە: جمع الوصول الى علم الاصول للتلمساني ص ١٥٣ـ ١٥٤.

هەروەها وەك ئەوەی یەکێکیان چوار خەلیفەکە یان زانایانی مەدینە کاریان پێ کردبێ و ئەویتریان وانەبێ.

هەروەها وەك ئەوەی دوو تەئویلکراو تێکبگیرێن بن و بەڵگەی تەئویلی یەکێکیان راجیح بێ و بەوەیش پێش ئەویتر دەخرێ، دیسان وەك ئەوەی یەکێکیان حوکمەکە لەگەڵ عیللەکە باس بکا و پێش ئەوە دەخرێ تەنها حوکمەکەی باس کراوە، هەروەها وەك ئەوەی یەکێکیان لەگەڵ قیاس کۆك بێ و ئەویتریان لەگەڵی ناکۆك بێ.. ئەمانە و ئەو زاڵکەرانەیتر کە لە کتێبەکانی ئوسولدا باس کراون.[1]

لەو مەسەلە فیقهییە خیلافیانەی لە ناکۆکی لە نەهێشتنی تێکگیران لەبەر شتێکی دەرەکی کەوتونەتەوە:

جیاوازیی شەرعزان لەبارەی کوشتنی ئافرەت لەسەر حەدی مورتەد، هۆی ناکۆکیەکەیش بریتییە لە تێکگیرانی حەدیسی ((مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ))[2] لەگەڵ حەدیسی ((نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (ﷺ) عَنْ قَتْلِ اَلنِّسَاءِ))[3]. بەپێی حەدیسی یەکەم هەر کەس موسڵمان بێ و پاشان کافر ببێ لە گەردنی دەدرێ پیاو بێ یان ئافرەت، مەگەر دووگیان بێ کە سزاکەی دوادەخرێ تا کاتی منداڵبوونی، ئەگەر کەسیش نەبوو شیری منداڵەکە بدا دوادەخرێ تا کاتی نانخواردنی. دووەمیشیان نەهیکردنە لە کوشتنی ئافرەتان بەرەهایی، چ وەرگەڕاو لە ئاین (مرتد) بێ یان هیتر.

وەرگەڕاوی ناخراپەکار (غیر مفسد) ناکوژرێ، بەڵام هی خراپەکار دەکوژرێ، ئەویش بۆ پاراستنی عەقیدە لە گاڵتەپێکردن و خراپە و رێگرتن لە بەلبەلە و دروستکردنی فیتنە لەناو تاك و کۆمەڵدا، تا بەو ئاسەوارە دەروونی و عەقائیدیانەی

---

[1] بروانە: جمع الجوامع بشرح الجلال المحلي مع حاشية البناني ٢/٢٢٩ و پاشتر. طلعة الشمس مع شمس الاصول ٢/٢٠٨. فما بعدها شرح التوضيح على التنقيح مع الحواشي ٣/٤٣. فما بعدها المسودة ص ٣٠٦ فما بعدها.

[2] رواه البخاري وابو داود.

[3] متفق عليه، سبل السلام ٤/٥٠.

لێی دەکەونەوە و ئەو پشێویەی لە سیستمی خێزاندا دروستی دەکا پشێوی بڵاو نەبێتەوە و سیستمی ژیان تێکنەچێ، هەربۆیە دانانی حەدی (ریددە) سەرجەم ئەو خراپانە بنبڕ دەکات و لەناو دەبات.

جمهوری شەرعزان رایان وابووە دەکوژرێ لەبەر ئەوەی حیکمەتی حوکمەکانی تێدایە، هەروەها لەبەر گشتیبوونی ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ((مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ))، هەروەها لەبەرئەوەی ئەفەرموێ: ((لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: اَلثَّيِّبُ اَلزَّانِي، وَاَلنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَاَلتَّارِكُ لِدِينِهِ اَلْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ))[1]. هەروەها لەبەر فەرمانکردنی بە تۆبەکردنی ئوم مەروان، کە ئەگەر تۆبەی کرد ئەگینا دەکوژرێ.[2]

هەروەها لەبەرئەوەی مەبەست لە حەدیسی دووەم نەهیکردنە لە کوشتنی ئافرەتانی جەنگاوەر (حربي) لەبەرئەوەی وەك پیاوان توانای شەڕکردنیان نیە، هەروەها لەبەرئەوەی ئیسلام رێگە بە کوشتن لە شەڕەکاندا نادا لە بەرتەسکترین بازنەدا نەبێ، لەبەرئەوە نەهی لە کوشتنی نابینا و بەساڵاچو و کاهینە گۆشەگیرەکانی صەومەعەکان کردوە، لەبەرئەوە حەدیسی یەکەمیان زاڵ کردوە و گشتیبوونەکەیان وەرگرتوە.

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن لەگەڵ ئەوەن ئافرەتی لە ئاین وەرگەڕاو ناکوژرێ و حەدیسی دووەمیان زاڵ کردوە و وتویانە: داوای تۆبەی لێناکرێ، ئەگەر تۆبەی نەکرد حەپس دەکرێ لەبەرئەوەی نەهیکردن لە کوشتنی سابت بووە و وەك کافری ئەسڵی وایە، جا ئەگەر ئافرەتی کافری ئەسڵی لە بارێکدا بێ جێی بەزەیی بێ، ئەوا وەرگەڕاوی سەرهەڵداو لە دارولئیسلامدا بۆ بەزەیی لەپێشترە تا بواری بۆ بڕەخسێ بگەڕێتەوە بۆ ئامێزی ئیسلام.

---

[1] رواه البخاري، فتح الباري ١٥/٢٢٠ورواه مسلم تحقيق محمد فؤاد عبد الباقي ٣/١٣٠.

[2] رواه الدار قطني.

هەروەها لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لە کوشتنی ئافرەت و منداڵان لە جەنگدا کردوە، دیسان لەبەر هەندێ حەدیسیتریش لەوانە ئەوەی ئەبوهورەیرە ریوایەتی کردوە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ئافرەتێك لە ئاین هەڵگەڕایەوە بەڵام نەیکوشت. هەروەها ئەوەی تەبەرانی لە (المعجم الکبیر)دا ریوایەتی کردوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە معاذی کوڕی جەبەلی گوت: ((أَيُّمَا رَجُلٍ ارْتَدَّ عَنْ الإسلام فَادْعُهُ، فَإِنْ تَابَ فَاقْبَلْ مِنْهُ وَإِنْ لَمْ يَتُبْ فَاضْرِبْ عُنُقَهُ، وَأَيُّمَا امْرَأَةٍ ارْتَدَّتْ عَنْ الإسلام فَادْعُهَا، فَإِنْ تَابَتْ فَاقْبَلْ مِنْها وَإِنْ أَبَتْ فَاسْتَبِقْهَا)).

مانای ئەمە، وەك لە ئیبن عەباس و هیترەوە هاتووە، لە زینداندا بەند دەکرێ تا دەمرێ یان تۆبە دەکا، ئەمە جگە لەوەی بەکۆی دەنگ حەددەکان بە شوبهە رادەگیرێن. پوختەی قسان ئەوەیە ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین پشتیان بەو حەدیسانە نەبەستوە کە لەبارەی کوشتنی ئافرەتی مورتەدەوە هاتوون، بەڵکو پشتیان بەو حەدیس و ئەسەرانەی سەرەوە بەست، هەروەها لەبەرئەوەی حەدیسی نەهیکردن لە کوشتنی ئافرەت لەگەڵ قیاس کۆکە.

بە دیدی من رای زاڵ رای جمهورە لەبەر بەهێزی بەڵگەکانیان، هەروەها لەبەرئەوەی جەوهەری ئەو خراپانەی لە وەرگەڕان لە ئاین چاوەڕوان دەکرێن بە نێرینەیی و مێنەیی ناگۆڕێ.

# دەروازەی سێیەم

## جیاوازیی هاوەڵان و شوێنکەوتوان لە حوکمە شەرعیەکاندا

## بەگوێرەی جیاوازییان لە سەرچاوە پاشکۆ (تەبەعی)ـەکاندا

ئەم دەروازەیە جیاوازیی شەرعزانی هاوەڵان و تابیعین لە ئیجتیهادکردن بە را لەڕێی سەرچاوە پاشکۆکانەوە لەخۆ دەگرێ.

ئەمیش دوو بەش دەگرێتەوە:

یەکەم: لە جیاوازیی شەرعزانی هاوەڵاندا.

دووەم لە جیاوازیی شەرعزانی تابیعیندا.

# بەشی یەکەم:
# جیاوازیی هاوەڵان لە کارکردن و پشتبەستن بە سەرچاوە پاشکۆکان و کاریگەریی ئەوە لە جیاوازییان لە حوکمەکاندا

ئەم بەشە سێ باس لەخۆ دەگرێ:

## باسی یەکەم:
## سەرچاوەکانی یاسادانان (تەشریع) لە سەردەمی راشیدین (١١-٤٠ک)

واتــە لــە کۆچــی دوایــی پێغەمبــەرەوە(ﷺ) تــا کۆتــایی خیلافــەتی راشــیدین، لەبەرئەوەی چالاکیی فیقهی لەو ماوەیەدا خەریکە بڵێین تەنها لـە سـنووری هاوەڵانـدا قەتیس بووە، ئەویش لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆر موجتەهیدیان تێدا بوو کە یاوەریی پێغەمبەریان کردبوو و زۆر حوکمیان لەوەوە گواستبوویەوە.

پاش کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ رووداو هاتنە پـێش کـە وێنـەیان لـە پێشـتردا نەبوو و لەبەر نەمانی وەحی زۆریان دەقیان لەسەر نەبوو، لەکاتێکدا ئەو رووداوانە زۆر گـرنگ و مەترسـیدار بـوون، بۆیـە بابەتەکـە ئاسـتێکی بـەرز لـە دووربینـی و وردیـی تێگەیشــتن و فراوانیــی دەرککردنــی دەویســت بــۆ زانینــی ئامــانج و مەبەســتەکانی شەریعەت و نهێنیەکانی یاسادانان لە چارەسـەری ئـەو کێشـانە و رووبەڕووبوونـەوەی

ئەو ڕووداوانە بەتوندی و دانایی، چونکە هەرچی بڕیارێك وەك چارەسەر لەبارەیانەوە بدرێ کار لە چۆنێتیی ژیانی موسڵمانان لە ئایندەی خۆیاندا دەکا.

لە میهرەبانیی خودا بەرانبەر ئەم ئوممەتە ئەوەیە ئەو کۆمەڵە دەستەبژێرە لە حەوارییەکانی پێغەمبەری خوای بۆ شاندانە ژێر ئەم ئەرکە گەورەیە ئامادە کرد، کە هۆگری بوون و ئەوەی بەوەحی بۆی دەهات لێیان وەردەگرت و بەشێوەیەك لە ئەقڵ و دڵیاندا وردیان کردەوە کە سەردەمەکەیان بە درێژکراوەی سەردەمی ریسالە دانراوە، بەڕادەیەك لەنێو تابیعیەکاندا ئەوە بڵاو بێتەوە کە بە قسە و کردەوەکانیان بڵێن سوننە.

## پەرەسەندنی فیقە پاش پێغەمبەر(ﷺ):

لە باسە بەراییەکەدا بەکورتی باسمان لە پەرەسەندنی فیقە لە سەردەمی هاوەڵان و تابیعین کرد و گوتمان: پەرەسەندن شتێکی سروشتییە بۆ هەموو فیقە و یاسایەك.

بەلای توێژەرەوە ئەم پەرەسەندنە زەرورەتێکی حاشاهەڵنەگرە، هەروەها ئەوە زادەی سروشتی فیقە خۆی و هەروەها لە سروشتی ژیانیشە.

پەرەسەندنی فیقە پاش پێغەمبەر بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

### ١- پەرەسەندنی ژیان و نوێبوونەوەی ڕووداوەکان:

کردەوەکانی بەرئەرکەکان نوێ دەبنەوە و بێکۆتان، گەشە و زیاد دەکەن و لێرە و لەوێ لە هەموو کات و شوێنێکدا فراوان دەبن. ئەم نوێبوونەوە بەردەوامە ئەگەر هەموو سەعاتێك نەبێ هەموو ڕۆژێك ڕووداوی نوێیان بەدوادا دێ. چ جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان ژیانی سنووورداری دورگەی عەرەبی لەسەرەتای پەیامەکە لەگەڵ ئەو ژیانەی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە وڵات و مەملەکەتە دوور و نزیکەکانی جیهانە نوێیەکەیان کە خوا فەتحی کرد بۆیان، تێیدا دەژیان. چ جیاوازیەکی گەورە لەنێوان

ئەو رۆژانەی رابردوو و ئەو رۆژانەدا هەیە کە ئێمە تێیاندا دەژین.. ناشزانین ژیان لە سەردەمی نەوەکانی ئایندەدا چۆن دەبێ؟

ئەم پەرەسەندن و جیاوازیانە کە لە سروشتی ژیانەوە هەڵقوڵاون تەشریعاتی نوێیان لە هاوەڵانی بەرێز دەویست کە لەگەڵ ئەو ژیانە بگونجێ، بەو مەرجەی لە چوارچێوەی رۆحی شەریعەتی ئیسلامی دەرنەچێ.

٢ - فراوانبوونی رووبەری دەوڵەتی ئیسلامی:

قەڵەمڕەوی ئیسلام سنووری دورگەی عەرەبی تێپەڕاند، چەندین گەل و نەتەوەی جیاواز لە میسر و عێراق و شام و هیتر ملکەچی بوون.. ئەو وڵاتانە خاوەن شارستانێتی و مەدەنیەتێکی دێرین بوون وەك شارستانێتی فارس لە عێراق و شارستانێتی رۆمان لە میسر و شام و شوێنیتر..

ئەم وڵاتانە هەندێ دابونەریتی وایان هەبوو کە لای عەرەب باو نەبوون و خاوەن سیستمگەلی خۆیان بوون لە کاروباری دارایی و ئیدارە و کشتوکاڵدا.. کە لە دورگەی عەرەبیدا نەناسرابوون.

هەربۆیە شەرعزانی هاوەڵان لەم وڵاتانە رووبەڕووی زۆر مەسەلە لە کاروبارە جیاوازەکانی ژیان بوونەوە، کە پێویستیان بە یاسادانانێك هەبوو کە لە دورگەی عەرەبی پێویستیان پێی نەبوو. پاشان ئەو جەنگ و فتوحاتە لەدوای یەکەکانە پێویستیان بە رێسای نێودەوڵەتی هەبوو لەبارەی مافی جەنگاوەران و دیلەکانی جەنگ و کاروبارە نێودەوڵەتی و جەنگیەکانیتر. دارشتنی رێسا دەستووریەکانی گەلە فەتحکراوەکان مافە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ئاینیەکانیان دیاری دەکا.. هەروەها ئەرکەکانیان بەرانبەر دەوڵەتە نوێیەکە دیاری دەکا.

لەبەرئەمە و زیاتر لەمەیش فیقهی ئیسلامی پاش مردنی پێغەمبەر دەستی دایە هەنگاوە بەراییە فراوانەکانی، بگرە پاش خیلافەتی عومەری کوڕی خەتاب (رەزای

خوای لێبێ) و بڵاوبوونەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا، بۆ ڕێکخستنی ژیانی کرداری و دانانی یاسا و حوکمی شەرعی کە هەموو بوارەکانی ژیان بگرێتەوە.

٣- نەمریی شەریعەت و مۆرکە گشتیەکەی:

شەریعەتی ئیسلامی بۆ هەموو سەردەم و شوێنێك گونجاوە. لە نیعمەتە گەورەکانی خوا بەسەر خەڵك و ڕواڵەتەکانی حیکمەتی لە بەندەکانیدا ئەوەیە ئەقڵی بەشەری قۆناغی بەرایی تێپەڕاند و فیکر ئامادە بوو بۆ هەڵکشان بەپلەکانی ژیاندا: ئیسلام ببێتە کۆتا شەریعەت، تەلارێکی قایم و سیستمێکی تەواو و دیمەن نایاب و ئامانج باڵا و وەڵامدەرەوەی پێویستیەکانی تاك و گرووپەکان بێ، دادپەروەر بێ بەبێ زیادڕەوی و ئاسان بێ بەبێ کەمڕەوی، بۆ هەموو کات و شوێنێك بشێ و بوارەکانی خێر پیشانی خەڵك بدات و بەرەو بەختەوەریی هەردوو دنیا بانگیان بکات و شانبەشانی شارستانێتی مرۆڤایەتی هەنگاو بنێ بەمەرجی تێگەیشتن لە ئامانجەکانی و زانینی ئەو بەرژەوەندیانەی حوکمەکانی لەپێناویاندا دانراون.

٤- سنووردارێی دەقەکان و بێسنووریی ڕووداوەکان:

شەهرستانی —لەمیانی ڕوونکردنەوەی زەرورەتی ئیجتیهاد و پەرەپێدانی فیقهی ئیسلامی لە هەموو سەردەمێکدا— دەڵێ: بەقەتعی و بەقینی دەزانین ڕووداو و بەسەرهاتەکان لە عیبادەت و ڕەفتارەکان لە ژمارە نایەن، بەقەتعیش دەزانین لە هەموو ڕووداوێکدا دەق نەهاتووە و ئەوەیش چاوەڕوان ناکرێ. ئەگەر دەقەکان کۆتا و ڕووداوەکان بێکۆتا بن، ئەوەی بێکۆتا بێ بەهیچ شێوەیەك کۆتا ناتوانێ ڕێکی بخا، پێویستە ئیجتیهاد و قیاس لەبەرچاو بگیرێ تا بۆ هەر ڕووداوێك ئیجتیهادێك هەبێ.[1]

---

[1] بڕوانە: الملل والنحل للشهرستاني + الفصل لابن حزم ٢/١٦٠

## پەسەندکردنی ئیجتیهاد لەلایەن پێغەمبەرەوە:

پێغەمبەر(ﷺ) خۆی هەندێ ئیجتیهادی لە مەسەلە دنیاییەکاندا کردوە، بۆ نموونە:

لە مەسەلەی کشتوکاڵدا بە هاوەڵانی وت: "أنتم أعلم بشؤون دنیاکم"، ئەویش پاش ئەوەی بەئیجتیهادی خۆی نەهی کردن لە موتوربەکردنی دارخورما و پاشتر دەرکەوت بەبێ موتوربە بەرهەم باش نابێ.

لە مەسەلە سەربازیەکاندا: لە دیاریکردنی شوێنی رووبەڕووبوونەوەی دوژمن لە جەنگی بەدردا ئیجتیهادی کرد، بەڵام کاتێ حەبابی کوڕی منذر وتی: ئایا ئەمە شوێنێکە خوا دیاری کردوە و ناتوانیت لێی لابدەیت، یان رای خۆت و جەنگ و پیلانە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە بەڵکو رای و جەنگ و پیلانە، حەباب پێشنیاری چوونە شوێنێکیتری گونجاوتری لەڕووی جەنگیەوە کرد، ئەویش بەوە رازی بوو و وازی لە ئیجتیهادەکەی خۆی هێنا.

لە کاروباری سیاسیدا: گەورەی مونافیقەکان عەبدوڵای کوڕی سەلولی نەکوشت، تا نەوترێ محەمەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێ.

بۆ دووپاتکردنەوەی حیکمەتی ئیجتیهاد و گرنگی لە ژیانی کرداریدا، خوای گەورە پێغەمبەرەکەی رێگری کردوە لە پەیبردن بە چارەسەری نموونەیی لە هەندێ رووداودا وەك باسمان کرد، هەروەها بۆ تێگەیاندنی خەڵك لەوەی هەڵەکردن لە ئیجتیهاددا پاش وردبوونەوە، تاوان نیە، لەم روانگەوە پێغەمبەر فەرمویەتی: ((إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ)).[1]

بەڵام لە مەسەلە ئاینیەکاندا پێغەمبەر ملکەچی وەحی بووە وەك قورئانی پیرۆز ئەوەی راگەیاندوە: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾[2].

---

[1] رواه عمرو بن العاص متفق عليه. سبل السلام ١١٧/٤.

[2] النجم : ٤

پێغەمبەر(ﷺ) ئیجتیهادی هاوەڵانی لە ژیانی خۆیدا ئیقرار کردوە، چونکە دەیزانی پاش مردنی رووبەڕووی رووداوی ئەوتۆ دەبنەوە کە حوکمیان بەڕاشکاوی لە قورئان وسوننەدا نادۆزنەوە، ئەوەبوو کاتێ موعازی کوڕی جەبەل وئەبو موسای ئەشعەری دەنێرێ بۆ یەمەن، بە موعازی وت: بەچی حوکم دەکەیت؟ ئەویش وتی: بە کتێبی خوا. وتی: ئەی ئەگەر لە کتێبی خوادا نەتدۆزیەوە؟ وتی: بە سوننەتی پێغەمبەری خوا حوکم دەکەم. وتی: ئەی ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا نەتدۆزیەوە؟ وتی: بە رای خۆم ئیجتیهاد دەکەم، ئەویش فەرموی: سوپاس بۆ خوا کە نێردراوی پێغەمبەری خوای سەرکەوتوو کرد بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا پێی رازییە.

ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چەقبەستن دروست نیە و دەبێ ئەگەر پێویستی کرد پەنا بۆ را ببرێ.

پێغەمبەر(ﷺ) هەر بەوەندەوە نەوەستاوە، بگرە هەندێ جار ئیقراری دوو رای جیاوازی دژبەیەکی هاوەڵانی دەکرد، تا ئەوە ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی تێکگیرانی دوو را یان زیاتر لە رای موجتەهیدان بەتاڵیی هەندێکیان یان هەموویان ناخوازێ بەو مەرجەی هیچ یەکێکیان سەر نەکێشێ بۆ بەتاڵ، لەوانە بەڕاست دانانی ئەوەی دوو هاوەڵی لە سەفەردا کردبوویان کە بەبێ دەستنوێژ (بەتەیەموم) نوێژیان کردبوو، پاشان لەکاتێکدا هێشتا کاتی نوێژ مابوو ئاویان دەسکەوت، یەکێکیان دووبارەی کردەوە و ئەویتریان نەیکردەوە، ئەویش بەوەیانی گوت کە نوێژەکەی دووبارە نەکردەوە (أصبت السنة وأجزأتك صلاتك) بەوەیشیانی کە کردیەوە گوتی: (لك الأجر مرّتين)).[1]

---

[1] رواه أبو داود والنسائي سبل السلام ٩٧/١.

## شێوازی شەرعزانی هاوەڵان لە هەڵێنجاندا:

شێوازی خەلیفەکانی راشیدی و باقی هاوەڵان -لەبارێکدا بوونە جێگرەی پێغەمبەری خوا لە پێشەوایەتیی موسڵمانان و قەزا و فتواندا- لە ناسینی حوکمی مەسەلەکاندا ئەوەیە ئەگەر رووداوێکیان بهاتایەتە پێش لە قورئاندا بۆ حوکمەکەی دەگەڕان، ئەگەر تێیدا بوایە کاریان پێدەکرد، ئەگەر نەیاندۆزیایەتەوە لە سوننەتی پێغەمبەردا بۆی دەگەڕان، ئەگەر تێیدا بیاندۆزیایەتەوە داوەری و فتوایان پێدەدا، ئەگینا لەژێر رۆشنایی قورئان و سوننەدا ئیجتیهادیان دەکرد بۆ زانینی حوکمەکە بەسوود وەرگرتن لەو شارەزاییەی لەبارەی نهێنی و حوکم و ئامانجەکانی شەریعەت بەدەستیان هێنابوو، بەو شێوەیەی عەدالەت و یەکسانی بێنێتەدی و بەرژەوەندیی ئوممەت و پێویستیی کۆمەڵگە بیخوازێ.

ئیجتیهادی شەرعزانی هاوەڵان لەو مەسەلانەی دەقێکیان لە قورئان یان سوننەدا لەسەر نەهاتبوو ئەوەبوو هەندێ جار پاش راوێژ و وردبوونەوەی هاوبەش دەگەیشتنە کۆدەنگی لەسەر حوکمەکە، ئەمە لە سەردەمی ئەواندا زۆر رووی دەدا، لەوانەیش بوو جیاواز بوونایە و نەگەیشتنایە بە یەک رای هاوبەش، ئەگەر لەسەر رایەک کۆدەنگ بوونایە خەلیفە کاری بە کۆدەنگیەکەیان دەکرد و دەبووە حوکمێکی بنبڕ لەو کێشەیەی هەیە. ئەمەیە بناغەی ئیجماع کە شەرعزان بە بەڵگەیەکی سێیەمیان داناوە لە بەڵگەکانی ئەحکامی شەرعی.

لەمەی خرایەڕوو دەگەینە ئەو دەرەنجامەی: بەگوێرەی زاهیر سەرچاوەکانی تەشریع لە سەردەمی هاوەڵاندا چوار بوون: قورئان و سوننە و ئیجماع و را.

بەڵام ئیجتیهاد بە را لای ئەوان تەنها یەک رێگەی نەبوو بۆ نموونە وەک قیاس، بەڵکو زۆربەی سەرچاوە پاشکۆ (تەبەعییە)کانی دەگرتەوە: وەک قیاس، بەرژەوەندی، ئیستیحسان و سەدی زەرایع.. ئەم زاراوانە ئەگەرچی ئەوکاتە

نەناسرابوون، بەڵام پیادەکردنە فیقهیەکانی هاوەڵان بەڵگەیە لەسەر بەکارهێنانیان لە هەڵێنجانی ئەحکام، وەك پاشتر روون دەکرێتەوە.

پێشتر باس لەو هۆیانەی ناکۆکی کرا کە پەیوەندییان بە دوو سەرچاوە یەکەمەکەوە (کیتاب و سوننە)ەوە هەیە، هەرچی ئیجماعە لەسەردەمی هاوەڵاندا جێی ناکۆکی نەبوو، هەر حوکمێك سەرچاوەکەی ئیجماع (کۆدەنگی) بوو بێ هەرهەموویان لەسەری کۆك دەبوون، بۆیە ماوە قسە لە سەرچاوەی چوارەم بکەین: واتە را.

## را "الرأي":

لەڕووی زمانەوە: چاوگە، (رأى الشيء يراه رأيا ورؤية): واتە بەچاو یان بەدڵی بینی. پاشان تایبەت کرا بەوەی دڵ دەیبینێ پاش بیرکردنەوە و رامان و داواکردن بۆ زانینی رووی راستەقینە لەوەی نیشانەکان تێیدا تێك دەگیرێن.

ئیجتیهادکردن بە را، بریتییە لە بەخەرجدانی کۆشش بۆ گەیشتن بە بڕیاردان لە رووداوێکدا کە بەزاهیر دەقی لەسەر نیە، ئەویش بە بیرکردنەوە و بەکارهێنانی ئەو کەرەستانەی شەرع رێنمایی کردوە بۆ هەڵێنجانی پێیان[1].

### رای زەمکراو و رای ستایشکراو:

لەبارەی را هەندێ بۆچوون هاتوون زەمی دەکەن و هەندێکیش هاتوون ستایشی دەکەن. لە هەندێ لە هاوەڵانەوە دەگێڕنەوە زەمی رایان کردوە وەك ئەوەی ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: "چ زەویەك هەڵیگرتوم و چ ئاسمانێك سێبەری بۆ کردوم ئەگەر لەبارەی ئایەتێکی قورئان بە رای خۆم یان بەوەی نایزانم بڵێم"[2]، عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: "دەخیلتانم لە راخوازان بەدوور بن، چونکە

---

[1] اعلام الموقعين ٧٥/١مصادر التشريع فيما لانص فيه عبد الوهاب خلاف ص٨.

[2] اعلام الموقعين ٥٤/١. "أيُّ أرضٍ تُقلني وأيُّ سماءٍ تُظلني، إن قلت في آية من الكتاب برأي أو بما لا أعلم"

ئەوان دوژمنی سونەنن"[1] ئیبن عەباس (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: "هەرکەس لە هەر شتێکدا پرسیاری لێ کرا فتوای بۆ خەڵك دا، شێتە"[2]، ئەمانە و هیتر کە را لە زانست دەکەنە دەرەوە و زەمی دەکەن.

بەڵام لەڕاستیدا دژیەکی نیە لەنێوان ئەوەی سەلماوە شەرعزانی هاوەڵان رایان بەکارهێناوە، لەگەڵ ئەوەی لێیانەوە گوێزراوەتەوە کە زەمی رایان کردوە و هۆشداریان لەبارەیەوە داوە، چونکە لەڕاستیدا را دوو جۆرە: زەمکراو و ستایشکراو:

١- زەمکراو (المذموم): بریتییە لە دەربڕینی را بەئارەزوو، ئەوەیش چەند جۆرێکە لەوانە: رای پێچەوانەی دەق، لەوانە قسەکردن لەسەر ئاین بە نەزانی و گومان، بە کەمڕەوی و کەمتەرخەمی لە ناسینی دەقەکان، لەوانە ئەو رایەی بیدعەکانی پێ داهێنراوە و سوننەکانی پێ گۆڕاوە.[3]

٢- ستایشکراو (الممدوح): بریتییە لە هەڵێنجانی حوکمی رووداوەکە لە دەق بەراستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بەو رێگەیانەی شەرع بڕیاری داون و شەرعزانی هاوەڵان و تابیعین و تابیعی تابیعین کاریان پێکردوون.[4]

## هەڵوێستی هاوەڵان لە را:

هاوەڵان نەیاندەتوانی لە زۆر لەو کێشە و رووداوانەی دەهاتنە پێشیان و -وەك پێشتر باس کرا- بەزاهیر دەقێکیان لە کیتاب یان سوننە لەسەر نەبوو، پەنا بۆ را نەبەن. بەڵام سەرەتا بە دوولێیەوە دەستیان بۆ برد، ئەوەیش بەڕوونی لەو

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، المدخل للفقه الاسلامي عيسوي احمد عيسوي ص ٥٤. "إيّاكم وأصحاب الرأي، فإنهم أعداء السنن".

[2] اعلام الموقعين ٣٤/١. "إن كل من أفتى الناس في كل ما سألوا عنه، لمجنون".

[3] سەرچاوەی پێشوو ٦٧/١ و پاشتر.

[4] فقه اهل العراق وحديثهم للكوثري ص١٥.

گفتوگۆیەی لەنێوان عومەر و ئەبوبەکر و پاشان لەنێوان ئەبوبەکر و زەیدی کوڕی ثابت لە مەسەلەی کۆکردنەوەی قورئاندا کرا دیارە.

بەڵام زۆری نەبرد هاوەڵان زۆر لە مەسەلە هەرە سەرەکیەکانیان لەسەر را بنیات نا. بەڵام بەکارهێنانی را لەنێوان هەموو یان زۆربەی هاوەڵاندا باو نەبوو، چونکە هەموو هاوەڵان شەرعزان نەبوون و شەرعزانەکانیشیان لە رادەی کارپێکردنیدا وەك یەك نەبوون، بەڵکو هەیانبوو زۆر و هەیانبوو کەم و هەیانبوو مامناوەند بەکاری دەهێنا، لەوانەی زۆرترین رایان هەبوو عومەر و ئیبن عەباس و عەبدوڵای کوڕی مەسعود و عائیشەی دایکی ئیمانداران و زەیدی کوڕی ثابت بوون.[1]

بەیداخهەڵگری را عومەر (رەزای خوای لێبێ) بوو، لە رادا دروستترین رای هەبوو و لە هەمووان زیاتر تێیدا پەلی هاویشتبوو. پابەند نەبوو بە حەرفیەتی دەقەوە، بەڵکو نهێنی و رۆحەکەی تێدەگەیشت، بەناوبانگترین کەس کە شوێنپێی هەڵگرت عەبدوڵای کوڕی مەسعود بوو، کە سەرسام بوو بە راکانی. ئیبنول قەیم دەڵێ[2]: ئیبن مەسعود خەریکە بڵێین لە هیچ شتێکدا پێچەوانەی عومەر نیە ئەمە نهێنی ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە قوتابخانەی عێراق کە پاش ئەوسەردەمە دروست بوو بە را و بەکارهێنانی قیاس ناوبانگی دەرکرد، چونکە زانای عێراق عەبدوڵای کوڕی مەسعود بوو کە رێچکەی عومەری دەگرت لە کارکردن بە را و فراوانکاری تێیدا. شەعبی دەڵێ: ئەگەر خەڵك لە شتێکدا ناکۆك بوون عومەر چی گوتوە ئەوە بکەن.

دیارترینی ئەوانەیش سڵیان لە پەنابردن بۆ را دەکردەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر بوو کە پێچەوانەی باوکی بوو. هەروەها عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص.[3]

هەڵسەنگاندنی رای هاوەڵان:

---

[1] بروانە: اعلام الموقعين ١٢/١ و پاشتر.

[2] سەرچاوەی پێشوو ٢٠/١.

[3] اعلام الموقعين ٣٢/١.

هـاوەڵ خـۆی نرخێکـی تایبـەتی بـە راکـەی نـەدەدا لـەکاتی جیـاوازبوون لەگـەڵ ئەوانیتر، بەڵکو پێی وابوو ئەوەی ئـەو بـۆی چـووە راسـتە و ئەگـەری هەڵەبوونیشـی لێدەکرێ، ئەوەیش ئەوانیتر بۆی چوون هەڵەیە و ئەگـەری راستبوونیشـی لێـدەکرێ. هەروەها پێی وابوو ئەو لە بۆچوونەکەیدا لە باقیی هاوەڵانیتر لەپێشتر نیـە. ئەبوبـەکر لەبارەی (کلالة) پرسیاری لێکرا، ئەویش گوتی: بە رای خۆم قسەی لەبارەوە دەکەم، ئەگـەر راسـت بـوو ئـەوە لـە خواوەیـە و ئەگـەریش هەڵـە بـوو ئـەوە لـە مـن و لـە شەیتانەوەیە: کیلالە جگە لە باوك و فەرزەندە.

بەڵام هەریەکە بەڕای خۆی پابەند دەبێ، لەبەرئەوەی خوا حاکم یان قازی یان هەر کەسێکیتر کارکردن بـەوە پابەنـد دەکا کـە گومـانی زاڵـی ئەوەیـە راسـتە. ئـەوەیش هەڵوێستێکی سروشتی بوو لەوانـەوە، لەبەرئـەوەی هەرهـەموویان هـاوەڵی پێغەمبـەر بوون و لە گـوێلێگرتن و لـیوەرگرتنیـدا هاوبـەش بـوون. بـەڵام پـاش بەسەرچـوونی سەردەمی هاوەڵان را و فتواکانیان شوێنێکی گەورەی لە فیقهـی ئیسـلامیدا وەرگـرت بەتایبەت لە قوتابخانەی مەدینـە، بەشـێوەیەك ئـەو بۆچـوونانە بەپلـەی چـوارەم دێ پاش قورئان و سوننە و ئیجماع، تەنانەت راویەکانی تابیعین بـۆ پیشـاندانی پێگـەیان لەفزی (سوننە)یان بۆ ئاماژەدان بە رای هاوەڵان بەکاردەهێنا.

پاشـان لـە سـەردەمی مەزەبـە جەماعیەکانـدا جـەدەلێکی تیـۆری لـەبارەی حوججیـەتی قسـەی هـاوەڵان لـە مەسـەلە ئیجتیهادیەکانـدا سـەری هەڵـدا، هەنـدێ بـەڕەهایی نکوڵییـان لـە حوججیبـوونی دەکـرد، هەنـدێکیش بـەڕەهایی داکۆکییـان لێدەکرد، هەروەها هەندێکیتر جیاواز لەمانە تەنها قسـەکانی خەلیفـەکانی راشـیدییان بەحوججە دەزانی، وەك پاشتر لەجێی خۆیدا باس دەکرێ.

## شێوازی هاوەڵان لە وەرگرتنی را و جێبەجێکردنیدا

ئیجتیهادکردنی هاوەڵان بە را بە دانایی و حەزم جیا دەکرێتەوە، هەندێ حوکم هەبوون رەها بوون یان بەعیللەیەکەوە بەسترابوون، کاتێ لێیان کۆڵیبوونەوە بینیبویان ئەو عیللانە نەماون، یان ئەوەی لەپێناویدا تەشریع کراوە گۆڕاوە، بۆیە بەو پێیە کارکردن بەو حوکمانەیان رادەگرت، وەك حوکمی دڵڕاگیراوان (المؤلفة قلوبهم) لە زەکات و هیتر کە پاشتر باس دەکرێن.

هەندێ حوکمیتر هەندێ جار نەهیبیان لێکردوە لەگەڵ ئەوەی دانیشیان بە مەشروعیەتیاندا ناوە، ئەویش بۆ دوورخستنەوەی خراپەیەك کە لە کردنیان چاوەڕوان دەکرا، لەوانە رێگرتنی عومەری کوڕی خەتاب لە مارەکردنی ئافرەتانی ئەهلی کیتاب، هەروەها هەندێ حوکمی توند و چاوترسێنیان دەرکردوە کە دۆخەکە خواستویەتی و لە سەردەمی پێغەمبەردا نەبوون ئەویش بۆ لادانی خراپەیەکی دڵنیا یان شیمانەکراو، یا ئەوە بوویێتە مایەی تایبەتکردنی دەق یان وازهێنان لە زاهیرەکەیشی، ئەمەیش بوارێکی فراوانە و نموونەکانی زۆرن. لەوانە بەزامنکردنی پیشەوەران (تضمين الصناع) لەبەر پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خەڵك، لەوانە زیادکردنی حەدی ئارەق خواردنەوە، لەوانە حوکمدانی عومەر بە کەوتنی سێ تەڵاقەکە بەیەك لەفز لە یەك مەجلیسدا، ئەمانە و چەندین مەسەلەیتری جێکۆك و جێناکۆك کە شەرعزانی هاوەڵان لەڕێی ئیجتیهاد و راوە بەرهەمیان هێناون.

بەوەیش لای هاوەڵان را: (مەساڵیحی مورسەلە) و (سەدی زەرایع) و (ئیستیحسان) و هیتر لە سەرچاوە تەبەعیەکان دەگرێتەوە. لەکاتی ئیجتیهادکردنیشیان بە را لە پیادەکردنی ئەم رێگایانە و لێرەیشەوە لە ئەحکامی فیقهیدا، جیاوازییان تێکەوتوە.

## باسی دووەم:
## ئیجتیهادی هاوەڵان بە را لەڕێی قیاسەوە

قیاس: لە رووی زمانیەوە: بەمانای ئەندازەکردن و رێکخستن دێ، دەوترێ: قست الثوب بالمتر، ئەگەر ئەندازەت کرد. دەوترێ: فلان قیاس ناکرێ بە فلان واتە لە رێز و شەرەفدا وەك ئەو نیە.

لە زاراوەدا: یەکسانکردنی رووداوێکە دەقێك حوکمەکەی دیاری نەکردوە بە رووداوێك دەقێك حوکمی دیاری کردوە لەبەر هاوبەشیی هەردووکیان لە عیللەکەیدا[1].

روونکردنەوەی ئەم کردە ئیجتیهادییە کە لە زاراوەی ئوسولناساندا پێی دەوترێ قیاس ئەوەیە: جمهوری موسڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەو حوکمە شەرعیانەی دەقەکان باسیان کردون بەبێهودە دانەنراون، بەڵکو بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی بەندەکان دانراون جا چ ئەقڵی بەشەری پەی بەو بەرژەوەندیانە ببات یان نەیبات، ئەوانە لە واقیع و هەمان شتدا هەبوون.

ئەو حوکمانەی ئەقڵ پەی بە بەرژەوەندیەکانیان نابات پێیان دەوترێ (تەعەبودی) و پێویستە بەندەکان بەو شێوەیەی لە دەقەکاندا هاتوون جێبەجێیان بکەن و قیاسیان تێدا ناکرێ، وەك ژمارەی رکاتەکانی هەر نوێژێك، ژمارەی رۆژەکانی رۆژووگرتن، ژمارەی سورانەوەکان بەدەوری کەعبەدا، سزا دانراوەکان وەك دیاریکردنی حەدی زینا بە سەد جەڵد و قەزف بە هەشتا جەڵد، کەفارەتی سوێند شکاندن بە نانداني دە هەژار یان سێ رۆژ رۆژووگرتن. ئەقڵ وردەکاریی بەرژەوەندی لەو جۆرە حوکم و رووداوانەدا نازانێ و ناکرێ رووداوێك بە یەکێکیتر یەکسان بکرێ.

[1] بروانە: التحرير مع التقرير والتحبير ١١٧/٣ شرح تنقيح الفصول للقرافي ص٣٨٣ شرح الكوكب المنير ص٢٧٢.

لەبەرئەوە جمهوری ئوسولناسان بڕیاریان داوە قیاس لە عیبادەتەکان بۆ میراتگران لە ئەحکامی میرات و باقیی ئەو حوکمانەیتردا نیە کە ئەقڵ عیللە و حیکمەتەکانیان نازانێ.

جا ئەگەر ئەقڵ توانای ئەوەی هەبوو ئەو بەرژەوەندیانە بزانێ کە ئەحکامەکانیان لەپێناودا دانراوە، ئەوا دەبێ بەندەکان بەپێی دەقەکانیان جێبەجێیان بکەن، پێویستە موجتەهیدەکانیش ئەو بەرژەوەندییە بدۆزنەوە کە شەرعدانەر لەو حوکم و عیللە رواڵەتیەی حوکمدانەکەی پێوە بەستوە، مەبەستی بووە، لەبەرئەوەی ئەم بەستنەوەیە بەدیهێنانی ئەو بەرژەوەندیەی تێدایە، جا کاتێ ڕووداوێکیان هاتەپێش جیاواز لە ڕووداوی دەقەکە و بۆیان دەرکەوت ئەو عیللەیەی تێدا بەدیهاتووە، هەمان حوکمی ڕووداوی دەقەکەی لەسەر دەدەن، بۆ بەدیهێنانی ئەو بەرژەوەندیەی شەرعدانەر مەبەستی بووە.

بۆ نموونە ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لا يرث القاتل) (واتە: بکوژ میرات نابا)، ئاماژەیە بۆ حوکمێك کە بێبەشکردنە لە میرات لە ڕووداوی کوشتنی میراتدەر لەلایەن میراتگرەکەیەوە. جا ئەگەر موجتەهید بە ئیجتیهادی خۆی گەیشتە ئەوەی ئەو بەرژەوەندیەی شەرعدانەر مەبەستی بووە لەو حوکمە بریتی بووە لەوەی مرۆڤ پەلە نەکا لە بەدەستهێنان پێش کاتی خۆی و بێبەشکردنی تاوانبار لەوەی سوود لە تاوانەکەی وەربگرێ، هەروەها گەیشتە ئەوەی کە (عیللەی زاهیر) کە شەرعدانەر حوکمەکەی پێوە بەستوە بریتییە لە کوشتن، لەبەرئەوەی بەستنەوەی بێبەشکردنەکە بە کوشتنەکەوە ئەو بەرژەوەندییە بەدیدێنێ، پاشان ڕووداوی کوشتنی وەسێتکەر لەلایەن وەسێت بۆکراوی هاتە پێش و بینی ئەو عیللەیەی حوکمی ڕووداوی یەکەمی پێوە بەستوە لەو ڕووداوەیشدا هەیە، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە لە حوکمدا لەگەڵ ڕووداوی یەکەم یەکسانە لەبەر یەکسانبوونیان لە عیللەی ئەو حوکمەدا، بەوە بێبەشبوونی بکوژ (قاتل) بەدەق و بێبەشبوونی وەسێت بۆکراویش بە قیاس جێگیر دەبێ.

لێرەوە دەردەکەوێ پرۆسەی قیاس بە دەرهێنانی عیللەی حوکمی ئەو رووداوەی حوکمەکەی بەدەق دیاری کراوە، دەست پێدەکا، ئەمەیش پێی دەوترێ دەرهێنانی عیللە (تخریج المناط)[1]. پاش ئەوە گەڕان بەدوای بەدیهاتنی ئەو عیللە رووداوە دێ کە بەدەق حوکمی دیاری نەکراوە، ئەمەیش پێی دەوترێ بەدیهێنانی عیللە(تحقیق المناط). پاشان حوکمدان دێ بەوەی هەردوو رووداوەکە لە عیللەدا یەکسانن، یەکسانبوونی هەردوو رووداوەکەیش لە حوکمدا لەسەر ئەم یەکسانکردنە دادەمەزرێ، مەبەست لە قیاسیش ئەمەیە.[2]

لەم خستنەڕووە کورتە بە دوو دەرەنجام دەگەین:

یەکەم– رۆڵی موجتەهید لە لە قیاسدا بریتییە لە دۆزینەوەی عیللەی حوکمی دەقەکە و بەدیهاتنیەتی لە رووداوە پێشهاتەکە و یەکسانکردنی دوو رووداوەکە لە حوکمدا لە روانگەی یەکسانییان لە عیللەکەیدا.

دووەم– قیاس بە چوار رەگەز نەبێ بەدینایەت:

١– رووداوی دەقەکە (ئەو رووداوەی دەقەکە حوکمی تێدا داوە) و پێی دەوترێ ئەسڵ و قیاس لەسەرکراو.

٢– رووداوە لەناکاوەکە کە بەدەق حوکمی دیاری نەکراوە و مەبەست لە قیاس گەیشتنە بە حوکمەکەی و پێی دەوترێ فەرع و قیاسکراو.

٣– حوکمی ئەو ئەسڵەی دەقەکەی لە رووداوەکەدا پێهاتووە.

٤– عیللەی ئەو حوکمەی شەرعدانەر حوکمەکەی لە رووداوی دەقەکەدا لەسەر بینا کردوە.

---

[1] عیللەی حوکم پێی دەوترێ (مناط الحکم)، لەبەرئەوەی حوکمەکە دراوەتە پاڵی، واتە بەوەوە بەستراوە و بوون و نەبوونی لەسەر ئەوە دامەزراوە.

[2] بڕوانە: مصادر التشريع فيما لا نص فيه للخلاف ص١٧.

لەو پیادەکردنە فیقهییە خیلافیانەی شەرعزانی هاوەڵان، کە لە جیاوازییان لە ئیجتیهاد بە را و پەیڕەوکردنی قیاس کەوتوونەتەوە، ئەمانەن:

**أ- شەرعزانی هاوەڵان لەبارەی میراتی باپیری مردوو ئەگەر لەگەڵ خوشك و براکان کۆبوویەوە -بۆ جگە لە خوشك و برا لەدایکەوە- چوار رای جیاوازیان هەیە:**

رای یەکەم: ئەگەر برا و خوشکەکان کۆبوونەوە قیاس لەسەر باوك یان لەسەر کوڕی کوڕ بێبەش (حجب)یان دەکا، وەك چۆن لەکاتی کۆبوونەوەیان لەگەڵ باوك یان کوڕی کوڕ هیچ نابەن، بەهەمان شێوە لەگەڵ باپیریش هیچ نابەن ئەگەر لەگەڵی کۆبوونەوە. ئەوە رای ئەبوبەکری سدیق و ئیبن عەباس و ئیبن عومەر (خوا لێیان رازی بێ) و زۆر هاوەڵیترە، ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین ئەمەیان وەرگرتوە.

هەندێکیان قیاس لەسەر باوکیان کردۆتە بەڵگە، لەبەرئەوەی باپیر لە زۆر ئەحکامدا وەك باوك وایە، لەوانە ویلایەت لەسەر ناکام، هەروەها لەوەی لەسەر کوشتنی نەوەکەی ناکوژرێتەوە، و بەلای جمهورەوە لەسەر قەزفکردنی حەدی لێنادرێ و ئەگەر دزی لێکرد دەستی نابڕدرێ و دروست نیە زەکاتی خۆی بداتە نەوەکەی، بۆیە وەك باوکیش دەبێ لەوەدا کە برا و خوشکەکان حەجب دەکا ئەگەر لەگەڵیان کۆبوویەوە.

ئیبن عەباس لەسەر کوڕ قیاسی کردوە بە کۆکەرەوەی یەکسانی لە پلەی خزمایەتیدا وەك لە قسە بەناوبانگەیەوە ئەوە دیارە: (لا يتقي الله زيد بن ثابت يجعل ابن الابن ابنا ولا يجعل ابن الاب ابا). (واتە: زەیدی کوڕی ثابت لە خوا ناترسێ، کوڕی کوڕ دەکاتە کوڕ، بەڵام کوڕی باوك ناکاتە باوك".

رای دووەم: باپیر حەجبیان ناکا بەڵکو لە میراتەکەدا لەگەڵیان هاوبەش دەبێ وەك برایەکی هەقودا (لە باوك و دایك) لەسەریان حسێبە بەو مەرجەی پشکەکەی لە شەشیەك کەمتر نەبێ، لەبەرئەوەی لەگەڵ کوڕدا بەشەکەی شەشیەکە، بۆیە

لەپێشترە کە لەگەڵ خوشك و براکان شەشیەك و بگرە زیاتری هەبێ.[1]

ئەمە رای عەلی و ئەو هاوەڵانەیە کە هاوڕاین، بۆ ئەوەیش (ئیستیصحاب)یان کردۆتە بەڵگە و وتویانە: میراتیان بە دەقی قوئان چەسپیوە، بۆیە ئەسڵ جێگیریی میراتیان و حەجبنەکردنیانە مەگەر بەدەقێکیتر یان بەئیجماع، دیارە نە دەقیش هەیە و نە ئیجماع، جا لەبەرئەوەی لە هۆی شایستەبووندا یەکسانن، پێویستە لە هەمان شایستەییدا یەکسان بن، لەبەرئەوەی هەریەك لە باپیر و خوشك و براکان لەڕێی باوکەوە بە مردوەکە دەگەن و هێزی خزمایەتییان لە یەك پلەدایە.

ئەمە بۆ بەڵگەکەی رابردوو دەگەڕێتەوە، واتە ئەسڵە نەگۆڕەکە ئەوەیە میرات دەبەن و بەبێ بەڵگەیەك ترازان لەم ئەسڵە نیە، بەڵگەیش نیە.

رای سێیەم: لەگەڵ رای دووەم کۆکە کە ئەسڵ میرات بردنیانە لەگەڵیدا، لەبەرئەوەی هەموویان یەك پلەی خزمایەتییان هەیە، بەڵام لەوەدا لێی جیایە کە کردویەتیە مەرج پشکی باپیرە لە دابەشکردن بەڕێگەی (تەعصیب) لە سێ–یەك کەمتر نەبێ. ئەمە بۆچوونی عەبدوڵای کوڕی مەسعود و ئەو شەرعزانەیتری هاوەڵانن کە لەگەڵی کۆکن. ئەویش قیاسی یەکەمی کردۆتە بەڵگە و دەڵێ: ئەگەر باپیرە تەنها لەگەڵ کچەکان کۆببێتەوە پشکی لە سێ–یەك کەمتر نیە، بۆیە لەپێشترە کە پشکەکەی کەمتر نەبێ ئەگەر لە گەڵ خوشك و براکان کۆببێتەوە، لەبەرئەوەی خزمایەتیی کچ بەهێزترە.

رای چوارەم: لەگەڵ رای عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب (رەزای خوای لێبێ) کۆکە کە خوشك و براکان بێبەش ناکا، هەروەها لەگەڵ رای ئیبن مەسعود کە پشکی باپیر پێویستە لە سێ–یەکی میراتەکە کەمتر نەبێ ئەگەر میراتەکەی بە دابەشکردن بوو، بەڵام لەوەدا لەگەڵ هەردووکیان جیاوازە کە پێی وایە باپیر خوشك و براکان بەرەهایی دەکاتە خزم و خوێش (واتە وەك عوصبە پشك دەبەن نەك وەك نەك فەرز–وەرگێڕ)، جا

---

[1] ئەمەیش دیسان قیاسە.

تەنها نێرینە بن یان تەنها مێینە یان نێر و مێ. ئەمە رای زەیدی کوڕی ثابت و ئەو هاوەڵانەیە کە هاوڕاین و هەر سێ ئیمامەکە: مالیك و شافیعی و ئەحمەد و هەردوو هاوەڵەکەی ئەبوحەنیفە و زۆر لە شەرعزانیترە لە شەرعزانی مەدینە و شام و عێراق.[1]

ئەنجامی بۆچوونەکەی زەیدی کوڕی ثابت ئەوەیە باپیر وەك برایەکی هەقودا لەگەڵی برا هەقوداکان و برای باوکی لەگەڵ برا باوکیەکان لەگەڵی بەش دەکرێ، هەروەها پێویستە بەشی لە هەموو بارەکاندا لە سێ–یەکی میراتەکە کەمتر نەبێ ئەگەر خاوەن فەرزێکیان لەگەڵ نەبوو، ئەگەر خاوەن فەرزێکیان لەگەڵ بوو خاوەن فەرزەکە پشکی خۆی دەبا، پاشان باپیرەکە ئەوە لە دابەشکردنەکە دەبا کە بۆی باشە بە ئیعتیباری ئەوەی (عوصبە)یە، هەروەها لە سێیەکی پاش پشکی خاوەن فەرزەکان و شەشیەکی تەواوی میراتەکە، هەرکام لەوانە بۆ ئەو باشتر بوو میراتە شەرعیەکەی ئەوە دەبێ.

شێخ مەعروفی کوردی ئەوەی کردۆتە شیعر کە پێویستە باپیر بە میرات لەو دوو حاڵەتە بیبات، لە حاڵەتی یەکەمدا دەڵێ:

الجد مع فرع أب أو ولـــد ... لأبوين فائز بالأزيـــد

من ثلث والقسم عند فقـد ... صاحب فرض كأخ وجـد

كلاهما مع ضعف جد شرع ... ودون مثليه الأخير أنفـع

ومع فوق ضعفه فالأكثـــر ... ثلث وما صوره منحصر[2]

له حاڵەتی دووەمدا دەڵێ:

وفائز من قسمة وســــدس ... وثلث الباقي يأخذ الانـفس

إن كان ذو فريضة وســـت ... هنا ذوات الفرض وهي بنت

---

[1] بڕوانە: المغني لابن قدامة ٢١٧/٦ و پاشتر.

[2] بڕوانە: فرائض الشيخ المعروف النودهي الكردي الشافعي ص ٧٠

| | |
|---|---|
| والأم والبنت التي لنجــل | وجدة مع زوجـــة وبعــل |
| ففي ابنتين وأخ وعـــرس | وجد الأجود أخذ الســدس |
| وإن وجدت جدة وجــــداً | مع أخ فالقسم صار أجـدى |
| أو إخوة عشرة وجــــداً | وجدة فثلث باق أجــــدى |

تێبینی دەکرێ هەندێ مەسەلە هەن زەیدی کوڕی ثابت پێچەوانەی هەندێ لەو بنەمایانە جوڵاوەتەوە کە ڕاکەی لەسەری دامەزراوە، هەربۆیە ئەو مەسەلەیە ناونراوە (الاكدرية) لەبەر لێڵکردنی ئەو ڕایەی سەرەوەی لە میراتی باپیر لەگەڵ برا و خوشکەکان، کە بەم شێوەیە: ئەگەر ئافرەتێك مرد و باپیرەیەك و مێرد و دایك و برایەکی باوکی "خوشکێکی هەقودا یان لەسەری باوکەوە" لە شوێن بەجێما، لە بنەماکانی ئەو ڕایەی باس کرا ئەوەیە: خوشکەکان بەو دەبنە (عوصبە) و حوکمەکە دابەشکردن دەبێ هەرکەس بەپێی بەشی خۆی. یەکێکیتر لە بنەماکانی ئەوەیە لە مەسەلەکانی باپیردا بەخێوکردن (عول) لەئارادا نیە، لەکاتێکدا لەم مەسەلەیەدا کاری پێکردوە، پاشان پشکەکانی خوشك و باپیرە کۆکردەوە و کردی بە سێ بەشەوە سێیەکێکی بۆ خوشکەکە و دوو لەسەر سێی بۆ باپیرەکە، ئەم کارەی زەید کردوێتی هاوشێوەی نیە، ئەوەیش وای لێکردوە ئەمە بکا ئەوەیە بینیویەتی پشکی خوشك بەدەق نیوەیە، بۆیە ئیسقاتکردنی بە باپیرە ئاستەمە و باپیر بەهیچ شێوەیەك پشکەکەی لە سێیەك یان شەشیەك کەم ناکا، لەبەرئەمە و ئەوە ناچاری ئەو چارەسەرە ناوبراوە بوو، شێخ مەعروف دەڵێ:

| | |
|---|---|
| والجد محســوب كـأنثيــن | تأخذ ثلثــاً وحوى ثلثيـــن |
| روعى تعصيب وروعى الرحم | في الفرض للأخت وفي قسم علم |

ئەوە ڕای هاوەڵانە لەم مەسەلەیەدا و هۆی ناکۆکیان تێیدا ئیجتیهادکردن بە ڕا و جیاوازییانە لە پیادەکردنی قیاس تێیدا. ئەم ناکۆکیەیش کاریگەری هەبوو لە جیاوازی شەرعزانی تابیعین و مەزەبە بەکۆمەڵەکان کە پاش ئەوان هاتوون.

**ب- لەبارەی میرات و دیاریکردنی مارەیی ئەو ژنەی مێردەکەی بەر لە چوونەلا و پێش دیاریکردنی مارەیی مردوە، جیاوازن.** جیاوازیەکەیان لەسەر ئەوە دامەزرابوو کە ئەم مەسەلەیە لەنێو دوو ئەسڵدا بوو، هەندێکیان قیاسکردنیان لەسەر یەکێك لە دوو ئەسڵەکە هەڵبژاردوە، ئەوانیتریش لەسەر ئەسڵەکەیتر قیاسیان کردوە.

بۆ نموونە عەبدوڵا ئیبن مەسعود رای وایە ئەو ژنە مارەیی هاوشانی دەکەوێ قیاس لەسەر ژنێکیتر کە لە جوانی و رێکی و حەسەب و نەسەبدا لە ئاستی ئەودا بێ. واتە ئەو مارەییەی دەکەوێ کە بە ئافرەتێك دەدرێ لە ئاستی کۆمەلایەتی ئەودا بێ، لە خزمەکانی، ئەگەر ئەوان نەبوون لە هیتر کە لەو پێگە کۆمەلایەتیەدا هاوبەشن. هەروەها بڕیاری میراتبردنی داوە بە قیاسکردنی مردن لەسەر چوونەلا لە واجبکردنی عیددە لە هەردووکیاندا، راکەی ئیبن مەسعود بەوە پشتگیری دەکرێ کە میعقەل بن سینانی ئەشجەعی ریوایەتی کردوە کە بڕیاردانەکەی لەگەڵ قەزای پێغەمبەری خوا(ﷺ) رێك بووە، ئەبوحەنیفە و ئەو شەرعزانەی مەزهەبە جەماعیەکان کە هاورای بوون ئەم رایەیان وەرگرتوە.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب قیاسی کردوە لەسەر ئەوەی بەر لە چوونەلا (دخول) ژنەکەی تەلاق داوە، هەروەها مارەیی بۆ فەرز نەکردوە لەڕووی هاوبەشیی هەموو لە بێ مارەییدا (عدم الصداق)دا، حوکمی ئەسڵەکەیش بەدەق جێگیرە، ئەویش ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء مَا لَمْ تَمَسُّوهُنُّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾، هەروەها پێی وایە ژنەکە میراتی دەکەوێ. تێبینی دەکرێ قەزاکەی ئیبن مسعود لەسەر رای خۆی دامەزرابوو نەك حەدیس. کەمال بن ئەلهەمام دەڵێ: کارەکەی ئیبن مەسعود بە رایە، بەلام خۆشحاڵ بوو بە بوونی ریوایەتی هاورای بۆچوونەکەی لە بەستنەوەی مردن بە چوونەلاوە، بەبەڵگەی واجبکردنی عیددە لە هەردووکیاندا.[1]

---

[1] بڕوانە: التحرير مع التقرير والتحبير ٢/٢٥٠

**ج– شەرعزانی هاوەڵان لەبارەی کوشتنی کۆمەڵەکەسێك لەسەر کوشتنی کەسێك جیاوازن**، لەبەر جیاوازییان لە کارکردن بە قیاس:

عومەری کوڕی خەتاب و عەلی کوڕی ئەبوتالیب و موغیرەی کوڕی شوعبە و ئیبن عەباس پێیان وایە: ئەگەر چەند کەسێك پێکەوە کەسێکیان کوشت هەرهەموویان تۆڵەی شەرعی (واتە قیساس)یان لەسەرە مادام ئەگەر یەکێکیان بەتەنیا کارەکەی بکردایە قیاسی لەسەر واجب دەبوو. هەریەك لە سەعید بن مسەیب و حەسەن و ئەبو سەلەمە و عەتا و قەتادە ئەمەیان وەریانگرتوە، هەروەها ئەوە مەزەبی مالیك و ثوری و ئەوزاعی و شافیعی و ئیسحاق و ئەبو ثور و خاوەنانی رایە، ئەحمەدیش لە ریوایەتێکدا..

هەندێکیان پێیان وایە ناکوژرێنەوە، بەڵکو خوێنباییان لەسەر واجب دەبێ، قسەی ئیبن ئەلزوبێر و ئیبن ئەبومەسا لە ئیبن عەباسی گێڕاوەتەوە، هەروەها حەبیب بن ئەبو ثابت و عەبدولمالیك و رەبیعە و داود و (ابن المنذر) وەریانگرتوە، هەروەها یەکێکە لە دوو ریوایەت لە ئەحمەدەوە، لە بۆچوونەکەیاندا پشتیان بە رواڵەتی دەقەکان بەستوە، کە یەکسانی لە قیساسدا واجب دەکا.

لە موعازی کوڕی جەبەل و (ابن المنذر) ریوایەت کراوە کە یەکێکیان لێ دەکوژرێ و ئەوانیتر هەریەکەیان بەشی خۆیان خوێنباییان لێ وەردەگیرێ، لەبەرئەوەی هەریەکەیان هاوتای ئەوە، بۆیە ناکرێ بەیەك گۆڕەر بگۆڕدرێ، هەروەها چەند خوێنباییەکیش بۆ یەك کوژراو واجب نیە.[1]

خاڵی سەرەتا ئەوەیە ئافرەتێك و دۆستەکەی کوڕی مێردەکەیان کوشت، یەعلا بن ئومەیە بۆ عومەری کوڕی خەتابی نووسی –کە عامیلی بوو– داوای رای ئەوی لەسەر بابەتەکە لێ کرد، ئەویش لە حوکمدان وەستا لەبەرئەوەی ئەو یەکسانیەی

---

[1] بروانە: المغنی لابن قدامة ٧/ ٦٦١.

هاوچەشنی لە سزادا دەخوازێ پێویستە نەفس بەنەفس بێ کە ئەوە زاهیری قورئانە، عەلی کوڕی ئەبوتالیب پێی وت: "ئەی میری ئیمانداران ئایا ئەگەر چەند کەسێك بەشدارییان کرد لە دزینی وشترێکدا، هەریەکەیان ئەندامێکیان برد، ئایا دەستی هەموویانت دەبڕی؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: ئەویش وایە. پاشان عومەر بۆ یەعلا بن ئومەیەی نووسی کە بیانکوژە، ئەگەر خەڵکی سەنعا هەموویان تێیدا بەشداربوونایە هەموویانم دەکوشت. [1]

عەلی کوڕی ئەبوتالیب کۆمەڵێکی بەشدار لە کوشتنێکدا لەسەر کۆمەڵێکی بەشدار لە دزیدا قیاس کرد بە کۆکەرەوەی هاوبەشی لە هاوکاریکردن لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا، عومەریش بەو قیاسە رازی بوو و فەرمانی کرد بە جێبەجێکردنی سزای قیساس بەرانبەر بەشداران، ئەوانەی پێچەوانەی عومەر و عەلییان کردوە کاریان بەم قیاسە نەکردوە. ئەم رایە لە عومەر و عەلی و ئەوانەی تێیدا هاوڕایانن حوکمکردنە بە عیللە، هەروەها رێگرییە لە خوێنرێژی مادام تاوانباران دەزانن لەسەر ئەوەی بەناهەق کوشتویانە دەکوژرێن[2].

لەبەرئەوە دەکرێ ئەم مەسەلەیە بخرێتە ژێر خانەی ئیجتیهاد بە را لەڕێی (سەدی زەرایع) و (مەسڵەحەتی مورسەلە) کە ئەم دوو رێگەیەیش بەسەریدا دەچەسپێن.[3]

---

[1] إعلام الموقعين ١/١٨٥ الأم للشافعي ٦/١٦.

[2] بڕوانە: الأم للشافعي ٦/٩، ٢٠

[3] تخريج الفروع على الأصول للزنجاني ص ١٧١.

## باسی سێیەم:
## ئیجتیهادی هاوەڵان بە را لەڕێی
## (مەسالیحی مورسەلە و سەدی زەرایع و ئیستیحسان)ەوە

ئەم باسە سێ خواست لەخۆ دەگرێ بۆ روونکردنەوەی کارکردن بەو ڕێگایانە.

### خواستی یەکەم:
### کارکردن بە بەرژەوەندی

بەرژەوەندی (المصلحة) لە ڕووی زمانەوە: ئەوەیە شت بە شێوەیەکی تەواو بێ بەگوێرەی ئەو مەبەستەی ئەو شتەی بۆ دەویسترێ، وەك قەڵەم کە بەشێوەیەکە بۆ پێ نووسین گونجاو بێ. لەڕووی ناونانی هۆیش بەناوی بەرهۆ (مسبب)ەوە بەو کارانە دەوترێ کە دەبنە مایەی سوود.[1]

لە عورفدا: ئەو هۆیەیە دەبێتە مایەی چاکە و سوود، وەك بازرگانی کە دەبێتە مایەی قازانج.

لە زاراوەی ئوسولناساندا: غەزالی دەڵێ لەئەسڵدا بریتییە لە هێنانی سوود یان لادانی زیان، بەڵام مەبەستمان لە بەرژەوەندی پارێزگاریکردنە لە مەبەستی شەرعدانەر.[(2)]

ئوسولناسان بەرژەوەندییان بەگوێرەی دیدەگرتن یان نادیدەگرتنی لەلایەن شەرعدانەرەوە کر ویانەبە سێ بەشەوە:

---

[1] القاموس للفيروزآبادي١/٢٧٧.

[2] بڕوانە: المستصفى للغزالي ص ٢٥١.

جۆری یەکەم: بەرژەوەندیی دیدەگیراو (معتبر) کە ئەحکامی بۆ بەدیهێنانیان داناوە، ئەوانە حوججەن، حاسڵەکەی بۆ قیاس دەگەڕێتەوە ئەویش وەرگرتنی حوکمە لە مەعقولی دەق و ئیجماع[1]، ئەم جۆرە لێرەدا مەبەست نیە.

جۆری دووەم: ئەو بەرژەوەندیانەی شەرعدانەر ئیعتیباری هەڵوەشاندونەتەوە و کۆمەڵێ بەرژەوەندی لەسەر هەڵوەشاندنەوەیان بینا کردوە کە لێیان زیادن، بۆیە هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی نابێ بکرێنە بەڵگە. بۆ نموونە: یەکسانکردنی کچ لەگەڵ کوڕ لە میراتدا بەرژەوەندیەکە شەرعدانەر نادیدەی گرتوە و لە میراتدا جیاوازی لەنێوانیاندا کردوە و بەرژەوەندیەکی بەهێزتر و گرنگتری لەسەر بینا کردوە، ئەویش دانانی کۆمەڵێ ئەرك و خەرجییە لەسەر پیاو کە ئافرەتی پێیان پابەند نەکردوە، ئەویش لەبەر جیاوازییان لە پێکهاتەی خودی و لە سروشتی ئەرکی هەریەکەیان لە ژیاندا.

ئەم جۆرەیش لێرەدا مەبەست نیە.

جۆری سێیەم: کۆمەڵێ بەرژەوەندین کە شەرعدانەر نە باسی دیدەگرتن یان نادیدەگرتنیانی نەکردوە، ئەم جۆرەیان لەم باسەدا مەبەستە.

هاوەڵان لە سەرەتای ئیسلامدا بایەخیان بە پێناسەی بەرژەوەندی نەداوە، بەڵکو هەموو خەمیان بەدیهێنانی بووە، بەڵام لەسەر زمانیان بەناوی خێر بەکار هاتووە، وەك بوخاری[2] ریوایەتی دەکا کە زەیدی کوڕی پابت لە گێڕانەوەی چیرۆکی کۆکردنەوەی قورئاندا باسی دەکا کە عومەر و ئەبوبەکر بیرۆکەی کۆکردنەوەکەیان بە (خێر) وەسف کردوە. زەید بەم شێوەیە چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە: أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ لِمَقْتَلِ أَهْلِ الْيَمَامَةِ وَعِنْدَهُ عُمَرُ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ إِنَّ الْقَتْلَ قَدْ

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] بڕوانە:البخاري ٦/١٨٣.

اسْتَحَرَّ[1] يَوْمَ الْيَمَامَةِ[2] بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِالْقُرَّاءِ فِي الْمَوَاطِنِ كُلِّهَا فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنَ الْقُرْآنِ إِلاَّ أَنْ تَجْمَعُوهُ وَإِنِّي لأَرَى أَنْ تَجْمَعَ الْقُرْآنَ، قُلْتُ لِعُمَرَ كَيْفَ أَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)؟ فَقَالَ عُمَرُ هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي فِيهِ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ لِذَلِكَ صَدْرِي وَرَأَيْتُ الَّذِي رَأَى عُمَرُ. قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ وَعُمَرُ عِنْدَهُ جَالِسٌ لاَ يَتَكَلَّمُ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ وَلاَ نَتَّهِمُكَ، كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَتَتَبَّعْ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ... قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلاَنِ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ النَّبِيُّ (ﷺ)! فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ.

له جێبەندی ئەم دیالۆگەی نێوان ئەبوبەکر و عومەر لەلایەك و لەنێوان ئەبوبەکر و زەیدی کوڕی ثابت لەلایەکیترەوە، دەردەکەوێ هەریەك لە ئەبوبەکر و عومەر مەبەستیان لە وشەی (خیر) ئەوە بووە کە بەرژەوەندیی ئوممەتی ئیسلامی تێدایە.

## تەشریعی ئیسلامی و بەرژەوەندی:

ئەوەی لە ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامی وردبێتەوە —سەرەڕای کورتهێنانی ئەقڵ لە پەیبردن بە هەندێ لە بەرژەوەندیەکانی— دەبینێ هەر حوکمێکی بۆ هێنانی سوودێك بۆ مرۆڤ یان دوورخستنەوەی زیانێك لێی، یان هەڵگرتنی زەحمەتیەك لەسەری، دانراوە.

واجبکردنی باوەڕ بە خوا و بە سیفەتەکانی و بە پێغەمبەرەکانی ڕێگەی ڕزگاری و ناونیشانی باڵایی و ڕێزگرتنی مرۆڤی تێدایە.. پابەندبوون بە عیبادەتەکان پاکیی دەروون و ڕەمزی ئەخلاق و ڕێگرتن لە خلیسکان و ڕێگەی یەکترناسین و بایەخدان بە بەرژەوەندییە گشتیەکانی تێدایە.

---

[1] استحر: واتە توند و زۆر بوو.

[2] یەمامە: زێدی بەنی حەنیفە بوو لە نیمچەدوورگەی عەرەب، کە تێیدا موسەیلەمەی درۆزن بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد و موسڵمانان بەسەرکردایەتیی خالیدی کوڕی وەلید لەگەڵی جەنگان تا کوشتیان.

هەروەها لە ئەحکامە دارایییە گشتی و تایبەتەکاندا: هەرەوەزی و هاوکاری و سۆز و بەزەیی ناو خەڵك و بەگژاچوونەوەی هەژاری و دەستگرتنی لاواز و بەهێزکردنی ئابووریی ئوممەت هەیە.

سزا ترسێنەرەکانی بۆ تاوانە مەترسیدارەکان، پاراستنی تاك و ئاسوودەیی کۆمەڵگە و پاراستنی فەزیلەت و مافە ئەدەبی و مادیەکانی تێدایە.

ڕێکخستنی هاوسەرگیری پاراستنی شەرەف و پیرۆزکردنی پەیوەندییە خێزانیەکان و مانەوەی رەگەزی ئادەمیزاد هەیە.

ئەحکامی میراتیش دابەشکردنی دادپەروەرانەی ماڵ و دابەشکردنی سامان و ڕێگرتن لە کەڵەکەبوونی لە دەستی تاقمێکی کەم و دوورخستنەوەی دروستبوونی کێشە و کینەیان لەنێوان خزمان تێدایە.

ئەمانە و باقیی حوکمە شەرعیەکانیتر کە بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی بەندەکان دانراون.

## گۆڕانی ئەحکام بەگوێرەی بەرژەوەندیەکان نەسخکردنەوە نیە:

هەندێ خەڵك گومانیان وابووە کارکردن بەبەرژەوەندی دەبێتە مایەی گۆڕینی شەریعەت و سەرەوژێرکردنی بارەکانی، چونکە هەرچی خەڵك بە بەرژەوەندی بزانن دەقێکی بۆ واز لێدێنن، ئەوەیش نەهێشتنی ئەحکامی شەرعییە و دەبێتە نەسخکردنەوە بە را، کۆدەنگیش هەیە لەسەر ئەوەی پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) نەسخکردنەوە نیە، مادام بەرژەوەندیی دەمڕاست بێ دەشێ واز لە هەموو دەقەکان بهێنرێ.

ئەم گومانە بێجێییە، لەبەرئەوەی گۆڕانەکە تەنها ژمارەیەکی کەم حوکم دەگرێتەوە کە لەسەر بەرژەوەندیی کاتی دامەزراون -وەك پاشتر دێ- و گۆڕین دەیانگرێتەوە. هیچ مەخلوقێك پێگەی هەرچی بێ ناتوانێ بڵێ ئەوانە نەسخکراوەن، بەڵکو ئەسڵی حوکمەکە هەیە، ئەوەی هەڵگیراوە پیادەکردنی حوکمەکەی پێشووە،

لەبەرئـەوەی حوکمەکـە لەسـەر بەرژەوەنـدی وەسـتاوە و لەگـەڵی دەسـوڕێ، هـەر بەرژەوەندیەکیش پشت بەئەسڵێك دەبەستێ، ئەسڵەکەیش ماوە.

شـاتبی دەڵـێ[1]: جیـاوازیی ئـەحکام بـەگوێرەی جیـاوازیی بـارودۆخ، لەڕاسـتیدا جیاوازی نیە لە ئەسڵی گوتارەکەدا، لەبەرئەوەی شەرع وا دانراوە هەمیشە و ئەبـەدی بێ ئەگەر بڕیار بێ دنیا بێکۆتا بێ، تەکلیفیش بەهەمان شێوە لە شەرعدا پێویستی بە زیاتر نیە، بەڵکو مانای جیاوازی ئەوەیە ئەگەر بـارودۆخ جیـاواز بـوو، هـەر عادەتێك دەگەڕێتەوە بۆ ئەسڵێکی شەرعی کە حوکمی پێ دەدرێ لەسەر ئەو عادەتە.

## کارکردنی هاوەڵان بە بەرژەوەندی:

هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) ڕووبـەڕووی بێشـومار ڕووداو بوونەتـەوە کـە بەڕواڵـەت دەقیـان لەسـەر نیـە، بـەڵام لـەڕێی ئیجتیهـاد بەبەرژەوەنـدی چارەسـەریان بـۆ دۆزراوەتەوە. نیشانەکانی ئەم ڕووداوانـە لـە یەکـەمین سـاتی وەفـاتی پێغەمبـەرەوە دەستیان پێکرد، کاتێ ڕووبەڕووی کێشەی خیلافەت بوونەوە، پاشان هەڵگەڕانـەوەی زەکاتنەدەران، پاشان مەسەلەی کۆکردنەوەی قورئان، پاشـان سـوپاکەی ئوسـامە و بەرگریکردن لە عەقیدە.

پاشان ڕووداوەکان ڕێچکەیان بەست، ڕێکخستنی سوپا و تۆماری دیوان و چۆنێتی دابەشکردنی بەخشیش و فراوانکردنی مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) و کردنی خانوویەك بە بەندیخانە و ڕەفتارکردن بە زەوییە فەتحکراوەکان و زۆر مەسـەلەیتری دەوڵـەتێك کـە هەموو ڕۆژ لە فراوانبووندا بێ و گەل و نەتەوەی نوێ بێنە ژێر سایەی ئاینەکەی.

زانایان لە ئوسولناس و شەرعزان ڕووپێوی فتوا و داوەریکردن و ئیجتیهادکردنی بە ڕای هاوەڵانیان لە هەڵێنجانی ئەحکامی ڕووداو و بەسەرهاتەکاندا کردوە، بینیویانە لـە یەکەم کۆبوونەوەی سەقیفەی بەنی ساعیدەوە بۆ خیلافەت تا مردنی دووایین هـاوەڵ،

---

[1] بڕوانە: الموافقات ٢/٢٨٥.

له زۆربەی هەڵێنجانەکانیاندا —پاش کیتاب و سوننە— پشتیان بە بەرژەوەندی و پیادەکردنی ڕۆحی شەریعەتی ئیسلامی بەستوە.

لەپاڵ ئەوەشدا، لە هەندێ ئەحکامی شەرعیدا رایان جیاواز بووە بەهۆی جیاوازییان لە را لە ڕێگەی کارکردن بە مەسالیحی مورسەلەوە. ئەگەر ڕووداوێکیان بهاتایە پێش هەندێکیان پێیان وابوو بەرژەوەندیەك هەیە دەخوازێ حوکمی ئەم ڕووداوە بەو شێوەیە بێ، هەندێکیشیان وایان نەدەبینی، ئەویش لەبەر جیاوازیی تێڕوانینیان لە مەزەندەکردنی قەبارەی ئەو بەرژەوەندییە و چەندە حوکمی ئەو پێشهاتە دەخوازێ. لێرەوە لە هەندێ ئەحکامی شەرعیدا رایان جیاواز بووە، لەوانە:

**أ— لەبارەی عیددەی تەلاقدرلو رایان جیاوازە ئەگەر ژنەکە لە خاوەن قورئەکان و بوو و پاکبوونەوەی درێژ بوویەوە:** عومەری کوڕی خەتاب و ئیبن عەباس و ئەو هاوەڵانەی هاوڕایانن فتوایان داوە تەلاقدراوی خاوەن قورئ ئەگەر حەیزی نەما نۆ مانگ چاوەڕوان دەکا، ئەگەر دەرکەوت سکی نیە پاش ئەوە سێ مانگ عیددە دەگرێ، ئەمەیشیان لە روانگەی لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیی ئافرەت و سەیرکردنی مانای مەبەست لە دانانی عیددەوە کردوە، کە دڵنیابوونە لەوەی رەحمی ئافرەتەکە منداڵی تێدا نیە، پاش تێپەڕبوونی ماوە باوەکەی سکپڕی ئیتر گومان نامێنێ و پاشان ئەو چەند مانگە لە عیددەدا دەبێ، ئیمام مالیك ئەمەی وەرگرتوە.

ئیبن مسعود و زەیدی کوڕی ثابت و ئەوانەی هاوڕایانن، رایان وایە چاوەڕوان دەکا تا ئومێدبڕاو دەبێ، لەوکاتەوە عیددە دەژمێرێ، جمهور لە ئیمامانی موجتەهید ئەمەیان وەرگرتوە، لەبەرئەوەی ئەم عیددەکارە لە خاوەن قورئەکانە و عیددەی بەدەق سێ قورئە[1].

---

[1] بڕوانە: بداية المجتهد ٩١/١تاريخ الفقة الاسلامي محمد اسحاق الحداد ص ٢٣.

**ب- لەبارەی حوکمی زەویی ناوچە فـەتحرلوەکان رای جیاوازیـان هەیـە: پـاش فەتحکردنی عێراق و شام و ولاتانیتر** لە سەردەمی عومەری کـوڕی خەتابـدا هـاوەڵان سەبارەت بە حوکمی ئەو زەویانەی کەوتنـە ژێـر دەسـتی موسـڵمانان رای جیاوازیـان هەبوو:

جمهوری هاوەڵان لە سەرەتادا رایـان وابـوو ئـەو زەویانـە بەسـەر فەتحکەرەکانـدا دابەش بکرێن پاش دەرکردنـی پێنجیـەك بـۆ خەرجییـە شـەرعییە ناسـراوەکان، وەك ئەوەی خوا فەرمانی کردوە: ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ﴾الآية .[1]

واتە بـۆ ئـەو فەتحکارانـەی غەنیمەتەکـەیان گرتـوە. ئـەوان بـە بۆچـوونی خۆیـان پشتیان بەم ئایەتە و ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە خەیبەر کردی دەبەست ، کە بەهیچز گرتی و پاش دەرکردنی ئەوەی قورئان دیاری کردوە، بەسەر موسڵمانەکاندا دابەشـی کرد. بەڵام عومـەر لەمـەدا هـاوڕای ئـەوان نـەبوو و راکەیشـی نـرخ و قورسـایی خـۆی هەبوو، چ لەو سەردەمە و چ لەسەردەمی هاوەڵاندا.

سەرەنجام پێیان وت: راوێژ بکە. ئەویش راوێژی بە کۆچەرییە یەکەمـەکان کـرد و رای جیاوازیان هەبوو، لەوانـەی نـەیاری بـوون: زوبـێر بـن عـەوام و بـلال بـن رەبـاح و عەبدوڕەحمان بـن عـوف و ئەبوعوبەیـدە و عـەمار بـن یاسـر بـوون، کـە رایـان وابـوو زەویەکان پێنجیەکیان لێ دەربکرێ و باقیەکەی بەسەر فاتیحەکاندا دابەش بکرێ.

عومەر وتی ئایا پێتان وانیە ئەم سنوورانە دەبێ پیاوانێك هـەبێ بیانپـارێزن؟ ئیـا پێتان وانیە ئـەم شـارە گەورانـە "وەك شـام و جـەزیرە و کوفـە و بەسـرە و میسـر" پێویستە پڕ بکرێن لە سوپا و خۆراکیـان پـێ بـدرێ؟ جـا ئەگـەر زەوی و علوجـەکان دابەش بکرێن، ئەمانە لە کوێ دێن؟ هەموو گوتیان: قسـە قسـەی تۆیـە، قسـەکەت و

---

[1] الأنفال : ٤١

بۆچوونەکەت نایابن، ئەگەر ئەم سنوور و شارانە بەپیاو پڕ نەکرێن و پێویستیەکانیان دابین نەکرێ، ئەهلی کوفر دەگەڕێنەوە بۆ شارەکانیان.

سەرەنجام بەڕازیبوونی هەموویان بابەتەکە کۆتایی هات.

ئەبویوسف دەڵێ: بۆچوونەکەی عومەر لە ڕێگرتن لە دابەشکردنی زەوی لەنێوان ئەوانەی فەتحیان کردون، کاتێ پەی بەوە برد کە خوا لە کتێبەکەیدا ڕوونی کردەوە، تەوفیقێکی گەورەیە لە خواوە، ئەوەیش خێر بوو بۆ سەرجەم موسڵمانان.[1]

تێبینی دەکرێ ناکۆکی لەم مەسەلەیەدا لە ناکۆکی لە ئیجتیهاد بە رای رووت نەکەوتۆتەوە، بەڵکو هەموو لایەنەکانی ناکۆکیەکە دەستیان بە دەقەوە گرتوە[2]، کە عومەر و ئەوانەی لەگەڵی بوون پشتیان بە ئایەتی ﴿مَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ﴾[3] دەبەست. لەبەرئەوە ناکۆکی تێیدا لە بابی ناکۆکی لە بەرژەوەندیی ویستراو لە حوکمی دەقەکە دادەنرێ. عومەر ئاسۆی بۆ ئەو بەرژەوەندییە لە ئاسۆی نەیارەکانی فراوانتر و قووڵتر بوو.

**ج- شەرعزانی لە چۆنێتی دابەشکردنی ماڵپێدان (العطاء)یشدا رایان جیاوازە:**

ئەبوبەکر و ئەوانەی هاوڕایانن لەوەدا لەگەڵ عومەر ناکۆک بوون: ئەبوبەکر رای وابوو ماڵپێدان بەیەکسانی بێ و ماڵ بەیەکسانی لەنێوان خەڵکدا بەش بکرێ، کەس بەسەر کەسدا فەزڵ نەدرێ، بەڵگەیشی ئەوە بوو کە نایەوێ ئەو ماڵەی پێیان دەدرێ بکاتە نرخی ئەو کارانەی بۆ خۆیان کردوە، دەیگوت ئەوان تەسلیمی خوا بوون و پاداشتیان لەسەر خوایە، هەرچی دنیایە گەیاندن (بەلاغ)ـە و ئەمەیش بژێوییە، بۆیە

---

[1] بروانە: کتاب الخراج لابي یوسف ص ٢٤ و پاشتر./ الخراج لیحیی بن ادم ص ١٨، ص ٤٣، الأموال لابن عبید ص ٥٦ و پاشتر. روض النضیر ٣١٥/٤.

[2] بروانە: أحکام القران لابي العربي ١٧٦٦/٤

[3] سورة الحشر/٧.

(یەکسانکردن) تێیدا لە (فەزڵدان) باشترە.

هەرچی عومەری کوڕی خەتابە رای لەگەڵ تەفزیلداندا بوو، دەیگوت: ئەوەی ماڵ و حاڵی خۆی بەجێهێشتوە و کۆچی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)کردوە وەك ئەوە لێ ناکەین کە بەناچاری موسڵمان بووە، ئەوەی شەڕی لەگەڵ پێغەمبەری خوا کردوە وەك ئەوە لێناکەم کە شەڕی لەپشتەوە کردوە.

ناکۆکیەکە لەسەر جیاوازیی تێڕوانینیان بۆ بەرژەوەندیی زاڵ بینا کرابوو، کە ئاخۆ لە یەکسانکردندایە وەك ئەبوبەکر پێی وابوو، یان لە تەفزیلدایە وەك عومەر پێی وابوو؟

## خواستی دووەم:
## کارکردن بە بیانووبەست (سەدی زەرایع)

زەریعە (الذريعة): ئامراز یان رێگە، لێرەدا مەبەست پێی گەیشتنە بە خراپە (مفسدة) لەرێی بەرژەوەندیەوە.[1]

سد الذرائع (بیانووبەست): واتە یەکلاکردنەوە (حسم)ی مادەی ئامرازەکانی خراپە بەمەبەستی دوورخستنەوەیان. هەرکات کاری ناخراپ بوو بە ئامراز بۆ خراپەیەك، ئەو کارە دەگیردرێ.

ئەگەرچی ئەم زاراوەیە لە سەردەمی صەحابەدا نەبوو بەڵام لەرووی کرداریەوە لە هەندێ مەسەلەی فیقهیدا پیادە کراوە، پیادەکردنی لە رێی ئیجتیهادکردن بە را، بووە مایەی جیاوازییان لە هەندێ حوکمی شەرعیدا، لەوانە:

حوزەیفەی کوڕی یەمان لە مەدائین ژنێکی جولەکەی مارە کرد، عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێبێ) بۆی نووسی "بەرێی بکە با بڕوا"، ئەویش بۆی نووسی: "ئەی میری ئیمانداران ئایا حەرامە؟ عومەر بۆی نووسی: فەرمانت پێدەکەم ئەم

---

[1] بروانە:الموافقات للشاطبي ٤/١٩٨.

نامەیـەم دانـەنێیت بـەڕێی بکـەیت، چـونکە دەترسـم موسـڵمانان چـاوت لێبکـەن و ئافرەتانی ئەهلی زیممە لەبەر جوانییان بێنن، ئەوەیش دەبێتە فیتنەیەکی گـەورە بـۆ ئافرەتانی موسـڵمان. محەمـەد ئەمـەی لـە کتێبەکـەی "الآثـار".[1] دا ریوایـەت کـرد و دەڵێ: دەستی پێوە دەگرین و بەحەرامی نابینین، بەڵام وامان پێباشە لەباتیی ئـەوان ئافرەتانی موسڵمان بێنن. هەروەها دەڵێ: ئەبوحەنیفە هەواڵی داینێ، کـە حـەماد لـە زاری ئیبراهیمەوە قسەی بـۆ کـردین گـوتی: "موسـڵمان ژنـی جولەکـە یـان نەسـرانی ناهێنێ، ئافرەتی موسڵمانی ئازاد نەبێ".[2]

جەصاص ئەم ئەسەرەی بەهەنـدێ جیاوازیـەوە هێنـاوە و دەڵـێ:[3] تـزوج حذيفـة يهودية فكتب إليه عمر ان خل سبيلها، فكتب إليه حذيفة أحرام هي؟ فكتـب إليـه عمـر لا، ولكن أخاف أن تواقعوا المومسات منهن.

قورتـوبی دەڵـێ[4]: دەگێڕنـەوە عومـەر هەریـەم لـە تەڵحـەی کـوڕی عوبەیـدوڵا و حوزەیفەی کوڕی یەمانی لە دوو ژنە کیتابی جیا کردەوە، هەردووکیان گوتیان: ئـەی میری ئیمانداران تەڵاق دەدەین و توورە مەبە. ئەویش وتی: ئەگەر تەڵاقەکەتان جائیز بوایە نیکاحەکەیشتان جائیز دەبوو! بەڵام لێکتـان جیـا دەکەمـەوە ...هتـد...، ئـیبن عەتیە دەڵێ: ئەمە زۆر نابێتە سەنەد، لەوە سەنەدتر ئەوەیـە عومـەر ویسـتی لێکیـان جیا بکاتەوە، حوزەیفـە گـوتی: ئایـا پێـت وایـە حەرامـە و بەڕێی بکـەم ئـەی مـیری ئیمانداران؟ ئەویش گوتی: ناڵێم حەرامە، بەڵام دەترسـم سـۆزانیەکانیان بێـنن، ئـیبن عەباسیش شتێکی لەو جۆرەی گێڕاوەتەوە.

ئەم ئەسەرانە ئاماژەن بە ڕێگرتن لەترسی ئەو خراپەیەی لەوانەیە لێی بکەوێتـەوە

---

[1] كتاب الآثار ص ٧٥.

[2] تعليل الأحكام ص ٤٤.

[3] بڕوانە: أحكام القرآن للجصاص ٢/١٦.

[4] بڕوانە: تفسير القرطبي ٣/ ٦٨ الطبعة الثانية مطبعة دار الكتب المصرية ١٩٣٦. روى عن عمر أنه فرّق بين طلحة ابن عبيد الله وحذيفة بن اليمان وبين كتابيتين وقالا: نطلق يـا أمـير المـؤمنين ولا تغضب، فقال: لو جاز طلاقكما لجاز نكاحكما ! ولكن أفرق بينكما صغرة قمأة.

چ بـه كەوتنـە نـاو خواسـتنى سۆزانيەكان (المومسـات)، يـان چـاولێكردنى لەلايـەن موسلّمانانەوە.

ئەوە روونە جياوازيى بۆچوونى عومەرى كوڕى خەتاب لەگـەڵ بۆچـوونى ئـەوانيتر لەو مەسەلەيەدا لەسەر دەستگرتن بە رێساى (سەدى زەرايـع) دامـەزرابوو، كـە ئـەوە راى عومەر و ئەوانەيە هاوڕاى بـوون، يـان دەسـتگرتن بـە زاهـيرى دەقەكانـەوە[1]، كـە ئەوە راى عوسمان و ئەوانەيە هاوڕاى بوون.

## خواستى سێيەم:
## خواستى كاركردن بە ئيستيحسان

ئيستيحسان: لەڕووى زمانەوە بەماناى بە باشدانانى شتێك دێ.

لـە زاراوەى ئوسولّناسـاندا ئـەو دەليلەيـە كـە پێچـەوانەى قياسـى رۆشـنە، يـان جياكردنەوەى مەسەلەيەكى لاوەكييە لە ئەسلّێكى گشتى لەبەر دەليلێكى تايبەت، جا چ دەق بێ يان ئيجماع يان زەرورەت يان عورف يان بەرژەوەندى و هيتر.[2]

ئـەم زاراوەيـە لـە سـەردەمى هاوەڵانـدا نـەبووە بـەڵام ناوەڕۆكەكـەى لەلايـەن شەرعزانيانەوە لەكاتى ئيجتيهادكردنيان بە را پەيڕەو كراوە، ناكۆكى لە پيادەكردنيـدا بووەتە مايەى جياوازييان لە هەندێ مەسەلەى فيقهيدا لەوانە:

وەستا (الصانع) بە لەلادانراو (مودع) دادەنرێ بۆ ئەو شتەى كەسێك لاى داناوە تا شتێكى لێ دروست بكا بۆى وەك بەرگدروو و دارتـاش و چـنيار و هـيتر.. ئـەو جـۆرە كەسانە ئەمينن لەسەر ئەو مادە خامانەى لايان دانراوە وەك قوماش و تەختە و شليلە كە تەسلميان كراوە و دەستيان دەستى ئەمانەتە بەبەڵگـەى ئـەوەى پێغەمبـەر(ﷺ)

---

[1] لەوانە ئەوەيە خوا ئەفەرموێ (وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ...الآية) المائدة/ ٥.

[2] بڕوانە: كشف الأسرار مع البزدوي ٤/١١٢٤ تسهيل الوصول إلى علم الأصول ص ٢٢٤.

ئەفەرموێ: (لا ضمان على مؤتمن).[1]

بەڵام لە سەردەمی هاوەڵاندا رووی داوە هەندێ کەس دەروونیـان ئەندازەیـەك لـە رێگەی راست لایداوە و ناپاكییـان لـەو شـتانە كـردوە كـە خـەڵك وەك سـپاردە لایـان داناون، بۆیە دەبوو چارەسەری حاڵەتەكە بكرێ ئەگەر هەبوو، هەنـدێ لـە شـەرعزانی هاوەڵان چارەسـەریان بـۆ ئەمـە دانـاوە تـا لـەلادانراو وەك پێویسـت پـەرۆش بـێ بـۆ پاراستنی ئەوەی لەلایەتی.

بەیهەقی لەم رووەوە كۆمەڵێ ئەسەر لە عەلی كوڕی ئەبوتاڵیبەوە دەگێڕێتەوە، كە هەندێكیان هەندێكیتریان بەهێز دەكەن و بەزامنكردنی كرێوانان (تضمين الأجراء)یـان لێ دەخوێنرێتەوە[2]، ئەوانیش بریتین لەمانە:

ئەوەیە عەلی بشـۆر و رەنگكـەری بـە زامـن دانـاوە و دەڵـێ: "لا يصـلح النـاس إلاّ ذلك". (خەڵك بەوە نەبێ چاك نابن).

لە جەعفەر كوڕی محەمەدەوە، لە باوكیەوە، لە عەلیەوە دەگێڕێتەوە كـە بشـۆر و رەنگكەری بە زامن داناوە و دەڵێ: "لا يصلح الناس إلاّ ذلك".

قەتادەوە لە خەلاسەوە دەگێڕێتەوە كە عەلی كرێكاری زامـن كـردوە، هاوشـێوەی ئەوە لە شەعبیشەوە ریوایەت كراوە.

قازی شورەیح كاری بە رای عەلی كوڕی ئەبوتاڵیب كـردوە. لـەم بـارەوە محەمـەد شەیبانی دەگێڕێتەوە[3]: پیاوێك هاتـە لای شـورەیح و پێـی وت: جلێكیـان بـۆ هێنـام چاكی بكەم، ماڵەكەم سووتا و جلەكەیشی سووتا، وتی: "جلەكەی بـدەرەوە" وتـی: چۆن جلەكەی بدەمەوە لەكاتێكدا ماڵەكەم سووتاوە؟ ئەویش وتی: ئایـا ئەگـەر مـاڵی ئەو بسووتایە، تۆ لە كرێكەت خۆش دەبوویت؟..

---

[1] السنن الكبرى للبيهقي ٢٩٨/٦–٢٩٠ نيل الاوطار ٢٩٦/٥.

[2] سەرچاوەی پێشوو ٢٢/٦كنز العمال في سنن الاقوال والافعال للشيخ علاء الدين علي التقي بن حسـام الـدين الهندي ١٩١/٢ـ ١٩٢.

[3] بڕوانە دوو سەرچاوەكەی پێشوو.

بەپێی شتێکی هاوشێوەی لە شافیعی ریوایەت کردوە، کە قازی شورەیح ئیجتیهادەکەی عەلی و ئەوانەی هاوڕای بوون وەرگرتوە. پیادەکردنی ڕێسای ئیستیحسانی لەبەرچاو گرتوە، لەبەرئەوەی بە بەرژەوەندی دەقی سوننەی تایبەت کردوە و بەبەرژەوەندی لەو ڕێسا گشتییە لایداوە کە حەدیسی (لا ضمان علی مؤتمن) ئاماژەی بۆ داوە، تا وەستا یان کرێوان پەرۆش بێ لەسەر پاراستنی ئەو مادە خامانەی لە خاوەنەکانیان وەردەگرێ.

ئەو شەرعزانەی هاوەڵانیش کە پێچەوانەی ڕاکەی عەلی بوون، دەستیان بەزاهیر و عمومی دەقی ناوبراوەوە گرتوە.

ناکۆکیی نێوان شەرعزانی هاوەڵان بووەتە مایەی جیاوازیی شەرعزانی مەزەبە بەکۆمەڵەکان لەم مەسەلەیەدا: ئەبوحەنیفە و زوفر و ئەوانەی هاوڕایانن بۆ ئەوە چوون ئەگەر کرێوان (الاجیر) بەتەنها کاری کرد بەبێ مولکی بەکرێگر، ئەوا فەوتانی ئەو شتەی تێیدا بەکرێ گیراوە بە کەمتەرخەمی ئەو، یان بەهۆی شتێك لە کردەوەکانی یان ناتەواویی سنعەتەکەی، ئەوا پابەندی دەکا و دەبێ بیبژێرێ (واتە زامنی دەکا) ئەگەر کرێوانەکە هاوبەش (مشترك) بوو[1]. ئەمە ڕای شیعەی ئیمامیشە، بەڵام کرێوانی تەنها لای ئەوان هاوبەشە. توسی دەڵێ، ئەوەی لە عەلیەوە ریوایەت کراوە ئەوەیە کرێوانی بە زامن داناوە، کە وا وەرگیراوە وەك ئەوەی بەکردەوەی ئەو بێ[2].

خاوەنانی ئەم ڕایە دەڵێ کرێوان یان وەستا (الصانع) جگە لەو حاڵەتەی باس کران زامن ناکا، لەبەرئەوەی ماڵەکە ئەمانەتە لەدەستیدا ئەگەر وەرگرتنەکە بە مۆڵەتی ئەو ڕووی دا، لەبەرئەوە ئەگەر بەهۆیەك نەدەکرا خۆی لێ بپارێزێ فەوتا، زامنی ناکا، هەروەها ئەگەر زامنکراو بێ زامنی دەکا، وەك لە زەوتکراودا.

پاراستن ئەرکی سەرشانیەتی وەك پاشکۆ نەك بەمەبەست، لەبەرئەوە کرێی

---

[1] بروانە: فتح القدیر ٩/١٢٢فما بعدها.

[2] بروانە: الخلاف للطوسي ١/٧١٦.

لەبەرانبەردا نیە، بەپێچەوانەی ئەوەی بەکرێ لای دادەنێ، لەبەرئەوەی پاراستن بەمەبەست لەسەریەتی تا کرێکە بەرانبەری بێ. ئەمە رای ئیمام ئەحمەد و ئیسحاقیشە.

ئەبویوسف و محەمەد دەڵێن: ئەگەر بە شتێکی زاهیر فەوتا کە نەدەکرا بەری پێ بگیرێ وەك سووتان نایبژێرێ، بەڵام ئەگەر بەشتێك فەوتا کە دەکرا بەری پێ بگیرێ زامنی ئەکا، ئەمە لە کرێوانی هاوبەشدا، هەرچی کرێوانی تاکە زەمانی لەسەر نیە.[1]

شافیعی دوو قسەی لەمەدا هەیە: یەکێکیان ئەوەیە بەتەنیا کارەکەی لە غەیری مولکی بەکرێگردا کرد نابێتە زامن هەرکات بەهەر شتێك فەوتا، بەدزین یان سووتان یان شتێك لە کردەوەی خۆی یان غەیری کردەوەی خۆی، ئەوەیش قسەی ئیمام مالیك و ئیبن ئەبولەیلا و شەعبییە.

قسەکەیتری ئەوەیە زەمانی لەسەر نیە چ بەتەنها بێ یان بەهاوبەش، وەرگرتنیشی وەرگرتنی ئەمانەتە، ئەوەیش قسەی عەتا و تاوسە.

ئەلرەبیع دەڵێ: شافیعی پێی وابوو بەحەتمی لەسەر وەستاکەیە.[2]

## زاڵکردن:

بەڕای من رای زاڵ دەستگرتنە بەقسەکەی ئەبویوسف و محەمەدەوە لەوەی لە حاڵەتەکانی بارودۆخی دەرەوەی توانا وەك سووتان و لافاو و بومەلەرزە زامنکردنیان لەسەر نیە، بەڵام لەو حاڵەتانەدا کە دەکرێ بەر بە تەلەفەکە بگیرێ، بەرژەوەندی زەمانکردنیان دەخوازێ جا چ دەربکەوێ کەمتەرخەم بوون یان نا، ئەویش بۆ پاراستنی ماڵی خەڵك لە گەمەپێکردنی لەلایەن پیشەکارەکانەوە ئەگەر دڵنیابوون زامن ناکرێ بە ئیسپاتی کەمتەرخەمییان نەبێ، ئەویش بۆ ئەو تەعلیلەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب گوتی، کە خەڵك بەوە نەبێ چاك نابن.

---

[1] فتح القدیر، سەرچاوەی پێشوو.

[2] بروانە سەرچاوەکانی پێشوو.

# بەشی دووەم:
# جیاوازیی شەرعزانی شوێنکەوتوان
# لەبەر جیاوازییان لە ئیجتیهاد بە را

مەفروز (المفروض): تەشریع لەسەردەمی شوێنکەوتواندا[1] بە درێژەی تەشریعی سەردەمی هاوەڵان دادەنرێ، بەڵام گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەردا هات بەهۆی جیاوازی لەبارەی حوججیەتی ئیجماع و قیاس و باقی رێگەکانیتری گەیشتن بە ئەحکامی شەرعی لە سەرچاوە پاشکۆکان. ئەم گۆڕانەیش لە کارکردن بەم بنەما تەشریعیانە بۆ دابەشبوونی تائیفی "یان سیاسی"ی موسڵمانان بۆ شیعە و خەواریج و جمهور دەگەڕێتەوە.

شیعە: لە خۆشویستنی گەورەمان عەلی و ئالی بەیتەکەیدا زیادەڕەوییان کرد و خیلافەتیان لەواندا حەسر کرد.

خەواریج: خیلافەتیان بە مافێکی گشتی هەرکەسێك لە عامەی موسڵمانان زانی کە خەڵك بە هەڵبژاردنی گشتی هەڵیبژێرن، چ عەرەبی قورەیشی بێ یان کۆیلەیەکی حەبەشی[2]. هەروەها پێیان وایە حوکمی شەرعی پێویستە لەڕێی ئیمامەتەوە بێ و ئیمامیش هەردوو دەسەڵاتی دینی و دنیایی هەیە.

---

[1] زانایان وەك چۆن پێشتر لەبارەی چەمکی هاوەڵ (صەحابی) رایان جیاواز بوو، لە پێناسەی شوێنکەوتوو (تابعی)دا رایان جیاوازە، هەندێکیان پێناسەیان کردوە بەوەی: ئەو کەسەیە چاوی بە هاوەڵێك یان زیاتر کەوتبێ، ئەوەی هاوەڵێکی دیبێ وەسفی تابیعی تێدا بەدیهاتووە. هەندێکیشیان هاوەڵێکردنی هاوەڵیان بۆ ماوەیەك و لێبیستنی بەمەرج داناوە.

[2] تاريخ الفقة الإسلامي للأستاذ محمد علي السايس عبادة ٢٣٣/١.

جمهوری موسڵمانان: له ڕێڕەوی فیقهیدا بوونه دوو بەش: بەشێك لەسەر زاهیری دەقەكان و ئەسەرەكان وەستان و لێی لانادەن و له حاڵەتی ئەوپەڕی زەرورەتدا نەبێ، پەنا بۆ را نابەن. ئەم مەزەبە له حیجاز بڵاو بوویەوە و بە مەزەبی ئەهلی حەدیس ناوبانگی دەركردوە.

بەشێكیتریان كاتێ دەقیان نەبینیەوە له بەكارهێنانی رادا فراوانكارییان كرد. ئەوەیش له عێراق بڵاو بوویەوە و بە مەزەبی ئەهلی را ناسراوە.

ئەم بەشە سێ باس لەخۆ دەگرێ.

## باسی یەكەم:
## جیاوازیی شیعە لەگەڵ جمهور

دەركەوتنی فیكرەی شیعەگەری كاریگەرێكی گەورەی لەسەر تەشریعی ئیسلامی و جیاوازبوون له ئەسڵ و فەرعەكانیدا هەبووە، چونكە شیعە رەتیان كردەوە دان بە ئیجماعی جگە له بنەماڵەی ئالی بەیت (العِتْرَة )دا بنێن، لەبەرئەوەی ئیجماع بە دەلیلێكی سەربەخۆ دانانێن، بەڵكو بەلای ئەوانەوە حوججە له رای مەعسومدایە كە لەوانەیە ئیجماعیان لەسەرە.

ئەوەی چاو بە سەرچاوە فیقیهیەكان لای شیعەی ئیمامیدا بگێڕێ بەكارهێنانی دەستەواژەی بەڵگەمان كۆدەنگیی فیرقەیە (ودلیلنا اجماع الفرقة) یان كۆدەنگیی فیرقەی هەق (اجماع الفرقة المحقة) بەزۆری لەناویاندا دەبینێ، ئەوە بەزۆری لەكتێبی "الخلاف في الفقة"ی توووسیدا دەبینین. هەروەها دان بە حوججیەتی قیاسدا نانێن، لەبەرئەوەی را-یە و ئاینیش بە را وەرناگیرێ، بەڵكو له خوا و پێغەمبەرەكەی و ئیمامە مەعسومەكانەوە وەردەگیرێ.

ئەمەیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە لە ئوسولّی شیعەی ئیمامیدا خو' بۆ هەر شت یان ڕووداوێك چەند کەم مەترسیش بێ حوکمێکی دیاریکراوی هەیە، چ لە عیبادەتەکان و چ لە مامەڵەکاندا.

ئەم حوکمانە پێغەمبەر(ﷺ) بە وەحی و ئیلهام لەخواوە ناساندونی و لە ژیانی خۆیدا ئەوانەی حیکمەت و پێویستی ڕوونکردنەوەیانی خواستبێ، ڕوونی کردونەتەوە، باقیەکەیتری بە شاگردەکانی سپاردوە تا هەریەکەیان لە سەردەمی خۆیاندا ئەوەی پێویستی و حیکمەت ڕوونکردنەوەی دەخوازن ڕوون بکەنەوە، لەبەرئەوە وتویانە: ئێمە بوونی مەعسوم لە هەموو سەردەمێکدا بەواجب دەزانین و ئەویش گەورەی ئوممەتە، کۆدەنگیی عیترە حوججەیە لەبەرئەوەی گوزارشتە لە گوتەی مەعسوم.

هەروەها دەڵێن بەڵگە لەسەر عیسمەتی ئالی بەیت ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيراً﴾.[1]

هەروەها ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((إني تاركٌ فيكم ما إن تمسكتم به لن تضلوا بعدي: كتابُ اللهِ وعترتي أهلُ بيتي)).

ئەم دوو بەڵگەیە بەوە وەڵام دراونەتەوە کە ئایەتەکە هیچ بەڵگەیەکی تێدا نیە لەسەر عیسمەتی ئالی بەیت، چونکە عیسمەت تەنها بۆ پێغەمبەرانە، حەدیسەکەیش لەو حەدیسانەیە کە بەلای زانایانی حەدیسەوە ڕاستی ساغ نەبۆتەوە.

هەروەها باوەڕ بە ئیمامانی مەعسومیان کردۆتە بناغە بۆ ڕەتکردنەوە قیاس و حوججیەتی، لەبەرئەوەی بەکارهێنانی قیاس زەرور نیە و وتویانە: قیاس کارکردنە بە ڕا، ئەحکامی خوایش دروست نیە مەرجەعەکەی ڕا بێ. هەرچی ئیمامانن مەعسومن لە هەڵەکردن لەو حوکمانەدا، هەربۆیە ئەوەی دیدی ئەوان بە دەقی هاتوو لە شەرعدانەرەوە دادەنرێ.

---

[1] الاحزاب/٣٣.

هەربۆیە مەرجەعی ئەحکامی شەرعی هەمیشە ئیمامەکانن، نەك کەسانیتری جگە لەوان.[1]

ئەو جیاوازیەی لە سەرەوە خرایە روو کاریگەریی گەورەی لەسەر فیقهی ئیسلامی هەبووە، لە ئەسڵ و فەرعەکانیدا، کە شیعە لە زۆر مەسەلەی ئوسوڵی و فیقهیدا لەگەڵ ئەهلی سوننە جیاواز بوون.

ئەمانە چەند نموونەیەکن:

أ- **لە مەسەلە ئوسوڵیەکاندا:** هاوەڵان لەبارەی راستیی تەرتیبی زەمەنیی خەلیفەکانی راشیدین کۆدەنگن، لەکاتێکدا شیعە ئەو تەرتیبە بەشەرعی دانانێن و عەلی بە شایستەی خیلافەت بەر لە هەموان دادەنێن.

ب- **لە مەسەلە شەرعیەکاندا:** تەنها هەندێ مەسەلەی خیلافی دەخەمە روو لە میراتدا، کە شیعەی ئیمامی تێیاندا لە باقیی شەرعزانی موسڵمان جیاوازن، لەوانە:

١- **ئەگەر خوشکێکی هەقودا یان لە باوك لەگەڵ کچ کۆبووەوە**، بەلای جمهوری موسڵمانانەوە کچەکە نیوە و باقیەکەی بۆ خوشکەکەیە بە تەعصیب[2]، ئەم حوکمە لە سەردەمی هاوەڵانەوە بە ئیجماع جێگیر بووە. بەڵام شیعەی ئیمامی دەڵێن: کچەکە هەموو ماڵەکە دەبا، نیوەی بە فەرز و نیوەیشی بە رەد. تووسی دەڵێ: "دلیلنا اجماع الفرقة".[3].

٢- وتویانە: **کوڕی باوك و باپیر و مام و ئامۆزا تەنها بە فەرز دەبیەن نەك بە** تەعصیب. تووسی دەڵێ: "ودلیلنا اجماع الفرقة علی بطلان القول

---

[1] بروانە: مبادئ الوصول للحلي من علماء الشیعة ص ١٩٠تاریخ الفقة الاسلامي للشهاوي.

[2] تعصیب: واتە وەك بەشێك لە خزم و خوێشانی دەرەوەی میراتگرانی فەرز کە وەك کوڕ و کچ کە وەك فەرز میرات دەبەن، بەڵام خزم و خوێش (کە بە عوصبە ناو دەبرێن) زیاتر کاتێ میرات دەبەن کە مردوەکە تەنها کچی هەبێ، بەڵام ئەگەر کوڕی هەبێ خزم و خوێش هیچیان ناکەوێ-وەرگێر.

[3] بروانە: الخلاف للطوسي٢/٤٩.

بالتعصيب".[1]، ئەمەیش پێچەوانەی ئیجماعی شەرعزانی ئەهلی سوننەیە لە دابەشکردنی میرات بۆ خاوەن فەرزەکان و خزم و خوێش.

٣- **کچ لەگەڵ کچی کوڕ، کچی کوڕەکەیش شەشیەك وەك تەواوکردنی دوو سێیەکەکە** و باقیەکەیشی بۆ خزم و خوێش (واتە عوصبە)، ئەگەر عوصبە نەبوو بەپێی ڕێژەی پشکەکەیان بۆیان دەگێڕدرێتەوە. ئەمە حوکمێکە بە کۆدەنگیی شەرعزانی ئەهلی سوننە جێگیرە. بەلای ئەوانەوە ماڵەکە بۆ کچەکەیە نیوەی بە فەرز و نیوەی بە ڕەد. تووسی دەڵێ: "دلیلنا اجماع الفرقة".[2]

٤- **کچ لەگەڵ باوك**: کچ نیوە و باوك شەشیەك دەبا بە فەرز، باقیەکەیشی بە تەعصیب بە کۆدەنگیی شەرعزانی ئەهلی سوننە. بەلای ئەوانەوە باقیەکەی بەگوێرەی پشکەکانیان بۆ ئەو دووانە دەگێڕدرێتەوە. ڕەت دەکرێتەوە. تووسی دەڵێ: "دلیلنا اجماع الفرقة".[3]

٥- **باپیر "باوکی باوك"**: بە کۆدەنگیی شەرعزانی جمهور برا دایکیەکان بێبەش (حەجب) دەکا، لەسەر باوك یان کوڕی کوڕ بە کۆکەرەوەی پلەی خزمایەتی. کارکردن بەم قیاسە ڕەت دەکەنەوە و سێ-یەکی ماڵەکە بە میرات دەدەنە خوشك و برا دایکیەکان، باقیەکەیشی بۆ باپیرەکە. تووسی دەڵێ: "دلیلنا اجماع الفرقة".[4]

٦- **ئەگەر ئامۆزای هەقودا لەگەڵ مام لە باوکەوە کۆبوونەوە** مام لە باوکەکەوە پێش دەخرێ، لەبەرئەوەی لە ئامۆزا هەقوداکە لە مردوەکەوە نزیکترە، ئەمە کۆدەنگیی شەرعزانی لە هاوەڵان و شوێنکەوتوان و ئیمامان لەسەرە. بەڵام

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] سەرچاوەی پێشوو ٤٧/٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو ٥٢/٢.

[4] سەرچاوەی پێشوو ٦٨/٢.

شیعە بەپێچەوانەی ئەمانەوە ئامۆزای ناوبراو پێش مام لە باوکەوە دەخەن.
تووسی دەڵێ: مامێکی باوکیی (واتە لە باوکەوە برای باوکیەتی) لە کوڕە
مامێکی باوك و دایکی: ماڵەکە بۆ کوڕە مامی باوکی و دایکی (واتە هەقودا)
دەبێ نەك مامی باوکی. لەوەیشدا پێچەوانەی سەرجەم شەرعزانن.
بەڵگەیشمان ئیجماعی فیرقەیە، کە لەوەدا جیاواز نابن. دەڵێن ئەمیری
ئیمانداران سڵاوی خوای لێبێ لە ئیبن عەباس لەپێشتر بوو ئەگەر بکرایە
لەگەڵ کچ میرات ببەن، لەبەرئەوەی تەعصیب لای ئەوان بەتاڵە".[١]

بەم شێوەیە تووسی بۆ هەر مەسەلەیەك لەو مەسەلانەی باس کران کۆدەنگیی فیرقەکەیان و هەواڵی ئیمامە مەعسومەکانیان دەکاتە بەڵگە، لەکاتێکدا جمهور پێی وایە لەنێو دەقەکانی شەریعەتی ئیسلامیدا شتێك نیە لەسەر حوججیەتی ئەم کۆدەنگییە یان عیسمەتی ئیمامەکان. حوججیەت بۆ کۆکبوونی سەرجەم ئوممەتی محەمەد جێگیر بووە نەك بۆ فیرقەیەکیان، هەروەها عیسمەت بۆ پێغەمبەران یان ئوممەت بەگشتی دەبێ، نەك بۆ گرووپێکی دیاریکراوی.

---

[١] الخلاف للطوسي ٣٦/٢.

## باسی دووەم:
## جیاوازیی خەواریج لەگەڵ جمهور

پێشتر لە سەرەتای ئەم کتێبەدا باسی ئەوە کرا خەواریج کێن و بنەما و ڕێنماییەکانیان چین؟ دەگەڕێمەوە و هەندێ لەو ڕێنماییانە و کاریگەرییان لە فیقهی ئیسلامیدا دەکەم:

بەناوبانگترین ڕێنماییانەکانی خەواریج ئەمانەن:

١- خیلافەت بۆ ئەو کەسەیە موسڵمانان هەڵیبژێرن، با قورەیشی یان عەرەبیش نەبێ.

٢- بێهێزیی ئەوان و بەهێزیی حاکم هەرچەند بێ، لە دەرچوون لەو "ئیمامەی هەڵبژاردنی لەلایەن ئیمامەکانەوە نەبووە" نایانبەخشێ.

٣- کارەکان لە نوێژ و ڕۆژوو و هیتر بەبەشێك لە ئیمان دادەنێن و ئیمانی مرۆڤ تەنها بە باوەڕی دڵ بەدینایەت[1]، لەبەرئەوە هەندێ لەوان هەندێ لە موسڵمانان بە کافر دادەنێن، هەندێکیشیان پێگەی نێوان دوو پێگەیان "لەنێوان ئیمان و کوفر"دا بۆ بڕیار دەدەن.

ئەم ڕێنماییانە و هیتر کاریگەریی گەورەی لەسەر فیقهی ئیسلامی هەبووە لەڕووی سەرچاوە و لقەکانیەوە. توندڕەوەکانیان کە هەندێ لە غەیری خۆیان کافر دەکەن کارکردن بە سوننەیان ڕەت کردۆتەوە -و وەك پێشتر باسمان کرد- تەنها قورئانیان وەرگرتوە. بەڵام ناتوندڕەوەکانیان سوننەتی پێغەمبەری خوایشیان وەرگرتوە بەو مەرجەی لەڕێی ئیمامەکانی خۆیانەوە پێیان بگا. پاشان ئەوان -جگە لە ئیبازی- کارکردن بە ئیجماع و قیاسیان ڕەت کردۆتەوە، هەروەها لەو ڕووەوە داننان بە

---

[1] بڕوانە: تاريخ الفقه الاسلامي للاستاذ الشهالوي ص ٣٦.

ئیجماعدا داننانە بە غەیری خۆیان کە فاسق و کافریان دەکەن و ئەوەیش لەگەڵ ڕێنماییەکانیاندا ناکۆکە. هەروەها لەبەرئەوەی قیاس رایە و ئاینیش بە را وەرناگیرێ، ئەمەیش مانای دەستگرتنیانە بە زاهیری دەقەکان و کارنەکردن بە ئیجتیهاد بە را بە هیچ شێوەیەك.

بەهۆی رەتکردنەوەی کارکردنیان بە ئیجماع و قیاس و زۆریەی ئوسولی شەریعەتی ئیسلامی، لە زۆر حوکمی شەرعیدا رایان لەگەڵ جمهور جیاوازە، کە زۆریەیان بە بەزاندنی ئیجماعی هاوەڵان دادەنرێن، ئەمەیش نموونەیەك لەوانە:

**١- شەرعزان لە هاوەڵان و غەیری ئەوان کۆدەنگن لەسەر دابەزینی حەرامبوون بەهۆی شیردانەوە لە باوکەوە بۆ رۆڵەکانی کوڕ یان کچ.** بەڵگەیشیان بۆ ئەو کۆدەنگییە ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ((یحرم من الرضاع ما یحرم من النسب))[1]، بەجیاوازی لە هەندێ وردەکاریدا وەك ئەو ئەندازەیەی شیردان کە حەرام دەکا، هەروەها وەك ئەوەی لە رێسای (یحرم من الرضاع ما یحرم من النسب) ئیستیسنا دەکرێ. خەواریج ئەم کۆدەنگیەیان شکاندوە و دەڵێن: قورئان تەنها دایکی شیری و خوشکی شیری حەرام کردوە و باقیتری حەڵاڵ کردوە بەوەی ئەفەرموێ: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ﴾، واتە خەواریج لەگەڵ تایبەتکردنی عمومی ئەم دەقەدا نین نە بە ئیجماع و بەو حەدیسە بەناوبانگەی دەڵێ: (یحرم من الرضاع ما یحرم من النسب).

**٢- هاوەڵان کۆدەنگن لەسەر حەرامکردنی کۆکردنەوەی ژن و پووری (لە هاوسەریی پیاوێکدا)،** ئەویش بەپێی نەهیکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەم حوکمەیش جێگیرە، لەکاتێکدا خەواریجیش هاوشێوەی شیعە لێی دەرچوون و

---

[1] متفق علیه، سبل السلام ٢١٧/٣.

کۆکردنـەوە لـەنێوان ژن و پورەکـەی بـە جـائیز دەزانـن لەبەرئـەوەی قورئـان تـەنها کۆکردنەوەی دوو خوشکی حەرام کردوە و هیتر لەسەریان قیاس ناکرێ.

٣- بەردبارانکردنی زیناکەری هاوسەردار (موحصەن) رای جمهورە بەپێی ئایەتی "الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما البتـة" کـە خوێندنـەوەی نەسـخ کـراوە و بـاقی حوکمەکانی لەسەردەمی هاتنی پەیامەکە و هاوەڵاندا کاری پێکراوە، پێغەمبەری خوا ئەم حوکمەی لەسەر ماعیز و هیتر جێبەجێ کرد، خەواریج لەگەڵ ئەم کۆدەنگییە نین و بوونی حوکمی بەردبارانکردنیان لە شەریعەتی ئیسلامیدا رەت کردۆتەوە و دەڵێن:

حەدی زیناکەری عازەب و هاوسەردار یەکە، ئەویش سەد جەڵدەیە بەپێی ئـەوەی خـوا ئەفـەرموێ: ﴿الزَّانِيَـةُ وَالزَّانِـي فَاجْلِـدُوا كُـلَّ وَاحِـدٍ مِّنْهُمَـا مِئَـةَ جَلْـدَةٍ﴾، بـۆ رەتکردنـەوەی بـەردبارانکردنیش ئـەوەیان کردۆتـە بەڵگـە کـە خـوا لـەبارەی کەنیزەکەکانەوە ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾[1].

دەڵێن: ئەم ئایەتە ئاماژەیە بە جێگیرنەبوونی بەردبارانکردن بۆ ژنـانی زیناکـەری هاوسـەردار، لەبەرئـەوەی بـەردبارانکردن لـەناوبردنی نەفسـە، لـەناوبردنی نەفسـیش بەشبەش ناکرێ، ئیتر چۆن کەنیزەك نیوەی ئەو سزایەیان لەسەرە؟!

لایەنگرانی بەردبارانکردن ئەم بەڵگەیەیان رەت کردۆتەوە، بەوەی دەڵێن مەبەست ئەوەیە: ئەگەر بە مێردکردن خۆیان ئیحصان کرد، ئەگـەر زینایـان کـرد حەدەکـەیان نیوەی حەدی ئافرەتە ئازادەکانە، زاهیری ئەمە ئەوەیە کـەنیزەك ئەگـەر زینـای کـرد حەدی لێ نادرێ تا شـوو نـەکات. وتـراوە ئەمـە رێبـازی موجاهیـد و تاوسـە. راجـیح ئەوەیە، ئـەوەی خـوا ئەفـەرموێ: ﴿فَـإِذَا أُحْصِـنَّ﴾ وەك مـەرج نـەهاتوە، بـەڵکو بـۆ نەهێشتنی ئەو وەهمە بووە کە شووکردن حەدەکەیان زیاد دەکا، بۆیە مانای نیە.

---

[1] النساء/٢٥.

له هەموو بارەکاندا حەدی کەنیزەك نیوەی حەدی ئازادە شوونەکردوەکانە، کە پەنجا جەڵدە، بەڵگەیش ئەوەیە بوخاری و موسلیم لە خالید ئەلجەهنیەوە ریوایەتیان کردوە: إِذَا زَنَتِ الأَمَةُ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَبِيعُوهَا وَلَوْ بِضَفِيرٍ.[1]

ئەوەی لێرەدا بەلامانەوە گرنگە بابەتی بەردبارانکردنە، لەبەر بەهەڵە بڵاوبوونەوەی لە جیهانی ئیسلامیدا.

له قورئانی پیرۆزدا ئایەتێك نیە نە لە نزیك نە لە دوور ئاماژە بۆ مەشروعیەتی بەردبارانکردنی زیناکەری هاوسەردار، پیاو بێ یان ژن، بکا. بەپێچەوانەوە قورئان زۆر ئایەتی تێدایە بەشێوەیەکی گومانبڕ ئاماژەن بەوەی سزای زینا بەشێوەیەکی رەها سزایەکی دنیاییە و بریتییە لە جەڵد و حەپس و تەنگ پێهەڵچنین (العضل) و هیتر.

لەو ئایەتانە:

**یەکەم:** ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾[2].

بەڵگەنەویستە هەردوو سیغەی (زانی و زانیة) ئیسمی فاعیلی رازاوە بە (ال)ی ئیستیغراقن، رێسایەکی ئوسوڵیشە ئەگەر اسم فاعل (ال)ی ئیستیغراقی لەگەڵ بوو گشتیبوون دەگەیەنێ، گشتیش بە گشتیبوونەکەی بەعموم وەردەگیرێ مەگەر بەڵگەیەك هەبێ تایبەتی بکا. حوکمدان بە بەردبارانکردن (رەجم) لەلایەن پێغەمبەرەوە ئەگەر پێش دابەزینی ئەم ئایەتە بێ و کاری بە ئیجتیهادی پشتبەستووی خۆی بە شەریعەتی یەهودی (تەورات) و عورفی سەردەمی نەفامی

---

[1] نيل الاوطار/٧/١٣٧.

[2] النور:٢

کردبێ، وەك لە باسی دووەمدا بەدرێژی باس دەکرێ، ئەوا عمومی ئایەتە بەو حوکمدانە تایبەت ناکرێ.

سزای ژن یان پیاوی زیناکردوو لە قورئاندا نەهاتووە ئەگەرچی لە تەوراتدا هاتووە، بەڵام موسڵمانان کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەوە و سزای رەجمیان بۆ سزای جەڵد بۆ تاوانی زینا لە حاڵەتی هاوسەرداریدا زیاد کرد، شەرعزان بە حەدیسەکانی رەجمەوە سەرقاڵ بوون کە یاساکانی قورئانیان لەبارەی سزای زینا هەڵوەشاندەوە، بەشێوەیەك ئەو وردەکارییە قورئانیانە بەلای ئەقڵی زۆربەی شەرعزانەوە بزر و نائاشنان.

سزای زینا لە قورئاندا بەم شێوەیە: هەردوو زیناکەر ئەگەر لە حاڵەتی تێوەگلان بە تاوانەکەدا گیران سزاکەیان سەد جەڵدە لەبەردەم خەڵکدا. سورەتی (النور) بەوە سەرەتایەکی تاکانەی دەست پێکردوە کە گومانی ئەوانەی خۆ لە روونی قورئان و رۆشنی یاساکانی نەبان دەکەن رەت دەکاتەوە، کە خوا لەو سەرەتا تاکانەیەدا ئەفەرموێ: ﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾[1] پاش پاش ئەوە راستەوخۆ دەڵێ ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ...﴾[2].

سەلماندنی حاڵەتی تێوەگلان بە تاوانی زینا زەحمەتە، هەروەك زەحمەتیشە لەم سەردەمەدا تاوانکارەکە دان بە روودانی تاوانەکەدا بنێ، بەڵام ئاسانە بڵاو بێتەوە کە فڵان ئافرەت بەدڕەوشتە و کەسوکارەکەی بەناهەق بیکوژن، یان خۆی پەنا بۆ خۆسوتاندن ببات.

**دووەم**: خوا ئەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلاً أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ وَاللّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُمْ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلاَ مُتَّخِذَاتِ

---

[1] النور:١

[2] النور:٢

أَخْدَانٍ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنْكُمْ وَأَن تَصْبِرُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [1]

ئەو سزا (العذاب)ـەی لەم ئایەتەدا هاتووە هەمان سزای ناو سورەتی نوور ئایەتی دووەمە ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾.

ئەم ئایەتە بەڕوونی ئاماژەیە بەوەی کەنیزەك (جاریە)ی مێرکردوو ئەگەر زینای کرد و تاوانەکەی بەشێوەیەکی شەرعی لەسەر ساغ بوویەوە، سزاکەی نیوەی سزای ئافرەتانی ئازادی شووکردووی زیناکەرە. ئاشکرایە مردن بەش ناکرێ بۆ مردنی تەواو و نیوە مردن، مردن هەر مردنە، ئەوەی بەش دەکرێ جەڵدە، سزای ژن و پیاوی زیناکەری ئازاد (١٠٠) جەڵدە، سزای بەندە و کەنیزەکی زیناکەریش (٥٠) جەڵدە جا هاوسەردار بێ یان سەڵت، ئەویش لە روانگەی دەستگرتن بە عمومی ئایەتەکەی سورەتی (نور)ەوە.

سێیەم: خوای گەورە لە ئایەتی لیعاندا ئەفەرموێ: ﴿وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ﴾. [2]

قورئانی پیرۆز لەم ئایەتەدا نەیوتوە (ويدرأ عنها الموت أو عقوبة الرجم) لەکاتێکدا وشەی دوورخستنەوە (درأ) لە قورئاندا لەگەڵ مردن هاتوە لەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا قُلْ فَادْرَؤُوا عَنْ أَنفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾. [3] عەزابیش لەم ئایەتەدا هەمان عەزابە لە ئایەتی دووەمی سورەتی نوردا ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾.

---

[1] النساء:٢٥

[2] النور:٨

[3] آل عمران:١٦٨

**چوارەم:** ئەوەی خوا لەبارەی ژنانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿يَا نِسَاء النَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَاعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيراً﴾.[1]

سزای ناو ئەم ئایەتە هەمان سزای سورەتی نور ئایەتی ژمارە (٢)ە کە (١٠٠) جەڵدە، لەبەرئەوەی مردن یان رەجم دووقات ناکرێن، ئەوەی دووقات دەکرێ جەڵدە.

**پێنجەم:** ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً﴾[2].

سزای ژنی زیناکردووی هاوسەردار لەم ئایەتەدا دەرکردنیەتی لەو ماڵەی پێویستە بۆ بەسەربردنی عیددەکەی تێیدا بمێنێتەوە.

**شەشەم:** ئەوەی خوا لە سورەتی (النساء)دا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهاً وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾.[3]

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە سزای ژنی زیناکردووی هاوسەرداری لەباتیی بەردبارانکردن بە تەنگ پێهەڵچنین (عضل) و بردنی بەشێك لەوەی مێردەکەی پێی داوە، داناوە، با (محصنة)یش بێ.

---

[1] الأحزاب:٣٠

[2] الطلاق:١

[3] النساء:١٩

**حەوتەم:** ئەوەی خوا لە سورەتی (النساء)دا ئەفەرموێ: ﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾.[1]

لەم ئایەتەدا سزای ژنی زیناکردووی هاوسەردار (واتە: محصنة)، حەپسکردنیەتی لە ماڵ. ئەوەی دەوترێ ئایەتی حەپس لە ماڵ بە ئایەتی دووەمی سورەتی نور نەسخ کراوەتەوە هەڵەیەکی زەقە، لەبەرئەوەی تاوانی زینا یان لەنێوان دوو مێیەنەدا دەبێ (المساحقة)، کە سزاکەی حەپسکردنە لە ماڵ، یان لەنێوان دوو نێرینەدا (نێربازی= اللواط) کە سزاکەی ئازاردانە، یان لەنێوان نێر و مێدایە کە سزاکەی سەد جەڵدە، ئیتر تێکگیران لەنێوان ئەم ئایەتانە لەکوێدایە تا بۆ هەڵگرتنی ئەو تێکگیرانە[2]، هەندێکیان هەندێکیتر نەسخ بکەنەوە.

**هەشتەم:** ئەوەی خوا لە سزای نێربازدا کە لە حوکمدا یەکسانە بە زینا ئەفەرموێ: ﴿وَاللَّذَانَ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا، فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ تَوَّاباً رَّحِيماً﴾.[3]

لەم ئایەتەدا سزاکە ئازاردانە بەبێ دیاریکردنی رەجم.

**نۆیەم:** سزای بێوەریکردن لە هاوسەرگیری لەگەڵ مرۆڤی بڕوادار، ئەو ئافرەت یان پیاوەی زینای کردوە و تۆبە لە زینا ناکا، بەر لە تۆبەکردن تەنها بۆیان هەیە لەگەڵ پیاو/ئافرەتی زیناکردوو یان هاوەڵ بۆ خوا دانەر هاوسەرگیری بکەن، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿الزَّانِي لَا يَنكِحُ إلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾.[4]

---

[1] النساء:١٥

[2] لمزيد من التفصيل يُنظر مؤلفنا التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن.

[3] النساء:١٦

[4] النور:٣

لەو خاڵانەی باسمان کردن ئەوە روون دەبێتەوە قورئانی پـیرۆز لـەو ئایەتانـەدا وا مامەڵە لەگەڵ ئافرەتی زیناکردووی هاوسەردار، هـەروەها پیـاوی زینـاکردووی ژنـدار، دەکـا کـە پـاش تۆمـەتبارکرانی بـە زینـا و جێبـەجێکردنی سـزای جەڵـد بەسـەریدا بەزیندوویی دەمێنێتەوە، قورئانی پیرۆز هاوسەرگیریی زیناکردووی پیاو یـان ئـافرەت لە مرۆڤە پاکەکان حەرام دەکات و دروست نیە بڕوادارێکی پاک زیناکردوێکی ئالودە بە زینا بخوازێ بەر لە تۆبەکردن، هەروەك بۆ ئافرەتێکی بڕواداری پاك دروست نیە شـوو بە پیاوێکی ئالودە بە زینا بکا بەر لە تۆبـەکردنی، وەك قورئـانی پـیرۆز لـە سـورەتی نوردا بەڕاشکاوی ئەوەی وتـوە. خۆ ئەگـەر چارەنووسـی زیناکـەر بـەردبارانکردن تـا مردن بوایە، بەو شـێوە بـاس لـە وردەکـاری حوکمـەکانی ژیـانی نـەدەکرا مـادام ئـەو حوکمی مردنی بەسەردا درابێ.

سزای تەڵاقدراوی زیناکەریش بەهەمان شێوەیە بە دەرکردنی لە ماڵ و رێگرتن لـە شووکردنەوەی تا هەندێ مارەیی دەدا، ئەگەر سـزای رەجـم بـۆ ئـەو ژنـە زینـاکردوە هاوسەرداره هەبوایە پێویست بە دانانی یاسایەك نـەبوو کـە رێگـە لـە شـووکردنەوەی بگرێ، یان رێگە بە دەرکردنی لە ماڵ لە ماوەی عیددەدا بدات.

جگـە لەوانـەی باسمـان کـرد، خـوای گـەورە هەڕەشـە لـە زیناکـاران دەکـا بـە دووقاتکردنی سزا و تێدا مانەوەی تـا رۆژی قیامـەت ئەگـەر لەسـەر زینـا سـووربوون، مەگەر ئەوەی تۆبە بکات و کاری چاکە بکا، ئەوانە خوا خراپەکانیان بـۆ دەگـۆڕێ بـە چاکە، وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً، يُضَاعَفْ لَـهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً، إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً﴾[1].

---

[1] الفرقان:٦٨-٧٠

سەرباری ئەوەی قورئانی پیرۆز نە لە نزیك نە لە دوور، نـە بـە راشـكاوی و نـە بـە ئامـاژە، ئامـاژەی بـە رەجـم نـەكردوە، حەدیسـە ناسـاغەكانی رەجـم و پێـوە سەرقاڵبوونیان یاساكانی قورئانیان سەبارەت بە وردەكـاریی سـزای زینـا فەوتانـدوە، بەقسەی ئەوان ئەو حەدیسانە ئەوەی لەبارەی حوكمی زینا لە قورئاندا هاتوە نەسـخ و حوكمەكانیان بەتاڵ كردونەتەوە. ئەگەرچی سزای رەجم لە قورئاندا نەهاتوە و ئـەو سزایەی بۆ تاوانی زینا هاتوە جەخت تەنها لە جەڵد دەكا، بەڵام قەناعەتی هەندێ لـە زانا و شەرعزانی موسڵمان بەدرۆ و دەلەسەی رەجم كردویەتی بە بناغـەی تەشـریعیی باو لە كتێبەكانی فیقهی ئیسلامی و لە پیادەكردنی شەریعەتی ئیسـلامی لای هەنـدێ دەوڵەتی ئیسلامی تـا ئـەمڕۆ. تائێسـتایش بەشـێكی زۆری پیـاوانی ئـاینی واقیـان وڕ دەمێنێ كـاتێ پێیـان بـوترێ رەجـم لـە یاسـای قورئـان و ئیسـلامدا نیـە، لەكاتێكـدا گەورەترین تاوان ئەوەیە كوشتنی نەفسێكی پاكی تۆمەتبارە بە تۆمـەتێك كـە پاسـاو نیە بۆ كوشتن. هەروەها لە گەورەترین تاوانەكان ئەوەیە یاسایەك بۆ كوشتنی نەفسی بێتاوان دابنرێ و پاشان بدرێتە پاڵ خوا و پێغەمبەرەكـەی ﴿وَمَـنْ أَظْلَـمُ مِمَّنِ افْتَـرَى عَلَى اللّهِ كَذِباً أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾[1].

ئـەو سـزایانەی بـاس كـران، جگـە لـە سـزای كۆیلـە و كـەنیزەكی زینـاكردووی هاوسەردار، سزای زیادەن بۆ سزای جەڵد.

شایانی باسە خوای گەورە فاحیشە (زینا)ی بە سیفەتی "ئاشكرا" لە ئایەتەكانـدا باس كراوە (الطـلاق:١)، (النسـاء:١٩، ٢٥)، (الأحـزاب:٣٠)، واتـە بەبەڵگـەی شـەرعی سـەلماوە، واتـە شـایەتیدانی چـوار پیـاوی عـادل كـە هـیچ جیاوازیـەك لـە ئیفـادە و شایەتیەكانیاندا نەبێ، یان بە دانپێدانانی تاوانكاری باڵقی ئـاقڵی هەڵبـژێر بـە روودانـی تاوانە سێكسییەكە بەكردەوە لەبەردەم قەزادا، ئەگینا سزای حـەدی (١٠٠) جەڵدەكـە نامێنێ و دەگۆڕێ بۆ سزایەكی تەمێكارانە كـە وەلی ئـەمر بـەهاوكاریی ئـەهلی شـوورا

---

[1] الأنعام:٢١

دیاری دەکەن، لەبەرئەوەی قورئانی پیرۆز سەلمانی تاوانی زینای لە بوونی چوار شایەت یان چوار جار دانپێدانانی تاوانکار لەبەردەم قەزادا قەتیس کردوە، سوننەتیش ئەمەی دووپات کردۆتەوە، وەك لە بەسەرهاتەکەی ماعیز و هیتردا هاتووە.[1]

**دەیەم: درۆی (الشیخ و الشیخة):**

ئەم درۆ نەفامانەیە[2] بە چەند دەربڕینێك ریوایەت کراوە لەوانە:

أ- (الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما البتة).

ب- (الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما البتة نکالا من الله والله عزیز حکیم).

ج- (الشیخ والشیخة فارجموهما البتة بما قضیا من اللذة).

د- (إذا زنی الشیخ والشیخة فارجموهما البتة نکالا من الله والله عزیز حکیم).[3]

ئەمە لەکاتێکدا هەموو رستە یان وشەیەکی قورئان لە ساغبوونەوە (ثبوت)دا موتەواتیرە و جیاوازی لە دەربڕینەکانیدا نیە.

ئەم درۆیە لە ئەسلدا عورفێکی نەفامانەیە بەپێی رێنماییە یەهودیەکان. ئایەتێکی قورئان نیە خوێندنەوەی نەسخ کرابێ و حوکمەکەی مابێ وەك کەسانی رووکەش گومانیان وایە، لەبەر ئەم بەڵگانەی خوارەوە:

١- ئەوەی کەمترین چێژی رەوانبێژی هەبێ دەزانێ ئەم دەربڕینە دوورە لە کەلامی خوا، لەبەرئەوەی هەموو وشە یان رستە یان ئایەتێك لە قورئانی پیرۆزدا رەوانبێژیەکی وای تێدایە لەسەروو رەوانبێژیی قسەی مرۆڤەوەیە.

---

[1] بۆ زیاتر دڵنیا بوون و سوود بڕوانە: الأستاذ أحمد صبحي منصور، الحوار المتمدن، العدد (١٠٦٥) في ٢٠٠٥/١/١. بەناونیشانی (أكذوبة الرجم ألغت تشريعات القرآن في عقوبة الزنا).

[2] ئەم درۆیە درۆیەکیتری شاخداری بۆ زیاد کراوە ئەویش ئەوەیە -وەك لە نیل الأوطار ١٠٢/٧دا هاتووە- لەو ئایەتانەی بۆ سەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) دابەزیون ئایەتی رەجمە (الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما البتة بما قضیا من اللذة) و سورەتی ئەحزاب بەقەدەر سورەتی بەقەرە بووە و ئایەتی رەجمی تێدا بووە (الشیخ والشیخة)، بەڵام نەسخ کراوەتەوە و ٧٣ ئایەتی ماوەوە. ئایا ئەمە تۆمەتبارکردن نیە بە تەحریفی قورئان هاوشێوەی تورات و ئینجیل!.

[3] فتح الباري شرح صحيح البخاري ١٤٣/١٢

٢- ئەوەی دەوترێ ئایەتێكی قورئان بووە خوێندنەوەی نەسخ كراوەتەوە و حوكمەكەی ماوە، هەڵەیەكی زەقە لە دوور رووەوە:

یەكەمیان: نەسخ لە قورئاندا نیە وەك لە كتێبی (التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن)دا، بە بەڵگەی ئەقڵی و نەقڵی ئەوەمان سەلماندوە.

دووەم: نەسخكردنەوەی مانا و مانەوەی لەفزەكەی، یان نەسخی لەفز و مانەوەی ماناكەی هەڵەیەكە مەنتیق و ئەقڵی ساغ رەتی دەكەنەوە، لەبەرئەوەی بەرِوونی وابەستەی یەكن بەمانا هەرە تایبەتەكە (متلازمان لزوما بيّناً بالمعنى الأخص)[1]، بۆیە بۆیە بە بەڵگەنەویست هەڵوەشاندنەوەی یەكێكیان هەڵوەشاندنەوەی ئەویتر لەناو زەین و دەرەوەی زەین لازم دەكا.

٣- رەجم بەستراوە بە هاوسەرداری (احصان)ەوە نەك پیری، بەقسەی ئەوان گەنجی هاوسەردار، لە نێر و مێ، رەجم دەكرێن، لەكاتێكدا مانای پێچەوانە (مەفهوم موخالەفە)ی دەستەواژەی (الشيخ والشيخة) ئەوەیە رەجم ناكرێن.

٤- بەرای هەمووان شێخی بێ هاوسەر (غير محصن) رەجم ناكرێ با پیر پیریش بووبێ.

٥- ئەوەی بە گێرانەوەی جیاواز لە عومەری كوڕی خەتابەوە (رەزای خوای لێبێ) ریوایەت كراوە هەرهەموو درۆ و هەڵبەستراون:

لەوانە ئەوەیە ریوایەت كراوە كە وتویەتی: (يا أيها الناس قد سُننت لكم السُنن، وفُرضت لكم الفرائض، وتُركتم على الواضحة. وصفق بإحدى يديه على الأخرى، إلاّ ألاّ تضلّوا بالناس يميناً وشمالاً، ثمّ إياكم أن تهلكوا عن آية الرجم، أن يقول قائل لا نجد حدّين في كتاب الله. فقد رجم الرسول ورجمنا، وإنّي والذي نفسي بيده، لولا أن يقول

---

[1] اللزوم بالمعنى الأخص: ئەوەیە بۆ پێداگری لەسەر وابەستەبوون (اللزوم) تەنها وێناكردنی لازم و مەلزوم بەسە.

الناس زاد عمر بن الخطاب في كتاب الله، لكتبتها ((الشيخ والشيخة إذا زنيا فارجموهما البتة)). فإنّا قد قرأناها).[1]

كە تێیدا هۆشداری دەدا لە خافڵبوون لە ئایەتی رەجم و دەڵێ نەڵێن دوو حەد لە کتێبی خوادا نابینین، بگرە پێغەمبەر رەجمی کردوە و ئێمەیش کردومانە، سوێند بەو کەسەی نەفسمی بەدەستە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە خەڵك بڵێن عومەر شتی خستۆتە سەر کتێبی خوا بەم شێوەیەم دەنووسی: ((الشيخ والشيخة إذا زنيا فارجموهما البتة)). ...

ئەم درۆیەی بەناوی گەورەمان عومەر بڵاو کراوەتەوە ساختە و بوهتان و هەڵەیەکی زەقە و لێخۆشبوونی نیە، لەبەر ئەم بەلگانەی خوارەوە:

أ- پاش پێغەمبەر(ﷺ) عومەر بوێرترین کەس بووە لە وتنی هەقدا و لە لۆمەی کەس سڵی نەکردۆتەوە، چۆن لە قورئان شتێك بەجێدێڵێ کە دەزانێ ١٠٠٪ قورئانە.

ب- چۆن رێگە بە پشتگوێخستنی ئەوە دەدات کە باوەڕی وایە ١٠٠٪ قورئانە.

ج- ئەم درۆیە شپرزە و بەریوایەتی جیاواز ریوایەت کراوە، ئەگەر ئایەتی قورئان بوایە جیاوازیی دەربڕینی تێنەدەکەوت.

د- عومەر بەدرێژایی ماوەی خیلافەتەکەی ئەم رەجمەی جێبەجێ نەکردوە، ئەگەر هەبوایە دەیکرد، ئەوەی وتوێتی کە ئایەتێك هەیە بەلەفز نەسخ بوەتەوە بە حوکم ماوەتەوە لە کۆتایی ژیانیدا نابێ، بەڵکو ئەسڵ وایە ئەم قسەیە کاتێك وترابێ کە ویستبێتی حوکمی رەجم بەسەر یەکەمین زیناکردوو لە خیلافەتەکەیدا کە دەساڵی خایاند، جێبەجێ بکا، چونکە ناکرێ بیر لەوە بکرێتەوە کە ئەو چەند جارێك

---

[1] موطأ الإمام مالك ط/٢ ص/٢٤١.. صحيح مسلم ١٣١٧/٣. ابن ماجه في السنن رقم ٢٥٥٣. فتح الباري ١٤٣/١٢.

ڕەجمی جێبەجێ کردوە پاشان لە کۆتایی تەمەنیدا دێت و بەخەڵك دەڵێ کە ئایەتێکی ڕەجم هەیە دابەزیوەتە سەر محەمەد، بەڵام لە مەسحەفدا نەنووسراوە.[1]

٦- هەموو ئایەت یان ڕستە یان وشەیەکی قورئان موتەواتیرە، ئەگەر ئەم درۆیە لە قورئان بوایە ناکۆکی تێ نەدەکەوت و بە ڕیوایەتی جیاواز ڕیوایەت نەدەکرا.

٧- ئەگەر ئەم درۆ نەفامانەیە قورئان بوایە، تەنها عومەر ڕیوایەتی نەدەکرد و بۆ خەڵکی بگوێزێتەوە، لەبەرئەوەی بە ئیجماعی زانایان و زۆرمەندان هەموو ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان موتەواتیرە.

٨- لە: (فتح الباري شرح صحيح الإمام أبي عبدالله محمد بن إسماعيل البخاري)دا هاتووە[2]: (نەسائیش ڕیوایەتی کردوە: مەروان بن ئەلحەکەم بە زەیدی کوڕی ثابتی وت -کە لە نووسەرانی وەحی بوو- ئەی لە مەسحەف (قورئان)دا نایینووسیت؟ وتی: نا، ئەی نابینی هەردوو بێوەلاو (الشابين الثيبين) بەردباران دەکرێن.

٩- دیسان لە (فتح الباري)دا هاتووە: زەیدی کوڕی ثابت و سەعیدی کوڕی عاص لە مەسحەفیان دەنووسی، بەسەر ئەم ئایەتەدا تێپەڕین، زەید وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو دەیوت: (الشيخ والشيخة فارجموهما البتة)، عومەر وتی: کاتێ دابەزی چوومە لای پێغەمبەر و بوتم بینووسمەوە، وەك بڵێی ئەوەی پێ ناخۆش بوو.

١٠- ئەگەر ئەو درۆی شێخ و شێخە ڕاست بێ کە دراوەتە پاڵ عومەر، ئەوا دەبێ بڵێین پێغەمبەر(ﷺ) ئایەتێکی قورئانی واز لێهێناوەو عومەر ئاشکرای کردوە. لازم بەتاڵە و هەروەها مەلزوم.

---

[1] بڕوانە: سنة الأولين، للأستاذ ابن فرناس، ص٨٣٣

[2] ١٤٣/١٢

١١- ڕەنگە دیارترین تێبینی لەسەر ئەم ئەحکامانە ئەوەبێ توندترینیان کە ڕەجمە، تێیدا پشت دەقێك بەستراوە کە وتویانە ئایەتێك بووە لە قورئاندا هەبووە، بەڵام پێغەمبەری خوا پاش خوێندنەوەی بۆ هاوەڵانی، ڕێگەی نەداوە بخرێتە ناو مەسحەف، کەچی کاری پێدەکرد و غامدیە و ماعزی بەردباران کرد.

١٢- لە تەئویلی ئەم درۆیەدا سێ قسە کراوە:

یەکێکیان ئەوەیە نەسخ کراوەتەوە، بەڵام بەڵگە لەسەر ئەوە چییە و کامەیە ئایەتە نەسخکارەکە، کەوتنی ئایەتێك بەڵگە نیە لەسەر لابردنی.

دووەم ئەوەیە لەبیر کراوە، بەڵام چۆن خوا شتێك بەوەحی دەنێرێ و پاشان لەبیری دەکا؟!.

سێیەم ئەوەیە فەرامۆش کراوە، ڕەنگە ئەمە نوکتەیەك بێ کە ئیبن حەجەر لە (شرح المنهاج)دا باسی کردوە لە هۆی نەسخکردنەوەی خوێندنەوە و هێشتنەوەی حوکمەکە، سووککردنی باری ئوممەتی ئیسلامی بووە بە بەناوبانگنەبوون خوێندنەوە و نووسینی لە مەسحەفدا، با حوکمەکەیشی باقی بێ، لەبەرئەوەی قورسترین حوکم و دڵتەزێنترینیانە.

١٣- نامۆترین شت لەو درۆیەدا وترابێ ئەوەیە دراوەتە پاڵ دایکی ئیمانداران عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) کە وتبێتی: باقی سورەتی ئەحزاب لە پێستەیەکدا نووسرابوو لەژێر نوێنەکەی محەمەدا دانرابوو، کاتێ مرد و لەگەڵ خەڵکەکە چووم بۆ بەخاکسپاردنی، گەڕامەوە بینیم پەلەوەرێکی ماڵی پێغەمبەر پێستەکەی بە وەحیەکەی ناویەوە خواردوە. دیارە هەندێ لە موفەسیران رایان وابووە سورەتی (الاحزاب) بەقەدەر سورەتی (البقرة) بووە، بەڵام ئایەتەکانی نەسخ کراونەتەوە لەناویاندا ئایەتی (الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما) و (٧٣) ئایەتیان ماونەتەوە.

ئەم ریوایەتە جیاوازانە پەیامی محەمەد و قورئانی پیرۆز دەشێوێنن، هەروەها دەستکاریکردن (تەحریف) دەدەنە پاڵ قورئان.

١٤- ئەم درۆیە سەرەتا لەرێی (الموطأ)ی ئیمام مالیکەوە (رەحمەتی خوای لێبێ) بڵاو بوویەوە. ئەم هەواڵەیش لەرووی ریوایەت و سەنەد و مەتنەوە قسەی لەسەر دەکرێ:

أ- لەرووی ریوایەتەوە: مالیك بن ئەنەس ئەم هەواڵەی نەنووسیوە، بەڵكو حەدیسەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەگێرایەوە و قوتابیەکانی لەویان دەبیست و دەیانتووسینەوە، لەبەرئەوە ریوایەتەکانی (الموطأ) فرە بوون تا گەیشتونەتە بیست کۆپیی جیاواز.

ب- لەرووی سەنەدەوە: بەدوای یەکداهاتنی ئەو سەنەدانەی محەمەد شەیبانی قوتابی ئەبوحەنیفە (رەحمەتی خوای لێبێ) دەینووسی، دەیوت: (أخبرنا مالك، حدثنا يحيى بن سعيد، أنه سمع سعيد بن المسيب، يقول أن عمر بن الخطاب قال كذا وكذا..) ، راست نیە سەعید بن مسەیب لە عومەری کوری خەتابەوە ریوایەت بکا، چونکە کاتێ عومەر شەهید بوو سەعید تەمەنی دوو ساڵ بوو، جا چۆن منداڵێکی بچوك حەدیس لە عومەرەوە دەگێرێتەوە. ئەمە مێژوونووس (ابن سعيد) لە (الطبقات الكبرى)[1]دا ئاماژەی بۆ کردوە کە گەورەترین و کۆنترین سەرچاوەی مێژوویيە لای موسڵمانان.

ج- لەرووی مەتنەوە: زاراوەی (الشيخ والشيخة) مانای (ئیحصان)، یان (المحصن و المحصنة) ناگەیەنێ، چونکە دەکرێ مرۆڤ پیر ببێ و هەر بوخچەی نەکراوە بێ و هاوسەرگیری نەکا.

١٥- ئەوەی لە عومەرەوە ریوایەت کراوە دژیەکی تێدایە، چۆن بە ئایەتی دادەنێ و پاشان بە زیادەی دادەنێ لە کتێبی خوادا و ئامادە نیە بیخاتە سەر قورئان.

---

[1] الطبقات الكبرى ٨٨/٥ و١٠٦

١٦- ئەگەر درۆی(الشيخ والشيخة) ئایەتێکی قورئان بووایە، تەنها عومەری کوڕی خەتاب نەیدەگواستەوە.

١٧- لەم درۆیەدا پێغەمبەر(ﷺ) تۆمەتبار دەکرێ بەوەی ئایەتێکی قورئانی واز لێهێناوە و نەینووسیوەتەوە، لەکاتێکدا پێغەمبەر نەهی کردوە لە نووسینەوەی جگە لە قورئان تا لەگەڵ سوننە تێکەڵ نەبێ و ئەفەرموێ: ((لا تكتبوا عني شيئا سوى القرآن، فمن كتب عنّي غير القرآن فليمحه)). زانایانی حەدیس دەڵێن: "ئەمە تاکە حەدیسی موتەواتیرە".

١٨- لە درێوترین درۆ کە بدرێتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەیە هەندێ یاسای بدرێتە پاڵ کە پێچەوانەی قورئانی پیرۆز بن.[1]

[1] بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە ئەم کتێبەمان: لا رجم في القرآن.

## باسی سێیەم:
## دابەشبوونی جمهور بۆ ئەهلی را و ئەهلی حەدیس

وتمان جمهور لە رێرەوی فیقهیدا بوون بە دوو تاقمەوە: تاقمی "شەرعزانی مەزەبی ئەهلی حەدیس" کە لەسەر دەقەکان وەستان، لەگەڵ تاقمی (شەرعزانی مەزەبی ئەهلی را) کە بەفراوانی رایان بەکار هێنا.

### أ- مەزەبی ئەهلی حەدیس و هۆکانی بلاوبوونەوەی لە حیجاز:

بارەگای مەزەبەکە شاری مەدینەی منەوەرە بوو و لەسەروو شەرعزانەکانیەوە سەعید بن مسەیب (رەحمەتی خوای لێبێ) دێ، ئەو و هاوەڵانی بینییان خەڵکی هەردوو حەرەمە پیرۆزەکە لە حەدیس و فیقهدا دامەزراوترینن، بۆیە روویان کردە ئەو ئەسەرانەی لە دەستیاندا بوون، بۆیە فتواکانی خەلیفەکانی راشیدی و فتواکانی عائیشە و ئیبن عەباس و زەیدی کوڕی ثابت و ئیبن عومەر و ئەبوهورەریرە لە هاوەڵان، هەروەها کێشەکانی قەزای مەدینەی کۆکردەوە و زۆر لەوانەی لەبەر کرد و بینی پاش هەموو ئەوە ئیتر پێویستی بەبەکارهێنانی را و ئیجتیهاد نیە. جا ئەگەر رووداوێك بخرایەتە بەردەم شەرعزانی ئەم مەزەبە دەیانخستە بەر تیشکی کتێبی خوا، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پاشان ئەسەری هاوەڵان، ئەگەر حوکمی ئەو رووداوەیان لەوانەدا نەدۆزیایەتەوە ئەنجا رایان بەکار دەهێنا. رەنگە لە فتوادانیش وەستابن و لەوەیشدا شوێنپێی شێخەکانیان هەلگرتبوو وەك عەبدولای کوڕی عومەر کە لە سنووری ئەسەرەکاندا دەوەستا و خۆی لە فتوادان بە را دەپاراست.

بڵاوبوونەوەی ئەم ڕێبازە لە حیجاز بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان:

١- کارتێکرانی شەرعزانی ئەم قوتابخانەیە بە ڕێچکەی شێخەکانیان لە هاوەڵان، وەك عەبدوڵای کوڕی عومەر (واتە ئیبن عومەر-وەرگێڕ)، کە سڵی لە ئیجتیهاد بە ڕا دەکردەوە و لە زەرورەتدا نەبوایە پەنای بۆ نەدەبرد.

٢- بوونی سامانێکی گەورە لە سوننەن و ئەسەر و داوەریی پێغەمبەر(ﷺ) و فتواکانی گەورە هاوەڵان لای شەرعزانی حیجاز، ئاخر وڵاتەکەیان زێدی وەحی و ماڵی هەڵگرانی شەریعەت بوو، بۆیە پاش ئەوە پێویستیان بەبەکارهێنانی ڕا نەبوو.

٣- کەمیی ڕووداو و بەسەرهات لای ئەوان جیاواز لە باری شوێنەکانیتری دەرەوەی حیجاز. هەر ڕووداوێك ڕووی بدایە چارەسەرەکەیان لە قورئان یان سوننە یان داوەری و فتواکانی هاوەڵاندا دەدۆزیەوە، ئەویش بەهۆی سروشتی ژینگەکەوە.

## ب- مەزهەبی ئەهلی ڕا و هۆکانی بڵاوبوونەوەی لە عێراق:

مەزەبی ئەهلی ڕا لەناو عێراقیەکان بڵاو بوویەوە لەسەرووبیانەوە ئیبراهیمی نەخعی (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، ئەو شەرعزانە و هاوەڵەکانی پێیان وابوو: حوکمەکانی شەرع مانا ماقوڵن و هەڵگری بەرژەوەندین بۆ بەندەکان و لەسەر بنەمای مەحکەم و عیللەی ڕێکخەر بۆ ئەو بەرژەوەندیانە دامەزراون، بۆیە بەدوایاندا دەگەڕان و حوکمەکەیان چ بە بوون و چ بە نەبوونەوە پێیانەوە دەبەست (مەبەست ئەحکامی مامەڵەکانە نەك عیبادەتەکان، هەروەها لەو ئەحکامانەی عیللە و حیکمەتەکانیان دەزانرێ نەك حوکمە تەعەبودیەکان).

ئەم قوتابخانەیە ڕەخنەی لە چەقبەستنی قوتابخانەی حیجاز دەگرت بەهۆی ئەوەی دەڵێن حوکمە شەرعیەکان زۆربەیان (تەعەبودین) و بواری ڕا-یان تێدا نیە و لەسەر دەق دەوەستن.

شەرعزانی ئەهلی ڕا ئەگەر ڕووداوێکیان بهاتایەتە پێش، دەگەڕان بەدوای عیللەکاندا تا حوکمەکانیان لەسە ربنیات بنێن، ڕەنگە هەندێ حەدیسیان لەبەر

نەگونجانیان لەگەڵ ئەو عیللانە ڕەت کردبێتەوە بەتایبەت ئەگەر حەدیسیتریش هەبن پێچەوانەیان بن، لەوەیشدا شوێنپێی مامۆستای یەکەمیان، عەبدوڵای کوڕی مەسعودیان هەڵدەگرت.

مەزەبی ئەهلی را لە عێراق بۆ چەند هۆیەك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

١- کارتێکرانیان بە ڕێگەی مامۆستای یەکەمیان، عەبدوڵای کوڕی مەسعود (ئیبن مەسعود) کە لەژێر کاریگەریی بۆچوونەکانی عومەری کوڕی خەتابدا بوو، ئیبن مەسعودیش لەناو هاوەڵان پێگەیەکی زۆر گەورەی هەبوو، بەشێوەیەك هاوشێوەی عومەر ناتوانین دەستبەرداری زانستەکەی بین. عومەر دەربارەی وتوێتی: (کنیف[1] ملئ فقهاً، وفي رواية علماً). واتە جامۆڵەیەکی پڕ لە فیقه یاخود زانستە.

هەریەك سەعد بن مالیك، حوزەیفە، عەممار، سەلمان و ئەبو موسا لە هاوەڵە دەستەبژێرەکان لەگەڵ ئیبن مەسعود بوون و لە ئەرکەکەیدا یارمەتییان دەدا.[2]

٢- ئەو حەدیسانەی لایان بوون و بەلای ئەوانەوە دەکرێ پشتیان پێ ببەسترێ، بەبەراورد بەو مەسەلانەی پێویستیان بە زانینی حوکمەکانیان هەیە، کەم بوون، بۆیە دەبوو را بەکار بێنن.

کەمیی ئەو حەدیسانەی پشتیان پێ دەبەسترێ بۆ دەست توندییان لە وەرگرتنی حەدیسدا دەگەڕێتەوە، بەشێوەیەك هەندێ مەرجیان بۆ قبوڵکردنی دانابوو کە ژمارەیەکی کەمیان نەبێ بەسەلامەتی دەرنەدەچوون، ئەویش بۆ بڵاویی دانانی حەدیس لە سەردەمەکەیاندا دەگەڕێتەوە.

٣- سروشتی ژینگەی عێراق: پەنابردن بۆ بەکارهێنانی را بەهۆی بوونی شارستانێتیی دێرین و کەلتوری جیاواز و ژیانی پەرەسەندووەوە بوو، زۆربەی

---

[1] بچوککراوەی (کنف)ە واتە دەفر یاخود جام، بچوککردنەوەکەیش بۆ گەورە پیشاندانە.

[2] بڕوانە: فقه اهل العراق وحديثهم للكوثري ص ٤٥/٥٢.

رووداو و بەسەرهاتەکان سروشتیان لە رووداو و بەسەرهاتەکانی حیجاز جیاواز بوو، کە مۆرکی دەشتەکیبوون تێیاندا زاڵ بوو.

دوو خاڵ هەیە پێم خۆشە ئاماژەیان پێ بدەم:

یەکەم: ئەوەی باسمان کرد لە جیاوازیی رێچکەی حیجاز و عێراق مانای ئەوە ناگەیەنێ کە هەموو شەرعزانی عێراق لە ئەهلی را بوون، یان هەموو شەرعزانی حیجاز لە بەکارهێنانی را سڵیان کردۆتەوە، بەڵکو لەناو عێراقیەکاندا هی وا هەبوو رقی لە را بوو و بەکاری نەدەهێنا و رێگەی ئەهلی حەدیسی دەگرتەبەر، لەوانە عامر بن شەرحەبیلی ناسراو بە شەعبی، کە دەیگوت: (ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە پێتان گەیشت، وەریگرن، ئەوەیش رای خۆیان بوو فرێی بدەنە حەوشە).

لەناو حیجازیەکانیشدا زانای وا هەبوون حەزیان لە را بوو، وەك رەبیعە بن عەبدورەحمان، شێخی ئیمام مالیك بن ئەنەس، لەبەرئەوەیە نازناوی (ربيعة الراي) دراوەتێ.

دووەم: شەرعزانی ئەهلی را هیچکات رایان بەسەر سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)دا هەڵنەدەبڕی، کەسیان رای خۆی پێش سوننەتی راست نەدەخست و کۆك بوون لەسەر ئەوەی هەرکەس سوننەتی پێغەمبەری خوای بۆ دەرکەوت، نابێ دەستبەرداری ببێ بۆ قسەی کەسیتر.

کەواتە ئاراستەی باو لە عێراق بەرەو بەکارهێنانی را بە پاڵنەری ئەو هۆکارانە بوو باسم کردن.

لەو مەسەلە فیقهییە لاوەکیانەی لە ناکۆکیی شەرعزانی شوێنکەوتوان لە ئیجتیهاکردن بە را لەرێی مەساڵیحی مورسەلەوە، کەوتونەتەوە ئەمانەن:

١- جیاوازی لە نرخدانانی بەزۆر (التسعير الاجباري):

هاوەڵان خۆیان لە نرخدانان لاداوە و رێگەیان والا کردوە خەڵك چۆنیان دەوێ بکڕن و بفرۆشن، لەبەرئەوەی بینییان پێغەمبەر(ﷺ) لە سەردەمی خۆیدا رازی نەبووە نرخ دابنرێ وەك ئەبوداود و هیتر لە حەدیسی عەلا بن عەبدورەحمانەوە لە

باوکیەوە لە ئەبوهورەیرەوە ریوایەتی کردوە کە: رجلًا جاء إلى رسول الله (ﷺ) فقال: يا رسولَ الله! سَعِّرْ لَنَا، فقال: بل أدعو اللهَ، ثم جاءَهُ رجلٌ، فقال: يا رسولَ الله! سَعِّرْ لَنَا، فقال: بلِ اللهُ يرفعُ ويُخفض، وإني لأرجو أن ألقى اللهَ وليست لأحدٍ عندي مظلمةٌ)).[1]

ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە: غلا السعر في المدينة على عهد رسول الله (ﷺ) فقال الناس: يا رسولَ الله! غَلا السِّعرُ فسعِّر لنا، قال: ((إنَّ اللهَ هوَ المسعِّرُ، القابضُ الباسِطُ[2] الرَّازِقُ، إنِّي لأرجو أن ألْقَى اللهَ وليسَ أحدٌ منكم يُطالبني، بمظلمةٍ في دمٍ ولا مالٍ)).[3] (واتە: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا نرخ لە مەدینە گران بوو، خەڵك وتیان: ئەی نرخ گران بووە نرخمان بۆ دانێ، ئەویش وتی: خوا نرخدانەرە، بگرو ببەخش و رۆزیدەرە و من خوازیارم بگەمەوە بەخوا و کەسێك لە ئێوە نەبێ لەبەر ستەملێکرانێك لە خوێن یان ماڵدا بەرۆکم بگرێ).

بەبەهەقی پاش ئەم دوو رووداوە ئەسەرێکی لە عومەری کوڕی خەتابەوە ریوایەت کردوە تێیدا هاتووە: فەرمانی بە مێوژ فرۆشێك کردوە نرخەکەی بەرز بکاتەوە یان بیباتە ماڵەکەی خۆی و چۆنی دەوێ بیفرۆشێ، لەبەرئەوەی کەمتر لە نرخی خەڵك دەیفرۆشت و بەوە زیانی پێ دەگەیاندن، عومەر فەرمانی پێکرد وەك نرخی خەڵکی لێبکا یان لە بازاڕ هەستێ، پاشان گەڕایەوە بۆ لای و پێی وت: ئەوەی پێم وتیت نە مافێکی منە و نە داوەریکردنێکە، بەڵکو شتێکە مەبەستم پێی خێری خەڵکی شارەکەیە، لەکوێ و چۆنت ویست بیفرۆشە.[4]

---

[1] بڕوانە: المنتقى شرح الموطأ ٥/١٨.

[2] القابض: المقتّر، والباسط: الموسّع.

[3] رواه الخمسة إلا النسائي وصححه ابن حبان وأخرجه ابن ماجه والدرامي وابو يعلى من حديث أنس واسناده على شرط مسلم راجع سبل السلام ٣/٢٥.

[4] بڕوانە: السنن الكبرى ٦/٢٩ سنن أبي داود ٣/٢٧٠ سبل السلام ٣/٢٥.

ئەو حەدیسەکە ئاماژەن بەوەی نرخدانان ستەمە، ئەگەر ستەمیش بێ کەواتە حەرامە، هەروەها ئەسەرەکەی عومەریش ئەوە دەگەیەنێ، لەبەرئەوەی دەبوویست لەو مەسەلەیەدا بەرژەوەندی پیادە بکا وەك لە قسەکەیەوە دیارە (مەبەستم پێی خێری خەڵکی شارەکەیە)، زاهیر پاش ئەوەی زانیوێتی زیانەکە هێشتا نەگەیشتۆتە ئاستێك پێویست بکا لە کارکردن لە زاهیری دەقەکە لابدا، پاشگەز بووەتەوە، بەم شێوەیە حوکمی نادروستیی نرخدانان بەکارپێکراوی ماوەتەوە لەسەردەمی پەیامەکە و هاوەڵاندا، تا سەردەمی تابیعین هات و ناکۆکی لەنێوان دوو تاقمدا دروست بوو: تاقمێك دەستی بە زاهیری ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لە سەردەمی راشیدیدا لەسەر بووە گرت، تاقمێکیش رای وابوو واز لەو زاهیرە بهێنرێ و کار بە (مەسالیحی مورسەلە) بکرێ بە سەپاندنی نرخدانانی ئیجباری بۆ دوورخستنەوەی زیان لە خەڵك. کۆمەڵێ لە شەرعزانی تابیعین لەوانە سەعید بن مسەیب و رەبیعە بن عەبدورەحمان و یەحیا بن سەعیدی ئەنساری فتوای دروستیی نرخداناتی ئیجبارییان دا، وەك کە ئەبولوەلید ئەلباجی لە (شرح الموطأ) دا لێی گواستونەتەوە و بەشێك لە مالیکی و شافیعی و کۆمەڵێ لە پێشەوایانی زەیدی لە حاڵەتی گرانیدا کاریان پێکردوە.[1]

زۆر لە شەرعزانی تابیعین لە هەردوو قوتابخانەکە وابەستە مانەوە بە گوتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەسەرەکەی عومەر لە حەرامکردنی نرخدانان بۆ هەموو کالایەك، ئەمە رای زۆربەی زانایانی مەزەبە بەکۆمەڵەکانە.

ئەو ئەسڵەی خاوەن رای یەکەم پشتیان پێ بەست لە جائیزبوونی نرخدانانی زۆرەملێ (ئیجباری) بریتی بوو لە بەرژەوەندیی کراوە (المصلحة المرسلة)، لەبەرئەوەی بینییان بەرژەوەندی ئەوە دەخوازێ و زیان لە خەڵك دوور دەخاتەوە، هەروەها بینییان ئەوە پێچەوانەی ئەو هەڵوێستی نرخدانانەی سەردەمی پەیامەکە و هاوەڵان نیە، لەبەرئەوەی نەکردنی لەو کاتەدا لەبەر نەبوونی زەرورەت بووە چونکە

---

[1] بروانە: المنتقى شرح الموطأ المرجع السابق نيل الأوطار للشوكاني ٥/٢٢٠.

ئەو گرانیەی لای پێغەمبەر(ﷺ) سـکالآیان لـە دەسـتی کـرد، ئامـاژە نیـە بـۆ بـوونی شتێك کە نرخدانان بخوازێ، لەبەرئەوەی گرانی هەندێ جار لەبەر زیادبوونی خواسـتە لـە خسـتنەڕوو، هەنـدێ جـاریش بـەهۆی قۆرخکـاریی بازرگانـە بەرهەمهێنـەکان یـان هاوردەکارانی کاڵاکانە بەمەبەستی دەسـتکەوتنی قـازانجێکی زۆر، زاهـیر گرانیەکـەی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر هۆی یەکەم بووە، ئەویش لەبەر پاکیی دەروونـەکان و دووریـی خـەڵك لـە چلێسـی و لادان بەئاراسـتەی مـادیی رووت، ئەگـەر وانەبوایـە پێغەمبـەر دەسـتبەرداری نـەدەبوو، چـونکە گرانـی بـەهۆی کـۆنترۆڵکردن لەلایـەن بازرگانانەوە ستەمە لە خەڵك و پێویستە حاکم نەیهێڵێ، جا چۆن پێغەمبەر(ﷺ) خـۆ لە لادان و نەهێشتنی ستەم دەبوێرێ؟

هەرچی ئەوانەن نرخدانانی زۆرەملێیان بە دروست دانەناوە، دەستیان بـە زاهـیری دوو حەدیسـەکە و رازینـەبوونی پێغەمبـەر بـە نرخدانانـەوە گرتـوە، لـەو رووەوە زۆر لەخەڵك کردنی تێدایە بۆ فرۆشتنی ماڵەکانیان بـە نرخێـك کـە پێـی رازی نـین، خـوای گەورەیش رێگەی بە خواردنی ماڵی خـەڵك نـەداوە بـە بازرگـانیی رەزامەندانـە نـەبێ، جمهوری شەرعزان —وەك وتمان— ئەم رایەیان هەڵبژاردوە و گوتویانـە نـرخ دانـانرێ، هیچ جیاوازی نیە لەنێوان حاڵەتی گرانی یان خۆشگوزەرانیدا، یان لەنێوان ئەوەی ئەو پێویستیەکان هی وڵاتەکە بن یان هاوردەکراو بن، ئەویش لە روانگەی دەسـتگرتن بـە راشکاوی ئەو حەدیسانە و ئەو ئەسەرەی لە عومەرەوە ریوایەت کراوە.

## زاڵکردن:

بەدیدی من رای زاڵ رای گرووپی یەکەمە لە دروستیی نرخدانانی زۆرەملێ —ئەگەر واجبیش نەبێ— لەلایەن ئیمام (یـان دەسـەڵاتی ئـارا)وە، لەبەرئـەوەی رەچـاوکردنی بەرژەوەندیی خەڵك و رێگرتن لە تێکدانی ژیانیـانی تێدایـە و هـیچ زۆرلێکردنێکـی بـۆ فرۆشیاران تێدا نیە بۆ فرۆشتن تا پێچـەوانەی خاوەنـدارێتی بـێ، بـەڵکو رێگرتنـە لـە فرۆشتن بەجیاواز لەو نرخە، بەو شـێوەیەی بەرپرسـان بـە بەرژەوەنـدی دەبیـنن بـۆ بفرۆش و بکڕ، هەروەها رێگەی قازانجکردن لە بفـرۆش نـاگرێ و رێگـەیش بـەوە نـادا

زیان بەخەڵك بگەیەنێ، پاشان نەهیكردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە نرخدانان عیللەكەی ئەوە بووە لە سەردەمی ئەودا پێویست نەبووە و هەر تەنها بەو بەرزبوونەوەی نرخەی لە مەدینە روویدا واجبی ناكا. كاتێ لە سەردەمی تابیعیندا دۆخێك هاتە پێش ئەوەی خواست فتوایان پێدا، كەس بۆی نیە وا گومان ببا ئەمە نەسخردنەوەی حەدیسە بە بەرژەوەندی، بەڵكو حەدیسەكە بەحوكمەكەیەوە باقییە، بەڵكو كاركردن بەگوێرەی ئەو حەدیسەیان راگرت كاتێ كارەكە بۆ بەرژەوەندیی گشتی كراوە بوو.

جا ئەگەر كاتێك هات خەڵك بە كردەوەی دادپەروەرانە و هاوسەنگی خۆیان كە بەرژەوەندیی شەخسی و بەرژەوەندیی گشتی یەك بخا، دەستبەرداری نرخدانان بوون، ئەوكاتە پێویستە بگەڕێنەوە بۆ كاركردن بەگوێرەی خواستی سوننە. ئەگەر لە سەردەمی پێغەمبەریشدا بازرگانان گەمەیان بە نرخ بكردایە و قووتی خەڵكیان قۆرخ بكردایە و بارودۆخی نائاساییان بقۆستایەتەوە وەك لە سەردەمی تابیعین رووی دا، ئەوا پێغەمبەر(ﷺ) نرخی ئیجباری لەسەر فرۆشیاران فەرز دەكرد، لەبەرئەوەی ئیسلام ئاینێكە هەمیشە دەیەوێ هاوسەنگی لەنێوان بەرژەوەندیی تاك و كۆمەڵگەدا دروست بكا.

پەیڕەوكردنی حوكمی نرخدانانی زۆرەملێ ئەگەر لە سەروەختی چڵێسبوونی بازرگانان لەكاتی ئاشتیدا گرنگ بێ، ئەوا لەكاتی جەنگ و پاش جەنگدا زۆر گرنگترە، كە بازرگانان هەوڵ دەدەن لەو دۆخەدا لەسەر حسابی خەڵكانیتر خۆیان دەوڵەمەند بكەن و دەست بەسەر نرخی زۆر لە كاڵاكاندا بگرن بەتایبەت پێداویستییە زەرورییەكان، بۆیە ئەركی دەسەڵاتی ئارایە دەستپێشخەری بكا بە سەپاندنی نرخدانانی زۆرەملێ و لێدانی دەستە چڵێس و قۆرخكارەكان بەدەستێكی پۆڵایین.

٢- جیاوازی لە دروستیی شایەتدانی خزم بۆ خزمەكەی:

سەعید بن مسەیب و ئەو شەرعزانەی تابیعین لە مەدینە كە هاوڕاین شایەتیدانی خزم بۆ خزمی خۆی لە باوك و كوڕ و مێر و ژن و هیتر بە دروست دەزانن. بەڵام قازی

شورەیح و ئەو شەرعزانەی تابیعین لە عێراق کە هاوڕاین، رایان وایە شایەتیدانی ئەوانە دروست نیە.

لە زوهریەوە دەگێڕنەوە وتویەتی[1]: "پێشینانی سالّحی موسلّمانان لە شایەتیدانی باوك و بۆکوڕی، کوڕ بۆ باوکی، برا بۆ برای و مێرد بۆ ژنەکەی تۆمەتبار نەدەکران. پاش ئەوە فێلّ و تەلّەکەبازی و خراپە لەناو خەلّك پەیدا بوون و هەندێ شتیان لێ دەرکەوت وای کرد دەسەلاّتداران تۆمەتباریان بکەن، هەربۆیە شایەتی ئەوەی تۆمەتبار دەکرا بەجێدەهێلّرا ئەگەر لە خزمایەتیەوە بوایە و ئەوە لە باوك و کوڕ و برا و مێرد و ژنەوە روویدا، لە کۆتایی زەماندا تەنها ئەوانە تۆمەتبار کران"[2].

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دەقەکانی قورئان سوننە دەبینین ئەم کۆت یان مەرجەیان دانەناوە (واتە ئەوەی نابێ شایەت خزم بێ)، بەلاّم کاتێ دەروونەکان گۆڕاون و باوەڕ لاواز بووە، نیشانەکانی تۆمەت دەرکەوتون، هەندێ لە شەرعزانی تابیعین لە روانگەی کارکردن بە (مەسالّیحی مورسەلە) دانانی ئەم کۆتەیان پەسەند کردوە، ئەویش لەبەر ساغنەبوونەوەی ئەو حەدیسەی لەو رووەوە هاتووە. خاوەنی (نصب الراية) دەلّێ: "شایەتیدانی باوك بۆ کوڕ، کوڕ بۆ باوك، ژن بۆ مێردی، مێرد بۆ ژنی، بەندە بۆ گەورەکەی، گەورە بۆ بەندەکەی، بەکرێدەر بۆ کرێچیەکەی قبول ناکرێ).. حەدیسێکی نامۆ (غەریبە) و بۆ سەنەد ناشێ[3].

هەروەها لەبەرئەوەی قسەکەی پێشووی زوهری کە دەلّێ (پاش ئەوە فێلّ و تەلّەکەبازی و خراپە لەناو خەلّك پەیدا بوون و هەندێ شتیان لێ دەرکەوت وای کرد دەسەلاّتداران تۆمەتباریان بکەن) ئاماژەیە بەوەی ئەو شەرعزانەی تابیعین کە لەگەلّ جائیزنەبووندا بوون پشتیان بە دەقێکی سابت نەبەستبوو، بەلّکو کاریان بە

---

[1] بروانە: إعلام الموقعين ١/ ١١٣.

[2] سەرچاوەی پێشوو، تعليل الأحكام ص ٧٥.

[3] بروانە: نصب الراية ٨٢/٤.

مەساڵیحی مورسەلە دەکرد، چونکە کاتێ نیشانەکانی تۆمەت سەریان هەڵدا بینییان ئەگەر بەو شێوەیە وازیان لێ بێنن لە قبولکردنی شایەتیدان، دەبێتە مایەی فەوتانی ماف و ڕوودانی زیان و زەحمەتی لەناو خەڵکیدا، جا بۆ لادانی ئەم خراپەیە و لە ڕوانگەی کارکردن بە بەرژەوەندی شایەتییان ڕەت کردونەتەوە و دەقەکانی شایەتیدانیان پێ تایبەت کردوە.

تێبینی دەکرێ سەعید بن مسەیب و ئەو شەرعزانەی قوتابخانەی حەدیس کە هاوڕاین، لەو ڕووەوە دەستیان بە زاهیر و عمومی حەدیس بەستوە، هەندێ لە شەرعزانیش لە پێشەوایانی مەزەبە بەکۆمەڵەکان وەك شیعەی ئیمامی ڕاکەیان وەرگرتوە.[1]

لەوانەی وتویانە شایەتیدانی ئەوانە دروست نیە قازی شورەیحە لە شەرعزانی تابیعین لە عێراق، کە سەرەتا لەگەڵ شەرعزانی مەدینە هاوڕا بوو، پاشان پاشگەز بوویەوە و حوکمی بە دروستنەبوونی دا. جمهوری شەرعزان ڕای قازی شورەیحیان پەسەند کردوە.[2]

---

[1] الخلاف للطوسي ٢/٦٢٤.

[2] فتح القدير ٧/٤٠٣ و پاشتر. المهذب للشيرازي ٢/ ٣٣٠، بەڵام لای شافیعیەت شایەتیدانی ژن و مێرد بۆ یەکتر قبول دەکرێ.

# دەروازەی چوارەم

## جیاوازیی پێشەوایانی مەزەبە فیقهیەکان لە حوکمەکاندا

## بەگوێرەی جیاوازییان لە سەرچاوە پاشکۆکاندا

پێشەوایانی مەزەبە فیقهییە بەکۆمەڵەکان پاش سەقامگیربوونیان لەسەر پەسەند و پیادەکردنی سەرچاوە پاشکۆکان کە –قورئان و سوننە بەدەر لەوانەن– ئیجماع و قیاس و قسەی سەحابی و مەسالیحی مورسەلە و ئیستیحسان و ئیستیصحاب و سەدی زەرایع و عورف و هەندێ سەرچاوەیتری پاشکۆی جێناکۆك دەگرێتەوە.

ئەم جیاوازییەیان کاریگەریی بەرهەستی هەبووە لە ناکۆکییان لە زۆر ئەحکامی فیقهیدا، کە دەقێکی زاهیر لە قورئان و سوننە لەبارەیانەوە نەهاتووە.

ئەم دەروازەیە هەشت بەش دەگرێتەوە، لە هەریەکێك لەو بەشانەدا بەکورتی و بەئەندازەی ئەوەی پەیوەندی بە بابەتی جیاوازییەوە هەبێ، باسی یەکێك لەو سەرچاوە بەناوبانگانە دەکەین.

## بەشی یەکەم:
## جیاوازی لە ئیجماعدا

دوو باس لەخۆ دەگرێ:

یەکەم لە ئیجماعی گشتیدا

دووەم لە ئیجماعە تایبەتەکاندا

### باسی یەکەم:
### ئیجماعی گشتی

کۆدەنگی (الاجماع) لەڕووی زمانەوە: واتە لێبڕان (العزم). دەوترێ: (أجمع فلان علی كذا). واتە فلان کەس بۆ ئەوە لێبڕا.

هەروەها بەمانای ڕێکەوتن دێ. دەوترێ: (أجمع القوم علی كذا). واتە ڕێك کەوتن.[1]

لە زاراوەدا: ڕێکەوتنی موجتەهیدانی ئوممەتی محەمەد(ﷺ) لە سەردەمێك لە سەردەمەکاندا پاش مردنی، لەسەر حوکمێکی شەرعی.[2]

---

[1] كشف الأسرار مع البزودي ٣/٩٤٦ التلويح على التوضيح ٢/٣٢٦.

[2] شرح التوضيح على التنقيح٢/٣٢٦.

له پێناسەکەوە ئەوە وەردەگیرێ کە دامەزرانی ئیجماع لەسەر ئەم توخمانەی خوارەوە دەوەستێ:

١- ڕێکەوتنی موجتەهیدان[1]: ڕێکەوتن یان ڕێنەکەوتنی غەیری ئەوان حسێب نیە[2]، ژمارەیەکی دیاریکراویش مەرج نیە[3].

٢- ڕێکەوتنی هەموان: ئەگەر یەك موجتەهید کۆك نەبێ ئیجماع بەمانا زاراوەییەکەی دانامەزرێ، لەبەرئەوەی پشت بەبەلگە دەبەستێ و لەوانەیە بەلگە لای جیاوازەکە بێ، بۆیە نابێ ناکۆکبوونەکەی نادیدە بگیرێ، بۆیە نابێتە بەلگەیەکی گومانبڕ ئەگەرچی ئەگەری ئەوەیشی هەیە.

٣- ئەوەیە موجتەهیدەکان لە ئوممەتی محەمەد بن و ڕێکەوتنی غەیری ئەوان حساب نیە، لەبەرئەوەی ئەوە تایبەتمەندیی ئەو ئوممەتەیە کە پارێزراوە لەوەی لەسەر هەڵە کۆدەنگ بێ.

٤- ڕێکەوتنەکە لە سەردەمێك لە سەردەمەکاندا بێ و مەرج نیە لە هەموو سەردەمەکاندا بێ، ئەگینا قەت نایەتەدی و سەردەمە بۆ پوکانەوە (انقراض) درێژ نابێتەوە بەپێچەوانەی رای هەندێ.[4]

٥- ئەوەیە ڕێکەوتنەکە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) بێ، چونکە لە سەردەمی ئەودا ئەگەر هاوڕایان بوو ئەوا حوججە ڕەزامەندیەکەی ئەوە، ئەگینا ڕێکەوتنەکە بەتاڵە.

---

[1] مەبەست لە ڕێکەوتن (الاتفاق): هاوبەشبوونە لە باوەڕ یان قسە یان کرداردا.. حاشية السعد على التوضيح٣/٣٢٦.

[2] بەپێچەوانەی هەندێ لە زانایان وەك ئەبوبەکری باقلانی کە بەرەهای دادەنێ. کۆمەڵێکیش کۆکبوونی عاممە لە ئوسوڵی شەریعەتدا دەکەنە مەرج.

[3] بەپێچەوانەی هەندێ لە زانایان وەك ئیمامی حەرەمەین کە دەڵێ: پێویستە ژمارەی موجتەهیدەکان لە حەدی تەواتور کەمتر نەبێ.

[4] وەك ئیمام ئەحمەد و هەندێ لە هاوەڵانی شافیعی.

٦- ڕێکەوتنەکە لەسەر حوکمێکی شەرعی قابیل بە ئیجتیهاد بێ، ڕێکەوتن لەسەر مەسەلەیەك قابیل بە ئیجتیهاد نەبێ، یان لەسەر مەسەلەیەکی ئەقڵی یان زمانەوانی، بە ئیجماع دانانرێ بە مانا زاراوەییەکەی، جمهور نەشیانکردوە بە مەرج ئەو ڕێکەوتنە لە هەمووانەوە بەڕاشکاوی بێ، بەڵکو دەکرێ لە هەندێکەوە تەنها بەناوەکی (ضمني) بێ، بەوەیش ئیجماع لەلایان دوو جۆرە: ڕاشکاو (صريح) و بێدەنگ (سكوتي).

٧- پێش لەو ئیجماعێك نەبوبێ لەسەرڕایەکی جیاواز لەو.

ئیجماعیش یان ڕاشکاوە بەوەی هەرکەس ڕای خۆی بەڕاشکاوی دەربڕێ، جا چ لە مەجلیسێکدا کۆببنەوە یان هەندێ ئامادە بن و هەواڵی حوکمەکە بگاتە ئەوانیتر و ڕاشکاوانە پێی ڕازی بن، وەك ئیجماعی هاوەڵان لەسەر خیلافەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێ). یان بێدەنگ (واتە سکوتییە)، ئەویش ئەوەیە هەندێکیان ڕا لە مەسەلەکەدا بدەن و ئەوانیتر بێدەنگ بن، بێدەنگیەك کە قەرینەی ڕازیبوون یان نەیاربوونی لەگەڵ نەبێ، بەو مەرجەی پاش ماوەیەك بێ کە بەشی ئەوە بکا لە مەسەلەکە بکۆڵرێتەوە.

## ناکۆکی لەبارەی ئیمکانی دامەزراندنی ئیجماع و حوججەبوونی:

لەڕووی ئەقڵیەوە ئیمکانی کۆدەنگبوون ناکۆکی لەسەر نیە، لەبەرئەوەی ئەقڵ لاری نیە لە تەسەورکردنی ڕێکەوتنی موجتەهیدان لە سەردەمێکدا لەسەر حوکمێك لە حوکمەکان، هیچ ناکۆکیش نیە لە شیانی لە زەروریاتی حوکمەکاندا، هەروەها هیچ ناکۆکی نیە لە حوججیەتی کۆدەنگیی هاوەڵان بەر لە دابەشبوونی موسڵمانان و بەر لە بڵاوبوونەوەی هاوەڵان لە وڵاتانی ئیسلامیدا.

بەڵکو ناکۆکی لەسەر ئیمکانی ڕوودانیەتی لەناو غەیری هاوەڵاندا لەو حوکمانەی کە بەزەرورەت زانراو نین، بەوەی کۆدەنگیەکە لە ڕوانگەی بەڵگەیەکی گومانگر (ظني)ەوە بێ.

ئـەوەیش دەڵـێ کـۆدەنگی دانامـەزرێ و لەوێیشـەوە بەحوججـەی دانـانێ، چـەند بەڵگەیەکی هەیە، لەوانە:

١- کۆکبوونی موجتەهیدان لەسەر حوکمێك کە بە زەرورەت زانراو نەبێ عادەتەن مەحاڵە، وەك چۆن رێکەوتنیان لەیەك ساتدا لەسەر خواردنێك و قسـەکردنیان بەیەك وشە مەحاڵە.

٢- کۆکبوونیـان لقێکـە لـە یەکسـانبوونیان لـە گواسـتنەوەی حوکمەکـە بۆیـان، بڵاوبوونەوەیشـیان لـە وڵاتانـدا رێگـرە لـە گواسـتنەوەی حوکمەکـە بۆیـان، ئەوەیش بەگوێرەی عادەت.

٣- کۆکبوونیـان یـان لـە روانگەیـەکی گومـانبڕەوە دەبـێ یـان گومـانگر و هەردووکیشیان بەتاڵن، هەرچی گومانبڕە لەبەرئەوەیە عادەت نەگواستنەوەی ئیحالە دەکا، ئەگەر هەبوایە دەگوێزرایەوە، جا کاتێ نەگوێزراوەتـەوە زانـراوە کە نەبووە، ئاخر ئەگەر بگوێزرایەتەوە پێویست بە ئیجماع نەدەما.

هەرچی گومانگرە لەبەرئەوەی لەبـەر جیـاوازیی تێگەیشـتن و تێـڕوانین بـەعادەت رێکەوتن لەسەری ناکرێ، وەك رێکـەوتنیان لەسـەر خـواردنی جـۆرێکی دیـاریکراو لـە میوە لە یەك کاتدا، کە بەزەرورەت شتی وا ناکرێ ئەویش لەبەر جیاوازیی هۆ یـاخود پاڵنەر.

بەڵام جمهور رای وایە بەعادەت مومکینە و بەکردەوەیش رووی داوە و بە کیتاب و سوننە و ماقوڵیش حوججەیە.

هەرچـی روودانیـەتی بـەکردەوە: هەنـدێ کـۆدەنگی هـەبوون کـە نـاکرێ بـیر لـە نکوڵیکردنیان بکرێتەوە، لەوانە: ئیجمـاع لەسـەر ئـەوەی ئـاو ئەگـەر یـەکێك لـە سـێ وەسفەکانی (رەنگ و تام و بـۆنی) بەپیسـیەك گـۆڕان، دروسـت نیـە دەسـتنوێژ یـان وسڵی پێ بکرێ[١]. ئیجماع لەسەر حەجبکردنی کوڕی کوڕ بە کوڕ لە میراتدا. ئەمانـە و

[١] سبل السلام ٩١/١ العدة ٧٨/٢.

هەندێ حوكمیتر لەو حوكمانەی هەمووان لەسەریان كۆكن، رووداتیش بەڵگەی ئیمكانە، هەرچی حوججیبوونیەتی بە قورئان و سوننە و ماقوڵ ساغ بۆتەوە:

أ- كیتاب (قورئان): جمهور زۆر ئایەتیان بەبەڵگە هێناوەتەوە لەوانە: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾[1]، لەبەرئەوەی بە گوتراو هەڕەشە دەكا لە شوێنپێ هەڵگرتنی جگە لە رێگەی موسڵمانان، رێگەی ئەوانیش بریتییە لە رێكەوتن و بۆدەنگی لەسەر حوكمی شەرعی و بە مەفهوم بەڵگەیە لەسەر حوججیەتی ئیجماع.

ب- سوننە: نزیكترین رێگەیە لە سەلماندنی ئەوەی ئیجماع حوججەیەكی گومانبڕە، لەوانە ئەو فەرمودانەی پێغەمبەرە(ﷺ) كە گەورە هاوەڵان ریوایەتیان كردوە، لەولنە ئەوەیە تەرموزی لە ئیبن عومەر ریوایەتی كردوە: ((لا يجمعُ اللهُ تعالَى هذه الأمَّةَ على ضلالةٍ أبدًا ، ويدُ اللهِ مع الجماعةِ، واتَّبعوا السَّوادَ الأعظمَ، فإنَّه من شذَّ شذَّ في النَّارِ)).[2]

هەروەها حاكم بەم شێوەیە ریوایەتی كردوە ((لا يجمع الله هذه الأمة على ضلالة ويد الله مع الجماعة)).[3] هەروەها بەم لەفزەیش ریوایەتی كردوە: ((سألت الله عز وجل أن لا تجتمع أمتي على ضلالة فأعطانيها)).[4]

ئەم حەدیسانە و هیتر كە ئەو مانایەیان هەیە، ئەگەرچی هەریەكەیان هەواڵێكە دەكرێ درۆی تێ بكەوێ، بەڵام هەموو كەسێكی ژیر لە كۆی هەموویان زانیاریی زەروری لەلا گەڵاڵە دەبێ.

---

[1] النساء/١١٥

[2] روى بألفاظ متقاربة رواها الترمذي عن ابن عمر وخرجها الترمذي وقال في بعضهم غرلبة ورواها أبو نعيم كشف القناع ص ٨٤.

[3] التقرير والتحبير ٣/٨٥.

[4] سەرچاوەی پێشوو.

ج- ماقول! (المعقول): کۆدەنگیی ژمارەیەکی زۆر لە موجتەهیدان لەسەر حوکمێك لە حوکمەکان عادەتەن بەمەحاڵ دادەنرێ، تا بەڵگەیەکی گومانبڕیان نەبێ کە لەپێناویدا لەسەر ئەوەی ئاماژەیە بۆی کۆدەنگ بووبن.

بەبڕوای من ئیجماع لەو ڕووەوە بەڵگە و سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی حوکمە شەرعیەکانە ساغ بووەتەوە و دەکرێ لە هەموو سەردەمێکدا ڕووبدات، ڕوویشی داوە و وەك پێشتر باس کرا بەڵگە لەسەر حوججەبوونی گومانبڕی لە قورئان و سوننە و ماقوڵ دروست بووە.

هەرچی ئیمکانی دامەزرانیەتی، ئەوا بۆ ڕابردوو شتێکە پێویستی بە ڕوونکردنەوە نیە، چونکە کۆدەنگیی زۆر لەلایەن موجتەهیدانی هاوەڵان و هیترەوە ڕووی داوە، وەك کۆدەنگییان لەسەر دانی شەشیەکی میرات بە داپیرە، هەروەها بەتاڵیی شووکردنی ئافرەتی موسڵمان بە ناموسڵمان و کۆکردنەوەی قورئان و هیتر.

بۆ ئەم سەردەمەیشمان بەهۆی بوونی ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی خوێنراو و بیستراو و بینراوەوە (دروستبوونی کۆدەنگی) لە هەرکاتێکی پێشوو ئاسانترە، بۆ نموونە لە وەرزی حەجدا کاتێ نوێنەرانی دەوڵەتانی ئیسلامی لەوانەی ئەهلیەتی ئیجتیهادیان هەیە کۆدەبنەوە، دەکرێ ڕووداو و کێشەکانی موسڵمانان لە بوارە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەکان، هەروەها لە بواری پەیوەندیەکانی دەوڵەتانی ئیسلامی لەنێوانیان لەلایەك و نێوان ئەوان و دەوڵەتانیتر لەلایەکیترەوە، گەنگەشە بکەن، پاشان دەرکردنی بڕیاری شەرعی لەبارەیانەوە لەلایەن زانایانی موسڵمانەوە لەوانەی ئامادەی کۆنگرەکە دەبن، پاشان ڕاگەیاندنی بە باقیەکەی لەڕێی هۆیەکانی ڕاگەیاندنەوە بەمەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی هەمووان لەسەریان، ئیجماعیش هەر ئەم ڕێکەوتنە دەگەیەنێ.

## باسی دووەم:
# ئیجماعە تایبەتەکان

### أ- ئیجماعی ئالی بەیت (ئەهلی عیترە):

شیعەی ئیمامی تێگەیشتنێکی تایبەتیان بۆ ئیجماع هەیە جیاوازە لە ئیجماع بەو مانایەی پێشوو لای جمهور، چونکە لای ئەوان بریتییە لە کۆدەنگیی کۆمەڵێك کۆکبوونیان رای مەعسوم ئاشکرا دەکات، چونکە کۆکبوونی هەموویان ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە لە سەرۆکەکەیان وەرگیراوە.[1]

لەمەوە سێ شت وەردەگیرێ:

١- پێویستیی کۆکبوونی کۆمەڵێك کە باوەڕیان بە بوونی مەعسوم و بەوە هەبێ کە هیچ سەردەمێك لەو خاڵی نابێ جا بەبینراوی و دیاری بێ یان بە شاراوەیی و نادیاری.

٢- کۆکبوونی جگە لە تایفەی ئیمامی، ئەگەر ئەوانی تێدا نەبن، بەکۆکبوونێك دانانرێ ئیجماعی پێ بێتەدی.

٣- حوججیەت لە ئیجماع خۆیدا نیە، بەڵکو لە قسەی ئیمامی مەعسومدایە کە ئەو ئیجماعە ئاشکرای دەکات. حیللی دەڵێ: "ئیجماعی ئوممەتی محەمەد هەقە، بەڵام لەسەر قسەی ئێمە رواڵەتییە، لەبەرئەوەی لای ئێمە بوونی مەعسوم لە هەموو سەردەمێکدا واجبە، کە گەورەی ئوممەتە و حوججە لە قسەی ئەودایە".[2]

---

[1] بڕوانە: القوانين المحكمة، الباب السادس، طبع حجر ايران، لاپەڕەکانی ژمارەیان نیە.

[2] مبادئ الوصول الى علم الاصول ص١٩٠.

بەڵام هەڵوێستی شیعەی زەیدی تا رادەیەك لە هەڵوێستی ئیمامی مالیك دەچێ لە پەسەندکردنی دوو جۆر لە ئیجماعدا: یەکەم: ئیجماعی موجتەهیدانی ئوممەتی محەمەد (ﷺ)، کە ئەوە رای جمهورە، دووەمیان: ئیجماعی ئالی بەیتە (ئەهلی عیترە)، کە شیعەی ئیمامی دەستیان پێوە گرتوە، بەڵام جۆری دووەمی ئیجماع رای هەمووی لەسەر نیە، بەڵکو زۆریەیان لەگەڵی بوون.[1]

هەروەها لەوەدا لەگەڵ شیعەی ئیمانی جیاوازن کە لای ئەوان حوججیەت لە ئیجماع خۆیدایە، چونکە سەرچاوەیەکی سەربەخۆیە و لە قسەی مەعسومدا نیە. ئەو شیعانەی دەڵێن ئیجماعی ئەهلی عیترە حوججەیە پشت بە کیتاب و سوننە و مەعقول دەبەستن.

أ- هەرچی کیتاب (قورئان)ـە ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾.[2] رووی بەڵگەبوونەکەی: خوا بە "انما" -کە بۆ حەسە- باسی لەوە کردوە کە پیسی (رجس) لە ئالی بەیتدا نەماوە. هەڵەکردن یان گومڕاییش لە ریجسن، واتە لەوانە دوورن.[3]

ب- هەرچی سوننەیە پشت بە هەندێ حەدیس دەبەستن کە لە کتێبە (صحیح)ەکاندا نین، لەوانە دەڵێن: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: "اني تارك فيكم الثقلين، فيان تمسكتم بهما لن تضلوا: كتاب الله و عترتي". جا پێیان وایە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حوججە تەنیا لەو دوانەدایە.

ج- مەعقول: ئەوەیە ئالی بەیت بەتایبەت شەرەف و رەچەڵەکیان پێ بەخشراوە و ئەالی بەیتی پەیامەکە و کانزای پێغەمبەرایەتی و بە هۆکانی دابەزین و زانینی تەئویل و کردار و گوفتارەکانی پێغەمبەر ئاشنان و بەپێی ئەو ئایەتە لە هەڵە پارێزراون،

---

[1] معيار العقول في علم الاصول، مخطوطة دار الكتب المصرية، ورقة رقم ٩٣.

[2] الأحزاب/٣٣.

[3] الاحكام في اصول الاحكام للامدي ١/١٨٢.

لەبەرئەوە گوفتار و کردارەکانیان حوججەیە لەسەر غەیری خۆیان، بگرە قسەی یەکێکیان حوججەیەکی زەرورە لە پارێزرانیدا لە هەڵە وەك گوفتار و کردارەکانی پێغەمبەر وایە.

ئەم بەڵگانە قسەیان لەسەر کراوە، بەوەی (رجس) هەڵە نیە لەبەرئەوەی (رجس) گوناه یان سزا یان هەموو شتێکی قیزەون و درێوە. پاشان مەبەست لە ئەالی بەیت هاوسەرەکانی پێغەمبەرە، ئەویش بە قەرینەی جێبەند و ئەوەی بەدوایدا هاتووە. هەرچی جێبەند (سیاق)ـە ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَاءِ..﴾.[1] هەرچی ئەوەیشە بەدوایدا هاتووەی ئەوەیە ئەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾.[2] حەدیسەکە ساغ نەبووەتەوە، خۆ ئەگەر بە راستیش دابنرێ مەبەست لە (الثقلين) قورئان و سوننەیە، نەك قورئان و عیترە، چونکە هیچ بەڵگەیەك نیە تایبەتبوونیان بە شەرەف و رەچەڵەکەوە پەیوەندی بە ئیجتیهاد و هەڵێنجانی ئەحکام لە سەرچاوەکانیانەوە هەبێ، بەڵکو لەوەدا سەنگی مەحەك شیاوییە بۆ وردبوونەوە و بەڵگەبەندی و زانینی سەرچاوەکانی شەریعەت، کە ئەوەیش شەرەف و خزمایەتی رۆڵی تێدا نابینێ.

## ب- ئیجماعی خەڵکی مەدینە:

ئیمام مالیك و ئەو هاوەڵانەی کە هاوڕاین پێیان وایە کۆکبوونی خەڵکی مەدینەیش بەئیجماع و سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی یاساداناانی ئیسلامی دادەنرێ لەپاڵ ئیجماعە گشتیەکەدا. بەڵگەیش ئەوەیە قەرافی سەرچاوەکانی تەشریعی بەم شێوەیە هێناوە: "بەڵگەکان بریتین لە: کیتاب، سوننە، ئیجماعی ئوممەت، ئیجماعی خەڵکی

---

[1] بڕوانە: ارشاد الفحول للشوكاني ص ٢.
[2] الأحزاب/ ٣٢.

مەدینە، قیاس، قسەی صەحابی، مەساڵیحی مورسەلە و ئیستیصحاب و هتد".[1]

بەڵام ئەوەی لەلایەن هەندێ لە زانایانی وەك غەزالیەوە دراوەتە پاڵ ئیمام مالیك كە حوججیەت تەنها لە ئیجماعی خەڵكی مەدینەدا دەبینێ، راست نیە، چونكە مالیك وەك چۆن كۆدەنگیی خەڵكی مەدینەی بەئیجماع داناوە، لەپێشتر دانی بە ئیجماعی ئوممەتدا ناوە، لەبەرئەوەی ئیجماعی موجتەهیدانی ئوممەت ئیجماعی خەڵكی مەدینەیش دەگرێتەوە، بەڵگەیش ئەوەیە بەئەهلی ئیجماع دەڵێن (ئەهلی حەل و عەقد).[2]

پاشان ئیجماعی خەڵكی مەدینە كاتێ جێی ناكۆكییە لەنێوان مالیكی و جمهور كە بەتەنها بن، بەڵام ئەگەر لەناو جمهوردا بن بەوەی ئیجماعەكەیان لە چوارچێوەی ئیجماعی گشتیدا بێ، ئەوا هیچ ناكۆكی لەوەدا نیە.

بەڵام لەبارێكدا بەتەنها بن، مالیك وتوێتی ئەگەر لەسەر حوكمێك ئیجماعیان هەبوو پێویستە كاری پێبكرێ و ناكۆكیی غەیری ئەوان هیچ نرخێكی نابێ.

غەیری مالیكیەت لەبارەی مەبەستی ئیمام مالیك لەوەی دەڵێ: "اجماع اهل المدینة حجة" ، رایان جیاوازە.

هەندێ لە شەرعزانی مالیك وتویانە: مەبەستی لەو شتانەدا بووە كە رێگەی، گواستنەوەی بەلێشاوە وەك صاع و مود و بانگ و قامەت و واجبنەبوونی زەكاتە لە سەوزەواتدا.. كە وا باو بووە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) هەبووە، ئەگەر لەوەی لەسەری بوو بگۆڕایە دەیزانی.

هەرچی مەسەلەكانی ئیجتیهادە ئەوان و غەیری ئەوان وەك یەكن، قازی لە (التقریب)دا ئەمەی لە ئەبهەریی شێخی گێڕاوەتەوە.[3]

---

[1] الأحزاب/ ٣٤.

[2] سەرچاوەی پێشوو. ل٣٢٢.

[3] بڕوانە: ارشاد الفحول للشوكاني ص ٢.

کۆمەڵێك، لەوانە ئیبن بەکیر وتویانە: کۆکبوونی خەڵکی مەدینە ئیجماع و حوججەیە بەڕەهایی چ لە راوە بێ یان قیاس یان گواستنەوە.[1]

جورجانی دەڵێ: مالیك مەبەستی تەنها کۆکبوونی حەوت شەرعزانەکە بووە.

هەندێ پێیان وایە: قسەکەی مالیك وا وەردەگیرێ کە ریوایەتی خەڵکی مەدینە پێش ریوایەتی غەیری ئەوانە[2]. شافیعی لە (التقدیم)دا ئاماژەی بەمە داوە.[3]

ئەوانەی لایەنگری بۆچوونەکەی مالیکن لەبارەی حوجیبوونی ئیجماعی خەڵکی مەدینە پشتیان بە دەق و ماقوڵ بەستووە:

أ- دەق: پێغەمبەر فەرمویەتی: (ان المدینة طیبة تنفي خبثها کما ینفي الکیر خبث الحدید)[4]. (واتە مەدینە پاکە و پیسیەکەی رادەماڵێ وەك چۆن کورە پیسی ئاسن رادەماڵێ).

بەڵگەبوونەکەی ئەوەیە هەڵە لە پیسی (خبث)ـە، مەدینەیش لەوە دوور خراوەتەوە.[5]

ب- ماقوڵ: لە سێ رووەوە بەڵگەیان هێناوەتەوە:

١- مەدینە خانەی کۆچ و گڵکۆی پێغەمبەر(ﷺ) و دابەزگەی وەحی و ئۆقرەگەی *ئیسلام و کۆڕی هاوەڵانە، بۆیە ناکرێ هەق لە قسەی خەڵکەکەیدا نەبێ.*

٢- خەڵکی مەدینە دابەزینی وەحییان دیوە و گوێیان لە تەئویل بووە و لە هەموو کەس زیاتر بە حاڵی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشنا بوون، بۆیە پێویستە هەق لێیان دەرنەچێ.

---

[1] الإحكام في أصول الأحكام لابن حزم٤/٥٠٧.

[2] مختصر المنتهى لابن الحاجب مع العضد والسعد٢/٣٥.

[3] إرشاد الفحول، سەرچاوەی پێشوو.

[4] الحديث روى بروايات مختلفة منها حديث جابربن عبد الله بانما المدينة كالكير تنفى خبثها وينصع طيبها، تنوير الحوالك شرح الموطا مالك ٣/٨٤.

[5] الاحكام للأمدي ٣/١٨١ شرح تنقيح الفصول ص ٣٣٤.

٣- ریوایـەتی خـەڵکی مەدینـە پـێش ریوایـەتی غـەیری ئـەوان دەخـرێ، بۆیـە ئیجماعیان حوججەیە لەسەر غەیری ئەوان.

ئەم بەڵگانە قسەیان لەسەر کراوە بەوەی ئەگەرچی دەق ئاماژەی تێدایە بۆ پاکیی مەدینە لە پیسی، بەڵام ئەوە ناگەیەنێ هەرچی لێیەوە دەرچێ لە پیسی پاك دەبێ، هەروەك ئـەوە ناگەیـەنێ کـە ئیجمـاعی خـەڵکی مەدینـە حوججـە بـێ، تایبـەتکردنی مەدینـەیش بـە باسـکردن بـۆ دەرخسـتنی شـەرەفی و روونکردنـەوەی گرنگـی و جیاکردنەوەی بووە لە غەیری خۆی. هەروەها خاوەنبوونی مەدینـە بـۆ ئـەو سـیفەتە فەزڵبەخشانە بەڵگە نیە لەسەر نەبوونی فەزیڵەت لای غەیری ئەو، هەروەك بەڵگە نیـە لەسەر کردنی ئیجماعی خەڵکەکەی بەبەڵگە هاوشێوەی مەککـەی موکەڕەمـە، بـەڵکو ئەسڵ زانستی زانایان و ئیجتیهادی موجتەهیدانە و بیقـاع هـیچ کاریگەریـەکی لـەوەدا نیە، هەروەها بەڵگـە نیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەهلی عـیلم لـە (ئـەهلی حـەل و عەقـد) و ئەوانەی قسەیان حوجەیە لەواندا حەسر بووە بەوەی لە وڵات و مەملەکەتەکانـدا بـڵاو بوونەتەوە و هەموویان سەبارەت بە تێڕوانین و ئیعتیبار وەك یـەکن. ریوایـەت زۆریـی راویـەکی دەسـتبانی دەکـا، بۆیـە پێویسـتە هـەر موجتەهیـدێك دەسـت بەقسـەی زۆرترینەوە بگرێ پاش یەکسانبوون لە هەموو سیفەتە موعتەبـەرەکان لـە ریوایەتـدا. بەپێچەوانەی ئیجتیهاد کە پێویست نیە لەسەر هیچ موجتەهیـدێك کـە نـە دەسـت بـە قسەی زۆرترەکەیان نە هی یەکێکیشیانەوە بگرێ.

پاشـان ریوایـەت سەرچـاوەکەی بیسـتن و روودانـی رووداوە گێڕدراوەکانـە لـە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)، خەڵکی مەدینە لە خـەڵکیتر زیـاتر بەوانـە ئاشـنا بـوون. بـەڵام ئیجتیهـاد ڕێگـەی تێـڕوانین و لێکۆڵینەوەیـە بـە دڵ و ئیسـتیدلال بـە حـوکم، ئەوەیش بە جیاوازیی شوێنەکان ناگۆڕێ.

لەم روانگەوە نە ئیجماعی خەڵکی مەدینە نە مەککە و نە بەسرە و نە کوفە بە حوججە لەسەر نەیارەکانیان حسێب نیە.[1]

**زاڵکردن:**

بە دیدی من رای زاڵ ئەوەیە ئیمام مالیك مەبەستی لە ئیجماعی خەڵکی مەدینە لەوەدا بووە کە رێگەکەی (تەوقیف)ـە. بەڵگەیش ئەوەیە قەرافی —لەمیانی بەڵگەهێنانەوە لەسەر حوججیەتی ئیجماعی خەڵکی مەدینە— دەڵێ: "پاشینانیان لە پێشینانیان و زۆڵەکانیان لە باوکانیان دەگوێزنەوە، بەوەیش هەواڵەکە لە هەواڵی گومان و و مەزەندەکردنەوە بەرەو هەواڵی یەقین دەردەچێ".[2]

هەروەها ئەوەی ئەبو عەبدوڵای تەلمەسانی مالیکی دەڵێ کە ئیجماعی خەڵکی مەدینە لای مالیك (رەحمەتی خوای لێبێ) حوججەیە، لەوەیشدا غەیری خۆی نەیاری بوون، بۆ نموونە: بەبەڵگەکردنی هاوەڵانمان بۆ ئیجماعیان لە بانگدان و مود و صاع و هیتر لە گوێزراوە بەردەوامەکان (کە بوونیان زۆر دووبارە دەبێتەوە).[3]

دیسان ئەوەی لە ئەلباجییەوە گوێزراوەتەوە کە مەبەستی لە حوججەبوونی خەڵکی مەدینە لەوەدا بووە کە رێگەکەی گواستنەوەی بەلێشاو (النقل المستفيض)ـە وەك صاع و مود و بانگ و قامەت و واجنەبوونی زەکات لە سەوزەواتدا، کە عادەت وادەحو لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا بن.

[illegible] بووەود ئەمە مەبەستی ئیمام مالیك بووە وەك لە شیکردنەوەی هاوەڵانی دەحویرینەوە— ئەوا رای راجیح کە پێویستە دەستی پێوە بگیرێ ئەوەیە ئیجماعی خەڵکی مەدینە لەوەدایە کە رێگەکەی گواستنەوەیە، چونکە ئەوکاتە وەك سوننەی جەمینەیە (السنة المتواترة). بەڵام پێویستە ئەوە نە ئیجماعی خەڵکی

---

[1] بڕوانە: الإحكام في أصول الاحكام للآمدي ٣/١٨١ـ١٨٢

[2] شرح تنقيح الفصول للقرافي ص ٣٣٤.

[3] مفتاح الوصول في علم الاصول ص ٢٠٢.

مەدینە لە سەردەمی هاوەڵان و تابیعیندا حەسر بکرێ و ئیجماعێك بێ لەگەڵ دەقی قورئان یان ئیجماعی ئوممەتدا لێك ئەدا.

ئیجماع لای زاهیری و خەواریج:

ئیبن حەزمی زاهیری حەقیقەتی ئیجماعی نە بە سنوور و نە بە رەسم دیاری نەکردوە بەڵام وتویێتی ئەحکامی ئاین لە قورئان و سونەن لە دوو شت بەدەر نیە کە سێیەمی نیە، یان وەحیەکی جێگیرکراوە لە مەسحەفدا کە قورئانە یان وەحیەکی ناجێگیرکراوە لە موسحەفدا کە ئەویش بەیانی پێغەمبەرە(ﷺ)، پاشان ئەوەیش دەبێتە سێ بەشەوە چوارەمی نیە:

١- ئەوەیە ئوممەت هەمووی چەرخ دوای چەرخ گواستویەتیەوە وەك ئیمان و نوێژەکان و رۆژوو و ئەو جۆرە شتانە. ئەمە ئیجماعە و لەم بەشەدا شتێك نیە ئیجماعی لەسەر نەبێ.

٢- یان ئەوەی بە جەمینە گوێزراوەتەوە وەك زۆر لە سونەنەکان کە لەوانەیە ئیجماع لەسەر هەندێ لەوانە هەبێ، یان لەوانەیە جیاوازی لەسەری هەبێ وەك نوێژی پێغەمبەر بەدانیشتن بە هەموو هاوەڵانی ئامادەبووی، هەروەها وەك دانی خەیبەر بە جولەکە بەنیوەی بەرهەمەکەی.

٣- یان ئەوەی جێباوەڕ لە جێباوەڕی گواستوتەوە تا دەگاتە پێغەمبەری خوا، هەندێکی ئیجماع لەسەر گوتنی هەیە، هەندێکیشی جیاوازی لەسەرە، ئەمە واتای ئیجماعە کە جگە لەوە هیچ ئیجماعێکیتر لە دیانەتدا نیە.[1]

لە قسەکەی سەرەوەی ئیبن حەزم ئەوە وەردەگیرێ کە: ئیجماع لەڕاستیدا ئەوەیە ئوممەت هەمووی چەرخ دوای چەرخ گواستویەتیەوە وەك ئیمان و نوێژە فەرزەکان و کاتەکانیان و ژمارەی رکاتەکانیان، رۆژوو و مانگ و کاتەکەی...، حەج و

---

[1] بروانە: الإحكام في أصول الأحكام لابن حزم ٤/٥٠٥ و پاشتر.

کـات و روکنـەکانی، بـەم شـێوەیە هەرچـی بـەزەرورەت لـە ئـاین زانرابـێ. ئەمەیـە حەقیقەتی ئیجماع بەو شێوەیەی ئیبن حەزم لێی تێگەیشتووە. دەڵێ: ئـەبو سـلێمان و زۆر لە هاوەڵانمان وتویانـە ئیجمـاع نیـە جگـە لـە ئیجمـاعی هـاوەڵان، لەبەرئـەوەی تـەوقیفیان لـە پێغەمبـەری خـواوە بینیـوە. هـەروەها سـەلماوە ئـەوە ئیجمـاعی ئیماندارانە و ئەوە ئیجماعی یەقینییە. هەرچی سەرجەم سـەردەمەکانی پـاش ئەوانـە بەشێك لە ئیماندارانن نەك هەموویان و ئیجماعی هەندێ لە ئیماندارانیش ئیجمـاع نیـە. هەروەها لەبەرئەوەی ئەوان بەژمارە کەم بوون و دەکرا هەموو بناسرێن و قسـەکانیان بزانرێ، بەڵام پاش ئەوان بەو شێوەیە نیە.[1]

پوختـەی قسـان ئەوەیـە ئیجمـاعی بایەخـدار (موعتەبـەر) لای مـەزەبی زاهـیری ئیجماعی هاوەڵانە. خەواریجیش لەگەڵ زاهیری هـاوڕان کـە تـەنها ئیجمـاعی هـاوەڵان حوججەیە، بەڵام لەوەدا لێیان جیان کە حوججیـەتی ئیجمـاعی هـاوەڵان هـی پـێش کوژرانی عوسمانی کوڕی عەفان و قبـوڵکردنی عـەلی کـوڕی ئـەبوتاڵیب بـۆ تـەحکیم و ڕوودانی دووبەرەکییە. بەڵام پـاش ئـەوە کـۆدەنگی، تـەنها کـۆدەنگیی تایفەکەیانـە، لەبەرئەوەی تایفەکەیان بوو کە لەسەر هەق دامەزراو بوو و غەیری ئەوان بەلای بەتاڵدا لایان دا و ئیجماع لە ئەهلی هەقەوە نەبێ نابێ.

ئاشکرایە بانگەشەکردنیان بـە قەتیسـبوونی هـەق لـە تایفەکـەیان و قەتیسـبوونی بەتاڵ لە غەیری ئەواندا گومانێکی بێ بەڵگەیە، بگرە بەڵگە لەدژی هەیە.

بەڵام زاهیریش کۆدەنگیی هاوەڵان بەحوججە نابینن تا پـێش بڵاوبوونـەوەیان لـە وڵاتانی ئیسلامی، مێژووی ئەوەیش بۆ پاش مردنی گەورەمان عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) دەگەڕێتـەوە. تێبینـی دەکـرێ کـەس لـە موسـڵمانان لـەبارەی کـۆدەنگیی هـاوەڵان جیاوازی نیە لەوانەی بزانن ئەو کۆدەنگییە لە سەردەمی خۆیاندا دروسـت بـووە، بـەو

[1] سەرچاوەی پێشوو.

شێوەیە ناکۆکیی زاهیری لەگەڵ جمهور لە چوارچێوەی کۆدەنگیی جگە لە هاوەڵاندا قەتیس دەبێ.

لەم خستنەڕووەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەکەی ناکۆکیی زانایان لە ئوسوڵناس و شەرعزان لەبارەی حوججیەتی ئیجماع بۆ ناکۆکی یان لەبارەی شوێنی دامەزران یان دانەمەزرانی دەگەڕێتەوە. ئەو ئیجماعەی یەکێك لە لایەنە ناکۆکەکان ئیدیعای دەکا بەلای لایەنەکەیترەوە ئیسپات نەبووە، بەڵام ئەگەر سبوتی دامەزرانی لای بەدیهات، ئەویش وەك ئەو لایەنەی باسی ئیجماعەکە دەکا دەیڵێ.

لە ناکۆکی لەم ئەسڵەوە جیاوازبوون لە هەندێ مەسەلەی فیقهی کەوتۆتەوە، لەوانە:

جمهور پێی وایە ئیجماع دامەزراوە لەسەر ئەوەی نەفەقەی ژن لەسەر مێردەکەیەتی جا چ هەژار بێ یان دەوڵەمەند. لەکاتێکدا مەزەبی زاهیری پێی وایە ئەو ئیجماعە وجودی نیە لەبەرئەوە بۆ ئەوە چوون کە نەفەقەی مێردی هەژار لەسەر ژنە دەوڵەمەندەکەی واجبە. ئیبن حەزم دەڵێ: ئەگەر مێرد نەیتوانی نەفەقەی خۆی بکات و ژنەکەی دەوڵەمەند بوو، داوای لێدەکرێ خەرجی مێردەکەی بکێشێ و داوایشی لێ نەکاتەوە".[1]

بەڵگەیشیان ئەوەیە خوا ئەفەرموێ: ﴿... وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ... تا ... وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾[2]. وتویانە ژنیش میراتگرە، بۆیە بەدەقی قورئان لەسەریەتی نەفەقەی مێردی هەژاری بکێشێ.

زانراوە باپیری راستەقینە خوشك و برای هەقودا یان باوکی لە میرات بێبەشی ناکەن، بەڵکو بەرای هەندێ لەگەڵیان بەش دەکا، یان بەرای هەندێکیتر ئەوان بێبەش (حەجب) دەکا ئەویش بە ئیجماعی دامەزراو لەسەر ئەوەی باس کرا، لەکاتێکدا

---

[1] بڕوانە: المحلى ١٠/٩٢طبعة منير.

[2] البقرة : ٢٣٣

هەندێك پێیان وایە باپیر برا و خوشکی هەقودا یان باوکی بێبەشی دەکەن، وەك کە ئەوە رای عەبدوڕەحمان بن غەنەمە کە لە هاوەڵانە و دەڵێ ئەو لەگەڵیان میرات نابا.
ئیبن حەزم دەڵێ: (لای هەندێ لە هاوەڵان باپیر جێی باوك ناگرێتەوە. لای هەندێکیتریان لەگەڵ خوشك و براکان بەش دەکا. لە عەبدوڕەحمان بن غەنەمەوە دەگێڕنەوە کە لەگەڵ خوشك و براکان میرات نابا بەڵکو لە میرات بێبەش دەکرێ).[1]

جمهور پێی وایە ئیجماع هەیە لەسەر حەرامکردنی مارەکردنی کچ بەسەر پووریدا (خوشکی باوك و دایکی) وەك پێشتر باس کرا. لەکاتێکدا شیعەی ئیمامی و خەواریج باوەڕیان بەوە نیە، لەبەرئەوەی لای ئەوان ئەو ئیجماعە دانەمەزراوە. ئیبن حەزم لە (المحلي)دا قسەی هاوشێوەی ئەوانی لە (عثمان البتي) دەگوێزێتەوە.[2]

جمهوری شەرعزان پێیان وایە ئیجماع[3] لەسەر حەرامکردنی زەواجی موتعە پاش ئیباحەکردنی، دامەزراوە، بەڵام شیعەی ئیمامی پێیان وایە فیرقەکەیان ئیجماعیان هەیە لەسەر مانەوەی حوکمی دروستیی موتعە. تووسی دەڵێ: مارەکردنی موتعە لای ئێمە موباحی جائیزە و شێوەکەی ئەوەیە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە مارەییەکی دیاریکراو عەقدی لەگەڵ بکا، ئەگەر ماوە دیاری نەکرا عەقدەکە هەمیشەیی دەبێ، بەڵام ئەگەر باسی ماوە کرا و مارەیی دیاری نەکرا عەقدەکە بەتاڵ دەبێ...

---

[1] بڕوانە: المحلی ٢٨٢/٩ و پاشتر.

[2] المحلی ٥٢٤/٩.

[3] تێبینی دەکرێ خاوەنی (الهدایة) جائیزبوونی مارەکردنی موتعە دەداتە پاڵ ئیمام مالیك و دەڵێ: "مالیك (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ جائیزە لەبەرئەوەی موباح بووە بۆیە هەروا دەمێنێ تا نەسخکەرەوەی دەردەکەوێ، دەڵێین نەسخکردنەوەی بە ئیجماعی هاوەڵان جێگیر بووە".
الهدایة مع فتح القدیر٣/٢٤٧ . بەڵام ئەوەی لە مەزهەبی مالیکدا جێگیرە ئەوەیە لەوە جیاوازە. لە (شرح الصغیر)دا هاتووە: "نیکاحی موتعە هەردوو مێردی تێدا سزا دەدرێن بەپێی مەزهەبەکان -واتە لەبەر بوونی شوبهە- و بەبێ تەڵاق هەڵدەوەشێنرێتەوە". (الصاوی) دەڵێ: "لەبەرئەوەی ئەوە کۆدەنگی لەسەرە و جگە لە تاقمێکی موبتەدیع کەس لەوەدا ناکۆك نیە". الشرح الصغیر مع بلغة السالك ٣٦٦/١.

بەڵگەیشمان ئیجماعی فیرقە لەسەر هەقەکەیە.[1]

**مامەڵە داراییەکان:**

ئیمامی مالیك رەتیکردەوە دان بە بژارەی مەجلیسدا بنێ و عوزری هێنایەوە لە کارکردن بە حەدیسی ئیبن عومەر کە دەڵێ: (إذا تبایع الرجلان فکل واحد منهما بالخیار ما لم یتفرقا)[2] لەبەرئەوەی پێچەوانەی ئیجماعی خەڵکی مەدینەیە.

جمهور بەگوێرەی حەدیسی ناوبراو کاریان کردوە و لەگەڵ مالیك نەبوون لە داننان بە حوججیەتی ئیجماعی خەڵکی مەدینەدا.

جمهور پێی وایە ئیجماع لەسەر پێشخستنی قەرز لەسەر وەسێت جێگیر بووە جا چ قەرزەکە پەیوەندی بە عەینی میراتەکەوە هەبێ، یان بەئەستۆی مردوەکەوە.

خەواریج و ئەبو ثور ئیبراهیم ئەلەبغدادی لە شەرعزانی شافیعی[3] لەگەڵ پێشخستنی وەسێتن بەسەر قەرزدا، ئەویش لە روانگەی کارکردن بە زاهیری دەقەکە، لەبەرئەوەی بەلای ئەوانەوە ئیجماع لەسەر پێچەوانەی راکەی ئەوان جێگیر نەبووە.

---

[1] الخلاف الطوسي ٢/١٧٩.

[2] بروانە: العدة ٣/٤ الحدیث متفق علیه واللفظ لمسلم سبل السلام ٣/٣٣.

[3] ئیبراهیم بەیەکێك لە شەرعزانە شافیعیەکان دادەنرێ بەڵام لاسایی نەکردەوە و لە هەندێ حوکمدا سەرپێچی لەوە کردوە لەوانە پێشخستنی وەسێت بەسەر قەرزدا لە روانگەی کارکردن بەوەی خوا ئەفەرموێ (من بعد وصیة یوصی بها أو دین)، ساڵی ٣٠٦ك مردوە. بڕوانە ئیبن خەلەکان.

## بەشی دووەم:
## قیاس و کاریگەری لەسەر جیاوازیی شەرعزان لە ئەحکامدا

پێشتر پێناسەی قیاس کرا و روکنەکانی روون کرانەوە. یەکسانکردنی رووداوێکە بۆ ئاشکراکردنی حوکمەکەی بە بەستنەوەی بە رووداوێکیترەوە کە حوکمەکەی بەدەق جێگیر بووە، ئەویش لەبەر هاوبەشیی دوو رووداوەکە لە خاڵێکی کۆکەرەوەدا.

روکنەکانی چوارن: ئەسڵ + لق (فەرع) + عیللە + حوکمی ئەسڵ.

هەروەها قیاس بە سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی یاسادانانی ئیسلامی دادەنرێ پاش قورئان و سوننە و ئیجماع، لەوەی باس لە حوکمی لق ناکا. لەرێیەوە زۆر کێشە چارەسەر کراون کە موسڵمانان لە سەردەمە جیاوازەکاندا رووبەڕوویان بوونەتەوە، هەروەها بە یەکێك لە گرنگترین هۆکانی جیاوازیی شەرعزان لە حوکمە شەرعیەکان دادەنرێ لەبەر جیاوازی و ناکۆکیی بۆچوونەکان سەبارەت بە حوججەبوونی و جیاوازیی تێڕوانینی ئەوانەی باوەڕیان بەحوججەبوونی هەیە لە بوارە جیاجیاکاندا، کە هەندێکیان باس دەکەین. ئەم بەشە دوو باس لەخۆ دەگرێ: یەکەمیان لەبارەی جیاوازی لە حوججیەتی قیاس، دووەمیان لەبارەی جیاوازی لەوەی قیاسی تێدا دەکرێ و ئەوەی تێیدا ناکرێ.

# باسی یەكەم:
# حوججیەتی قیاس

بابەتی حوججیەتی قیاس لە كتێبەكانی ئوسولدا قسەی لەسەر كراوە و لێرەدا بەكورتی باسی دەكەین، لەبەرئەوەی جیاوازیی شەرعزان لە حوكمەكاندا لەسەر بەبەڵگەكردن یان نەكردنی قیاس دامەزراوە، بۆ ئەوەی بابەتەكە درێژ نەبێتەوە تەنها بۆچوونەكان باس دەكەم نەك بەڵگەكانیان.

ناكۆكی لەوەدا نیە قیاس لە بابەتە دنیاییەكاندا دروستە وەك قیاسكردنی هەندێ دەرمان لەسەر هەندێكیتر لەبەر خاڵێكی هاوبەش یاخود كۆكەرەوەیەك لەنێوانیاندا ،بۆ نموونە وەك گەرمی و گونجاوی بۆ جۆرێكیی تایبەتی نەخۆشی.

هەروەها ناكۆكی لەبارەی قیاسی گومانبڕ (قەتعی)ـەوە نیە، ئەویش ئەوەیە بە رەتكردنەوەی بوونی جیاوازی لەنێوان قیاسكراو و قیاس لەسەركراو[1] بەكلا كراوەتەوە، وەك قیاسكردنی لێدان لەسەر ئۆفكردن (التأفیف) بە كۆكەرەوەی ئازاردان. بەڵكو جیاوازی لە قیاسی گومانگر (ظني)دایە لە شەرعیاتدا، ئەویش ئەوەیە بوونی عیللەی ئەسڵەكە تێیدا، هەروەها لە فەرعەكە یان یەكێكیاندا[2]، جێگومان بێ، كە پێنج را لەوبارەوە هەیە:

یەكەم: قیاس لەڕووی شەرعەوە حوججەیە و پێویستە لە شەرعیاتدا كاری پێبكرێ، ئەوەیش رێبازی جمهورە.

---

[1] واتە ناكۆكی لە مانادا نیە. ئەوانەی قیاس رەت دەكەنەوە ئەوە ناو نانێن قیاس بەڵكو وای دادەنێن كە دەقی ئەسڵەكە دەیگرێتەوە.

[2] بڕوانە: شرح تنقیح الفصول للقرافي ص ٣٨٧

دووەم: لە مەسەلە ئەقڵی و شەرعیەکاندا بە ئەقڵ و شەرع حوججەیە، ئەوەیش رێبازی قەفال ئەلشاشی ئەلکەبیرە لە شافیعی و ئەبولحوسێنی بەصری لە موعتەزیلە.

سێیەم: قیاس حوججەیە لە شێوەیەکی تایبەتدا، قاشانی و نەهرەوانی پێیان وایە حوججەیە و پێویستە لە دوو شێوەدا کاری پێبکرێ:

یەکەمیان ئەوەیە عیللەی ئەسڵەکە بەدەق باس کرابێ چ بە راشکاوی لەفز یان بەئاماژە، دووەم ئەوەیە فەرعەکە بۆ حوکمەکە لەپێشتر بێ تا ئەسڵەکە، وەك قیاسی حەرامکردنی لێدان لەسەر حەرامکردنی ئۆفکردن (لەدەست دایك و باوك). هەردوو وتویانە ئەقڵ لێرەدا دەروازەی نیە نە لە بوون و نە لە نەبوونیدا.[1]

(عثمان البتي) دەڵێ: پێویستە شتێك هەبێ بەڵگە بێ لەسەر دروستیی قیاس لەسەر ئەسڵەکە لەو بوارەی دەویسترێ قیاسی لەسەر بکرێ، بۆ نموونە ئەگەر قیاس لە بواری هاوسەرگیریدا بویسترێ پێویستە بەڵگەیەك هەبێ کە قیاس لە هاوسەرگیریدا دروستە. ئەگەر ویسترا قیاس لە بواری فرۆشتندا بکرێ پێویستە بەڵگە هەبێ لەسەر ئەوەی قیاس تێیدا دروستە و بەو شێوەیە.[2]

چوارەم: ئەوەیە ئەهلی زاهیر و هەندێ شیعەی ئیمامی و هەندێ خەواریج بۆی چوون کە لە رووی شەرعەوە خواپەرستی پێکردنی قەدەغەیە با لەرووی ئەقڵیشەوە دروست بێ. ئیبن حەزمی زاهیری زۆر بەڵگەی بۆ بەتاڵکردنەوەی قیاس هێناوە و بەتوندی رەتی کردۆتەوە و بناغەی رەتکردنەوەکە بەلایەوە ئەوە بوو دەقەکانی شەریعەت بەشی حوکمەکانی رووداوەکان دەکەن و پێویست بە قیاسکردن ناکا[3].

---

[1] بڕوانە: الاحكام للآمدي ٣/٦٤ الاسنوي مع البدخشي ٣/١٠.

[2] بڕوانە: اصول الفقه لابي النور زهير ٤/١٧٠.

[3] بڕوانە: الاحكام في اصول الاحكام ٧/٩٢٩ و پاشتر.

حیللی له ئیمامیەت دەڵێ: خەڵك لەبارەی حوججیەتی قیاس  رایان جیاوازە، رای ئێمە ئەوەیە حوججە نیە، بەستنەوەی بێدەنگ بە گوتراو (مەسکوت بە مەنتوق) لە بابی قیاس نیە، ئەو حوکمەی بۆ عیللەیەك دانراوە، بەدەدق نەك بە قیاس سەرجەم ئەوانەی گرتۆتەوە کە ساغ بوویێتەوە ئەو عیللەیەیان تێدایە.[1]

هەندێ لە زانایانی شیعەی ئیمامی دانەپاڵی (ئیحالەی ئەقڵی) بۆ لای شیعە بەهەموو شێوەیەك رەت دەکەنەوە و دەڵێن: رەنگە ئەوە لە هەندێ کتێبی ئوسوڵی شیعەدا هەبێ کە رای خاوەنی کتێبەکەیە، بەڵام بۆچوونەکەی بە بۆچوونی تەواوی مەزهەبەکە لەقەڵەم دراوە. هەڵەیە بۆچوونەکە بدرێتە پاڵ کۆی شیعە هەر لەبەر ئەوەی موجتەهیدێك لە موجتەهیدەکانی بینراوە ئەو رایەی هەبووە.[2]

پێنجەم: کە مەزهەبی (النظّام) لە موعتەزیلە و هەندێ شیعەی ئیمامییە کە بەئەقڵ مەحاڵە شەرعدانەر بە قیاس عیبادەتی بۆ بکرێ، بەڵام قیاسی گومانبڕ وەك وتمان کەس نکوڵی لێ نەکردوە و نەززام لەگەڵ قیاسە لە شێوەی دەقدانان (التنصیص) لەسەر عیللە[3]، هەروەها شیعەی ئیمامیش، بەڵام ناوی نانێن قیاس.

ئەمانە گرنگترین مەزهەبەکانن لە حوججیەتی قیاسدا، هەرلایەکیش بەڵگەی نەقڵی و ئەقڵی خۆیان هەیە، جا دەست بۆ بردن و قسەلەسەرکردن و تەرجیحکردنی هەڵبژێردراوەکەی دەرچوونە لە باس و درێژکردنەوەیەکی بێ سوودە لەبەرئەوەی لە کتێبەکانی ئوسوڵدا باس کراون.

---

[1] مبادئ الوصول الى علم الاصول للحلي ص ٢١٤ و پاشتر.

[2] الأصول العامة للفقه المقارن محمد تقي الحكيم ص ٣٢٢.

[3] إزالة الالتباس عن مسائل القياس الشيخ أمين الشيخ، مطبعة التضامن ص ٢٣-٢٤.

## کاریگەریی ئەم جیاوازییە لە حوکمە فیقهیەکاندا:

جیاوازیی زانایان لە ئوسولڵناس و شەرعزان سەبارەت بە حوججیەتی قیاس لە گرنگترین هۆکانی جیاوازین لە زۆر حوکمی شەرعیدا، ئەمەی خوارەوە نموونەیەکیەتی:

شەرعزان لەبارەی ئەوەی بە فرۆشتن بەسوو دادەنرێ و ئەوەی دانانرێ رایان جیاوازە، ئەویش بەهۆی جیاوازییان لەبارەی قیاس یان لە عیللەکەیدا لەبەر تیشکی ریوایەتێکی موسلیم لە عوبادە بن صامت کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: الذهب بالذهب والفضة بالفضة والبر بالبر والشعير بالشعير والملح بالملح والتمر بالتمر مثلاً بمثل سواء بسواء...[1]

شەرعزان لەسەر حەرامکردنی سوو (ریبا) لەم شەش جۆرەدا کۆکن و لەبارەی ریبەویبوونی هەندێکیتر کە لە حەدیسەکەدا باسیان نەکراوە ناکۆکن، هۆی خلافەکەیشیان ئەوەیە ئاخۆ حەدیسەکە تایبەت و مەبەست پێی مانایەکی تایبەتە، یان تایبەت و مەبەست پێی مانایەکی گشتییە لەرێی قیاسەوە، کە ئەوە رای جمهورە، یان لەرێی گشتگیریی دەقەکەوە وەك شیعەی ئیمامی و ئەوانەی لەگەڵیانن دەڵێن؟

لەم رووەوە لەبارەی ریبەویبوونی جگە لەم جۆرانە بوون بە دوو تاقمەوە، تاقمێك پێی وایە حەدیسەکە تەنها ئەو جۆرانە دەگرێتەوە کە تێیدا هاتوون و جگە لەوانە ئەو حوکمە نایگرێتەوە، ئەم تاقمە هەندێکیان نکوڵی لە قیاس دەکەن وەك زاهیری و

---

[1] ئەم حەدیسە بە ریوایەتی جۆرلوجۆر هاتووە بەڵام بەهەمان ماناوە، لەوانە: عن عبادة بن الصامت (ﷺ) قال رسول الله (ﷺ): ((الذهب بالذهب والفضة بالفضة بالبر والشعير بالشعير والملح بالملح والتمر بالتمر مثلاً بمثل سواء بسواء يداً بيد فإذا اختلفت هذه الأصناف فبيعوا كيف شئتم إذا كان يداً بيد)). رواه أحمد ومسلم بلوغ المرام مع سبل السلام ٣٧/٣ ومنها ((نهي النبي (ﷺ) عن الذهب بالذهب والورق بالورق والتمر بالتمر والبر بالبر والشعير بالشعير والملح بالملح إلا مثلاً يداً بيد)) راجع مسلم ٦٩٠/١ السنن الكبرى ٢٧٦/٥ نيل الأوطار ٢١٨/٥ معالم السنن ٦٨/٣.

هەندێکیان لەگەڵین وەك عوسمان ئەلبەتی، بەڵام پێی وانیە مەرجی کارپێکردنی لەم مەسەلەیەدا هاتبێتەدی، ئەویش بوونی بەڵگەیەکە لە ئەسڵدا کە مەعلولە.[1]

تاقمی دووەم پێیان وایە حوکمی سوو تایبەت نەکراوە بەم شەش جۆرەوە، بەڵکو هەموو جۆرێك دەگرێتەوە ئەو عیللەیەی تێدا بێ کە لەوانەدا هەیە. ئەم تاقمەیش دوو بەشن: هەندێکیان دان بە قیاس وەك بەڵگەیەکی شەرعیدا نانێن و پێیان وایە پەلهاویشتنی حوکمەکە بۆ دەرەوەی ئەم جۆرانە لە ڕێگەی دەقەوەیە نەك قیاس، ئەوانیش شیعەی ئیمامین.

- تووسی دەڵێ: (لای ئێمە سوو لە هەموو پێوانەکراو و کێشراوێکدا هەیە جا چ خوراو بێ یان نەخوراو، داود و ئەهلی قیاس هەموو دەڵێن سوو لە جگە لە ڕەگەزەکان (اجناس)یشدا جێگیر دەبێ بەهەندێ جیاوازی لەنێوانیاندا، بەڵگەیشمان ئیجماعی فیرقە و هەواڵەکانیانە و ڕێگەی ئیحتیاتیش ئەوە دەخوازێ)[2]. پاشان دەڵێ ئەوەی سووی تێدا جێگیر بووە بە دەق جێگیر دەبێ نەك لەبەر عیللەیەك لە عیللەکان—واتە نەك لەڕێی قیاسەوە.[3]

بەشێکیشیان قیاس بە بەڵگەیەکی شەرعی دەزانن و پێیان وایە حوکمی سوو لەڕێی قیاسەوە، نەك لەڕێی گرتنەوەی لەلایەن دەقەوە، پەل دەهاوێ بۆ هەموو شتێك کە هەمان عیللەی تێدا بێ کە لەو شەش جۆرەدا هەن. ئەمەیش ڕای جمهوری شەرعزانە، بەڵام ئەوان لەکاتێکدا لەسەر بنەمای بوونی ناوچەی سوو لە دەرەوەی ئەو جۆرانە کۆك بوون، بەڵام لەبارەی ئەو ماڵانەی پەلیان بۆ دەهاوێژێ ڕایان جیاوازە، ئەویش لەئەنجامی جیاوازییان لە دیاریکردنی عیللەی سوو لەو شەش جۆرەدا، بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

[1] فتح القدير ٥/٧ سبل السلام ٣٩/٣.

[2] بروانە: الخلاف للطوسي ٥٢٣/١–٥٢٤.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

حەنەفیەت پێیان وایە عیللە لەو شەش جۆرەدا بریتییە لە پێوانە لەگەڵ جنس و کێشانە لەگەڵ جنسە لە حاڵەتی سووی زیادە (ربا الفضل)دا[1]. واتە لە بارێکدا دوو بەدەلەکە لەیەك جۆر بن عیللەکە لە دوو بەش پێکدێ: ئەندازە و هاوجنسی.

بەڵام لە ریبای النساء-دا عیللە یان کەیلە یان وەزنە یان یەککگرتنی جنسە[2]. ئیبن ئەلهەمام دەڵێ "لای ئێمە عیللەی ریبا ئەندازە و جنسە، لەکاتی کۆبوونەوەی هەردووکیاندا تفازل و نساء حەرام دەکرێن، بە یەکێکیشیان نساء حەرام و تفازل حەلال دەکرێ".[3]

عیللەی (ربا النساء) لە خۆراکی ریبەوی و هیتردا لای مالیکی تەنها تامە (الطعم)، واتە خوراو بێ بۆ مرۆڤ نەك وەك دەرمانکردن، هەربۆیە میوە و سەوزە و پاقلەمەنی دەگرێتەوە و فرۆشتنی هەندێکی بە هەندێکی بۆ ماوەیەك، با بەیەکسانیش بێ، قەدەغەیە. عیللەی (ریبای فەزل)یش لە خواردندا پێبژی (الاقتیات) و هەڵگرتن یاخود پاشەکەوتکردنە (الادخار)، واتە عیللەکە لە دوو شت پێکدێ: یەکەمیان پێ ژیان و ئەویتر پاشکەوتکردن. ئەگەر یەکێکیان نەبوو عیللەکەیش نامێنێ، بەو مەرجەی هاوجنس بن.[4]

مەبەست لە (ئیقتیات) ئەوەیە بەبەکارهێنانی جەستە بمێنێتەوە بەشێوەیەك لەکاتی تەنها بەکارهێنانی ئەودا تێکنەچێ. مەبەست لە (ادخار)یش: بە دواخستنی بۆ

---

[1] ربا الفضل: زیادەیەکە لە هەمان ماڵدا کە لە گرێبەندی فرۆشتنەکەدا کراوەتە مەرج لەسەر پێوەری شەرعی، کە پێوانە یان کێشانەیە لە جنسدا.

[2] ربا النساء: زیادەی سوڕانەوە (فضل الحلول)یە لەسەر وادەکە و زیادەی ماڵەکەیە لەسەر قەرزەکە، مەبەست لە یەککگرتنی جنسیش یەککگرتنی جۆرە.

[3] فتح القدير ٥/٧.

[4] بڕوانە: بلغة السالك ٢/٢٢.

ئەو ماوەیەی بەعادەت مەبەستە تێکنەچێ، ئەوەیش بەپێی زاهیری مەزەب حەدێکی نیە بەڵکو بۆ هەر شتێك بەگوێرەی خۆیەتی، بۆیە ئەوە عیبرەت نیە کە بەدەگمەن پاشەکەوت دەکرێ وەك هەنار. مانای (ئیقتیات) ئەو شتەیش دەگرێتەوە کە خواردن بەبێ ئەوە کەڵکی نابێ وەك خوێ و بەهارات وەك بیبەر. ئیبن عەرەفە دەڵێ: (الطعام ما غلب اتخاذه لأكل آدمي أو لاصطلاحه أو لشربه).[1]

عیللەی ریبا لای ئەوان لە زێڕ و زیودا بەنرخبوون، یاخود ئەوەیە کە ئەوانە خۆیان نرخن.

شافیعیەتیش هاوشێوەی مالیکیەت پێی وایە عیللەی ریبا لە زێڕ و زیودا بەنرخییە (ئەوەیە نرخ یاخود پارەن)، بۆیە سوو لەوانەدا حەرامە و لە پارەی جگە لەوانەدا حەرام نیە، واتە عیللەکە لەوانەدا قەتیسە و تێناپەڕێ، بۆیە هیتر لەسەر ئەوان قیاس ناکرێ.[2]

هەرچی چوار عەینەکەن (گەنم و جۆ و خورما و خوێ) شافیعی دوو قسەی لەبارەیانەوە هەیە: لە نوێکەیدا دەڵێ عیللە تێیدا تامە واتە ئەوەیە خوراون جا چ قوت بن یان قوت نەبن، هەڵبگیرێن یان هەڵنەگیرێن و حوکمەکە لەرێی قیاسەوە قوتەکان و پێستەی خۆشەکراو (الأدم) و میوە و دەرمانیش دەگرێتەوە.. ئەویش لەبەر ئەوەی معمر بن عەبدوڵا ریوایەتی کردوە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: (الطعام بالطعام مثلاً بمثل). خواردنیش ناوە بۆ هەر شتێ بخورێ بەبەڵگەی ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿...وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ...﴾.[3]

---

[1] بڕوانە: مذهب ابن عباس في الربا زيدان أبو المكارم ص ١٩.
[2] المهذب للشيرازي ١/٢٧٠
[3] المائدة/٥.

لە قەولی کۆنیشیدا دەڵێ: عیللە تێیدا ئەوەیە خوراوێکی پێوانەکراو یان خوراوێکی کێشراوە. بەڵگەیش ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی(الطعام بالطعام مثلا بمثل)، لێکچوونیش بە پێوانە (کەیل) یان کێشانە (وەزن) نەبێ نابێ. ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حەرام ناکرێ لە خوراوێکی کەیلکراو یان کێشراودا نەبێ، لەبەرئەوە سوو لەو شتانەدا حەرام نیە کە پێوانە و کێشانە ناکرێن[1]. ئەمە رای سەعید بن مسەیبە.

حەنبەلیەکان –لە زاهیری مەزەبەکەیاندا– هەمان رای حەنەفیەکانیان هەیە، بەڵام هاوجنسییان لە ریبای فەزڵدا کردۆتە مەرج نەك مەرجی عیللە وەك حەنەفیەکان کردویانە[2].

## شیعەی زەیدی

زەیدیش لە فرۆشتنی سووداردا لە رای حەنەفیەکان جیاواز نین. ئیمام ئەلمەهدی ئەحمەد بن یەحیا ئەلمورتەزا سووی لە شەرعدا پێناسە کردوە و دەڵێ: بریتییە لە زیادەکاری لە شتی هاوجنسدا، یان زیادەیەکە لەپێناو (النساء)دا. پاشان باس لە کۆدەنگیی عیترەی قاسمی و ناصری دەکا لەگەڵ ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی لەوەی کە عیللەی حەرامکردنەکە یەکبوونی جنس و ئەندازەیە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئاگەداری داوە لەوە و ئەفەرموێ (إلا صاعاً بصاع)، هەروەها ئەفەرموێ (إلا كيلا بكيل) و لەو جۆرە. پاشان دەڵێ هەروەها کێشراویش.[3]

لەم خستنەڕووەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی: بەلای زاهیری و عثمان البتي–ەوە ناوچەی سوو بەو شەش جۆرەی ناو حەدیسەکە دیاری کراوە و شتیتریان لەسەر

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ٢٧٩/١

[2] نیل المارب ١٢٩/١–١٣٠.

[3] البحر الزخار–الجامع لمذاهب علماء الأمصار، طبع القاهرة ٢٣٢/٣–٢٣٠.

قیاس ناکریّ، بەلای حەنەفی و حەنبەلی و شیعەی ئیمامی و شیعەی زەیدیەوە حوکمەکە تێدەپەڕێ بۆ هەموو شتێکی پێوانەکراو و کێشراوێك لە یەك جۆر، چ خوراو بێ یان نەخوراو، قوت بێ یان قوت نەبێ. بەلای حەنەفی و حەنبەلی و شیعەی زەیدیەوە بە پێچەوانەی ئەوە. بەلای مالیکیەتەوە (ربا الفضل) لەو شتانەدا حەسر دەبێ کە بژێوین و پاشەکەوت دەکرێن و و پەل ناهاوێژێ بۆ دەرەوەی ئەوانە لە پێوانەکراوە خوراوەکان. هەرچی (ربا النساء)ـە لە خوراوەکاندا قەتیسە بەڵام نەك بۆ دەرمانکردن. بەڵام لە نرخەکاندا سنووری سوو زێڕ و زیو تێناپەڕێنێ. بەلای شافیعیەتەوە: ناوچەی سوو لە نرخەکاندا لە زێڕ و زیودا قەتیسە و پارەیتریان لەسەر قیاس ناکرێ وەك دینار و جونەیهـ، وەك مالیکی پێی وایە. لە چوار جۆرەکەیشدا سوو تێناپەڕێ بۆ خوراوەکان. ئەمە لە رای تازەکەیدا، لە را کۆنەکەیدا حوکمی سوو مەحسورە لە خوراوێکی پێوانەکراو یان کێشراودا قەتیسە و لە هیتری جگە لەوەدا قیاس ناکرێ.

لەوەی باس کرا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە: هەندێ شت هەن هەندێ لە زانایان پێیان وایە مامەڵەیان ئاساییە تێدا بکرێ، چونکە سوویان تێدا روونادات و حەڵاڵن، لەکاتێکدا هەندێکیتریان پێیان وایە سوویان تێدا روودەدات و حەرامن. ئەویش بەهۆی جیاوازییان لە داننان یان داننەنان بە حوججیەتی قیاس و هەروەها جیاوازیی دانپێدانەرانی لە دیاریکردنی ئەو عیللەیەی حوکمەکە بوون و نەبوونی بەدەوری ئەودا دەسورێتەوە. هەروەها هەندێ شتیتر هەن هەمووان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی سوویان تێدەکەوێ، ئەو شەش جۆرەی لە حەدیسەکەدا باس کراون بەئیجماع سوویان تێدەکەوێ بەو وەسفەی لە حەدیسەکەدا هاتووە.

١- سووی قەرز کە ئەو زیادەیەیە لەبەرانبەر ماوەی لەلابوونەکە لەسەر قەرزەکە وەردەگیرێ، بە ئیجماع حەرامە.

٢- فرۆشتنی ئەو شەش جۆرە لەم بارانەی خوارەوەدا بەئیجماع سوویان تێدەکەوێ:

أ- جنس بە جنسی خۆی بەنەسیئە، جا بەیەکسان بێ یان بە زیادەوە.

ب- جنس بە جنسەکەی دەست بەدەست بە زیادەوە، بەڵام جنس بەغەیری جنسی خۆی بەزیادەوە بۆ دەستبەجێ حەڵاڵە، بەڵام لەگەڵ دواخستندا حەرامە.

جگە لەمانە هەندێکیان مەزهەبەکان لەسەریان کۆکن و هەندێکیان لەسەریان جیاوازن بەو وردەکاریەی پێشوو، سەرچاوەی خلافەکەیشیان جیاوازییە لە قیاسدا.

لەکۆتایدا دەڵێم: پێویستە ئەو قسە بەتەواوی رەت بکرێتەوە کە پارەیتری جگە لە زێڕ و زیو سووی تێدا نیە.

## باسی دووەم:
## ئەوەی قیاسی تێدا دەکرێ

زانایان لە ئوسولناس و شەرعزان سەبارەت بەوەی قیاسی تێدا دەکرێ و ئەوەی تێیدا ناکرێ رای جیاوازیان هەیە، گرنگترینیان ئەمانەن:

### یەکەم - قیاس لە شتە ئەقلیەکاندا:

زۆربەی موتەکەلیمین کۆکن لەسەر دروستیی قیاسکردن لە شتە ئەقڵیەکاندا و ناوی دەنێن بەستنەوە (الحاق)ی نادیار (غائب) بە دیار (شاهد)ەوە، وەك ئەوەی بوترێ وردی لە شاهیدا بەڵگەی زانینە، خوایش لە کردەوەکانیدا وردە بۆیە زانا دەبێ[1]. ئەم قیاسە بەلای هەندێکیترەوە دروست نیە.

### دووەم - قیاس لە زمانەکاندا:

ناکۆکی لەوەدا نیە کە قیاس لەو حوکمەی لە زمان وەردەگیرێ ناکرێ وەك رەفعی فاعیل و نەصبی مەفعول.. چونکە ئەوە بە سەرپێو (ئیستیقرا) سەلماوە، بەڵکو ناکۆکی لە لەفزێکی وەرگیراو لە زماندایە کە ناوی جنسێك بووە، مانایەکی هەیە کە دەکرێ لە غەیری جنسەکەی خۆیشیدا تێبینی بکرێ، وەك لەفزی (الخمر) کە بەوە دەوترێ لە گوشراوی ترێ وەردەگیرێ ئەگەر گەرم بوو و کەفەکەی فرێ درا، بۆ مانایەك کە ترشان (الخامرة)ی تیایە، ئەم مانایە بەبوون و نەبوون لەگەڵ ناونانەکەدا دەسوڕێ، جا ئەگەر (مخامرة)مان لە غەیری خەمردا بینی بۆ نموونە لە سرکەدا، ئایا دەکرێ پێی بوترێ خەمر یان نا؟ زانایان رایان لەم بارەیەوە جیاوازە: هەندێ رایان

---

[1] بروانە: شرح تنقیح الفصول ص٤١٢ السنوي مع البدخشي ٣٤/٣.

وایە دەكرێ، لەوانە ئیمامی رازی لە ئوسوڵناسان، ئیبن جەنی لە ئەدیبان و مالیكیەت لە شەرعزان[1]. هەندێكیش وتویانە جائیز نیە لەوانە حەنەفیەت.[2]

## سێیەم: حەد و كەفارەت و مەزەندە و روخسەتەكان:

زانایان لە ئوسوڵی و شەرعزان لەبارەی بەكارهێنان یان نەهێنانی قیاس تێیاندا جیاوازن: شافیعی[3] و زۆربەی هاوەڵانی و ئیمام ئەحمەد و زۆربەی هاوەڵانی[4] و وئەلباجی لە مالیكیەت –وەك قەرافی[5] باسی دەكا– و ئەوانەی هاوڕایانن، لەگەڵ ئەوەن جائیزە قیاسیان تێدا بكرێ.

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن قیاس لەم چوارەدا ناكرێ[6]. ئەوەی رای لەگەڵ بەكارهێنانی قیاسە پشتی بە گشتیبوونی بەڵگە جێگیركراوەكان بۆ حوججیەتی قیاس بەستووە، لەبەرئەوەی بەڵگەكان لەسەر دروستیی كاركردن بە قیاس بۆ هەموو حوكمێك كە بكرێ قیاسی تێدا بكرێ گشتین و هیچ جیاوازی نیە لەنێوان حەدەكان و كەفارەتەكان و مەزەندەكان (التقديرات) و روخسەتەكان و هیتردا.

**ئەوانەی لەگەڵ نەكردنی قیاسن:**

أ– لە حەدەكاندا ئەوەیان كردۆتە بەڵگە كە حەد بەبوونی شوبهە لادەدرێ، لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ (إدرؤوا الحدود بالشبهات)[7] ، بۆیە بەبەڵگەیەك

[1] شرح تنقيح الفصول، سەرچاوەی پێشوو. مفتاح الوصول الى علم الاصول ص ١٨٧.
[2] شرح تنقيح الفصول، سەرچاوەی پێشوو.
[3] الأسنوي مع البدخشي٣/٣٤ و پاشتر.
[4] المسودة ص ٣٩٨.
[5] شرح تنقيح الفصول، سەرچاوەی پێشوو.
[6] تسهيل الوصول إلى علم الأصول ص ٢٢٦.
[7] رواه البيهقي عن علي بن أبي طالب (رضي الله عنه) سبل السلام ٤/١٥.

جێگیر نابێ شوبهەی تێدا بێ، قیاسیش بەڵگەیەکە شوبهەی تێدایە لەبەرئەوەی گومانگرە، بۆیە تێیدا جێبەجێ ناکرێ.[1]

ب– لە کەفارەتەکاندا ئەوەیان کردۆتە بەڵگە کە زیانە، لەبەرئەوەی لەناوبردنی ماڵ و ئازاردانی نەفسە بە رۆژوو و هیتر، بەڵگەکەیش زیان رەت دەکاتەوە.[2]

ج– لە مەزەندەکردنە شەرعیەکانی وەك مەزەندەکردنی نیصاب لە زەکاتدا پشت بەوە دەبەستن کە ئەوانە کۆمەڵە شتێکن ئەقڵ پەییان پێ نابات، هەربۆیە بوونی مانای کۆکەرەوە لەنێوان ئەسڵ و فەرع ئەقڵ نایبڕێ، هەموولایش کۆکن لەسەر ئەوەی قیاس فەرعێکە بۆ دەرککردن بەو مانایە.[3]

د– هەرچی روخسەتەکانە وەك کورتکردنەوەی نوێژ و رۆژووشکاندن لە رەمەزان بۆ رێبوار، سەرچاوەکانیان تێناپەڕێنن، بەڵکو تەنها دەقیان وەك سەرچاوەی تێدا بەکاردێ و قیاسی تێناکەوێ.

شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ) و ئەوانەی شوێنی کەوتون بەم شێوەیە وەڵامیان داونەتەوە:

أ– مەبەست لە (الحدود تندرئ بالشبهات) شوبهەی کردەوە یان شوبهەی بابەتە نەك شوبهەی دەلیل، شوبهەیش لە قیاسدا شوبهەی دەلیلە[4]. پاشان قسەکەیان پوچەڵکراوەیە لەبەرئەوەی قیاسکاریەکی زۆریان تێدا کردوە، بەشێوەیەك بە ئیستیحسانیان داوەتە قەڵەم، چونکە تێیدا دەڵێن گوایە ئەگەر چوار کەس شایەتی لەسەر کەسێك بدەن کە زینای لەگەڵ ژنێك کردوە و هەریەکەیان گۆشەیەکیان دیاری

---

[1] إزالة الالتباس عن مسائل القياس الشيخ أمين الشيخ مطبعة التضامن القاهرة ص ٦٩.
[2] سەرچاوەی پێشوو.
[3] سەرچاوەی پێشوو.
[4] سەرچاوەی پێشوو. ص٧٠

کرد، ئەو کەسە لەڕووی بەباشزانین (ئیستیحسان)ەوە حەدی لێ دەدرێ ئەگەرچی ئەوە پێچەوانەی ئەقڵە، جا کارپێکردنی بەپێی ئەقڵ لەپێشترە.[1]

ب- ئەوەی دەڵێن کەفارەتەکان پێچەوانەی ئەسڵن لەبەرئەوەی زیانن و دەلیلیش زیان ڕەت دەکاتەوە، ڕەتکراوەیە بەوەی دەلیل زیانی رووتە ئەمەیش وانیە، لەبەرئەوەی زیانێکی تێکەڵ بە سوودە، لەو رووەوە مرۆڤ لە ئەنجامدانی واجبکارەکەی دەترسێنێ، لەبەرئەوە وتویانە: ئەوە عیبادەتێکە مانای سزای تێدایە[2].

پاشان قسەکەیان پوچەڵکراوەیە بەوەی قیاس لە کەفارەتەکاندا بەکار دێنن، چونکە ئەوان قیاس لەسەر رۆژووشکاندن بە جیماع کەفارەتی رۆژووشکاندن بە خواردنیان واجب کردوە، هەروەها قیاس لەسەر کوشتنی بەئەنقەست کەفارەتی کوشتنی بەهەڵەیان واجب کردوە.[3]

ج- ئەوەیش دەڵێن مەزەندەکراوەکان هەندێ شتن ئەقڵ پەی بە زانینیان نابات، ڕەتکراوەیە بەوەی ئێمە لەکاتی ڕوودانی روکن و مەرجەکانیدا قیاس بە جائیز دەزانین. ئەگەر وتیان: لەوەی ئێمە تێیداین ئەو دوانە روونادەن، دەڵێین قەدەغەیە، چونکە راشکاوی ئەقڵ حوکم بە دروستیی دانانی حەد یان کەفارەتێك دەدا لەلایەن شەرعدانەرەوە لە شێوەیەکدا بۆ شتێکی گونجاو، پاشان ئەم شتە لە شێوەیەکیتردا پەیدا دەبێ و لە حوکمەکەیدا لەسەری قیاس دەکەین.

ئەگەر وتیان: دان بە ئیمکاندا دەنێین بەڵام دان بە رووداندا نانێین، ئەوە دەبێتە حاشاکردن لە راستییەك کە ناکۆکیمان نیە تێیدا.[4]

پاشان ئەوەی کردویانەتە بەڵگە پوچەڵکراوەیە، بەوەی ئەوان لە مەزەندەکراوەکان (المقدرات)دا قیاسیان کردوە، تا گەیشتونەتە ئەوەی لە سەتڵ و

---

[1] الأسنوي مع البدخشي ٣٤/٣ و پاشتر.
[2] إزالة الالتباس عن مسائل القياس ص ٧٠
[3] الأسنوي، سەرچاوەی پێشوو.
[4] إزالة الالتباس، سەرچاوەی پێشوو.

بیردا مەزەندە بکەن و لە کەوتنەخوارەوەی ئاژەڵدا جیاوازییان کردوە لەوەی ئەگەر لە بیردا بمرێ و وتویانە: لە مریشکدا هێندە و هێندە گیان دەدات و لە مشکدا لەوە کەمتر، ئەم مەزەندەکردنەیش نە لە دەقەوەیە و نە لە ئیجماعەوە بۆیە نابێتە قیاس.[1]

د- هەرچی لە روخسەتەکاندایە وەك شافیعی دەڵێ، قیاسیان کردوە و زیادەڕەویشان تێدا کردوە، بەکارهێنانی بەرد تەنها بۆ تارەتکردن لە دیارترین روخسەتەکانە و بۆ گشت پیسیەکانیان ژماردوە.[2]

ئەم ناکۆکییە جیاوازی لە کۆمەڵێ مەسەلەی فیقهیدا لێ کەوتۆتەوە لەوانە:

**أ- جیاوازی لە واجببوونی کەفارەت لەسەر بکوژی بەئەنقەست:**

پێشەوایان کۆکن لەسەر واجبی کەفارەت لە کوشتنی بەهەڵەدا، لە کوشتنی بەئەنقەستدا رایان جیاوازە:

شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین کەفارەت بۆ کوشتنی بەئەنقەست یان نیمچە ئەنقەست بە واجب دەبینن قیاس لەسەر کوشتنی هەڵە بە کۆکەرەوەی تساندن (زجر) لە هەردووکیاندا، لەبەرئەوەی ئەگەر لە کوشتنی هەڵەدا واجب بکرێ کە بەبێ گوناهە، ئەوا لەپێشترە کە لە هی ئەنقەست و نیمچە ئەنقەستدا واجب بکرێ کە گوناهکردن تاوانباریش بووە[3]. ئەمە رای زوهری و ئەحمەدە لە یەکێك لە دوو ریوایەتەکەیدا[4]، هەروەها رای شیعەی ئیمامیشە، تووسی دەڵێ (بەڵگەمان ئیجماعی فیرقەیە) هەروەها رێگەی ئیحتیاتیش دەیخوازێ.[5]

---

[1] الاستوي٣/٣٥.
[2] سەرچاوەی پێشوو.
[3] المهذب ٢/٢١٧.
[4] الميزان الكبري الشعرانية ٢/١٢٩.
[5] الخلاف للطوسي ٢/٤٢١.

حەنەفیەت و مالیك و ئەوانەی هاوڕایانن، لەگەڵ ئەوەن کەفارەت لە کوشتنی بەئەنقەست یان نیمچە ئەنقەستدا واجب نیە، ئەمەیش رای زۆربەی شەرعزانی حەنبەلی و ئەحمەدە لە یەکێك لە دوو ریوایەتەکەیدا[1]، هەروەها مەزەبی ثوریپە.

بەڵگەی حەنەفیەت ئەوەیە دەڵێ کوشتنی بەئەنقەست گوناهێکی گەورەیە، کەفارەتیش مانای عیبادەتی تێدایە بۆیە ناخرێتە پاڵ ئەو جۆرە کارانە. ئیبنولهەمام دەڵێ: (وەڵام بۆ قیاسی شافیعی لە واجببوونی کەفارەت لە بەئەنقەستدا لەسەر واجبوونی لە بەهەڵەدا، ئەوەیە: دانانی کەفارەت لە شەرعدا بۆ سڕینەوەی گوناهی بچوك –کە هەڵەیە– بەڵگە نیە لەسەر دانانیشی بۆ سڕینەوەی گوناهی گەورە کە بەئەنقەستە)[2].

ب- جیاوازی لە جائیزبوونی سەلەمی دەستبەجێدا:

جیاوازی لەنێوان شەرعزاندا نیە لەوەی سەلەمی دواخراو دروستە و ئەوە لە روخسەتەکانە. ئیبن عەباس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە و خەڵك پێشینەی بەروبەمی ساڵ و دوو ساڵیان وەردەگرت، ئەویش گوتی "من أسلف في تمر[3] فليسلف في كيل معلوم ووزن معلوم إلى أجل معلوم)). متفق عليه وللبخاري من أسلف في شيء".[4] (واتە: ئەوەی لە خورمادا پێشینەی کرد با بە کێشانە و پێوانەیەکی زانراو و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بیکا).

---

[1] نيل المآرب ١٣٧/٢ الرحمة في اختلاف الامة هامش الميزان ١٣٤/٢الشرح الصغير مع بلغة السالك ٣٧٩/٢ و پاشتر.

[2] فتح القدير ٢٠٩/١٠ـ٢١٠.

[3] روى بالمثناة والمثلثة فهو بها أعم.

[4] بلوغ المرام مع سبل السلام ٤٩/٣.

**شەرعزان لەبارەی سەلەمی دەستبەجێ رایان جیاوازە:**

شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ) ئەوانەی هاوڕاین رایان وایە جائیزە، حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕاین پێیان وایە بەتاڵە.

شافیعی و ئەوانەی شوێنی کەوتون بەڵگەیان ئەوەیە سەلەم بەدواخراوی جائیزە جا ئەگەر بۆ دەستبەجێ جائیز بێ –کە لە نادڵنیایی (غرر) دوورترە– لەپێشترە.[1]

حەنەفیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن ئەم قیاسە فاسیدە لە دو رووەوە:

یەکەمیان ئەوەیە قیاسێکە دەق دەگۆڕێ، ئەویش ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی "من أسلف فليسلف في كيل معلوم ووزن معلوم إلى أجل معلوم"، کە بەڵگەیە لەسەر نامەشروعیەتی سەلەمی دەستبەجێ بە حوکمی تێگەیشتراوی ئامانجەکە، بۆیە قیاس گۆڕینی ئەو دەقەیە و بەوەیش بەتاڵ دەبێ.

دووەمیان: حوکمەکە وەك خۆی لە ئەسڵەکەدا نەماوە بەڵکو جۆرە گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە. چونکە ماوەکە لە ئەسڵدا لە توانا و بوونی عەقدلەسەرکراوەکە دواکەوتوە لەبەر ئیمکانی تێدا پەیدابوونی و لە فەرعەکەدا خستویەتی. روونکردنەوەی ئەمەیش بەم شێوەیە: شەرع بەدواخراوی رێگەی بە سەلەم داوە، جا ترازاندنی حوکمەکەی بۆ سەلەمی دەستبەجێ بەبێ گۆڕینی حوکمی دەقەکە نابێ و بەتاڵ دەبێتەوە، ئەویش چونکە بەئیجماع یەکێك لە مەرجەکانی جائیزبوونی فرۆشتن لە گشت فرۆشتنەکاندا ئەوەیە فرۆشراوەکە بابەتی فرۆشتنەکە بێ، هەروەها ماڵێکی موڵکی بەردەست و بەکەڵك (متقوم) بێ و بتوانرێ وەربگیرێ، ئەویش لەبەر نەهیکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە فرۆشتنی ئەوەی لای مرۆڤ نیە، دیارە لە سەلەمیشدا عەقدلەسەر وجودی نیە بۆیە ئەسڵ تێیدا جائیزنەبوونە، بەڵام شەرع وەك روخسەت بەسیفەتی ماوە (اجل) جائیزی کردوە بەدانانی لەجێی توانا و بوونی عەقدلەسەرکراو، لەبەرئەوەی هۆی هەردووکیانە وەك چۆن ماڵ (عەین) لەجێی سوودە لە عەقدی

[1] المهذب للشيرازي ٢٩٧/١.

\

بەکرێداندا و ماوەکە بوو بە مەرج نەك لەبەر عەینی خۆی بەڵکو لەجیاتیی مەرجی جائیزبوونی عەقدەکە، ئەویش بوونی توانایە بەسەر عەقدلەسەرکراودا، بۆیە تەعلیلکردنی بەشێوەیەك سەریکێشیٚ بۆ خستنی ئەو مەرجە دروست نیە، ئەگینا ئەمە ترازانی حوکمی دەقەکە نەدەبوو بەڵکو بەتاڵکردنەوەی دەبوو[1] و جێگیرکردنی حوکمێکیتر لە فەرعەکەدا کە دەق باسی نەکردوە، چونکە لە ئەسڵدا باسی کردنی ماوەکەی بە جێگرەوەی توانا کردوە و ئەوەی لە فەرعەکەدا دروست نەکردوە.

وای دەبینم رای زاڵ قسەکەی حەنەفیەت و ئەوانەیە هاورِایانن، چونکە دەق بەرِوونی ماوە (الاجل)ی بە مەرجێك لە مەرجەکانی دروستیی سەلەم داناوە، هەروەها ئەگەر سەلەم دەستبەجیٚ بیٚ ئەو سوودەی لێدەکەوێتەوە کە لە روخسەتدان بە سەلەم مەبەستە، چونکە لەم بارەدا هیچ پاساو نیە بۆ ترازان لە عەقدی فرۆشتنەوە بۆ عەقدی سەلەم، هەندیٚ لە شافیعیەکان بەشێوەیەکی تایبەت بۆ دروستیی سەلەمی دەستبەجیٚ ئەوەیان کردۆتە مەرج کە لەکاتی عەقدکردنەکەدا عەقدلەسەرکراو وجودی هەبیٚ (نەبوو نەبیٚ).

## چوارەم: هۆ و مەرج و رێگرەکان:

زانایان لە ئوسولناس و شەرعزان لەبارەی دروستیی قیاسکردن لە هۆ و مەرج و رێگرەکاندا رایان جیاوازە:

زۆربەی شافیعیەکان و هەندیٚ لە حەنەفیەکان و ئەوانەی هاورِایانن قیاسکردن تێیاندا بە جائیز و هەندێکیتر بە ناجائیزیان داناوە، ئەوە لەلایەن ئامەدی لە شافیعیەتەوە هەڵبژێردراوە و زۆربەی زانایانی حەنەفیش پەسەندیان کردوە.[2]

---

[1] بروانە: حاشیة الأزمیري ٢/٢٩٢-٢٩٣ کشف الأسرار مع البزدوي ٣/١٠٣٨ و پاشتر

[2] تسهیل الوصول إلى علم الأصول ص ٢٢٥.

ئەوانەی وتویانە نابێ: دەڵێن حیکمەت ڕێکخراو (منضبط) نیە، لەبەرئەوەی چەند ئەندازەیەك لە پێویستییە بەڵام وەسفەکانی ڕێکخراون، لەبەرئەوە حوکم لە هۆکەی دەکەوێتەوە حیکمەت هەبێ یان نەبێ، بەبەڵگەی بڕینی دەستی دز با ماڵەکەیش لەلای بمێنێتەوە و بگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، هەروەها حەد لە زیناکار دەدرێ با دەریشکەوتبێ نەسەب تێکەڵ نەبووە، جا ئەگەر لە هۆ و مەرج و ڕێگرەکاندا قیاس بکەین بەحیکمەت کۆدەکەینەوە، کە ڕێکخراو نیە، کۆکردنەوەیش بەبێ ڕێکخراوی نابێ[1].

ئەوەیش پێی وایە جائیزە، ئەوەی کردۆتە بەڵگە کە هۆبوون و مەرجبوون و ڕێگربوون ئەحکامی شەرعین، بۆیە وەك باقیی حوکمەکاینتر قیاس تێیاندا جائیزە.

ئەم ناکۆکیەیش جیاوازبوونی لە هەندێ حوکمی شەرعیدا لێ کەوتۆتەوە، لەوانە:

أ- لە هۆکاندا: شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین کوشتنیان بەشتی قورس وەك بەردی گەورە یان دارتەختەیەکی گەورە بە کوشتن بە چەك قیاس کردوە لە واجبی قیساسدا، ئەوەیش قسەی ئەبویوسف و محەمەدە، چونکە کوشتن بە شتی قورس بەئەنقەست دادەنێن.

ئەبوحەنیفە پێچەوانەی ئەوانە و کوشتنی بە شتی قورس بە واجبکەری قیساس دانەناوە[2]، بەڵکو بە نیمچە ئەنقەستی داناوە، بۆیە قیساس واجب ناکا. بەلای ئیمام مالیکەوە ئەنقەست و هەڵە ناوەندیان نیە، لەبەرئەوەی لە قورئاندا تەنها ئەنقەست و هەڵە هاتووە نیمچە ئەنقەست وجودی نیە، لەبەرئەوە کوشتن بە شتی قورسی بە کوشتنی بەئەنقەست داناوە.

ب- لە مەرجەکاندا: شەرعزان رایان جیاوازە لەبارەی قیاسکردنی دەستنوێژ لەسەر تەیەموم بەکۆکەرەوەی ئەوەی هەردووکیان مەرجن بۆ دروستی نوێژ. ئەوەی

---

[1] شرح تنقیح الفصول للقرافي ٤١٤.

[2] فتح القدير ٢١/١٠.

قیاسکردنی له مەرجەکاندا بەجائیز داناوە قیاسی کردوە لەسەر تەیەموم و وتویتی نیەت تێیدا واجبە، وەك مالیکی و شافیعی. ئەوەیش پێی وانیە، دەڵێ نیەت لە دەستنوێژدا واجب نیە، وەك حەنەفی.

تێبینی دەکرێ رای ئەوانەی دەڵێن قیاس لەسەر تەیەموم دەکرێ رەخنەی ئەوەی لێ دەگیرێ دەستنوێژ بەر لە تەیەموم دانراوە و لە مەرجەکانی دروستیی قیاسیش ئەوەیە، حوکمی ئەسڵەکە پێش لە حوکمی فەرعەکە بێ. رای زاڵ لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە بوترێ دەستنوێژ لەلایەك شوبهەی عیبادەتی رووت (العبادة المحضة)ی تێدایە، کە بە هەموولا کۆکن لەسەر ئەوەی پێویستی بە نیەت هەیە. لەلایەکیتر شوبهەی عیبادەتی مانا روون (العبادة المفهومة المعنى) تێدایە کە پێویستی بە نیەت نیە وەك لابردنی پیسی (النجاسة). لەبەرئەوە ناکۆکی تێکەوتوە: ئەوەی تەماشای ئەوەی کردوە کە زیاتر لە عیبادەت دەچێ وتویتی نیەت واجبە. ئەوەیش پێی وابووە زیاتر لە پاکوتەمیزی دەچێ وتویتی واجب نیە.[1]

قیاس لەسەرکراو یان عیبادەتی رووتە، یان پاکوتەمیزییە وەك شۆردنی پیسی، ئەمەیش لە قیاسی لێکچوونە (قیاس الشبه).[2]

---

[1] بڕوانە: بداية المجتهد ٦/١.

[2] ئەویش لکاندنی ئەو فەرعەیە لەنێوان دوو ئەسڵدا دێ و دەچێ بەوەیانەوە کە زۆرتر لێی دەچێ. تەلمەسانی دەڵێ: وەك دەستنوێژ کە لەنێوان تەیەموم و لابردنی پیسیدا دێ و دەچێ، لە تەیەموم دەچێ لەو رووەوە ئەوەی دەستنوێژکانی پێ لادەبرێ لە هەردووکیاندا حوکمییە. لە لابردنی پیسیش دەچێ لەوەدا ئەوەی پێیان لادەبرێ هەستییە نەك حوکمی. مالیکی و شافیعی نیەت لە دەستنوێژدا واجب دەکەن بۆ ئەوەی زیاتر لە تەیەموم بچێ، حەنەفیەتیش نیەت واجب ناکەن تا لابردنی پیسی زاڵ بکەن. هەرلایەکیش پاساوی خۆیان هەیە. بڕوانە: أصول التلمساني ص١٨٤.

# بەشی سێیەم:
# ئیستیحسان و کاریگەری
# لەسەر جیاوازیی ئەحکام

ئەم بەشە دوو باس لەخۆ دەگرێ:

یەکەمیان سەبارەت بە رای زانایان لەبارەی ئیستیحسان.

دووەم لە پیادەکردنە فیقهییە خیلافیەکان کە لە جیاوازبوون لە پیادەکردنی ئیستیحسان دەکەونەوە.

## باسی یەکەم:
## رای زانایان لە ئوسولناسان و شەرعزان لەبارەی ئیستیحسان

لەم باسەدا هەوڵ دەدەین رای هەر مەزەبێك لە ئیستیحسان بخەینە روو، پاشان بەراورد لەنێوان ئەو رایانەدا بکەین بۆ گەیشتن بە شێوەکانی ناکۆکی، کە بوونەتە مایەی جیاوازبوون لە ئەحکامدا.

حەنەفی:

ئیستیحسان: بەلای حەنەفیەتەوە بە دوو قۆناغدا تێپەریوە: قۆناغی رەهایی (الاطلاق) و قۆناغی سنووردارکردن (التحدید).

قۆناغی یەکەم: بەکارهێنانی ئیستیحسان بەبێ دیاریکردنی ناوەرۆکەکەی:

ئـەوەی چـاو بـە سەرچـاوە فیقهییـە حەنەفیەکانـدا بگێـڕێ بـەکارهاتنی هـەردوو دەستەواژەی (ئیستیحسان) و (ئەو قیاسەی لەگەڵیدایە) بەزۆری دەبینێ و دەوتـرێ: حـوکم لـەم مەسـەلەیەدا بـەم شـێوەیە، بـەڵام وامـان پـێ چـاکە (نستحسـن کـذا)، ئیستیحسان وادەخوازێ و قیاسیش پێچـەوانەیەتی و کـار بـە قیـاس دەکـەین و بـەم شێوەیە[1].

بۆ نموونە ئەوەی شایەتی زینای لەسـەر دەدرێ و حـوکمی جەڵدلێـدانی بەسـەردا دەدرێ و پێش تەواوبوونی حەدەکەی دوو کـەس شـایەتی دەدەن کـە هاوسـەردارە، ئەبوحەنیفە دەڵێ بەئیستیحسان رەجم ئیسپات دەکەین بەپێچەوانەی قیاس. ئەگـەر ئیمـام یـان جێگرەکـەی یـان حاکمەکـەی پیاوێکیـان بینـی دزی دەکـا یـان مـەی دەخواتەوە، ئەبویوسف دەڵێ پێویسـتە بـەو بینینـە حـەدی لـێ نـەدرێ تـا بەڵگـەی لەسەر پەیدا دەبێ، ئەمە ئیستیحسانە، بەڵام قیاس ئەوەی لەسەر جێبەجێ دەکـات، بەپێچەوانەی مافی خـەڵك کـە پێویسـتە هـەرکات بیسـتی دانـی پێـدا دەنـێ حـوکمی پێبدا.[2]

پرسیار لە محەمەد (رەحمەتی خوای لێبێ) کـرا لـەبارەی پیاوێـك لـە نوێـژدا ئایـەتی سوجدە دەخوێنێ و رکوع دەبـا، ئایـا بـۆی حسێبە؟ گـوتی: بـەپێی قیـاس لـەوەدا سوجدە و رکوع وەك یەکن، لەبەرئـەوەی هـەموویان نوێـژن، بـەڵام لـە ئیستیحسـاندا پێویستە سوجدە ببا، ئێمەیش دەست بە قیاسەوە دەگرین.[3]

بەم شێوەیە ئـەم زاراوەیـە لەسـەر زاران هـاتووە و نـەزانراوە پێناسـە و دیاریـیـان کردبێ، لەبەرئەوە لە ئیستیحسانکردنەکانیاندا دووچاری رەخنەی خەڵك بوونەوە و لە هەموو لایەکەوە تانەیان لێدەدرا: فـەرموودەناس و شـەرعزان لەلایـەك و موتـەکیلمان

[1] بڕوانە: حجة الله البالغة ١٦١/١ الجامع الكبير لإمام محمد ص ١٦٥. تعليل الأحكام ص ٣٣٠
[2] الخراج ص ١٠٨
[3] فتح القدير ٣٨٧/١

لەلایەکیتر، یەکێك دەیوت بەئارەزووی خۆیان شەرع دادەنێن، یەکێکیتر دەیوت بە را واز لە حەدیسی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دێنن.

قۆناغی دووەم: شەرعزانی حەنەفی (پاشینان) لەئاست ئەم رەخنانەدا دەستەوئەژنۆ دانەنیشتون و مل بەوە بدەن کە ئیمامەکەیان بە ئارەزووی خۆی شەرعی داناوە، بەڵکو سەلماندویانە ئیستیحسان بەڵگەیەکی شەرعی و سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی فیقهی ئیسلامی و بە دەربڕینی جۆراوجۆر گوزارشتیان لە حەقیقەتی ئەم سەرچاوەیە کردوە، لەوانە:

أ- هەندێکیان دەڵێن: ئەوە لادانە لەوەی قیاس واجبی دەکا بۆ واجبکەرێکی بەهێزتر[1]. ئەمە بەوە رەخنەی لێدەگیرێ کە ئیستیحسانی سەلماو بە بەڵگەیەکیتری غەیری قیاس ناچێتە ژێر خانەی ئەم پێناسەیە، وەك ئەوەی بە ئەسەر یان ئیجماع یان زەرورەت سابت بووە.

ب- هەندێکیان دەڵێن ئەوە تایبەتکردنی قیاسە بە بەڵگەیەکی بەهێزتر[2]. ئەمەیش بەوە رەخنەی لێدەگیرێ کە ئەگەرچی سەرجەم جۆرەکانی قیاسی گرتۆتەوە، بەڵام ئاماژە بەوە دەکا کە ئیستیحسان تایبەتکردنی عیللەیە، وایش نیە.

ج- کەرخی دەڵێ: ئیستیحسان ئەوەیە مرۆڤ خۆی لابدا لەوەی لە مەسەلەیەکدا بەو شێوەیە حوکم بدا کە لە هاوشێوەکایندا حوکمی داوە بۆ حوکمدان بە جیاواز لەوە، لەبەر هۆیەك کە دەخوازێ لە یەکەم لابدا. ئەمەیان رەخنەی لێدەگیرێ بەوەی نەسخکردنەوە و تایبەتکردنیش دەگرێتەوە.

د- بەزودی دەڵێ: ئیستیحسان لادانە لە واجبکەری قیاسەوە بۆ قیاسێکی لەو بەهێزتر، یان تایبەتکردنی قیاسە بەبەڵگەیەکیتر بەهێزتر لەو.[3]

---

[1] کشف الأسرار مع البزدوي ٤/١١٢٣.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

کەمال بن ئەلهەمام دەڵێ: حەنەفیەت قیاسیان دابەش کردوە بۆ ئاشکرا و پەنهان (الجلي و الخفي)، یەکەمیان قیاس و دووەمیان ئیستیحسانە، کە ئەمەی دووایی قیاسی پەنهانە بەبەراورد بە قیاسێکی زاهیر. هەروەها دەوترێ ئیستیحسان بۆ ئەوەیە لە قیاسی پەنهان گشتیترە، واتە هەموو بەڵگەیەك کە قیاسێکی زاهیر لە دەقێك لە بەرانبەری بێ وەك سەلەم، یان ئیجماعێك بەرانبەری بێ وەك داوای بۆ دروستکردن (الاستصناع)، یان زەرورەت بەرانبەری بێ وەك پاکیی ئەستێر (حەوز) و بیرەکان، کە نکوڵی لێکاری نەیزانیوە مەبەست لێی چییە (واتە لای ئەوانەی باوەڕیان پێیەتی).[1]

پاش دیاریکردنی لەلایەن ئەو زانایانەوە نەیارەکانیان ملکەچی راکەیان بوون و گوتیان: ئیستیحسانێکی جێناکۆك نیە مادام لە چوارچێوەی ئەو بەڵگانە دەرنەچێ کە کۆکیان لەسەرە، پاشینانی مەزهەبی شافیعی دەستیان دایە تەئویلکردنی قسەی ئیمامەکەیان کە لەسەر زمانی بەناوبانگە و دەڵێ (من استحسن فقد شرع) و دەڵێن: شافیعی مەبەستی ئیستیحسانە بە ئارەزوو کە پشت بە ئەسڵێکی شەرعی نەبەستێ.[2]

سەرباری ئەم دیاریکردنانە بۆ چەمکی ئیستیحسان، مەبەستی ئیمامەکەیان، واتە ئەبوحەنیفەی بەدینەهێنا، لەو رووەوە قیاسی بەرانبەر ئیستیحسانیان بەجۆرەکانیەوە کردە قیاسێکی ئوسوڵی، لەکاتێکدا لە زۆربەی بارەکاندا وادیارە بەمانای ئەو رێسای گشتییە دێ کە لە کۆی ئەو بەڵگانەی لە یەك جۆردا هاتوون وەرگیراوە، یان بەمانای خواستی بەڵگەی گشتی.

شیکردنەوەی ئەمەیش ئەوەیە: هەر کۆمەڵێك لە شەرعزانی موسڵمان کۆمەڵێك زاراوە و رێسای گشتی و (کولیاتی ئیجتیهادی)یان هەیە کە لە کۆی بەڵگەکان وەریانگرتوون: بەوەی ئەو بەڵگانە کۆدەکەنەوە کە لە یەك جۆردا هاتوون، بەدوای

---

[1] التحرير مع التقرير والتحبير٣/٢٢٢

[2] تعليل الاحكام ص٣٢٥

ناسخ و مەنسوخ و گشتی و تایبەت و رەها و بەند و زاڵ و بنزاڵیدا دەگەڕێن، پاشان لەوە ڕێسایەکی گشتی پاڵفتە دەکەن کە بەسەر جوزئیاتە زۆرەکاندا پیادە (پراکتیك)یان دەکەن چ ئەوانەی ڕوویان داوە و چ ئەوانەی ڕوویان نەداوە و فەرزیان بکەن و حوکمیان بدەنێ. ئەگەر بەڵگەیەکیان نەدۆزیەوە دژی ئەم ڕێسایە بێ گشتیبوونەکەی درێژ دەکەنەوە و هیچ لە تاکەکانی هەڵاوێر ناکەن، بەڵام ئەگەر شتێکیان بینییەوە کە لە هەندێ جوزئیاتیدا دژی بوو، تەماشای بەڵگەکە دەکەن، ئەگەر بینییان سەنەد و دیلالەتی دروستە لە جێی خۆیدا کاری پێدەکەن و ئەو تاکە لەو ڕێسایە هەڵاوێر دەکەن و ئەو تاکە دوو حوکمی دژبەیەکی دەبێ: حوکمێك بەئیعتیباری چوونە ژێر ئەو چەمکە هەمەکیەی کە بەڵگەیەکی گشتی یان کۆمەڵە بەڵگەیەکی تێدا هاتووە، لەگەڵ جوکمێکی پێچەوانەی ئەمە کە بەڵگەی تایبەت بۆی جێگیر کردوە.

لێرەوە بووە بە عورف لای هەندێ شەرعزان کە ناوی بنێن حوکمی بەباشزانراو (موستەحسەن) بەپێچەوانەی قیاس، ئەو کارەیش ناونراوە بەباشزانین (ئیستیحسان)، هەندێکیشیان بەو ناوە ناوی نابەن، بەڵکو ناوی دەنێن هەڵاوێدراو لە حوکمی گشتی.

ئەوەی چاو بە حوکمە ئیجتیهادییە فەرعیەکانی ئەبوحەنیفەدا بخشێنێ، دەبینێ ئەم موجتەهیدە مەزنە لەوەی لە کتێبی خوا تێگەیشتوە و لە سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی گەیشتووە ڕێسا و بنەمای داناوە، هەروەها تێدەگا مەبەستی لەو قیاسەی کە لێی لادەدا -کە بە تێڕوانینی ئەو لادانەکە واجبە- ئەو ڕێسا گشتییەیە کە لە کۆی ئەو بەڵگانەی لە جۆرێکدا هاتوون، یان خواستی بەڵگەی گشتی وەرگیراوە، هەروەك لەوانەیە قیاسی ئوسولیش بێ.

**مالیکی:**

ئیبنـول عـەرەبی پێناسـەی کـردوە بـەوەی هەڵبـژاردنی وازهێنانـە لـە خواسـت (موقتەزا)ی دەلیل بەڕێگەی هەڵاوێران و مۆڵەتـدان، بـۆ بەرهەڵسـتیکردنی ئـەوەی لـە هەندێ خواستەکانیدا بەرهەڵستی پێدەکا.[1]

ئەلباجی دەڵێ: ئیستیحسان قسەکردنە بەبەهێزترینی نێوان دوو بەڵگە.[2]

قەڕافی دەڵێ: مالیك لە چـەند مەسـەلەیەکدا لەگـەڵی بـووە وەك لـە بـەزامنکردنی پیشەوەران کە بە سنعەتەکەیان کار لە ماڵەکان دەکەن، هەروەها تەزمینی هـەڵگرانی خواردن و پێخۆر، جیاواز لە باقیی هەلگر (حەماڵ)ەکانیتر.[3]

شاتبی دەڵێ: بەلای ئێمە و ئەبوحەنیفەوە ئیستیحسان کارکردنە بـە بـەهێزترینی دوو بەڵگە... مالیك و ئەبوحەنیفە لەگـەڵ تایبـەتکردنی عمـومن بەهـەر بەڵگەیـەك لـە زاهیر بێ یان مانا، مالیك وای پێ باشە بـە بەرژەوەنـدی تایبـەت بکـرێ، ئەبوحەنیفـە وای پێ باشە بە قسەی یەکێك لە هاوەڵان کە بە پێچـەوانەی قیـاس هـاتووە تایبـەت بکـرێ، هەردووکیشـیان پێکـەوە لەگـەڵ تایبـەتکردنی قیـاس و هەڵوەشـاندنەوەی عیللەن.

ئیبن روشدی باپیر دەڵێ: ئیستیحسان وەلانـانی ئـەو قیاسـەیە کـە دەبێتـە هـۆی ڕۆچوون لە حوکمێك و زیادەڕەوی تێداکردنی بۆ حوکمێکیتر، لـە جێیەکدا دەخـوازێ قیاس لەوە هەڵاوێر بکرێ.

لەم دەربڕینانە و هیتر بەو ئەنجامە دەگەین کە: ئیستیحسان لـە فیقهـی مالیکیـدا لادانە لە خواستی دەلیلێکی گشتی یان بـەردەوامیی قیـاس بـۆ ئـەوەی ئـەوە واجـب دەکا لە عورف یان بەرژەوەندیی زاڵ، یان لادانی ئاستەمی و زەحمەتیەك.

---

[1] مصادر التشريع للاستاذ خلاف ص ٥٨

[2] شرح تنقيح الفصول ص ٤٥١

[3] سەرچاوەی پێشوو لا٤٥٢

**شافیعی:**

لە قسەکانی شافیعی لە (الرسالة) و لە (الام)دا دەگەینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- باوەڕ بە ئیستیحسان هیچ نیە جگە لە چێژبردن و قسەکردن بەئارەزوو و رای رووت، پاشان قورئان و سوننە و ئیجماعیش رێگەی پێنادەن.

٢- پشت پێبەستنی -بەم سیفەتەیەوە- گوناه و نەفامییە و شایان بە شانی هیچ زانایەك نیە.

٣- کارپێکردنی شپرزی لە حوکم و فتوادا دروست دەکات و چەندین را و حوکم لە یەك مەسەلەدا واجب دەکا.

پاش ئەم ئەنجامانە ئایا دەکرێ بڵێین: شافیعی نەیاری کارکردن بە ئیستیحسان کە ئەبوحەنیفە و مالیك و هاوەڵانیان پەسەندیان کردوە و کارپێکردنی بە چێژبینین و نەفامی و گوناه دەبینێ؟

وەڵام: نەخێر، لەبەر دوو هۆ:

یەکەم- ئەو ئیستیحسانەی شافیعی هێرشی کردۆتە سەر ئەو ئیستیحسانە نیە کە ئەبوحەنیفە و مالیك و هاوەڵانیان باسی دەکەن.

دووەم- رووداوەکان شایەتی ئەوەن شافیعی و هاوەڵانی لەگەڵ ئیستیحسان بوون و کاریان پێ کردوە.

شیکردنەوەی یەکەمیان: شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ) لە جەرگەی رەگەزەکانی جیاوازبووندا ژیاوە و چمکەکانی مەزەبی خەڵکی عێراق و خەڵکی حیجازی گرتوە و تێکەڵی کردون و مەزەبێکی ناوەندی پێکهێناوە کە رێبازی خەڵکی عێراق و رێبازی ئەهلی حەدیس کۆدەکاتەوە. بەڵام دەبینی دەسەڵاتی ئەهلی حەدیس لە سەردەمەکەیدا خەریکە بەهۆی لاوازییان لە دەمەتەقێ (مونازەرە)دا دەپوکێتەوە. هەروەها دەبینی تانە لەدوای تانە لە ئەهلی را دەدرێ، بۆیە دەستی کرد بە

پشتیوانیکردنی ئەوانە و هەوڵی دا را بگێڕێتەوە بۆ قیاس، کە بریتییە لە بەستنەوەی فەرعێك کە دەق لەسەر حوکمی نیە، بە یەکێکیترەوە کە دەق لەسەر حوکمی هەیە بەکۆکەرەوەیەك لەنێوانیاندا، بەوەیش گەردەلولەکە تاوێك هێور بوویەوە و دەستی ئەوانەی کۆتا کرد کە بەناشایستەیی لەم دەرگاوە هاتبوونە ژوورەوە، ئەویش لەڕێی دانانی کۆمەڵێ ڕێساوە بۆ ئیجتیهاد.

شیکردنەوەی دووەمیان: ئەوەی چاو بە فیقهی شافیعیدا بگێڕێ، کارکردنی زۆر بە بەرژەوەندی دەبینێ، کە لای حەنەفی و مالیکی پێی دەوترێ ئیستیحسان.

شافیعی ڕێگەی بە لەناوبردنی داروباری دوژمنان و رووەك و ئاژەڵەکانیان داوە کە خۆیان و کەرەستە جەنگیەکانیان دەگوێزنەوە، ئەگەر هاتوو شەڕ و بردنەوە و سەرکەوتن وای خواست، لەکاتێکدا نەهی لەمە کراوە. لادانی لە دەق لەبەر بەرژەوەندیی گشتی هەر ئەوەیە کە ئەبوحەنیفە و مالیك ناویان ناوە ئیستیحسان.

شافیعیەت فتوای داوە بە جائیزبوونی زەمانی پێزانین (ضمان الدرك) —لەکاتێکدا ئەوە پێچەوانەی قیاسە، لەو رووەوە فرۆشیار ئەگەر موڵکەکەی فرۆشت ئەو پارەی وەریگرتوە نابێتە قەرز لەسەری تا زامنی نەکا— ئەوەیش دەبەستنەوە بە پێویستیی خەڵك بە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانێکی نەناس و دەرچوونی فرۆشراو بەشایستەیی مسۆگەر ناکا، ئەگەر ڕێگەیان بەوە نەدایە خەڵك تووشی زەحمەتی دەبوون.

ئەمە ڕێك هەر ئەوەیە ئیمام مالیك فتوای پێداوە، ئەوەیش هەر مانای کارکردنە بە ئیستیحسان— شافیعیەت ڕێگەی داوە بە بردنی گژوگیای حەرەم بۆ ئالفدانی ئاژەڵ لەبەر ئەو زەحمەتیەی تووشی هەمووان دەبێ ئەگەر ڕێگەیان پێنەدرێ لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڕاشکاوی نەهی لێکردوە، ئەمەیش هەر مانای ئیستیحسان دەگەیەنێ. ئەمە لەڕووی پیادەکردنە فیقهییە کرداریەکانەوە.

لەڕووی گوتە و گواستنەوەیشەوە: ئامەدی دەڵێ[1]: لە شافیعیەوە گوێزراوەتەوە کە وتویێتی:

(أستحسن في المتعة أن يكون ثلاثين درهما، وأستحسن ثبوت الشفعة للشفيع الى ثلاثة ايام. وأستحسن ترك شيء للمكاتب من نجوم الكتابة). واتە: (وام پێباشە موتعەی تەڵاقدراو) سی درهەم بێ، وام پێباشە بۆ شەفیعی بۆ هەقدار (شەفیع) بۆ ماوەی سێ ڕۆژ جێگیر بکرێ، وام پێباشە شتێك لە..).

لەبارەی دزیشەوە دەڵێ: (إذا أخرج السارق يده اليسرى بدل اليمنى فقطعت: القياس أن تقطع يُمناه والاستحسان ألاّ تُقطع).

واتە: ئەگەر دز لەباتی دەستی چەپی دەستی ڕاستی دەرهێنا و بڕدرا: قیاس ئەوەیە دەستی ڕاستی ببڕدرێ، بەڵام واباشە نەبڕدرێ (واتە ئیستیحسان وایە). پاشان ئامەدی لەبارەی ئەو قسەیەوە دەڵێ: ئیتر ناکۆکی نەما تەنها لە مانا و حەقیقەتی ئیستیحساندا نەبێ.

عەبدولعەزیزی بوخاری دەڵێ:: (محي السنة) لە (التهذيب)دا دەڵێ: دانانی مەسحەف لە کۆشی سوێندخۆردا شافیعی بەباشی زانیوە، وەك قورسکردن لەسەری.[2]

هەروەها لە قسەی ئیبنول حاجب و کەمال بن ئەلهەمام ئەوە وەردەگیرێ ناکۆکیی شافیعی و ئەوانەی شوێنی کەوتون لەگەڵ ئەوانەی لایەنگری ئیستیحسانن، ناکۆکیەکی لەفزییە.[3]

لەم خستنەڕووە خێرایەوە بۆمان روون دەبێتەوە ئەوەی دەدرێتە پاڵ شافیعی کە کارکردن بە ئیستیحسان ڕەت دەکاتەوە، ڕاست نیە.

---

[1] الاحكام في اصول الآمدي ٣/٢٠٠.

[2] كشف الاسرار مع البزدوي٤/١١٢٣.

[3] مختصر المنتهى مع العضد والسعد ٢/٢٨٨ التحرير مع التقرير والتحبير ٣/٢٢٣.

حەنبەلی:

ئیمام ئەحمەد وەك سێ ئیمامەکەیتر ئیستیحسانی پەسەند بووە و وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی تەشریع پراکتیزەی کردوە، بەلام لە بازنەیەکی بەرتەسکتردا. لە پێناسەکانی حەنبلەیەکان:

ئەلتوفی لە (مختصر)ەکەیدا دەڵێ: ئیستیحسان لادانی حوکمی مەسەلەیەك لە هاوشێوەکانی، لەبەر بەڵگەیەکی شەرعیی تایبەت.[1]

ئیبن قودامە دەڵێ: ئیستیحسان سێ مانای هەیە: یەکەمیان لادانی حوکمی مەسەلەیەك لە هاوشێوەکانی لەبەر بەڵگەیەکی تایبەت لە کیتاب یان سوننە. دووەمیان ئەوەیە موجتەهید بەئەقڵی خۆی بەباشی دەزانێ، سێیەمیش مانایەکە لە دەروونی موجتەهیددا دەجمێ کە ناتوانێ گوزارشتی لێبکا.[2]

ئیبن بەدران دەڵێ: قسەکەی ئەحمەد ئەوە دەگەیەنێ ئیستیحسان لادانە لە واجبکەری قیاس لەبەر بەڵگەیەکی بەهێزتر.[3]

موعەمەر بەغدادی دەڵێ[4]: نموونەی ئیستیحسان ئەوەیە ئەحمەد وتویێتی کە وا باشە بۆ هەر نوێژێك تەیەموم بکرێ، قیاسیش ئەوەیە تەیەموم وەك ئاو وایە تا دەستنوێژی دەشکێ، هەروەها دەڵێ: دروستە رەشە زەوی بکڕدرێ بەلام فرۆشتنی دروست نیە. وترا چۆن ئەوەی توانای فرۆشتنی نەبێ دەکرێ؟ وتی: قیاس بەم شێوەیە بەلام ئەوە ئیستیحسانە، لەبەرئەوە فرۆشتنی مەسحەف (قورئان) قەدەغە دەکا بەلام لەڕووی ئیستیحسانەوە فەرمان بەکڕینی دەکا. لە قسەکەی ئەحمەد گەیشتمە ئەو ئەنجامەی: ئەو بەباشزانین (ئیستیحسان)ـەی دراوەتە پاڵی بریتییە لە

---

[1] مصادر التشريع ص ٥٨–٥٩

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] المدخل إلى مذهب إمام أحمد لابن بدران ص ١٣٦

[4] سەرچاوەی پێشوو.

پێشکەشکردنی بەڵگەی شەرعی یان ئەقڵی بۆ باشەکەی.[1]

لەم قسانە و هیترەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ئیمام ئەحمەد و هاوەڵەکانی لەگەڵ ئیستیحسان بوون و دەشێ فراوانیی چەمکی ئیستیحسان لایان لە فراوانیی چەمکەکە لای ئەوانەی پێش خۆی کەمتر نەبێ، بەڵام لەرووی کرداری و پراکتیکیەوە حەنبەلیەکان بەکەمی نەبێ دەستیان بۆ نەبردوە، تەنانەت ئیبن تەیمیە قسەکانی حەنەفیەتی لە سەرجەم ئەو عەقدانەدا رەت کردۆتەوە کە بەپێچەوانەی قیاسیان داناون و –حەنەفیەت– بەرێگەی ئیستیحسان بەجائیزیان داناون وەك موزارەبە و مزارعە و مساقات و بەکرێدان و سەلەم... و سەلماندنی ئەوان لەگەڵ قیاس کۆکن[2].

ئیمامی:

لە قسەی شیعەی ئیمامی لە مەرجەعە ئوسوڵی و فیقهیەکانیاندا ئەم ئەنجامگیرییە دێتە دەست:

١- ئیستیحسان بە عورف مەسەلەی عورف و حوججەبوونیەتی، ئەمەیش نابێتە حوججە و بەڵگەیەك تا ئەو حوکمەی لەسەری دەوەستێ نەگاتەوە بە سەردەمی مەعسومەکان، ئەگەر ئیقراریان کرد ئەوا ئیقرارەکەی ئەوان دەبێتە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] ئیبن تەیمیە دەڵێ: ئەوانەی موزارەبە و ئاویۆدان و مزارعە پێچەوانەی قیاسن گومانیان ولبوو ئەو عەقدانەیان لە جنسی بەکرێدانە.. ئەمە لە هەڵەی ئەوانە چونکە ئەوانە لە جنسی هاوبەشی (مشارکات)ن.. هەرچی حەواڵەیە: ئەوەی وتوێتی پێچەوانەی قیاسە دەڵێ ئەوە فرۆشتنی قەرزە بەقەرز، ئەوەیش نابێ و لە دوو رووەوە هەڵەیە پاشان دوو رووەکە شەرح دەکا. ئەوەیش وتوێتی قەرز پێچەوانەی قیاسە دەڵێ لەبەرئەوەی فرۆشتنێکی ریبەوییە بە جنسەکەی خۆی بەبێ وەرگرتن، ئەمەیش هەڵەیە، چونکە قەرز لە جنسی بەخشینە بە شتە سوودەکان وەك شتی خوازراو. هەرچی قسەی ئەوەیە دەڵێ: لابردنی پیسی پێچەوانەی قیاس و مارەکردن پێچەوانەی قیاس و ئەو جۆرە شتانە، ئەوە لە خراپترین قسەکانە.. تا کۆتایی ئەوەی ئیبن تەیمیە لەم بارەوە دەیڵێ. بڕوانە: القياس في الشرع الإسلامي لابن تيمية، ص ٧ و پاشتر.

حوججە لەبەرئەوەی ئیقراریان لە سوننەوەیە، ئەگینا پێویست پێی نیە.

٢- ئیستیحسان بە بەرژەوەندی دەچێتە خانەی (مەسالیحی مورسەلە) و دەگەڕێتەوە بۆ حوججیەتی ئەقلْ و لەو بنەمایانە نیە کە سەربەخۆ وەستاون.

٣- ئیستیحسان بەمانای کارکردن بە بەهێزترینی دوو بەلْگە دەچێتە خانەی تێکگیرانی بەلْگەکان، کە زالْکەری خۆی هەیە بۆ نەهێشتنی تێکگیرانەکە و زالْکردنی یەکێك لە دوو بەلْگەکە بەسەر ئەویترياندا، بەلاّم ئەگەر مەبەست لە ئیستیحسان خسوسی دەستگرتن بە بەهێزترینی دوو بەلْگەوە بیّ، ئەوە باشە و لاری نیە لە دەست پێوەگرتنی، بەلاّم بەهیچ شێوەیەك بە ئەسلێك لەبەرانبەر کیتاب و سوننە و ئەقلْ دانانریّ.[1]

لەمەوە ئەوە تێدەگەین کە ئەوان ئیستیحسان وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی فیقهی ئیسلامی ئیقرار ناکەن.

شیعەی زەیدی:

جمهورەکەیان ئیستیحسانیان پەسەند کردوە و بەسەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی تەشریعیان داناوە. بەلایانەوە ئیستیحسان، وەك لە (معيار العقول)[2]دا هاتووە: لادانە لە قیاس لەبەر شتێکی لەپڕ کە دەستگرتن بە بەلْگەیەکی بەهێزتری واجب کردوە. مامۆستا ئەبو زەهرە دەلْیّ ئەمە ئاکامی ئیستیحسانە لای حەنەفیەت.

بەبڕوای من ئاکامەکەی لای حەنەفیەت گشتیترە، لەبەرئەوەی مەبەست لە قیاس لای ئەبوحەنیفە گشتیترە لەوەی قیاسێکی ئوسولْی یان ڕێسایەکی گشتی یان خواستی دەقێکی گشتی بیّ وەك پێشتر باس کرا، بەلاّم بەلای زەیدیەوە لە ئیستیحساندا پێویست بە دوو دەلیلی گومانگری لێلادراو و بۆلادراو دەکا، هەردووکیان ڕاستن و مەرجی هیچکامیان تێکنەچووە، بەلاّم لەبەر هۆیەکی زالْکەر

---

[1] بڕوانە: الأصول العامة للفقه المقارن محمد تقي الحكيم ص ٣٧٢-٣٧٤.

[2] معيار العقول في علم الأصول ورقة رقم١١.

یەکێکیان بەهێزترە. جا چ دوو قیاس بن، یان قیاسێك و هەواڵێك بێ.[1]

هەرچی شەوکانییە لە مەزەبی زەیدی دەڵێ: باسکردنی ئیستیحسان لە باسێکی سەربەخۆدا بێسوودە، لەبەرئەوە ئەگەر بۆ بەڵگەکانی پێشتر بگەڕێتەوە ئەوە دووبارەیە، ئەگەریش لە دەرەوەی ئەوانە بێ ئەوا فرێ بەشەرعەوە نیە، بەڵکو لەو شتانەیە بەدەم ئەم شەریعەتەوە هەڵبەستراوە کە هەندێ جار بەو شتانەی تێیدا نیە و هەندێ جاریش بە شتی دژ بەو.[2]

وەلحاسڵ شەوکانی پێی وایە ئیستیحسان لە وردکردنەوەدا کارکردنە بە قیاسێك کە دەگەڕێتەوە سەر قیاسێك، یان کارکردن بە عورف یان بەرژەوەندی، ئەمەیش لە قسەی شیعەی ئیمامیەوە نزیکە، بەڵام لەگەڵ حوججیەتی قیاس و مەساڵیحی مورسەلە و عورفیش نین.

ئیبازی: سالمی دەڵێ:

ومنه الاستحسان أن ينقدحا      في ذهن العلم دليل وضحا

وقصرت عن ذكره العبارة      وقيل أخذ ما اقتضته العادة[3]

واتە ئیستیحسان لە ئیستیدلالە. بەلای ئیبازیەوە (ئیستیحسان) و (مەساڵیحی مورسەلە) و (ئیستیقرا) و (ئیستصحاب) لە جۆرەکانی ئیستیدلالن[4]، لە جمهور جیاواز نین لەوەی ئیستیحسان بەڵگەیەکی شەرعییە بەڵام ناوی دەنێن ئیستیدلال. ناکۆکی تەنیا لە ناونانەکەدایە.

---

[1] بڕوانە: معيار العقول، سەرچاوەی پێشوو. أبو زهرة الإمام زيد ص ٤٣٨–٤٣٩..

[2] إرشاد الفحول ص٢٤١.

[3] طلعة الشمس مع شمس الأصول ٢/١٨٥.

[4] قال السالمي: الاستدلال في اصطلاح الأصوليين أسم لنوع خاص من الادلة وهو ما ليس بنص ولا إجماع ولا قياس، سەرچاوەی پێشوو. ٢/١٧٧

**زاهیری:**

پێشتر وتمان کە زاهیری نکوڵی لە قیاس دەکەن، بۆیە شتێکی سروشتییە کە ئیستیحسان زیاتر لەو رەت بکەنەوە. ئیبن حەزم دەڵێ: ئەوانەی باوەڕیان بە ئیستیحسان هەیە ئایەتی ﴿الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ﴾[1] دەکەنە بەڵگە، لەکاتێکدا ئەم بەڵگەیە لەدژیانە نەك بەڵگە بێ بۆیان، لەبەرئەوەی خوا نەیوتوە (فیتبعون ما استحسنوا) بەڵکو وتویەتی (فیتبعون أحسنه)، باشترین گوتەکانیش ئەوەیە لەگەڵ قورئان و قسەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)دا رێك بێ، هەق هەر هەقە با خەڵکیش بەخراپی بزانن، بەتاڵیش هەر بەتاڵە با خەڵکیش بەباشی بزانن، بۆیە دەرکەوت ئیستیحسان شەهوەت و شوێنکەوتنی ئارەزوو و گومڕاییە.

سەیرە کە ببینین زانایەکی وەك ئیبن حەزم بەرانبەر جمهور وا چاوقایم بێ، بەشێوەیەك کارکردنیان بە ئیستیحسان بە گومڕایی و نەفامی دابنێ و لەوە بێئاگا بێ کە لەڕاستیدا ئیستیحسان بەرجەستەکردنی ئەم دەقە قورئانیانەیە:

﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾[2] ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[3] ﴿يُرِيدُ اللّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفاً﴾[4] ﴿مَا يُرِيدُ اللّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾[5]. هەروەها ئەوەی پێغەمبەر فەرمویەتی (لا ضرر ولا ضرار). ئەمانە و چەندین دەقیتری لەم جۆرە.

لە بەراوردکردنی رای مەزەبەکان لەبارەی ئیستیحسان دەگەینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- بەناوبانگترین مەزەبەکان لە حوججیەتی ئیستیحساندا سیانن:

---

[1] الزمر/١٨.
[2] البقرة/١٨٥
[3] الحج/٧٨
[4] النساء/٢٨.
[5] المائدة/٦.

أ- جمهور (حەنەفیەت، مالیکیەت، شافیعیەت، حەنبەلی، ئیبازی و جمهوری زەیدی)، کە دانیان بە حوججیەتی ئیستیحساندا ناوە، بە هەندێ جیاوازی لە وردەکاری لەنێوانیاندا.

ب- شیعەی ئیمامی و زاهیری بە حوججەی دانانێن.

ج- شەوکانی لە مەزەبی زەیدی دەڵێ حوججەیە، بەڵام بەڵگەیەکی سەربەخۆ نیە، بەڵکو بۆ بەڵگە شەرعیەکانیتر لە سەرچاوە تەبەعیەکان دەگەڕێتەوە، چونکە ئەوەی لە تەحقیقدا لای ئەوە کارکردنە بە قیاسێك کە بەسەر قیاسێکدا تەرجیح دەبێ، یان کارکرن بە عورف یان بەرژەوەندی.

٢- ئەوەی دراوەتە پاڵ ئیمامی شافیعی لە نکوڵیکردنی لە ئیستیحسان بەو رەهاییە راست نیە، بەڵکو ئەو ئیستیحسانەی هێرشی کردۆتە سەر ئیستیحسانە بەئارەزوو کە ئەسڵێکی شەرعی نەبێ. لەبەرئەوەیە ئیبنول حاجب دەڵێ: ئیستیحسانێکی جێناکۆك بەدی نایەت[1]. خاوەنی (التقریر والتحبیر) دەڵێ ئەوە لای هەمووان حوججەیە بەبێ تەسەورکردنی ناکۆکی.[2]

٣- چوارچێوەی پیادەکردنی لای حەنەفیەت لە باقیی ئەو مەزهبانەیتر کە باوەڕیان پێیەتی، فراوانترە.

٤- هەردوو مەزەبی حەنەفی و مالیکی لەوەدا بەیەك دەگەن کە زەحمەتی (مەشەقە) و عورفی باڵادەست بە واجبکەری ئیستیحسان دادەنێن، دەستگرتن بە ئیجماع و هەواڵی ئاحاد لەبەرانبەر قیاس، وادیارە مالیکی ئەوە ناونانێن ئیستیحسان.

٥- لێلادراو لە ئیستیحساندا لەوانەیە خواستی قیاسی ئاشکرا بێ بۆ خواستی قیاسی پەنهان، هەروەك لەوانەیە خواستی دەقێکی گشتی بێ بۆ حوکمێکی تایبەت، لەوانەیشە خواستی پیادەکردنی ڕێسایەکی شەرعیی گشتی بێ بۆ حوکمێکی نائاسایی. لەبەرئەوە پێناسەکردنی ئیستیحسان بەوەی لادانە لە قیاسێکەوە بۆ

---

[1] بروانە: مختصر المنتهى مع شرح العضد ٢/٢٨٨

[2] التحریر مع التقریر والتحبیر ٣/٢٢٣.

قیاسێکی بەهێزتر، یان تایبەتکردنی قیاسێك بەبەڵگەیەك، پێناسەیەکی ناتەواوە لەبەرئەوەی سەرتاپاگیر نیە.

٦- جۆرەکانی ئیستیحسان بە لەبەرچاوگرتنی سەنەدەکەی وەك ئەوەی لای حەنەفیەت بەناوبانگە چوارن:

أ- ئیستیحسانێك سەنەدەکەی قیاسی پەنهانە.

ب- ئیستیحسانێك سەنەدەکەی دەقە.

ج- ئیستیحسانێك سەنەدەکەی عورفە.

د- ئیستیحسانێك سەنەدەکەی زەرورەتە.

لای مالیکیەت دووانن:

أ- ئیستیحسانێك سەنەدەکەی عورفە.

ب- ئیستیحسانێك سەنەدەکەی بەرژەوەندییە.

٧- مالیکی لەگەڵ حەنەفی لە دوو جۆری ئیستیحساندا کۆکن: ئەو ئیستیحسانەی سەنەدەکەی عورفە، لەگەڵ ئەو ئیستیحسانەی سەنەدەکەی بەرژەوەندییە، لەبەرئەوەی بەرژەوەندی ئەوە دەگرێتەوە کە حەنەفیەت ناوی ناوە زەرورەت و مالیکیەت ناوی ناوە نەهێشتنی زەحمەتی (رفع الحرج). حەنەفیەت خۆی بەتەنها ئیستیحسانێکی هەیە کە سەنەدەکەی قیاس و دەقە. هەموو ئیستیحسانێك لای مالیکیەت لای حەنەفیەت ئیستیحسانە، نەك بەپێچەوانەوە.

زەیدیش لەگەڵ حەنەفیەت لە سێ جۆردا یەکدەگرێتەوە: ئەو ئیستیحسانەی سەنەدەکەی دەق، یان ئیجماع یان قیاسە. حەنەفیەتیش خۆی تەنها دوو جۆری هەیە: ئیستیحسان بە عورف و ئیستیحسان بە زەرورەت، هەموو ئیستیحسانێك لای زەیدی لای حەنەفیەت ئیستیحسانە، نەك بە پێچەوانەوە.

٨- تێبینی دەکرێ ئەو ئیستیحسانەی سەنەدەکەی دەق یان قیاسە بێبناغەیە، لەبەرئەوەی حوکم لە جۆری یەکەمدا بەدەق جێگیرە و لە دووەمدا بەقیاس، لەبەرئەوەی زاڵکردنی قیاسێکە بەسەر قیاسێکی دژیدا لەوە دەرناکا کە بەڵگەی حوکم بێ و حوکم بەوە جێگیر بووە.

## باسی دووەم:
# پیادەکردنە فیقهییە جێناکۆکەکان کە لە ناکۆکی لە ئیجتیهاد بە را لەڕێی ئیستیحسان دەکەونەوە

أ- شەرعزان لەبارەی شەفیعبوون لە بەروبومی درەختەکاندا بوون بە سێ رای جیاوازەوە:

ئیمام مالیك و ئەوانەی شوێنی کەوتوون لەگەڵ ئەوەن شەفیعبوون لە بەروبومی دار و درەختدا دروستە بەر لەوەی وشك بێ، هەروەها بەروبومی ئەو چێنراوانەی لە بنەکانیان دەڕنرێن و بنەکانیان ماون وەك کاڵەك و باینجان و کولەکە و بامیە و پاقلە.. و گوتی: ئەگەر یەکێك لە دوو شەریکەکە لەسەر بنەکەی فرۆشت، شەریکەکەیتر بۆی هەیە بە مافی شەفیعبوون لە کڕیارەکەی ببات، ئەویش بەبەستنەوەی (مافی شەفیعبوون لە بەروبومدا) بە خانوبەرە (عەقار)وە بەو مەرجەی بەرهەمەکە وشك نەبووبێ.[1]

شافیعی[2] و حەنبەلی[3] و شیعەی ئیمامی[4] رایان وایە شەفیعبوون لە کشتوکاڵ و بەروبوم بەهیچ شێوەیەك جائیز نیە و دەڵێن: شەفیعبوون تەنها لە خانوبەرەدا هەیە.

---

[1] الشرح الصغير مع بلغة السالك ٢١٢/٢ تێیدا هاتووە: بزانە مەسەلەی شەفیعبوون لە بەروبومدا و ئەوەی عەتف کراوە لەسەری یەکێکە لە چوار مەسەلەکەی ئیستیحسان کە مالیك تێیدا وتویێتی ئەوە لەبەر شتێکە بەباشم زانیوە و نەمزانیوە کەس من وتبێتی. دووەمیان شەفیعبوونە لە بیناکردن لە زەویەکی (مجسه) یان خوازراو، سێیەم: قیساس بە شایەتێك و سوێندخواردنێك لە بریندارکردندا، چوارەم لە خوێنبایی برگە پەنجەی گەورەدا کە پێنج وشترە.

[2] المهذب ٣٧٦/١-٣٧٧

[3] نيل المارب ٢٧٢/١

[4] الخلاف للطوسي ٦٨٤/١

حەنەفیەت لەگەڵ شەفیعبوونن لە گشتوکاڵ و بەروبوم لەگەڵ بندا ئەگەر بەروبوم یان کشتوکاڵەکە لە فرۆشتنەکەدا باس کرابوو، لەبەرئەوەی بەبێ باسکردن نایەتە ناوەوە[1]. لە لێکدانەوەیەکی شافیعیەتدا بەروبومی پێوننەکراو (غير المؤبرة) لەگەڵ بنجەکەیاندا وەردەگیرێ، نەك بەتەنها خۆی.[2]

ئیمام مالیك ئیستیحسانی کردۆتە بەڵگە و دەڵێ ئەوە –واتە باسکردن لە بەروبوم و کشتوکاڵ– شتێکە بەباشی دەزانم و نەمزانیوە کەس پێش من گوتبێتی.[3]

خاوەنی (الهدایة)یش –سەبارەت بە قسەکەی حەنەفیەت لەبارەی دروستیی شەفیعبوون لە بەروبومدا، ئیستیحسان دەکاتە بەڵگە و دەڵێ: ئەم باسکردنە باسکردنی ئیستیحسانە، لە قیاسدا وەرناگیرێ، لەبەرئەوەی شوێن ناکەوێ، بەڵام بەبێ باسکردن نایەتە ناو فرۆشتنەکە و بەوە وەك کەلوپەلە لەناو ماڵدا. رووی ئیستیحسان ئەوەیە بە ئیعتباری بەردەوامی (الاتصال) بووەتە شوێنکەوتەی خانوبەرە وەك بینا لەناو ماڵ و ئەوەی تێیدا تەرکیب کراوە و شەفیع دەیبا.[4]

ئەوەیش لەگەڵ جائیزبوونی نیە ئەو حەدیسەی کردۆتە بەڵگە کە ئەفەرموێ: (لا شُفعةَ إلّا في رَبعٍ أو حائطٍ)[5]، کە ئەم دەقە شەفیعبوون لە خانوبەرەدا حەسر دەکا، نەك گوێزراوەکان.[6]

ب– شەرعزان لەبارەی داوەریکردن بە یەك شایەت و سوێندخواردن لە قیساس لە بریندارکردندا دوو رای جیاوازیان هەیە:

---

[1] الهداية مع فتح القدير ٩/٤٠٢

[2] المهذب ١/٣٧٦ و پاشتر. لە لێکدانەوەیەکیتردا وەرناگیرێ لەبەرئەوەی گوێزراو (منقول)ە و لەگەڵ ئەسڵەکەی وەرنەگیراوە.

[3] بلغة السالك ٢/٢١٢.

[4] الهداية مع شرح فتح القدير ٩/٤٠٢.

[5] رواه مسلم عن جابر بن عبدالله سبل السلام ٣/٧٣.

[6] المهذب ١/٣٧٦

ئیمام مالیك رای وایە لە قیاسی بریندارىدا شایەتێك و سوێندخواردنی سکالآکار (المدعي) بەسە. بەڵام جمهور ئەوە بە دروست نازانیَ.[1]

هۆی ناکۆکیەکە تێگەیرانێکی رواڵەتییە لەنێوان دەق و بەرژەوەندیدا، ئیمام مالیك ئیستیحسانی کردۆتە بەڵگە، لەبەرئەوەی بەرژەوەندیی سکالآکار ئەوە دەخوازیَ سوێندخواردنی و شایەتێك بەس بیَ.

بەڵگەی جمهوریش گشتیبوونی دەقەکانە لەوانە: ﴿وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ﴾ ، لەبەرئەوەی ئەم دەقە تایبەتە بە روونکردنەوەی ژمارە و نێرینەیی و بالقبوون[2]، جمهوریش کۆکن لەسەر ئەوەی داوەریکردن بە یەك شایەت و سوێندخواردنی سکالآکار لە قیساسدا بەهیچ شێوەیەك دروست نیە، بەڵام لە بابەتی ماڵیدا رایان جیاوازە. حەنەفیەت دەڵیَ: بەهیچ شێوەیەك لە دارایی و قیساس و شتیتردا دروست نیە. بەڵام غەیری ئەوان وتویانە لە داراییدا دروستە.

بەلای منەوە رای زاڵ رای ئیمام مالیکە پاش دروستبوونی قەناعەت لای دادوەر و بەتەواوی تێگەیشتنی لە هەلومەرجی ئەو کێشەیەی خراوەتە بەردەمی، تا دەستدرێژکار لە دنیادا لە دەستی دادپەروەریی ئاسمان قوتاری نەبیَ.

ج- شەرعزان لەبارەی جێبەجێکردنی سزای دەستبڕینی دز پاش جاری دووەم دوو رای جیاوازیان هەیە:

شافیعی و مالیك و ئیسحاق و ئەوانەی هاوڕایانن رایان وایە ئەگەر دز پاش بڕینی دەستی راستی و پێی چەپی دزی کردەوە، لە سێیەم جاردا دەستی چەپی دەبڕدرێتەوە، ئەگەر بۆ جاری چوارەمیش دزی کردەوە، پێی چەپیشی دەبڕدرێتەوە.[3]

[1] بلغة السالك ٢/٢١٢.

[2] بروانە: فتح القدير ٧/٣٦٩ الخلاف للطوسي ٢/٦٠٧.

[3] المهذب ٢/٢٨٣.

حەنەفی[1] و حەنبەلی[2] و شیعەی ئیمامی[3] و ئەوانەی هاوڕایانن رایان وایە، لە جاری سێیەمدا بەند دەکرێ و پاش دووەم جار ئیتر بڕینەوە رادەگیرێ.

هۆی ناکۆکیەکەیان تێکگیرانی ئەسەرەکانە لەگەڵ ئیستیحسان.

ئەوانەی لەگەڵ بەردەوامیی بڕینەوەن ئەو حەدیسە دەکەنە بەڵگە کە ئەبوهورەیرە لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە ریوایەتی کردوە و لەبارەی دزەوە دەڵێ: (إن سرق فاقطعوا يده ثم سرق فاقطعوا رجله). (واتە: ئەگەر دزی کرد دەستی ببڕنەوە، ئەگەر پاشان دزی کرد پێی ببڕنەوە).

وتویانە ئەگەر پێنجەم جار دزی کرد ناکوژرێ، لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە حەدیسەکەی ئەبوهورەیرەدا ئەوەی لە چوار جاردا واجبە روون کردۆتەوە، ئەگەر لە پێنجەم جاردا کوشتنی واجب بووایە ئەویشی روون دەکردەوە. بەڵام لە ریوایەتی ئەبوداود بەسەنەدی جابر بن عەبدوڵادا هاتووە: (في الخامسة اقتلوه...). (لەپێنجەمدا بیکوژن).

دەقی حەدیسەکە بەم شێوەیە:

روى أبو داود بسند إلى جابر بن عبدالله أنه قال: جِيءَ بسارقٍ إلى النَّبيِّ (ﷺ) فقال: فقال: اقطعُوه. كذلك في الثانيةَ والثالثةَ والرابعةِ، فأُتِيَ به في الخامسةِ، فقال: اقتُلُوه. قال جابر: فانْطَلَقْنَا به فقَتَلْنَاه.[4]

حەنەفیەت ئیستیحسانیان کردۆتە بەڵگە، خاوەنی (الهداية) دەڵێ: ئەگەر جاری دووەم دزی کرد پێی چەپی دەبڕدرێتەوە، ئەگەر بۆ جاری سێیەم کردیەوە نابڕدرێ بەڵام تا مردن بەند دەکرێ. خاوەنی (الهداية) لەسەر ئەمە دەڵێ: ئەمە ئیستیحسانە.[5]

---

[1] فتح القدير ٥/٣٩٥.

[2] نيل المارب ٢/١٤٧

[3] الخلاف للطوسي ٢/٤٦٩

[4] بروانە: السنن الكبرى ٤/١٤٢

[5] البداية مع فتح القدير ٥/٣٩٥.

حەنبلەیەكان دەڵێن تـاوانێكی كـردوە حـەد واجـب ناكـا، بۆیـە پێویسـت لـەباتیی دزیەكە و بۆ تەمێكردنی حـەپس بكـرێ، لەبەرئـەوەی هـەر ئەوەنـدە دەكـرێ، زاهـیر لەڕووی بەزەیی پێداهاتن و ئیستیحسانەوە دەستبەرداری بڕین بوون، بـا ئەوەیشـیان رانەگەیاندوە.[1]

شیعەی ئیمامی وەك نەریتی خۆیان ئیجمـاع و هـەواڵی فیرقـەیان كردۆتـە بەڵگـە، لەپاڵ ئـەوەدا خوێندنەوەكـەی ئـیبن مەسـعودیان كردۆتـە بەڵگـە كـە بـەم شـێوەیە: (والسارق والسارقة فاقطعوا أيمانهما)، هەروەها بـەوەی لـە عـەلی ریوایـەت كـراوە كـە دزێكی دەست و پێ براویان هێنایە لای، ئەویش گـوتی: "مـن شـەرم لـە خـوا ئەكـەم بەشی ئەوەندەی بۆ نەهێڵمەوە كە نانی پێ بخوات و تارەتی پێ بگرێ".

هەروەها ئەوەیان كردۆتە بەڵگە كە ئەسڵ ئەستۆپاكییە.

رای زاڵ نەبڕینەوەیە لە سێیەم و چوارەمدا وەك زۆربـەی شـەرعزان بـۆی چـوون، لەبەر بەهێزی بەڵگەكانیان بەتایبەت ئەگەر ئەوە راست بێ لە عەلی ریوایەت كراوە، كە ئەوە لوتكەی ئیستیحسانە.

د- شەرعزان رایان جیاوازە لەبارەی خاوەندارێتیی كانزاكان كە ئاخۆ بۆ خـاوەنی ئـەو زەویـەن تێیـدا دۆزراونەتـەوە لـەو ڕووەوە بەشـێكە لـە زەویەكـە، یـان بـۆ دۆزەرەوەكەیە لەبەرئەوەی ئەو هۆی راسـتەوخۆ بـووە و سـكی زەوی مـوڵكی كـەس نیە، یان بۆ هیچكام لەوانە نیە بەڵكو بۆ دەوڵەتە:

حەنەفیەت كاریان بـەقیاس كـردوە و وتویانـە ئەگـەر ئـەو كانزایانـە لـە زەویەكـدا دۆزرانـەوە كـە مـوڵكی كـەس یـان كۆمپانیاكـان بـوو، شـوێنكەوتەی زەویەكـە دەبـن لەبەرئەوەی بەشێكن لـە زەویەكـە، مـادام ئەوانـەیش خـاوەنی زەویەكـەن دەرەوە و ناوەوەی زەویەكە وەك یەكە. ئەگەر زەیەكەیش لە موڵكە تایبەتـەكانی دەوڵـەت بـوو ئەوا ئەو كانزایانەی لەناویدان موڵی دەوڵەتن. ئەگـەر لـە زەویـی وەقفـدا بـوون دەبنـە

---

[1] الخلاف للطوسي ٤٦٩/٢

موڵکی وەقف، ئەگەر لە مردە زەوی (ارض الموات)یشدا بوون بۆ یەکەم کەسە دەستی بەسەردا بگرێ، لەبەرئەوەی بەگوێرەی موباحیی ئەسڵەکەی موباحە.[1]

مالیکیەکان ئیستیحسانیان کردۆتە بەڵگە، واتە بەو بەرژەوەندیەی لەگەڵ قیاس تێکدەگیرێ.

دەڵێن: کانزاکان بەسەرجەم جۆرەکانیانەوە (چ رەق بن و قابیل بە پیاکێشان و راکێشان بن وەك زێڕ و زیو و مس و ئاسن... یان قابیل بەوە نەبن وەك ئەڵماس... یان شلە بن وەك پێترۆڵ..موڵکی دەوڵەتن و بۆ بەرژەوەندیی سەرجەم موسڵمانانن).[2]

شافیعی و حەنبەلی رایەکی نزیك لە رای حەنەفیەتیان هەیە و دەڵێن: ئەگەر کانزاکان لە موڵکدا بن ئەوا هی خاوەن موڵکەکەن، ئەگینا بۆ ئەو کەسەیە پێشتر دەستی بەسەردا گرتوە.[3]

بەڵام ئیبن قودامە رایەکیتر لە شافیعی و حەنبەلی دەگوێزێتەوە، کە لەگەڵ بۆچوونەکەی مالیکیدا رێك دەکەوێ.[4]

هۆی ناکۆکیەکەیشیان تێکگیرانی قیاسە لەگەڵ ئیستیحسان، کە -لێرەدا- بریتییە لە لادان لە قیاسی ئاشکرا بۆ بەرژەوەندی.

ئەوەی پەیرەوی لە قیاس کردوە و وتویێتی ئەوەی خاوەنی رووی دەرەوەی زەوی بێ خاوەنی ناوەیشیەتی دەڵێ: بۆ دەوڵەت نابن، بەڵکو بۆ خاوەن زەویەکە دەبن، لە مردە زەویشدا بۆ ئەو کەسەن کە دەست بەسەر زەویەکەدا دەگرێ.

ئەوەی بەرژەوەندیی کۆمەڵی بەسەر بەرژەوەندیی تاکدا هەڵبژاردوە، کاری بە ئیستیحسان کردوە و رای وایە زەوی بەمەبەستی چاندن یان بینا و ئاوەدانکردنەوە دەکرێتە موڵك و لە نرخەکەیدا حساب بۆ ئەوە ناکرێ چی لە ناوەوەیدا و لە

---

[1] البدائع ٦٥/٢ المبسوط ٢١١/٢ الدر المختار ٤٧/٢.

[2] بلغة السالك ٢١٤/١.

[3] المهذب ١٦٢/١-٤٢٤-٤٢٥.

[4] المغني لابن قدامة ٥١٢/٥.

عەقدەکەدا بەمەبەست ناگیرێ. پاشان ئەگەر دەوڵەت خاوەنی بێ بەرژەوەندیی گشتی تێدایە و لەوانەیە دەستبەسەرداگرتنی لەلایەن تاکەکانەوە خراپەی لێ بکەوێتەوە وەك صاوی ئەلمالیکی لە شیکردنەوەی مولکبوونی بۆ دەوڵەتدا دەڵێ لەوانەیە کەسانی بەدکار کانزاکان بدۆزنەوە و ئەگەر حوکمیان بەدەست ئیمام نەبێ، دەبێتە مایەی فیتنە و بێسەروبەری.

رای زاڵ ئەوەیە مالیکیەکان بۆی چوون، لەبەرئەوەی تێڕوانینیان لەم مەسەلەیەدا تێڕوانینێکی جەماعییە کە بەرژەوەندیی گشتی دەخاتە پێش بەرژەوەندیی تاك، تێڕوانینی باقی شەرعزان تیۆری و تاکەکەسیی رووتە و ئەگەر کاریان بە رێسای ئیستیحسان بکردایە باشتر بوو، چونکە عەقدکردنی نێوان خەڵك لەسەر زەوی یان زیندووکردنەوەی، مەبەست ئەوە نیە لە ناخی زەویدایە، پاشان بەرژەوەندیی گشتی لێرەدا پێچەوانەی قیاسە، بۆیە کار بەو دەکرێ نەك بەم.

# بەشی چوارەم:
# مەساڵیحی مورسەلە و کاریگەری لەسەر جیاوازیی ئەحکام

دوو باس دەگرێتەوە:

. یەکەم لەبارەی بەڵگەبوونی (مەسڵەحەی مورسەلە)

دووەم لەبارەی پیادەکردنە خیلافیەکان

## باسی یەکەم:
## بەڵگەبوونی (مەسڵەحەی مورسەلە)

پێشتر پێناسەی مەسڵەحەی مورسەلە کرا بەوەی، ئەوەیە ئەسڵێك نیە بەڵگە بێ لەسەر لەبەرچاوگرتن یان هەڵوەشاندنەوەی لە دیدی شەرعدا[1]، بۆچوونەکان لەبارەی بەبەڵگەکردنی بۆ سێ رای جیاواز دابەش بوون:

یەکەم: ئەوەیە بەهیچ شێوەیەك بەڵگە (حجة) نیە، ئەمە ئیبنول حاجب هەڵیبژاردوە و دەڵێ هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر ئیعتیباری بۆیە پێویست رەت بکرێتەوە[2]. ئامەدی دەڵێ: شەرعزانی شافیعی و حەنەفی و هیتر کۆکن لەسەر دەست پێوەنەگرتنی، هەروەها گومان دەخاتە سەر ئەوەی لە مالیك ریوایەت کراوە بە

---

[1] التقرير والتحبير مع التحرير ٣/٢٨٦

[2] مختصر المنتهى مع شرح العضد والحاشية السعد ٢/٢٨٩.

حەسکردنی لە بازنەیەکی تەسکدا و دەڵێ: ئەگەر ئـەوەی لێـی گوێزراوەتـەوە راسـت بێ، رەنگە ئەوەی لە هەموو بەرژەوەندیەکدا نەگوتبێ، بەڵکو لەوەدا گوتبێتی کـە لـە بەرژەوەندییە زەرورییە هەمەکیەکان بووبێ کە رووادنیان گومانبڕە.

هەروەها زاهیری و هەندێ لە پاشینانی زانایانی حەنبـەلی و بـاقلانی و کۆمـەڵێ لـە موتەکەلیمین لەگەڵ قەدەغەکردنی رەهان، شاتبی دەڵێ: ئەوە مەزەبی جمهورە.[1]

دووەم: بـەڕەهایی حوججەیـە، ئـەوە لـە ئیمـام مالیکـەوە بەناوبانگـە و ئیمـامی حەرەمەین –لە مەزەبی شـافیعی– هەڵبـژاردوە[2]. شـاتبی لـە (الاعتصـام)دا دەڵـێ: مالیك لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئـەوەدا بـووە و بـەڕەها حـوکمی لەسـەر بینـا کـردوە[3]، هەنـدێ زانـای حەنبـەلی کاریـان پێکـردوە، لەوانـە ئـەلتوفی کـە بەناوبانگـە بـەوەی زیادەڕەوی لە رەچاوگرتنی بەرژەوەندیدا دەکرد.

سێیەم: بەم وردەکاریەی خوارەوە:

أ– بە سێ مەرج وەردەگیرێ: ئەوەیە زەروری و گومانبڕ و هەروەها هەمەکی بـێ. ئەسنەوی دەڵێ: ئەوە رای غەزالییە و بەیزاوی هەڵیبژاردوە.[4]

ب– شاتبی (الاعتصام)دا لە زاری جوێنییەوە دەڵێ: شافیعی و زۆربـەی حەنـەفی لەگەڵ دەستگرتن بـوون بـەو مانایـەی لەسـەر ئەسـڵێکی راسـت دانەمـەزراوە، بـەڵام بەمەرجی نزیکبوونی لە ماناکانی ئوسوڵە جێگیرەکان. خاوەنی (المودة) لە زاری ئیبن بورهانـەوە دەگێڕێتـەوە: هـەق ئەوەیـە شـافیعی گوتـوێتی کـە ئەگـەر بـۆ ئەسـڵێکی هەمەکی یان بەشەکی لـە بنـەماکانی شـەریعەت گونجـاو بـوو، بۆمـان هەیـە حـوکمی لەسەر بینا بکەین، ئەگینا نا.[5]

---

[1] إرشاد الفحول ص ٢٤٢.

[2] الاسنوي مع البدخشي ٣/١٣٦.

[3] الاعتصام ٢/١١١ و پاشتر. مطبعة السعادة.

[4] مناهج البيضاوي مع الانسوي والبدخشي٣/١٣٦.

[5] المسودة في اصل الفقه الحنبلي ص ٤٥١.

شیعەی ئیمامی دەڵێن ئەگەر وەك جەزم گەڕایەوە سەر ئەقڵ کاری پێدەکرێ، بەدەر لەوە حوجە نیە، بەڵام وتویانە: ئەوە مانای ئەوە نیە ئەوە بەڵگەیەکی سەربەخۆیە لەبەرانبەر ئەقڵ.[1]

هەڵسەنگاندنی راکان لە دیدی خۆمەوە:

یەکەم: ئامەدی (رەحمەتی خوای لێبێ) لە شیکردنەوەی رای زانایان لەم بابەتەدا سەرکەوتوو نەبووە، لە سێ رووەوە:

رووی یەکەم- ئیدیعای کۆکبوونی شەرعزان لە هەردوو مەزەبی شافیعی و حەنەفی و هیتر لە دەستنەگرتن پێیەوە، لەگەڵ بوونی کۆمەڵێ پیادەکردنی فیقهی کە لەسەر کارکردن بە مەساڵیحی مورسەلە دامەزراون لای زۆربەی شەرعزان دژ دەوەستێ، ئەمە جگە لەوەی ئیمامی حەرەمەین لە شافیعی و زۆربەی شەرعزانی حەنەفی گواستۆتەوە کە کار بەوە دەکەن ئەگەر بەرژەوەندییە موعتەبەرەکانی تێدا بێ. قەرافی دەڵێ: "لە هەموو مەزەبەکاندا بەدیهێنانی بەرژەوەندییە، لەبەرئەوەی قیاس دەکەن و جیا دەکەنەوە و داوای بەڵگەیەك ناکەن بۆ لەبەرچاوگرتن، مەساڵیحی موسەلەیش هەر مانای ئەوەیە. ئەوەی کارکردن بە مەسلەحەی مورسەلە دووپات دەکاتەوە ئەوەیە صەحابە هەندێ شتیان تەنها لەبەر بەرژەوەندی کردوە، نەك بۆ پێشکەشکردنی بەڵگەیەك بۆ لەبەرچاوگرتن".[2]

ئەلتوفی لە حەنبەلیەکان دەڵێ: بەرژەوەندی پێش دەق و ئیجماع دەخرێ، لەبەرئەوەی ئیجماع جیاوازی لە بەڵگەبووونیدا هەیە لەکاتێکدا بەرژەوەندی جیاوازی لە بەڵگەبوونیدا نیە و دەستگرتن بە جێکۆکەوە لە دەستگرتن جێناکۆك لەپێشترە.[3]

---

[1] القوانين المحكمة للمحقق القمي ٢

[2] شرح تنقيح الفصول ص ٤٤٦.

[3] بڕوانە: رسالة الطوفي في رعاية المصلحة المنشورة في مصادر التشريع الاسلامي فيما لانص فيه للاستاذ عبد الوهاب خلاف .

پاش هەموو ئەوانە چۆن دەکرێ بوترێ شەرعزان کۆکن لەسەر کارنەکردن بە مەساڵیحی مورسەلە؟!

رووی دووەم– ئامەدی دەڵێ (هاوەڵانی مالیك نکوڵییان لەوە کردوە کە دراوەتە پاڵ مالیك لەوەی لەگەڵیدایە)[1]. ئیدیعای نکوڵیکردنی هاوەڵانی مالیك بۆ مەساڵیحی مورسەلە تەنها ئامەدی نایڵێ، بەڵکو کۆمەڵێك گوتویانە، لەوانە شەوکانی کە نکوڵیکردنەکە دەداتە پاڵ قەرافی، ئەوەیش هەڵەیە و سەرچاوەکەی ئەوەیە شەوکانی دەڵێ: (کۆمەڵێ لە مالکیەکان نکوڵییان کردوە لەوەی دراوەتە پاڵ مالیك کە وتبێتی لەگەڵیدایە، لەوانە قەرافی دەڵێ: ئیمامی حەرەمەینی جوێنی جەسارەت و سەرکێشی کردوە لەوەی داویەتیە پاڵ مالیك لە زیادڕەوی لەم ئەسڵەدا، ئەوە نە لە کتێبەکانی مالیك و نە لە هیچ لە کتێبەکانی هاوەڵانیدا نیە).[2]

ئەمە دەقی قسەکەی شەوکانی بوو، ئەمەیش ئەوەیە قەرافی گوتویێتی: (ئیمامی حەرەمەین لە کتێبەکەیدا بەناونیشانی (الغیامی) هەندێ شتی کردوە و ڕێگە و فتوای پێداوە، مالیکیەکان دوورن لێیان، جەسارەتی کرد و بۆ بەرژەوەندیی رەها پەسەندی کردوە. هەروەها غەزالیش لە (شفاء الغلیل) دا، لەکاتێکدا ئەو دووانە لە مەسڵەحەی مورسەلەدا زۆر سەروگوێلاکی ئێمە دەکوتن)[3].

کەواتە جیاوازیی نێوان قسەکەی قەرافی و ئەوەی شەوکانی دەیڵێ ئاسمان و ڕێسمانە، قسەکەی قەرافی وەك ئاوی کانی روونە کە ئەوەی رەخنەی لە مالیکی گرتوە لە بەبەڵگەکردنی مەساڵیحی مورسەلەدا، زیاتر لە مالیك و مالیکیەت کاری پێ کردوە.

---

[1] بڕوانە: الإحكام في أصول الأحكام للآمدي ٣/٢٠٢ وهذا القول من الآمدي لا يؤيده الواقع في المراجع المالكية الاصولية والفقهية

[2] ارشاد الفحول للشوكاني ص ٢٤٢

[3] شرح تنقيح الفصول للقرافي ص٤٤٦–٤٤٧

رووی سێیەم: ئامەدی لە بردنی قسەکەی ئیمام مالیك بەئاقاری کۆکبوون لەگەڵ ڕاکەی غەزالیدا لەوەی ئەو بەرژەوەندیەی مالیك کاری پێدەکرد بەرژەوەندیی زەرووری گومانبڕی هەمەکی بوو، لەگەڵ لق لێکردنەوەکانی مالیك لە مەسالیحی مورسەلە دژ دەوەستێ، لەوانە: بەندکردنی ئەو کەسەی بەدزی تۆمەتبار کراوە تا ئەوکاتەی دان بەتاوانەکەیدا دەنێ، لەوانە: جیاکردنەوەی ژن لە مێردە بێسەروشوێنەکەی پاش چوار ساڵ و هیتریش.

دووەم: دانانی غەزالی لە ڕیزی خاوەنانی ڕای سێیەم کە بابەتی کارکردن بە مەسڵەحەی مورسەلە ورد دەکەنەوە، وەك ئەوەی ئەسنەوی کردویەتی، لە دوو ڕووەوە ڕاست نیە:

یەکەم: غەزالی ئەو مەرجانەی بۆ دووپاتکردنەوەی کارپێکردنی داناوە، نەك بۆ ئەسڵی پەسەندکردنی وەك ئیبن ئەلسەبکی دەڵێ.[1]

دووەم: ئەوەی غەزالی بۆی چووە لە بەرژەوەندیی زەرووری گومانبڕی هەمەکی ناکرێ بە مەسالیحی مورسەلە دابنرێ، چونکە ئەوە بەڵگە هەیە لەسەر لەبەرچاوگرتنی.

سێیەم: ئەم ناکۆکی و مشتومڕانە لەنێوان ئوسوڵناسان و شەرعزان لەبارەی کارکردن بە مەسالیحی مورسەلە زیاتر لەفزییە، چونکە هەموولا کۆکن لەسەر ئەوەی حوکمەکانی خوا بۆ بەرژەوەندیی بەندەکان دانراون، هەروەها کۆکن لەسەر ئەوەی هەر بەرژەوەندیەك سوودێکی گشتی بۆ خەڵك دێنێ یان زیانێکی گشتییان لێ دوور دەخاتەوە و لە شەرعدا شتێك نەهاتووە بەڵگە بێ لەسەر نادیدەگرتنی، بۆیە جائیزە حوکمی لەسەر بینا بکرێ.

شەرعزانی هاوەڵان و شوێنکەوتوان و ئەوانەی پاش ئەوان هاتوون ئەم ڕێبازەیان گرتوەتە بەر، بەڵام لە وردەکاریدا جیاوازن: هەندێکیان دەیگێڕنەوە بۆ عمومیاتی

[1] جمع الجوامع مع حاشية البناتي٢/١٧٧المطبعه الازهرية المصرية.

دەقـەکان و قیاسـکردنەکان، وەك غـەزالی لـە مـەزەبی شـافیعی، ئیبنـول حاجـب لـە مەزەبی مالیکی، ئیبن ئەلهەمام لە مەزەبی حەنەفی و ئیبن تەیمیە لـە حەنبەلیـەکان. هەنـدێك دەیگێڕنـەوە بـۆ ئـەقڵ وەك شـیعەی ئیمـامی، یـان بـۆ قیـاس وەك شـیعەی زەیـدی، یـان بـۆ زاهـیری دەقـەکان وەك زاهـیری، یـان بـۆ ئیسـتیدلال وەك ئیبـازی، هەندێکیشـیان بـە سەرچـاوەیەکی سـەربەخۆی دادەنـێن وەك مـالیکی، بـەڵام لـە سەرچاوە بدۆز (کاشف)ەکانە.

## باسی دووەم:
## پیادەکردنە فیقهییە جیناکۆکەکان
## کە لە ناکۆکی لەم ئەسلە دەکەونەوە

أ- شەرعزان لەبارەی حوکمی ژنی پیاوی بێسەروشوێن دوو رایان هەیە:

١- پێشینانی حەنەفیەت و شافیعی لە قەولی نوێی و ئەوانەی شـوێنیان کـەوتون، رایان وایە بۆی نیە مێرد بکاتەوە تا لە مردنی دڵنیا دەبێ. ئـیبن ئـەبی لـەیلا و ئیبن شبرمە و ثوری ئەمە بۆچوونیانە، شیعەی ئیمامیش دەڵێن: (ئەمە) ئەگەر وەلی مێردەکەی نەفەقەی کێشا، ئەوە لە عـەلی کـوڕی ئـەبوتالیب (رەزای خوای لێبێ) ریوایەت کراوە.

٢- ئیمام مالیك و ئەحمەد و ئیسحاق و شافیعی لە قەولی کۆنیدا رایان وایـە چـوار ساڵ چاوەڕوان دەکا، پاشان بۆی هەیە سکاڵا بۆ لای حـاکم بـەرز بکاتـەوە تـا بـەداوای ئـەو لێکیـان جیـا بکاتـەوە پـاش دڵنیـابوون لـە هـەواڵبڕانی لـەڕێی دەزگەکانی راگەیاندنەوە، پاشان عیددەی مردن بەسەر دەبات و بۆ مێردکردن حەڵاڵ دەبێ. ئەم بۆچوونە لە عومەر و ئیبن عـەباس و ئـیبن عومـەر ریوایـەت

کراوە، هەروەها رای شیعەی ئیمامیشە ئەگەر وەلیی مێردەکە نەفەقەی نەکێشا.[1]

هۆی ناکۆکیەکەیش تێکگیرانی رواڵەتی دەقەکانە لەگەڵ بەرژەوەندی، ئەوانەی دەستیان بە رواڵەتی دەقەکانەوە گرتوە کە ئاماژەن بۆ مانەوەی نیکاحی پیاوەکە لەسەر ژنەکە (واتە عیسمەت) تا نەمانی بە هۆ ناسراوەکانی وەك تەڵاق و مردن دەڵێن: پێویستە ژنی بێسەروشوێن ئارام بگرێ تا مردنی مێردەکەی ساغ دەبێتەوە. ئەوانەیش دەستیان بەبەرژەوەندیی ژنەکەوە گرتوە دەڵێن: بۆی هەیە چوار ساڵ چاوەڕوان بکا، پاشان لەسەر داوای ژنەکە قازی لەیەکیان جیا دەکاتەوە، جا عیددەی مردن بەسەر دەبات و شوودەکاتەوە. دیاریکردنی ئەم ماوەیە لەلایەن هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە بوو وەك عومەری کوڕی خەتاب، هەروەها لە بۆچوونەکەیاندا بۆ جیاکردنەوە و حەڵاڵبوون بۆ شووکردنەوە پاش ماوەکە و عیدەی مردن، کاریان بە بەرژەوەندی کردوە.

مالیکیەت دەڵێ: ژنی پیاوی بێسەروشوێن لە وڵاتی ئیسلام بۆی هەیە سکاڵا بۆ قازی و والی و زەکات کۆکەرەوە بەرز بکاتەوە، ئەگینا بۆ کۆمەڵی موسڵمانان لە پیاوچاکانی شارەکەی، بۆیشی هەیە بەرزی نەکاتەوە و بەمانەوە لە عیسمەتیدا بمێنێتەوە تا سۆراخی روون دەبێتەوە، یان دەمرێ، ماوەی چوار ساڵ دادەنێ ئەگەر نەفەقەکێشانی لە ماڵی مێردەکەیەوە بەردەوام بوو، ئەگینا لەبەر نەفەقەنەکێشان تەڵاق دەدرێ، پاش تەواوبوونی ماوەکە عیددەی مردن بۆ ماوەی چوار مانگ و دە رۆژ بەسەر دەبات.[2]

زۆر لە حەنەفیانی پاشین وازیان لە ئەسڵی مەزەبەکەیان هێنا و بەپێی مەزەبی مالیك فتوایان دا بە جیاکردنەوەی ژنی پیاوی بێسەروشوێن لە مێردەکەی پاش چوار

---

[1] الخلاف للطوسي٢/٣١٢

[2] بروانە: حاشية الدسوقي على الشرح الكبير ٢/٢٧٩

ساڵ، ئەوەیشیان بە گۆڕانی زەمان لێکداوەتەوە و وتویانە: ئەوکات خەڵك چاك بوون و ژن ئەگەر بەدرێژایی تەمەنی بەبێ مێرد بمایەتەوە گومانی بەدەوردا دروست نەدەکرا و خەڵکانێکی خێرخواز هەبوون نەفەقەی بکێشن، بەڵام رۆژگار خراپ بووە، خێر کەمی کردوە و ئیمان لاواز بووە.

هەروەها دەستیان بە مەزەبی مالیکیەوە گرتوە لە عیددەی ئەو ژنەی پاش تەڵاق پاکبوونەوەی تەواو دەبێ و وتویانە: بە ساڵێك لە مێژووی تەڵاقەکەوە بڕیار دەدا. خاوەنی (البزازیة) دەڵێ: فتوا لەم سەردەمەماندا بەپێی قسەی مالیکە.[1]

ب- شەرعزان لەبارەی دروستیی ئەشکەنجەدانی ئەو کەسەی بەدزی تۆمەتبار بە بەندکردن یان لێدان تا دانی پێدا بنێ رایان جیاوازە: ئیمام مالیك لە روانگەی کارکردن بە مەساڵیحی مورسەلەوە فتوای دروستیی ئەوەی داوە، بەڵام جمهور بە پێچەوانەی ئەو بوون کە لە روانگەی کارکردن بە رواڵەتی دەقەکان کاریان کردوە لەوانە، ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((البيّنة على المدعي واليمين على من أنكر)).[2]

شاتبی لە (الاعتصام)[3] دا دەڵێ: مالیك رای وابووە بەندکردن جائیزە با ئەوە جۆرێك بێ لە سزایش، هاوەڵانی لەگەڵ دروستیی لێدانن، ئەوە لای شێخەکان هاوشێوەی بەزامنکردنی سنعەتکارەکانە، چونکە ئەگەر لێدان و بەندکردن لەسەر تۆمەت نەبێ، مەحاڵ بوو ماڵە دزراوەکان لەدەستی دز و زەوتکەران دەربهێنرێ، چونکە بەڵگەهێنانەوە ئاستەمە، بۆیە بەرژەوەندی لە سزادانداین وەك رێگەیەك بۆ بەدەستهێنان بە دیاریکردن و دانپێدانان.

کارکردن بە حەدیس بەکەڵك بوو کاتێ دڵەکان بە باوەڕ ئاوەدان بوون و کەس لەبەر ئەو ماڵەی دزیویێتی، بەهای هەرچەندە بوایە، پەنای بۆ سوێندخواردن نەدەبرد،

---

[1] بڕوانە: ابن عابدين ٢٩٥/٤.
[2] صحيح الترمذي ٦١٧/٣
[3] ١٢٠/٢

بەڵام کاتێ دەروونەکان گۆڕان و دەسەڵاتی ئیمان لاواز بوو، لە حوکمی پێویستیی سوێندخواردنی سکاڵا لەسەرکراوەوە گۆڕاوە بۆ ئەشکەنجەدان.

تێبینی دەکرێ سوودی دانپێدانان بە زۆرلێکردن لە دیاریکردنی کەلوپەلەکەدا دەردەکەوێ و بەڵگەکە لەسەری دەبێتە شایەت بۆ خاوەنەکەی، هەروەها لەوانەیە کەسانیتر بەوە بترسن و کاری هاوشێوە ئەنجام نەدرێ و خراپەکاری کەم دەبێتەوە.[1]

غەزالی دەڵێ لێدان لەسەر تۆمەت بۆ داننان بە دزیکردندا بەرژەوەندیەکە مالیك لەگەڵی بووە و ئێمە لەگەڵی نین، نەك بۆ پوچەڵکردنەوەی لەبەرچاوگرتنی رەگەزی بەرژەوەندی، بەڵکو لەبەرئەوەیە ئەم بەرژەوەندییە بەرژەوەندیەکیتر بەرهەڵستیەتی ئەویش بەرژەوەندیی کەسی لێدراوە، کە رەنگە بێگوناه بێ، لێنەدانی گوناهبارێکیش لە لێدانی بێتاوانێك ئەهوەنترە.[2]

لە دیدی منەوە رای زاڵ ئەوەیە، پێویستە ئەمە بۆ مەزەندەی قازی بەجێ بهێڵرێ، جا ئەگەر گومانی زاڵ ئەوە بوو تۆمەتەکە بناغەی هەیە تۆمەتبار سزا دەدرێ تا دانی پێدا دەنێ، ئەگینا نا.

ج- هەروەها شەرعزان لەبارەی شایەتیدانی منداڵان (الصبیان) لەسەر یەکتر لە برینداری و کوشتندا، رایان جیاوازە. مالیك بەپێچەوانەی جمهور فتوای داوە کە جائیزە، لەکاتێکدا دادپەروەری مەرجێکە لە شایەتیداندا، یەکێك لە مەرجەکانی دادپەروەریش باڵقبوونە، جائیزکردنی مالیکیش بۆ ئەمە لە لەرووی کارکردن بە بەرژەوەندییەوەیە و لەبەرانبەر دەقدا فتوای بەوە داوە، ئەوەی ئیبن روشد دەیڵێ بەوەی (ئەمە لەڕاستیدا شایەتی نیە لای مالیك، بەڵکو قەرینەی حاڵە، هەربۆیە تێیدا کردویەتیە مەرج کە لەیەك پەرت نەبن تا نەترسن)[3] ئەمە پینە ناکا، لەبەرئەوەی لە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] المستصفى ص ٢٥٤

[3] بدایة المجتهد ٢/٣٨٧

شەرعدا مەبەست لە شایەتیدان ساغکردنەوەی راستبێژیی سکاڵاکارە لەوەی دەیڵێ. واتە ئەوە قەرینەیە لەسەر راستگۆیی. رای زاڵیش مەزەبی مالیکە لەبەرئەوەی ئامانج گەیشتنە بە راستی، کە لەوانەیە زیاتر لەسەر زمانی منداڵان دەربکەوێ تا گەورەکان، چونکە منداڵ دوورە لە فرۆفێڵ و لایەنگیری و درۆ.

د- لەبارەی دروستیی سوێندخواردن بە قورئان و بە سورەتی بەرائە ویە گۆڕی پیاوچاکان و هەروەها بەتەڵاق، رایان جیاوازە.

ئیمام مالیك جیاواز لە جمهور لە روانگەی کارکردن بە مەسڵەحەی مورسەلەوە بەجائیزی داناوە، هۆی ناکۆکیەکەیش تێکگیرانی بەرژەوەندییە لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمان دەکا بەوەی سوێند تەنها بە خوا بخورێ: ((من كان حالفاً فلا يحلف إلا بالله)).[1]

مەزەبی مالیکی بەوە تەعلیلی ئەوەی کردوە کە مەبەست لە سوێندخواردن و ترساندنەکە دوورخستنەوە سوێندخۆرە لە کردنی خراپە[2]. راکەیشیان لەم مەسەلەیەدا پێکاویەتی، لەبەرئەوەی زۆر لە خەڵکانی سادە و ساکار ببەلایانەوە ئاساییە بە ناهەق سوێند بە زات و سیفەتەکانی خوا بخۆن، بەڵام رازی نابن بەناهەق تەڵاق بخۆن یان سوێند بەگۆڕی هەندێ لە ئەولیاکان بخۆن.

هـ- لەبارەی کوشتنی کۆمەڵێك لەسەر کوشتنی کەسێك رایان جیاوازە: ئەم مەسەلەیە پێشتر ناکۆکی لەناو هاوەڵاندا دروست کردبوو، هەربۆیە جمهوری شەرعزان بۆ ئەوە چوون پێویستە بەپێی مەسڵەحەی مورسەلە کۆمەڵێ کەس لەسەر بەشدارییان لە کوشتنی کەسێکدا بکوژرێنەوە. رووی بەرژەوەندیەکە: کوژراو خوێنی حەرامە و بەئەنقەست کوژراوە، جا جێبەجێنەکردنی ئەسڵی قیساسەکە هاندەرە بۆ

---

[1] النسائي: كتاب الأيمان والنذور، باب التشديد من الخلف بغير الله تعالى ٤/٣.
[2] بڕوانە: حاشية الدسوقي على الشرح الكبير٤/٢٢٨

ئەوەی بە هاوکاری و بەشداریکردن هەوڵ بۆ کوشتن بدرێ، ئەگەر زانرا قیساسی تێدا نیە.[1]

و- لەبارەی دروستیی خەرجکردنی زەکات بۆ بەنی هاشم رایان جیاوازە: جمهوری شەرعزان لەگەڵ ئەوەن ئەوە جائیز نیە، ئەویش لەبەر هەندێ حەدیس کە بە ریوایەتی جیاواز هاتوون کە سەدەقەی واجب و سوننەت لە بەنی هاشم حەرام دەکا، لەوانە ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ((أنا لا آكل الصدقة))[2] (واتە: ئێمە خێر ناخۆین). هەروەها ئالی بەیت ئاگەدار دەکاتەوە کە خواردنی خێر و سەدەقە بۆ ئەوان دروست نین و تەنها مافی پێنجیەکیان هەیە: ((لا يحل لكم أهل البيت من الصدقات شيء، إنما هي غسالة أيدي الناس، وإن لكم في خمس الخمس ما يغنيكم)).

لە ئەبوحوزەیفە دەگێرنەوە بە جائیزی داناوە، کەمال بن ئەلهەمام دەڵێ (بۆ بەنی هاشم خەرج ناکرێ)، ئەمە زاهیری ریوایەتەکەیە. ئەبو عیسمەت لە ئەبوحەنیفەوە ریوایەتی کردوە لەم سەردەمەدا جائیزە با لەو زەمانەدا نەکرابێ[3]. ئەم ریوایەتە لە ئیمام ئەبوحەنیفەوە -ئەگەر راست بێ- لەسەر کارکردن بە بەرژەوەندی دامەزراوە، بۆ لادانی زیان لە بەنی هاشم.

---

[1] الاعتصام ٢/١٢٥

[2] صحيح مسلم٢/٧٥١

[3] بروانە: فتح القدير ٢/٢٧٢حاشيه بن عابدين٢/٣٥٠

# بەشی پێنجەم:
# قسەی هاوەڵ (صەحابی) و
# کاریگەری لەسەر جیاوازیی ئەحکام

ئەم بەشە دوو باس لەخۆ دەگرێ
یەکەم لەبارەی حوججیەتی قسەی هاوەڵان.
دووەم لەبارەی پیادەکردنە فیقهییە جێناکۆکەکان.

## باسی یەکەم:
## حوججیەتی قسەی هاوەڵ[1]

باسی ئەوەمان کرد گەورە هاوەڵان (ی پێغەمبەر) کە بە فیقە و ئیجتیهاد ناسرابوون، ئیجتیهادیان کردوە و لە زۆر رووداودا فتوا و بڕیاریان داوە، پاشان راویەکانی شوێنکەوتوان و شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان ئەو بڕیار و فتوایانەنیان تۆمار کردوە، تەنانەت هەندێکیان بە قسەکانی هاوەڵانیان دەوت (سوننە)، ئەمانە بوونە جێبایەخی گەورەی زانایانی ئوسوڵ و شەرعزان بۆ دۆزینەوەی پێگەیان لە بەبەڵگەکردن و پلەیان لەنێو سەرچاوەکانی تەشریعدا و لەسەر ئەوە رێك کەوتوون کە

[1] لەبارەی مانای هاوەڵان (الصحابە) رایان جیاوازە، هەندێکیان کردویانە بەمەرج کە هاوەڵێکردنێکی درێژخایەن بێ، ئەمەیش لای ئوسوڵناسان پەسەندە، هەندێکیشیان تەنها هاوەڵێکردنێکی کەمیان بە بەس زانیوە با بۆ ساتێکیش بێ، ئەوەیش رای فەرموودەناس (محدث)ەکانە.

مەزەبی هاوەڵ لە مەسەلە ئیجتیهادیەکاندا لەسەر هاوەڵە موجتەهیدەکانیتر حوججە نیە، جا ئیمام بێ یان حاکم یان موفتی.[1]

بەڵام ئەگەر مەزەبی هاوەڵ لە سەردەمی هاوەڵان یان هەر سەردەمێکیتردا ڕێکەوتنی لەسەر کرابوو حوججەیە. هەروەها ئەگەر هاوەڵ گوتی پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ کردین بە فلانە شت، یان نەهی کردین لە فلانە شت، یان ڕوخسەتی پێداین بۆ فلانە شت، یان حەرامی کرد یاخود نەهی لێکرد یان فەرمان یان فەرزی کرد.. ئەوا حوججەیە، لەبەرئەوەی بە سوننەتێکی ریوایەتکراو لە پێغەمبەرەوە حسێبە و تەنها زاهیریەکان رایان لەمەدا هاوڕا نین[2]، بەڵام بەدەر لەم حاڵەتانە، سێ رای جیاوازیان هەیە:

یەکەم- بەرەهایی حوججەیە، ئەوەیش مەزەبی مالیك و شافیعییە لە رای کۆنی و ئەحمەد بن حەنبەل لە ریوایەتێکدا و هەندێ هاوەڵانی ئەبوحەنیفە، وەك ئەبوبەکری رازی جەصاص و بەردەعی. دەڵێن: لەکاتی تێکگیراندا پێش قیاس دەخرێ. تەبەری لە ئەبوسەعیدی بەردەعی دەگێڕێتەوە وتویەتی: قسەی یەکێك لە هاوەڵان، لە پێش قیاسە و بەقسەی ئەو وازی لێ دەهێنرێ. سەرخەسی دەڵێ شێخەکانمان بەم شێوەیە بینیوە.[3]

دووەم- بەهیچ شێوەیەك حوججە نیە، ئەوەیش مەزەبی ئەشعەری و موعتەزیلە و شافیعی لە رای تازەی و ئەحمەد بن حەنبەلە لە یەکێك لەو دوو ریوایەتەی لێیەوە هاتوون[4]، هەروەها غەزالی ئەوە بۆچوونی بووە و رازی و ئامەدی و شوێنکەوتوانیان وەك ئیبنول حاجب و بەیزاوی، هەڵیانبژاردوە.[5] ئەوە قسەی کەرخییە لە حەنەفیەت،

---

[1] الآمدي ١٩٥/٣ مختصر المنتهى مع العضد والسعد ٢٨٧/٢الاسنوي مع البدخشي ١٤٣/٣

[2] بڕوانە: المسودة ص ٢٣٩

[3] بڕوانە: اصول السرخسي ١٠٥/٢

[4] الآمدي ١٩٥/٣

[5] الاسنوي ١٤٣/٢مختصر المنتهى مع العضد والسعد ٢٨٧/٢

ئەبوبەکری رازیی جەصاص لە ئەبولحەسەنی کەرخی دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: دەبینم ئەبو یوسف لە هەندێ مەسەلەیدا دەڵێ: قیاس بەم شێوەیە، بەڵام من لەبەر ئەسەر (قسەی صەحابی) وازم لێ هێناوە. ئەمە دیلالەتێکە لەسەر پێشخستنی قسەی هاوەڵ بەسەر قیاس دامەزراوە، بەڵام من ئەم مەزەبەم بەدڵ نیە[1]، کە ئەوە لە مەزەبی ئیبازیدا راستە.[2]

سێیەم: بەم وردەکاریەی خوارەوە:

أ- هەندێ دەڵێن حوججەیە ئەگەر پێچەوانەی قیاس بوو ئەگینا نا. ئەمە رای ئەحمەد و زۆریەی هاوەڵانی و بەشێك لە حەنەفیەکانە. ئەلفەتوحی ئەلحەنبەلی لە (شرح الكوكب المنير)دا دەڵێ: ئەگەر هاوەڵ لەگەڵ قیاس کۆك نەبوو، بەلای ئەحمەد و زۆریەی هاوەڵانی و شافیعی و حەنەفیەت و ئیبن صەباغ و رازیەوە بەڕواڵەت بە (تەوقیف) وەردەگیرێ.[3]

ب- هەندێ پێیان وایە تەنها قسەی خەلیفەی راشیدەکان حوججەیە.

ج- کۆمەڵێك دەڵێن حوججە قسەی هەردوو شێخەکە (ئەبوبەکر و عومەر)ـە.

د- هەندێکیتر دەڵێن حوججەیە ئەگەر قیاسی چووە پاڵ، ئەوکاتە پێش قیاسێك دەخرێ کە قسەی هاوەڵی لەگەڵ نیە، ئەوە بۆچوونی زاهیری شافیعییە لە (الرسالة)دا.[4]

هـ- هەندێ دەڵێن پێویستە قسەی هاوەڵ وەربگیرێ و چاوی لێبکرێ لەو شتەی بەقیاس نازانرێ، ئەمەیش زاهیری مەزەبی حەنەفییە. دەڵێن ئەوەی لای ئەوانەوە بێ یان بیستراوە یان درۆیە، ئەوانیش لە درۆ دوورن، بەڵام ئەگەر بەقیاس زانیبێتی واجب نابێ، چونکە ئەوە بەناوبانگە کە بە رای خۆیشیان قسەیان کردوە، دیارە هەموو

---

[1] اصول السرخسي ٢/١٠٦

[2] شمس الاصول مع طلعة الشمس ٢/٦٤

[3] بروانە: شرح الكوكب المنير ص ٣٨٦

[4] ارشاد الفحول للشوكاني ص ٢٤٣

موجتەهیدێك دەپێكێ و هەڵەیش دەكا (ناپێكێ)، ئەم مەسەلەیە لە مەسەلەیەكیتر بووەتەوە، ئەویش ئەوەیە: ئایا مەزەبی هاوەڵ ئەگەر روون نەبوویەوە كە ئیجتیهادی خۆیەتی، وا وەردەگیرێ كە لە پێغەمبەری بیستوە یان نا؟[1].

و- شتێكی سروشتییە مەزەبی ئالی بەیت لای شیعەی ئیمامی حوججە بێ، لەبەرئەوەی ئەوان قسە و كردار و تەقریرەكانی مەعسوم بە سوننە دادەنێن.

خاوەنانی رای یەكەم چەند بەڵگەیەك دێننەوە لەوانە:

١- خوا ئەفەرموێ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ﴾ الآية.[2].
رووی دیلالەتی ئەوەیە: گوتارە بۆ هاوەڵان كە ئەوەی فەرمانی پێدەكەن چاكە (معروف)ـە، مەعروفیش شوێنكەوتنی واجبە، لەبەرئەوە مەزەبی هاوەڵ شوێنكەوتنی واجبە. ئەمە بەوە وەڵام دەدرێتەوە كە ئەو گوتارە گشتییە بۆ ئوممەتی ئیسلامی، ئەگەر وایش دابنێین تایبەتە بە هاوەڵان، ئەوا گوتارە بۆ گرووپەكە و بەڵگە نیە لەسەر حوججیەتی قسەی هەریەكەیان.[3]

٢- پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: ((أصحابي كالنجوم بأيهم اقتديتم اهتديتم)). بەوە وەڵام دەدرێتەوە كە سەنەدی حەدیسەكە لاوازە، هەروەها هیچ دیلالەتێكی تێدا نیە لەسەر گشتیبوونی چاولێكردن لە هەر شتێكدا كە چاوی لێدەكرێ.[4]

٣- كۆدەنگی (ئیجماع): عەبدورەحمانی كوڕی عەوف عەلی كرد بە خەلیفە بەو مەرجەی چاو لە هەردوو شێخەكە (ئەبوبەكر و عومەر) بكا، رازی نەبوو، عوسمانی دانا رازی بوو، كەسیش بەرهەڵستی نەكرد، هەربۆیە بوو بە ئیجماع. ئەمە بەوە وەڵام

[1] شمس الاصول مع طلعة الشمس ١٤/٢
[2] آل عمران/١١٠.
[3] الآمدي ١٩٨/٣
[4] الآمدي ١٩٨/٣.

دەدرێتەوە کە هاوەڵان بەرهەڵستیی عەبدوڕەحمان و عەلییان نەکرد، لەبەرئەوەی چاولێکردنیان بە شوێنکەوتن لە ڕێڕەو و سیاسەتدا وەرگرت نەك شوێن پێهەڵگرتن لە مەزەبدا، بەڵام مەزەبی هاوەڵ حوججە نیە لەسەر هاوەڵ.[1]

٤- ماقوول:

أ- هاوەڵ ئەگەر قسەیەکی کرد پێچەوانەی قیاس، نابێ ئەوە بەبێ سەنەد بێ، ئەگینا دەبێتە شەرعدانان بەبێ بەڵگە، ئەوەیش حەرامە و بناغەکەی گواستنەوەیە و دەبێتە بەڵگەیەکی شوێنکەوتوو (حجة متّبعة).

ب- قسەی هاوەڵ ئەگەر بڵاو بوویەوە و کەس بەرهەڵستی نەکرد حوججەیە و قیاسی لەسەر دەکرێ مەگەر بڵاو بێتەوە، وەك لە قسەی پێغەمبەر(ﷺ)دا.

ج- مەزەبی هاوەڵ یان لە گواستنەوەوەیە یان ئیجتیهادە، لە یەکەمیاندا حوججەیە و لە دووەمیاندا ئیجتیهادی هاوەڵ بەسەر تابیعی و ئەوەی پاش ئەو دێ زاڵ دەکرێ.

یەکەمیان بەوە وەڵام دەدرێتەوە کە بەمەزەبی تابیعی پوچەڵ کراوەتەوە، چونکە ڕێك هەر ئەوەی باسیان کردوە تێیدا جێگیرە، لەکاتێکدا بەرای هەموولا حوججە نیە.

دووەمیشیان بەوە وەڵام دەدرێتەوە کە ئەوە بەڵگەنەویست نیە بناغەکەی نەقڵ بێ، چونکە ئەگەر نەقڵی لەگەڵ بووایە دەبووە ئیجماع ئەگینا بەهیچ شێوەیەك حوججە نیە.

هەرچی سێیەمە، بەوە وەڵام دەدرێتەوە کە ئەوە بەڵگەنەویست نیە کە بناغەکەی نەقڵ بێ، چونکە ئەگەر نەقڵی لەگەڵ بووایە دەیگێڕایەوە، لەبەرئەوەی دادپەروەرە.[2]

خاوەنانی رای دووەم کۆمەڵێ بەڵگە دێننەوە لەوانە:

---

[1] الآمدي ٣/١٩٨ أصول السرخسي ٢/١٠٩

[2] بڕوانە دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

١– کەرخی ئایەتی ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾[1] کردۆتە بەڵگە. ڕووی دیلالەتکردنی: ئەوەیە لەکاتی جیاوازبوونی بۆچووندا گەڕانەوە بۆ قورئان و سوننەی واجب کردوە، بۆیە گەڕانەوە بۆ مەزەبی هاوەڵ وازهێنانە لەو واجبە.[2]

وەڵام ئەوەیە گەڕانەوە بۆ مەزەبی هاوەڵ کاتێك دەبێ حوکمی ڕووداوەکە لە قورئان و سوننەدا دەست نەکەوێ.

٢– غەزالی دەڵێ: کۆمەڵێك ڕایان وایە بەڕەهایی حوججەیە، هەندێکیتریش ڕایان وایە حوججەیە ئەگەر لە قیاس جیاواز بوو، کۆمەڵێك دەڵێن حوججە لە قسەی ئەبوبەکر و عومەردایە، کۆمەڵێکیتر دەڵێن لە قسەی ڕاشیدەکاندایە. بەلای ئێمەوە هەموویان بەتاڵن، چونکە ئەوەی بکرێ هەڵە و سەهو بکات و ساغ نەبوویێتەوە لەوانە پارێزراوە، قسەی نابێتە حوججە.[3]

وەڵام ئەوەیە ئەوانەی لەگەڵ دەستگرتنن بە مەزەبی هاوەڵەوەن نایانەوێ مەعصومیی هاوەڵان بسەلمێنن و پێیان وایە هەر ئەوەندەی عادلن بەسە بۆ وەرگرتنی ڕاکانیان.

هەروەها دەڵێ: هاوەڵان کۆکن لەسەر دروستی سەرپێچیکردنی هاوەڵان، ئەبوبەکر و عومەر سەرزەنشتی کەسێکیان نەکردوە کە جیاواز لەوان ئیجتیهادی کردوە، واتە ئەگەر مەزەبەکەی حوججە بوایە دەبوو هەریەکەیان شوێن ئەویتریان بکەوێ.

وەڵام ئەوەیە بابەتی ناکۆکیەکە بریتییە لە حوججیەتی مەزەبی هاوەڵ لەسەر غەیری هاوەڵ.

---

[1] النساء ٥٩.

[2] أصول السرخسي ١٠٧/٢.

[3] المستصفى ص ٢٤٣.

٣- هەروەها وتویانە: قسەی هاوەڵ بەئیجتیهاد دەکرێ هەڵە بێ، لەبەرئەوە پێش قیاس ناخرێ.

وەڵام ئەوەیە ئەگەری هەڵەکردن ڕێگر نیە لەوەی پێش قیاس بخرێ وەك لە یەکینە هەواڵدا.[1]

٤- سالمی ئیبازی دەڵێ: ئەگەر حوججە بوایە لەسەر کەسێك، دەبوو بەهیچ شێوەیەك لە هیچ مەسەلەیەکدا ناکۆکی نەکەوتایەتە نێوان هاوەڵان، بەڵام لە زۆر مەسەلەدا ناکۆکی کەوتۆتە ناو هاوەڵان.[2]

ئەم بەڵگەیەی سالمی هەمان بەڵگەیە کە غەزالی پشتی پێ بەستبوو، بەهەمان لۆژیکی ئەویش وەڵام دەدرێتەوە.

خاوەنانی رای سێیەم کە دەڵێن قسەی هاوەڵ حوججەیە ئەگەر جیاواز بوو لە قیاس دەڵێن: نەیار (المخالف) پێویستە بەڵگەیەکی نەقڵی هەبێ و قبوڵ بکرێ و حوججەکە بەو حەقیقەتە بێ.

وەڵام ئەوەیە، ئەگەر ئەمە راست بوایە، دەبوو هاوەڵ بە کارپێکردنی پابەند بکرایە. هەروەها پێویست بوو قسەی شوێنکەوتوانیش دوای ئەوان بەهەمان شێوە بوایە، لەبەرئەوەی بەڵگەیان تێدایە، هەردووکیشیان پێچەوانەی قیاسن.[3]

ئەوەیش قسەی خەلیفە راشیدەکان بە حوججە دادەنێ، حەدیسی ((علیكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين من بعدي، عضواً عليها بالنواجذ)) دەکاتە بەڵگە، ئەم حەدیسە ئەو مانایە دەگەیەنێ کە غەیری ئەوان وان نیە.[4]

وەڵام ئەوەیە مەبەست لە شوێنپێ هەڵگرتنیان لە هەقخوازیدا نەك

---

[1] الأمدي ١٩٦/٣.

[2] شمس الأصول مع طلعة الشمس ٦٤/٢.

[3] السعد مع العضد ومختصر المنتهى ٢٨٨/٢.

[4] شرح تنقيح الفصول للقرافي ص ٤٤٦.

لاساییکردنەوەی مەزەبەکەیان[1]. ئەمە جگە لە ساغنەبوونەوەی سەنەدی ئەم حەدیسە.

هەروەها ئەوەی قسەی دوو شێخەکە بەحوججە دادەنێ پشت بەو حەدیسە دەبەستێ کە دەڵێ ((اقتدوا باللذين من بعدي أبي بكر وعمر))، ماناکەی ئەوە دەگەیەنێ غەیری ئەوان بەو شێوەیە نیە.[2]

هەمان وەڵامی تایبەت بە راشیدین بۆ ئەمیش دەدرێتەوە.

بەبڕوای من ناکۆکی لەسەر بەبەڵگەکردنی قسەی هاوەڵ لە بواری یاساданانی ئیسلامیدا وەك بنەمایەك، وەك زۆر ناکۆکیکتر ناکۆکیەکی لەفزییە، ئەویش لە چەند روویەکەوە:

١- هەموولا کۆکن لەسەر ئەوەی شەرعدانەر (الشارع)ی راستەقینە تەنیا خوایە و پێغەمبەر(ﷺ) بە یاسادانەر (المشرع) دادەنرێ، چونکە ئەو لەخۆیەوە قسەی نەدەکرد بەڵکو وەحی بوو بۆی دەهات، بۆیە حوکم هەر بۆ خوایە.

٢- هەموولا کۆکن لەسەر ئەوەی سەرچاوە پاشکۆکان چ ئەوانەی جێی کۆك و چ ئەوانەی جێی ناکۆن، سەرچاوەی بدۆزی حوکمەکانی خوان نەك پێکهێنەریان.

٣- نکوڵیکردنی غەزالی (رەحمەتی خوای لێبێ) -بۆ نموونە- لە حوججیەتی قسەی هاوەڵ بەرەهایی، مانای ئەوە نیە بەچاوێکی کەمتر بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا دەڕوانێ لەوەی -بۆ نموونە- بەردعی بۆیان دەڕوانێ کە لەگەڵ ئەوەیە قسەی هاوەڵ بەرەهایی حوججەیە، هەموولا کۆکن لەسەر عەدالەتی هاوەڵان و پایەی بەرزیان وەك ئیمان و بیرکردنەوە و ئیجتیهاد و متمانە و پێگەی بەرێزیان لە دنیای ئیسلامیدا.

لەم روانگەوە: ئەوەی دەڵێ مەزەبی هاوەڵ حوججەیە، مەبەستی ئەوەیە ئەگەری ئەوە هەیە لەو کەسەوە ریوایەت بکا کە وەحی بۆ دادەبەزێ، چونکە عادەتیان

---

[1] أصول السرخسي ١٠٨/٢.

[2] شرح تنقيح الفصول ص ٤٤٤.

وابووه ئەوەیان دەقێکی لەلابووه، دەشێ هەندێ جار بەگوێرەی دەقەکە، بەڵام بەبێ دەقەکە، ریوایەتی کردبێ یان فتوای دابێ، ئەمە ئەگەری ئەوەی لێدەکرێ گوێی لە خاوەنی وەحی بووبێ، لەبەرئەوە پێش رای رووت دەخرێ.

هەروەها ئەوەی وتوێتی حوججە نیە، مەبەستی ئەوە بووە هاوەڵ یاسادانەر نیە و سەردەمی تەشریع بەمردنی پێغەمبەر(ﷺ) کۆتایی هاتووە، هەروەها بۆچوونەکەی وەك هی هەر موجتەهیدێکیتر قابیل بە راست و هەڵەیە، چونکە مەعسوم نیە، لەبەرئەوە هەر تەنها رای خۆی بەبێ ئەوەی پشت بە کیتاب (قورئان) یان سوننە ببەستێ بەهیچ شێوەیەك بە حوججە دانانرێ، خۆ ئەگەر پشتی بەیەکێکیان بەستبێ، ئەوا حوججەکە لە سەنەدەکەدایە نەك لە راکەدا.

## باسی دووەم:
# مەسەلە پراکتیکییە جیاکۆکەکان
# کە لەم ناکۆکییە دەکەونەوە

جیاوازیی شەرعزان لەبارەی حوججیەتی قسەی هاوەڵ، وای کردوە لە کۆمەڵێ مەسەلەدا جیاواز بن، لەوانە:

أ- جیاوازییان لە دیاریکردنی ماوەی بێنوێژی (سوڕی مانگانە)دا[1]:

حەنەفیەت رای وایە کەمترین ماوەی بێنوێژی (حیض) سێ رۆژ و زیاترینی دە رۆژە[2]. مالیك دەڵێ کەمترین ماوەی حەیز حەدی نیە، دەکرێ سەعاتێك بێ. بە رای مالیکیەت: کەمترینی لە عیبادەتدا تەوژمێکە، واتە بە تەوژم (دەفعە)یەك خۆشۆردنی لەسەر واجب دەبێ. رۆژوەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و ئەو رۆژە قەزا دەکاتەوە، بەڵام لە عیددە و (استبراء)[3] دا بە حەیز دانانرێ تا رۆژێك یان بەشێك لە رۆژ بەردەوام نەبێ، زۆرترینیشی بەسەرەتاکەیەوە نیو مانگە وەك کەمترین پاکبوونەوە.[4]

شافیعی لە جێیەکدا دەڵێ: کەمترینی رۆژ و شەوێکە. لە جێیەکیتردا دەڵێ: کەمترینی رۆژێکە. پاشان هاوەڵانی لە لێکدانەوە ئەوەدا بوون بە سێ قسەی جیاوازەوە: هەندێکیان دەڵێن دوو قسەیە. هەندێکیان وتیان (رۆژ و شەوێك) یەك قسەیە و ئەوەی کە دەڵێ رۆژێك مەبەستی بەشەوەکەیشیەوە، هەندێکیش وتویانە

---

[1] ناکۆکی لەبارەی عیددەوەیە نەك عیبادەت، چونکە هەموولا کۆکن حەیز ئەگەر بۆ ساتێکیش بێ عیبادەت خراپ دەکا.

[2] فتح القدیر مع الهدایة ١/١٦٠ و پاشتر.

[3] مەبەست چاوەڕوانکردنی ئافرەتە بۆ ماوەیەك بەمەبەستی دڵنیابوون لەوەی سکپڕ نیە-وەرگێڕ.

[4] بلغة السالك ١/٧٣-٧٤.

یەك قسەیە بەڵام وتوێتی رۆژ و شەوێك بەر لەوەی رۆژەكەی لەلا ساغ بێتەوە، كاتێ لای ساغ بوویەوە گەڕایەوە بۆی، زۆری دە رۆژ و زۆربەی شەش یان حەوت رۆژە.[1]

حەنبەلیەكان وتویانە لای خواری رۆژ و شەوێكە، لە (شرح الاقناع)دا هاتووە: مەبەست ئەندازەی رۆژ و شەوێكە (٢٤ سەعاتە)، ئەگەر خوێن لەوە كەمتر پچڕا ئەوە خوێنی پیسە، زۆری پازدە رۆژە بە شەوەكانەوە، زۆربەیشی شەش یان حەوت رۆژە[2]. رای أبو ثور لەگەڵ حەنبەلیەكان كۆكە.

شیعەی ئیمامی دەڵێن: لای خواری بێنوێژی سێ رۆژ و لای سەرووی دە رۆژە[3]، بەوە لەگەڵ حەنەفیەت یەكدەگرنەوە. داودی زاهیری پێی وایە لای خوارەكەی رۆژێكە بەبێ شەو.

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی بۆچوونەكان لەبارەی ماوەی بێنوێژی چوارن:

یەكەم: كەمترینی سێ رۆژ و زۆرترینەكەی دە رۆژە، ئەوەیش مەزەبی حەنەفی و شیعەی ئیمامی و ئەوانەیە هاوڕایانن.

دووەم: كەمترینی رۆژ و شەوێكە و زۆرترینی پازدە رۆژە، ئەوەیش مەزەبی حەنبەلی و شافیعییە لەسەر دوو لێكدانەوە یەكەمەكەی هەردوو قسەكەی شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن.

سێیەم: كەمترینی یەك رۆژە بەبێ شەو، لای زاهیری و شافیعی لەسەر لێكدانەوەی سێیەم.

چوارەم: كەمترینی یەك ساتە بۆ عیبادەت، رۆژێك یان بەشێك لە رۆژێكە بۆ عیددە، ئەوەیش مەزەبی مالیكییە.

---

[1] المهذب ٣٨/١.

[2] نیل المأرب ١٩/١

[3] الخلاف للطوسي ٧٣/١ و پاشتر.

هۆی ناکۆکیەکەیان: جیاوازییانە لەوەی ئاخۆ ئەوەی لە هاوەڵ (صەحابی)ـەوە ریوایەت دەکرێ ئەگەر لەوە بێ کە بە را نازانرێ دەبێتە حوججە؟ لەبەرئەوەی صەحابی شتی لەو شێوە ناڵێ، تا شتێکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) تێدا نەبیستبێ وەك حەنەفی و شیعەی ئیمامی و ئەوانەی هاوڕایان بۆی چوون.

یان نەخێر مەزەبەکەی حوججە نیە و کار بە را و قیاس دەکرێ، وەك شافیعیەت و ئەوانەی هاوڕایانن بۆی چوون؟

بەزدەوی دەڵێ[1]: هاوەڵانمان کۆکن لەسەر کارکردن بە لاساییکردنەوە (واتە تەقلیدی صەحابی) لەوەی بە قیاس پەی پێ نابرێ، وتراوە کەمترینی بێنوێژی سێ رۆژە و زۆرترینی دە رۆژە، ئەوەیان لە ئەنەس و وعوسمان بن ئەبیلعاصی سەقەفیەوە ریوایەت کردوە.

عبد العزیز البخاری دەڵێ: ئەوە لە: عومەر و عەلی و ئیبن مەسعود عوسمانی کوڕی ئەبولعاصی سەقەفی و ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت کراوە.[2]

هەروەها شیعەی ئیمامیش قسەی صەحابی دەکەنە بەڵگە. تووسی دەڵێ: ئەحمەد بن محەمەد بن ئەبو نەصر دەگێڕێتەوە: پرسیارم لە ئەبولحەسەن (عەلی) کرد لەبارەی کەمترین ماوەی بێنوێژی، وتی: لای خواری سێ رۆژ و لای سەری دە رۆژە. هەروەها صەفوان بن یەحیا دەگێڕێتەوە: پرسیارم لە ئەبولحەسەن کرد لەبارەی کەمترین ماوەی بێنوێژی، وتی: نزیکترینی سێ رۆژ و دوورترینی دە رۆژە.[3]

مەزەبی شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن را و قیاس دەکەنە بەڵگە. ئەبوئیسحاقی شیرازی دەڵێ[4]: بەڵگە لەوەدا ئەوەیە، مەرجەع لەوەدا بوونە، بوونیش لەو ئەندازەیەدا سەلماوە.

---

[1] أصول البزدوي مع كشف الأسرار ٩٣٨/٣

[2] الكشف مع البزدوي ٩٣٨/٣

[3] الخلاف للطوسي ٧٤/١.

[4] المهذب ٣٨/١ و پاشتر.

شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ژنێکم بینی بۆم دەرکەوت یەك ڕۆژ لە عادە (بێنوێژی)دایە و لەوە زیادی نەکردوە. ئەوزاعی دەڵێ: لای ئێمە ئافرەتێك هەیە بەیانی دەکەوێتە عادە ئێوارە پاك دەبێتەوە. عەتا دەڵێ: لە ئافرەتاندا دیومە یەك ڕۆژ لە عادەدا بووە و هەیە پازدە ڕۆژ. ئەبوعەبدولڵای زوبێری دەڵێ: ئافرەتان هەندێکیان یەك ڕۆژ لە عادەدا دەبوون و هەندێکیان پازدە ڕۆژ.[1]

بەم شێوەیە هۆی ناکۆکیەکەیان تێکگیرانی قیاسە لەگەڵ قسەی صەحابی: حەنەفیەت و شیعەی ئیمامی و ئەوانەی هاوڕایانن قسەی صەحابییان وەرگرتوە. شافیعی و مالیکی و ئەوزاعی و حەنبەلیەکان و ئەوانەی هاوڕایانن ئافرەتێکیان لەسەر یەکێکیتر قیاس کردوە بەگوێرەی ئەوەی لەبارەی نەریتی هەندێ لە ئافرەتان لەلایان جێگیر بووە.

ب- لەبارەی فرۆشتنی عەینە (بیع العینة) ڕای جیاواز دروست بووە کە بریتییە لە: پێشینەکان (السلف) کە بریتییە لە کڕینەوەی ئەوەی فرۆشتویەتی بەر لە وەرگرتنی پارەکەی بە کەمتر لەو نرخەی فرۆشتویەتی:

شافیعی و ئەوانەی شوێنی کەوتوون هەردوو گرێبەندەکە بە دروست دادەنێن، ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین گرێبەندی دووەمیان بە فاسید داناوە.

هۆی ناکۆکیەکەیشیان تێکگیرانی قیاسە لەگەڵ قسەی هاوەڵ. شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین کاریان بە قیاس کردوە و دەڵێن: ماڵە فرۆشراوەکە بە وەرگیرانی لە لایەن کڕیارەوە فرۆشتنی دامەزراوە و ئیتر فرۆشیارەکە بۆی هەیە بەهەر نرخێك بەوێ بیفرۆشێ هەروەك فرۆشتن لەلایەن کەسیترەوە و هەروەك لێکڕینی بە نرخەکەی خۆی.[2]

---

[1] المهذب، سەرچاوەی پێشوو.
[2] تخريج الفروع للزنجاني ص ٨٣ كشف الأسرار مع البزدوي ٩٣٨/٣

ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین قسەی هـاوەڵ (عائیشـە)یان وەرگرتـوە[1]، ئـەویش ئەوەیە دایکی یونس ریوایەتی کردوە کە ئافرەتێك هاتە لای عائیشـە وتـی خزمـەتکار (یان بەندە)یەکم لە زەید بن ئەرقـەم کـڕی بـە هەشتسـەد درهـەم بـۆ عـەتا، ئـەویش پێویستی بە پارەکەی بوو، منیش پێش هـاتنی کـاتی پارەدانەکـەی لـێم کڕیـەوە بـە شەشسەد، ئەویش گوتی: خراپت کڕی و خراپت فرۆشت. بە زەید بن ئەرقەم بڵێ خوا حەج و جیهادەکەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا بەتاڵ کردۆتەوە ئەگەر تۆبـە نـەکا. زەیـد هاتە لای و عوزرخوایی هێنایەوە، ئەویش ئایەتی ﴿فَمَن جَاءَهُ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِ فَانتَهَىٰ فَلَهُ مَا سَلَفَ﴾ خوێندەوە.[2]

ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین کاریان بەوە کرد کە لە عائیشەوە ریوایەت کراوە و وازیان لە قیاس هێنا، لەبەرئەوەی قیاس بۆ ئەوەی پێچـەوانەی قسـەکەی عائیشـەیە لایـەنی بیسـتن (جهـة السـماع)ی تێـدا دیـاری دەکـا، بەلگـەیش لەسـەری ئەوەیـە بەتاڵبوونەوەی حەج و جیهادی کردۆتە سزای کردنـی ئـەو عەقـدە، لەکاتێکـدا سـزای تاوانەکان بە را دیاری ناکرێن، بۆیە زانـی ئـەوە وەك بیسـتراو لـە پێغەمبـەری خـواوە وایە، پۆزشەکەی زەیدیش بۆی بەلگەیە لەسـەری، چـونگە هەنـدێکیان بەپێچـەوانەی رای هەندێکیان جوڵاونەتەوە و عوزریشیان بۆ هاوەڵەکانیان نەهێناوەتەوە.[3]

ج– ئەبو زەیدی دەبوسی لـە (تأسـیس النظـر)دا دەڵـێ: (ئەسـڵ لای هاوەڵانمـان ئەوەیـە قسـەی هـاوەڵ پـێش قیـاس دەخـرێ ئەگـەر یـەکێك لـە هاوشـانەکانی رای جیاوازی نەبوو، لەبەرئەوەی ناکرێ بوترێ لەرێگەی قیاسەوە وتوێتی، چـونکە قیـاس پێچەوانەیەتی، ناشکرێ بوترێ لـەخۆوە بـەگۆترە وتـوێتی، چـونکە وادیـارە لـەرووی بیستنی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وتوێتی. بەلای ئیمامی قورەیشی ئەبو عەبـدوڵای

[1] بروانە: الإجابة للزركشي تحقيق الاستاذ سعيد الأفغاني ص ١٥١ السنن الكبرى للبيهقي ٣٣٠/٥–٣٣١.
[2] البقرة ٢٧٥
[3] كشف الأسرار لعبد العزيز البخاري مع البزدوي ٩٣٨/٣–٩٣٩ الهداية مـع فـتح القـدير ٢٠٨/٥ تخـريج الفـروع على الأصول للزنجاني ص ٨٣–٨٤.

شافیعیشەوە قیاس لەپێشە، چونکە ئەو لەگەڵ لاساییکردنەوەی هاوەڵ و دەستگرتن بە رای هاوەڵ نیە).[1]

دەبوسی ژمارەیەك جیاوازبوونی لەم ناکۆکییە خستۆتەوە، لەوانە:

١- دەبوسی دەڵێ: هاوەڵانمان دەڵێن، واتە حەنەفیەت: ئاو لە دەم و لوت رادان لە لەشپیسیدا فەرزن لەبەرئەوەی لە ئیبن عەباسەوە ریوایەت کراوە کە کاتێ پرسیاری لێکراوە لەبارەی ئەوەی ئاوی لە دەم و لوتی رانەدا و نوێژی کرد، ئاوی لە دەم و لوتی رادا و نوێژەکەی کردەوە، لای شافیعی ئاو رادان لە دەم و لوت لە وسڵی جەنابەتدا سوننەتە و کاری بە قیاس کردوە[2].

٢- لەبارەی دروستیی فرۆشتنی مەی لەنێوان ئەهلی زیممەدا: حەنەفیەت وتویانە جائیزە و ئەو قسەیەی عومەری کوڕی خەتابان کردۆتە بەڵگە کە وتویێتی: (رێیان پێبدەن بیفرۆشن و دەیەکی نرخەکەیان لێ وەربگرن). بەلای شافیعی و ئەوانەی هاوڕان: جائیز نیە، ئەویش بە قیاس لەسەر غەیری زیممی[3]. دەبوسی دەڵێ: بەلای ئەبوحەنیفە و ئەوانەوە کە هاوڕاین، لە روانگەی قسەکەی پێشووی عومەرەوە، پێیان وایە ئەوەی ئارەقەکە لەناو ببات دەبێ بیبژێرێ ئەگەر خاوەنەکەی زیممی بوو.

بەلای شافیعیەوە با خاوەنەکەی زیممیش بێ لەناوبەری ئارەق زەمان (واتە بژاردن)ی ناکەوێتە سەر[4].

---

[1] تأسيس النظر ص ٧٥.

[2] سەرچاوەی پێشوو. ص ٧٦

[3] سەرچاوەی پێشوو.

[4] سەرچاوەی پێشوو.

# بەشی شەشەم:
# ئیستیصحاب و کاریگەری
# لەسەر جیاوازیی ئەحکام

دوو باس لەخۆ دەگرێ: یەکەم: لەبارەی جۆرەکانی و رای زانایان لە کردنی بەبەڵگە.

دووەم: لە پیادەکردنە فیقهییە خیلافیەکان کە لە جیاوازی لە بەبەڵگەکردنی دەکەونەوە.

## باسی یەکەم:
## ئیستیصحاب و جۆرەکانی و کردنی بەبەڵگە

ئیستیصحاب (الاستصحاب): لەڕووی زمانەوانییەوە: لە هاوەڵێتی (المصاحبة)ەوە[1] هاتووە، لای ئوسوڵناسان بریتییە لە جێگیربوونی شتێك لە زەمەندا بینا لەسەر جێگیربوونی لە زەمەنی یەکەمدا، لەبەر نەمانی ئەوەی بۆ گۆڕان دەست دەدا.[2]

بۆ نموونە: ئەگەر کەسێك شتێکی کڕی بەمەرجی بێعەیبی، پاشان لەبەر بوون و نەبوونی عەیبێك کە پێویست بە گێڕانەوە بکا لای فرۆشیار، جیاوازییان تێکەوت، ئەوا

---

[1] (سین) بۆ داواکردنە بەپێی ڕێسای ئەوەی تەماشاکار ئێستا داوای ڕاستی ئەوە دەکا کە تێپەڕیوە.

[2] جمع الجوامع وشرحه مع حاشية البناني ٢/٢١٧ الأسنوي مع البدخشي ٣/١٣١

قسه قسەی فرۆشیارەکەیە لەبەر دەستگرتنی بە سیفەتە ئەسڵیەکەوە کە ساغییە، سەلماندن لەسەر کڕیارە.

جۆرەکانی: ئیستیصحاب بەلەبەرچاوگرتنی حوکمەکەی پێشوو دەبێ بە سێ جۆرەوە:

١- ئیستیصحابی حوکمی ئەسڵی شتەکان کە ڕێپێدان (ئیباحە)یە لەکاتی نەبوونی بەڵگە لەسەر پێچەوانەکەی، ئەوەیش لای جمهور بڕیاری لێدراوە ئەوەیە حوکمی جێگیری ئەو شتانەی بۆ مرۆڤ بەسوودن بریتییە لە ئیباحە و ئیزن، بەو مەرجەی حوکمێکی دیاریکراو لەلایەن شەرعدانەرەوە نەیەت، ئەویش بەبەڵگەی دەقە گشتییەکانی قورئان، لەوانە: ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾[1] ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾.[2]، لەبەرئەوەی ژێربارخستنی شت بۆ مرۆڤ یان دروستکردنی لەبەر ئەو، هەر ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە کە موباح بن بۆی و مۆڵەتی بەکارهێنانیانی پێبدرێ.

خواستی گشتیبوونی ئەم دەقانە و هیتر -ی لەم جۆرە- ئەوەیە هەرچی لەم گەردوونەدایە، لە وشکانی یان دەریایی یان ئاسمانی، موباح و ڕێگەپێدراون مەگەر بەڵگەیەك لە شەرع لەسەر قەدەغەکردنی هەبێ.

٢- ئیستیصحابی ئەستۆپاکیی ئەسڵی: وەك حوکمدان بە ئەستۆپاکی لە ئەرك و پابەندیەکان، تا بەڵگەیەك ئاماژە بە وابەستەکردنی بە شتێ لەوانە دەکا، وەك دەقێك یان عەقدێك یان لەناوبردنێك.. ئەوەی سکاڵا لەسەر یەکێکیتر بکا ئەسڵ ئەستۆپاکیی سکاڵا لەسەرکراوە تا سکاڵاکار پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێنێ.

هەروەها ئەگەر لە نرخ یان ئەندازەی ماڵە تەلەفکراوەکەدا بۆچوونیان جیاواز بوو، قسەی تەلەفکارەکە حسێبە تا پێچەوانەکەی دەسەلمێ، لەبەرئەوەی ئەسڵ

---

[1] الجاثية/١٣.

[2] البقرة/٢٩.

ئەستۆپاکییە لە زیادە، جا ئەگەر وەکیل یان بەردەست کاڵایەکی بە سیفەتێکی دیاریکراو کڕی و موەکیل یان خاوەن سەرمایەکە بانگەشەی ئەوەی کرد کە نەبوونی ئەو مەرجەیان کردۆتە مەرج.... تا پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێ، لەبەرئەوە ئەسڵ مەرجدانەنانە.

٣- ئیستیصحابی ئەوەی شەرع ئاماژەی بۆ جێگیربوونی کردوە لەبەر بوونی هۆکەی، تا بەڵگە لەسەر نەمانی پەیدا دەبێ[1]، وەك جێگیربوونی خاوەندارێتی لەکاتی بوونی ئەو هۆیەی بوونی ئەو خاوەندارێتییە دەگەیەنێ وەك فرۆشتن و میرات، موڵکەکە بەبەردەوام دادەنرێ کات چەندە درێژە بکێشێ تا بەڵگە لەسەر پێچەوانەکەی پەیدا دەبێ. هەروەها وەك جێگیربوونی پەیوەندیی هاوسەری، کە حوکم بە مانەوەی دەدرێ تا بەڵگەی جیابوونەوە پەیدا دەبێ. هەروەها وەك دڵنیابوون لە بوونی دەستنوێژ کە لەڕووی ئیستیصحابەوە بەگومان لەناو ناچێ و بەم شێوەیە.

جگە لە هەندێ زانای وەك ئیبن ئەلسەبکی[2] ئیستیصحابی عموم یان دەق بۆ هاتنی بگۆڕ لە تایبەتکەرێکەوە ئەگەر زاهیر بوو، یان نەسخکارێك ئەگەر دەق بوو، بە ئیستیصحابی کۆکلەسەر (المتفق علیه) لەقەڵەم دراوە، چونکە لەوەدا تەنها (ئیبن سریج) لە کارکردن بە (عام) بەر لە گەڕان بەدوای تایبەتکەردا لایداوە.

ئەمەیش بەوە رەت دەدرێتەوە کە ژماردنی ئەوە بە ئیستیصحاب نادروستە، چونکە جێگیربوونی حوکمەکە تێیدا لەڕووی لەفزەوەیە نەك لەڕووی ئیستیصحابەوە.

بۆچوونەکان لەبارەی بەبەڵگەکردنی ئیستیصحاب:

ئەوەی ئەقڵ و شەرع بەڵگە بن لەسەر جێگیری و بەردەوامی ناکۆکی لەسەر نیە، وەك خاوەندارێتی لەکاتی بوونی ئەوەی خاوەندارێتی دەخوازێ، هەروەها گیرانی

---

[1] شرح التنقیح الفصول ص ٤٤٧

[2] جمع الجوامع، سەرچاوەی پێشوو.

ئەستۆ لەکاتی بوونی واجبکەرێك لە تەلەفکردن یان پابەندی و بەردەوامیی حەڵاڵبوون لە مارەکراودا پاش پەسەندکردنی مارەبڕینەکە، لەمانەدا ناکۆکی نیە لە پێویستیی کارپێکردنی تا بەرهەڵستێك دەردەکەوێ.[1]

ناکۆکی نیە لەوەی ئیستیصحاب ناکرێ بەڵگە لە بارێکدا بەڵگەیەك هەبێ لە قورئان و سوننە یان ئیجماع لای هەموو، یان قیاس لای جمهور، پێچەوانەی بگەیەنێ. خوارەزمی لە (الکافی)دا دەڵێ: ئەوە دواین خولگەی فتوایە، چونکە موفتی ئەگەر لەبارەی رووداوێك پرسیاری لێکرا لە کیتابدا بەدوای حوکەکەیدا دەگەڕێ، پاشان لە سوننە، پاش ئەوە لە ئیجماع و ئەنجا لە قیاس. ئەگەر نەدیۆزیەوە حوکمەکەی لە ئیستیصحابی دۆخەکە وەردەگرێ لە نەفی و ئیسپاتدا، ئەگەر دوودڵی لە نەمانیدا هەبوو ئەوا ئەسڵ مانەوەیەتی، بەڵام ئەگەر دوودڵی لە سبوتیدا بوو ئەوا ئەسڵ سبوتبوونیەتی.[2]

ناکۆکی نیە لە ئیستیصحابی نەبوونی ئەسڵی (استصحاب العدم الاصلي) بەبەڵگەیەك لە ئەحکامی شەرعیدا وەك ئەستۆپاکی لە بەرئەرکی (تکلیف) تا بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر گۆڕانی پەیدا دەبێ، قازی ئەبوتەیب دەڵێ: ئەمە بەئیجماع حوججەیە لەلایەن ئەوانەی دەڵێن بەر لە شەرع حوکم نیە.[3]

هەرچی ئیستیصحابی حوکمی ئەقڵییە لای موعتەزیلە، بەلای ئەوانەوە ئەقڵ لە هەندێ شتدا حوکم دەکا تا بەڵگەی سەمعی رەتی دەکاتەوە. ئەمە لەناو ئەهلی سوننەدا خیلافی لەسەر نیە لەو رووەوە نابێ کاری پێبکرێ، لەبەرئەوەی لە شتە شەرعیەکاندا حوکم بەدەستی ئەقڵ نیە، بەڵام لەنێوان ئەهلی سوننە و موعتەزیلە و ئەوانەی هاوڕایانن جێی ناکۆکییە.[4]

---

[1] إرشاد الفحول س ٢٣٨

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٧

[3] سەرچاوەی پێشوو ص ٢٣٧

[4] سەرچاوەی پێشوو.

بەڵام بەدەر لەم شێوانەی لەسەرەوە باس کران، ناکۆکی بەسەر سێ ڕێبازدا دابەش بووە:

یەکەم: بەرەهایی حوججەیە و ئەوەیش مەزەبی جمهورە، زۆربەی زانایان لە مەزەبەکانی مالیکی[1] و شافیعی[2] و حەنبەلی[3] و زاهیری[4] و شیعەی ئیمامی[5] و زەیدی ئەم رایەیان هەیە[6].

دووەم: بەرەهایی حوججە نیە، ئەوەیش ڕێبازی موتەکەلیمەکانە، لەوانە ئەبولحوسێنی بەصری.[7]

سێیەم: وردکردنەوە:

زۆربەی پاشینەکان لە حەنەفیەت رایان وایە حوججەیە بۆ دوورخستنەوە (الدفع) نەك بۆ نەهێشتن (الرفع)، روونکردنەوەی ئەمەیش بەو شێوەیە کە ئەو دۆخەی بە ئیستیصحاب جێگیر کراوە حوججەیە بۆ دوورخستنەوەی ئەوەی پێچەوانەیەتی تا بەڵگە لەسەر ئەو پێچەوانەیە دروست دەبێ و حوججە نیە لەسەر سەلماندنی ئیددیعاکراوێك کە بەڵگەیەك پەیدا نەبووە بیسەلمێنێ. بێسەروشوێن کاتێ ون بووە ژیانی جێگیر بووە و ئەسڵیش مانەوەی ئەوەیە کە هەبووە وەك خۆی تا گۆڕانی ئەوە دەسەلمێ، واتە ئەسڵ ئەوەیە بەزیندوویی بمێنێتەوە تا بەبەڵگەیەکی راستەقینە مردنی ساغ دەبێتەوە، یان قەزا بڕیاری مردنی دەدا، جا ئەگەر وەرەسەکەی داوای بەشکردنی میراتەکەیان کرد لەنێوانیاندا، داواکەیان رەت دەکرێتەوە بەوەی ژیانی بە ئیستیصحاب جێگیرە (واتە: ئەسڵ مانیەتی تا بەڵگە لەسەر نەمانی پەیدا دەبێ)،

---

[1] شرح تنقيح الفصول للقرافي المالكي ص ٤٤٧

[2] الأسنوي مع البدخشي والبيضاوي ١٣١/٣

[3] الكوكب المنير ص ٣٨٢

[4] الشوكاني ص ٢٣٧

[5] الأصول العامة محمد تقي الحكيم ص ٤٤٧ و پاشتر.

[6] إرشاد الفحول، سەرچاوەی پێشوو.

[7] سەرچاوەی پێشوو.

هەروەها ئەگەر ژنەکەی داوای کرد لێی تەڵاق بدرێ یان بەکێك داوای کرد بەکرێدانەکەی فەسخ بکرێتەوە، ئیستیصحابی ژیانی بەڵگەیە بۆ دانەدواوەی ئەو داوایەی لەسەری کراوە.

بەڵام ئەگەر کەسێك مرد کە بێسەروشوێنەکە میراتگریەتی و سەرپەرشتیاری بێسەروشوێنەکە داوای میراتەکەی لە میراتدەرەکەی کرد بەپشتبەستن بەوەی کەسە بێسەروشوێنەکە بە ئیستیصحاب بە زیندوو دادەنرێ، ئەم پشتبەستنە ناکرێتە بەڵگە و بێسەروشوێنەکە دەستبەجێ میراتی لێ نابا، بەڵکو وەك ئەمانەت پشکەکەی دەپارێزرێ تا سۆراخی بێسەروشوێنەکە بەراستی روون دەبێتەوە.[1]

بەڵام حەنەفیەت لە زۆر لە پیادەکردنەکانیاندا ئیستیصحاب و ئەو رێسایانەی لێی دەکەونەوە، دەکەنە بەڵگە بەبێ جیاوازیکردن لەنێوان (دفع) و (رفع)، وەك لە پیادەکردنەکاندا باس دەکرێ.

---

[1] مصادر التشريع فيما لا نص فيه للأستاذ خلاف، ص ١٣٢.

## باسی دووەم:
# مەسەلە پراكتیكییە جێناكۆكەكان

شەرعزان لەبەر جیاوازییان لە كردنی ئەم بنەمایە بە بەڵگە لە هەندێ مەسەلەی فیقهیدا رایان جیاوازە:

١- جیاوازی لەبارەی كاتی كۆتا و سەرەتای عەسر:

ئەبوحەنیفە و ئەوانەی هاوڕاین دەڵێن بڕیار بە سەرچوونی كاتی نیوەڕۆ نادرێ تا سێبەری هەموو شتێك بەقەدەر دوو هێندەی خۆی لێ نەیەت.

ئەبو یوسف و محەمەد و شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن رایان وایە ئەگەر سێبەری هەر شتێك بەقەدەر خۆی لێهات، ئەوا بڕیار بە تەواوبوونی كاتی نیوەڕۆ دەدرێ، واتە پاش سێبەری لادان لە ناوەڕاستی ئاسمان (ظل الزوال)، وەك مالیكیش پێی وایە.[١]

هۆی ناكۆكیەكەیشیان جیاوازییانە لە بەبەڵگەكردنی ئیستیصحابدا.

ئەبوحەنیفە كار بە ئیستیصحاب دەكات و دەڵێ: زانیمان كاتەكە شایستەی نیوەڕۆیە و گومانمان هەیە لە تەواوبوونی كاتەكەی و چوونە ناو عەسر، بۆیە بە یەقین نەبێ بڕیار نادرێ، ئەو یەقینەیش بەدینایەت تا سێبەری هەر شتێك دوو هێندەی خۆی لێ نەیەت.[٢]

بەڵام شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن دەستیان بەدەقەوە گرتوە و كاریان پێكردوە و وازیان لە ئیستیصحاب هێناوە. ئەبوئیسحاقی شیرازی دەڵێ: سەرەتای كاتی نیوەڕۆ لادانی خۆرە (لە ناوەڕاستی ئاسمان) و كۆتاییەكەیشی ئەو كاتەیە سێبەری هەر شتێك بەقەدەر خۆی لێ دێ جیاواز لەو سێبەرەی كەسەكە لە زەوالدا هەیەتی. ئەویش لەو رووەوە ئیبن عەباس ریوایەتی كردوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:

---

[١] حاشية الدسوقي على الشرح الكبير ١/١٧٦-١٧٧

[٢] تأسيس النظر للدبوسي ص ١٠

(أمني جبريل عليه السلام عند باب البيت مرتين فصلى بي الظهر في المرة الأولى حين زالت الشمس والفيء مثل الشراك،[1] ثم صلى بي المرة الأخيرة حين كان ظل كل شيء مثله).[2]

رەنگە ئەم دەقە لای ئەبوحەنیفە ساغ نەبووبێتەوە، چونکە ئەویش ئیستیصحاب ناکاتە بەڵگە کاتێ دەق هەبێ، بەتایبەت لەوەی بواری رای تێدا نیە.[3]

٢- ئەو کەسەی لەبەر بێئاوی تەیەموم دەکا، ئەگەر لەکاتی نوێژەکەیدا ئاوی بینی شەرعزان لەبارەی بەتاڵیی نوێژەکەیەوە رایان جیاوازە:

بەلای شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، لەبەرئەوەی کۆدەنگی دروست بووە لەسەر دروستیی نوێژەکەی لەکاتی دەستپێکردنیدا، ئەو بەڵگەیەی ئامازە بێ بۆ دروستیی دەستپێکردن ئامازەیشە بۆ بەردەوامبوونی، مەگەر بەڵگەی پچڕان سەرهەڵبدات.

بەڵام حەنەفی و حەنبەلیەکان و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن، بەتاڵ دەبێتەوە و کۆدەنگی لەسەر دروستیی نوێژەکەی بەر لە بینینی ئاو بایەخی نیە، لەبەرئەوەی کۆدەنگی لەکاتی نەبووندا دامەزراوە نەك لە حاڵەتی بووندا، ئەوەی دەیەوێ نەبوون بە بوون بگەیەنێتەوە پێویستە بەڵگەی هەبێ.

زنجانی دەڵێ: ئەم مەسەلە خیلافییە لەوەوە سەرچاوەی گرتوە کە ئیستیصحابی دۆخ لەو کۆدەنگیەی پێشتر پاش روودانی ناکۆکیەکە دروست دەبێ لای شافیعی حوججەیە و دەڵێ کۆدەنگیەکە ناکۆکیەکە یەکلا دەکاتەوە.

---

[1] هو أحد سيور النعل التي تكون على وجهها.

[2] سنن ابي داود ٩٣/١ مطبعة حلبي. سنن النسائي ١٩٧/١.

[3] بڕوانە: مختصر المقنع ص ٩.

ئەبوحەنیفە دەڵێ حوججەی تێدا نیە، بەڵگەیشی ئەوەیە شوێنی ناکۆکی لە شوێنی تەبایی جیاوازە، لەبەرئەوەی مەحاڵە لەو جێیە جیاواز بن کە تێیدا رێککەوتون، بۆیە ئیجماع حوججە نیە لەو شوێنەی ئیجماعی تێدا نیە[1].

پێم وایە رای زاڵ ئەوەیە بوترێ نوێژەکە تەواو دەکرێ لەرووی کارکردن بە بەردەوامی لە عیبادەتدا، پاش ئەوە وەك ئیحتیات دووبارە بکرێتەوە، بەوەیش بەڵگەکان و یەکلاکردنەوەی خیلافەکەیش کۆدەبنەوە.

٣- ئەوەی ژنەکەی تەڵاق بدات و منداڵێکی لێی هەبێ، پاش تەواوبوونی عیدەکەی شووی بە یەکێکیتر کرد و سکی لێی بوو، پاشان -بەر لە منداڵبوون- شیری دایە منداڵێك:

ئەبوحەنیفە و شافیعی دەڵێن شیردانەکە لە مێردی یەکەمەوەیە لەبەرئەوەی شیرەکە بەیەقین لەوەوە بووە، حوکمی پچڕانی ئەو یەقینەیش بە یەقینێکی وەك خۆی نەبێ نادرێ، لێرەیشدا یەقین نیە تا پاش منداڵبوونی لە مێردی دووەم.

ئەبویوسف لەگەڵیان کۆکە ئەگەر شیرەکە بە سکپڕییەکە زیاد نەکا، دەڵێ ئەگەر زیاد بوو ئەوە لە دووەمەوەیە و فەرمان دەکرێ لە یەکەم بپچڕێنرێ.

بەلای محەمەوە شیرەکە لە هەردووکیانە.[2]

ئەم ناکۆکییە راجیایی لێدەکەوێتەوە لەبارەی درێژبوونەوەی حەرامکردن بە شیردان بۆ بنەچە و وەچەکان (ئوسوڵ و فروع)ی مێردی یەکەم یان دووەم، هەروەها لەگەڵ بنەچە و وەچەکانی شیرەخۆرەکە.

هۆی ناکۆکیەکەیش وەك لە بەڵگەسازیەکەیانەوە دیارە، ناکۆکییە لە بەبەڵگەکردنی ئیستیصحاب و بواری کارپێکردنی.

---

[1] تخريج الفروع على الأصول للزنجاني ص ٢١.

[2] تأسيس النظر ص ١٠

٤– ئەگەر بەخێوکەر (وەلی) بەپیاوێکی وت بە بەخێوکراو (ە مێینە)کەم لێ مارەکردیت بە هەزار یان دوو هەزار دینار و ئەویش وتی قبولم کرد، مارەیی هاوشانی ئەو ئافرەتە هەزار و پێنجسەد دینار بوو:

ئەبوحەنفیە دەڵێ مارەیی هاوشانی دەکەوێ واتە (١٥٠٠) دینار.

هەردوو هاوەڵەکە و شافیعی دەڵێن: مێردەکە سەرپشکە کام لەو دوو چەردە پارەیەی بداتێ.[١]

هۆی ناکۆکیەکەیان جیاوازییە لە بەبەڵگەکردنی ئیستیصحابدا: ئەبوحەنیفە کاری پێکردوە و ئەوانیتر نەیانکردوە و دەڵێ: عەقدەکە مارەیی هاوشان (مهر المثل) واجب دەکا لە رێگەی ئاگەداربوون و یەقینەوە و ئەوە بەبێ یەقینێکی هاوشێوە کەم ناکرێتەوە، لێرەیشدا یەقین نیە لەبەرئەوەی وشەی: یان (أو) بۆ گومان یان سەرپشککردنی ئەو کەسەیە مافی هەڵبژاردنی هەیە، ئەویش نەزانراوە.[٢]

٥– ئەوەی بە ژنەکەی بڵێ تەلاقت کەوتبێ (واتە تەلاقدراویت)ئەگەر تەلاقم نەدایت، یان ئەگەر تەلاقم نەدایت تۆ تەلاقت کەوتبێ و نیەتی نەبێ:

شەرعزان لەبارەی کەوتنی ئەم تەلاقەوە رایان جیاوازە.

ئەبوحەنیفە دەڵێ تەلاقەکە لە دواین بەش لە بەشەکانی ژیاندا دەکەوێ بەبێ پچران.

هەردوو هاوەڵەکە و شافیعی دەڵێن: تەلاقەکە دەستبەجێ دەکەوێ.

هۆی ناکۆکیەکەیان جیاوازییانە لە کارکردن بە ئیستیصحاب: ئەبوحەنیفە کاری پێکردوە و ئەوانیتر نەیانکردوە و دەڵێ: وشەی ئەگەر (اذا) ئەگەری ئەوەی هەیە بۆ مەرج بێ، هەروەك دەشێ بۆ کات بێ، ئێمە لە مانەوەی پەیوەندیی هاوسەری دڵنیاین

---

[١] سەرچاوەی پێشوو ص ١٠

[٢] سەرچاوەی پێشوو.

و له ئێستادا گومـان لـه نـەمانی دروست بـووه، بۆیـه حـوكم بـەم نەمانـه نـادرێ بـه یەقینێکی هاوشێوەی یەقینی مانەکە نەبێ.[1]

شافیعی و دوو هاوەڵەکە دەڵێن: اذا -بەیەقینی- بۆ کاتە، بۆیە بوار بـۆ کـارکردن بە ئیستیصحاب نیە.

٦- ئەگەر ژن بە مێردەکەی وت تەڵاقم بدە هەزار دینارت دەدەمێ، ئـەویش وتـی وا تەڵاقم دایت، ژنەکەیش بێدەنگ بوو و نەیوت ئەوە ئـەو هـەزارم لەسـەره کـه باسـم کرد:

ئەبوحەنیفـه دەڵـێ تەڵاقەکـه بـەبێ بـاتی (عـوض) دەکـەوێ و ژنەکـه هــەزار دینارەکەی ناکەوێتە سەر.

شافیعی و دوو هاوەڵەکە دەڵێن: پیاوەکـه شایسـتەی بـڕە پارەکەیـه و پێویسـته ژنەکە بیداتێ.[2]

هۆی خیلافەکەیشیان جیاوازییانە لە کارکردن بە ئیستیصحاب: ئەبوحەنیفە دەڵێ ئەوە یەقینە کە هەزار دینارەکـه مـوڵکی ژنەکەیـه و نـەمانی بـه مـوڵکی ئـەو گومـانی تێدایە و بەبێ یەقین حوکمی تێدا نادرێ، یەقینیش نیە.

شـەفیعبوون (الشـفعة) (واتـه: هەقـداری): ئەگـەر پیاوێـك خانوویـەکی هـەبوو و لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر لەدەستیدا بووه ئـەوه زانـراوه کـه مـوڵکی ئـەوه، پاشـان خانوویەك لە تەنیشتی فرۆشرا، یان پیاوێك لەگـەڵ یـەکێکیتر لـه عەقارێکدا شـەریك بوون، پاشان شەریك (هاوبەش)ـەکەی بەشەکەی خۆی فرۆشت، جـا خـاوەن ماڵەکـه یان شەریك-ەکە داوای شەفیعبوونی لەو فرۆشتنەدا کرد و کڕیارەکەیش نکوڵی لـەوه کرد ئـەو خـانووه هـی داواکارەکـه بـێ، یـان لـەو خـانووەی بەشـێکی لـێ فرۆشـراوه هاوبەش بێ:

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] تأسيس النظر ص١١

ئەبوحەنیفە و محەمەد وتویانە حوکمی شەفیعبوونی بۆ نادرێ تا بەڵگە لەسەر کڕیار ساغ دەبێتەوە کەخاوەن موڵك یان شەریکە، چونکە ئەو هۆ جێگیرەی بەحوکمی ئیستیصحابی حاڵ شەفیعەکە ئیددیعای دەکا بەتەنها بەس نیە وەك بەڵگەیەك بۆ سەلماندن و پابەندکردن، جا بۆ ئیلزامکردنی کڕیار پێویستە بەبەڵگە بسەلمێنرێ.

زوفر لە هەردوو مەسەلەکەدا رای وایە قسە قسەی شەفیعەکەیە و داوای لێناکرێ بەڵگە بێنێتەوە، ئەوەیش رای شافیعییە لە مەسەلەی دووەمدا. بەڵگەی زوفر ئەوەیە موڵکەکە بۆ شەفیعەکە جێگیرە و بە جێگیری و موستەصحیبی دەمێنێتەوە تا شتێك دەسەلمێ نەمانی واجب بکا، ئەمەیش لەو روانگەوە کە ئیستیصحابی حوکم وەك چۆن بۆ رەتکردنەوە دەست دەدا، بۆ ئیسپاتیش دەست دەدا.[1]

٧- دانپێدانان: ئەگەر کەسێك دانی بەوەدا نا لە دینارێك بۆ دە دیناری کەسێکیتری لەسەرە:

بەلای ئەبوحەنیفەوە تەنها نۆی لەسەرە، لەبەرئەوەی دەیەمیان بەیەقینی موڵکی دانپێدانەرەکەیە و نەمانی گومانی تێدایە، لەبەرئەوەی پاش بۆ (الی) ئەگەری هەیە بچێتە ناو حوکمی پێش خۆی و ئەگەریش هەیە نەچێتە ناوی.

بەلای هەردوو هاوەڵەکە و شافیعیەوە (دە)ی لەسەرە، لەبەرئەوەی هەموو ئەوە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە نێوان ( لە و بۆ).[2]

بەلای زوفرەوە هەشتی لەسەرە، لەبەرئەوەی هەردوو کۆتاییەکە ناچنە ناو قسەکە.

ئەم ناکۆکیەیش دیسان بۆ جیاوازییان لە بەبەڵگەکردنی ئیستیصحاب دەگەڕێتەوە.

---

[1] البداية ٣/١٤.

[2] تأسيس النظر، سەرچاوەی پێشوو.

# بەشی حەوتەم:
# بەبەڵگەکردنی سەدی زەرایع و کاریگەری لە جیاوازیی شەرعزاندا

دوو باس لە خۆ دەگرێ:

یەکەم لە بەشەکانی سەدی زەرایع و بۆچوونەکان لەبارەی بەبەڵگەکردنی.

دووەم لە پیادەکردنە فیقهییە جێناکۆکەکان کە لە ناکۆکی لەوەدا دەکەونەوە.

## باسی یەکەم:
## سەدی زەرایع و بەبەڵگەکردنی

پێشتر پێناسەی (الذرائع) روون کردەوە بەوەی: لای شاتبی گەیشتنە بە خراپە لەرێی ئەوەوە کە بەرژەوەندییە[١]، یان لای ئیبنول قەیم ئامراز یان رێگەیەکە بۆ شتێك[٢]. جیاوازیی نێوان دوو پێناسەکەیش ئەوەیە یەکەمیان زەرایع تەنها وەك داخستن (سەد)ێك باس دەکا، بەڵام دووەمیان بە داخستن و کردنەوە، ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە یەکەمیانە.

پێناسەی من ئەوەیە: ئامرازێکی رێپێدراوە، کە رێی گەیشتنە بە قەدەغەکراوێك کە خراپە (مەفسەدە)ی تێدایە.

---

[١] الموافقات ١٩/٤

[٢] إعلام الموقعين ١٤٧/٣

## بەشەکانی زەریعە:

دوو دابەشکردن دەخەینە روو، یەکێکیان دابەشکردنی سیانینەی شەرعزانی مالیکی قەرافی و دووەمیان دابەشکردنی چوارینەی شەرعزانی حەنبەلی ئیبنول قەیمە، پاشان بەراوردیان دەکەین و دابەشکردنە جێپەسەندەکەیان هەڵدەبژێرین.

دابەشکردنی قەرافی:

قەرافی دەڵێ: ئوممەت کۆدەنگە لەسەر ئەوەی سێ بەشە:

یەکێکیان بەئیجماع موعتەبەرە، وەك لێدانی بیر لە رێگەی موسڵمانان و ژەهرکردنە خواردنیان.

دووەمیان: بەئیجماع هەڵوەشاوەیە وەك چاندنی ترێ، کە رێگە لە ترسی ئارەق ناگرێ، هەروەها بەهاوبەشی ژیان لە ماڵێکدا کە رێگە لە ترسی زینا ناگرێ.

سێیەم: رای جیاوازی لەسەرە وەك فرۆشتنە ماوەدارەکان (بیوع الاجال)، کە ئێمە بە زەریعەمان داناون..

دابەشکردنی ئیبنول قەیم:

ئیبنول قەیم زەرایعی لەڕووی ئەنجامەکانیانەوە بۆ چوار بەش دابەش کردوە:

١- ئامرازێکە بۆ ئەوە دانراوە تا سەربکێشێ بۆ خراپەیەك وەك خواردنەوەی مەستکەرێك کە سەردەکێشێ بۆ خراپەی سەرخۆشی لە فەوتانی ئەقڵ، قەزف کە سەردەکێشێ بۆ خراپەی بوختانکردن، زینا کە سەردەکێشێ بۆ تێکەڵبوونی نەسەب و تێکدانی شوێنی خەوتن.

٢- ئامرازێکە بۆ موباح دانراوە مەبەست پێی گەیشتنە بە خراپەیەك، وەك ئەو کەسەی هاوسەرگیری دەکا و مەبەستی مارەبەجاشە، یان کڕین و فرۆشتن دەکات و مەبەستی سووە..

٣- ئامرازێکە بۆ موباح دانراوە مەبەست نەبووە بگاتە خراپەیەك، بەڵام بەزۆری سەر بۆ ئەوە دەکێشێ و خراپەکەی لە بەرژەوەندیەکەی زاڵترە، وەك خۆڕازاندنەوەی ژنی مێرد مردوو.[1]

٤- ئامرازێکە سەردەکێشێ بۆ خراپە و بەرژەوەندیەکەی لە خراپەکەی زاڵترە، وەك تەماشاکردنی خوازبێنیکراو یان شایەتی لەسەردراو بۆ ناسین.[2]

ئیبنول قەیم پێی وایە بەشی یەکەم و چوارەم جێی ناکۆکی نین، لەبەرئەوەی شەرعدانەر یەکەمی قەدەغە و چوارەمی موباح کردوە.

بەراورد لەنێوان دوو دابەشکردنەکەدا:

***رووەکانی لێکچوونیان:**

١- هەردوو دابەشکردنەکە لە دیاریکردنی بابەتی ناکۆکیی زانایان لە (سەدی زەرایع)دا کۆکن.

٢- هەروەها کۆکن لەوەی خولکەی دابەشکردنەکە سەرکێشانە بۆ خراپە، بەڵام ئەم خراپەیە لەوانەیە لە بەرژەوەندیەکی زاڵ یان بنزاڵەوە بێ، ئیبنول قەیم ئەو وردکردنەوەیەی لەبەرچاو گرتوە، هەربۆیە دابەشکردنەکەی چوارینە بوو لەکاتێکدا قەرافی نەچووە ناو ئەو وردەکارییە، لەبەرئەوەی مالێ یەکە، جا بەشێك بەڕای هەموولا قەدەغە و بەشێك بەڕای هەموولا جائیزە، باقیەکەی جێناکۆکە، جا چ بە یەك بەشی دابنێین یان زیاتر، بگرە ئەگەر وردەکردنەوەکە وەربگرین دابەشکردنە پێنجینە دەبێ، لەبەرئەوەی خراپەکە دەکرێ لەگەڵ بەرژەوەندیەکە یەکسان بن.

---

[1] واتە ماوەی عیددە.

[2] اعلام الموقعین ٣/١٣٦

*** ڕووەکانی ناکۆکی:**

١- دابەشکردنەکە ئیبنول قەیم لە ڕوونکردنەوەی مەبەستدا ڕوونترە، چونکە باسی ئامراز و ئامانجی تێدا کردوە، بەپێچەوانەی قەڕافی کە تەنها باسی نموونەکان و ڕوونکردنەوەی ئەوانەی کردو کە جێکۆك و جێناکۆکن.

٢- لە دابەشکردنەکەی قەڕافیدا ئامراز لە بەشەکانی زەریعەدا خۆی لەخۆیدا موباحە، بەپێچەوانەی دابەشکردنەکەی ئیبنول قەیم کە ئامراز لە بەشی یەکەمیدا خۆی لەخۆیدا حەرامە.

٣- لە دابەشکردنەکەی ئیبنول قەیمدا ئامراز و ئامانج (مەقاصید)ی تێکەڵ کرد بەپێچەوانەی دابەشکردنەکەی قەڕافی. تێکەڵکردنەکە لەو ڕووەوەیە ئیبنول قەیم خواردنەوەی ئارەق و قەزف و زینای لەئامرازەکان داناوە، لەکاتێکدا ئەوانە لە (مقاصد)ن، لەبەرئەوەی لە خۆیاندا خراپەن، ئەوانە حەرامکراون با ئەنجامەکانیشیان لێ نەکەوێتەوە. بۆ نموونە زینا حەرامە با نەشبێتە مایەی تێکەڵکردنی نەسەب، خواردنەوەی ئارەق حەرامە با نەشبێتە مایەی سەرخۆشی بۆ هەندێ کەس.

لەم ڕوانگەوە دەبینین هەردوو دابەشکردنەکە عەیبدارن هەریەك لە ڕوویەکەوە: دابەشکردنەکەی قەڕافی لەبەر کۆبێژی (ئیجمال)ەکەی ناتەواوە و دابەشکردنەکەی ئیبنول قەیم لە دوو ڕووەوە عەیبدارە:

یەکەم: لە سەدی زەرایعدا ئەسڵ وایە ئامراز خۆی لەخۆیدا موباحە، بەڵام بەهۆیانەوە دەگەنە خراپە، ئیبنول قەیم ئەم ئیعتیبارەی پشتگوێ خستوە.

دووەم: تێکەڵکردنی ئامراز و ئامانج وەك وتمان.

لەم ڕوانگەوە ئەو دابەشکردنە جێپەسەندەی هەڵیدەبژێرین ئەوەیە شاتبی بۆی چووە، کە زەرایع بەگوێرەی ئاکامەکانیان بۆ ئەم چوار بەشەی خوارەوە، دابەش دەکرێن:

١- ئـەوەی سەرکێشـانی بـۆ خراپــە حـەتمی بـێ، وەك هەڵكەنـدنی بـیر لەپشـت دەرگای ماڵ لە تاریکیدا، بەشێوەیەك ئەوەی بێتە ژوورەوە بەحـەتمی تێـی بکـەوێ و شتی لەو شێوەیە.

٢- ئەوەی سەرکێشانی بۆ خراپە دەگمەن بێ وەك هەڵكەندنی بـیر لـە شـوێنێکدا کە بەزۆری نابێتە هۆی تێکەوتن، هەروەها فرۆشتنی خۆراك کە بەزۆری زیان بەکـەس ناگەیەنێ.

٣- سەرکێشانی بۆ خراپە بەڕێژەیەکی زۆر بێ، بەشێوەیەك گومانی زاڵ ئەوە بـێ کە سەردەکێشێ، وەك فرۆشتنی چەك لەکاتی شـەڕ و ئاشـوبدا، هـەروەها فرۆشـتنی ترێ بە مەیساز و ئەو جۆرە شتانە، کـە گومـانی زاڵ -نـەك بنـبڕ- ئەوەیـە سـەر بـۆ خراپە دەکێشێ.

٤- سەرکێشانی بۆ خراپە بەرێژەیەکی زۆر بێ، بەڵام زۆریەکەی نەگەیشتۆتە ئـەو ئاستەی ئەقڵ هەمیشە گومانی بوونی خراپەی تێدا بکا، وەك فرۆشتنە ریبەویەکان.

ئەم دابەشکردنە لەو کەموکورتی و عەیبانە خاڵییە کـە لـە دوانەکـەیتردا هـەبوون، لەبەرئەوە هەڵیدەبژێرین و بەشی یەکەم و دووەم دوور دەخەینەوە، لەبەرئەوەی جێی ناکۆکی نین.

هەرچی دووبەشی کۆتایین، شوێنی پیادەکردنی سەدی زەرایعن، بـەڵام پێـوەری باو لە بەشـی یەکەمیانـدا زاتییـە و پشـت بـە مەبەسـتی بکـەر دەبەسـتێ، لـە بەشـی کۆتاییشدا بابەتییە و گوێ بە مەبەستەکەی نادا.

### رای زانایان لەبارەی بەبەڵگەکردنی سەدی زەرایع:

لە دابەشکردنەکانی رابردوو ئەوەمان بۆ روون بوویـەوە نـاکۆکی لـەم دوو جـۆرەدا نیە: ئەوەیان بەحەتمی سـەر بـۆ خراپـە دەکێشـێ، لەگـەڵ ئـەوەیان کـە بەدەگمـەن سەردەکێشێ بۆ خراپە، یەکەمیان بە رای هەموولا دادەخـرێ و دووەمیـان بـەئیجماع رەها دەکرێ.

ناکۆکی لەسەر غەیری ئەو دوو شێوەدا هەیە، بۆچوونەکان لەوەدا جیاوازن — لەبەر تیشکی ئەوەی لەسەری وەستاوم — و بوون بە سێ ڕێچکەوە:

یەکەم — حوجحە نیە، ئەوەیش مەزەبی جمهورە لەوانە حەنەفیەت و شافیعیەت و ئەوانەی هاوڕاین. ئەلباجی دەڵێ: مالیك لەگەڵ ڕێگریکردنە لە پەنابردن بۆ زەرایع، ئەبوحەنیفە و شافیعی دەڵێن ڕێلێگرتنی جائیز نیە.[1]

دووەم — ڕێبازی ئیبنول قەیم و قەڕافی، قسەکەی قەڕافی و ئیبنول قەیم ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە سەدی زەرایع لای ئەوان لە جۆری پێشەکییە، واتە حوکمی مەسەلەکان حوکمی ئەوەیە سەردەکێشێ بۆی لە واجببوون یان هیتر، قەڕافی دەڵێ: سەرچاوەی حوکمەکان دوو بەشە: ئامانجەکان (المقاصد) کە لەخۆیاندا هەڵگری سوود و زیانەکانن + ئامرازەکان (الوسائل) کە ئەو ڕێگایانەن ئەو ئامانجانەیان پێ بەدیدێ، حوکمیشیان حوکمی ئەوەیە لێی بەدیدێ لە حەرامکردن یان حەڵاڵکردن، بەڵام لە حوکمدا ئاستیان لە خوار ئامانجەکانەوەیە، ئامراز بۆ باشترین ئامانج باشترین ئامراز و بۆ دزێوترین ئامانج دزێوترین ئامراز، بۆ مامناوەندیش مامناوەندە".[2]

ئیبنول قیم دەڵێ: "لەو ڕووەوە ئامانجەکان بەبێ کۆمەڵێ هۆ و ڕێگە بەدینایەن، ڕێگە و هۆکانیشیان سەر بەوان حسێبن و بەوانەوە موعتەبەرن، ئامرازەکانی حەرام و سەرپێچیەکان لە کەراهەت و ڕێگری لێکردنیاندایە بەگوێرەی سەرکێشانیان بۆ ئامانجەکانیان"[3]. کەواتە ئامرازی مەبەست (مەقصود) سەر بە (مەقصود)ە و هەردووکیشیان مەقسودن، بەڵام ئەمیان مەقسودی قەسدی ئامانجەکانە و ئەویان مەقسودی قەسدی ئامرازەکانە، جا ئەگەر خوای گەورە شتێکی حەرام کرد و کۆمەڵێ ئامراز و ڕێگە هەبوون مرۆڤیان بەرەو ئەو شتە دەبرد، ئەوانیش حەرام و قەدەغە

---

[1] إرشاد الفحول ص ٢٤٦

[2] الفروق للقرافي ٢/٢٣.

[3] إعلام الموقعين ١٣٥/٣ و پاشتر.

دەكا بەمەبەستی چەسپاندنی حەرامكردنی بۆ شتەكە و جێگیركردنی و رێگرتن لەوەی سنووری بشكێنرێ، خۆ ئەگەر ئامراز و بیانووە بەدیهێنەكانی موباح بكردایە، ئەوە دەبوو هەڵوەشاندنەوەی حەرامكردنەكە و هەڵنانی دەروون بۆ كردنیان، دانایی و زانایی ئەویش ئەوانە هەڵناگرێ. زاهیر ئەمە رێبازی شیعەی ئیمامیشە.[1]

سێیەم: حوججەیە و بنەمایەكە لە بنەماكانی یاسادانانی ئیسلامی و لقەكانی لەسەر بینا دەكرێ و رێگەیەكە لە رێگەكانی هەڵێنجانی ئەحكام، ئەوەیش رای ئیمام مالیك و ئەو هاوەڵانەیەتی كە هاورای بوون، پاش ئەوان لە دەست پێوەرگرتنیدا ئیمام ئەحمەد و ئەو هاوەڵانەی دێن كە هاورای بوون.

قەرافی دەڵێ: "رەنگە هەندێ جار بۆ ئامراز وشەی (ذرائع) بەكار بێ، ئەوەیش زاراوەی هاوەڵانمانە، ئەم لەفزە لە مەزەبەكەماندا بەناوبانگە، لەبەرئەوە دەڵێن: سد الذرائع ، بەواتای یەكلاكردنەوەی مادەی ئامرازەكانی فەساد بۆ نەهێشتنیان، هەركات كردەوەی دوور لە مەفسەدە بوو بە ئامرازێك بۆ مەفسەدە، مالیك ئەو كردەوەیە لە زۆر شێوەدا قەدەغە دەكا، سەدی زەرایع لە تایبەتمەندیەكانی مەزەبی مالیك نیە وەك زۆر كەس وا خەیاڵ دەكەن... هتد".[2]

لە (مختصر التحرير)[3] لە بنەماكانی فیقهی حەنبەلیدا هاتووە: مانای (سد الذرائع) رێگرتنە لە كردنیان لەبەر حەرامبوونی، شافیعی رێگەی پێداوە، سەرجەم فێڵ و تەڵەكەكان حەرامن و لە ئاییندا جێیان نابێتەوە، ئەویش ئەوەیە وەك فێڵ و چاوبەست عەقدێكی موباح پیشان بدات و مەبەستی یەكێكی حەرام بێ بەمەبەستی كردنی كارێك كە خوا حەرامی كردوە و بەزاندنی قەدەغەكانی، یان پەكخستنی واجبێك یاخود رەتكردنەوەی مافێك و ئەو جۆرە شتانە.

---

[1] بڕوانە: أصول العامة محمد تقي الحكيم ص ٤١٠.
[2] الفروق للقرافي ٣٢/٢
[3] ص ٣٨٨

شەوكانی لە روانگەی حەدیسی ((ومن وقع في الشبهات وقع في الحرام))ەوە.[1]
بۆچوونی زیاتر بەلای هەردوو مەزەبی مالیك و ئەحمەددا شكاوەتەوە.

بەبڕوای من رای زاڵ ئەوەیە: كاركردن بە سەدی زەرایع لە بازنەی كاركردن بە بەرژەوەندی دەرناچێ، لەبەرئەوەی بەرژەوەندی لە دوو رەگەز پێكدێ: رەگەزێكی ئەرێنی كە هێنانی سوودە، لەگەڵ رەگەزێنی نەرێنی كە دوورخستنەوەی زیان یاخود خراپەیەكە، سەدی زەرایع دەچێتە خانەی بەشی دووەمیان بۆیە بەلای مالیك و ئەوانەی هاوڕاین هیچ پاساو نیە بۆ ئەوەی بە سەرچاوەیەكی سەربەخۆ لە سەرچاوەكانی تەشریعی ئیسلامی دابنرێ، ئەمە لەلایەك، لەلایەكیترەوە لەبەرچاونەگرتنی مەبەست (واتە قەسد) لە رەفتارەكانی خەڵكدا -كە ئەوە رای شافیعی و ئەوانەیە هاوڕاین- دەرگای فرت و فێڵ لەبەردەم هەندێ خەڵكدا دەكاتەوە، تا لەرێیانەوە بگەنە ئەنجامگەلێك خوا حەرامی كردوون و لە ریزی ئامانجە خراپەكانی داناون.

---

[1] نوعمانی كوڕی بەشیر دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ئەیفەرموو ((إِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ لا يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ، فَمَنْ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلا وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ، أَلا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلا وَهِيَ الْقَلْبُ))، صحيح مسلم ٣/١٢٢٠

## باسی دووەم:

# نموونە لە پیادەکردنە فیقهییە خیلافییەکان کە لە ناکۆکی لەبارەی بەبەڵگەکردنی سەدی زەرایع کەوتونەتەوە

١- شەرعزان لەبارەی دروستیی هاوسەرگیریکردن بەمەبەستی حەڵاڵکردن (ی ژنی سێبەسێ تەڵاقدراو بۆ مێردەکەی)[1] بوون بە سێ رای جیاوازەوە:

یەکەم: بەڕەهایی دروستە جا چ لە کرۆکی عەقدەکەدا باسی مەرجەکە کرابێ و مەبەست حەڵاڵکردن (التحلیل) بێ یان نا، ئەوەیش رای جمهوری حەنەفیەتە و دەڵێن: ئەگەر مەرجی حەڵاڵکردنی لەسەر (ئافرەتەکە) دانا با لە کرۆکی عەقدەکەیشدا بێ، عەقدەکە راست و دروستە و حەڵاڵی دەکا بۆ مێردی یەکەمی، لەو رووەوە عەقدەکە دروستە و مەرجەکە لەغو (بەتاڵ)ە.[2]

دووەم: بەڕەهایی بەتاڵە، ئەوەش رای مالیکی و حەنبەلیەکان و ئەوانەیە هاورایانن.

لە (الشرح الصغیر)دا هاتووە: (تەڵاقدراوی لێکترازاو (المبتوتة)[3] بە نیکاحێکی فاسیدی وەك حەڵاڵکەر بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ نابێتەوە، ئەویش ئەوەیە ژنەکە بەمەبەستی حەڵاڵکردنی بۆ کەسێکیتر مارە دەکا ئەگەر ئەم ویستی پاش جووتبوون لێی جیا ببێتەوە، یان نیەتی نەبێ، بگرە ئەگەر بشیەوێ رایبگرێ ئەگەر بەدڵی بوو،

---

[1] لە کوردەواریدا پێی دەوترێ: مارەبەجاش- وەرگێڕ.

[2] فتح القدیر ٣/٢٤٨

[3] واتە بەتەڵاقی بائین تەڵاق درابێت.

ئەوە حەلاڵی ناکا و نیکاحێکی هەمیشە فاسیدە... و هەڵدەوەشێنرێتەوە).[1]

مالیکیش لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەیە نەك لەسەر بناغەی دروستیی عەقدەکە، بەڵکو لەسەر ئەو بناغەیەی ئەوە لە مەسەلە خیلافیەکانە لەنێوان شەرعزاندا و بۆ رەچاوکردنی ئەوە وتویانە هەڵدەوەشێنرێتەوە، ئەگینا لای مالیکیەت فەساد و بەتاڵ هاومانان.

لە (نيل المأرب)دا هاتووە: (ئەگەر سێبەسێ تەڵاقدراو مێردی کرد بەو مەرجەی پیاوەکە هەر کە حەلاڵی کرد تەڵاقی بدات، یان ئەگەر حەلاڵی کرد ئیتر نیکاح لەبەینیاندا نامێنێ، ئەوا ئەو عەقدە بەلای ئەهلی عیلمەوە بەگشتی بەتاڵە، هەروەها ئەگەر مێردەکە لەدڵی خۆیدا نیازی حەلاڵکردنی هەبوو و لە عەقدەکەدا باس نەکرا، ئەوا بەپێی راسترین را دیسان بەتاڵە).[2]

سێیەم: وردکردنەوە: شافیعیەت و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن (مقاصد) کاریگەری نیە بەڵکو تەنها مەرج کاریگەری هەیە. ئەگەر لە کرۆکی عەقدەکەدا باس کرا عەقدەکە فاسیدە، بەڵام بەر لە عەقدەکە باس کرا زیانی نیە، ئەبوئیسحاقی شیرازی دەڵێ: "لەبەرئەوەی عەقدەکە بەوەی کراوەتە مەرج بەتاڵ دەبێتەوە نەك بەوەی مەبەست بووە".[3]

هۆی ناکوکیەکەیش جیاوازییانە لە کردنی سەدی زەرایع بەبەڵگە و لەبەرچاوگرتن یان نەگرتنی قصد لە عەقدەکەدا.

رای زاڵ ئەوەیە مالیکی و حەنبەلی لە مەسەلەی حەلاڵکردندا بۆی چوون، لەبەرئەوەی حیکمەتی خوا لە حەرامکردنی مارەکردنەوەی سێبەسێ تەڵاقدراو -تا مێردێکیتر دەکاتەوە- لە حەلاڵکردندا بەدینایەت، کە ئەوە لای ئەو کەسەی دەرك

---

[1] الشرح الصغير مع بلغة السالك في فقه الإمام مالك ٣٧٥/١

[2] نيل المأرب في الفقة الحنبلي ٦٦/٢-٦٧

[3] المهذب في الفقه الشافعي ٤٦/٢-٤٧

بەو حیکمەتە ئیلاهییە دەکا شاراوە نیە، پاشان ئەوە هاوسەرگیریەکی کاتییە، هەموولایش کۆکن لەسەر بەتاڵیی هاوسەرگیریی کاتی، وەك موتعە.

٢- لەبارەی فرۆشتنی ترێ بەوانەی مەی (ئارەق) دروست دەکەن و خورما بەوانەی سرکە دروست دەکەن و فرۆشتنی چەك لەکاتی ئاشوبدا و .. ئەو جۆرە شتانەدا، رایان جیاوازە.

شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن دەڵێن ئەسڵی کردەوەکە مەکروهە بەڵام عەقدەکە دروستە. ئەبوئیسحاقی شیرازی دەڵێ: (فرۆشتنی ترێ بەوانەی مەی دروست دەکەن و خورما بەوانەی سرکە دروست دەکەن، هەروەها فرۆشتنی چەك بەوەی سەرپێچیی خوای گەورەی پێدەکا، مەکروهە، لەبەرئەوەی گەرەنتی نیە ئەوە نەبێتە یارمەتیدەر بۆ گوناهکردن).[1]

مالیکیەکان دوو قسەیان هەیە: یەکەمیان وەك رای شافیعییە، دووەمیان عەقدەکە فەسخ دەکا (هەڵدەوەشێنێتەوە)، ئەلصاوی لەسەر (الشرح الصغیر) دەڵێ: (وەك فرۆشتنی مەسحەف بەکافرێك، کە ئاشکرایە کڕیار مەرامێکی ناجائیزی لەوەدا هەیە، بەڵام فەسخنەکردن بەناوبانگە وەك مازری وتوێتی و ئەوەیش مەزهەبی مودەوینەیە، لەبەرانبەردا رایەك هەیە دەڵێ فەسخ دەکرێ ئەگەر فرۆشراوەکە هەبوو، سەحنون داویەتییە پاڵ زۆربەی هاوەڵانی مالیك).[2]

بەلای حەنبەلیەکانەوە وەك لە (دلیل الطالب) و شەرحەکەی (نیل المأرب)دا هاتووە: (دروست نیە ترێ یان خۆشاو بفرۆشرێ بەو کەسەی وەك ئارەق بەکاری دێنێ، یان خواردن و خواردنەوە و بۆنکراو و جامێك بفرۆشرێتە کەسێك کە مەستکەرێکی لەسەر یان پێ دەخواتەوە، هەروەها دروست نیە هێلکە و گوێز و شتی

---

[1] المهذب ١/٢٦٧

[2] بلغة السالك ٢/٥. بەڵام ئیبن روشد دەڵێ: خیلافەکە بەندە بەوەی ئاخۆ فرۆشیار زانیویەتی کڕیارەکە کافرە یان نا، بەڵام ئەگەر وایزانی موسڵمانە ئەوا هیچ ناکۆکی نیە لەوەدا کە هەڵناوەشێنرێتەوە.

لەو جۆرە بۆ قومار بفرۆشرێ، هەروەك دروست نیە چەك و شتی لەو جۆرە وەك سوپەر و قەڵغان لەکاتی شەڕ و ئاشوبدا، یان بە خەڵکانی شەڕکەر یان چەتە و ڕێگران بفرۆشرێ، ئەگەر فرۆشیار ئەوەی لە کڕیارەکەیدا دەزانی".[1]

٣- لەبارەی ئەو فرۆشتنەی چاوبەستی تێدایە و دەبێتە هۆی سوو رایان جیاوازە، وەك ئەوەی پیاوێك کاڵاکەی بە نرخێکی بەرز بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بفرۆشێ، پاشان دەستبەجێ بەکاش لە کڕیاری بکڕێتەوە بە کەمتر لەو نرخەی یەکەم جار پێی فرۆشت:

شافیعی و ئەوانەی هاوڕاین بە دروستیان داناوە. بەڵام مالیك و ئەوانەی هاوڕاین بەبەتاڵیان داناوە، هۆی ناکۆکیەکەیش جیاوازییە لە بەبەڵگەکردنی سەدی زەرایعدا. پێشتر لە بابەتی بەبەڵگەکردنی قسەی صەحابیدا باسی ئەمەم کرد.

قەڕافی دەڵێ: "بەشێك -لە سەدی زەرایع- زانایان رایان تێیدا جیاوازە کە ئاخۆ دادەخرێ یان نا؟ وەك فرۆشتنی ماوە (الآجال) لای خۆمان، وەك ئەو کەسەی کاڵایەك بە دە درهەم بفرۆشێ بۆ ماوەی مانگێك، پاشان بەر لە مانگەکە بە پێنج درهەم بیکڕێتەوە، مالیك دەڵێ ئێستا پێنجی لە دەستی دەرهێنا و لە کۆتایی مانگدا دەی برد، ئەمە ڕێگەیەکە بۆ گۆڕینەوەی پێنج بە دە بەئومێدی ئەوەی شێوەی فرۆشتنەکە ئەوە دەربخا. شافیعی دەڵێ تەماشای شێوەی فرۆشتنەکە دەکرێ و شتەکە بە رواڵەتەکەی وەردەگیرێ، ئەوە دروستە".[2]

**٤- لە قەزا و داکۆکیکارییە یاساییەکان (المرافعات)دا:**

قەڕافی دەڵێ: هەروەها -بەهۆی جیاوازی لەبارەی سەدی زەرایع- رایان جیاوازە لەبارەی "حوکمدان لەسەر زانست ئاخۆ حەرام دەکرێ لەبەرئەوەی ئامرازێکە بۆ بڕیاردان بەبەتاڵ لەلایەن قازییانی خراپەوە، یان حەرام ناکرێ"؟

---

[1] نیل المأرب شرح دلیل الطالب ١٢٢/١

[2] الفروق للقرافي ٣٢/٢ و پاشتر.

# بەشی هەشتەم:
# عورف و کاریگەری لەسەر جیاوازیی شەرعزان

دوو باس لەخۆ دەگرێ:

یەکەمە لەبارەی بەشەکانی و بایەخی.

دووەم لەبارەی پیادەکردنە فیقهییە جێناکۆکەکان کە لە ناکۆکی لەو کەوتونەتەوە.

## باسی یەکەم:
## بەشەکانی عورف و بایەخ (ئیعتیبار)یان

### عورف و بەشەکانی:

پێشتر پێناسە کرا بەوەی: ئەو قسە یان کردارەیە خەڵك دەقیان پێوە گرتوون و بەزۆری لەسەری دەڕۆن.[1]

دەبێ بە سێ بەشەوە: یەکەمیان لەڕووی رواڵەت (مظهر)یەوە، دووەم لەڕووی سەرچاوە و سێیەم لەڕووی مەشروعیەتیەوە.

---

[1] بڕوانە: مصادر التشريع الإسلامي الأستاذ خلاف. هەندێ پێیان وایە پەیوەندیی نێوانعورف و عادەت پەیوەندیی عموم و خسوسی رەهایە، بەڵام جیاوازییان تێکەوتوە، هەندێکیان وتویانە عادەت گشتیترە، هە ندێکیشیان وتویانە عورف گشتیترە. بەقسەی شەرعییەکاندا دیارە کە عورف و عادەت هاومانان. بڕوانە: شرح التحرير لابن أمير الحاج ٢٨٢/١.

لەڕووی ڕواڵەتیەوە بۆ گوفتاری و کرداری دابەش دەبێ:

١- عورفی گوفتاری (قولي): ئەوەیە ئەهلی عورف نەریتیان وابێ لەفزێك بەمانایەکی دیاریکراو بەکار بێنن، کە لەڕووی زمانەوانیەوە وانەبێ.[1] وەك بەکارهێنانی وشەی (الولد) بۆ نێر نەك مێ، هەروەها بەکارهێنانی وشەی (اللحم) بۆ جگە لە گۆشتی ماسی.

٢- عورفی کرداری (عملي): ئەوەیە خەڵك لە مامەڵە و باری کەسایەتییاندا لەسەر ڕێبازێکی دیاریکراو بڕۆن جا چ گشتی بێ وەك چوونە گەرماو بەبێ دیاریکردنی کات و بڕی ئاوی بەکارهێنراو و بڕی کرێ، یان تایبەت بێ بە وڵاتێك، وەك ڕاهاتن لەسەر ئەوەی ژن ناگوێزرێتەوە بۆ مێردەکەی تا بەشێك لە مارەییەکەی وەرنەگرێ.

لەڕووی سەرچاوەکەیەوە دابەش دەبێ بۆ گشتی و تایبەت و شەرعی.[2]

١- عورفی گشتی: ئەوەیە خەڵك بەسەرجەم توێژ و پیشەکانیانەوە لە سەرتاسەری وڵاتدا دەقیان پێوە گرتوە، وەك دەقگرتنیان بە داوای بۆ دروستکردن (استصناع)ەوە.

٢- عورفی تایبەت: ئەوەیە خەڵکی ناوچەیەك دەقیان پێوە گرتوە و هەندێکیتر نا، یان هەندێ پیشەگەر دەقیان پێوە گرتوە و هەندێ پیشەگەریتر نا، وەك جێگیرکردنی قەرزەکان لەلایەن بازرگانانەوە لەسەر عەمیلەکانیان لەڕێگەی تۆمارەکانەوە، بەبێ ئەوەی پێویست بە شایەتی بکا.

٣- شەرعی: ئەو لەفزەیە شەرعدانەر بەکاری هێناوە و مەبەست پێی مانایەکی تایبەتە وەك گوازراوە شەرعیەکانی وەك نوێژ (الصلاة) کە لە نزاوە گوێزراوەتەوە بۆ عیبادەتێکی تایبەت، هەروەها ڕۆژوو (الصیام) لە خۆگرتنەوەی ڕەهاوە

---

[1] شرح تنقیح الفصول للقرافي ص ٢١١

[2] هەندێ لە زانایان عورفی شەرعی بە تایبەت دادەنێ بەڵام بەدیدی من وا باشترە لە گشتی و تایبەت تاك بکرێتەوە، لەبەرئەوەی عورفی شەرعدانەرە، لەبەرئەوە بە وەسفی عموم و خسوسی ناو خەڵك وەسف ناکرێ.

گوێزراوەتەوە بۆ خۆگرتنەوەی تایبەت، هەروەها (حج) لە مەبەستەوە گوێزراوەتـەوە بۆ نوسوکێکی تایبەت..

لەڕووی مەشروعیەتیشەوە دابەش دەبێ بۆ دروست و خراپ:

١- عورفی دروست (العرف الصحیح): ئەوەیـە دژ بـە بەڵگەیـەکی شـەرعی نـەبێ، وەك راهاتنی خەڵك لەسەر چوونە ناو گـەرماو بـەبێ دیـاریکردنی مـاوە و بـڕی ئـاوی بەکاربراو.

٢- عـورفی خـراپ (العـرف الفاسـد): ئەوەیـە دژ بـە حـوکم و ڕێسـا شـەرعییە نەگۆڕەکانـە، وەك راهـاتنی خـەڵك لەسـەر مامەڵـەکردن بـە سـوو و قومـارکردن و دەرخستنی هەندێ لە عەورەت.

## مەرجەکانی رەچاوکردنی عورف:

عـورف بایـەخی نـابێ تـا مەرجـەکانی تێدا نـەبێ، کـە ئەوانـە ئەگەرچـی زانایـان هەموویانیان ئاشکرا نەکردون، بەڵام لە دەربڕین و پیادەکردنەکانیاندا چ بەڕاشکاو بـێ یان لێ هەڵێنجان، ئەو مەرجانە دێ،ە دەست و گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ئەوەیە عورفەکە بەردەوام (مطرد) یان زاڵ (غالـب) بـێ. ئـیبن نـەجیم دەڵـێ: (تعتبر العادة أذا اطردت أو غلبت).[1] (واتە: عادەت رەچاو دەکرێ ئەگەر بەردەوام یـان زاڵ بوو).

سیوتی دەڵێ: (إنما تعتبر العادة إذا اطـردت، فـإن اضـطربت فـلا) (واتـە: عـادەت ئەگەر بەردەوام بێت ڕەچاو دەکرێت، ئەگەر جارجارە بێت نا).[2]

مەبەسـت لـە (الاطـراد) ئەوەیـە کـارپێکردنی بەشـێوەیەکی رێکوپێـك دووبـارە ببێتـەوە، زاڵـی و بـەردەوامیش بەنیسـبەت ئـەهلی عـورف لـە وڵات یـان ئـەو تایفانـە

---

[1] بڕوانە: الأشباء والنظائر علی مذهب أبي حنیفة لابن نجیم ص ٤٧.

[2] الأشباه والنظائر في قواعد وفروع فقه الشافعي للسیوطي ص ١٠١.

لەبەرچاو دەگیرێ کەلە کتێبەکانی فیقهدا بەناوبانگ نین.

خاوەنی (تهذیب الفروق) دەڵێ: پێویستە موفتی تەماشای عورفی رابردوو کە لە کتێبەکانی فیقهدا هەیە نەکا، بەڵکو پێویستە لەبەر تیشکی عورفی باو لە وڵاتی فتواخوازدا فتوا بدا.[1]

٢- عورفەکە گشتی بێ لە سەرجەم وڵاتانی ئیسلامی.

شێخەکانی بەڵخ و بوخارا و خوارەزم و هەروەها ئەبو لیث و ئەبو عەلی نەسەفی لەم مەرجە لایانداوە و فتوایان داوە بەدانانی عورفی تایبەت بە بەڵگە و تایبەتکەر، لەبەرئەوە زۆر مامەڵەیان لە روانگەی عورفی خۆجێییەوە بە جائیز داناوە، وەك بەکرێگرتنی چنیار بۆ رستن لەبەرانبەر بەشێك لە بەرهەمی کارەکەی، لەکاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لە بەشەئاردی کرێی ئاشەوان (قفیز الطحان) کردوە.[2]

وای دەبینم ناکۆکیەکە لەفزییە: ئەوەی عومومی لە عورفدا کردۆتە مەرج ئەوەی سەبارەت بەو حوکمە گشتیانە وتوە کە لەسەر عورف بینا دەکرێن، ئەوەیش نەیکردۆتە مەرج تەماشای ئەو حوکمە تایبەتانەی کردوە کە لەسەر عورفە خۆجێییەکان بینا دەکرێن.

٣- عورفەکە پێچەوانەی بەڵگەکانی شەرع نەبێ، ئەگەر وابێ ئیعتیباری نامێنێ، وەك راهاتنی خەڵك بە خواردنەوەی مەی و قومارکردن و داگیرساندنی مۆم لەسەر گۆڕ و دەرخستنی عەورەت..

لە ئەبو یوسفەوە دەگێڕنەوە کە لەو مەرجە لایداوە ئەگەر دەقە شەرعیەکە لەسەر عورف دامەزرابێ و رەخنەی لە ئەبوحەنیفە و محەمەد گرتوە کە وتویانە: ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتبێتی پێوانەکراو و کێشراوە، ئەوە وایە. جا دەڵێ: شەرعدانەر بۆ رەچاوکردنی ئەو عورفەی ئەوکات باو بووە وای کردوە، جا ئەگەر عادەت گۆڕا و

---

[1] بڕوانە: تهذيب الفروق والقواعد السنية في الأسرار الفقهية هامش الفروق للقرافي ٤٣/١.

[2] بڕوانە: العرف والعادة لابي سنة ص ٥٨

گەنم و خورما کێشران، ئەوا پێوەرەکە دەگۆڕێ بۆ کێشان و یەکسانکردن بەم وەزنە ڕاستە.[1]

٤- عورفەکە لەکاتی پەیدابوونی ئەو ڕەفتارەی دەویستریّ عورفی تێدا بکرێتە حاکم هەبێ، بەوەی پێش ئەو هەبووبێ و تا سەردەمەکەی بەردەوام بێ جا چ ڕەفتارەکە گوفتاری بێ یان کرداری. بەمە عورفی لەناکاو (الطارئ) هەڵسوکەوتەکەدا یان پاشتر پەیدابوو دەچێتە دەرەوە، با کارەکەیشی بەگوێرەی ئەو بەراورد کردبێ، هەروەها عورفی ڕابردوو کە بەر لە پەیدابوونی هەڵسوکەوتەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەڵام پاش حوکمدان بەگوێرەی عورف ڕوودانی گۆڕان لە عورفەکەدا زیانی نیە.

ئیبن نەجیم دەڵێ: (ئەو عورفەی لەفزەکانی لە ڕوانگەوە وەردەگیرێ عورفی بەراوردکراوی پێشووە نەك پاش، لەبەرئەوە وتویانە عورفی لەناکاو بایەخی نیە).[2]

سەرنج لەسەر بۆچوونەکەی ئیبن نەجیم ئەوەیە مەرجەکەی تایبەت کردوە بە عورفی گوفتاری، لەکاتێکدا لە عورفی کرداریشدا بەهەمان شێوە ڕوو دەدا، وەك فرۆشتن بە بەیەکتردان (المعاطاة) و چوونە ناو گەرماو..

پێویستە لەبەر تیشکی ئەم مەرجەدا بەڵگەکانی وەقف و وەسێت و فرۆشتن و پێشکەشکردن و بەڵگەنامەکانی هاوسەرگیری لێك بدرێنەوە، هەروەها ئەو مەرج و زاراوانەیش تێیاندا دێن لەبەر تیشکی عورفی ڕەفتارکردواندا لێك بدرێنەوە کە لە سەردەمەکەیاندا هەبووە، نەك لەسەر عورفێکی پەیدابوو.[3]

٥- عورفەکە مولزیم بێ، واتە بەهۆی دووبارەبوونەوەی ڕێکوپێکەوە، بەشێوەیەك دەگاتە پلەیەك خەڵکەکەی خۆیان بەناچار دەبینن لەسەری بڕۆن و لێدەرچوونی

---

[1] بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.
[2] الأشباه والنظائر لابن نجيم، سەرچاوەی پێشوو.
[3] العرف والعادة ص ٦٥.

دەبێتە شوورەیی.

ئەللەخمی دەڵێ: ئەوەی هاوڕێ یان دراوسێ لە شایی و بۆنەکاندا بەدیاری دەیدەن پاداشتی هەیە، بەڵام لەوەدا جیاوازن، ئەگەر دەرکەوت شتی لەو شێوەیە پاداشتی دەوێ ئەوا خۆی و وەرەسەکەی ئەو مافەیان هەیە، هەروەها لە خەڵکی هەرێمەکەیەوە دەگێڕێتەوە کە عادەتیان وابوو قەرەبوی ئەو دیاریانەیان دەکرد، ئەم عورفە بەبەس دانانێ بۆ حوکمپێدانی، لەبەرئەوەی سیفەتی ئیلزامی تێدا نەهاتوتەدی.[1]

٦- گوفتار یان کردارێك نەبێ پێچەوانەی ناوەرۆکی عورفەکە بگەیەنێ: وەك ئەوەی عورف وابێ لەبازاڕ نرخ بکرێتە قیست و هەردوو عەقدکاریش بەڕاشکاوی لەسەر چارەسەرەکان رێکە بکەن، یان عورف وابێ خەرجیەکانی هەناردەکردن لەسەر کڕیارە و ئەوان رێك بکەون لەسەر فرۆشیار بێ.

ئیبن عەبدولسەلام لە (القواعد)دا دەڵێ: (هەر شتێك لە عورفدا جێگیر بێ ئەگەر هەردوو عەقدکار بەپێچەوانەی قسەیان کرد بەشێوەیەك لەگەڵ مەبەستی عەقدەکە بگونجێ دروستە، هەروەها لە قەرینەی عورفیدا، وەك ئەوەی ئافرەتێك لەکاتی کێشە لە جیازیدا بەڵگە بێنێتەوە لەسەر ئەوەی لە تایبەتمەندیەکانی ئافرەتانە، ئەوا بڕیاری پێدەدرێ و پێش عورف دەخرێ، لەبەرئەوەی بەڵگەکان لەو گومانەی لەم لایەنانە وەردەگیرێ بەهێزترن).[2]

مانای ئەم مەرجە ئەوەیە دیلالەتی عورف لە دیلالەتی لەفز لاوازترە، بۆیە لە تێکگیراندا دیلالەتی لەفز زاڵ دەبێ.

---

[1] بڕوانە: العرف والعادة سەرچاوەی پێشوو. ل٦٦٧.

[2] القواعد لابن عبد السلام ١٧٨/٢

## گرنگیی عورف:

ئـەم سەرچـاوەیە -بەپێچـەوانەی بـاقیی سەرچـاوە تەبەعیـەكانیتر- خەریكـە شەرعزان كۆك بن لەسەر كارپێكردنی لە پیادەكردنە فیقهیەكانیاندا، با هەندێكیشـیان بەتیۆری رەتیـان كردۆتـەوە یـان گێڕاویانەتـەوە بـۆ سەرچـاوەیەكیتر یـان لـە بـواری كارپێكردنیدا لایانداوە، ئەوەیش دەدرێتە پاڵ چەند هۆیەك، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- دەسەڵاتی عورف لە هەموو سەردەمێكدا: ئەو كۆمەڵە زاراوە و دابونەریتانـەی هەر ئوممەتێك دەقیـان پێـوە دەگـرێ و دەیانكاتـە رێچـكە و رێبـاز، رێزیـان لـە دڵـی تاكەكانـدا هەیـە و دەسـەڵاتێكی بـەهێزیان بەسـەریاندا هەیـە، بەشـێوەیەك لـە شـتە گرنگەكانی ژیانیان دێنە ژماردن كە ناتوانن لێیان بێنیاز بن و لێدەرچوونیان بە مایەی بێزاری و سەرزەنشتی خەڵك بەگشـتی دەبیـنن، لێـرەوە وتویانـە: (نـەریت سروشـتی دووەمە)، مەبەستیان ئەوەیە نـەریت هێزێكـی هەیـە نزیـك لـە هێـزی سروشـت، واتـە ئەوەی مرۆڤی لەسەر خولقاوە.

شەرعزان دەڵێن: ترازاندنی خەڵك لە عادەتەكانیان زەحمەتیەكی گەورەی تێدایـە، مەبەستیان ئەو هێزە گەورەیە (عادەت) هەیەتی.[١]

٢- لەبەرئەوەی قورئانی پیرۆز هەنـدێ دابونـەریتی بـاوی پـێش ئیسـلامی ئیقـرار كردوە كە لەگەڵ گیانی شەریعەتی ئیسلامیدا لێك نادەن، لەوانە واجببوونی خوێنبایی لەسەر كەسوكاری بكوژ.

٣- هەروەها لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) كاتێ كۆچـی كـرد بـۆ مەدینـە، هەنـدێ دابونەریتی باوی ئەوێی ئیقرار كرد، لەوانـە: فرۆشـتنی (سـەلەم) و (عاریـە) و رێگـەی پێدان كاتێ بینی لەو فرۆشتنانەن كـە مامەڵـەكارانی مەدینـە نـاتوانن دەسـتبەرداریان بن، ئەگەرچی ئەو نەهی كردوە لە فرۆشتنی نـەبوو (مەعـدوم) و فرۆشـتنی شـت بـە هاوڕەگەزەكەی بەزیادەوە.

---

[١] العرف والعادة، سەرچاوەی پێشوو لا١٦٧

٤- هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ لە هەرێمە ئیسلامیەکاندا بڵاو بوونەوە، هەندێ دابونەریتی ناوخۆیی باویان ئیقرار کرد، ئەو جیاوازییە زۆرەی لەنێوان ئەو حوکمانەی لەسەر عورفەکانی عێراق دامەزراون و ئەوانەی لەسەر عورفەکانی حیجاز دامەزراون هەیە، لە رواڵەتەکانی ئەم حاڵەتەن.

أ- لە شەرعزانی حەنەفی ئیبن نەجیم دەڵێ: رێسای شەشەم عادەت موحکەمە و بنچینەکەی ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ)ئەفەرموێ: ((ما رآهُ المسلمونَ حسنًا فَهوَ عندَ اللّهِ حسنٌ)).[1] (واتە: ئەوەی موسڵمانان بە باشی بزانن لای خوایش باشە). هەروەها دەڵێ: بزانە فیقهـ لە زۆر مەسەلەدا عورف و عادەت لەبەرچاو دەگرێ، تا کردویانە بە ئەسڵێك و دەڵێن: لە ئوسولێ لە بابی ئەوەی بەهۆیەوە حەقیقەت تەرك دەکرێت: حەقیقەت بە دەلالەتی بەکارهێنان و عورف تەرك دەکرێت.

هەروەها دەڵێ: ئەگەر عورف لەگەڵ شەرع تێکگیران، عورفی بەکارهێنان پێش دەخرێ بەتایبەت لە سوێندەکاندا، جا ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر پێخەف (الفراش) یان لەسەر رایەخ (البساط) دانەنیشێ یان نەچێتە بەر روناکی (السراج)، بەدانیشتنی لەسەر زەوی یان سوودوەرگرتن لە روناکیی خۆر سوێندەکەی ناکەوێ لەکاتێکدا خوا زەوی بە (فراش) و (بساط) و خۆری بە (سراج) ناوبردوە. ئەگەر سوێندی خوارد گۆشت نەخوات بەخواردنی گۆشتی ماسی سوێندەکەی ناکەوێ، با خوایش لە قورئاندا بە گۆشت ناوی بردوە.[2]

---

[1] سیوتی دەڵێ: پاش گەڕان و پرسسیارێکی زۆر لە هیچ کتێبێکی حەدیسدا بە مەرفوعی نەمبینی، بە سەنەدێکی لاوازیش: ئەوە قسەی عەبوڵای کوڕی مەسعودە و لەسەر ئەو وەستاوە، ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا هێناویتی. بڕوانە: الأشباه والنظائر للسيوطي ص ٩٩.

[2] الأشباه والنظائر على مذهب أبي حنيفة ص ٤٦ للشيخ زين الدين ابن نجيم (ت ٩٦٩)

ب- له زانایانی مالیکی: قەڕافی -له بابەتی سیغەکانی تەڵاقدا- دەڵێ: هەندێ شت پێویستە لەسەرمان یەکێکیان ئەوەیە: باوەڕمان وابێ مالیك یان زانایانیتری جگە لەو، لەو رووەوە ئەم حوکمانەیان لەبارەی ئەم لەفزانەوە داوە کە سەردەمەکەیان هەندێ عادەتی تێدا بووە کە وای خواستوە ئەو لەفزانە ئەو مانایانە بگوێزنەوە کە ئەوان فتوایان پێداون تا لە خلیسکان بیانپارێزن. دووەمیان ئەوەیە ئەگەر ئێمە بینیمان سەردەمەکەمان ئەو شتانەی تێدا نەماوە، پێویستە لەسەرمان ئەو حوکمانە لەبارەی ئەو لەفزانەوە نەدەین، لەبەرئەوەی گواستنەوەی عادەتەکان گواستنەوەی ئەحکام واجب دەکا".

قەڕافی دراوی ئاڵوێرکراو بەنموونە دێنێتەوە، پاشان دەڵێ: بەهەمان شێوە نەفەقەی ژن و منداڵ و خزمان و پۆشاکیان بەگوێرەی دابونەریت دەگۆڕێ و فتوا تێیدا دەگۆڕێ، فتوادان بە جگە لە عادەتی حازر حەرامە، .. وەرگرتنی مارەیی لەکاتی چوونەلا یان پێش یان پاش چوونەلا (الدخول) و غەیری ئەو کە بێشومارن و لەسەر دابونەریت دامەزراون، بەئیجماعی موسڵمانان هەرکات عادەتیان تێدا گۆڕا حوکمەکەیش دەگۆڕێ و فتوادان بەیەکەم حەرام دەبێ".[1]

ج- له زانایانی شافیعی: سیوتی دەڵێ: بزانە فیقهـ لە ژمارەیەکی بێئەندازە مەسەلەدا گەڕاوەتەوە بۆ لەبەرچاوگرتنی عورف و عادەت، لەوانە تەمەنی کەوتنە بێنوێژیی ئافرەت و باڵقبوون و رەحەتبوون (الانزال) و کەمترین ماوەی بێنوێژی و زەیسانی و پاکبوونەوە و زۆربە و زۆریان. ئەو پیسیانەی چاوپۆشی لە بڕێکی کەمیان کراوە، کورت و درێژیی کات لە بەدوای یەکداهاتنی دەستنوێژ لە رووی و بیناکردن لەسەر نوێژ لە جەمع و وتاردان و جومعەدا، هەروەها لەنێوان ئیجاب و قبوڵ، سەلامکردن و وەڵامدانەوەی و دواخستنی رێگر لە گێڕانەوە لەبەر بوونی عەیب.[2]

---

[1] الفروق للقرافي ١/٤٥.

[2] الاشباه والنظائر للسيوطي ص٩٩

بەلگەیتر هەن لەسەر لەبەرچاوگرتنی عورف لەلایەن شەرعزانەوە وەك بەلگەیەکی سەربەخۆ و سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی تەشریعی ئیسلامی.

لەم بوارەدا بەم ئەندازەیە واز دێنین.

پاش ئەم گرنگیەی عورف لای زانایان لە ئوسولناسان لە بیناکردنی ڕێساکانیان لەسەری، لای شەرعزان بە هەلێنجان لەبەر ڕۆشناییدا، لای موفتی و فازییان لە ڕەچاوکردنیان بۆ دابونەریتە گشتی و تایبەتەکان لە فتوا و فەزاوەتەکانیاندا... ئایا دەکرێ عورف بەهۆیەك لە هۆکانی جیاوازیی شەرعزان لە حوکمە شەرعیەکان دابنێین؟

ئەگەر سەرنج بدەینە پیادەکردنە فیقهییە خیلافیەکان کە لەسەر جیاوازبوون لە کارەکانی عورف دامەزراون، وەلام، ئەرێ دەبێ.

هەروەها نەرێ دەبێ ئەگەر لەسەر ئەوە بچین کە هەندێ لە زانایان لەو بابەتەدا نووسیویانە. بۆ نموونە بەتلیمۆسی کە لەبارەی ناکۆکیی فیوانانی نووسیوە عورفی بەیەکێك لەو هۆیانە نەژماردوە، هەروەها حوججەتولای دەهلەوی لە کتێبی (الانصاف في التنبيه على أسباب الخلاف)دا کە لە چەند گۆشەیەکی جیاوازەوە قسەی لەسەر بابەتەکە کردوە، هەروەها ئیبن تەیمیە لە کتێبی (رفع الملام عن أئمة الإعلام)دا باسی عورفی نەکردوە.

لەپاڵ ئەوانەدا، هەندێ لە زانایان قسەکانیان بەڕاشکاوی ئەوە دەگەیەنێ کە عورف بەیەکێك لە هۆکانی ناکۆکی دانانێن وەك شاتبی لە (الموافقات)دا، ئەوەتا کاتێ جیاوازی نێوان ناکۆکی ڕاستەقینە و ناکۆکیی ڕواڵەتی روون دەکاتەوە دەڵێ: پێویستە ئەو ناکۆکییە نەبێ کە لەسەر حەقیقەتە بە ناکۆکیی ڕاستەقینە لەنێوان ئیمامەکاندا نەژمێردرێ، ئەوەی زاهیرەکەی ناکۆکی و واقیعەکەی تەبایی بێ، ناوبردنی بە ناکۆکی هەڵەیە.

به بۆچوونی من عورف له سەردەمی هاوەڵانەوە بەهۆیەکی سەرەکیی جیاوازیی شەرعزان دادەنریٚ، پیادە فیقهیەکان (التطبیقات الفقهیة) لە سەردەمە جیاوازەکاندا بەڵگەن لەسەر ئەوە. ئەوەی شاتبی و هاوڕاکانی دەیڵێن کە کۆکبوونی شەرعزان لەسەر سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی ئەحکام ڕێگە بەوە نادات بەهۆیەك لە هۆکانی ناکۆکی دابنریٚ، ئەو ڕاستییە بەرهەڵستی دەکا کە شەرعزان کۆکن لەسەر حوججیەتی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئیجماع، ئەگەرچی لەو حوکمانەی لەو سەرچاوانە هەڵدەهێنجرێن ڕایان جیاوازە، چونکە ناکۆکیی زانایان تەنها لە جیاوازییان لە حوججیەتی سەرچاوەکەوە نیە، بەڵکو دەشیٚ لەبارەی حوججیەتی ڕێك بکەون بەڵام لە پیادەکردن یان بواری کارپێکردنیدا جیاواز بن.

لەم ڕوانگەوە کارەکانی عورف لە هەڵێنجانی فیقهیدا بەهۆیەك لە هۆکانی جیاوازیی شەرعزان لە حوکمە شەرعیەکاندا دادەنریٚ.

## باسی دووەم:
## نموونە لە پیادەکردنی فیقهیی جیناکۆک کە لە ناکۆکی لەسەر کارکردن بە عورف کەوتونەتەوە

١- وەکیل لە مارەبڕیندا ئەگەر مارەیی ئافرەتی بەشێوەیەك زیاد کرد کە خەڵك تێیدا مافی یەکتر نەخۆن، بەلای ئەبوحەنیفەوە دروستە، بەلای ئەبویوسف و محەمەدەوە دروست نیە لەوەدا نەبێ کە خەڵك تێیدا مافی یەکتر نەخۆن. هۆی ناکۆکیەکەیان ئەوەیە مۆڵەتپێدانی رەها ئەگەر لە تۆمەت و ناپاکی رووت بوویەوە بەلای ئەبوحەنیفەوە تایبەت بە عورف نابێ، بەڵام بەلای ئەو دوانەوە تایبەت دەبێ.

هەمان ناکۆکی لەبەر هەمان هۆ سەبارەت بە وەکیل بۆ خولعکردن (الوكيل بالخلع) لەنێویانیاندا هەیە.[1]

٢- سپاردەکار (المودع) ئەگەر سەفەری بە سپاردەکە کرد بەلای ئەبوحەنیفەوە ئەوە جائیزە ئەگەر رێگەکە بێ ترس بوو، جا چ بار (حمل) و مەسرەف (مؤنة)ی هەبێ یان نەیبێ. بەلای ئەبو یوسف و محەمەدەوە ئەگەر قورسایی و مەسرەفی نەبوو بۆی هەیە، ئەگینا جائیز نیە.

هۆی ناکۆکیەکەیان جیاوازییانە لە تایبەتکردنی مۆڵەتپێدانی رەها بە عورف، لای ئەبوحەنیفە جائیز نیە و لای ئەو دوانە جائیزە.

جیاوازییان لەبارەی ئەو کەسەی، کەسێك بەرەهایی بکاتە وەکیل کە خانوەکەی بۆ بەکرێ بدا، پاشان بۆ ماوەیەکی درێژ وەك دە ساڵ یان زیاتر بەکرێی دا، لەسەر

---

[1] بڕوانە: تأسيس النظر ص ٢٣.

هـەمان نـاکۆکی دادەمـەزرێ. بـەلای ئـەبو حەنیفـەوە بەکرێدانەکـە دروسـت و بـەلای ئەبویوسف و محەمەد و شافیعی و ئەوانەی هاوڕایانن بەتاڵە، لەبەرئـەوەی ئـەم ئیزنـە بـە عـورفی بـاوەوە بەسـتراوە، بۆیـە پێویسـتە وەکیلەکـە لـە مـاوەی بەکرێدانەکـەدا سەرپێچی نەکا.[1]

٣- شەرعزان لەبارەی فرۆشتنی بەیەکتردان (بیع المعاطاة)ەوە رایان جیاوازە بەم شێوەیە:

حەنەفیەت: فیقهی حەنەفی بە بازدان نەگەیشتە قبولکردنی بەیەکتردان (التعاطي) وەك ئامرازێك بۆ گوزارشتکردن لە ئیرادە، بەڵکو پلەبەپلە پێی گەیشـت رەنگـە هـۆی ئەوەیش پەرۆشی ئەم فیقهەیە لە سەرەتای پەرەسـەندنیدا لەسـەر پیـادەکردنی ئـەو ئەسڵەی لەلای پەسەند کراوە، ئەویش هەڵبژاردنی دەربڕینی لەفزییە.

بەڵام پاشـتر عـورف پـاڵی بـە حەنەفیەکانـەوە نـا بـۆ فراوانکـاری لـە قبـولکردنی بەیەکتردان، سەرەتا رێگەیان بە بەیەکتردان دا بۆ دامەزرانی فرۆشتن لە شـتی بێنـرخ (الخسیس) نـەك بـەنرخ (النفـیس)، زۆری نـەبرد لـە هەردووکیانـدا رێگـەیان پێدا. لـە (البداية)دا هاتووە "قەدوری باسی ئەوەی کردوە کە بەیەکتردان لە شتە بێنرخەکانـدا دروسـتە بـەڵام لـە شـتە بەنرخەکانـدا نـابێ، ریوایـەتی جـائیزبوون لـە بنەڕەتـدا لـەم وردەکارییە رەهایە، هەر ئەوەیش راستە".

لە (تبيين الحقائق)[2]دا هاتووە: پابەند دەکرێ بە بەیەکتردان و هیچ جیـاوازی نیـە لەنێوان ئەوەی فرۆشراوەکە بێنرخ بـێ یـان بـەنرخ لەبـەر نـەبوونی (ئـەو جیاوازییـە)، راست یەکەمە، لەبەرئەوەی دروستیی فرۆشتن بـە ئیعتیبـاری رازیبوونـە بـە شـێوەی لەفزەکە، ئەم گۆڕانە بەرچاوە لە فیقهی حەنەفیدا بناغەکـەی گـۆڕان بـوو لـە عـورفی خەڵکدا لە مامەڵەکردن بە بەیەکتردان.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو. ل٢١٧-٢٢.

[2] ٤/٤

هەروەها مالیکیەت و حەنبەلیەکانیش دەستیان بە درووستیی (فرۆشتنی بەیەکتردان) لە بێنرخ و بەنرخدا گرتوە، ئیبن قودامە دەڵێ: "خوا فرۆشتنی حەڵاڵ کردوە، بەڵام چۆنێتیەکەی روون نەکردۆتەوە، بۆیە پێویستە بۆ عورف بگەڕێینەوە وەك چۆن لە وەرگرتن و بەدەستهێنان(احراز) و جیابوونەوەدا بۆی دەگەڕێینەوە، موسڵمانان لە بازاڕ و سەودا و مامەڵەکانیاندا لەسەر ئەوەن، هەروەها لەبەرئەوەی فرۆشتن لەنێوانیاندا هەبووە و زانراو بووە لایان، بەڵام شەرع هەندێ حوکمی پێدا هەڵواسیون و وەك خۆی هێشتویەتیەوە، بۆیە گۆڕینی بە را و تەحکیم دروست نیە".[1]

حەتاب ئەلمالیکی دەڵێ: "روکنی یەکەم کە سیغەکەیە و فرۆشتنی لەسەر دادەمەزرێ ئەوەیە ئاماژە بێ بۆ رازیبوون، چ بە قسە بێ یان کردار وەك بەیەکتردان کە پێدانە (فرۆشیار ماڵەکە دەدات و کڕیاریش لەبەرانبەردا نرخەکەی-وەرگێڕ)... لەبەرئەوەی کردەوەکە بەعورف ئاماژەیە بۆ رەزامەندی".[2]

لەبەرانبەر ئەم را فراوانکارەی حەنەفی و مالیکی و حەنبەلیدا لەسەر بینای عورف، دەبینین شافیعی و شیعە بەئاراستەی رای تەسککەرەوە چوون، جا ئاخۆ خاوەنانی ئەم دوو رێبازە شتە بێنرخ و بەنرخەکانیان

لێك جیا کردۆتەوە و لە یەکەمدا بەیەکتردان-یان پەسەند کردوە نەك لە دووەمدا؟

لە (نهاية المحتاج) -فیقهی شافیعی-دا هاتووە: "رەزامەندی شتێکی شاراوەیە و ئێمە ئاگامان لێی نیە، سیغەکە کراوەتە بەڵگە لەسەر رەزامەندی، بۆیە بە بەیەکتردان دانامەزرێ".[3]

---

[1] المغني ٥١٦/٣

[2] شرح الحطاب ٢٢٨/٤

[3] نهاية المحتاج للرملي ٣/٤، ٢٢

محەلی دەڵێ: "فرۆشتن بە بەیەکتردان نیە و هەرچی بەوە وەریگرتبێ، یان بەدەلەکەی ئەگەر فەوتابێ، دەیگێڕێتەوە، هەروەها وتراوە لە ناموعتەبەردا پێی دادەمەزرێ"[1].

هەروەها لە (الروض النضير) -فیقهی شیعەی زەیدی-دا هاتووە: "ئەو گوتەیەی عەقدی پێ دادەمەزرێ بریتییە لە ئیجاب و قبوڵ لە ماڵێکدا بەکۆمەڵێ مەرجی موعتەبەرەوە، ئەوانەی موعتەبەر نین لەوە هەڵاوێر کراون لەبەرئەوەی خەڵك وا راهاتوون بەبێ سیغە دەچنە ناوی، کە ئەوە مەزەبی هادەویشە"[2].

هۆی ناکۆکیەکەیان جیاوازییە لە بەبەڵگەکردنی عورفدا، رێبازی حەنەفی و مالیکی و حەنبەلی بریتییە لە ملکەچکردنی فرۆشتنەکە بۆ دەسەڵاتی عورف، لەکاتێکدا لە دیدی شافیعی و شیعەدا شەرعدانەر تەنها باسی سەودا و فرۆشتنی کردوە و جیاوازی لەنێوان قۆناغی دیاریکردنی نرخ و عەقدکردندا کردوە و ئەو دەستەواژە کردارییانەی سەردەمی جاهیلی دەقیان پێوە گرتبوو خستۆتە لاوە وەك دەست لەیەکدان (الملامسة) و شتیتر، بۆیە بەو پێیە پێویستە هەرچی لەشێوەی ئەوەیە بخرێتە لاوە لە بەیەکتردان -یك لەفزی فرۆشتنی لەگەڵ نەبێ، کە شەرعدانەر کردویتی بە ناونیشانی عەقدکردن بخرێتە لاوە.

بەبۆچوونی من رای زاڵ رای مەزەبی حەنەفی و مالیکی و حەنبەلیەکانە، چونکە زیاتر لەگەڵ گیانی ئاسانکاری لە شەریعەتی ئیسلامیدا دەگونجێ.

رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ

---

[1] شرح جلال الدين المحلي على المنهاج مع قليوبي وعميرة ١٥٣/٢.
[2] الروض النضير ٢٠٥/٣-٢٠٦

## گرنگترین سەرچاوەکانی ئەم کتێبە

**القرآن الكريم:**

* تفسير الطبري، محمد بن جرير الطبري (٢٢٤–٣١٠) ط بولاق.
* أحكام القرآن للجصاص، أبي بكر أحمد بن علي الرازي (ت – ٣٧٠هـ) ط القاهرة.
* أحكام القرآن لابن العربي أبي بكر بن محمد (ت– ٤٣٠هـ)ط الحلبي.
* تفسير القرطبي، محمد بن أحمد الأنصاري (ت – ٦٧١هـ) ط ثانية – دار الكتب.
* الاتقان في علوم القرآن جلال الدين عبدالرحمن السيوطي (ت–٩١١هـ).
* كنز العرفان في فقه القرآن، للحلي جمال الدين ط النجف.

**الحديث:**

* الموطأ مع تنوير الحواليك، ط الحلبي للأمام مالك.
* صحيح البخاري، ط بولاق ١٣١٤محمد بن إسماعيل (١٩٤–٢٥٦هـ) .
* صحيح مسلم بن الحجاج النيسابوري (ت – ٢٦١هـ) ط الحلبي.
* سنن أبن ماجة، محمد بن يزيد القزويني (ت– ٢٧٣) ط الحلبي.
* صحيح الترمذي، محمد بن عيسى (ت – ٢٧٩هـ) ط الحلبي.
* السنن الكبرى للبيهقي أبي بكر أحمد بن الحسين النيسابوري (٣٨٤–٤٥٨هـ) ط حيدر أباد ١٣٤٧ هـ.
* النهاية في غريب الحديث، لابن الأثير محمد بن الجزري (٥٤٤–٦٠٦هـ).
* احكام الأحكام شرح عمدة الأحكام، محمد بن علي المعروف بأبن دقيق العيد (٦٢٥–٧٠٢هـ) ط السلفية.
* مع العدة حاشية محمد بن إسماعيل الصنعاني.
* بلوغ المرام من جمع أدلة الأحكام، محمد بن علي العسقلاني (٧٧٣–٨٥٢هـ).
* فتح الباري للعسقلاني شرح صحيح البخاري ط الحلبي.
* نيل الأوطار، للقاضي اليماني محمد بن علي الشوكاني (ت– ١١٢٥هـ).
* قواعد التحديث في فنون مصطلح الحديث، جمال الدين القاسمي (ت– ١٣١٧هـ).

**أصول الفقه الحنفي:**

* أصول الجصاص، مخطوطة دار الكتب المصرية رقم (٢٦).

* تقويم الأدلة، للدبوسي عبيد الله بـن عمـر (ت – ٤٣٠هـ) مخطوطـة دار الكتـب المصـرية رقـم (٢٢٥).
* تأسيس النظر للدبوسي، ط الإمام القاهرة.
* عبيد الله بن عمر (ت – ٤٣٠ هـ).
* أصول البزدوي علي بن محمد (ت – ٤٨٢هـ) مع كشف الأسرار.
* المغنى في الأصول، عمر بن محمد الخبازي (ت – ٦٩١هـ) مخطوطـة مكتبـة الأوقـاف العامـة بغداد.
* التوضيح على التنقيح، لصدر الشريعة عبد الله بن مسعود مع الحواشي (ت – ٧٤٧هـ).
* التحرير، لكمال ابن الهمام (ت – ٨٦١هـ).
* مع التحرير والتحبير، لابن أمير الحاج، ط بولاق.
* فتح الغفار، للشيخ زين الدين الشهير بإبن نجيم (ت – ٩٧٦هـ).
* تيسير التحرير، محمد أمين المشهور بأمير بادشاه ط صبيح.

**أصول الفقه المالكي:**

* مختصر المنتهى، لابن الحاجب الكردي عثمان بن عمر (٥٧٠–٦٤٦) مع شرح العضد وحاشية السعد ط بولاق.
*شرح تنقيح الفصول في اختصار المحصـول، احمـد بـن ادريـس القـرافي (ت –٦٨٤)ط القـاهرة ١٣٧٤هـ.
*الفروق للقرافي ايضا.
*الموافقات للشاطبي ابراهيم بن موسى الغرناطي(ت –٧٩٠هـ).
*الاعتصام للشاطبي أيضاً .
*مفتاح الوصول في علم الاصول، محمد بن احمد المالكي التلمساني ط دار الكتب.

**اصول الفقه الشافعي:**

*الرسالة، للامام الشافعي، ط الحلبي تحقيق احمد شاكر.
*اصول الشاشي، اسحاق بن ابراهيم السمرقندي(ت– ٣٢٥هـ)ط حجر بالهند.
*اللمع للشيرازي ابي اسحاق بن علي (ت–٤٧٦هـ)ط الحلبي.
*البرهان، لامام الحـرمين عبـد الملـك ابـن الشـيخ ابـي محمـد عبـدالله (٤١٩–٤٧٨هـ)مخطوطة المكتبة المركزية بغداد).
*الانصاف في التنبية على الاسباب التي أوجبت الخلاف بين الائمة، لابن السيد البطليوسي(ت– ٥٢١هـ)

*المستصفى، للغزالي محمد بن محمد بن محمد(٤٥٠-٥٠٥هـ).
*شفاء الغليل، للغزالي أيضاً تحيق الدكتور حمد الكبيسي ط الارشاد.
*الاحكام في اصول الاحكام، للامدي علي بن محمد الكردي(ت-٦٣١هـ).
*تخريج الفروع على الاصول، للزنجاني محمد بن احمد(ت-٦٥٦هـ).
* منهاج الوصول الى علم الاصول للبيضاوي عبدالله بن عمر بن محمد (ت-٦٨٥هـ)ط كردستان العلمية القاهرة.
*المحصول، للرازي محمد بن عمر الطبرستاني (٥٤٤-٦٠٦هـ)تحقيق الدكتور طه جابر العلواني.
*جمع الجوامع، للسبكي عبد الوهاب بن تقي الدين (ت-٧٧١هـ)مع حاشية البناني ط بولاق.
*الأسنوي (نهاية السول) عبد الرحيم بن الحسن (ت-٧٧٢هـ)مع البدخشي ط صبيح.
*الاشباه والنظائر للسيوطي عبد الرحمن بن ابي بكر(ت-٩١١هـ).

**اصول الفقه الحنبلي:**
*روضه الناظر، لابن قدامه عبدالله بن احمد المقدسي(٥٤١-٦٢٠هـ)ط المدني.
*شرح الكوكب المنير (مختصر التحرير)للشيخ تقي الدين ابي القاء ط السنه المحمدية.
*القياس في الشرع الإسلامي لابن تيمية ط السلفية الثالثة.
*رفع الملام عن الائمة الاعلام لابن تيمية ايضا.
*القواعد والفوائد الاصولية علي بن عباس المعروف بابن اللحام (٧٥٢-٨٠٣هـ).

**اصول الفقه الجعفري:**
*مبادئ الوصول الى علم الاصول جمال الدين المعروف بالحلي ط النجف.
*معالم الدين في الاصول حسن بن زين الدين العاملي ط النجف.
* القوانين المحكمة للمحقق القمي ط حجر ايران.
*الاصول العامة للفقه المقارن السيد محمد تقي الحكيم ط دار الاندلس

**اصول الفقه الزيدي:**
*الفصول اللؤلؤية، حسام الدين ابراهيم بن عبد الهادي (ت-٩١٤هـ)مخطوطة دار الكتب المصرية.
*معيار الفصول في علم الاصول، مخطوطة دار الكتب المصرية.
*ارشاد الفحول، محمد بن علي الشوكاني(ت-١٢٥٥هـ)ط الحلبي .

**اصول فقه الظاهرية:**

* الإحكام في أصول الأحكام، لابن حزم ط العاصمة القاهرة.

* ملخص ابطال القياس والرأي والاستحسان والتقليد والتعليل، لابن حزم ط جامعة دمشق.

**اصول الفقه الاباضي:**

*شرح طلعة الشمس على الالفية المسماة بشمس الاصول، كلاهما لابي محمد عبدالله بن حميد السالمي الاباضي(ت–١٣٣٢هـ).

**اصول فقه المعتزلة:**

*المعتمد في اصول الفقه لابي الحسين البصري (ت–٤٣٦هـ)ط الكاثوليكية بيروت.

الفقه الحنفي:

*بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، للكاساني ابي بكر بن مسعود(ت–٥٧٨هـ).

*تبين الحقائق شرح كنز الدقائق للزيلعي عثمان بن علي (ت–٧٤٢هـ)ط بولاق .

*فتح القدير شرح الهداية مع التكملة – نتائج الافكار لابن الهمام ط الحلبي .

*الدر المختار شرح تنوير الابصار للحصكفي.

*محمد بن عبد الله (ت–١٠٠٤هـ)مع حاشية محمد امين المعروف بابن عابدين (ت–١٢٥٢هـ).

**الفقة المالكي:**

*المنتقى شرح موطأ الامام مالك، للقاضي سليمان بن خلف المعروف بالباجي الاندلسي(٤٠٣–٤٩٤هـ).

*مختصر خليل ابي ضياء ابي خليل بن اسحاق(ت–٧٧٦هـ).

*الحطاب شرح مواهب الجليل ابن عبد الله محمد بن محمد (ت–٩٥٤هـ)السعادة.

*الشرح الصغير للدردير احمد بن محمد.(ت–١٢٠١هـ).

* بلغة السالك لأقرب المسالك حاشية احمد الصاوي(ت–١٢٤١هـ)ط دار الفكر.

الفقه الشافعي:

*الام للشافعي ط بولاق.

*المهذب للشيرازي ابي اسحاق ابراهيم بن علي .

*المجموع شرح المهذب ابو زكريا محي الدين المعروف بانووي(ت–٦٧٦هـ).

*مغني المحتاج للخطيب الشربيني شمس الدين محمد بن احمد (ت–٩٧٧هـ)ط القاهرة.

*نهاية المحتاج للرملي(ت–١٠٠٤هـ)ط القاهرة١٣٠٤.

*كشف الغوامض لقطر العارض للشيخ المعروف الكردي .

**الفقه الحنبلي:**

*المغنى لابن قدامة ثالثة لدار المنار.

*نيل المأرب شرح دليل الطالب عبد القادر بن عمر الشيباني ط صبيح.

*اعلام الموقعين لابن القيم الجوزيه ط القاهرة.

**الفقه الزيدي:**

*البحر الزخار الجامع لمذاهب علماء الامصار، احمد بن يحيى بن المرتضى (ت-٨٤٠هـ)ط اولى السعادة.

*الروض النضير شرح مجموع الفقه الكبير، الحسين بن احمد الصنعاني (ت-١٢٢١هـ)ط السعادة.

**الفقه الظاهري:**

*المحلى لابن حزم ط منير الدمشقي .

**الفقه الاباضي:**

* شرح النيل وشفاء العليل محمد بن يوسف بن اطفيش ط بولاق ١٣٤٣.

**الفقه المقارن:**

*اختلاف الفقهاء للطبري ط الموسوعات .

*بداية المجتهد ونهاية المقتصد محمد بن احمد المعروف بابن رشد(٥٢٠-٥٩٥هـ).

*الميزان الكبرى الشعرانية سيدي عبد الوهاب الشعراني (ت-٩٧٣)

*مقارنة المذاهب في الفقه للشيخ محمود والشيخ محمد علي السايس ط محمد علي صبيح.

**تاريخ الفقه الإسلامي والفقهاء المسلمين:**

*الفكر السامي سيدي محمد بن الحسن الحجوي.

*فقه اهل العراق وحديثهم محمد زاهد الكوثري(١٢٩٦-١٣٧١)ط بيروت.

*تاريخ التشريع الإسلامي للشيخ محمد الخضري ط ثانية القاهرة.

*خلاصة تاريخ التشريع الإسلامي للاستاذ عبد الوهاب خلاف ط خامسة.

*ابو حنيفة للاستاذ ابي زهرة ط دار الفكر العربي.

*مالك لاستاذ ابي زهرة ط دار الفكر العربي.

*الشافعي للاستاذ ابي زهرة ط دار الفكر العربي.

*الامام احمد للاستاذ ابي زهرة ط دار الفكر العربي .

*الامام صادق للاستاذ ابي زهرة ط دار الفكر العربي .

*الامام زيد للاستاذ ابي زهرة ط دار الفكر العربي.

*ابن حزم للاستاذ ابي زهرة ط دار الفكر العربي.

*ابن تيميه للاستاذ ابي زهرة ط دار الفكر العربي.
*ابن قيم الجوزية للدكتور عبد العظيم عبد السلام شرف الدين ط ثانية.
*المدخل للفقه الإسلامي للاستاذ سلام مدكور ط اولى ١٩٥٤م.
*تاريخ الفقه الإسلامي للاستاذ الشيخ محمد على السايس ط صبيح ولولاده .
*تاريخ الفقه الإسلامي للاستاذ محمد انيس عباده ط اولى ١٣٨٨هـ١٩٦٩م جزءان.
*تاريخ التشريع الإسلامي للاستاذ ابراهيم الشهاوي ط القاهره ١٩٧١-١٩٧٢.
*تاريخ الفقه الإسلامي محمد اسحق الحداد ط القاهره-١٩٥٩م.
*تاريخ الفقه الإسلامي الدكتور محمد يوسف موسى ط دار المعرفة القاهرة ثلاثة اجزاء.
*المدخل للفقه الإسلامي عيسوي احمد عيسوي ط اولى.
*تاريخ التشريع الإسلامي الدكتور حسن الكاشف ط القاهرة.
الابحاث والمؤلفات الاخرى
*منهب ابن عباس في الربا بين المذاهب فقه السنة والشيعة زيد ابو مكارم ط اولى .
*مصادر التشريع الإسلامي فيما لا نص فيه، عبد الوهاب خلاف ط دار الكتاب العربي.
*تفسير النصوص في الفقه الإسلامي الدكتور محمد اديب صالح ثانية بيروت.
*التعبير عن الارادة في الفقه الإسلامي، الدكتور وحيد الدين سوار ط اولى .
*الخراج لابي يوسف ط السلفية.
*العرف والعادة في راي الفقهاء للدكتور ابي سنة، ط الازهر .
*محاضرات في الفقه المقارن للاستاذ فرج السنهوري ١٩٧١-١٩٧٢م جامعة القاهرة.
*اصول الفقه لزكريا البرديسي ط دار التاليف ١٩٦١م.
*رسالة الطوفي في رعاية المصلحة المنشورة في كتاب مصادر التشريع الإسلامي فيما لا نص فيه ابتداء من ص ٨٧ط دار الكتاب العربي القاهرة.
*ازالة الالتباس عن مسائل القياس للشيخ امين الشيخ ط التضامن القاهرة .
*تعليل الاحكام تأليف محمد مصطفى شلبي ط الازهر.
*اصول الفقه الشيخ محمد ابو زهير، اربعه اجزاء، ط دار التأليف.
*اصول الفقه للاستاذ عباس حمادة متولي، ط الازهر.
*الملل والنحل محمد بن عبد الكريم الشهرستاني (ت-٥٤٨هـ)مع الملل والاهواء والنحل لابن حزم.
*ط محمد علي صبيح وأولاده.

# فەرهەنگۆك

لەبەرئەوەی بەشی زۆری وشە و زاراوە فیقهی و شەرعیەکانی ناو ئەم کتێبە وشە و زاراوەی کوردیی پڕاوپڕیان لە زمانی کوردیدا نیە، بۆ ئەوەی رۆحە عەرەبیەکە بەسەر دەقە کوردیەکەدا زاڵ نەبێ، ناچار بووم –وەك هەندێ لە کارە وەرگێڕانەکانیترم– وشەی کوردی بۆ بەشێك لەوانە دابنێم، ئەگەرچی بەوە دەستبەرداری سیغە عەرەبیەکانیش نەبووم بەتەواوی لەبەرئەوەی بە عەرەبیەکەیان لەناو خوێنەرانی کوردیشدا تا رادەیەك بەکار دێن، لەبەرئەوە بەتێکەڵی بەکارم هێناون تا خوێنەری لەگەڵ کوردیەکان رابێ بەبێ ئەوەی زیان بەو خوێنەرانە بگەیەنێ کە لەگەڵ سیغە عەرەبیەکە راهاتوون.

دیارە بەشێك لە زاراوەکانیشم هەر بە دەربڕینە عەرەبیەکە گواستۆتەوە.

لە خوارەوە لیستێك بەو وشانە تۆمار دەکەم.

أجير: کرێوان

ايماو: کلەچاو

اختلاف: جیاوازی

خلاف: ناکۆکی

متفق عليه: جێکۆك

مختلف عليه: جێناکۆك

فقيه: شەرعزان

قطعي: گومانبڕ

ظني: گومانگر

مكروه: پێناخۆش

مندوب، مستحب: پێخۆش

مباح: رێپێدراو

مقتچی: خواست

دخول: چوونەلا، جیماع، جووتبوون

خبر الواحد: یەکینە هەواڵ
خبر الاحاد: تاکینە هەواڵ
مفهوم الموافقه: مانای راستەوانە
مفهوم المخالفه: مانای پێچەوانە
مكلف: بەرئەرك
ڤاهر: دیار، ئاشكرا
باگن: پەنامەكی، پەنهان
خفی: شاراوە
مجمل: كۆبێژ
مشكل: بەگرێ
متشابه: لێكچوو
راجح: زاڵ
مرجوح: بنزاڵ
مفسر: راڤەكار
محكم: دامەزراو
مگلق: رەها
مقید: بەند
عام: گشتی
عموم: گشتیبوون
سد الذرائع: بیانوویەست
المصالح المرسله:
الاستحسان: بەباشزانین
الاستصحاب: هاوەڵخوازی
الاجماع: كۆدەنگی
حجه: بەڵگە
الحجیه: بەڵگەبوون